# تيسير الكريم الرحمن

## في تفسير كلام المنان

به كوردى

نووسینی: العلامة عبد الرحمن بن ناصر السعدي رحمه الله

وەرگێڕانی: عباس محمد امين

بەرگی دووەم

سوورەتی (المائدة) تا سوورەتی (يُوسُف)

# تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ
## به كوردی

**بەرگی دووەم**

**سوورەتی (المائدة) تا سوورەتی (یوسف)**

# تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلاَمِ المَنَّانِ

# به كوردى

نووسینی

العلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي رحمه الله

ناوی کتێب: تَيْسِيرُ الكَرِيْمُ الرَّحْمَن فِي تَفْسِيرِ كَلَامِ المَنَّانِ به کوردی (بەرگی دووەم)

بابەت: تەفسیری قورئانی پیرۆز

ناوی نووسەر: العلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي (رحمه الله)

وەرگێڕانی: عباس محمد امین

دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٩

چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (٤٩)ـی ساڵی (٢٠١٩)ـی پێ دراوە.



ناوەندی ڕێنوێن

07701932749 - 07501269689

hakem1423@yahoo.com

renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم

بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوْفُواْ بِٱلْعُقُودِۚ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ
إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌۗ إِنَّ ٱللَّهَ
يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ① يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ
وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْيَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ
ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًاۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُواْۚ
وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن
تَعْتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ
وَٱلْعُدْوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ②

## تەفسیری سوورەتی (المائدة)

## مەدەنییە (١٢٠) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوْفُواْ بِٱلْعُقُودِۚ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّي ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ (١) ﴾

ئەمە فەرمانێکە لە لایەن خوای گەورەوە بۆ بەندە بڕوادارەکانی، بۆ ئەوەی پابەند بن بە پەیمانو بەڵێنەکانیانەوە بە تەواوترینو چاکترین شێوە، بە بێ کەمو کورتی. وە ئەمە گشتگیرە بۆ هەموو ئەو گرێبەستانەی کە لە نێوان بەندەو پەروەردگاری دایە، لە پابەند بوون بە خواپەرستیەوە، وە ئەنجامدانی بە باشترین شێوە، وە هیچ لەو مافانە کەم نەکاتەوە لەوەی لە نێوان خۆیو پێغەمبەر ﷺ دایە، بە گوێڕایەڵیو شوێنکەوتنی، وە ئەوەی لە نێوان خۆیو دایکو باوکو خزمە نزیکەکانی دایە، بە چاکەکردن لەگەڵیانو بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتیو دانەبڕان لێیان. وە ئەوەی لە نێوان ئەوو هاوڕێکانی دایە، لە بەجێهێنانی مافی هاوڕێیەتی لە هەژاریو دەوڵەمەندی، وە لە خۆشیو ناخۆشیدا، وە ئەوەی لە نێوان ئەوو هەموو دروستکراوەکان دایە لە گرێبەستو مامەڵەکان وەک کڕینو فرۆشتنو بە کرێدانو هاوشێوەکانی، وە گرێبەستی بەخشین وەک دیاریو خێرو چاکەکانو هاوشێوەکانی، بەڵکو هەستان بە ئەنجامدانی سەرجەم مافی مسوڵمانان، کە خوا ﷻ پەیمان دانی لە نێوانیاندا کردوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ (١٠) ﴾ الحجرات، (واتە: تەنها بڕواداران برای یەکترن) بەسەر خستنی لەسەر ڕاستیو یارمەتی دانیو، بەهێز کردنی پەیوەندی نێوان مسوڵمانانو نەپچڕاندنی.

ئەم فەرمانە گشتگیرە بۆ بنەماکانی دینو لقو پۆپەکانی، هەموو ئەمانە لە ناو ئەو

گرێبەستەدا جێگایان دەبێتەوە کە خوا ﷻ فەرمانی بە ئەنجامدانی کردوە.
پاشان خوا ﷻ منەت دەکات لە سەر بەندەکانی‌و پێیان دەفەرموێ: ﴿ أُحِلَّتْ لَكُم ﴾ واتە: لە بەر ئێوە، (وە ئەمە) میهرەبانیەکە بۆ ئێوە ﴿ بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴾ لە حوشترو لە مانگاو لە مەڕو بزن. بەڵکو هەندێ جار ئاژەڵی کێویش دەگرێتەوە، وە بزنو، کەری کێوی‌و، هاوشێوەکانی لە ڕاو کردن. هەندێ لە هاوەڵان ئەم دەقەیان کردۆتە بەڵگە لەسەر ڕەوایی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا پاش سەربڕینی دایکی.
﴿ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾ بێجگە لە وەی کە حەرامە، وەک لە فەرمایشتی خوای گەورەدا هاتوە: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ ﴿٣﴾ ﴾المائدة، (واتە: لێتان قەدەغە کراوە مردارەوە بوو، خوێن‌و گۆشتی بەراز) هەتا کۆتایی ئایەتەکە.
بە ڕاستی ئەمانەی کە باسکراون ئەگەر چی ئاژەڵی چوار پێن، ئەوە حەرامن، وە لە کاتێکدا کە گۆشتی ئاژەڵە چوار پێیەکان بە شێوەیەکی گشتی‌و لە هەموو کاتەکاندا ڕەوایەو حەڵاڵە، بەڵام ڕاوکردنیان لە کاتی ئیحرام بەستندا دروست نیە، وەک دەفەرموێ: ﴿ غَيْرَ مُحِلِّى ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ﴾ واتە: حەڵاڵ کراوە بۆتان گۆشتی ئاژەڵەکان لە هەموو کاتێکدا، تەنها لە کاتی ئیحرام بەستندا دروست نیە ڕاوی بکەن، کەواتە: ئەگەر یەکێک لەو ئاژەڵانەتان ڕاو کردو لە کاتی ئیحرام‌و مانگی حەرامدا کوشتتان ئەوە بە دڵنیایی حەڵاڵ نیە بۆتان، ئەگەر ڕاوی بکەن وەک بزنە مژەو هاوشێوەکانی.
(الصيد) واتە: ئەو ئاژەڵەی کە کێویەو گۆشتی دەخورێ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ﴾ واتە: هەر کاتێک خوا ﷻ بیەوێت بە ویستی خۆی بڕیاری لە سەر دەدات کە لەگەڵ حیکمەتەکەی بگونجێت، وەک چۆن فەرمانی پێکردوون بەڵێنەکان ببەنە سەر، لە بەر بە دەست هێنانی بەرژەوەندیەکانتان، وە دوور کەوتنەوە لە زیانەکان.
وە ئاژەڵە چوار پێیەکانی بۆ حەڵاڵ کردوون وەک میهرەبانیەک لەگەڵتان، وە حەرامی کردوە جگە لە وانە لە مردارەوە بوو و هاوشێوەکانی لە بەر پاراستن‌و ڕێز لێگرتنتان، وە ڕاوکردنی قەدەغە کردوە لە ئیحرام لە بەر ڕێزو گەورەیی ئیحرام بەستن.
(٢): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحِلُّوا۟ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا ۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُوا۟ ۚ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا۟ ۘ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـویْ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: حەرامكراوەكانی خـوای گـەورە كـە فەرمانـی پێكـردوون بـە گـەورەی ڕابگـرنو نزیكـی نەكەونــەوە. وە قەدەغـە كـردن لێرەدا بە مانـای ئەوە دێت كـە ئەنجامدانی ئـەو كارە قەدەغەیـە، وە قەدەغە كـردن لـە بـڕوا بـوون بـە حـەڵاڵ كردنـی، چونكە ئـەوە قەدەغـە كـردن دەگرێتـەوە لە كـرداری ناشـرین، وە بـە هەمـان شـێوە بڕوا بـوون بـەوەی كە قەدەغەیـە، وە ئـەو قەدەغە كردنـەش حـەرام كراوەكانـی ئیحـرام بەسـتن دەگرێتـەوە، وە حـەرام كراوەكانـی حەرام كـردن دەگرێتەوە.

وە دەچێتـە ئـەو چوارچێوەیەوە كـە دەفەرمـویْ: ﴿ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ ﴾ واتە: كوشـتار لەو مانگـەدا مەكـەن، وە هەروەهـا هەموو جۆرە سـتەمێكیش لـەو مانگەدا حەرام كـراوە، وەك خـوا ﷻ دەفەرمـویْ: ﴿ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ فَلَا تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ ﴿٣٦﴾ ﴾التوبة، (واتـە: بێگومـان ژمـارەی مانگـەكان لە لای خوا لـەو ڕۆژەوە كـە ئاسـمانەكانو زەوی هێناونـە دی، دوازدە مانگـن, لـەو «دوازدە مانـگ»ەش چواریـان حەرامـن «جەنگیـان تێـدا قەدەغەیـە», ئـا ئەوەیـە ئایینـی ڕاسـتو ڕێـك, ئنجا ئێـوە لەو «چـوار مانگ»انەدا سـتەم لـە خۆتـان مەكەن).

زۆربـەی زانایـان بۆ چوونیـان وایە كە كوشـتار لـە مانگەكانـی حەرامدا نەسـخ كراوەتەوە بـەو فەرمایشـتەی خـوای گـەورە: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴿٥﴾ ﴾التوبة، (واتـە: ئنجـا هـەر كات مانگـە جەنگ تێـدا قەدەغە كـراوە «بە مۆڵـەت دانـراوە»كان تێپەڕیـن، ئـەوە لـە هـەر كوێیـەك هاوبەش بـۆ خـوا دانەرەكانتان لـێ هەڵكەوتـن بیانكـوژن)، وە جگـە لـەو دەقـە گشـتیانەش كـە تیایانـدا فەرمـان كراوە بـە كوشـتنی كافـران بە ڕەهایـی، كە خـوای گەورە هەڕەشـەی كـردوە لە وانـەی كە دوا دەكـەون لـە كوشـتاری بێبڕواكاندا بـە ڕەهایی.

وە هەروەهـا پێغەمبـەری خـوا كوشـتاری خەڵكی (طائـف)ی كرد لـە مانگـی (ذي القعدة) ئەویـش یەكێكـە لە مانگـە حەرام كـراوەكان.

هەندێكـی تـر لـە زانایـان دەفەرمـوون: كوشـتار كـردن لـە مانگەكانـی حەرامـدا نەسـخ نەكراوەتـەوە بەڵگەیـان بۆ قسـەكەیان ئـەم دەقـەو هاوشـێوەكانێتی: لە بەر ئـەوەی قەدەغە كردنەكـە تایبـەت كراوە. لێـرەدا دەقە ڕەهاكانیـان حەمل كردوەو وتوویانـە: (المطلق يحمل

علی المقید) واتــە: ئــەوەی کــە بە ڕەهایــی هاتوە لەبەر ڕۆشــنایی ئــەوەدا کە بــە (مقید)ی‌و بە بەنــدداری هاتــوە تەماشــای دەکرێ[١]

وە هەندێکــی تــر لــە زانایــان درێژەیــان داوە بــەم بابەتــە دەڵێــن: دروســت نیە مســوڵمانان دەســت پێشــخەری بکەن بۆ کوشــتار لــە مانگەکانــی حەرامدا، بــەڵام درێژە پێــدان‌و تەواو کردنــی ئەگــەر ســەرەتای جەنگەکــە لە پێــش مانگەکانــی حەرامدا بــوو ئەوە دروســتە، وە کوشــتاری پێغەمبــەری خــوا ﷺ بەرانبــەر بــە خەڵکی (طائف) لە ســەر ئەوە دانــاوە، چونکە دەســت پێکــی کوشــتارەکەیان لــە جەنگــی حونەین بــوو، لە مانگی شــەوال.

وە هەمــوو ئەمانــەی کــە باســکرا دەربــارەی کوشــتار مەبەســت پێــی بەرگری کــردن نیە، بــەڵام کوشــتاری بەرگــری ئەگــەر کافــران دەســت پێشــخەریان کرد بــە کوشــتار لەگەڵ مســوڵماناندا، ئــەوە دروســتە مســوڵمانان بەرپەرچیان بدەنــەوە، ئەمیش بۆ بەرگــری کردنە لە خۆیــان لــە مانگــی حــەرام‌و هەمــوو مانگەکانــی تر بە یــەک دەنگــی زانایان.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَـٰٓئِدَ﴾ واتــە: ڕێگــری مەکەن لــەو قوربانیەی کە بە دیــاری دەهێنرێــت بــۆ ماڵــی خــوا (مەککــە) لــە حەجــدا بێ، یــان لە عەمــرە، یــان لە هەر کاتێکــی تــردا بێــت، لــە مــاڵات‌و هاوشــێوەکانی، نەکــەن ڕێگری لــێ بکەن هەتــا دەگاتە شــوێنی خۆی، وە لێــان مەبەن لە ڕێگای دزی کــردن‌و هاوەشــێوەکانیەوە، وە کەمتەرخەمی تیــادا نەکــەن بەوەی ئەرکێک بخەنە ســەر شــانیان کــە لە توانــای ئەواندا نەبێ، بــەو هۆیەوە پێــش ئــەوەی بگاتە شــوێنی پێویســت لە نــاو بچێــت، بەڵکو بە گــەورەی ڕابگــرن، وە ئەو کەســەش بە گــەورە ڕابگرن کــە دەیهێنێ.

﴿وَلَا ٱلْقَلَـٰٓئِدَ﴾ ئەمــە جۆرێکــی تایبەتــە لــە جۆرەکانــی دیــاری، ئەویــش بریتیــە لــەو قوربانیــەی کــە ملوانکــەی لــە مــل کــراوە بــۆ ئــەوەی خەڵکــی فێــری شــوێنکەوتن فێری ســوننەت ببــن، وە لەبــەر ئەوەی کــە بزانرێــت دیاری کــراوەو ڕێزی لــێ بگیرێــت، لەبەر ئەوەیــە ملوانکە خســتنە مل یەکێکە لە دروشــم‌و ســوننەتەکان ﴿وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ﴾ واتــە: ئەوانــەی مەبەســتیان ماڵــی خوایــە ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا﴾ واتــە: ئــەو کەســەی مەبەســتی ماڵــی خوایــە، وە مەبەســتی چاکــەی خوایــە بــە بازرگانی‌و کەســابەتی حــەڵاڵ‌و ڕێگــە پێدراو، یــان مەبەســتی ڕەزامەندی خوایە بە حــەج‌و عومرەو تــەواف‌و نوێژ کــردن، وە هاوشــێوەی ئەوانە لــە عیبادەتــەکان، وە ڕووبەڕوویان مەبنەوە بە قســەو کرداری ناشــرین، بەڵکــو ڕێزیــان لــێ بگــرن‌و ڕێز لــە نێــردراوەکان بگرن‌و بــە گەورە تەماشــایان

بکـەن، وە لـەو چوارچێـوەدا ڕێگـاو بانەکانیـان بۆ خـۆش بکەن، هەتـا ئەو کەسـانەی دێن بـۆ ماڵـی خـوا بـە ئارامیـەوە بێنو هیـچ مەترسـیەکیان لەسـەر نەبێـت، بەبێ ئـەوەی کە لە گیانیان بترسـن لە کوشـتنو ئـازاردانو هاوشـێوەکانی، وە هەروەها لە ماڵەکانیان نەترسـن، لـە دزیکـردنو ڕێگری کـردنو هاوشـێوەی ئەوانە.

وە ئـەم دەقـە پیـرۆزە تایبـەت کـراوە بـە فەرمایشـتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ ﴿٢٨﴾ ﴾التوبة.(واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بـە دڵنیاییـەوە هاوبەش بـۆ خوادانـەرەکان پیسـن, بۆیە با پـاش ئـەم سـاڵ «سـاڵی نۆیەمی کۆچـی» توخنـی مزگەوتـی حـەرام نەکەون).

کەسـی بـت پەرسـت نابێـت بچێتە نـاو ماڵی خـوا (کەعبـەی پیـرۆز)، وە تایبەتـی کردن لـەم دەقـەدا، بـە قەدەغـە کردنـی ڕوو بـەڕوو بوونـەوەی ئـەو کەسـانەی مەبەسـتیان ماڵی خـواو ڕەزامەنـدی ئـەوە، بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کە هەر کەسـێک مەبەسـتی ئـەوە بێت سـەرپێچیو خراپـەکاری تێـدا بـکات، ئـەوە پێویسـتە ڕێگـری لێ بکرێـت لـەم حاڵەتەدا، بـۆ ئەوەی پشـێویو ئاشـووب لـە ماڵی خوادا دروسـت نـەکات، وەک چۆن خـوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٢٥﴾ ﴾الحج.

وە کاتێـک کـە قەدەغەی لێکـردوون لە ڕاو کـردن لە کاتی ئیحـرام بەسـتندا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ ﴾ واتـە: ئەگـەر ئیحرامتـان شـکاند لە حـەجو عەمـرە، وە دەرچوون لـە حەرەمـی مەککـە ئـەوە دروسـتە بۆتـان ڕاو بکەن، وە ئـەو قەدەغـە کردنـە لادەچێت، وە فەرمـان کـردن پـاش قەدەغە کـردن، حوکمـی شـتەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ پێـش حەرام بوونی.

﴿ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ ﴾ واتـە: بـا تووڕەیـیو دژایەتـیو سـتەمی کەسـانێک واتـان لێ نـەکات، لەبـەر ئـەوەی ڕێگریان لێکـردوون لـە مزگەوتـی حـەرام (کەعبە)، ئێـوەش دەسـتدرێژی بکەنە سـەریان بۆ ئەوەی دڵتـان ئاوبخواتەوە، بەڕاسـتی پێویسـتە لەسـەر مسـوڵمان پابەندبـێ بە فەرمانەکانـی خواوەو ڕێگـای دادپـەروەری بگرێتەبـەر، تەنانـەت ئەگەر ستەمیشـی لێ بکرێت، دروسـت نیە بۆی کـە درۆ بـکات بەسـەر کەسـێکەوە بـە هۆی ئـەوەی کە ئـەو درۆی لەسـەر کـردوە، یان خیانەتـی لـێ بکات لەبـەر ئـەوەی کە ئـەو خیانەتـی لێکردوە.

﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ ﴾ واتـە: بـا هەندێکتـان کۆمەکـی هەندێکـی ترتـان بکەن

لەسەر چاکە. (البر): بریتیە لە ناوێکی گشتگیر بۆ هەموو ئەوانەی کە خوا خۆشی دەوێن و لێیان ڕازیە، لە کردارە ئاشکراو نهێنیەکاندا، وە لە مافی خوای گەورەو مافی بەندەکان.

(التقوى): لێرەدا: ناوێکی گشتگیرە بۆ واز هێنان لە هەموو ئەو کردارە ئاشکراو نهێنیانەی کە خواو پێغەمبەرەکەی پێیان ناخۆشە، وە هەموو ڕەوشتێک لە ڕەوشتەکانی خێرو چاکە کە فەرمان بە ئەنجامدانی کراوە، یان هەموو ڕەوشتێک لە ڕەوشتە ناشرینەکان کە فەرمان بە نەکردنی کراوە، بەراستی بەندە فەرمانی پێکراوە کە سەرەتا خۆی جێبەجێ بکات، پاشان هاوکاری برا ئیماندارەکانی بکات لەسەری، بە هەموو وتەیەک کە هانی بدات و چالاکی بکاتەوە، وە بە هەمان شێوە بە هەموو کردارێک.

﴿ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ ﴾ئەویش نەترسان و چاو قایم بوونە لەسەر تاوان و سەرپێچی کە خاوەنەکەی تاوانبار دەبێت ﴿ وَٱلْعُدْوَٰنِ ﴾بریتیە لە دەستدرێژی کردن بۆ سەر خەڵک لە خوێن و ماڵ و شەرەف و ناموسیان، بێگومان پێویستە لەسەر بەندە دەست هەڵبگرێت لە هەموو دەستدرێژی و ستەمێک، پاشان هانی خەڵکیش بدات بە واز هێنان و دوورکەوتنەوە لێی.

﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾لەسەر ئەو کەسەی کە بە چاو قایمی سەرپێچی دەکات، ئاگاداری قەدەغە کراوەکان بن،تاکو تووشی سزای خوا نەبن لە ژیانی دنیاو دوارۆژدا.


حرمت عليكم الميتة والدم ولحم الخنزير وما أهل لغير الله به والمنخنقة والموقوذة والمتردية والنطيحة وما أكل السبع إلا ما ذكيتم وما ذبح على النصب وأن تستقسموا بالأزلام ذلكم فسق اليوم يئس الذين كفروا من دينكم فلا تخشوهم واخشون اليوم أكملت لكم دينكم وأتممت عليكم نعمتي ورضيت لكم الإسلام دينا فمن اضطر في مخمصة غير متجانف لإثم فإن الله غفور رحيم ﴿٣﴾ يسألونك ماذا أحل لهم قل أحل لكم الطيبات وما علمتم من الجوارح مكلبين تعلمونهن مما علمكم الله فكلوا مما أمسكن عليكم واذكروا اسم الله عليه واتقوا الله إن الله سريع الحساب ﴿٤﴾ اليوم أحل لكم الطيبات وطعام الذين أوتوا الكتاب حل لكم وطعامكم حل لهم والمحصنات من المؤمنات والمحصنات من الذين أوتوا الكتاب من قبلكم إذا آتيتموهن أجورهن محصنين غير مسافحين ولا متخذي أخدان ومن يكفر بالإيمان فقد حبط عمله وهو في الآخرة من الخاسرين ﴿٥﴾

(٣): ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ
الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ
وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ
السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ
وَأَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ
الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن دِينِكُمْ فَلَا
تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ
دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ
الْإِسْلَامَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ
مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
(٣) ﴾:

ئەمە ئەوەیە کە خوا ﷻ بۆی گواستوینەتەوە لە فەرمایشتی خۆی: ﴿ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾ باش بزانە ئەوەی کە خوای گەورە قەدەغەی کردوە لەسەر بەندەکانی تەنها لەبەر بەرژەوەندی خۆیانو پاراستنیانە لە زیانی ئەوانەی کە لە ناو قەدەغەکراوەکاندا هەیە، وە هەندێ جار ئەوەی ڕوون کردوەتەوە، هەندێ جاریش ڕوونی نەکردوەتەوە. وە هەواڵیداوە کە بە ڕاستی ئەو حەرامی کردوە ﴿ الْمَيْتَةُ ﴾ مەبەست لە مردارەوەو بوو ئەوەیە کە گیانی دەرچووبێت بەبێ سەر بڕینێکی شەرعی، بە ڕاستی ئەوە حەرامە لەبەر ئەوەی زیانی هەیە، کە بریتیە لە مانەوەو کۆبوونەوەی خوێن لە جەستەیدا، وە گۆشتەکەی کە ئەگەر هەر کەس بیخوات زیانی پێ دەگەیەنێ.

وە زۆرێک لەوانەی کە دەمرن بە هۆی نەخۆشیەکەوە، ئەو نەخۆشیە دەبێتە هۆکاری مردنیان، وە ئەوانەی لە مردارەوە بوو جیاکراونەتەوە: مردارەوەبووی کوللەو ماسیە ئەوانە حەلاڵن.

﴿ وَالدَّمُ ﴾ واتە: خوێنێک ڕژابێت، وەک چۆن لە دەقێکیتردا بەنداری کردوە دەفەرموێ: ﴿ دَمًا مَّسْفُوحًا (١٤٥) ﴾ الأنعام

﴿ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ ﴾ ئەوە گشتگیرە بۆ هەموو بەشەکانی، لە بەر ئەوە خوای گەورە لە

نێـوان هەمـوو ئاژەڵـە درندەکانـدا بـە تایبـەت ناوی بـەرازی هێنـاوە، چونکە دەسـتەیەک لە خـاوەن کتێبـەکان لـە گـاورەکان پێیـان وابوو بـە تایبەت خـوا بـۆ ئەوانی حـەڵاڵ کردوە. واتـە: غـرور مەبـن بـەوان، بەڵکو ئـەوە حەرامـەو لە کۆی شـتە پیسـەکانە.

﴿ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴾ واتـە: ئـەو ئاژەڵەی لە کاتی سـەربڕیندا ناوی غەیری خوای لەسـەر هێنـراوە، لـە بتـەکانو پیاوچـاکانو ئەسـتێرەکان، وە جگـە لە وانـەش لە دروسـتکراوەکان، وەک چـۆن نـاوی خـوا سـەربڕاوەکە پـاک دەکات، ماناکـەی ئـەوە دەگەیەنێت کـە ناوی غەیـری خـوا پیسـی دەکات لـە ڕووی مەعنەوویـەوە، چونکـە شـیرکو هاوبـەش دانانە بۆ خـوای بـێ هاوتا.

﴿ وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ ﴾ واتـە: ئـەو مـردارەوە بـووەی کـە خنکێنـراوە بـە دەسـت، یان بـە پەتو گوریـس، یـان سـەری بخرێتـە نـاو شـتێکی تەسـکەوە، نەتوانرێـت بهێنرێتـە دەرەوە هەتـا دەمرێت.

﴿ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ ﴾ واتـە: مردارەوەبوویـەک بـە هـۆی لێدانەوە بە گۆچـان، یان بە بـەرد، یان بە دار، یـان ڕووخانی شـتێک بەسـەریدا، بە مەبەسـت یان بە بێ مەبەسـت.

﴿ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ ﴾ واتـە: ئـەوەی کە لە بـەرزی بکەوێتە خـوارەوە، وەک: کێو، یـان دیوار، یان سـەربان، یـان هاوشـێوەی ئەوانە، بە هۆی ئـەوەوە بمرێت.

﴿ وَٱلنَّطِيحَةُ ﴾ ئەوەیە کە (ئاژەڵێک) قۆچی لێ دابێ، بە هۆی ئەوەوە مردبێ.

﴿ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ ﴾ لـە گـورگ، یان شـێر، یان پڵنگ، یان ئـەو باڵندانەی کـە دڕندەنو ڕاو دەکـەن، ئەگـەر بە هـۆی لێخواردنی دڕندەوە مـرد، ئەوە بێگومان حـەڵاڵ نیە.

﴿ إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ ﴾ واتـە: دەگەڕێتـەوە بۆ ئەو مەسـەلانەی پێشـوو لـە: خنکاو، لێـدراو، ئەوەی لـە بەرزایـی فـڕێ درابێتـە خـوارەوە، قـۆچ لێـدراو، ئـەوەی دڕنـدە خواردبێتی، ئەگەر سـەر ببڕدرێـت، وە گیانـی ڕاسـتەقینەی تێـدا مابێـت بۆ ئەوەی سـەربڕینەکە شـەرعیو دروسـت بێت، شـارەزایان لـە فیقهی ئیسـلامیدا دەڵێن: (ئەگەر دەرکـەوت دڕندە یان هاوشـێوەی دڕندە ناوسـکی دەرهێنـا بـوو، یان گەردنـی بڕیبوو، ئـەوە ژیانـی وەک نەمانی وایـە). وە هەندێ لە زانایـان بـۆ چوونیـان وایە ئەگـەر نێچیرەکە ژیانـی تێدا مابوو ئەوە دروسـتە سـەر ببڕدرێتو بخورێـت، تەنانـەت ئەگـەر ناوسکیشـی دەرهێنرابوو، ئـەوە مانای ڕووکەشـی دەقەکەیە.

﴿ وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِ ﴾ واتـە: قەدەغە کـراوە لەسـەرتان فاڵگرتنەوە، یان نیـاز گرتنەوە بـە تیـرو پشـک، (الإستقسـام): بریتیـە لـە داواکردنی ئەو شـتەیە کـە بۆتان دابـەش بکاتو

ئەندازەگیریی بکات. کە بریتیە لە سێ (قەدەح) لە سەردەمی نەفامیدا بەکاریان دەهێنا، لەسەر یەکەمیان نووسرابوو: ئەو کارە بکە. وە لەسەر دووەم نووسرابوو: ئەو کارە مەکە. وە سێیەم: هیچی تێدا نەنووسرابوو.

جا ئەگەر کەسێک بیویستبایە گەشتێک بکات، یان ژن مارە ببڕێت، یان هاوشێوەی ئەوانە، دەچوو شتێکی هەڵدەدا بۆ سەر یەکێک لەو قەدەحانە، ئەگەر ئەوە دەربچوایە کە دەڵێ: ئەو کارە بکە. ئەوە لەسەر ئەو کارە دەچوو، وە ئەگەر ئەوە دەربکەوتبایە: ئەو کارە مەکە. ئەوە دەستی دەکێشایەوە لەو کارەو نەیدەکرد. وە ئەگەر ئەوە دەربکەوتبایە کە هیچی لەسەر نەنووسراوە، دووبارەی دەکردەوە هەتا یەکێک لەوانەی دی دەردەچوون، ئنجا کاری پێ دەکرد.

خوای گەورە لێی قەدەغە کردن، ئەوەی کە وەک ئەمەیەو ئەوەشی کە لە هاوشێوەی دەچێت، بەڵکو خوای کاربەجێ لە جیاتی ئەوە نوێژی (الإستخارة)ی بۆ دیاری کردن.

﴿ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ﴾ ئاماژەیە بۆ هەموو ئەو قەدەغە کراوانەی کە باس کرا، کە خوای کاربەجێ قەدەغەی کردوە، لەبەر پاراستنی بەندەکانی، وە بەڕاستی ئەوە ﴿فِسْقٌ﴾ واتە: دەرچوونە لە فەرمانی خواو بە دەمەوە چوونی فەرمانی شەیتانە.

پاشان خوا ﷻ منەتی کردوە بەسەر بەندەکانیدا وەک دەفەرمووێ: ﴿ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ ۚ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِى مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ ۙ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ ئەو ڕۆژەی کە ئاماژەی بۆ کراوە ڕۆژی عەرەفەیە، کە خوای گەورە دینی خۆی تەواو کامڵ کرد، وە بەندەو پێغەمبەرەکەی سەرخست، وە بت پەرستانی زەلیلو سەرشۆڕ کرد، پاش ئەوەی کە سوور بوون لەسەر هەڵگەڕانەوەی بڕواداران لە ئاینەکەیانو تەماحی ئەوەیان دەکرد. کاتێک گەورەیيو عیززەتی ئیسلامیان بینی، لە سەرکەوتنەکانو دەرکەوتنی بە تەواوی، تەواو بێ ئومێدو هیوا بڕاو بوون کە جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ سەر ئاینەکەیان، هەتا وایان لێهات لە بڕواداران دەترسان.

بۆیە لەوساڵەدا کە پێغەمبەر ﷺ حەجی تیایدا کرد -ساڵی دەیەمی کۆچی- حەجی ماڵئاوایی، هیچ بت پەرستێک حەجی نەکرد، وە هیچ کەسێک بە ڕووتی تەوافی نەکرد. بۆیە دەفەرمووێ: ﴿فَلَا تَخْشَوْهُمْ﴾ واتە: لە بت پەرستان مەترسن، لەو خوایە بترسن کە سەری خستوون بەسەریانداو ڕیسوای کردوونو هەموو فێڵەکانیانی بە گەردنی خۆیاندا شکاندووەتەوە.

﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ﴾بــە ئەوپــەڕی ســەرکەوتن، وە تــەواو کردنی شــەریعەت لە ئاشــکرایی‌و نهێنــی، بنەمــاو لقەکانــی. بۆیــە تەنها قورئانو ســوننەت بەســە بۆ ئــەوەی بکرێن بــە تاکــە ســەرچاوە، لــە بڕیارەکانی ئایــن‌و لق‌و پۆپەکانــی. هەر فەرمــان پێکراوێــک برِوای وابێــت کــە پێویســتە خەڵکــی بــۆ شــارەزا بــوون لــە عەقیــدەو ئەحکامــەکان فێــری کۆمەڵە زانســتێک ببێت جگە لە قورئانو ســوننەت، لە زانســتی کەلام‌و هاوشــێوەکانی، ئەوە بەراســتی نەفامــەو بۆچوونەکــەی پــووچ‌و بــێ مانایــە، چونکــە وا گومانی بردوە کــە ئاین تــەواو نابێت تەنهــا بــەوە نەبێــت کە ئــەو دەیڵێت‌و بانگەشــەی بۆ دەکات. ئەمــە لە گەورەترین ســتەم‌و خۆ گەوجانــدن‌و نەفامیە بەرانبــەر بە خــواو پێغەمبەرەکەی.

﴿ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي ﴾ واتــە: ئەوەی ئاشــکراو نهێنیــە ﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا ﴾ واتــە: ڕازی بــووم‌و هەڵمبــژاردوە کە ئیســلام ئاینتــان بێت، وەک چــۆن ئێوەش پێــی ڕازی بوون، دەی هەســتن ســوپاس‌و ستایشــی خوا بکەن کە منەتی کردوە بەســەرتاندا بە باشــترین‌و بەرێزتریــن‌و تەواوترینی نێــو ئاینەکان.

﴿ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ ﴾واتــە: ناچــاری تەنگی پــێ هەڵچنی بــە خواردنی ئــەو قەدەغەکراوانەی کە لە پێشــەوە باســمان کرد، لە فەرمــوودەی: ﴿ حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ ﴾.

﴿ فِي مَخۡمَصَةٍ ﴾ واتــە: لــە برســێتیدا، ﴿ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ ﴾ واتە: (بێ ئــەوەی ئارەزووی گونــاه کردنــی هەبێــت) واتــە: لێی نەخــوات هەتــا ناچار دەبێــت، وە بە قــەد پێویســت نەبێ زیاتــر نــە خــوات، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ کــە لــەو بارودۆخــەدا ڕێگای بــە خواردنی داوە، وە بــە میهرەبانــی خــۆی لێــی خــۆش دەبێــت بــە پێی ئــەوەی کە نیــازو نیەتی لەســەر دامــەزراوە، بەبــێ کــەم‌و کورتیەک کــە زیان بــە ئاینەکــەی بگەیەنێت.

(٤): ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ٤ ﴾.

خــوا ﷻ بــە پێغەمبەرەکــەی موحەممــەد ﷺ دەفەرمــوێ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡ ﴾؟ (پرســیارت لێدەکــەن چیــان بۆ حەڵاڵ کــراوە) واتە: لــە خواردەمەنیەکانــدا، ﴿ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ﴾ بریتیــە لــە هەمــوو ئەوانە ســوودو قازانجی هەبێت، یــان تام چێــژی هەبێت، بەبێ ئــەوەی زیانــی هەبێت بۆ جەســتەو عەقــڵ. هەمــوو خواردەمەنیــەکان دەگرێتەوە لــە دانەوێڵەو بەروبومــەکان ئەوانــە کــە لە لادێ‌و لــە دەشــتەکان دەچێنرێــن، وە هەموو گیاندارانی دەشــت

جگــە لەوانــەی کە خــوا جیــای کردونەتەوە لــە دڕندەو ئەوانەشــی کە پیســن. وە لەبــەر ئەمە تێگەیشــتن لە دەقەکەدا ئەوە دەســەلمێنێت کە شــتە پیســەکان حەرامو قەدەغــەن، وەک چۆن دەقەکــە بــە ڕوونــی ئامــاژەی پــێ دەکاتو دەفەرمــوێ: ﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ الأعـراف.﴿ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ ﴾ واتــە: حــەڵاڵ کــراوە بــۆ ئێــوە، هــەر یەکە لــە باڵنــدەو تانجیو ســەگ ڕاوتان بۆ بکــەن، کە فێــری ڕاوتــان کردوون، هەتــا کۆتایــی دەقەکە.

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر چەند شتێک:

یەکــەم: ســۆزو میهرەبانی بەرانبــەر بە بەندەکانــی، وەک چــۆن ڕێگاکانی حەڵاڵی بــۆ فراوان کــردوون، وە بۆیانــی حــەڵاڵ کــردوە ئەو نێچیرانــەی کە ســەریان نەبڕیونو ســەگو تانجیە ڕاوکەرەکانیــان بریندارییــان کــردوون. وە مەبەســت لــە (الجــوارح): ســەگو، پڵنــگو بازو هاوشــێوەیانە، ئــەوەی کــە بــە دەنوکــی ڕاو دەکات یان بــە چڕنووکی.

دووەم: مەرجــە ئەوانــەی ڕاویــان پــێ دەکــەن فێــری ڕاوکــردن کرابن، بــەو شــێوەی کە لە دابو نەریتــدا پێــی دەوترێــت فێر کــردن، بەوەی ئەگەر هانیــدا بە دەمیەوە بچێــت، وە ئەگەر ترســاندی بترســێت، وە ئەگــەر نێچیرەکــە بگرێــت نەیخــوات، بۆیە دەفەرمــوێ: ﴿ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ ﴾ واتــە: ئــەو نێچیــرە لــە بــەر ئێــوە بگــرن، وە ئەگــەر بریندارکەرەکــە (ســەگ یــان تانجی) لێــی خــوارد نازانرێت ئایا بــۆ خۆی ڕاوی کــردوە یان بــۆ خاوەنەکــەی، وە ڕەنگە بــۆ خــۆی ڕاوی کردبێت.

سێیەم: بــە مــەرج دانانــی ئەوەی کە ســەگ برینــداری بکات یــان باڵنــدە: لەبەر ئەم ڕستەیە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ ﴾ لەگــەڵ ئــەوەی کــە لە پێشــەوە باســکرا لە حــەرام بوونی خنکێنراو. ئەگەر ســەگ بیخنکێنێت، یان جگە لە ســەگ، یان بە قورســایی خۆی کوشــتبێتی، حــەڵاڵو ڕەوا نیــە. لەگــەڵ ئەوەشــدا (بریندارکــەرەکان) بە کەڵپەکانیــان نێچیرەکــە بریندار دەکــەن، یــان بە چڕنوکەکانیــان. ئەوەی کە ڕوونو دیارە بەڕاســتی (الجــوارح) بریندارکەر بە واتــای بە دەســتهێنەر دێــت، واتە: ئەوانــەی ڕاو دەکەنو شــارەزان لێــی. دەقەکــە نابێتە بەڵگە بــۆ ئەمە. خــوا زاناترە.

چــوارەم: دروســتە ســەگ ڕابگیرێــت بــۆ ڕاوکــردن، وەک چۆن لــە فەرمــوودەی صەحیحدا هاتــوە، لەگــەڵ ئــەوەی کە ڕاگرتــنو بە خێوکردنی ســەگ حەرامــە، بەڵام لەبــەر ئەوەی کە دروســتە فێــر بکرێت بــۆ ڕاو کردن، بــە هەمان شــێوەیش دروســتە ڕابگیرێت.

پێنجەم: پاکی ئەو شوێنە دەمی سەگی بەر دەکەوێت لە کاتی ڕاوکردندا، چونکە خوا ڕێگای پێداوە، وە باس لە شۆردنی ناکات، کەواتە بەڵگەیە لەسەر پاکێتی.
شەشەم: بەڵگەیە لەسەر گەورەیی زانست، چونکە بریندارکەری فێرکراو-بە هۆی زانستەکەیەوە-ڕێگە دراوە ڕاوی پێ بکرێت، بەلآم ئەوەی کە فێر نەکراوە ڕێگە نەدراوە ڕاو بکات.
حەوتەم: سەرقاڵ بوون بە فێر کردنی سەگ، یان باڵندە، یان هاوەشێوەیان، سەرزەنشت نەکراوە، وە لە شتە پووچو بێ ماناکان نیە، بەڵکو ئەوە کارێکی پێویستە، چونکە ئامرازێکە بۆ حەڵاڵ بوونی ڕاوو سوود وەرگرتن لێی.
هەشتەم: بەڵگەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ڕێگەیان داوە بە فرۆشتنی سەگ، دەڵێ: لەبەر ئەوە نێچیرەکە بەدەست ناهێنێت مەگەر بەوە نەبێت (واتە: بە سەگ نەبێت).
نۆیەم: ئاماژەیە بۆ بە مەرج گرتنی وتنی: (بسم الله الرحمن الرحيم) واتە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە)، وە ئەگەر بە ئەنقەست ناوی خوا نەهێنێت ڕەوا نیە ئەو نێچیرەی کە بریندارکەرەکە ڕاوی کردوە بخورێت.
دەیەم: دروستە خواردنی ئەو نێچیرەی کە بریندارکەرەکە ڕاوی کردوە، یەکسانە ئەگەر بریندارکەرەکە کوشتبێتی، یان نەیکوشتبێ. وە ئەگەر خاوەنەکەی گەیشت بە نێچیرەکە، بەلآم نێچیرەکە گیانی تیا مابوو ئەوە حەڵاڵ نیە بۆی مەگەر سەری ببڕێ.
پاشان خوای دادگەر هانی (مرۆڤەکانی) داوە لە سەر تەقواو خۆپارێزی، وە ئاگاداری کردوونەوە بە لێپرسینەوە لە ڕۆژی دوایی، بە ڕاستی هاتنی قیامەت زۆر نزیکە، دەفەرموێ: ﴿ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴾ (واتە: وە پارێز لە خوا بکەن، بێگومان خوا لێپرسینەوەی خێرایە).
(٥): ﴿ الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَطَعَامُ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حِلٌّ لَكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَهُمْ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَافِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِي أَخْدَانٍ وَمَنْ يَكْفُرْ بِالْإِيمَانِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ ۝٥ ﴾:
﴿ الْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ ﴾ خوا ﷻ لەبەر ئەوە حەڵاڵ کردنی پاکو خاوێنەکانی دووبارە کردۆتەوە بۆ ئەوەی منەت بکات بەسەر بەندەکانیدا، وە بانگی بەندەکانی بکات بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەنو زۆر یادی بکەن، چونکە ڕێگەی بەو شتانە داوە کە

پێویستی بەندەکانی پردەکاتەوە، وە بە هۆی شتە پاکو خاوێنەکانەوە سوودو قازانج بە دەست دەهێنن ﴿وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ﴾ واتە: سەربڕینەکانی جوولەکەو گاور حەڵاڵە بۆ ئێوە -ئەی مسوڵمانان- جگە لە بێبڕواکانی تر، چونکە سەربڕینی سەربڕاوەکانیان حەڵاڵ نیە بۆ مسوڵمانان. لەبەر ئەوەی خاوەن کتێبەکان دەدرێنە پاڵ پێغەمبەرانو کتێبە ئاسمانیەکان. وە بەڕاستی پێغەمبەران یەکدەنگن لە سەر ئەوەی کە سەربڕین بۆ غەیری خوا حەرامە، چونکە شیرکو هاوبەش دانانە. جوولەکەو گاورەکان لە ڕوانگەی دینەوە پێیان وایە کە سەربڕین بۆ غەیری خوا نادروستو قەدەغەیە، ئا لەبەر ئەوەیە ڕێگە دراوە بە سەربڕاوەکانیان جگە لە ئەوانی تر.

وە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە مەبەست لە خواردنەکانیان: سەربڕاوەکانیانە، بەڕاستی ئەو خواردەمەنیەی کە لە سەربڕاوەکان نیە، وەک دانەوێڵەو بەروبوومەکان، خاوەن کتێبەکان هیچ تایبەتمەندیەکیان تێدا نیە، بەڵکو ڕەوایە بۆ ئەوان، وە ئەگەر خواردنەکە لە غەیری ئەوان بووایە. وە هەروەها خواردنی داوەتە پاڵ ئەوان (واتە: پاڵ جوولەکەو گاور) ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مەبەست پێی خواردەمەنیە، بە هۆی سەربڕینیانەوە. وە ناوترێ: ئەوە بۆ خاوەندارێتیە، وە بەڕاستی مەبەستی ئەوەیە: ئەو خواردنەی کە خاوەنداری دەکەن، چونکە ئەمە دروست نیە لە ڕێگەی داگیرکاریەوە، بە تایبەت لە لایەنی مسوڵمانانەوە.

﴿وَطَعَامُكُمْ﴾ ئەی مسوڵمانان! (خواردنەکانی ئێوە) ﴿حِلٌّ لَّهُمْ﴾ (بۆ جوولەکەو گاورەکان حەڵاڵە) واتە: حەڵاڵە بۆ ئێوە کە خواردنیان پێ بدەن ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ واتە: حەڵاڵە بۆ ئێوە ئافرەتانی ئازادی داوێن پاک ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ واتە: لە جوولەکەو گاورەکان. وە ئەم دەقە تایبەت کراوە بە فەرموودەی خوای گەورە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ﴿٢٢١﴾﴾البقرة.

وە تێگەیشتن لە دەقەکە، ڕەوا نیە بۆ پیاوە ئیماندارە ئازادەکان کەنیزەکەکان مارە بڕن، ئەویش بە هەمان شێوە، بەڵام بۆ خاوەن کتێبەکان لە هەموو حاڵەتەکاندا ڕێگە پێنەدراوە، وە دروست نیە بۆ پیاوە ئازادەکان مارە بکرێن، لە بەر فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴿٢٥﴾﴾النساء. بەڵام ئەو ئافرەتانەی کە کەنیزەکن ئەوە بۆ پیاوانی ئازاد نیە مارەیان ببڕێت تەنها بە دوو مەرج نەبێ: دەست نەڕۆیو هەژاری، لەوە بترسێ تووشی گوناە ببێ، بەڵام ئافرەتانی خراپەکارو داوێن پیس دروست نیە هاوسەرگیریان لەگەڵدا بکرێت، یەکسانە ئەگەر مسوڵمان بن، یان خاوەن کتێب بن، هەتا تەوبە دەکەن،

خوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً ﴿٣﴾﴾النور.
وە دەفەرمـوێ: ﴿إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾واتـە: حەڵاڵمـان کردوە بۆتـان مارەکردنیان، بە مەرجـێ مارەییەکەیـان پـێ بـدەن. هـەر کەسـێک کە جەخـت بکاتەوە لە سـەر ئـەوەی کە مارەیـی نـادات ئـەوە بێگومـان بـۆی حـەڵاڵ نابـێ. وە فەرمانـی کـردوە پێی بـدرێ ئەگەر ئافرەتەکـە ژێـر بوو شایسـتەی ئەوە بـوو مارەییەکـە بدرێتە دەسـتیەوە، وە ئەگەرنـا دەدرێت بـە دەسـت سەرپەرشـتیارەکەیەوە. وە دانـە پاڵـی مارەیـی بـۆ لای ئافرەتـان بەڵگەیە لە سـەر ئـەوەی کە سـەرجەم ئـەو مارەییـە موڵکـی ئافرەتەکەیە، وە بەشـی هیچ کەسـێکی تێـدا نیە، مەگـەر خـۆی شـتێ بدا بـە مێردەکەی، یـان بیدا بـە سەرپەرشـتیارەکەی، یان هەر کەسـێکی تر.
﴿مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ﴾ واتـە: ئێـوە دەبـێ داوێـن پـاک بـن، وە داوێـن پیـس نەبن بـە ئاشـکرا جگە لـە ژنەکانتـان نەچنە لای هیـچ ژنێکـی تـرەوە ﴿غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ﴾ واتە: لەگـەڵ هەمـوو کەسـێکدا زینـا دەکـەن، ﴿وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخْدَانٍ﴾ واتـە:ئەویـش بریتیـە لـە زیناکـردن لەگـەڵ دۆسـتەکاندا (واتـە: دۆسـتی ژێـر بە ژێـری هەبـێ)، چونکـە زینا لە سـەردەمی نەفامیـدا بـەو شـێوە بوو کـە هەندێکیان زینـای لەگەڵ هەمـوو کەسـێکدا دەکرد، ئەمە پێی دەوترا (المسـافح). هەندێکیشـیان تەنهـا زینایان لەگەڵ خۆشەویسـتەکانیاندا دەکرد. وە خـوای گـەورە هەواڵی داوە کـە ئەوانە هەمووی پێچەوانـەی داوێن پاکیە چونکە بەڕاسـتی مەرجـی هاوسـەرگیری ئەوەیـە کـە پیاو داوێـن پاک بـێ لە زینا کـردن، وە خـوای گەورە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ﴾ واتە: هەر کەسـێک کوفر بە خوا ﷻ بـکات وە ئـەوەی پێویسـتە لـە بڕواهێنـان پێـی لـە کتێبەکانـیو پێغەمبەرانی یان شـتێک لە شـەریعەتەکانی، ئـەوە بێگومـان کردەوەکانـی هەڵدەوەشـێتەوە، بـە مەرجێ لە سـەر بێبڕوایی بمرێ، وەک خـوای پەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ ﴿٢١٧﴾﴾البقرة.
لـە کۆتایـی دەفەرمـوێ: ﴿وَهُوَ فِي ٱلْأٓخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ واتـە:ئەوانـە کـە زیانیـان داوە لە نەفـسو ماڵو سـامانو کـەسو کاری خۆیان لـە ڕۆژی دواییدا، وە ڕیسـوایی هەتـا هەتاییان بـە دەسـت هێنا.


يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ
وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ
وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ
وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ
ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا
طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ
لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ
وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦
وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم
بِهِۦٓ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ
بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ
لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ
أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ
ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ٨ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٞ ٩

(٦): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦ ﴾

بە ڕاستی ئەم دەقێکی گەورەیەو فەرمانو بڕیاری زۆر لە خۆ دەگرێت، ئەوەی خوای گەورە ئاسانی کردوە باسی دەکەین:

یەکەم: ئەمانەی کە باسکراوە فەرمانبەرداری تێدایە، وە کار پێکردنی لە پێویستیەکانی ئیمانەوەیە، ئیمان تەواو نابێت بە جێبەجێ کردنی ئەمانە نەبێت، چونکە بەوە دەستی پێکردوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ هەتا کۆتایی. واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە کار بکەن بە پێی پێویستی ئیمانەکەتان، بەوەی کە بۆمان داناون.

دووەم: فەرمان کردن بە بەرپا کردنی نوێژ، وەک دەفەرموێ: ﴿ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴾.

سێیەم: فەرمان کردن بە نیەت هێنان بۆ نوێژ کردن لەبەر ڕستەی: ﴿ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴾ واتە: بە مەبەستو نیەتی نوێژ کردن.

چوارەم: بە مەرج دانانی پاکو خاوێنی بۆ ڕاستیو دروستی نوێژ، چونکە خوای گەورە فەرمانی پێ کردوە، لە کاتی ئەنجامدانی نوێژ، ئەصڵو بنەماش لە فەرمانکردندا بۆ پێویست بوون (واجب)ە.

پێنجەم: دەست نوێژ گرتن پێویست نابێت بە چوونە ناو کاتەکەوە، بەڵکو

پێویسـت دەبێـت کـە هەسـتێت بـۆ نوێـژ.
شەشـەم: هـەر شـتێک نـاوی نوێـژی لێنـرا لـە فـەرزو سـوننەتو فـەرزی کیفایـەو نوێـژی جەنـازە، مەرجـە دەسـتنوێژی بـۆ بگیـرێ، تەنانـەت کرنـووش بردنیـش لـە لای زۆربـەی زانایـان، وەک سـوجدەی قورئـان خوێنـدنو سوپاسـگوزاری.
حەوتـەم: فەرمـان کـردن بـە شـۆردنی ڕووخسـار، سـنووری ڕووخسـار: لـە کۆتایـی مـووی پێشەسـەر هەتـا کۆتایـی چەناگـە بـە درێـژی، وە لـە نێـوان هـەردوو گوێـدا بـە پانـی، وە دەچێتـە ئـەم چـوار چێوەیـەوە ئـاو لـە دەم هەڵـدانو ئـاو لـە لـووت هەڵـدان بـە بەڵگـەی سـوننەت، وە هەروەهـا ڕیشـیش دەبـێ بشـوردرێت، بـەڵام بـە مەرجـێ تەنـک بێـتو ئـاو بگـات بـە پێسـتەکەی. وە ئەگـەر ڕیـش پـڕ بـوو ئـەوە تەنهـا ڕووکەشـی دەشـۆرێت.
هەشـتەم: فەرمـان کـردن بـە شـۆرینی دەسـتەکان، کـە سـنووری هـەردوو دەسـت هەتـا ئانیشـکەکانە، وە (إلـی) وەک چـۆن زۆرینـەی توێژەرەوانـی قورئـان دەڵێـن: بـە واتـای (مـع) دێـت، واتـە: لەگـەڵ ئانیشـکدا، وەک دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۝٢﴾ النسـاء. وە لەبـەر ئـەوە واجـب تـەواوو کامـڵ نابێـت هەتـا هەمـوو ئەنیشـکەکان نەشـۆردرێ.
نۆیەم: فەرمان کردن بە مەسح کردنی سەر.
دەیـەم: وە پێویسـتە هەمـوو سـەر مەسـح بـکات، چونکـە (بـ) لـە دەقەکـەدا بـۆ هەنـدێ نیـە، بەڵکـو بـۆ نووسـاندنە، ئەویـش مانـای ئـەوە دەدات کـە هەمـوو سـەر مەسـح بکرێت.
یازدەیـەم: دروسـتە بـە چـی شـێوازێک بیەوێـت مەسـحی بـکات، بـە هـەردوو دەسـتی بێـت، یـان بـە دەسـتێکی، یـان بـە پەڕۆیـەک یـان بـە دارێـک، چونکـە خـوای گـەورە سـڕینی (مەسـح)ی بـە ڕەهایـی هێنـاوەو بەنـددار (قیـد)ی نەکـردوە بـە سـیفەتێکەوە، ئـەوەش بەڵگەیـە لەسـەر ڕەهایـی مەسـح کـردن.
دوازدەیـەم: ئـەوەی کـە پێویسـتە مەسـح کردنـە، ئەگـەر سـەری بشـۆرێ دەسـت نەهێنێت بـە سـەریدا، بـەس نیـە، چونکـە ئـەوەی ئەنجـام نـەداوە کە خـوا فەرمانـی پـێ دەکات.
سـێزدەیەم: فەرمانکـردن بـە شـۆردنی قاچـەکان هەتـا قاپەڕەقـە (گۆزینـگ)، ئـەوە لـە هـەردوو دەسـتدا چ وتـراوە، لـە قاچەکانیشـدا بـەو شـێوەیە.
چواردەیـەم: وەڵامێکـە بـۆ شـیعە (رافضـة) لـە سـەر خوێندنـی زۆربـەی زانایـان بـە

(نصـب)، وە بـە ڕاسـتی دروسـت نیـە (پێیەکانـی) مەسـح بـکات لەبـەر ئـەوەی کـە بـە دەرەوەیـەو دیـارە.

پازدەیـەم: ئاماژەیەکـی تێدایـە بـۆ دەسـت مەسـح کـردن بەسـەر دوو خوفـدا لەسـەر خوێندنـی (الجـر) لـە وشـەی: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ﴾ ئەگـەر بـەم شـێوە ڕاڤـە بکرێـت هـەر یـەک لـەو دوو خوێندنەوەیـە مانـای تایبەتـی خـۆی دەگەیەنێـت، لەسـەر خوێندنـەوە بـە (النصـب) دەیشـۆرێت ئەگـەر پێیەکانـی بـەدەرەوە بـوو. وە لەسـەر خوێندنـەوە بـە (الجر) تەنهـا دەسـتی تـەڕی پێـدا دەهێنێـت ئەگـەر داپۆشـرابوون.

شـازدەیەم: فەرمـان کـردن بـە ڕیزبەنـدی لـە دەسـت نوێـژدا، لەبـەر ئـەوە خـوای گـەورە بـە ڕیـز بـە دوای یەکتـردا باسـی کـردوە. وە لەبـەر ئـەوە مەسـح کردنـی خسـتوەتە نێـوان دوو شـۆردنەوە، وە نازانـرێ سـوودەکەی چیـە جگـە لـە ڕیـز بەنـدی نەبێـت.

حەڤدەیـەم: ڕیزبەنـدی تایبەتـە بـە چـوار ئەندامـی جەسـتە کـە لـە دەقەکـەدا ئامـاژەی پێکـراوە. بـەڵام ڕێکخسـتن لـە نێـوان ئـاو هەڵـدان لـە دەمو لـووتو ڕوخسـار، یـان ڕاسـتو چـەپ لـە نێـوان دەسـتو پێیەکانـدا، پێویسـت (واجـب) نیـە. بەڵکـو سـوننەت وایـە ئـاو هەڵدانـە دەمو لـووت پێـش بخرێت بەسـەر شـۆردنی ڕووخسـاردا. وە پێشخسـتنی ڕاسـت بەسـەر چەپـەوە لـە دەسـتو پێیەکانـدا. وە پێشخسـتنی مەسـحی سـەر بەسـەر مەسـحی گوێـدا.

هەژدەیـەم: فەرمانکـردن بـە تازەکردنـەوەی دەسـت نوێـژ بـۆ هەمـوو نوێژێـک، لەبـەر ئـەوە وێنـای فەرمـان پێکـراو ببینرێـت.

نۆزدەیەم: فەرمان بە خۆشوردنو غوسڵ دەرکردن لە کاتی لەش گرانی.

بیسـتەم: پێویسـتە خۆشـۆردنەکە هەمـوو جەسـتە بگرێتـەوە، چونکـە خـوا پـاکو خاوێنی داوەتـە پـاڵ جەسـتە، وە هیـچ بەشـێکی جەسـتەی تایبـەت نەکـردوە بەسـەر بـە شـێکی تـردا.

بیستو یەک: فەرمان کردن بە شۆردنی دەرەوەو ناوەوەی موو لە جەنابەتدا.

بیسـتو دوو: بەڕاسـتی بـێ دەسـتنوێژی دەکەوێتـە نـاو لـەش گرانیـەوە لـە کاتـی خـۆ شـۆردندا، تەنهـا ئەوەنـدە بەسـە نیـەت بهێنێـتو پاشـان هەمـوو جەسـتەی بشـۆرێت، چونکـە خـوای گـەورە تەنهـا باسـی خۆپاککردنـەوەی کـردوە، باسـی ئـەوەی نەکـردوە کـە دەسـت نوێژەکـەی دووبـارە دەکاتـەوە.

بیســتو ســێ: مــرۆڤ لــە کاتێکــدا لەشــی گــران دەبێــت کــە مەنــی بێتــەدەر، بــە ئاگــا بێــت، یــان خەوتبێــت، بــەڵام لــە کاتــی جــووت بــوون لەشــی گــران دەبــێ ئەگــەر چــی مەنیشــی نەیەتــە دەر.

بیســتو چــوار: هــەر کەســێک خــەوی بینــی، یــان هــات بــە بیریــدا کــە لەشــی گــران بــووە، بــەڵام هیــچ تەڕاییەکــی نەبینــی، ئــەوە خۆشــۆردنی لەســەر نیــە، چونکــە جەنابــەت نەهاتوەتــە جــێ.

بیســتو پێنــج: یادخســتنەوەی منەتــی خــوای گــەورە بەســەر بەندەکانیــەوە، بــە ڕێگــە پێدانــی تەیەممــوم کــردن. بیســتو شــەش: لــە هۆکارەکانــی ڕەوابوونــی تەیەممــوم، بوونــی نەخۆشــیە کــە بــە خۆشــۆردن زیانــی پــێ بگــات، ئــەوە لــەم حاڵەتــەدا دروســتە تەیەممــوم بــکات.

بیســتو حــەوت: لــە کــۆی ئــەو هۆکارانــەی دەبنــە مایــەی ڕەوایەتیــدان بــە تەیەممــوم بریتیــە لــە: گەشــتو ســەفەر، دەرچــوون لەســەر ئــاو، ئەگــەر ئــاو نەبــوو، بــەڵام بــۆ نەخــۆش دروســتە تەیەممــوم بــکات لەگــەڵ بوونــی ئــاودا، چونکــە بــە خۆشــۆردن زیانــی پــێ دەگــات، وە بــۆ ئەوانــی تــر دروســتە ئەگــەر ئــاو نەبــوو، ئەگــەر چــی لــە شــوێنی خۆیانیــش بــن.

بیســتو هەشــت: هەمــوو ئەوانــەی دەردەچــن لــە پێــشو پاشــەوە لــە میــزو باشــەڕۆ دەســتنوێژ دەشــکێنێت. بیســتو نــۆ: ئەوانــەی کــە پێیــان وایــە جگــە لــەوەی لــە پێــشو پاشــەوە دەردەچێــت، دەســتنوێژی پێناشــکێت، دەســتنوێژ بــەوە ناشــکێنن ئەگــەر دەســتیان بــەر عەورەتیــان بکەوێــت، وە نــە بەهاوشــێوەی ئــەوەش.

ســیەم: بــاش وایــە بــە کینایــەو کنــارە بــاس لــەو شــتانە بکرێــت کــە مــرۆڤ قێــز دەکاتــەوە نــاوی بێنــێ، لەبــەر فەرمایشــتی خــوا ﷻ ﴿ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ ﴾.

سی‌و یەک: دەست بەرکەوتنی ئافرەت بە چێژو ئارەزووەوە، دەستنوێژ دەشکێنێت.

سی‌و دوو: نەبوونی ئاو مەرجە بۆ ڕەوا پێدان بە تەیەممومم.

ســیو ســێ: ئەگــەر کەســەکە لــە نــاو نوێــژدا بــوو، وە ئاویــش بوونــی هەبــوو، تەیەمموم‌مەکــەی بــە تــاڵ دەبێتــەوە، چونکــە خــوای گــەورە لــە کاتێکــدا ڕێگــای پێیــداوە کــە ئــاو نەبێــت.

ســیو چــوار: ئەگــەر چــووە نــاو کاتــی نوێــژەوە ئــاوی پێنەبــوو، ئــەوە پێویســتە لــە

دەورو بـەری خۆیـدا بـە دوای ئـاودا بگەڕێـت، چونکـە ناوترێـت: (لـم یجـد) واتـە: دەسـتی نەکـەوت ئەگـەر بـە دوای ئـاودا نەگەڕێـت.
سـیو پێنـج: ئەگـەر ئـاوی دۆزیـەوە بەشـی پێویسـتی نەدەکـرد، ئـەوە پێویسـتە بـەکاری بهێنێـتو پاشـان تەیەممـوم بـکات.
سـیو شـەش: ئاوێـک تێکـەڵ کرابێـت بـە شـتی پـاک، پێـش دەخرێـت بەسـەر تەیەممـودا، واتـە: دەبێتـە پاککـەرەوە، چونکـە ئـاوی گـۆڕاو ئـاوە، دەچێتـە چـوار چێوەی ڕسـتەی: ﴿ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً ﴾.
سـیو حـەوت: بەڕاسـتی لـە تەیەمموممـدا نیـەت پێویسـتە، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَتَيَمَّمُواْ ﴾ واتـە: مەبەسـتو نیازتـان تەیەممـوم کـردن بێـت.
سـیو هەشـت: ئـەوەی بەسـەر ئەرزەوەیـە بەسـە بـۆ تەیەممـوم کـردن، لـە خـۆڵو هاوشـێوەی. ئـەو کات ئەمـە لەسـەر وتـەی ئـەو ﴿ فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ ﴾ یـان زۆرینەیـە، واتـە: دەبـێ تەیەممـوم کـردن زۆربـەی بـە خـۆڵو تـۆز بێـت، ڕووخسـارو هـەردوو دەسـتی پـێ دەکرێـت. یـان بـۆ هاندانـە بـۆ باشـتر، ئەویـش ئەوەیـە ئەگـەر بکرێـت تـۆزی پـاک دەسـتبکەوێت ئـەوە باشـترە.
سـیو نـۆ: دروسـت نیـە تەیەممـوم کـردن بـە خۆڵـی پیـس، چونکـە خاوێـن نیـە، بەڵکو پیسە .
چـل: لـە تەیەممومـدا تەنهـا ڕوخسـارو هـەردوو دەسـت مەسـح دەکرێـت، بێجگـە لـە ئەندامەکانـی تـری جەسـتە. چـلو یـەک: بـە پێـی ڕسـتەی: ﴿ بِوُجُوهِكُمْ ﴾ هەمـوو ڕووخسـار دەگرێتـەوە، بـەڵام خـۆڵ کردنـە نـاو دەمو لـووتو گـوێ هەرچەنـدە کـەم بێـت دروسـت نیـە، چونکـە ئەمانـە لـە لایـەن خـواوە لێبوردنـی لەسـەرە. چـلو دوو: دەسـتەکان مەسـح دەکرێـن هەتـا مەچـەک، چونکـە بـە گشـتی بـەوە دەوترێـت دەسـت.
چـلو سـێ: ئەگـەر بکرێتـە مـەرج مەسـح کـردن هەتـا ئەنیشـکەکان، ئـەوە خـوای گـەورە کـۆتو قەیـدی دەکـرد وەک چـۆن لـە دەسـتنوێژدا کـۆتو قەیـدی کـردوە هەتـا ئەنیشـکەکان، دەقەکـە گشـتگیرە بـۆ ڕەوایەتـی دانـی دروسـتی تەیەممـوم لـە هەمـوو ئەوانـەی کـە بەسـەر بەنـدەدا دێـت، لـە بـێ دەسـتنوێژیو لـەش گرانـی، بەڵکـو بـۆ پیسـی جەسـتەش، چونکـە خـوای گـەورە لـە بـری ئـاو دایناوە، وە دەقەکـەی بـە ڕەهایـی هێنـاوەو بەنـدداری نەکـردوە، وە وتـراوە پیسـبوونی جەسـتە نـا چێتـە چـوار

چێـوەی حوکمـی تەیەمـوم، چونکـە دەقەکـە لـە میانـەی بـێ دەسـتنوێژیو لـەش گرانیدا هاتـووە ئـەوەش بۆچوونـی زۆربـەی زانایانـە.

چـلو چـوار: بێگومـان شـوێنی تەیەممـوم کـردن لـە بـێ دەسـتنوێژیو لـەش گرانـی بریتیـە لـە ڕووخسـارو دەسـتەکان.

چـلو پێنـج: ئەگـەر نیـەت بـۆ هـەردوو بـێ دەسـتنوێژیەکە بهێنێـت، ئـەوە بێگومـان دروسـتە، بـە کار کـردن لـە کـۆی گشـتیو ڕەهایـی دەقەکـە.

چـلو شـەش: دروسـتە مەسـح کـردن بە هـەر شـتێک بێـت، بە دەسـتی یـان هاوشـێوەی، چونکـە خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿فَٱمۡسَحُواْ﴾ نەیفەرمـووە ئـەوەی کـە مەسـحی پـێ دەکـەن، دەی کەواتـە بەڵگەیـە لەسـەر دروسـتی مەسـح کـردن بـە هەمـوو جـۆرێ.

چـلو حـەوت: بـە مـەرج گرتنـی ڕیزبەنـدی لـە خـۆ پـاک کردنـەوە لـە تەیەممومـدا، وەک چـۆن لـە دەسـتنوێژ گرتنـدا بـە مـەرج گیـراوە، وە لەبـەر ئـەوە خـوا بـە مەسـح کردنـی ڕووخسـار دەسـتی پێکـردوە پێـش مەسـحی هـەردوو دەسـتەکان.

چـــلو هەشـــت: خـــوای گـــەورە لـــەو شـــەریعەتەی کـــە بـــۆ ئێمـــەی دانـــاوە، هیـــچ نارەحەتیـەکو بارگرانیەکـی لەسـەر دانەناویـن بەڵکـو ئـەوە میهرەبانیەکـە لـە لایـەن خـواوە بـۆ بەندەکانـی، لەبـەر ئـەوەی پاکیـان بکاتـەوەو نـازو نیعمەتەکانـی خـۆی بڕێژێـت بەسـەریاندا.

چـلو نـۆ: پـاک ڕاگرتنـی ڕواڵـەت بـە ئـاوو بـە خـۆڵ، تـەواو کـەری پاککردنـەوەی ناخـە بـە یەکتاپەرسـتیو تەوبـەی ڕاسـتەقینە.

پەنجـا: بـە ڕاسـتی پاکـی تەیەممـوم، ئەگـەر چـی پـاکو خاوێنـی تێـدا بـەدی ناکـرێو هەسـتی پـێ ناکـرێو نابینـرێ، وە پاکیەکـی مەعنـەوی لـە خـۆ دەگرێـت کە لـە جێبەجێ کردنـی فەرمانـی خـواوە سـەرچاوەی گرتـوە.

پەنجـاو یـەک: پێویسـتە لەسـەر مـرۆڤ کـە ورد ببێتـەوە لـە نهێنـی شـەریعەتی خـوا لـە پـاکو خاوێنـیو هاوشـێوەکانیدا، لەبـەر ئـەوە زانسـتو زانیـاری زیـاد بـکات، وە بـە هەمـان شـێوە سوپاسـگوزاریو خۆشەویسـتی بـۆ خـوا زیاتـر ببێـت، لەسـەر ئـەو شـەریعەتو بڕیارانـەی کـە بەنـدە دەگەیەنێـت بـە بەرزتریـن پلـەو پایـە.

(٧): ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٧﴾:

کــە دەفەرمــوێ: ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ ﴾خــوا ﷻ فەرمــان بــە بەندەکانــی دەکات یــادی نیعمەتــە دینــیو دنیاییەکانــی بکەنــەوە، بــە دڵو زمانیــان، چونکــە بــەردەوام بوونــی (مــرۆڤ) لەســەر یادکردنــەوەی نیعمەتــەکان، بەڵگەیــە لەســەر سوپاســگوزاری خــواو خۆشویســتنی، وە پــڕ بوونــی دڵ لــە چاکــەو چاکەکاریــی، وە سەرســام نەبــوون بــە خــۆی، بــە هــۆی ئــەو نیعمەتــە ئاینــیو فــەزڵو چاکــە زۆرانــەی خــوای گــەورەوە.

﴿وَمِيثَٰقَهُ ﴾ واتــە: یــادی پەیمانەکــەی بکــەن ﴿ٱلَّذِي وَاثَقَكُم بِهِۦٓ ﴾ واتــە:ئــەو پەیمانــەی کــە لێــی وەرگرتــن. مەبەســت ئــەوە نیــە تەنهــا بــە وشــەو زمــان پەیمانیــان وەرگرتبێــت، بەڵکــو مەبەســت ئەوەیــە، لــە پــاش بڕواهێنــان بــە خــواو پێغەمبــەر ﷺ پابەندبــوونو گوێڕایەڵییــان کردبێــت، وە دەفەرمــوێ: ﴿إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ ﴾ واتــە: بیســتمان ئــەو بانگــەوازەی کــە بانگــی ئێمــەت بــۆ لای کــرد، بیســتنێکی ڕاســتەقینە، گوێڕایەڵــی فەرمانەکانــت بوویــنو جێبەجێمــان کــرد، وە ئــەوەی کــە قەدەغــەت لێکردوویــن لێــی دوورکەوتینــەوە، بــە ڕاســتی ئەمــە گشــتگیری ئاینــی ئیســلام لــە خــۆ دەگرێــت، لــەوەی کــە ئاشــکرایەو لــەوەی کــە نهێنیــە. بــە ڕاســتی بــڕواداران یــادی خــوا دەکــەن لەســەر ئــەو بەڵێــنو پەیمانــەی کــە لەســەریانە، وە ســوور دەبــن لەســەر جێبەجــێ کردنــی فەرمانــەکان بــە تــەواوی بــە بــێ کــەمو کورتــی.

﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ ﴾ لــە هەمــوو کاتەکانــدا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ واتــە: زانایــە بــەوەی کــە بــە بیــرو هــزرو نهێنــیو ختوورەکانتــان دایــە، دەی خۆتــان بپارێــزن بــەوەی کــە لــە دڵەکانتــان دایــە، لەســەر کارێــک خــوا پێــی ڕازی نەبێــت، یــان شــتێک بکــەن پێــی ناخــۆش بێــت، وە دڵەکانتــان ئــاوەدان بکەنــەوە بــە ناســینو خۆشویســتنی، وە بــە ئامۆژگــاری بەندەکانــی. بــە ڕاســتی ئەگــەر ئێــوە بــەو شــێوەیە بــن، خــوا لــە گوناهەکانتان خــۆش دەبێــتو خێــرو چاکەکانتــان چەنــد قــات بــۆ زیــاد دەکات، چونکــە بــە زانســتی دەزانێــت بــە چاکبوونــی دڵەکانتــان.

(٨): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾:

واتــە: بــەوەی کــە فەرمانیــان پێکــراوە بــە بڕوابــوون پێــی، ئــەوەی ئیمانەکەتان لەســەرتان پێویســت دەکات ئەنجامــی بــدەن، هەتــا بــن بــە ﴿قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ ﴾

گـورج بـن لـە ئەنجامدانـی دادپـەروەری بـە ئاشـکراو نهێنـی. وە دەبـێ ئـەو هەسـتانو ئەنجـام دانـە تەنهـا لەبـەر خـوا بـێ، نـەک بـۆ مەبەسـتێک لـە مەبەسـتەکانی دنیـا. وە دەبـێ ئامانجتـان تەنهـا دادپـەروەری بێـت، نـەک ڕۆچـوونو زێدەڕۆیـی لـە وتـەکانو کردارەکانتانـدا. بـەو دادپەروەریـە هەسـتن لەگـەڵ نزیـکو دوورو دۆسـتو دوژمنـدا. ﴿ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ ﴾بـا هانتـان نەدات ڕقو کینـەی، ﴿ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْ ﴾وەک چـۆن کەسـێک کارێـک دەکات دادپـەروەری تێـدا نەبـێ، بەڵکـو وەک چـۆن شـایەتی بۆ دۆسـتەکانتان دەدەن بـە هەمـان شـێوە شـایەتیش لەسـەریان بـدەن، وە وەک چۆن شـایەتی لەسـەر دوژمنەکەتـان دەدەن بـە هەمـان شـێوە شایەتیشـیان بـۆ بـدەن، ئەگـەر چـی کافـر یـان بیدعەچیـش بێـت، بەڕاسـتی پێویسـتە دادپەروەریـت تێـدا بێـت، وە ڕاسـتی قبـووڵ بکەیـت کـە لـە لایـەن ئـەوەوە بێـت، لەبـەر ئـەوە ڕاسـتە نـەک لەبـەر ئـەوە کـە لـە لایـەن ئـەوەوە هاتـووە، وە هـەر کەسـێک لەبـەر خاتـری کەسـەکە قسـە ڕاسـتەکەش وەرنەگرێـت بـە ڕاسـتی ئـەوە سـتەمکارە.

﴿ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ ﴾واتـە: هەتـا سـووربن لەسـەر دادپـەروەریو هەوڵبـدەن کاری پـێ بکـەن، ئـەوە نزیکتـرە بـۆ خۆپارێـزی دڵەکانتـان، ئەگـەر دادپـەروەری تـەواو بـوو ئـەوە تەقـواو خۆپارێزیـش کامـڵ دەبێـت.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾پاداشـتان دەداتـەوە لەسـەر کردەوەکانتـان، خێـرو چاکـە بێـت، یـان شـەڕو خراپـە، بچـوک بێـت یـان گـەورە، پاداشـتێک لـە ئێسـتادا بێـت یـان لـە داهاتـوودا.

(٩-١٠): ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٞ ٩
وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ١٠ ﴾

واتـە: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ﴾واتـە: ئـەو خوایـە کـە پەیمـان ناشـکێنێ، وە ئـەو ڕاسـتگۆیانەی کە بڕوایـان پێـی هێنـاوە، وە بـە کتێبەکانـیو بـە پێغەمبەرانـیو بـە ڕۆژی دوایی ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾واتـە: لـە واجبـەکانو سـوننەتەکانو، بـە لێخۆشـبوونی تاوانەکانیـان، وە بـە پاداشـتێکی گـەورە کـە کـەس نازانێـت چەنـدە گەورەیـە جگـە لـە خـوا نەبێـت ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٧ ﴾السـجدة.

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡجَحِيمِ (١٠) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ
ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ
فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ
ٱلۡمُؤۡمِنُونَ (١١) ۞وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ
وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗاۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي
مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ
وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا
حَسَنٗا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ
جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ فَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ
مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ (١٢) فَبِمَا نَقۡضِهِم
مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ يُحَرِّفُونَ
ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ
بِهِۦۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٖ مِّنۡهُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۖ
فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ (١٣)

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ﴾ واتـە: کـە بەڵگەیە لەسـەر هەقو ڕاستیەکی ڕوون، ئەوان بە درۆیان خستەوە، پـاش ئـەوەی ڕاسـتیەکان دەرکەوتـوون ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾ واتـە: پەیوەسـتە پێیانـەوە وەک پەیوەسـتی هاوڕێ بـە هاوڕێکەی.

(١١): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ (١١)﴾:

خـوا ﷻ چاکـەو بەهـرە گەورەکانـی خۆی یـادی بەندەکانی دەخاتـەوە، وە هانیان دەدات بـە دڵو بـە زمان یادی بکەنـەوە. وەک چۆن خۆیان بۆ کوشـتنی دوژمنەکانیـان ئامادە دەکەن، وە بردنـی ماڵو سـامانیانو دەسـت گرتـن بەسـەر وڵاتیانداو بە کۆیلـە کردنیـان، دەی با بەو شـێوەیەش یـادی نیعمەتـەکان بکەنەوە، بـەوەی کـە دوژمنی بۆ زەلیـل کـردوون، وە فرتو فێڵەکانیانـی هەڵوەشـاندوەتەوە، بەڕاسـتی ئەوانـە دوژمنـن، وا گومانیـان دەبـرد کـە ئـەوان بە تواناتـرن لـە بـڕواداران، ئەگـەر ئـەوان نەیانتوانی بـێ زیانی گـەورە بـە بـڕواداران بگەیەنن، بێگومـان ئەوە سـەرکەوتنە لە لایەن خواوە بۆ بەندە بروادارەکانی، وە پێویسـتە سوپاسـگوزاری لەسـەر بکـەن، وە بەندایەتـی بـۆ بکـەنو یـادی بکەنەوە، ئەمـە هەمـوو کەسـێک دەگرێتەوە ویسـتبێتی زیـان بـدات لـە بـڕواداران، لـە بێبـڕواو دوو ڕوو لـە سـنوور دەرچـوان، وە خوا بەرگـری لێکـردن لە دەسـتدرێژی ئـەوان، بەڕاسـتی ئەوە دەچێتـە نێو ئـەم دەقەوە.

پاشـان فەرمانیـان پـێ دەکات بـەوەی کـە پشـتی پـێ دەبەسـتن بـۆ سـەرکەوتن بەسـەر دوژمنەکانـدا، وە لەسـەر هەمـوو کاروبارەکانیـان﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ واتە: پشـتی پێدەبەسـتن لە بە دەسـتهێنانی بەرژەوەندیـە دنیایـیو دواڕۆژەکانیـان، وە خۆیان بەری دەکـەن لـە هێـزو توانـای ئەوانـەی کە لـە دەوریانـن، وە لە خوا دەترسـن لـە بە دەسـتهێنانی

ئەوانــەی کــە حــەزی لێ دەکەن، وە پشــت بەســتن بە پێــی بڕوای کەســە کە دەبێــت، وە ئەوە لــە پێویســتیەکانی دڵــە کــە زانایان لەســەری یــەک دەنگن.

(١٢): ﴿ وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ ٱثْنَىْ عَشَرَ نَقِيبًا ۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مَعَكُمْ ۖ لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِى وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ ﴾

خــوا ﷻ پەیمانێکــی بەهێــزی لــە نەوەکانــی ئیســرائیل وەرگرتــووە، وە باســی ســیفەتی ئــەو پەیمانــەی کــردوە، وە پاداشــت دانەوەیــان ئەگەر پێــی هەســتان، وە گوناهبار بوونیــان ئەگەر ئەنجامیــان نەدا، پاشــان باســی ئــەوە دەکات کە ئەوان پێی هەڵنەســتاون بە هەمان شــێوە باســی ســەرەنجامی دەکات، وەک دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾واتــە: پەیمانێکــی جەخت لەســەر کــراوە (کە خوا نــەوەی ئیســرائیلی وەرگرت) ﴿ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ ٱثْنَىْ عَشَرَ نَقِيبًا ﴾واتــە: دوازدە پێشــەواو سەرپەشــتیارمان هەڵبژارد هەتــا چاودێریان بکات، هانیــان بدات لەســەر جێبەجــێ کردنــی فەرمانەکانی خوا.

﴿ وَقَالَ ٱللَّهُ ﴾واتــە: بەوانــەی کــە چاودێــرن بەســەریانەوە کــە بەرگــەی نارەحەتیــەکان دەگــرن ﴿ إِنِّى مَعَكُمْ ﴾واتــە: (مــن لەگەڵتانــم) بەسەرخســتن، بــە ڕاســتی پشــتیوانی بە کۆششە.

پاشــان باســی ئەو پەیمانــە دەکات کە لێــی وەرگرتن، دەفەرمــوێ: ﴿ لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتــە: بــە ئاشــکراو بە نهێنــی، بە هەســتان بــە جێبەجێ کردنــیو ئەوەی کــە پێویســتە تیایداو بــەردەوام بــوون لەســەری ﴿ وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾واتــە: بــەو کەســەی کــە شایســتەیە ﴿ وَءَامَنتُم بِرُسُلِى ﴾واتــە: هەموویــان بــە گشــتی، ئــەو پێغەمبەرانــەی کــە بەڕێزتریــنو باشــترینیان موحەممــەدە ﷺ ﴿ وَعَزَّرْتُمُوهُمْ ﴾واتــە: بــە گــەورەی بزانــنو ڕێزیــان لــێ بگــرن، وە ئــەوەی کــە لەســەرتان پێویســتە لــە ڕێزگرتــنو بــە گەورەیــان بزانــن ئەنجامتان دابــێ ﴿ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ﴾ئەویــش بریتیــە لە بەخشــینو چاکەکاریــی کە لە ڕاســتگۆییو دڵســۆزیەوە ســەرچاوەی گرتبێ، وە کارو کەســابەتی حــەڵاڵ، ئەگــەر ئەمانەتان ئەنجــام دا، ﴿ لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾هــەر یــەک لــە خۆشــی چوونــە بەهەشــتو ئــەو نــازو نیعمەتانــەی کــە تیایدایە بۆیانــی کۆ کردۆتــەوە، وە دورخســتنەوەی ئەوەی کە خراپــە لە پاککردنــەوەی تاوانەکان، وە

ڕێگـری کـردن لەو سـزایەی بە هۆی ئـەو تاوانانـەی کـە کردوویانە تووشـی دەبن ﴿ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ ﴾ ئـەو پەیمـانو بەڵێنانـەی کـە بە بـڕواو پابەند بوونـەوە داویانە، کە لەگەڵیـدا هانـی پاداشـتی چاکەی پـێ داون.

﴿ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ ﴾ واتـە: بـە ئەنقسـتو زانیـن، ئەوە شایسـتەی ئەو سـزایەیە کە گومراکـەران شایسـتەین، لە بێبەش بوونی پاداشـتو بەدەسـتهێنانی سـزا. وەک ئـەوە وایە کە بوتـرێ: خۆزگـە دەمزانـی چییـان کرد؟ وە ئایـا بە وەفا بـوون لـە بەرانبەر ئـەو پەیمانەی کە دایانبـوو، یان پەیمانەکەیان شـکاند؟ خوا ئاشـکرای کردوە کـە ئەوان ئەو پەیمانەیان شـکاند، (١٣): ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ ۙ وَنَسُوا حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا بِهِ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَائِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۖ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ (١٣) ﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَاقَهُمْ ﴾واتـە: بە هـۆی ئەو پەیمان شـکاندنەیانەوە سـزامان دان بـە چەندین سـزا:

یەکـەم: ئێمـە ﴿ لَعَنَّاهُمْ ﴾واتـە: نەفرینمـان لێکـردنو دوورمان خسـتنەوە لـە میهرەبانیمان، کاتێـک دەرگاکانـی میهرەبانـیو ڕەحمەتی خوایان بەسـەر خۆیاندا داخسـتو هەڵنەسـتان بەو پەیمانـەی کـە لێیـان وەرگیـراوە، کە ئـەوە هۆکاری گـەورەی ئەو سـزادانەیە.

دووەم: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ﴾ واتـە: دڵەکانیـان ڕەق بـووە، هیچ ئامۆژگاری وەرناگرێت، وە نیشـانەو بەسـەرهاتەکان سـوودی پـێ ناگەیەنن، نەهانـدان هانیان دەدات، نەترسـاندن دەیانترسـێنێت، بەڕاسـتی ئەمـە گەورەتریـن سـزایە بۆ مرۆڤ، کـە دڵی بە جۆرێکـی لـێ بێـت هیدایـەتو ڕێنماییو خێر هیـچ سـوودێکی پێنەگەیەنێت جگـە لە خراپە نەبێت.

سـێیەم: ﴿ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ ﴾ واتـە: لـە فەرمـوودەی خـوا لایانـدا، هەتا تووشـی گۆڕیـن لادان بوون، وشـەکانیان بە شـێوەیەک لێ دەکـرد، لەبـەر بەرژەوەندی کاتی خۆیـان مانایـان بۆ وشـەیەک دادەنا کـە خـواو پێغەمبەرەکەی ئـەو مانایەیان مەبەسـت نەبوو.

چـوارەم: دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَسُوا حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا بِهِ ﴾واتـە: بێگومـان ئـەوان ئامۆژگـاری کـران بـە تـەوراتو بەوەی کە بۆ سـەر مووسـا دابەزیـوە، بەشـێکی زۆریان لـەوە لەبیر کرد. ئەمـە گشـتگیرە بـۆ لـە بیـر چوونـەوەی زانسـتەکەی، ئـەوان بەڕاسـتی لەبیریان کـرد، وە لە دەسـتیان چـوو، زۆربـەی ئەوانـەی کە خوا لە بیـری بردنەوە نەمـان، وەک سـزایەک لە لایەن

خـــواوە بۆ ئـــەوان.

وە بیـــر چوونـــەوەی کرداریـــش دەگرێتەوە کە وازیـــان لە کـــردار پێکردنی هێنا، ســـەرکەوتوو نەبـــوون بـــە هەســـتان بـــەوەی کـــە فەرمانیان پێکـــراوە. وە ئەمـــە دەکرێتـــە بەڵگە لەســـەر خاوەن کتێبـــەکان، بـــە نکوولـــی کردنیـــان بـــە هەندێ لـــەوەی کـــە لـــە کتێبەکەیانـــدا هاتـــووە، یان لە ســـەردەمی ئەوانـــدا روویـــداوە، ئـــەوە لەوانەیە کـــە لە بیریـــان کردوە.

﴿ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ ﴾واتـــە: خیانـــەت بەرانبـــەر بە خـــواو بەنـــدە بڕواداره‌کانی، گەورەتریـــن خیانـــەت کردنیـــان ئـــەوە بـــوو ئامۆژگـــاریو هـــەقو ڕاســـتیان دەشـــاردەوە لـــەو کەســـەی کـــە گومانی باشـــی بۆیان دەبرد، لەگـــەڵ بەردەوامیان لەســـەر بێبڕوایی. وە ئەم ســـیفەتە ناشـــرینو بۆگەنـــە بۆ هەمـــوو ئەوانەیە کە هەمان ســـیفەتی ئـــەوان وەردەگرێت. هەر کەســـێک بـــەو کارە هەڵنەســـێت کە خـــوا فەرمانی پێکـــردوەو پابەند نەبێـــت پێیەوە، ئەوە بەشـــێکی دەبێت لـــەو نەفریـــنو دڵڕەقیە، وە تووشـــی ئـــەو دەردە دەبێـــت بە گۆڕانی مانای وشـــەکان کـــە لەگەڵ ڕاســـتیدا ناگونجێـــت، وە لەبیـــر کردنـــی بەشـــێکی زۆر لـــەو ئامۆژگاریانەی کە کرابـــوون، وە بە ڕاســـتی هـــەر کەســـێک حاڵـــی بەم شـــێوەیە بێـــت هەردەبێ تووشـــی ئەو خیانەتـــە ببێت.

خـــوای گـــەورە ئـــەو ئامۆژگاریانـــەی بـــە بەخـــت ناوهێنـــا، چونکـــە ئـــەوە گەورەتریـــن بەشـــە، جگـــە لـــەوە بێگومـــان بەختەکانـــی دنیایـــە، وەک خـــوا ﷻ دەفەرمـــوێ: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَـٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَـٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ ﴾القصـص.

وە دەربـــارەی بەختـــی بـــە ســـوود دەفەرمـــوێ: ﴿ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ ﴾فصلت.

کـــە دەفەرمـــوێ: ﴿ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ﴾ واتە: بە ڕاســـتی ئەوان بـــە وەفا بوون بەرانبـــەر ئەو پەیمانە، بۆیـــە خـــوا ســـەرکەوتووی کـــردنو ڕێنمایی کـــردن بۆ ســـەر ڕێگای ڕاســـت، ﴿ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱصْفَحْ ﴾واتـــە: لـــەو هەڵانەیان ببورە کە شایســـتەی ئەوەیـــە لێی ببوریت، وە چاوپۆشـــیان لێ بکـــە، چونکە بەڕاســـتی ئەوە لـــە چاکەکارییـــە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ (الإحســـان): بریتیـــە لـــەوەی کـــە خوا بپەرســـتی وەک چـــۆن دەیبینیت، ئەگەر خـــوای گـــەورە نەبینیت، ئەوە بێگومـــان ئەو تـــۆ دەبینێت. وە لە مافـــی دروســـتکراوەکاندا: پێگەیاندنی یان پێدانی هەر شـــتێک کە ســـوودو قازانجی دنیـــاو دواڕۆژیانـــی تێدا بێت.


وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ١٤ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ١٥ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٦ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗاۗ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٧

(١٤): ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ١٤ ﴾:

واتــە: وەک چــۆن پەیمــانو بەڵێنمــان لــە جوولەکــە وەرگــرت، بــە هەمــان شــێوە پەیمانمان وەرگرت لە (ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ ) بۆ عیســای کوڕی مەریەم ، وە نەفســی خۆیــان بــە پــاک ڕادەگــرت بــە بڕواهێنــان بــە خــواو پێغەمبەرەکانــیو ئەوەی کــە بۆیــان دابەزیــوە، پەیمانەکەیان شــکاند، ﴿ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ﴾ بیرچوونــەوەی زانیاریــیو بیرچوونــەوەی کــرداری.

﴿ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾ هەندێکیانمــان زاڵ کرد بەســەر ئــەوی تــردا، وە نێوانیــان پڕ بــوو لە کێشــەو دووبەرەکــی ڕقو کینەو شــەڕو ئــاژاوە هەتا ڕۆژی دوایــی، بــە ڕاســتی ئەمــە بــە چــاو دەبینــرێ، بێگومــان گــاورەکان بــەردەوام لــە شــەڕو ناکۆکیو ڕکابەرایەتــیو دووبەرەکیــدان ﴿ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴾(واتــە: لەمــەودوا هەواڵــی ئەوەیــان پێدەدەیــن کــە دەیانکرد).

(١٥-١٦): ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ١٥ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٦ ﴾:

کاتــێ خوا ﷻ باســی ئــەو پەیمانەمان بۆ دەکات کە لــە خاوەن کتێبــەکان وەری گرتووە لە جوولەکــەو گــاورەکان، وە ئەوانیــش لە بەرانبەردا پەیمانەکەیان شــکاند جگە لــە کەمێکیان

نەبێ، فەرمـان بە هەموویـان دەکات کە بڕوا بە موحەممـەد ﷺ بهێنـن، وە چەندین بەڵگەی یەکلاکـەرەوە لەسـەر ڕاسـتی پەیامەکـەی موحەممـەد ﷺیـان لەوبـارەوە بۆ دەخاتـە ڕوو، ئەویـش بریتیـە لەوەی بۆیانـی ڕوون کردوەتـەوە زۆرێک لەوانـەی کە ئەوان لـە خەڵکیان دەشـاردەوە، هەتـا لـە نەفامەکانـی نـاو ئاینەکەی خۆیانیـش، لەو سـەردەمەدا تەنهـا خاوەن کتێبـەکان خـاوەن زانیاریی دینی بوونو شـارەزابوون (لـە کتێبە ئاسـمانیەکان) جگە لەوان کـەس لـە بـواری دینداریدا شـارەزاو زانا نەبوو، هەر کەسـێک بیویسـتایە شـتێک فێر ببایە تەنهـا دەبـوو بڕۆشـتبایەتە لای ئـەوان، بـەڵام هاتنـی پێغەمبـەر ﷺ بـەو قورئانـە گەورەیە کـە ڕوونـی دەکاتـەوە ئەوەی لـە نێوانـی خۆیاندا دەیانشـاردەوە کـەس نەیدەزانـی جگە لە خۆیـان نەبێـت لە نێـو یەکتردا، لەگەڵ ئـەوەدا موحەممـەد ﷺ پێغەمبەرێکە نـە خوێندەواری دەزانـی نە نووسـین، کە لـە گەورەترینی بەڵگەکانە لەسـەر ڕاسـتو دروسـتی پەیامەکەی، وە بـە هەمـان شـێوە لەبـەر بوونـی سـیفەتەکانی لـە کتێبەکانیانـدا، وە بوونی ئـەو مژدانەی کـە لە کتێبەکانیانـدا ئاماژەی پێکـراوە، وە ڕوون کردنـەوەی دەقی ڕەجمو هاوشـێوەکانی.

﴿وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ﴾ بـە دانایـی خـۆی چاوپۆشـی دەکات لـە زۆرێـک لـە تاوانـەکان کـە لـە حیکمـەت بـەدەرە.

﴿قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ﴾ کـە بریتیـە لـە قورئـان، دەبێتـە ڕۆشـنایی بـۆی لە تاریکـی نەفامیـداو لـە کوێریـی گومراییدا.

﴿وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ﴾ واتـە: بـۆ هەمـوو ئەوانـەی کـە دروسـتکراو (مـرۆڤ و جگە لـە مرۆڤ) پێویسـتی پێـی دەبێ، لـە کاروبـاری دنیاییاندا، لـە فێربوونی زانسـت دەربارەی پەروەردگـارو نـاوو سـیفەتو کردارەکانـی، وە شـارەزابوون لە بڕیـارە شـەرعیو بڕیاری وردەکاریـەکان، پاشـان بـاس دەکات کـە کـێ ڕێنمایـی بـەم قورئانـە وەر دەگرێـت، وە ئـەو هـۆکارە چیـە لە بەنـدەدا هەتا ئـەوە بەدەسـت بهێنێـت؟ دەفەرمـوێ: ﴿يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ﴾ واتە: کەسـێک ڕێنمایـی وەردەگرێت کە هەوڵبـداتو کۆشـش بـکات بـۆ ئەوەی بگـات بـە ڕەزامەندی خـوا، وە مەبەستیشـی چاک بێـت، ئـەوە ڕێگاکانـی خۆشـبەختی بەدەسـت دەهێنێـت، ئـەو ڕێگایانەی کـە خاوەنەکەی دەپارێزێـت لـە سـزا، وە دەیگەیەنێـت بە ماڵـی ئارامی (دار السلام)، ئەویـش زانینی هەقو کار پێکردنیەتـی، بە وردو درشـتیەوە.

(وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ) تاریکـی بێبڕوایـیو بیدعەو سـەرپێچیو

نەفامـیو بـێ ئاگایی بـۆ لای ڕووناکـی بڕواداریو سـوننەتو گوێڕایەڵیو زانسـتو یادی خـوا، وە هەمـوو ئـەم ڕێنماییانـە بـە ویسـتی خوایـە کـە هەر شـتێکی بوێـت ئـەوە دەبێ، وە هـەر شـتێکی نەویسـت نابێـت. ﴿ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ (واتە: وە ڕێنماییـان دەکات بـۆ ڕێگەی ڕاسـت).

(١٧-١٨): ﴿ لَّقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ۗ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ وَقَالَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَىٰ نَحْنُ أَبْنَاءُ اللَّهِ وَأَحِبَّاؤُهُ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ ﴾:

خـوا ﷻ کاتێک باسـی وەرگرتنی پەیمان دەکات لە هەردوو خـاوەن کتێبەکان (جوولەکەو گـاور) بێگومـان ئەوان پێی هەڵنەسـان، بەڵکـو پەیمانەکەیان شـکاندو هەڵوەشـاندەوە، باس لـە ڕەفتـارە ناشـرینەکانیان دەکات. بـاس لە وتەی گـاورەکان دەکات، ئەو وتـەی کە پێش ئـەوان کەسـیتر نەیکردبوو، وتیان: بە ڕاسـتی خوا هەر مەسـیحی کـوڕی مەریەمە.

هـۆی گومـان بردنەکەیـان ئـەوە بـوو کـە ئـەو منداڵێکـی بـێ باوکـە، ئـەو بیـرو بـڕوا پووچەیـان لەلا دروسـت بوو دەربارەی عیسـا، لەگەڵ ئـەوەدا (حەووا) هاوشـێوەی ئەو بوو، دروسـت کـرا بەبێ دایـک، وە ئادەم لەو لە پێشـترە کە دروسـت کرا بەبـێ دایکو باوک ئـەدی بۆچـی بانگـەوازی پەروەردگارێتی بـۆ ئادەمو حـەووا ناکەن، وەک چۆن بۆ مەسـیح کردیـان؟ دیلالـەت دەکات لەسـەر ئـەوەی وتەکانیان دەرەنجامـی شـوێن کەوتنی حەزوو ئارەزوویانـە، بەبـێ هیـچ بەڵگەو گومانێـک، خوا وەڵامی دانـەوە بە بەڵگـەی عەقڵی ڕوونو ئاشـکرا فەرمـووی: ﴿ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾ واتـە: ئەگـەر ئـەو دووانـەی کـە باسـکران (عیسـاو مەریـەم) هیـچ بەرگریکەرێـک نەبێت بەرگریـان لێ بـکات، وە ئەگەر خـوا بیەوێـت لەناویـان ببـات دەیـکات، وە هیچ هێـزو دەسـەڵاتێکیان نەبێت لەسـەر ئەوە، بەڵگەیـە لەسـەر بـە تاڵـی پەروەردگارێتی، ئـەوەی کە ناتوانـێ بەرگری لە خـۆی بکات لە لەناوچـوون، وە بـە هێـزی خـۆی نەتوانێت خۆ ئـازاد بکات.

﴿ وَلِلَّهِ ﴾ ئەمـەش بەڵگەیـە کـە بە ڕاسـتی هـەر بۆ خـوای تـاکو تەنهایە ﴿ مُلْكُ

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾(موڵكـی ئاسـمانەكانو زەوی) بەڕێوەیـان دەبـات بـە یاسـا گەردوونـیو شـەرعیو پاداشـتیەكانی، هەمـوو بەنـدەكان كۆیلـەی خـوان بـە فەرمانی ئەو هەڵـسو كـەوت دەكەن، ئایـا دەگونجێـت كۆیلەو بەندەی هـەژار ببێت بـە پەروەردگار لە هەمـوو ڕوویەكـەوە؟ ئەمـەش لە شـتە هەرە مەحـاڵو ئەسـتەمەكانە.

هیـچ وێنایـەك نیـە بـە سەرسـوڕمانیان بـە دروسـتكردنی عیسـای كـوڕی مەریـەم بەبـێ بـاوك، بە ڕاسـتی خوای گـەورە ﴿ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ ﴾ ئەگەر بیـەوێ لە دایـكو باوكێك، وەك سـەرجەم نەوەكانـی ئـادەم، وە ئەگـەر بیەوێ لـە باوكێك بەبێ دایـك وەك حەووا. وە ئەگـەر بیـەوێ لـە دایكێـك بەبێ بـاوك وەك عیسـا، وە ئەگـەر بیەوێ بەبـێ دایكو بـاوك وەك ئـادەم، خـوای باڵادەسـت بە ویسـتی خـۆی دروسـتكراوەكانی جـۆراو جۆر دروسـت كـردوە بە ویسـتی جێبەجێـكاری كە هیچ شـتێ ناتوانـێ ڕێگری لێ بـكات، بۆیە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾

وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَـٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّـٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ
فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ۚ يَغْفِرُ لِمَن
يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ ۚ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ
رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُوا۟ مَا جَآءَنَا
مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ۖ فَقَدْ جَآءَكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ
شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٩﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَـٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟
نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا
وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَـٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟
ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟
عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَـٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّ
فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن
يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ
أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ
غَـٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾

وە لە وتەکانی جوولەکەو گاور هەر یەک لەوان بانگەشەی پووچو بەتاڵی دەکرد بەو بانگەشە بێ بنەمایانە نەفسی خۆیانیان پاکو خاوێن دەکردو فەزڵی خۆیان دەدا بەسەر غەیری خۆیان، وەک ئەوەی کە هەر یەک لەوان دەیانوت: ﴿نَحْنُ أَبْنَـٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّـٰٓؤُهُۥ﴾ وە منداڵ لە زمانی ئەواندا بە واتای خۆشەویست دێت، مەبەستیان منداڵ بوونی ڕاستەقینە نەبووە، چونکە ئەمە لە پرۆگرامو مەزهەبی ئەواندا نەبووە، جگە لە مەزهەبی گاورەکان لە مەسیحدا.

خوا ﷻ وەڵامیان دەداتەوە کاتێک کە بانگەشەی بێ بنەمایان کرد: ﴿قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم﴾؟ ئەگەر ئێوە خۆشەویستی خوان ئەی بۆچی سزاتان دەدات بە هۆی گوناهەکانتان؟ چونکە خوا تەنها ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە بەو کارانە هەڵدەستن خوا لێی ڕازیە، ﴿بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ﴾ بەسەرتاندا دێت بڕیارەکانی دادپەروەریو چاکەخوازی ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾ ئەگەر هۆکارەکانی لێخۆشبوون، یان هۆکارەکانی سزا بەکاربهێنن ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾ واتە: چی شتێک ئێوەی تایبەت کردوە بەو فەزڵو چاکەیە، وە ئێوە لە ئەوەی مرۆڤەکانن، وە لە کوێ ئەوانەن کە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا، ئنجا پاداشتان دەداتەوە بە پێی کردوەکانتان.

(١٩): ﴿ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُوا۟ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٍ وَلَا نَذِيرٍ ۖ فَقَدْ جَآءَكُم بَشِيرٌ وَنَذِيرٌ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٩﴾ ﴾:

خوای گەورەو میهرەبان بانگی خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان دەکات کە بڕوا بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ بهێنن، وە سوپاسی خوای مەزن بکەن کە ناردوویەتی بۆیان پاش ماوەیەک ﴿فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾ لەبەر ئەوەی زۆر پێویستیان پێی هەبووە،

ئەمــە لەوانەیــە کــە بانگیــان دەکات بــۆ بڕواهێنــان، وە هەمــوو داواکاریو فەرمانەکانــی پەروەرگاریــان بــۆ ڕوون دەکاتــەوە، وە بە ڕاسـتی خوای گــەورە بەوە قســەیانی بڕیوە، هەتا نەڵێــن: ﴿مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞ﴾ مــژدە بــدات بە پاداشـتی لــە ئێســتاو داهاتــوو، وە بە کار بۆ کردنیان، وە ســیفەتی ئــەو کەســانەی کاری پێدەکەن. وە بیانترســێنێت بە ســزا لە ئێســتاو داهاتوو، وە بە کار بۆ کردنیان، وە ســیفەتی ئەو کەســانەی کاری پێدەکــەن، ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾ هەموو شــتەکان ملکەچو گوێڕایەڵی تواناو دەســەڵاتی خــوای گــەورەن، هیچ شــتێکی لێ یاخــی نابێت، وە لــە تواناو دەســەڵاتیەتی کە پێغەمبەرانــی نــاردوە، وە کتێبی دابەزانــدوە، وە ئەو پاداشــتی ئەوانە دەداتەوە کــە گوێڕایەڵی دەکــەن، وە ســزای ئەوانــە دەدات کە ســەرپێچی دەکەن.

(٢٠-٢٦): ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ
أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكٗا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمۡ يُؤۡتِ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٢٠) يَٰقَوۡمِ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡأَرۡضَ
ٱلۡمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَارِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ (٢١) قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ
فِيهَا قَوۡمٗا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ
(٢٢) قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا
دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (٢٣) قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن
نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ (٢٤) قَالَ رَبِّ
إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ (٢٥) قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ
عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ (٢٦)﴾:

کاتێــک خــوا ﷻ منەتی کرد بەســەر مووســاو گەلەکەیدا بــە ڕزگار بوونیان لــە فیرعەونو گەلەکەیــان، وە بــە دیــل گرتــنو کۆیلایەتــی پێکردنیــان، گەڕانــەوە بــۆ خــاکو وڵاتی خۆیــان، ئەویــش بریتــی بــوو لــە (بیــت المقــدس)و دەورو بــەری، وە نزیــک بوونــەوە لە گەیشــتن بــە (بیــت المقــدس) خــوای باڵادەســت جیهــادی لەســەر فــەرز کردبــوون، تــا دوژمنەکەیــان دەربکــەن لــە وڵاتەکەیــان. مووســا ؊ ئامۆژگــاری کــردنو هانیــدان بۆ جیهــاد کــردن، پێیانی فەرمــوو: ﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ بە دڵو بــە زمانتان، چونکە یادکردنــەوەی هۆکارێکــە بــۆ خۆشویســتنیو چالاکبوونەوەیــە لەســەر بەندایەتــی کردنــی ﴿إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ أَنۢبِيَآءَ﴾ بانگتــان دەکات بــۆ ڕێنمایــیو هیدایــەت، وە وریاتان دەکاتەوە لــە تیاچــوونو هانتــان دەدات بۆ خۆشــبەختی هەمیشــەیی، وە فێــری ئەوەشــتان دەکات کە

پێشتر نەتانزانیبوو ﴿ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا ﴾ خۆتان کاروباری خۆتان بەڕێوە دەبەن، بەو شێوەی بە کۆیلە کردنتانی لابرد کە بەسەرتانەوە بوو لە لایەن دوژمنانەوە، ئێوە کاروباری خۆتان بەڕێوە دەبەن، وە دەتوانن ئاینەکەتان ڕاوەستێننو جێبەجێی بکەن ﴿ وَءَاتَىٰكُم ﴾ لە نیعمەتەکانی دنیاو دواڕۆژ ﴿ مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ بێگومان ئەوان لەو سەردەمەدا باشترینی ناو خەڵک بوون، خوای گەورە زۆر ڕێزی لێ گرتن، بە ڕاستی نازو نیعمەتێکی بەسەردا ڕشتن کە نەڕژێنرابوو بەسەر کەسدا.

یادیان دەخاتەوە بە بەهرەو نیعمەتەکانی دنیاو دواڕۆژ، بۆ ئەوەی ببێتە مایەی بڕوا بەرزیو پابەند بوونیان لەسەر جیهادو تێکۆشان کردنو بە دەمەوە چوونیان، تا لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ﴾ پاککراوە ﴿ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ﴾ هەواڵێکیان پێ دەدات کە دڵەکانیان پێی ئارام ببێتەوە، ئەگەر بڕواداران‌و هەواڵی خوا بە ڕاست بزانن، بێگومان خوا نووسیویەتی بچنە ناو (بیت المقدس)ەوەو سەریان بخات بەسەر دوژمنەکانیاندا ﴿ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ ﴾ واتە: بەرەو دواوە نەگەڕێنەوە ﴿ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴾ بێگومان دنیاتان لە دەست چوو، بەوەی کە لە دەستاندا سەرکەوتن بەسەر دوژمنداو لە ئازاد کردنی وڵاتەکەتان ، وە دواڕۆژیشتان لە دەست چوو کە لەو پاداشتە بێبەش بوون، وە بە هۆی سەرپێچیەکانتانەوە شایستەی سزا بوون، بەراستی قسەیەکیان وت بەڵگە بوو لەسەر لاوازی دڵەکانیان‌و داڕوخاوی دەروونیان، وە گوێ نەدانیان بە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی.

﴿ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ ﴾ زۆر بەهێزو بە تواناو توندن، واتە: ئەمە یەکێکە لەو بەربەستانەی کە ناتوانین بڕۆینە ناویەوە ﴿ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴾ ئەمەش بە هۆی ترسنۆکیو کەمی دڵنیاییە، ئەگەرنا ئەگەر ئەوان ژیر بن، دەزانن ئەوان هەموویان لە نەوەی ئادەمن، وە بەهێز ئەو کەسەیە کە خوا بەهێزو توانای خۆی سەری بخات، وە بەڕاستی هیچ هەوڵو توانایەک نیە جگە لە ئەو نەبێت، وە دەیانزانی بەراستی سەردەکەون بەسەر دوژمندا، لە کاتێکدا خوا بەڵێنی پێداون، کە بەڵێنێکی تایبەتە ﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ ﴾ لە خوا دەترسان، گەلەکەیان هان دەدا بۆ کوشتار کردنی دوژمنەکانیان‌و داگیر کردنی وڵاتەکەیان ﴿ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ﴾ بە سەرکەوتنی وتەی هەق لەم شوێنەدا کە پێویست بەو جۆرە وتانە دەکات، وە خوای گەورە نیعمەت‌و بەهرەی خۆی داباراند بەسەریاندا بە سەرکەوتن‌و دڵنیایی.

﴿ ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَ ﴾واتـە: لـە نێوانـی ئێـوەو سـەرکەوتنتان بەسـەریاندا تەنهـا ئەوەیـە سـوور بن لەسـەریانو بچنـە ژوورەوە لـە دەرگای شـارەوە ئـەوە ئـەوان ڕاسـتەوخۆ هەڵدێنو مەیدانـی جەنگ بەجـێ دەهێڵن، پاشـان فەرمانی پێکـردن بـە ئامادە سـازی کـە لە بوونی ژمـارە گـەورەو گرنگترە فەرمـووی: ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ چونکە بە ڕاسـتی پشـت بەسـتن بە خوای مـەزن -بە تایبەت لەم شـوێنەدا- کارەکە زۆر ئاسـانتر دەکاتو سـەرکەوتن بەسـەر دوژمندا مسۆگەر دەکات، ئەمـەش بەڵگەیـە بـۆ پێویسـت بوونی پشـت بەسـتن، وە بەڕاسـتی پشـت بەسـتن بـە پێی بـڕوای کەسـەکە دەبێـت. ئەم فەرمایشـتەی هیچ سـوودێکی نەبـوو بۆیان، وە سەرزەنشـت کردنیـش قازانجـی نابێت بۆیـان، ئـەوان تەنها قسـەی زەلیلەکانیـان کرد.

قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ
أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ٢٤ قَالَ رَبِّ إِنِّي
لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٥ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ
يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ
٢٦ ۞ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ
مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ
قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٢٧ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ
لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ
رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢٨ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ
مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ٢٩ فَطَوَّعَتۡ
لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٣٠
فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي
سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا
ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ٣١

﴿ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَاۖ فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴾ چەندە ناشرینە ئەم وتەیە کە کردیان، بە تایبەت لە رووی پێغەمبەرەکەیاندا لەو بارودۆخە ناسکەدا کە وا پێویست دەکات بچن بەدەم پێغەمبەرەکەیانەوەو سەریبخەنو خۆیانو دەروونیان بە عیززەت بکەن. وە بەم نموونەو هاوشێوەکانی جیاوازی ئاشکرا بەدی دەکرێت لە نێوان هەموو گەلەکانو گەلی موحەممەد ﷺ کاتێ هاوەڵەکان بە پێغەمبەر ﷺیان وت- کاتێ کە راوێژی پێکردن بۆ کوشتار کردن لە رۆژی بەدردا لەگەڵ ئەوە ئەو زۆر جەختی لەسەر نەکردنەوە-: وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بماندەیت لەو دەریایە ئەوە لەگەڵتدا لێی دەدەین، وە ئەگەر بمانێریت بۆ سەر هەورەکان هیچ کەس لە تۆ دواناکەوێت، وە ئەوە ناڵێین کە گەلەکەی مووسا بە مووسایان وت: ﴿ فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴾ بەڵکو برۆ خۆتو پەروەرگارت لە دژیان بجەنگن ئێمەش لەگەڵتاندا دەجەنگین، لە پێشو پاشو لای راستو چەپی تۆوە، کاتێک مووسا ﷺ یاخی بوونیانی بینی.

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ ﴾ واتە: ملکەچمان نابن بۆ جەنگ کردن، منیش بە زۆر زۆردار نیم بەسەریانەوە ﴿ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾ واتە: دادوەری لە نێوان ئێمەو ئەواندا بکە، بەوەی سزایەکیان بۆ دابەزێنیت شایستەی دادپەروەری حیکمەتی خۆت بێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە وتەو کردارەکانیان لە تاوانە گەورەکانە کە خاوەنەکەی پێی فاسق دەبێ ﴿ قَالَ ﴾ خوا وەڵامی نزاکەی مووسا ﷺی دایەوە فەرمووی: ﴿ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ ﴾ واتە: سزاکەیان ئەوەیە کە قەدەغەی بکەم لەسەریان چوونە ناو ئەم شارە کە خوای گەورە

بۆیانــی نووســی بوو، چل ســاڵ.
وە ئــەو ماوەیــە بەســەر گەردانیو وێڵــی دەخولێنــەوە بەســەر زەویــداو ڕێگا نادۆزنــەوەو بە ئارامیــش دانانیشــن، ئەمــە ســزای دنیایانــە، بەڵکــو خــوا بیکاتە کەفــارەت بۆیان، وە ســزای گەورەتریــان لەســەر لا ببــات. وە ئــەم دەقــە بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی کــە هەنــدێ جــار ســزاو ســەرپێچیکردن لەســەر گونــاە دەبێتــە مایەی لــە نــاو بردنی نــازو نیعمەتــەکان، یان بەرپەرچدانــەوەی ســزایەکە کــە هــۆکاری بوونی، یان دواکەوتنی ئەو ســزایە دەبەســترێ بە کاتێکــی تــرەوە. وە ڕەنگــە حیکمەت بــۆ ئەو ماوەیــە ئەوە بێت کــە زۆربــەی ئەوانەی ئەو قســەیانە کــرد بوو بمــرن، (چونکە قســەکە) لــە دڵانێکــەوە دەردەچــوو کە هیــچ ئارامیو جێگیریەکــی تێــدا نەبــوو، بەڵکــو تەنهــا هیــواو ئاواتی ئــەوە بوو لــە دوژمنەکانیــەوە دوور بــێ، وە هەرگیــز ورە بــەرزی تێدا نەبوو هەتــا بگات بــە ئاواتەکانی. وە هەتا بە شــێوەیەکی تازەتــرو بــە گــەرمو گوڕتــر دەربکەوێت، بــە بیــرو بۆچــوونو پەروەردەیەکی تــازەوە بۆ شــکاندنی لووتــی دوژمنو قبووڵ نەکردنی کۆیلایەتی ژێردەســتەیی کە هۆکاری ســەرەکیە لە بــەردەم خۆشــبەختیدا.
وە لــە کاتێکدا خــوا دەیزانی مووســا لەوپەڕی میهرەبانیدایــە بەرانبەر خەڵکــی، وە بە تایبەت گەلەکــەی خــۆی، وە بێگومــان ئــەو نــەرمو نیانی نوانــد بەرانبەریــان، وە ســۆزی زۆر بۆیان جــولا بەرانبــەر بەو ســزایە، یــان داوای کرد ســزاکەیان لەســەر هەڵبگیرێت، لەگــەڵ ئەوەدا خــوا بڕیاری لەســەر داوە بــە حەتمــی، دەفەرمــوێ: ﴿ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴾ واتــە: نــە خەمیان بــۆ بخۆو نە خــۆت بێتاقەت بکە، بەڕاســتی ئەوانە فاســیق بوونو لە ســنور دەرچــوون، وە بــە هــۆی ســنوور بەزاندنیانــەوە ئەو ســزایەیان تــووش بوو، نەک لــە لایەن ئێمەوە ســتەمیان لــێ کرابێت.
(٢٧-٣١): ﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱبْنَىْ ءَادَمَ بِٱلْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْـَٔاخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَىَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِى مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِىَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّىٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثْمِى وَإِثْمِكَ فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَـٰبِ ٱلنَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُا۟ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُرِيَهُۥ كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ قَالَ يَـٰوَيْلَتَىٰٓ أَعَجَزْتُ أَنْ أَكُونَ مِثْلَ هَـٰذَا ٱلْغُرَابِ فَأُوَٰرِىَ سَوْءَةَ أَخِى فَأَصْبَحَ

مِنَ ٱلنَّـٰدِمِينَ ﴿٣١﴾ ﴾: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ ﴾ هەتا کۆتایی چیرۆکەکە[1]، باسی ئەو ڕووداوەی نێوان نەوەکانی ئادەمیان بۆ بکە کە هەقو ڕاستەو هیچ گومانێکی تێدا نیە، ئەوەی کە دیارە نەوەکانی ئادەم دووان بوون لە پشتی، وەک چۆن ڕووکەشی ئایەتەکە ئاماژەی پێدەکات، ئەمەش وتەی زۆرینەی توێژەرەوانی قورئانە.

واتە: بەسەریاندا بخوێنەرەوە کاتێ (دوو کوڕەکەی ئادەم) ویستیان قوربانی بکەن، ئەو قوربانیەی کە گەیاندنی بەو حاڵەی کە باسکراوە. ﴿ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا ﴾ واتە: هەر یەک لەو دووانە شتێکی لە ماڵەکەی کردە قوربانی بە مەبەستی نزیک بوونەوە لە خوا ﴿ فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ ﴾بە هۆی زانینی هەواڵێک لە ئاسمانەوە، یان بەو نەریتەی کە لە ئوممەتەکانی پێشوودا هەبوو، کە نیشانەی وەرگرتنی هەر قوربانیەک لە لایەن خواوە، ئەوە بوو کە ئاگرێک لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوە بیسوتێنێت ئەو کوڕەی کە لێی وەرنەگیرا لە بەر حەسوودییو زۆرداری ﴿ قَالَ ﴾ وتی: ﴿ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ ﴾براکەی تری بە نەرمونیانیەوە وتی: ﴿ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ چی تاوانێکم کردوە کە ببێتە مایەی ئەوەی بمکوژیت؟ جگە لەوە نەبێ کە تەقوای خوای گەورەم کردبێ، بێگومان تەقوای خوا لەسەر منو تۆش پێویستەو لەسەر هەموو کەسێکیش. بەهێزترین وتە بۆ مانای تەقوا لێرەدا، واتە: ئەوانەی لە خوا دەترسن لە ئەنجامدانی ئەو کارە، بەوەی کە کردەوەکەیان تایبەت لەبەر ڕەزامەندی خوا بێ، شوێنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کەوتبن.

پاشان پێی ڕادەگەیەنێت کە ئەو نایەوێت بیکوژێ، نە بە دەستپێشخەری نە بە بەرگری کردن لە خۆی، دەڵێ: ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ ﴾ نەک لەبەر ئەوەی دەترسم، یان بێ توانام، تەنها لەبەر ئەوە من ﴿ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ ئەوەی لە خوا دەترسێت دەسپێشخەری ناکات بۆ تاوان کردن، بە تایبەت تاوانە گەورەکان.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ترساندنی ئەو کەسەی کە دەیەوێت بکوژرێت، وە بەڕاستی پێویستە لەسەرت خۆپارێز بیتو لە خوا بترسی، ﴿ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ ﴾(من دەمەوێ) بگەڕێتەوە ﴿ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ ﴾ واتە: ئەگەر کار گەیشتە ئەوەی من تۆ بکوژم، یان تۆ من بکوژیت، ئەوە من ئەوە هەڵدەبژێرم بمکوژیتو هەردوو تاوانەکە بکەوێتە

١) هەتا ئەم وتەیە کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّـٰدِمِينَ ﴿٣١﴾ ﴾.

ئەستۆت ﴿فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوشتن لە تاوانە گەورەکانە، وە بێگومان ئاگری دۆزەخ پێویست دەکات بۆ خاوەنەکەی. ئەو ستەمکارە بە هیچ کام لەم وتانە دانەچەڵەکاو تەریق نەبوویەوە، وە دەروونی دووری نەخستەوە هەتا هانیدا بۆ کوشتنی براکەی، کە بە پێی شەرعو عەقڵ وا پێویست بوو رێزی لێ بگرێ ﴿فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾ دنیاو دوارۆژیان، وە ئەو ریگەیەی کردە پیشەیەک بۆ هەموو بکوژێک، وە هەر کەسێک رێنیشاندەری رێگایەکی خراپ بێ ئەوە تاوانەکەی لەسەریەتی، وە تاوانی ئەو کەسەش کە کاری پێ دەکات هەتا رۆژی دوایی. وە لە فەرمودەی راستدا هاتووە: {لا تقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْماً إلاَّ كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا، لأنَّهُ أَوَّلُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ} (أخرجه أحمد برقم: (٣٦٣٠)، والبخاري برقم: (٣١٥٧)، ومسلم برقم: (١٦٧٧)).

واتە: کەسێک یەکێک بە ستەم بکوژێت ئەوە نەوەی ئادەمی یەکەم بەشێکی بەردەکەوێت، لە خوێنەکەیدا، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کوشتنی دامەزراند. کاتێک براکەی کوشت نەیزانی چی بکات بە لاشەکەی، چونکە یەکەم مردوو بوو لە نەوەکانی ئادەم کە مرد ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبْحَثُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ (خوا قەلەڕەش) یێکی پیشانیدا بۆ ئەوەی قەلەڕەشێکی مردارەوە بووی تر بنێژێت ﴿لِيُرِيَهُۥ﴾ بەو ناشتنە ﴿كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ﴾ واتە: جەستەی، چونکە جەستەی مردوو دەبێت بە عەورەت ﴿فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ﴾ بەو شێوە سەرەنجامی تاوانو سەرپێچی پەشیمانیو بەدبەختیە.

مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِي ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُا۟ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓا۟ أَوْ يُصَلَّبُوٓا۟ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓا۟ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُوا۟ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُوا۟ بِهِۦ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٣٦﴾

**(٣٢):** ﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾﴾:

**خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ﴾ ئەو داسـتانەی کـە باسـمان کـرد لـە چیرۆکی نـەوەی ئـادەم، کاتـێ کـە یەکێکیـان براکـەی خـۆی کوشـت، کوشـتنی کـردە ڕێچکەیـەک بـۆ دوای خـۆی، بەڕاسـتی کوشـتن دەرەنجامێکـی خراپـی هەیـە لـە دنیـاو دوارۆژدا ﴿كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ خـاوەن کتێبـە ئاسـمانیەکان ﴿أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتـە: بـە ناهـەق ﴿فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾ لەبـەر ئـەوە هیـچ بەڵگەیەکـی پـێ نیـە کە هـۆکاری کوشـتنی ڕوون بکاتـەوە وە بەڕاسـتی دەستپێشـخەری نـاکات بـۆ کوشـتن تەنهـا بـە هـەقو ڕاسـتی نەبێـت.**

**بـەڵام کاتـێ کـە بوێریـی نوانـد بـە کوشـتنی نەفسـێک کـە شایسـتەی کوشـتن نەبێت، دەردەکەوێـت کـە لای ئـەو جیـاوازی لـە نێوان کـوژراوو کەسـێکی تـردا نیـە، ئەوکاتە بـە پێـی حەزو ئـارەزوو و نەفسـی خراپـەکاری دەجوڵێتـەوە، بە بوێریـەوە دەسـتی دەچێتە سـەر کوشـتنی، ئەویـش وەک ئەوە وایـە هەمـوو خەڵکی کوشـتبێت. بە هەمان شـێوە هەر کەسـێک نەفسـێک ڕزگار بکات: واتە: کەسـێکە بکەوێتە ژێر دەسـتی بتوانێت بیکوژێتو کەسـیش نەبێـت ڕێگـری لـێ بـکات، وە نەفسـی بانگـی بـکات بۆ کوشـتنی، بـەڵام ئەو لـە ترسـی خـوادا نەیکوژێـت، ئەمە وەک ئـەوە وایە هەمـوو خەڵکـی زینـدوو کردبێتەوە. چونکـە ئـەو ترسـەی لـە ناخیدایە ڕێگـری لێدەکات کەسـێک بـە ناهـەق بکوژێت.**

**وە ئایەتەکـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە کوشـتن بـە دوو ڕێگـا دروسـتە: یـان ئەوەیـە**

كەسـێک بـە ناهـەق بكوژێـت بـە ئەنقسـت، ئـەوە بەڕاسـتی دروسـتە بكـوژرێ، ئەگـەر هاوتابـنو لـە یـەک ئاسـتدا بـن، باوكی كـوژراو نەبێـت، یـان ئـاژاوە دەگێڕێت لەسـەر زەویـدا، بـە تێكدانـی ئاینی خەڵكـی، یان جەسـتەیان، یـان مـاڵو سـامانیان، وەک بێبڕواو هەڵگـەڕاوەكان، ئەوانـەی جەنگ بەرپـا دەكەن دژ بە ئیسـلام، وە بانگەشـەكەران بۆ بیدعە، ئەوانـەی كـە شـەڕو ئاژاوەیـان دانامركێتـەوە مەگـەر بە كوشـتن نەبێـت(٢)، وە بـە هەمان شـێوە ئەوانـەی كـە ڕێگا لـە خەڵكـی دەگـرنو هاوشـێوەكانیان، لەوانـەی كـە دەگەڕێن بەسـەر خەڵكیـدا بـۆ ئـەوەی كە بیكـوژن، یـان ماڵەكـەی ببەن.

﴿ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾ كـە ئیتـر هیـچ كەس بیانـووی نەمێنـێ ﴿ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم ﴾واتـە: زۆرێـک لـە خەڵكـی ﴿ بَعْدَ ذَٰلِكَ ﴾ پـاش ڕوون كردنـەوەی بەڵگـەكان، كـە هیچ بیانوویـەک بۆ مـرۆڤ ناهێڵنەوە بـۆ بەردەوامی پابەند بوونـی بە ئاینی خـوا (كە ئیسـلامە) لەسـەر زەویـدا ﴿ لَمُسْرِفُونَ ﴾ زێدەڕۆییـان كرد لە كـردەوەدا بە سـەرپێچی كـردن، وە بـە پێچەوانـەی پێغەمبەرانـەوە دەجووڵانـەوە كە بە بەڵگـەی ڕوونو ئاشـكراوە هاتبوون.

(٣٣-٣٤): ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْىٌ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾

ئەوانـەی دژایەتـی خـواو پێغەمبەرەكـەی ﷺ دەكـەن، ئەوانەن كە بـا ئاشـكرا دوژمنایەتی دەكـەن، وە لـە سـەر زەویـدا خراپـە بـڵاو دەكەنـەوە، بـە بـێ بڕوایـیو كوشـتنو بردنی ماڵو سـامانی خەڵكیو دروسـتكردنی مەترسـی لەسـەر ڕێگـاو بانەكان. ئـەوەی كە ڕوونو ئاشـكرایە، ئـەم دەقـە باس لـە بڕیارەكانـی ئەو كەسـانە دەكات كـە ڕێگا دەبـڕن، ئەوانەی ڕێگـا لـە خەڵكـی دەگـرن لـە لادێو چۆڵەوانـیو ڕێگاوبانەكانـدا، ماڵەكانیـان لـێ داگیر

---

٢) مەبەسـت لـە كوشـتنی ئەوانـەی بیدعـە بـڵاو دەكەنـەوە، ئەوانـە نیـە كـە مسـوڵمانن هەنـدێ بیدعـە دەكـەن، چونكـە بـە دەقـی فەرمـوودەی صەحیـح كوشـتنی مسـوڵمان لەسـەر مسـوڵمان حـەرام كـراوە، بەڵگـەكان زۆر زۆرن، لەوانـە: [عَـن ابـن عُمَـرَ أَنَّ رَسُـولَ اللّـه ﷺ قَـالَ: أُمِـرْتُ أَنْ أُقَاتِـلَ النَّـاسَ حَتَّـى يَشْـهَدُوا أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّـهُ، وَأَنَّ مُحَمَّـداً رَسُـولِ اللـه، وَيُقِيمُـوا الصَّـلاَةَ، وَيُؤْتُـوا الـزَّكَاةَ، فَـإِذَا فَعَلُـوا ذَلِـكَ عَصَمُـوا منـي دِمَاءهُـمْ وَأَمْوَالَهُـمْ، إِلاَّ بِحَـقِّ الإِسْـلاَمِ، وَحِسَـابُهُم عَـلَى اللـه] (متفـقٌ عَلَيْـهِ: البُخـاريَ برقـم: (٢٥)، ومسـلم برقـم: (٢٢)).

دەکەنو پاشان دەیانکوژن، وە دەیانترسێنن، هەتا وای لێدێ خەڵکی متمانەی بە ئاسایشی ڕێگاوبانەکان نامێنێو ڕێگای نێوان شارو شارۆچکەکان پڕ دەبن لە مەترسیو قۆناغ بە قۆناغ چۆڵ دەبن. خوا هەواڵی داوە سزا دانیانو بە پەند کردنیان ئەوەیە، تۆڵەیان لێ بکرێتەوە بە یەکێک لەم شێوانە.

توێژەرەوانی قورئان بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی ئەمە: ئایا ئەوە بۆ هەڵبژاردنە، کە هەموو چەتەیەکی ڕێگا بڕ ئیمان (فەرماندە) یان جێگرەکەی تۆڵەی لێ وەردەگرێت، بە پێی بەرژەوەندی لەو کارانەی کە باسکرا؟ ئەمە ڕووکەشی دەقەکەیە. یان ئەوەیە سزاکەیان بە پێی ئەو تاوانەیە کە دەیکەن، هەموو تاوانێک بەرانبەری تۆڵەیەک دیاری کراوە، وەک چۆن دەقەکە بەڵگەیە لەسەر دانایی گونجانی لەگەڵ حیکمەتی خوای گەورەدا. ئەو چەتانە ئەگەر کەسێکیان کوشتو ماڵەکەیان برد، ئەوە دەبێت بکوژرێنو هەڵبواسرێن، هەتا ناوبانگ دەر بکەنو ڕیسوابن، وە ببن بە پەند بۆ خەڵکانی تر. وە ئەگەر کوشتیانو ماڵەکەیان نەبردو بە جێیان هێڵا ئەوە تەنها دەکوژرێنەوە.

وە ئەگەر ماڵەکەیان برد بەڵام نەیانیان کوشت، ئەوە دەبێ دەستو قاچیان بە پێچەوانە ببردرێت، دەستی ڕاستو قاچی چەپ، وە ئەگەر خەڵکیان ترساندو کەسیان نەکوشت شار بە دەر دەکرێن، لە شوێنێکدا نیشتەجێ ناکرێن هەتا تەوبەیان ئاشکرا دەبێت. ئەمە وتەی ئیبنو عەبباسە (خوا لێی ڕازی بێت)، وە زۆرێک لە زانایان لەگەڵ هەندێ جیاوازی لە وردەکاریەکاندا ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ئەو بە پەند بوونە ﴿ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَا ﴾ ڕیسواییو سەرشۆڕی ئابڕووبردنیانە لە دنیادا ﴿ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕێگا بڕین لە گەورەترین تاوانەکانە، شایستەی ڕیسوایی دنیاو دواڕۆژە. وە ئەنجامدەرەکەی دوژمنی خواو پێغەمبەرەکەیەتی.

کەواتە: ئەگەر ئەو کارە گەورەترین گوناه بێت، لە بەرانبەردا پاککردنەوەی زەوی لە خراپەکارانو دابین کردنی ئاسایشی ڕێگاو بان لە کوشتنو دزینی ماڵو سامان لە گەورەترین چاکەکانو بەرزترین گوێڕایەڵیەکانە، وە چاکەکاریە لەسەر زەویدا، وەک چۆن پێچەوانەکەی خراپەکاریە لەسەر زەویدا.

﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡ ﴾ واتە: لە دوژمنە شەڕکەرەکان، ﴿ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ واتە: لەسەری لادەچێت ئەوەی کە ڕابوردووە لە

دادگایــی کردنی بە کوشــتنو هەڵواســینو بڕینی دەســتو قــاچ بە پێچەوانــەوەو دەرکردنی لــە وڵات. وە بــە هەمــان شــێوە لــە هەقی مرۆڤــەکان، ئەگــەر دوژمنەکــە کافر بوو پاشــان مســوڵمان بــوو.وە ئەگــەر دوژمنەکە مســوڵمان بوو، ئەوە مافــی خەڵکی لەســەری لا ناچێت لــە کوشــتنو بردنــی مــاڵو ســامان. وە بــە تێگەیشــتن لەم دەقــە ئامــاژە بــەوە دەکات کە تەوبــەی دوژمــن- پاش ئەوەی دەکەوێتە ژێر دەســت- هیچ شــتێکی لەســەر کــەم ناکاتەوە. وە حیکمــەت لــەوەدا ڕوونــە. وە ئەگــەر تەوبەکــەی پێــش ئــەوە بێــت کــە بکەوێتــە ژێر دەســت، ئــەوە تۆڵــەی بەســەردا ناســەپێت، وە ئەگەر تەوبەی لــە کارەکە کــرد پێش ئەوەی دەســەڵات بەســەریدا زاڵ بێــت ئــەو لە پێشــترە، بــۆ ئەوەی تۆڵەی بەســەردا نەســەپێ.

(٣٥): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣٥ ﴾.

ئــەم فەرمانــە لــە لایــەن خواوەیــە بــۆ بەنــدە بڕواداره‌کانــی، بــەوەی کــە لــە خوا بترســـنو فەرمانبــەرداری بکــەن، وە ئاگــادار بــن لــە خەشــم قیــنو تووڕەیــی، لەبــەر ئەوە پێویســتە لەســەر بەنــدە کــە هەرچــی لــە توانایدایــە بیخاتــە کار بۆ خــۆ بــە دوور گرتن لــەوەی کە خــوا تــووڕە دەکات، لە ســەرپێچیەکانی دڵو زمانو ئەندامانی جەســتە، ئەوەی کە ئاشــکراو نهێنیــە، پشــت بــە خوا ببەســتێت لەســەر وازهێنان لێــی، بۆ ئــەوەی ڕزگاری بێ لە خەشــمو قیــنو ســزای خوا.

﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾ واتــە: نزیــک بوونەوە، وە پلــەو پایەو ڕێز لــە لایەن خواوە، وە خۆشویســتن تەنهــا لەبەر خوا، ئەویــش بە هۆی ئەنجامدانــی فەرزەکانی نێــو دڵەوە، وەک خۆشویســتن لەبــەر ئــەوەو ترســانو هیواو ئومێــد بوونو ملکەچیو پشــت بەســتنو. وە ئەو فەرزانــەی کــە پەیوەندیــان بــە جەســتەوە هەیــە: وەک زەکاتو حــەج، وە پێکهاتــوو لــە فەرزەکانــی نێو دڵو جەســتە: وەک نوێژ کردنو هاوشــێوەکانی لە جۆرەکانــی خوێندنەوەو یادکردنــەوە، وە جۆرەکانــی چاکــە بەرانبەر بە دروســت کراوەکانی خوا بە ماڵو زانســتو خانەدانــیو جەســتەو، وە ئامۆژگاری بەندەکانــی خوا، هەموو ئەم کردەوانــە نزیک خەرەوەن لــە خــوا، وە بــەردەوام بەندە لە خوا نزیــک دەبێتەوە هەتا خوا خۆشــی دەوێ، ئەگەر خۆشــی ویســت ئــەوە دەبێتــە ئەو بیســەرەی کە پێی دەبیســتێت، وە ئــەو بیناییەی کە پێــی دەبینێت، وە دەســتەکانی کــە پێــی دەوەشــێنێت، وە پێیەکانی کە ڕێــی پێ دەکات، وە خــوای گەورە نــزاو پاڕانەوەکانی لــێ وەر دەگرێت.

پاشــان خــوا هەنــدێ لــە عیبادەتەکان کــە بــڕوادار نزیــک دەکەنــەوە لێی تایبــەت کردوە وەک: جیهــادو تێکۆشــان لە پێنــاوی خوادا کە بریتیە لە: کۆشــش کردن لە کوشــتار کردن بەرانبــەر بێبــڕواکان، بــە ماڵو بــە گیانو بۆچــوونو زمانو هەوڵــدان بۆ سەرخســتنی دینی خــوا، بــە هەمــوو تواناکانی بەندە، چونکە بەڕاســتی ئەم جــۆرە لە گەورەتریــن عیبادەتەکانو چاکترینیانە.

لەبــەر ئــەوەی هــەر کەســێک بەمــە هەســتێت ئەوەکانــی تــر بــە ئاســانی ئەنجامــدەدات ﴿ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ ئەگــەر لــە خــوا بترســن لــە وازهێنــان لــە ســەرپێچی کردن، وە بــە دوای هۆکارەکانــدا بگەڕێــن بــۆ گەیشــتن بــە خــوا، وە بگەڕێــن بــە دوای هەمــوو هۆکارێکــدا کــە نزیکتــان بکاتــەوە لــە خوا بــە جێبەجــێ کردنــی فەرمانەکانــی، وە جیهاد بکــەن لــە پێنــاو ڕەزامەندی خــوادا. (الفــلاح): بریتیە لە ســەرکەوتوو بوون لە هەمــوو ئەوانە کــە حــەزی لێیەتــی، وە ڕزگــار بوون لــە هەمــوو ئەوانــەی ترســی لێیەتــی، حەقیقەتەکەی خــۆش بەختــی هەتــا هەتایــیو چێژی هەمیشــەییە.

(٣٦-٣٧): ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لِيَفْتَدُوا بِهِ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٣٦﴾ يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا مِنَ النَّارِ وَمَا هُم بِخَارِجِينَ مِنْهَا وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٧﴾ ﴾:

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی خراپــی دۆخــی بێبــڕواکان لــە ڕۆژی دواییــداو ئــەو ســەرەنجامە خراپــەی کە بەســەریاندا هاتــوە، وە ئەگــەر هەرچی لــە زەویدا هەیە ببیەخشــن بــۆ ئــەوەی ڕزگاریــان بــێ لە ســزای خوا، ئــەوە بــە دڵنیاییــەوە لێیــان وەرناگیرێــتو هیچ بەهایەکــی نیــە، چونکــە شــوێنو کاتــی بەخشــین کۆتایی هــات، ئــەوەی ماوەتــەوە تەنها ســزای بە ئێشــە کــە بەردەوامــەو هەرگیــز لێــی ڕزگاریــان نابێت، بەڵکــو بۆ هەتــا هەتایی تیایــدا دەمێننەوە.

يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَا ۖ
وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٧﴾ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟
أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ
حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ
يَتُوبُ عَلَيْهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ
لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغْفِرُ
لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٠﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ مِنَ
ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ
ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ ۛ سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوْمٍ
ءَاخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ۖ
يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ
فَٱحْذَرُوا۟ ۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمْ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ۚ لَهُمْ
فِى ٱلدُّنْيَا خِزْىٌ ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٤١﴾

(٣٨-٤٠): ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤٠﴾ ﴾:

(السـارق): واتـە: دز: ئەو کەسـەیە کە ماڵی بەرانبەرەکـەی ببـات بـە شـاراوەیی‌و بەبێ ڕەزامەنـدی ئـەو، ئـەو تاوانـە یەکێکـە لـە تاوانـە گـەورەکان کە سـزایەکی ناشـرینی لەسـەر پێویسـت دەکرێت، ئەویـش بریتیە لـە بڕینـی دەسـتی ڕاسـتی، وەک چـۆن لە خوێندنـەوەی هەنـدێ لـە هاوەڵاندا هاتوە، بە گشـتی شـوێنی بڕینی دەسـت دیـاری کراوە کـە لـە مەچەکەوەیـە. ئەگـەر (کەسـێک) دزی کـرد دەسـتی دەبڕی لـە مەچەکـەوە، وە دەخرێتـە نێـو ڕۆنـەوە هەتـا خوێنەکـەی بوەسـتێتەوە، بەڵام سـوننەت ئـەم دەقـەی بەندار (قیـد) کـردوە لە چەنـد ڕوویەکـەوە: لەوانـە: (الحـرز) پاراسـتن‌و پەنهانی، پێویسـتە دزی کردنەکـە لـە شـوێنێکی پارێـزراودا بێت، وە شـوێنی پەنهانی هەمـوو ماڵێک ئەو شـوێنەیە کـە پارێـزراوە لـە لایـان‌و بـە نهێنـی ماڵەکەیانـی تێـدا دەشـارنەوە، ئەگـەر دزی کـرد لە ماڵێکـدا کـە پارێـزراو نەبوو ئـەوە دەسـتی نابڕدرێـت. وە لەوانە: پێویسـتە ماڵـە دزراوەکە بگاتـە ئەندازەیـەک کە شـەرع بـۆی دیاری کـردوە، ئەویـش بریتیە لـە (ربع دینـار)، یان سـێ درهـەم، یـان بـە ئەنـدازەی ئـەو دووانـە، ئەگـەر لـەوە کەمتـری دزی، ئەوە دەسـتی نابڕدرێـت، وە ڕەنگـە ئەمـە لـە وشـەی (السرقـة)و ماناکـەی وەرگیرابێت، چونکە وشـەی (السرقـة) بریتیـە لـە بردنی شـتێک لە شـوێنێکدا بێـت نەکرێـت پارێزگاری لـێ بکرێت. بۆیـە دەبـێ ئـەو ماڵە لە شـوێنی پارێـزراودا بێـت، ئەگەر لە شـوێنێکدا بـێ پارێـزراو نەبێ پێـی ناوترێت دزی، ئـەو حوکمەی بەسـەردا جێبەجـی ناکرێت.

وە بــە هەمــان شــێوە حیکمەتــی تێدایــە کــە دەســت نەبڕدرێت لەبەر شــتی کەمو بــێ نرخ، بۆیــە پێویســتە ئەندازەی بــۆ دیــاری بکرێت، ئەوە ئەنــدازە شــەرعیە دەقی قورئانــی تایبەت کــردوە، کە دەســتی دز لە شــتی بچــووکو بێ نرخــدا نەبڕدرێــت، وە حیکمەت لــە بڕینی دەســتی دز، پاراســتنی ماڵو ســامانەکانە، وە دەبــێ ئەو دەســتە ببڕدرێت کــە تاوانەکەی پێ ئەنجامــداوە، ئەگــەر دووبارەی کــردەوە پێی چەپــی دەبڕدرێــت، ئەگەر گەڕایــەوە، وتراوە: دەســتی چەپــی دەبڕدرێت، پاشــان پێــی ڕاســتی، وە وتــراوە: زیندانی دەکرێــت هەتا مردن.
وە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا ﴾ واتــە: تۆڵــەی ئەوەیــە کــە دزەکە ماڵو ســامانی خەڵکــی دزیــوە، ﴿ نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ ﴾ واتــە: بــۆ تەمێکــردنو ترســاندنی دزەکــەو کەســانی هاوشــێوەی ئــەون، وە تاکــو بــۆ خەڵکــی ببێتە وانــەو پەند کەس نەتوانێت دەســت بــۆ ماڵی خەڵکــی ببات بــە ناهەق.
﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾ واتە: بە باڵادەستیو کار دروستیو حیکمەتەوە دەستی دزی بڕیوە.
﴿ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾ خــوا لەو کەســە خۆش دەبــێ کــە داوای لێبــوردن دەکات، وە کردەوەی چاک ئەنجــام دەدات.
وە لەبــەر ئــەوە بەڕاســتی ئــەوەی لــە ئاســمانەکانو زەوی دایە تەنهــا موڵکی خوایــە، چۆنی بــوێ بە ویســتی خــۆی ڕایدەپەڕێنێت بــە ڕاپەڕاندنــە قــەدەریو شــەرعیەکان، وە لێبووردنو ســزا، بە پێی داخوازی کاردروســتیو حیکمەتی خــۆی، وە میهرەبانی بەرفــراوانو لێبوردەیی بێ ســنووری.

(٤١-٤٤): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٤١ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٤٢ وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوۡنَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٣ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ

وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾:

پێغەمبەر ﷺ بە هۆی زۆری نەرمو نیانیو سوور بوونی لەسەر خەڵکی بۆ ئیمان هێنانیان، خەمبار دەبوو کاتێک کە دەیبینی کەسێک بڕوا دەهێنێو پاشان هەڵدەگەڕێتەوە بۆ بێبڕوایی، خوای گەورە ڕێنمایی کرد کە خۆی بێتاقەتو خەمبار نەکات لەسەر ئەو جۆرە کەسانە، چونکە بەڕاستی ئەوانە نە لە کاروانیدان، وە نە لە شەڕدان. ئەگەر ئامادەشبن هیچ سوودێکیان نیە، ئەگەر دیاریش نەبن هەست بە بینینیان ناکرێ، لێرەدا خوا ﷻ هۆکاری ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە پێویست ناکات پێغەمبەر ﷺ خەمیان بۆ بخوات، دەفەرموێ: ﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡ ﴾ بە ڕاستی ئەو کەسانەی شایستەی ئەوەن خەمیان بۆ بخورێت بڕواداڕانن، ئەوانەن کە بە دڵو بە زمان بڕوایان هێناوە، خوا نەکات، ئەوانە لە ئاینی خۆیان هەڵبگەڕێنەوە، بێگومان بڕوا ئەگەر تێکەڵی دڵو جەستەی کەسێک بوو لە خاوەنەکەی جیا نابێتەوەو بە هیچ نایگۆڕێتەوە ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ ﴾ واتە: جوولەکە ﴿ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَ ﴾ واتە: زۆر گوێ بۆ درۆی خوا نەناسان دەگرنو شوێن پێی ئەوان هەڵدەگرن، کە بێگومان هەموو کاروبارەکانیان لەسەر درۆو گومراییو فریودان دارشتوە. وە ئەوانەش بریتین لە سەرکردەکانیان ﴿ لَمۡ يَأۡتُوكَ ﴾بەڵکو پشتیان تێکردوویو دڵیان بەو شتە بێ بنەمایانەی خۆیان خۆش بووە، ئەویش گۆڕینی مانای وشەکانی (تەورات) بوو، بە پێی حەزو ئارەزووی خۆیان نەک بە ویستی خوا، ئەویش بۆ گومرا کردنی خەڵکیو بەرپەرچدانەوەی ڕاستی کە شوێنی شتی ئەستەم کەوتوون، ئەوانەی کە سەرچاوەی درۆن لە پێناو گەیشتن بە ئاواتەکانیان ئامادەن هەموو درۆیەک بکەن، ئەوانە عەقڵیان نیە. بە هەمان شێوە خەم بۆ ئەوانە مەخۆ کە شوێنت ناکەون، چونکە ئەوانە لە ئەوپەڕی بێ نرخیدان، وە کەسی ناتەواو بێ نرخ گوێ بە هیچ شتێک نادات‌و بە بای خەیاڵیدا نایەت ﴿ يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْ ﴾واتە: ئەمە قسەیانە کاتێ بڕیاریان بۆ دەدەی، هیچ مەبەستێکیان نیە جگە لە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو نەبێت. هەندێکیان بەوی تریان دەڵێن: ئەگەر موحەممەد ﷺ بڕیاری بۆ دان هەمان ئەو بڕیارەی کە لەگەڵ هەواو ئارەزووتاندا دەگونجێ، ئەوە

بڕیارەكـەی وەربگـرن. وە ئەگـەر بـەوە بڕیـاری بۆتـان نـەدا، ئـەوە خۆتـان بپارێـزن. بە ڕاسـتی ئەمە فیتنەو شـوێنكەوتنی هەواو ئـارەزووە ﴿ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا ﴾ وە وەک لـە شـوێنی دیكەدا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ٥٦ ﴾ القصص.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡ ﴾واتـە: لەبـەر ئەوەی كـە كردیان. وە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی كە هەر كەسـێک مەبەسـتی ئـەوە بێت شـوێنی هەواو ئـارەزووی بكەوێـت، ئەوەیـە كاتێک كـە كێشـەیەكی دەباتە بەردەم شـەریعەت، ئەگـەر فەرمانەكە لە قازانجـی ئـەو بێـت، ئەوە بـێ دوو دڵـی وەریدەگرێـت، وە ئەگەر بـە پێچەوانە بێـت، ئەوە تـوورە دەبێـتو وەری ناگرێـت، بە ڕاسـتی ئـەوە پاک نەبوونـی دڵ دەگەیەنێـت. وە چۆن ئەگـەر كەسـێک كێشـەیەكی دەبات، یـان دەبرێتـە بەردەم شـەرعی خوا، ئەگـەر بڕیارەكە بگونجـێ لەگـەڵ ئارەزوویـدا یـان نەگونجـێ ئـەو هـەر پێـی ڕازیە، ئـەوە بەڵگەیە لەسـەر پاكـی دڵ. وە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی پاكـی دڵ هۆكارێكە بۆ هەموو خێـرو چاكەیەک، وە باشـترین هـۆكارە بۆ هـەر وتەیەكی دانایانەو هۆشـیارانە، وە كردەوەی ڕاسـتو دروسـت.

﴿ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ ﴾ واتە: ڕیسـواو سەرشـۆڕ دەبـن ﴿ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ ئەویـش ئاگـرو توورەیـی خوایە.

سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ ۚ فَإِن جَآءُوكَ
فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ ۖ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن
يَضُرُّوكَ شَيْـًٔا ۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٤٢﴾ وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ
وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ
ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٣﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ
فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟
لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن
كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ
وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم
بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبْنَا
عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ
بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ
قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن
لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾

﴿سَمَّٰعُونَ لِلْكَذِبِ﴾ واتە: (ئەو جوولەکانە زۆر گوێ قوڵاخی درۆن، ئەویش بە هۆی کەم دینیو کەم عەقڵیان، گوێ دەگرن بۆ کەسێک کە بانگیان بکات بۆ قسەی درۆو بێ بنەما. ﴿أَكَّٰلُونَ لِلسُّحْتِ﴾ واتە: ماڵی حەرام دەخۆن، بەو پارانەی کە بە ناهەق وەریدەگرن لە خەڵکە بێ ئاگاو گەمژەکانیان وەک موچەیەک، هەتا پێکەوە کۆیان کردەوە لە شوێنکەوتنی درۆو خواردنی ماڵی حەرام. ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحْكُم بَيْنَهُمْ أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ واتە: تۆ ئازادی لەوەدا بە ویستی خۆت بڕیاریان لەسەر بدە، وە ئەم دەقە نەسخ نەکراوەتەوە، بێگومان- ئەمە بۆ هاتنی ئەو جۆرە کەسانەیە کە دێن بۆ لای- هەواڵ دەدات لە نێوان ئەوەی بڕیاریان لە نێواندا بدات، یان وازیان لێ بهێنێت، چونکە ئەوان مەبەستیان بڕیاری شەرعی نیە، مەگەر بگونجێت لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا، وە لەسەر ئەمە هەر کەسێک کە داوای فەتوا، یان حوکمێکی شەرعی لە زانایەک بکات، ئەگەر زاناکە بە حاڵی کەسەکەی زانی، ئەگەر حوکمەکەی بەسەردا بدات ڕازی نابێت، ئەوە پێویست ناکات نە حوکمەکەی بۆ بدات نە فەتواکە. وە ئەگەر دادوەری کرد لە نێوانیاندا پێویستە بە دادگەرانە بێت، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْـًٔا ۖ وَإِنْ حَكَمْتَ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾ ئەگەر چی ستەمکارو دوژمنیش بن، با ئەوە ڕێگر نەبێت لە دادپەروەری کردن لە نێوانیاندا، وە لەمەدا ئاشکرا کردنی گەورەیی‌و چاکەی دادپەروەری لە نێوان خەڵکیدا دەردەکەوێت، وە بێگومان خوا خۆشی دەوێت.

پاشان بە سەر سوڕمانەوە دەفەرموێ: ﴿وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ بێگومان ئەگەر ئەوان

بـڕوادار بوونایـە کاریـان بەوە دەکـرد کە بڕواهێنان پێویسـتی کردوە لەسـەریان -پشـتیان نەدەکـرد لـە بڕیاری خـوا کە لە تەوراتـدا هەیە لـە بەردەسـتیاندا، تەنها لەبەر ئـەوە دەهاتنە لات شـتێک ببیننـەوە کـە لەگـەڵ ئارەزووەکانیانـدا بگونجێـت. وە کاتـێ دادوەریت کرد لـە نێوانیانـدا بە بڕیـاری خوا کە لەگـەڵ ئـەوەی خۆیاندا بگونجێـت، بە هەمان شـێوە ڕازی نابـن بـەوە، بەڵکو پشـتی تێدەکەن.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەوانـەی ئەمـە کردارەکانیانە ﴿بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ واتـە: ئـەوە لـە سـیفەتو سروشـتی بـڕوادار نیـە، وە شایسـتەی بڕواداریـش نیـن، چونکە هـەواو ئارەزوویان کـرد بە پەروەردگاریـان، وە ئەحکامەکانی ئیمانیان کردە شـوێنکەوتەی هـەواو ئارەزوویانەوە، ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ﴾ (ئێمە تەوراتـــمان نارده خوار) بۆ مووسـای کـوڕی عیمـران ﷺ ﴿فِيهَا هُدٗى﴾(مـرۆڤ) ڕێنمایـی دەکات بـۆ بـڕواو ڕاسـتی، وە دەیپارێـزێ لـە گومڕایی ﴿وَنُورٞ﴾ڕووناکـی دەدات لە تاریکی نەفامـیو گومانو دوودڵی ئـارەزووەکان، وەک دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلۡفُرۡقَانَ وَضِيَآءٗ وَذِكۡرٗا لِّلۡمُتَّقِينَ ٤٨﴾الأنبیـاء.

﴿يَحۡكُمُ بِهَا﴾ لە نێوان ئەوانەی کە جوولەکەن لە کاروبارو فەتواکاندا ﴿ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ﴾ واتە: ئەو پێغەمبەرانەی کە ملکەچ بوون بۆ فەرمانەکانی خوا، ئەوانەی مسوڵمانێتیان گەورەترە لە مسوڵمانێتی جگە لە خۆیان، وە ئەوان پاکترینی بەندەکانی خوای گەورەن. جا ئەگەر ئەو پێغەمبەرە بەرزو بەڕێزانە شوێنی بکەونو لە خۆیاندا جێبەجێ بکەن، چی ڕێگری لەو جوولەکە بێ نرخانە دەکات کە شوێنی نەکەون؟ چی وای لێکردوون بڕوا هێنان بە موحەممەد ﷺ پشت گوێ بخەن، کە هیچ کردارێکی ناو دڵو ئاشکرا وەرناگیرێت تەنها بە بیڕوا بوون بەو پەیامە نەبێ؟ ئایا ئەوان پێشەوایەکیان هەیە لەو کارەدا، بەڵی پێشەوایان هەیە پیشەیان لادانو گۆڕینی دەقەکانە، وە بیر لە پلەو پایەی ناو خەڵکی دەکەنەوە، وە پاڵدانەوە بە شاردنەوەی ڕاستیو ئاشکرا کردنی شتی پڕو پووچ، بەڕاستی ئەوانە پێشەوای گومڕان کە خەڵکی بانگ دەکەن بۆ دۆزەخ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ﴾ واتـە: بـە هەمـان شـێوە فەرمان بە تـەورات دەکـەن پێشـەوا خواناسـەکانیان (الربانیـون)، واتە: زانـا فێـرکارە خواناسـەکانیان، ئەوانەی کـە خەڵکیـان پـەروەردە دەکرد بـە جوانترین شـێوە، وە لەگەڵیانـدا ڕێبـازی پێغەمبەرانی بە سـۆزیان دەگرتـە بەر.

(الأحبـار) واتــە: زانـا گــەورەکان، ئەوانەی پەیـڕەوی وتەکانیــان دەکرێ، وە شـوێنەواریان دەمێنــێو خـاوەن قسـەن لـە نێـو ئۆمەتەکەیانـدا. ئـەوە حوکمـی ڕاسـتەقینەیە دەربـارەی ئـەوان کـە لەگـەڵ ڕاسـتیدا دەگونجێـت ﴿ بِمَا ٱسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ﴾ واتـە: بـە هـۆی ئـەوەی کە بـە ڕاسـتی خـوا ئەوانی کـردە پارێــزەر بۆ کتێبەکـەی، وە کردنـی بە دەسـتپاک بۆ پاراسـتنی، ئەو کتێبە سـپاردەیە کە لـە لای ئەوانە، پێویسـت بووە لەسـەریان بیپارێزن لـە هەر زیادەو شـاردراوەو ناتەواویـەک، وە فێر کردنی ئـەو کەسـەی کـە نایزانێت. ئەوان شـایەتن بەسـەریەوە، بە هۆی ئـەوەی کە پرسـیار لەوان دەکـرێ دەربـارەی ئـەوەی کە لـە خەڵکی لێـی دوو دڵن، خـوا ﷻ ئەو ئەرکەی خسـتوەتە سـەر شـانی خاوەن زانستەکان، نەیخسـتوەتە سـەر شـانی نەفامەکان، کەواتە پێویستە هەستن بـەو بـارەی کـە لەسـەر شـانیانە، وە بـا پەیـڕەوی نەفامـان نەکـەن بـە دانیشـتنو بەتاڵیو تەنبەڵی.

وە بـا تەنهـا ئـەو پەرستشـانە نەکـەن کـە پێویسـتە لەسـەریان، لـە جۆرەکانـی زیکـرو یادکردنـەوەو نوێـژو زەکاتو حـەجو ڕۆژوو وە هاوشـێوەی ئەوانـە، ئەگـەر جگـە لـە زانایـان پێی هەسـتێت ئـەوە ڕزگاری بووە. بـەڵام خاوەن زانسـتەکان وەک چۆن پێویسـتە لەسـەریان دەروونـی خۆیـان پـاک بکەنەوە، بـە هەمان شـێوە پێویسـتە لەسـەریان خەڵکی فێـر بکـەنو ئاگاداریـان بکەنـەوە لـەوەی کـە ئاینەکەیان پێویسـتی بـە چیە؟ بـە تایبەت کاروبـارە بنەڕەتیـەکان، وە ئەوانـەی کـە زۆر ڕوو دەدەن، نابـێ لـە خەڵکی بترسـن بەڵکو پێویسـتە تەنهـا لـە پەروەردگاریـان بترسـن، لەبـەر ئەمـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ ڕاسـتیەکان بشـارنەوەو پـووچو بەتاڵـەکان ئاشـکرا بکـەن، لەبـەر چێژێکـی کەمـی دنیـا، وە ئـەم بەڵایانـە ئەگەر زانـا لێـی پارێــزراو بێــت، ئەوە سـەرکەوتوو خۆشـبەخت دەبێت، بـەوەی کە تەنهـا هەموو خەمێکـی تێکۆشـان بێـت بـۆ زانسـتو زانیـاری، وە دەبێـت ئـەوە بزانێـت خـوای گەورە ئـەو زانسـتەی کە پێـی بەخشـیوە بۆ ئەوەیـە پارێزگـاری لە ئایـن بـکات، وە کردوویەتی بـە شـایەت بەسـەریەوە، دەبـێ لـە پەروەردگاری بترسـێت، ترسـی خەڵکـی ڕێگـر نەبێت لـەوەی کە لەسـەری پێویسـتە ئەنجامی بـدات، وە چاکـەی دونیا نەدات بەسـەر دیندا، وەک چـۆن نیشـانەی نەگبەتـی زانـا ئەوەیـە لـە دەسـتبەتاڵیدا بێـت، بـە ئەرکی سەرشـانی خۆی هەڵنەسـێت، وە بـە خەیاڵیشـیدا نەیـەت ئەرکـی سەرشـانی ڕاپەڕێنێـت، لـە بیری بـکاو لە

دەستی بدات، ئەوە بە ڕاستی دینی فرۆشتوە بە دنیا، لە دەسەڵاتداران بەرتیلی وەرگرتوە، وە پارەو پوولی لە بری فتواکانی وەرگرتووە، وە بەندەکانی خوای تەنها بە پارەو پوول فێر کردوە. ئەمە خواش منەتێکی گەورەی کردوە بەسەریدا، لە تاوانەکانی خۆش بووە، وە بەشێکی گەورەی لە بەهرەی خۆی پێی بەخشیوە، بێبەشە لێی بێجگە لە ئەو.

خوایە داوات لێ دەکەین بە زانستێکی بەسوود، وە کردارێکی وەرگیراو، وە پێمان ببەخشیت لێبوردنو بەخشندەیی خۆت، دوور لە هەموو بەڵایەک ئەی بەخشندەی میهرەبان.

﴿ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾ واتە: لە هەقی ڕوونکراوەیە، وە فەرمان کردن بە دوورکەوتنەوە لە شتی بەتاڵو پوچ، لە بەر مەبەستێک لە مەبەستە خراپەکانی ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾ وە حوکم کردن بە جگە لەوەی کە خوا دایبەزاندوە لە کردەوەی بێبڕواکاندا، وە هەندێ جار کوفرێکە خاوەنەکەی لە بازنەی ئیسلام دەخاتە دەرەوە، ئەوە ئەگەر بڕوای وابێ حەڵاڵەو دروستە. وە هەندێ جار دەبێتە تاوانێک لە تاوانە گەورەکانو کردەوەی بێبڕواکانە، کە بێگومان هەر کەسێک ئەو کارە ئەنجام بدات شایستەی ئەوەیە سزایەکی بە ئێشی تووش ببێت.

(٤٥): ﴿ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ بِٱلۡأَنفِ
وَٱلۡأُذُنَ بِٱلۡأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ
كَفَّارَةٞ لَّهُۥۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾

ئەم بڕیارانە لەو کۆمەڵە بڕیارانەن کە لە تەوراتدا هاتووە، ئەو پێغەمبەرانە فەرمانی پێدەکەن کە مسوڵمانو ملکەچ بوون -بۆ خوا- لە نێو جوولەکەکاندا حوکمیان پێدەکرد، هەروەها مشوورخۆرانو زانایان.

بێگومان خوا ﷻ لەسەر جوولەکەکان پێویستی کرد لە تەورات دا ئەگەر کەسێک بە ناڕەوا کەسێک بکوژێت لە بری ئەودا دەکوژرێتەوە، بە مەرجێک بە ئەنقستو هاوشان بێت، وەک چۆن چاو بە چاو دەردەهێنرێت، وە گوێ بە گوێ، وە ددان بە ددان دەردەهێنرێت. وە ئەوەی وەک ئەمانەیە یان هاوشێوەیانە، لەو شوێنانەی کە پێویستە تۆڵەو سزای لێ بکرێتەوە بەبێ زێدەڕۆیی ﴿ وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞ ﴾ وە تۆڵە کردنەوە ئەوەیە کە هەر چیەکی ئەنجامداوە بەو شێوەی لێ بکرێتەوە. هەر کەسێک بە ئەنقست کەسێکی بریندار کرد ئەوە دەبێت وەک خۆی بریندار بکرێتەوە، بە تۆڵەو سزا، وە

شـوێنی تایبـەت، بە پێـی درێژیو پانـیو قوڵـی. وە بۆ ئـەوەی بزانرێت کە شـەرعی پێش ئێمـە شـەرعە بـۆ ئێمە بـە مەرجێک شـتێک لە شـەرعی ئێمەدا نەهاتبـێ بـە پێچەوانەی ئەو.
﴿ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ ﴾ واتـە: لـە تۆڵـە سـەندنەوە لە کوشـتنی کەسـێک، یـان لە خوار ئـەوەوە لـە ئەندامەکانی جەسـتە، بـەوەی لە کەسـێک خۆش ببێ ئەگـەر تاوانێکـی بەرانبەر کـرا، وە پێـش ئـەوەی کـە لێـی خۆش ببـێ مافەکـەی بۆ جێگیـر کرابـێ، بەڵام ئـەو لێی ببـورێ ﴿ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ﴾ واتـە: ئـەوە دەبێتە سـڕینەوەی گوناهی کەسـی بکوژ، یان تاوانبـار، چونکـە مـرۆڤ ئەگـەر لـە مافەکـەی خـۆی خـۆش بـوو. خواش لـە پێشـترە لە لێبـوردن لـە مافی خۆی، وە بـە هەمان شـێوە دەبێتە مایـەی سـڕینەوەی گوناهەکانی خاوەن هـەق، بێگومـان وەک چـۆن لەو کەسـە خۆش بوو کە سـتەمی لـە خۆی یان کەسـوکاری کـردوە، بـە هەمان شـێوە خـوا ﷻ لەو خـۆش دەبێ.
﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾ ئیبنـو عەبیـاس (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵێـت: کوفرێکـە خوارتـر لە کوفر، وە سـتەمێکە خوارتر لە سـتەم، وە فاسـیق بوونێکـە لـە خـوار فاسـیق بـوون، ئـەوە سـتەمێکی زۆر گەورەیە، لـە کاتێکدا بـە حەڵاڵی بزانـێ، وە تاوانێکـی گەورەیـە کـە ئەنجامـی بداتو بـە حەڵاڵـی نەزانێت.

وَقَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ
مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ فِيهِ هُدٗى وَنُورٞ وَمُصَدِّقٗا
لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ٤٦
وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم
بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٤٧ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ
ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ
وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ
عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ
وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ
فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ٤٨ وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم
بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ
بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم
بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ٤٩ أَفَحُكۡمَ
ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ٥٠

(٤٦-٤٧): ﴿ وَقَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ فِيهِ هُدٗى وَنُورٞ وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ (٤٦) وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ (٤٧) ﴾:

واتە: شوێنکەوتنی ئەو پێغەمبەرانەش، ئەوانەی کە فەرمانیان بە تەورات دەکرد بە بەندەو نێردراوی خۆمان عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام)، ڕووحو گیانێکە لە لایەن خواوە ﷻ بە فەرمایشتی خۆی (ببە) بە جبریلدا بۆ مەریەم، وە بەڕاست دانەری تەوراتە کە لە پێش ئەوەوە هاتوە، وە ئەو شایەتە بۆ مووسا (عليه السلام)و کتێبە پیرۆزەکەی بە هەق، وە پشتیوانو سەرخەری بانگەوازەکەیەتی، وە بڕیاردەرە بە شەریعەتەکەی، وە لەگەڵیدا گونجاوە لە زۆرێک لە کاروبارە شەرعیەکان.

وە هەندێ جار عیسا (عليه السلام) کار ئاسانتر بووە لە هەندێ لە بڕیارەکاندا، وەک خوا ﷻ (لەسەر زاری عیسا (عليه السلام)) دەفەرموێ: ﴿ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ (٥٠) ﴾ آل عمران.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ ﴾ ئەو کتێبە گەورەی کە تەواوکەری تەوراتە ﴿ فِيهِ هُدٗى وَنُورٞ ﴾ ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست، وە هەق لە باتڵو پووچ جیا دەکاتەوە ﴿ وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ ﴾ (عیسا (عليه السلام)) بەڕاست دانەرو جێگیرکەریەتی، وە شایەتی بۆ دەداو پەسندی دەکات، ﴿ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾ بە ڕاستی ئەوانەن کە سوود لە ڕێنماییو ئامۆژگاری وەردەگرن، وە خۆیان بە دوور دەگرن لەو شتانەی کە شایستەی ئەوان نیە.

﴿ وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ﴾ واتە: (گاورەکان) دەبێت پابەند بن بە

کتێبەکەیانەوە، وە دروست نیە بۆیان لێی لا بدەن، ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾(واتە: هەر کەسێکیش بەوە حوکم نەکات کە خوا دایبەزاندوە، ئا بێگومان ئەوانەن لارێ بووان).

(٤٨-٥٠): ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُواْ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ ﴾واتە: قورئانی پیرۆز (مان بۆ دابەزاندووی)، بەرێزترین و باشترین (کتێبە)، ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾ واتە: بە هەق دامانبەزاندووەو هەقیشی لە خۆگرتوە، لە هەواڵەکانو فەرمانو قەدەغەکراوەکانی ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾چونکە شایەتی بۆ دەداو لە گەڵیدا دەگونجێتو وە دەقاو دەقو رێک هاواڵەکانیان لە یەکتر دەچێت، وە شەریعەتە گەورەکانی هەمان ئەو شەریعەتەیە کە هەواڵی پێیداوە بۆیە بووە بە ڕاست دانەری هەواڵەکانی.

﴿ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴾واتە: چاودێرە بەسەر هەموو کتێبەکانی پێش خۆی، وە زیاتر لە داواکاری پەروەردگارو خوڕەوشتی دەروونی لە خۆ دەگرێت، بێگومان قورئان شوێن هەموو ڕاستیەک کەوتوە کە کتێبە پیرۆزەکانی پێش خۆی ئاماژەیان پێکردوە، بە هەمان شێوە قورئانیش فەرمانی پێکردوە، وە هانی لەسەر داوە، وە زۆر ڕێگای دیاری کردوە بۆ گەیشتن پێی.

قورئان ئەو کتێبەیە کە هەواڵی پێشینو دواینی باسکردوە، وە ئەو کتێبەیە کە هەمان بڕیارو دانایی و فەرمانەکانی تێدایە، کە لە کتێبەکانی پێشوودا خراوەتە ڕوو، ئەوەی قورئان شایەتی بۆ دابێ ئەوە وەرگیراوە، وە ئەوەی شایەتی بۆ دابێ لەسەر ڕەتکردنەوە ئەوە ڕەتکراوەتەوە کە بێگومان گۆڕانو جێ گۆڕکێی تێدا کراوە، ئەگەر نا لە لای خواوە هاتبێ، قورئان پێچەوانەی نابێت ﴿ فَٱحْكُم

﴿ بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾ لـە بریـاری شـەرعی ئەوانـەی کـە خـوا ﷻ دایبەزاندوە بەسـەرتدا. ﴿ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾ واتـە: بـا هـەواو هـەوەس‌و خراپـەکاری ئـەوان وات لـێ نـەکات پێچەوانـەی ڕاسـتی بجولێتیـەوە، لـە بـری ئـەوەی کـە ڕاسـتیت بـۆ دابەزیـوە، پاشـان ئـەوەی کـە نـزم‌و خـوارە بیگۆڕیتـەوە بـەوەی کـە خێـرو چاکـە. ﴿ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ ﴾ ئـەی ئۆممەتـەکان دامانـناوە ﴿ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴾ واتـە: بەرنامەو ڕێبازێکـی تایبـەت، ئـەو بەرنامـەو ڕێبازانـە دەگۆڕێـت بـە پێـی گۆڕانـی ئۆممەتـەکان، وە بـە پێـی کات‌و شـوێن دەگۆڕێـت، هەمـووی دەگەڕێتـەوە بـۆ دادپـەروەری لـەو کاتـەی کـە دابەزیـوە، بـەڵام بنەمـا گـەورە گشـتیەکان کـە بەرژەوەنـدی‌و دانایـی تێدایـە لـە هەمـوو سـەردەمێکدا وەک یەکـن‌و گۆڕانیـان بەسـەردا نایـەت، بەڵکـو دەبێتـە بەرنامـە بـۆ هەمـوو شـەریعەتەکان ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾ شـوێنی یـەک ڕێبـاز دەکەوتـن، جیـاوازی نەدەبـوو ئـەوەی کـە لـە پێـش هاتبـوو ئەوەشـی کـە لـە دوایـی دەهـات، هەمـوو وەک یـەک دەبـوو.

﴿ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ﴾ هەتـا تاقیتـان بکاتـەوە بزانـێ چـۆن کار دەکـەن، وە هەمـوو گەلێـک تاقـی دەکاتـەوە بـە پێـی ویسـت‌و حیکمەتـی کـە دەیخـوازێ، وە هەمـوو گەلێـک ئـەوەی پێدەبەخشـێت کـە لەگەڵیانـدا دەگونجێـت، وە هەتـا کێبڕکـێ لـە نێـو گەلەکانـدا دروسـت ببێـت، بێگومـان هەمـوو گەلێـک سـوورە لەسـەر ڕێبـازی پێشـینی خـۆی، وە بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾ واتـە: پەلـەی تێـدا بکـەن‌و تـەواوی بکـەن، چونکـە بەڕاسـتی چاکـەکان گشـتگیرن بـۆ هەمـوو فـەرزو سـوونەتێک، لـە مافەکانـی پەروەردگـارو لـە مافـی بەنـدەکان، وە خاوەنەکـەی نابێتـە پێشـین بـۆ کەسـانی تـر، تەنهـا بـە دوو هـۆکار نەبێـت: دەستپێشـخەری بـۆ بـکات، وە هـەل‌و دەرفـەت بقۆزێتـەوە کاتـێ کـە وەختـی دێـت، وە کۆشـش بـکات بـۆ بەجێهێنانـی لەسـەر ئـەو شـێوەی فەرمانـی پێکـراوە، وە ئـەم دەقـە دەکرێـت بـە بەڵگـە بـۆ بەجێهێنانـی نوێـژو هاوشـێوەی لـە یەکـەم کاتیـدا، وە بـە هەمـان شـێوە پێویسـتە لەسـەر بەنـدە تەنهـا بـەوەوە نەوەسـتێت چـی دروسـتە لـە نوێـژو هاوشـێوەکانی لـەو پەرستشـانەی کـە پێویسـتن، بەڵکـو دەبێـت بـەو سـوونەتانە هەڵسـێت کـە دەتوانێـت ئەنجامیـان بـدات، بـۆ ئـەوەی تـەواوو کامـڵ بێـت، بـۆ ئـەوەی بـەو کارە پێشـینی بـە دەسـت بهێنێـت.

﴿ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا ﴾ كـە گەلەكانـی پێشـوو ئەوانەشـی بـە دوای ئەوانـدا دێـن هەموویـان لـە داهاتوویەكـی نزیكـدا خـوا ﷻ كۆیـان دەكاتـەوە لـە رۆژێكـدا كـە هیـچ گومانێكـی تێدانیـە ﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴾ لـە رێبـازو بەرنامـەو كـردەوەكان، ئەوانـەی رێبـازی ڕاسـتو كـردەوەی چاكیـان هەیـە پاداشـتیان دەكات، وە سـزای سـەرپێچكاران دەدات.

﴿ وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾ ئـەم دەقەیـە كـە وتـراوە: نەسـخی ئـەم دەقـە دەكات ﴿ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ ﴿٤٢﴾ ﴾المائـدة. بـەڵام بۆچوونـی ڕاسـت ئەوەیـە كـە نەسـخی نـاكات، وە ئـەو دەقـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی كـە پێغەمبـەر ﷺ ئـازادە لـە نێـوان ئـەوەی كـە دادوەریـان لـە نێوانیانـدا بـكات یـان نەیـكات، بـە هـۆی ئـەوەی ئـەوان مەبەسـتیان نیـە دادوەری بـە هـەق بكـەن. ئـەم دەقـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئەگـەر دادوەری كـرد لـە نێوانیانـدا، ئـەوە دادوەری دەكات بـە قورئـانو سـوننەت. ئـەوە ئەوپـەڕی دادپەروەریـە كـە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِ ﴿٤٢﴾ ﴾المائـدة. ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ڕوونكردنـەوەی دادپـەروەری، كـە نێوەرۆكـی بریتیـە لـەو یاسـاو بنەمایانـەی كـە خـوای گـەورە دایبەزانـدوە، ئـەوە گشـتگیرە بـۆ ئەوپـەڕی دادپـەروەری، وە ئـەوەی پێچەوانـەی ئەمـە بێـت زوڵمو سـتەمە.

﴿ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ ﴾ قەدەغەكردنـی دووبـارە كردۆتـەوە لـە شـوێنكەوتنی هـەواو ئارەزوویـان، بـە هـۆی ئـەوەی كـە زۆر خـۆی لێـێ بپارێزێـت، چونكـە بێگومـان ئـەوە لـە پلـەی دادوەریو فەتـوا دایـە، بەڵكـو فراوانتـرە، وە ئەمـە لـە پلـەو پایـەی دادوەریدایـە، وە لـە هەردووكیانـدا پێویسـتە شـوێنی هـەواو ئـارەزووی ئـەوان نەكـەوێ كـە پێچەوانـەی ڕاسـتیە، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ ﴾ واتـە: ئاگـادارو وریابـە، فریـوت نـەدەن، تووشـی بـەڵاو فیتنـەت بكـەنو بتترازێنـن لـە هەنـدێ لـەوەی خـوا ﷻ بۆتـی ناردوەتـە خـوارەوە، ئـەو كات شـوێنكەوتنی ئارەزووەكانیـان دەبێتـە مایـەی وازهێنـان لـە هـەقو ڕاستی، كـە پێویسـتە شـوێنی بكەوێـت ﴿ فَإِن تَوَلَّوۡاْ ﴾ لـە شـوێنكەوتنی تـۆو شـوێنكەوتنی هـەق ﴿ فَٱعۡلَمۡ ﴾ (بزانـە) بێگومـان ئـەوە سـزایە بـۆ سـەریان، وە خـوا ﷻ دەیەوێـت ﴿ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡ ﴾ بێگومـان گونـاه سـزای بـۆ دیـاری كـراوە دەسـت بەجـێو لـە داهاتـوودا، وە لـە گەورەتریـن سـزاكان ئەوەیـە كـە مـرۆڤ واز لـە شـوێنكەوتنی پێغەمبـەر ﷺ

بهێنێــت، ئەویــش بــە هــۆی تاوانیــەوە ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴾ واتە: سروشــتیان وایــە تــاوان دەکــەنو دەردەچــن لــە فەرمانبــەرداری خــوا ﷻو شــوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ ﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ﴾ واتــە: ئایــا بــە پشــت هەڵکردنیــان لە تــۆ دادوەریــی نەفامێتیان دەوێ، کــە ئەویــش بریتیــە لــە هــەر حوکمێــک پێچەوانــەی ئــەوە بێــت کــە خــوا ﷻ دایبەزانــدوە، هیــچ شــتێک لەوێــدا نیــە یــان حوکمــی خــواو پێغەمبەرەکــەی یــان حوکمــی نەفامــی.

ئــەوەی پشــت لــە یەکــەم هەڵبــکات، تووشــی بــەڵا دەبێــت بــە دووەم، کــە لەســەر نەفامــیو ســتەمو گومرایــی بنیــاد دەنرێــت، بۆیــە خــوا ﷻ پاڵــی داوەتــە لای نەفامــی. بــەڵام حوکمــی خــوا ﷻ لەســەر زانســتو دادوەریو ڕوناکــیو ڕێنمایــی بنیــات نــراوە ﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ بــڕوای ڕاســتەقینەو پتــەو (الموقن) ئەو کەســەیە کــە دەزانێــت جیــاکاری بــکات لــە نێــوان ئــەو دوو حوکمــەدا، وە بتوانێــت جوانــیو پاکــی حوکمــی خــوا جیــا بکاتــەوە، وە(الیقیــن) بریتیــە لــە زانســتێکی تــەواو کــە کــرداری لەگەڵــدا بێــت.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ٥٢ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ ٥٣ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٥٤ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ ٥٥ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ٥٦ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٥٧

(٥١-٥٣): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ٥٢ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ ٥٣ ﴾

خوا ﷻ ڕێنمایی به‌نده‌ ئیمانداره‌كانی ده‌كات كاتێک كه‌ بۆی ڕوونكردنه‌وه‌ دۆخی جووله‌كه‌و گاوره‌كان، وه‌ سیفه‌ته‌ خراپه‌كانیان كه‌ به‌ هیچ شێوه‌یه‌ک نه‌یانكه‌ن به‌ دۆست‌و خۆشه‌ویست، چونكه‌ بێگومان ئه‌وان هه‌ندێكیان دۆستی هه‌ندێكی تریانن، یه‌كتر سه‌رده‌خه‌ن له‌ ناو یه‌كداو به‌رانبه‌ر به‌ دوژمنانیان ده‌بن به‌ یه‌ک ده‌ست، ده‌ی كه‌واته‌: ئێوه‌ ئه‌وان مه‌كه‌ن به‌ دۆست، چونكه‌ ئه‌وان دوژمنی ڕاسته‌قینه‌ی ئێوه‌ن.

هیچ به‌ خه‌یاڵیاندا نایه‌ت زیانتان پێ بگات، به‌ڵكو هیچ قه‌درو ڕێزێكیشتان ناگرن ئه‌گه‌ر گومڕا ببن، هیچ كه‌س پشتیوانیان ناكات‌و دۆستایه‌تیان بۆ ده‌رنابڕێت جگه‌ له‌وانه‌، وه‌ له‌به‌ر ئه‌مه‌یه‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡ ﴾ چونكه‌ پشتیوانی ته‌واو گواستنه‌وه‌ بۆ ئاینی ئه‌وان ده‌گه‌یه‌نێ، وه‌ پشتیوانی ده‌ربڕینی كه‌م قۆناغ به‌ قۆناغ به‌ره‌و زیاد بوون ده‌ڕوات هه‌تا كه‌سه‌كه‌ ده‌بێت به‌ یه‌كێک له‌ ئه‌وان. ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ واته‌: ئه‌وانه‌ی كه‌ وه‌سف كراون به‌ سته‌م كردن، وه‌ ته‌نها بۆ لای خوا ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌، ئه‌گه‌ر به‌ هه‌موو به‌ڵگه‌و نیشانه‌یه‌ک بڕۆی بۆ لایان شوێنت ناكه‌ون‌و ملكه‌چ نابن بۆت. كاتێک كه‌ خوای گه‌وره‌ قه‌ده‌غه‌ی كرد له‌ بڕواداران پشتیوانی بێبڕواكان بكه‌ن، هه‌واڵی دا كه‌ كۆمه‌ڵێک هه‌ن خۆیان به‌ بڕوادار ده‌زانن، پشتیوانی‌و دۆستایه‌تی (جووله‌كه‌و گاور) ده‌كه‌ن، ده‌فه‌رموێ: ﴿ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ ﴾ واته‌: گومان‌و دوو ڕوویی، وه‌ لاوازی ئیمان، ده‌یانوت: ئه‌گه‌ر ئێمه‌

پشتیوانی گاورو جوولەکە بکەین لەبەر پێویستیە، ئەوە ئێمە ﴿ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ ﴾ واتە: لەوە دەترسین لە لایەن جوولەکەو گاورەوە تووشی بەڵایەک ببین، ئەگەر سەرکەوتن بۆ ئەوان بوو، ئەوە ئێمە لە لای ئەوان پشتیوانێکمان هەیە، ئەمەش گومانی خراپ بردنیانە بە ئیسلام، خوا ﷻ لە وەڵامی گومانە بەدەکانیاندا دەفەرموێ: ﴿ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ ﴾ بێگومان خوا ﷻ ئیسلام سەردەخات بەسەر جوولەکەو گاورەکانداو لە ناویان دەبات ﴿ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ ﴾ فەرمانێک دەردەکات بۆ ئابڕو بردنو بێ ئومێد بوونی ناپاکو دووڕەکان، وە تێکشکاندنو لە ناوبردنی بێبڕواکان لە جوولەکەو هاوشێوەکانیان ﴿ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ ﴾ واتە: ئەو کارە دزێوەی کە شاردبوویانەوە ﴿ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ﴾ پەشێمان بنەوە لە سەر ئەو زیانو ناپاکیە بە بێ ئەوەی هیچ قازانجێکیان دەست بکەوێت لە بە دەست هێنانی ئەو سەرکەوتنەی کە خوای گەورە بەخشی بە ئیسلامو مسوڵمانانو ڕیسوا کردنی کوفرو بێبڕواکان، ئنجا پەشێمان بوونەوەو خەمو خەفەتێکی زۆریان بە دەست هێنا کە تەنها خوا خۆی پێی دەزانێ، ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ بڕواداران سەریان سووڕدەمێنێ لە حاڵی ئەو دوو ڕووانەی کە لە دڵیاندا نەخۆشی هەیە، دەڵێن: ﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ ﴾ واتە: ئەمانە بوون بە توندی سوێندیان دەخواردو جەختیان دەکردەوە کە هەتا سەر لەگەڵتانینو پشتیوانتان دەکەین لە سەرکەوتنو خۆشویستنو دۆستایەتیدا.

خوا ﷻ ئەوەی کە شاردیانەوە ئاشکرای کرد، وە ئەو فێڵەی کە کردیانو ئەو گومانەی کە بە ئیسلامو مسوڵمانان بردیان فێڵەکەیان بەتاڵ کردەوە ﴿ أَعۡمَٰلُهُمۡ ﴾ کردەوەکانیان لە دنیادا ﴿ فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴾ کاتێک کە ئامانجەکانیان لە دەستچوو، تووشی ناخۆشیو سزا بوون.

(٥٤): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٥٤ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات ئەو بێباکە لە هەموو جیهان، بێگومان هەر کەسێک لە ئاینەکەی هەڵبگەڕێتەوە هیچ زیان بە خوای گەورە ناگەیەنێت، وە خوا ﷻ بەندەگەلێکی دڵسۆزو کۆمەڵە پیاوێکی ڕاستگۆی هەیە، خوای میهرەبانو بەخشندە گرەنتی داوە بە ڕێنمایی کردنیان، وە پەیمانی داوە بە ئامادەکردنیان، ئەوان تەواوترینی دروستکراوەکانی خوای گەورەن لە وەسفکردندا، وە بەهێزترین دەروونو جوانترین ئاکاریان هەیە، خوا ﷻ ﴿ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴾ بەڕاستی خوشەویستی خوا ﷻ بۆ بەندەکەی لە گەورەترین ئەو بەهرانەیە کە

پێی بەخشیوە، وە گەورەترین چاکەیە کە خوا ﷻ ڕشتوویەتی بەسەر بەندەکەیدا، ئەگەر بەندەیەکی خۆش بوێ کاری بۆ ئاسان دەکاتو نارەحەتیەکانی لەبەردەم سووک دەکات، وە سەرکەوتووی دەکات بۆ کاری چاکەو واز هێنان لە کاری خراپە، وە خۆشەویستی دەخاتە دڵی بەندەکانیەوە.

لە پێویستیەکانی خۆشویستنی خوای پەروەردگار بۆ بەندەکەی، پێویستە خۆی برازێنێتەوە بە شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاشکراو بە نهێنی، لە گوفتارو کردارەکانو هەموو حاڵەتەکانی تردا، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣١ ﴾آل عمران.

یەکێکی تر لە پێویستیەکانی خۆشویستنی خوای پەروەردگار بۆ بەندەکەی، دەبێ زۆر یادی خوا ﷻ بکاتەوە خۆی لێی نزیک بکاتەوە بە فەرزو سوننەتەکان، وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەی صەحیحدا لە پەروەردگاریەوە دەیگێڕێتەوە دەفەرموێ: {وما تَقَرَّبَ إليَ عَبْدي بشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ وَمَا يَزَالُ عَبْدي يَتَقَرَّبُ إلي بالنَّوَافلِ حتَّى أُحِبَّهُ فإذا أَحْبَبْتُهُ كنت سَمْعَهُ الذي يَسْمَعُ بِهِ وَبَصَرَهُ الذي يُبْصِرُ بِهِ وَيَدَهُ التي يَبْطِشُ بها وَرِجْلَهُ التي يَمْشِي بها وَإِنْ سَأَلَني لَأُعْطِيَنَّهُ وَلَئِنْ اسْتَعَاذَني لَأُعيذَنَّهُ} (أخرجه البخاري برقم: (٦١٣٧)).

واتە: بەندەکەم لە من نزیک نابێتەوە بە شتێک کە لە لای من زۆر خۆشەویست بێ، ئەوەندەی ئەو فەرزانەی کە پێویستم کردوە لەسەری، وە بەردەوام بەندەم لە من نزیک دەبێتەوە بە سوننەتەکان، هەتا خۆشم دەوێ، ئەگەر خۆشم ویست ئەوە دەبم بە بیسەری کە دەیبیسێت، وە بینەری کە دەیبینێت، وە دەستی وا لێ دەکەم تەنها بۆ کاری چاکە بە کاریبێنێ، وە بە هەمان شێوە پێی کە ڕێی پێدەکات، ئەگەر داوام لێبکات ئەوە پێی دەدەم، وە ئەگەر داوای پشتیوانیم لێبکات پشتیوانی لێ دەکەم.

وە یەکێکی تر لە پێویستیەکانی خۆشویستنی خوا ﷻ ناسینێتیو زۆر یادکردنێتی، چونکە بێگومان خۆشویستن بەبێ ناسین ناتەواوە، بەڵکو هەر بوونی نیە. ئەگەر بانگەشە بۆ کردنیشی بوونی هەبێت، هەر کەسێک خوای خۆش بوێت زۆر یادی دەکات، وە ئەگەر خوا ﷻ بەندەی خۆش بوێ کەمترین کردەوەی لێوەردەگرێو زۆرترین پاداشتی پێدەبەخشێو لە زۆرێک لە هەڵەو پەڵەکانی دەبورێ.

وە لە سیفەتی بڕوادارەکانە کە ﴿ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ ئەوان بەرانبەر بڕواداران خۆ بە کەم زانن لە ڕووی خۆشویستنو ئامۆژگاری کردنو نەرمو نیانیو

دڵسۆزیو میهرەبانیەوە، وە هەر کەمو کورییەکیان هەبێ لە ناو یەکتردا پڕی دەکەنەوە. وە لە سەر بێبڕواکان ئەوانەی کە دژایەتی ئایەتەکانی خوا ﷻ دەکەنو پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە درۆ دەخەنەوە، زاڵنو هەموو توانایەکیان دەخەنە کار لەسەر دژایەتی کردنیان، گشت هۆکارێک بەکاردەهێنن لە پێناو ئەوەی سەرکەون بەسەریاندا.

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ ﴿٦٠﴾ ﴾الأنفال.

ڕەقیو توندی بەرانبەر بە دوژمنانی خوا بەندە لە خوا نزیک دەکاتەوە، وە لەگەڵ خوای گەورەدا کۆک دەبێ لە توورەیی بەرانبەر بێبڕواکان، ڕەقیو توورەیی بەرانبەریان ڕێگری ناکات لە بانگەواز کردنیان بۆ لای ئیسلام بە جوانترین شێوە، لێرەدا دوو شت کۆدەبێتەوە توورەیی بەرانبەریان وە نەرمو نیانی لە بانگکردنیاندا، لە هەردوو بارودۆخەکەدا بەرژەوەندیو قازانجی ئەوانی تێدایە ﴿ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ بە ماڵو گیانیان وە بە گوفتارو کرداریان ﴿ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ﴾ بەڵکو ڕەزامەندی پەروەردگاریان پێش دەخەن، وە ترسان لە سەرزەنشتی خوا زیاتر لە سەرزەنشتی مرۆڤەکاندا، ئەمە بەڵگەیە لەسەر بەهێزیو بە توانابیان، بێگومان دڵی لاوازو توانای لاواز دەبێو ورەی دەڕوخێ لە بەرانبەر سەرزەنشتی سەرزەنشتکاراندا، لە ناخیاندا پەرستنی غەیری خوای تێدایە بە پێی ئەوەی کە ڕەزامەندی خەڵک پێش دەخەن بەسەر ڕەزامەندی خوادا، وە دڵ تەندروست نابێ لە پەرستنی غەیری خوا هەتا لە پێناوی خوادا گوێ بە لۆمەی لۆمەکاران نادات، وە کاتێک خوای گەورە منەتی خۆی دەکات بەسەریاندا بەو سیفەتە جوانو پلە بەرزانە، هەواڵی داوە کە ئەمە لە چاکەو گەورەیی ئەوەوەیە لەبەر ئەوەی لە خۆبایی نەبن، وە سوپاس گوزاری ئەو کەسە بن کە منەتی کردوە بەسەریاندا هەتا زیاتر لە چاکەی خۆی پاداشتیان بداتەوە، لەبەر ئەوە جگە لە برواداران‌یش بزانن کە فەزڵو چاکەی خوا ﷻ پەردەی بەسەرەوە نیە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾ واتە: چاکەی بەرفراوانە سوپاسی بێ پایانە بەڕاستی میهرەبانی هەموو شتێکی گرتۆتەوە، وە بەرانبەر بە دۆستانی بەرفراوانترە، کە بۆ جگە لە ئەوان بەو شێوە نیە، بەڵکو زۆر زانایە بەوەی کە کێ شایستەی فەزڵو چاکەیە پێی دەبەخشێ، خوای پەروەردگار زاناترە پەیامەکەی لە کوێدا دادەنێت.

(٥٥-٥٦): ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾:

کاتێــک دۆســتایەتی بێبڕاواکانــی قەدەغــە کــرد لەســەر مســوڵمان لــە جوولەکــەو گــاورو هاوەشــێوەکانیان، وە باســی دەرەنجامیشــی بــۆ کــردن کــە بێگومــان دۆڕاندنێکی ڕوونو ئاشــکرایە، خــوا ﷻ هەواڵــی دا کــێ پێویســتە پشــتیوانی لــێ بکرێــت، پاشــان ســوودو بەرژەوەنــدی ئــەوەی بــاس کــردوە، دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ﴾ پشــتیوانی خــوا ﷻ بــە بــڕواداران‌و لــە خــوا ترســان هەســتی پێدەکرێــت، هەمــوو بڕوادارێکــی لــە خــوا تــرس‌و خۆپارێــز دۆســت‌و خۆشەویســتی خــوای گەورەیــە، وە هــەر کەســێک ببێــت بــە دۆســتی خــوا ئــەوە دۆســت‌و پشــتیوانی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، وە هــەر کەســێک خــواو پێغەمبــەر ﷺ بــکات بــە پشــتیوان، ئــەوە پێویســتە پشــتیوانی ئەوانــە بــکات کــە ئــەوان دۆســتایەتی دەکــەن، کــە ئەوانیــش بڕوادارانــن ئەوانــەن کــە بڕوایەکــی ڕاســتەقینەیان هەیــە بــە ئاشــکراو بــە نهێنــی، وە دڵســۆزیان نوانــدوە بــۆ پەرســتراویان بــە بەجێهێنانــی نوێژەکانیــان بــە هەمــوو مەرجــەکان‌و فــەرزو تەواوکاریەکانــی، وە چاکــە خــواز بــن لەگــەڵ خەڵکیــداو زەکاتــی ماڵەکەیــان بــە جوانــی دەر بکــەن‌و بیــدەن بــە کەســانی شایســتە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴾ واتە:ملکەچی خوای گەورەن بە زەلیلی، مەبەست لە (أداة الحصر) ئامڕازی بەستنەوە لە ڕستەی: ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا الَّذِينَ ﴾ بەڵگەیە لەسەر بەستنەوەی دۆستایەتی‌و خۆشەویستی‌و پشتیوانی لەوانەی کە باسکران، وە خۆ بەری کردن لە پشتیوانی جگە لەوان.

پاشان باس لە سوودو کەڵکی ئەم دۆستایەتی‌و پشتیوانیە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَٰلِبُونَ ﴾ واتە: ئەوە لەو حیزب‌و تاقمەیە کە دراوتە پاڵ خوا ﷻ بە درانە پاڵێکی بەندایەتی‌و پشتیوانی، وە حیزب‌و کۆمەڵی خوا ﷻ سەرفرازو زاڵ‌و سەرکەوتوون، ئەوانەی کە ئاکامیان هەیە لە دنیاو دوارۆژدا، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ ﴾ الصافات.

ئەم ئایەتە مژدەیەکی گەورەیە بۆ ئەو کەسەی کە فەرمانی خوا ﷻ بە جێدەهێنێت‌و دەبێت بە حیزب‌و کۆمەڵ‌و تاقم‌و سەربازی ئەو، بێگومان زاڵ بوون‌و سەرکەوتن هەر بۆ ئەوە. ئەگەر چی هەندێ جار بە کاتی بیگۆڕێت دوژمن زاڵ بکات بە هۆی حیکمەتێکەوە کە خۆی دەیەوێت، بەڵام سەرەنجام زاڵبوون‌و سەرکەوتن هەر بۆ بڕوادارن دەبێ، دەی کێ لە خوا ﷻ فەرمایشتی ڕاسترو بە جێ ترە؟!

(٥٧-٥٨): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾:

خوا ﷻ قەدەغەی دەکات لە بەندە بڕوادارەکانی کە خاوەن کتێبەکان لە جوولەکەو گاورو هەموو شوێنکەوتووانی کە بێبڕواکان بکەن بە دۆستو هاوەڵ، خۆشیانیان بوێنو پشتیوانیو دۆستایەتیان بکەن، وە نهێنی بڕوادارانیان لە لا بدرکێننو لە هەندێ کاروباردا یارمەتیان بدەن کە زیان بە ئیسلامو مسوڵمانان بگەیەنێت، وە دەبێت ئەو ئیمانەی کە هەیانە ڕێگریان لێ بکات لە دۆستایەتیو پشتیوانی کردنیان، وە هانیان بدات بۆ دژایەتی کردنو ڕق لێ بوونەوەیان. بە هەمان شێوەش پابەند بوونیان بە تەقواو لە خوا ترسان، ئەوە فەرمانبەرداریتی فەرمانەکانی خوا دەگەیەنێو دوورکەوتنەوە لە سەرکۆنەکردنەکانی، کە وایان لێ بکات دژایەتیان بکەن.

بە هەمان شێوە ئەوە ڕێبازی بتپەرستو بێبڕواکانو ئەوانەی کە پێچەوانەی مسوڵمانانن لە سەری دەڕۆن، لە گاڵتە کردن بە ئاینی مسوڵمانانو لا قرتێو گەمەو گاڵتە پێکردنیانو بە کەم زانینو بە بچووک تەماشا کردنیان، بە تایبەت بە نوێژ کە گەورەترین دروشمی مسوڵمانانە، وە گەورەترینی عیبادەتەکانیانە، ئەو (دوو ڕووانە) هەر کات بانگ بکرێن بۆ نوێژ گاڵتەو یاریی پێدەکەن، ئەوەش بە هۆی بێ عەقڵیو گەمژەییو نەفامیانەوەیە، خۆ ئەگەر عەقڵیان تەواو بووایە ملکەچ دەبوون بۆی، وە دەیانزانی ئەوە لە گەورەترینو باشترینی نێو چاکەکانە کە دەروونی پێ پاک دەبێتەوە.

ئەی بڕوادارەکان! ئەگەر دۆخی بێبڕواکانو دژایەتی توندیان بۆ خۆتانو ئاینەکەتان زانی، ئەگەر هەر کەسێک دوای ئەمە دژایەتیان نەکات ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئیسلام لە لای زۆر هەرزانە، وە ئەو بێ باکە لەوەی گاڵتەی پێبکرێتو تانەی لێبدرێت، وە بەڕاستی ئەو هیچ پیاوەتیو مرۆڤایەتیەکی تێدا نیە.

چۆن بانگەشە بۆ ئاینێکی ڕاست دەکەی کە هیچ کەمو کورتیەکی تێدانیە، لەگەڵ ئەوەدا دۆستایەتی کەسانێک دەکەی کە گاڵتەو لاقرتێ بە ئیسلامەکەت دەکەن، بەوەشەوە ناوەستن بەڵکو گاڵتە بە شوێنکەوتوانی دەکەن، لە نەفامانو کەم عەقڵەکان، بەڕاستی ئەمە جۆرێک لە هاندانی تێدایە بۆ دژایەتی کردنیان، ئەمە ئاشکرایە لە لای هەر کەسێک کەمترین تێگەیشتنی هەبێت.

وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ
لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا
بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٥٩﴾
قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ
عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ
مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَقَد
دَّخَلُوا۟ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا۟ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْتُمُونَ
﴿٦١﴾ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ
ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٢﴾ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ
وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟
يَصْنَعُونَ ﴿٦٣﴾ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟
بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا
مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ
وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا
ٱللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾

(٥٩-٦٣): ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ
مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن
قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٥٩﴾ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم
بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ
وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ
وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن
سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا
وَقَد دَّخَلُوا۟ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا۟ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ
بِمَا كَانُوا۟ يَكْتُمُونَ ﴿٦١﴾ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ
فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ
مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٦٢﴾ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ
وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ
لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾:

﴿ قُلْ ﴾ واتـە: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ (بڵێ:) ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ (ئـەی خـاوەن کتێبـەکان!) کـە پەیوەسـت کردنیانـە بـەوەی دینـی ئیسـلام دینێکـی هـەق‌و واقیعییـە، وە گاڵتـەو تانـەو توانـج لێدانیـان لـەو ئاینـە پێویسـتە سەرزەنشـت بکرێـن لەسـەری، ﴿ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ ﴾ واتـە: ئایـا ئێمـە ناتەواویەکمـان هەیـە جگـە لـەوەی کـە بڕوامان بە خـواو کتێبەکانی پێشـوو داهاتوو هێنـاوە، وە بە پێغەمبەرانی پێشـوو ئەوانەشـی کە لە دوای ئەوانـەوە دێـن، ئێمـە جەخت دەکەینـەوە کە هەر کەسـێک بەم شـێوەیە بڕوانەهێنـێ، ئەوە بێبڕوایەکـی سـەرکەش‌و لـە سـنوور دەرچـوە؟ ئایا هیـچ ڕەخنـەو ڕقێکتان لە ئێمـە هەیە، بێجگـە لـەوەی بڕوامـان هێنـاوە بەو خوایـەی کە هەمـوو فەرزەکانی پێویسـت کـردوە لە سـەر هەمـوو پـێ سـپێردراوەکانی؟!! وە لەگەڵ ئەمـەدا زۆربەتان سەرکەشـن‌و سـەرەڕۆن، واتـە: لـە فەرمانـی خـوا دەرچوون‌و بوێـرن بەرانبەر بـە سـەرپێچی کردنی خوا، باشـتر وایە ئـەی دوو ڕووەکان ئێـوە بێدەنـگ بـن، ئەگەر ناتـەواوی ئێـوە، وە ئێوە پارێـزراون لە دوو ڕوویـی‌و سەرکەشـی، ئەوە خراپەکاری سـوکتر بـوو لە تانەدانتانـدا لەگەڵ سەرکەشـیتاندا. لەبـەر ئـەوەی تانەیان لە بڕواداراندا دەیسـەلمێنن ئەوان لەسـەر خراپەن. خـوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ قُلْ ﴾ پێیــان بڵــێ، دەربــارەی ئــەو کارە قێزەونانەی ئەوان لەســەری دەڕۆن: ﴿ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ ﴾ ئــەوەی کــە دەربــارەی ڕەخنەتان لە ئێمە دەگــرت، لەگەڵ دابەزینــی ئێوەدا، (بەڵکــو ئەوەی پاداشــتی خراپتــرە لە لای خوا ﷻ) ﴿ مَن لَّعَنَهُ اللَّهُ ﴾ واتە: ئەوە کەسێکە کە خــوا دووری خســتبێتەوە لــە میهرەبانــی خۆی ﴿ وَغَضِبَ عَلَيْهِ ﴾ وە ســزای دابــێ لە دنیاو دواڕۆژدا ﴿ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ ﴾ (الطاغـوت): بریتیە لە شــەیتان، وە هەمــوو شــتێک بەندایەتــی بکرێــت جگە لە خــوا ﷻ ﴿ أُولَٰئِكَ ﴾ ئەوان کە باســکراون بەو ســیفەتە ناشــرینانە ﴿ شَرٌّ مَّكَانًا ﴾ لــەو بڕوادارانەی کــە میهرەبانی خوا لێیانــەوە نزیکەو خوا لێیــان ڕازی بــووە، وە لــە دنیاو دواڕۆژدا پاداشــتیانی داوەتەوە، چونکە بە دڵســۆزیەوە خوایان دەپەرســت، وە ئــەم جــۆرە لــە بەکارهێنانــی (فعـل التفضيـل) کە لــە (باب)ی خــۆی، وە بە هەمــان شــێوە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَأَضَلُّ عَن سَوَاءِ السَّبِيلِ ﴾ دوورترین کەســن لــە ڕێگای ڕاســت ﴿ وَإِذَا جَاءُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا ﴾ بــە دووڕوویــیو فــرتو فێــڵو تەڵەکــەوە (هاتنە نێو ئیســلام) ﴿ وَقَد دَّخَلُوا ﴾ بێبڕوایــی دەگرێتــەوە ﴿ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا بِهِ ﴾ بــە بێبڕوایــی هاتنــە ژوورەوەو بــە بێبڕوایــش دەرچوون کەچــی وا گومانیان دەبــرد ئەوان بــڕوادارن، ئایا کەس هەیــە لــەوان خراپتر بێو لــە خراپترین دۆخــدا بێ؟! ﴿ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا يَكْتُمُونَ ﴾ پاداشــتی کردەوەکانیان بە شــەڕو خراپــە دەداتەوە.

پاشــان خــوا ﷻ بــەردەوام دەبــێ لەســەر ژماردنــی ناتەواویەکانیــان وەک بەرپــەرچ دانەوەیەکیــان لــە زامــدار کردنــی بڕوادارانــدا، دەفەرمــوێ: ﴿ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ ﴾ واتــە: لــە جوولەکــە ﴿ يُسَارِعُونَ فِي الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ ﴾ واتــە: ســوورنو دەسپێشــخەری دەکــەن لەســەر ئــەو تاوانو ســەرپێچیانەی کە پەیوەســتە بــە مافــی پەروەردگاریانــەوە، وە دژایەتی کردنی بەندەکان.

﴿ وَأَكْلِهِمُ السُّحْتَ ﴾ ئەوەیــە کــە حەرامــە، تەنهــا بــەوەوە نەوەســتاوە کــە ئــەوان ئەو کارە ئەنجــام دەدەن، بەڵکــو هەواڵیــداوە ئــەوان پەلەی تێدا دەکــەن، ئەمەش بەڵگەیە لەســەر پیســیو خراپیــان، بێگومــان دەروونیــان ڕاهاتــووە لەســەر ئەنجامدانی گوناهو ســتەم کردن، لەگــەڵ ئەمــەدا بانگەشــەی ئــەوە دەکەن کــە خــاوەن پلەو پایــەی بەرزن.

﴿ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ (خراپتریــن کارێکــە کە ئەوان ئەنجامــی دەدەن)، ئا ئەمە ئەوپەڕی سەرزەنشــت کردنو لەکەدار کردنیانە.

﴿ لَوْلَا يَنْهَاهُمُ الرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ الْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ السُّحْتَ ﴾ واتــە: ئــەوە بۆچــی

زاناکانیــان ڕێگــری ســەرپێچی کردنیــان لــێ نەدەکــردن، ئەوانــەی کــە خــوا منەتی خۆی کــردوە بەســەریاندا بــە زانســتو دانایی، بۆ ئــەوەی لەو نەفامیــە ڕزگاریان بێ کــە دەیکەن، وە هەروەهــا ببێتــە بەڵگە بەســەریانەوە.

بــە دڵنیایــی زانایــان لەســەریان پێویســتە کاروبــاری خەڵکی لــە حــەڵاڵو حەرامــدا ڕوون بکەنــەوە، وە ڕێگــای شــەرعیان بــۆ ڕوون بکەنــەوە، وە هانیــان بــدەن بــۆ کاری چاکــەو بیانترســێنن لــە شــەڕو خراپــە ﴿لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾.

(٦٤-٦٦): ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْۘ بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۚ وَأَلۡقَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ كُلَّمَآ أَوۡقَدُواْ نَارٗا لِّلۡحَرۡبِ أَطۡفَأَهَا ٱللَّهُۚ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادٗاۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَكَفَّرۡنَا عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ أَقَامُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِم مِّن رَّبِّهِمۡ لَأَكَلُواْ مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۚ مِّنۡهُمۡ أُمَّةٞ مُّقۡتَصِدَةٞۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ سَآءَ مَا يَعۡمَلُونَ ﴿٦٦﴾﴾:

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی وتە ناپەســندو ناشــرینەکانی جوولەکە، وە ئــەو بیروبڕوا ترســێنەرەیان، دەفەرمــوێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌ﴾ واتە: دەســتی خــوا زنجیر کراوو بەســتراوە، بۆیــە وا ڕژدو چرووکــە لــە خێرو چاکــەو بەخشــندەیی! ﴿غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ﴾ واتــە: ئەمــە دوعایەکــە لەســەریان بە چەشــنی ئەو وتەی کــە کردوویانــە، خوا ﷻ وەڵامــی دانــەوە کــە ئــەم ســیفەتی ڕەزیلــیو خێــر نەکــردن تەنیــا لــەوان دەوەشــێتەوە، ئــەوان ڕژدو چاوچنــۆکو چرووکتریــن مرۆڤــن، زۆر بــە کەمــی خێرو چاکــە دەکەن، وە خراپتریــن گومــان بــە خــوا ﷻ دەبــەن، بۆیە خــوا دووری خســتنەوە لــە میهرەبانــی خۆی، کــە بەخشــندەیی ئەو هەموو شــتێکی پۆشــیوە، وە جیهانو ئاســمانەکانو زەوی پــڕ کردوە، لەبــەر ئەمەیــە دەفەرمــوێ: ﴿بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُ﴾ قەدەغەی لەســەر نیە، هیچ بەرگریکەرێــک ناتوانێــت بەرگــری لێ بکات بۆ شــتێک ئەگــەر بیەوێ، بە ڕاســتی چاکەی خــوا ﷻ بــەردەوام والاو گوشــادە لــە دنیــاو دواڕۆژدا، فەرمانــی کــردوە بــە بەندەکانــی لە ڕووناکــیو بەخشــندەیی خــوا ﷻ کەڵــک وەربگــرن، دەرگــای چاکــەی خــوا لــە خۆیان دانەخــەن بە هــۆی ســەرپێچیەکانیانەوە.

دەســتەکانی هەمیشــە کراوەیــە بــە درێژایــی شــەوو ڕۆژ، وە خێــرو چاکــەی لــە هەمــوو

کاتەکانـدا پەیتـا پەیتـا دادەبارێنــێ، خــەمو خەفەتو پــەژارە لا دەبـات، هــەژار دەوڵەمەند دەکات، بەندکــراو ئــازاد دەکات، زۆردار دەشــکێنێت، وەڵامــی داوای داواکار دەداتــەوە، دەبەخشــێ بــە هــەژار، نــزای داواکاران وەردەگرێــت، وە نــازو نیعمەتــی خــۆی دەرێژێت بەســەر کەسـێکدا کــە داوای لێ نەکــردوە، وە لەو کەســەی دەبووریێت کــە داوای لێبوردنی لێـدەکات، ســەرپێچیکار لــە خێــرو چاکــەی خــۆی بێبــەش نــاکات، بەڵکو چاکــە خوازو خراپەکار ســوودی لێوەردەگرن، بەخشــندەیی خۆی دەبارێنێ بەســەر دۆســتەکانیدا، ســەریان دەخـات لــە کردەوە چاکەکاندا، پاشـان ستایشـیان دەکات لەسـەری‌و بۆیـان زیاتر دەکات، ئــەوەش لــە بەخشــندەیی خوایــە، وە پاداشــتیان دەداتــەوە بــە پەلــەو لــە داهاتــوودا، کە لە وەسـفکردن نایــەت، لــە کاتێکــدا بــە خەیاڵــی بەنــدەدا نایــەت، نــەرم‌و نیانــە لەگەڵیاندا لە هەمــوو کاروبارەکانیانــدا، وە چاکــەی خــۆی پێیــان دەگەیەنێــت، بــەڵاو نارەحەتیــان لــێ دوور دەخاتــەوە کــە هەســت بــە زۆربــەی ناکــەن، پاکــی بۆ ئــەو خوایــەی هەرچــی نازو نیعمــەت هەیــە لە لایــەن ئەوەوەیــە، وە تەنها بــۆ لای ئــەو دەگەڕێنەوە لە دوورخســتنەوەی ناخۆشـیەکان، پاکــی بــۆ ئــەو خوایە کــە کــەس ناتوانێــت وەســفەکانی بژمێرێــت، بەڵکو خــۆی وەک وەســفی خــۆی دەکات، بــەرزی‌و بڵنــدی بــۆ ئــەو خوایەی کــە لــە بەندەکانی بێئاگــا نابــێ بە قــەد چاوترووکانێک، بەڵکــو هیچ بوونێکیــان نیە مەگەر تەنها بە بەخشــندەیی ئــەو نەبێــت. دەک چــارە ڕەش بێــت ئــەو کەســەی بــە نەفامــی خــۆی وا گومــان دەبـات پێویســتی بــە پەروەردگــاری نیە، وە شــتێ دەداتە پــاڵ خوا کەوا شــایەنی نیــە، بەڵکو ئەگەر خــوا ﷻ مامەڵەی لەگــەڵ جوولەکەدا بکردایە لەســەر ئەو قســەی خۆیان‌و هاوشــێوەکانیان، ئــەوە بێگومــان لەنــاو دەچــوون‌و لە دنیــادا ئەوەنــدەی تر نامــۆو ڕەزا تــاڵ دەبــوون (بەڵکو ئەگــەر خــوا ﷻ بــە قســەی ئــەوان چــرووک بووایە، یەکــەم کەس ئــەو کــەم عەقڵانەی لە برسـان دەکوشــت) بــەڵام ئەوان ئــەو وتانــە دەڵێن، خــوای گەورە نــەرم‌و نیانــە لەگەڵیانداو لێیــان دەگــەڕێ‌و دەرفەتیان پــێ دەدات، بــەڵام پشــتگوێیان ناخات.

وە وتــەی: ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا﴾ ئەمــە گەورەتریــن ســزایە لەســەر بەنــدە، دەبوو ئــەو قورئانەی کە خــوا ﷻ دایبەزانــدوە بــۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ کــە ژیــان‌و دڵو دەروونــی تێدایــە، هەروەهــا خۆشــبەختی دنیــاو دوارۆژو ســەرکەوتنی هــەردوو دنیــای تێدایە، ئــەوە گەورەتریــن منەتە خــوای پەروەردگــار کردوویەتی بەســەر بەندەکانیــدا، وە پێویســت دەکات لەســەریان دەستپێشــخەری بکــەن بــۆ وەرگرتنی‌و خۆیان

ڕادەستی پەروەردگاریان بکەنو سوپاسگوزاری بن، دەکرێ لە بەرانبەر ئەمەدا گومڕایی‌و سەرکەشی‌و بێبڕوایی بەسەر بڕوادار هەڵبژێرێت، ئەویش بەهۆی پشت تێکردنی‌و ڕەتکردنەوەی‌و دژایەتی کردنی، وە بەرپەرچدانەوەی بە گومانی بەتاڵو پووچ.

﴿ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ هۆگری ناکەوێتە نێوانیانەوە، وە یەکتر سەرناخەن، وە لەسەر حاڵەتێک یەک دەنگ نابن بەرژەوەندی تێدا بێت، بەڵکو بە بەردەوامی ڕقو کینە لە دڵەکانیاندا هەیە، لە نێو یەکتردا دژ بە یەکترن هەتا ڕۆژی دوایی.

﴿ كُلَّمَآ أَوْقَدُواْ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ﴾ بۆ ئەوەی فێڵ لە ئیسلامو شوێنکەوتوانی بکەن، دەستپێشخەری دەکەنو چەند بارەی دەکەنەوە، تا بتوانن ئەسپی خۆیان تاودەدەن، ﴿ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ﴾ بە سەرشۆڕی‌و تێکشاندنی لەشکرەکەیانو سەرکەوتنی بڕواداران بەسەریاندا (خوا ئاگرەکەیان دەکوژێنێتەوە).

﴿ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ﴾ واتە: هەوڵ دەدەنو کۆشش دەکەن، بۆ بڵاوکردنەوەی خراپەکاری لەسەر زەویدا، بە سەرپێچی کردنو بانگەواز کردن بۆ ئاینە پووچەکەیان، لەمپەر دانان لەبەردەم ئەوانەی دێنە ناو ئیسلامەوە.

﴿ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ بەڵکو ڕقی لێیانە ئەوپەڕی ڕق لێبوون، وە لە داهاتویەکی نزیکدا پاداشتیان دەداتەوە لەسەر ئەوە.

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ
سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَاهُمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا
التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُوا
مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم ۚ مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ ۖ
وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَاءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴿٦٦﴾ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ
بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ
رِسَالَتَهُ ۚ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ
الْكَافِرِينَ ﴿٦٧﴾ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ حَتَّىٰ
تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ۗ
وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا ۖ
فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٦٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ
هَادُوا وَالصَّابِئُونَ وَالنَّصَارَىٰ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ
وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٩﴾ لَقَدْ أَخَذْنَا
مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَأَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ رُسُلًا ۖ كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ
بِمَا لَا تَهْوَىٰ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾

پاشـان خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَاهُمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴾ ئەمە لـە بەخشـندەیی‌و میهرەبانـی خۆیەتی، کاتێـک کـە باسـی شـتە نـا تـەواوو خراپەکانـی خـاوەن کتێبـەکان دەکات، لەگـەڵ وتـە پـڕو پووچەکانیانـدا، بانگیان دەکات بـۆ تەوبـەو داوای لێخۆشـبوون، وە ئـەوان ئەگـەر بڕوایـان بهێنایـە بـە خـواو بـە فریشـتەو سـەرجەم کتێبـەکانو کـۆی پێغەمبـەران، وە خۆیـان بپاراسـتایە لـە سـەرپێچی کـردن، ئـەوە خـوا ﷻ لـە گوناهەکانیـان خـۆش دەبـوو، ئەگـەر هەرچەنـدە زۆریـش بووایـە، وە دەیخسـتنە نـاو بەهەشـتەکانەوە، ئـەوەی تێدایـە کـە دڵ حـەزی لێـدەکاو چـاو لەززەتـی لـێ دەبینـێ.

﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ ﴾ واتـە: فەرمـانو قەدەغـە لێکراوەکانیـان بەجـێ بهێنایـە کـە لە تـەوراتو ئینجیلدا هاتـوە، وەک چۆن خـوای گەورە هانـی داون لەسـەری، وە لـە بەجێهێنانی تەوراتو ئینجیلـدا دەبوو بڕوایان بـە موحەممەد ﷺ و بـە قورئـان بهێنایـە، ئەگـەر ئـەم نیعمەتـە گەورەیـان بەجێبهێنایـە کـە خـوا ﷻ بـۆی دابەزانـدوون، واتـە: لـە پێنـاوی ئـەوانو گرنگیـدان بـە ئـەوان ﴿ لَأَكَلُوا مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم ﴾ واتـە:خـوا ﷻ دەرگـای ڕزقو ڕۆزی لێدەکردنـەوەو بارانـی بەسـەردا دەبارانـدنو زەوی بـۆ سـەوز دەکـردن وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ﴿٩٦﴾ ﴾ الأعـراف.

﴿ مِّنْهُمْ ﴾ واتـە: لە خاوەن کتێبـەکان، ﴿ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ ﴾ واتە: ئەوانـەی کار بە تەوراتو ئینجیـل دەکـەن، کردەوەیەک نـە زۆر بەهێزەو نە چالاکـە ﴿ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَاءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴾ واتـە: خراپـەو بەدکاریـان زۆر تێدایـە، بەڵام ئەوانەی پێـش ئەمان کەمتریـان تێدا بوو.

(٦٧): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٦٧ ﴾

ئەمـە فەرمانێکە لەلایـەن خوای گەورەوە بـۆ پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ بـە گەورەترین‌و ڕێزدارترینـی فەرمانەکانـی، کـە ئەویـش بریتیـە لـە ڕاگەیاندنی ئـەوەی خـوا دایبەزاندوە، دەچێتـە ئـەم چوارچێوەیـەوە هەمـوو فەرمانێـک کـە ئۆممەتەکەی لێـەوە وەریـان گرتبێ لـە عەقیـدەو کـردەوەکان‌و وتـەو بنەمـاو یاسـا شـەرعیەکان، وە سـەرجەم داواکاریەکانی پەروەردگـار، پێغەمبـەر ﷺ بە تەواوترین شـێوە پەیامەکـەی خۆی ڕاگەیاند، بانگەشـەی بۆ کـردو خەڵکی ئاگـادار کردەوەو مـژدەی پێیانداو کارئاسـانی بۆ کـردن، وە نەفامانی فێری زانسـت‌و زانیـاری کرد، تـا بوون بـە یەکێک لە زانـا خواناسـەکان، بێگومـان پێغەمبەر ﷺ بـە زمـان‌و بـە کـردەوەو بـە قورئـان ئاینەکـەی ڕاگەیانـد، هیچ چاکەیـەک نەمـا مەگەر ئامـاژەی پێکـردوە بـۆ ئۆممەتەکـەی، وە هیـچ شـەڕو خراپەیـەک نیـە مەگـەر ئاگاداری کردوونەتـەوە لێـی، وە شـایەتی بۆ دەدەن لـە گەیاندنـی پەیامەکەیدا لە بەڕێزترینـی نێو ئەم ئۆممەتـە لـە هاوەڵان (خـوا لێـان ڕازی بێـت)، وە لە پاش ئەوان لـە گـەورە زانایانی دین، وە پیاوانی مسـوڵمان.

﴿ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ ﴾واتـە: ئەگـەر وات نەکـرد ئـەوە ئەو پەیامـەی کە لەلایەن خـواوە بۆت دابەزیـوە ڕات نەگەیانـدوە ﴿ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ ﴾واتە: فەرمانی خـوات جێبەجێ نەکردوە. ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ واتـە: ئەمـە پارێزگاریەکـە لەلایـەن خـواوە ﷻ بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ لـە خەڵکـی، وە بەڕاسـتی پێویسـتە سـووربونی تـۆ لەسـەر فێرکـردن‌و پێگەیانـدن بێـت، بـا خەڵکـی کاریگەریـت لەسـەر دروسـت نەکـەن، چونکـە نێوچاوانی ئـەوان بە دەسـتی خوایـە ﷻ، خوای گـەورە گرەنتی داوە تـۆ بپارێزێ تەنها لەسـەر تۆ ئەوە پێویسـتە بـە ڕوونـی‌و ئاشـکرایی پەیامەکـەت بگەیەنی، هـەر کەسـێک ویسـتی ڕێنمایی وەربگرێـت ئـەوە تەنهـا بۆ خۆیەتی، بـەڵام ئـەو بێبڕوایانەی کە مەبەسـتیانە شـوێنی هەواو ئارەزووەکانیـان بکـەون ئەوە بەڕاسـتی خوای گـەورە هیدایەتیان نادات، وە سـەرکەوتویان نـاکات بـۆ خێرو چاکـە بـە هـۆی بێبڕواییانەوە.

(٦٨): ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۖ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٦٨ ﴾

واتــە: بــە خــاوەن کتێبەکان بڵــێ: بە دەنگــی بــەرز گومڕاییــان ڕابگەیەنــە، وە پووچی بیرو باوەڕیــان ئاشــکرا بکــەو (پێیــان بڵــێ:) ﴿ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ ﴾ لە کاروبــاری ئاینیدا (لەســەر هیــچ نیــن)، بــە ڕاســتی ئێــوە نە بــە قورئــانو نــە بــە موحەممــەد ﷺ بڕواتــان هێنــا، وە نە پێغەمبەرەکەتــانو نــە کتێبەکەیتــان بەڕاســت نەزانــی، وە دەســتان نەگــرت بە هــەقو هیچ بنەمایەکــی متمانە پێکــراوەوە.

﴿ حَتَّىٰ تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ ﴾ واتــە: هەتــا بــە ڕێــکو پێکــی پەیڕەوی تــەوراتو ئینجیــل نەکــەنو شــوێنی نەکەون.

﴿ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ وە هەروەهــا ئــەو قورئانــەی کــە دابەزیوەتــە خــوارەوە، وە ئــەو پەروەردگــارەی کە پــەروەردەی کــردوونو نیعمەتەکانی خۆی ڕشــتوە بەســەرتاندا لە گەورەترینــی ئــەو نیعمەتانــە دابەزاندنی کتێبە ئاســمانیەکانە بۆتان، بۆیە پێویســتە لەســەرتان ســوپاسو ستایشــی خوا ﷻ بکەنو دەســت بگــرن بە بنەمــاو یاســاکانی پەروەردگارتانەوە، وە هەســتن بەو ڕاســپاردەو پەیمانەی خــوا کە لێی وەرگرتــوون. ﴿ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴾ (واتــە: وە بــە دڵنیاییەوە ئــەوەی کە لەلایــەن پەروەردگارتــەوە بــۆت دابەزێنراوە یاخی بــوونو کوفــری زۆرێکیان زیــاد دەکات، دەجــا خەفەت لــە کۆمەڵی کافــران مەخۆ).

(٦٩): ﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئُونَ وَالنَّصَارَىٰ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٩﴾ ﴾:

خوای گەورە هەواڵ دەدات دەربارەی خاوەن کتێبەکان، لە شوینکەوتووانی قورئانو تەوراتو ئینجیل، بەڕاستی خۆشبەختیو ڕزگاربوونیان تەنها لە یەک ڕێگاو یەک بنەمادایە ئەویش بریتیە لە بڕواهێنان بە خواو بە ڕۆژی دواییو بە کردەوەی چاک، هەر کەسێک لەوان بڕوا بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێنێ ئەوە ڕزگاری بووە، وە هیچ ترسیان لەسەر نیە لەو دۆخە ترسناکەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، وە نەخەفەتبار دەبن لەوەی کە بەجێیان هێشتوە، ئەم حوکمەی کە باسکراوە هەموو سەردەمو ڕۆژگارەکان دەگرێتەوە.

(٧٠-٧١): ﴿ لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَأَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ رُسُلًا ۖ كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَىٰ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾ وَحَسِبُوا أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُوا وَصَمُّوا ثُمَّ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُوا وَصَمُّوا كَثِيرٌ مِّنْهُمْ ۚ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٧١﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ واتـە: پەیمانـی بەهێـزو پتەومـان لێوەرگرتـن بـە بڕوابوون بـە خوا لـە بەجێهێنانـی ئەرکەکانی، کە پێشـتر ئاماژەی پێکـراوە لـەو ئایەتـەی: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَاقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ ٱثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا ﴿١٢﴾ ﴾المائدة. هەتـا کۆتایـی دەقەکـە.

﴿ وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًا ﴾ واتـە: چەنـد پێغەمبەرێکمـان بـۆ نـاردن بـە دوای یەکتـردا بـە بانگـەواز، وە پەیمانیـان لێوەرگرتـن بـە ڕێنمایـیو هانـدان، بەڵکـو ئـەوە هیچ سـوودێکی نەبـوو لەگەڵیانـدا، ﴿ كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ ﴾ لـە ڕاسـتی بە درۆیان دەخسـتەوەو سەرسـەختیان لەگەڵـدا دەکـردو بـە ناشـرینترین شـێوە مامەڵەیـان لەگەڵـدا دەکـرد، ﴿ فَرِيقًا كَذَّبُوا۟ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾ وَحَسِبُوٓا۟ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ ﴾ واتە: وایان دەزانـی کـە سـەرپێچیو بـە درۆخسـتنەوەی پێغەمبەرەکانیان بکەن لەسـەری سـزا نادرێنو تۆڵەیـان لێناکرێتـەوە بۆیـە بەردەوام بـون لە سـەر ئـەو کارە قێزەونە ﴿ فَعَمُوا۟ وَصَمُّوا۟ ﴾ لە ئاسـتی ڕاسـتییدا ﴿ ثُمَّ ﴾ پاشـان دەیـان ژیێنیـنو ﴿ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ﴾ کاتێک کە داوای لێبوردنیـان کـردو ملکـەچ بوون ﴿ ثُمَّ ﴾ بەردەوام نەبوون لەسـەر ئـەوە تا زۆربەیان هەڵگەڕانـەوە بـۆ حاڵەتێکی ناشـرین، لە کاتێکدا کـە ﴿ عَمُوا۟ وَصَمُّوا۟ كَثِيرٌ مِّنْهُمْ ﴾ بە ئـەم وەسـفە، وە ڕێژەیەکـی کەمیان بەردەوام بون لەسـەر تەوبـەو بڕواهێنان ﴿ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴾ پاداشـتی هـەر کەسـێک دەداتـەوە بە کـردەوەی خۆی، ئەگـەر چاکەی کـردوە بـە چاکە، وە ئەگـەر خراپـەی کردوە بـە خراپە.

وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٞ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ثُمَّ
عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ٧١
لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ
يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۖ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ
بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا
لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ٧٢ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ
ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ
عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٧٣
أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٤
مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ
صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ
ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٧٥ قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا
يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٧٦ قُلۡ
يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ
قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ٧٧

**(٧٢-٧٥):** ﴿ لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۖ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ﴿٧٢﴾ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٧٤﴾ مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی کوفـرو بێبڕوایی گاورەکان بەو قسـانەی کـە دەیانوت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ﴾ بـەو گومانـەی ئەوانـە کـە لـە دایکێکـی بـوو بەبـێ باوک، ئەوەش پێچەوانەی سروشـتی پەروەردگارە لە دروسـتکردندا، لە کاتێکدا عیسـا ؊ بە درۆی خسـتنەوە بـە تایبەت لەم بانگەشـەدا، پێیانی فەرمـوو: ﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡ ﴾خـوا ﷻ سـەلماندی بۆیـان کە تەنهـا تاکە پەرسـتراوی تـەواو خۆیەتی، وە هەروەهـا پەروەردگارێتـی گشـتگیر لـە هەمـوو دروسـتکراوەکاندا تەنهـا بـۆ خـۆی دەگەڕێتەوە.

﴿ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ ﴾ کەسـێک لـە دروسـتکراوەکان، عیسـا ؊ بـێ، یـان غەیـری ئـەو ﴿ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴾ ئەویـش بـە هۆی ئەوەی دروسـتکەرو دروسـتکراوی هێناوەتـە یەک ئاسـت، وە خوا ﷻ بۆ ئەوە دروسـتی کـردوە تەنها عیبادەتی ئـەو بـکات، کەچـی ئەو لە گـەڵ خوادا کەسـێکی تـر دەکات بـە هاوبەش، بۆیە شایسـتەی ئەوەیـە کە بۆ هەمیشـەیی لـە دۆزەخـدا بمێنێتەوە.

﴿ وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ أَنصَـارٍ ﴾ ڕزگاریـان بـکات لـە سـزای خـوا ﷻ، یـان ڕێگریی هەندێ لـەو سـزایانەیان لـێ بکات.

﴿ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٍ ﴾ ئەمـە یەکێکە لـە وتەکانی گاورەکان کـە بـەلای خۆیانـەوە جێگـای بایەخـە، وا گومانیان بـرد کە خـوا ﷻ یەکێکە لەو سـێیانە: خـوا، عیسـا، مەریەم، بـەرزیو گەورەیی بۆ خـوا لە قسـەو گومانەکانیان. ئەمـە گەورەترین بەڵگەیـە لەسـەر گەمژەیـیو کـەم عەقڵی گـاورەکان، چۆن ئەم وتـە قێزەونو بیـرو باوەڕە ناشـرینەیان قبـووڵ کـرد؟ چـۆن دروسـتکەرو دروسـتکراویان بـە یەکتر چووانـد؟! چۆن پەروەردگاریـان لێ شـارایەوە؟ خوا ﷻ گومانەکانیـان ڕەت دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مِنْ إِلَـٰهٍ إِلَّآ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ (خـوا خـۆی) وەسـف دەکات بە هەموو سـیفەتەکانی کامڵ بوون، پـاکو بێگـەردە لە هەموو کـەمو کورتیەک، تاکو تەنهایە لە دروسـتکردنو ڕێکخسـتنی کاروبارەکانـدا، دروسـتکراو هـەر نیعمەتێکـی لەبەر دەسـتدا بێـت تەنها لە لایـەن خواوەیە، دەی چـۆن لەگـەڵ ئەودا شـتێکی تر دەپەرسـترێت؟!! بـەرزیو بڵندی بۆ خوا ﷻ لە قسـەی ئەو سـتەمکارانە (گـاورو هاوشـێوەکانیان) بەرزیەکی بێ پایانو بێسـنوور.

پاشـان هەڕەشـەیان لێدەکات دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ پاشـان بانگیـان دەکات بـۆ داوای لێخۆشـبوون لـەو کارەی کـە کردوویانـە، وە ڕوونـی کردوەتەوە کە داوای لێخۆشـبوون وەردەگرێت لـە بەندەکانی، دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ واتـە: پەشـێمان ببنـەوەو بگەڕێنـەوە بـۆ لای ئـەوەی کـە خوا ﷻ پێی خۆشـەو پێی ڕازیـە لە دانپێدانان بـە یەکتاپەرسـتیدا، وە بەوەی کە عیسـا عليه السلام بەنـدەو پێغەمبـەری خوایە، لـەوەی کە پێشـتر دەیانوت: ﴿ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ ﴾ لـەوەی کـە وتوویانـە: ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ واتـە: لـە تاوانـی گوناهبـاران خۆش دەبـێ، ئەگـەر چی پـڕاو پڕی ئاسـمانەکانیش بێـت، وە میهرەبانیـان بەسـەردا دادەبارێنێ بە وەرگرتنـی تەوبەکانیـان، وە گۆڕینـی گوناهەکانیان بـە خێرو چاکە.

خوا ﷻ بە ئەوپەڕی سـۆزداریو جوانترین دەسـتەواژە بانگیان دەکات بۆ داوای لێخۆشـبوون پێیـان دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ (ئـەرێ ناگەڕێنەوە بـۆ لای خوا؟! وەک چـۆن دوو کـەس بـە یەکـەوەن، یەکیـان دەڵـێ: ئـەرێ بـۆ نایـەی لـە ماڵمان میـوان بی؟ سـبحان الله لەو تەعبیرە ناسـکە!!).

پاشـان حەقیقـەتو ڕاسـتی مەسـیحو دایکـی (علیهما السـلام) کە تەنهـا ئەوە ڕاسـتە بەیان

دەکات، دەفەرموێ: ﴿ مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ ﴾ واتە: ئەمە ئەوپەڕی سنووری مەسیحە، کە تەنها یەکێکە لە بەندە پێغەمبەرەکانی خوا ﷻ، ئەوانەی کە هیچ فەرمانێکیان بە دەست نەبووەو هیچ یاسادانانێکیش بێجگە لەوە نەبێ کە بۆی ناردوون، عیسا ﷺ وەک یەکێک لەو پێغەمبەرانەیە کە لە پێش ئەو هاتوون، هیچ جیاوازیەکی نیە لە مرۆڤایەتی دەری بکات بۆ پلەی پەروەردگارێتی.

﴿ وَأُمُّهُۥ ﴾ مەریەم (یش) ﴿ صِدِّيقَةٞ ﴾ بە هەمان شێوە ئەمەش سنووریەتی، کە لە ڕاستگۆیانە، بێگومان ڕاستگۆیان بەرزترین پلەو پایەیان هەیە لە پاش پێغەمبەران لە لای خوا ﷻ، وە(الصديقة) بریتیە لە زانستی بە سوودو کە بەرهەمی دڵنیایی (اليقين)و کردەوەی چاکە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مەریەم پێغەمبەر نەبووە، بەڵکو ئەوە بەرزترین پلەی ڕاستگۆییە، بێگومان ئەمە بۆ ئەو بەسە، ئەو چاکەو ڕێزێکی تەواوە. بە هەمان شێوە سەرجەم ئافرەتان، پێغەمبەریان تێدا هەڵنەکەوتووە، چونکە خوا ﷻ پێغەمبەرایەتی لە تەواوترین ئەو ڕەگەزە هەڵبژاردووە، لە پیاواندا، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم ﴿١٠٩﴾ ﴾ یوسف

ئەگەر عیسا ﷺ پێغەمبەرێک بێ لە ڕەگەزی پێغەمبەرانی پێشوو، وە دایکیشی ئافرەتێکی ڕاستگۆ بێت، هیچ شتێک نابێتە مایەی ئەوەی بکرێن بە دوو پەرستراو لەگەڵ خوا ﷻ؟ کە دەفەرموێ: ﴿ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ﴾ بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە ئەوان دوو بەندەی هەژارن، ئەوەی کە نەوەکانی ئادەم پێویستی پێیەتی لە خواردنو خواردنەوە ئەوانیش بە هەمان شێوە پێویستیان پێیەتی، ئەگەر پەرستراو بوونایە پێویستیان بە خواردنو خواردنەوە نەدەبوو، وە پێویستیان بە هیچی تر نەدەبوو، چونکە بە ڕاستی پەرستراو دەوڵەمەندو بەخشندەیە.

کاتێک خوا ﷻ بەڵگەی ڕوون کردەوە بەم فەرمایشتەی: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾ کە ڕاستی ڕوون دەکاتەوەو دڵنیایی ئاشکرا دەکات، لەگەڵ ئەمەدا هیچ سوودێکیان پێناگەیەنێت، بەڵکو بەردەوامن لەسەر درۆو دەلەسەو بوختان کردن، بە ڕاستی ئەوە لە لایەن ئەوانەوە ستەمو سەر کەشییە.

(٧٦): ﴿ قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٧٦﴾ ﴾:

﴿ قُلۡ ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: ﴿ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ لە

دروستکراوە هەژارەکان کە ﴿ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ ﴾ لە کاتێکدا پشت لەو کەسە دەکەن کە زیانو قازانج، وە بەخشینو گرتنەوەو نەبەخشین تەنها بە دەستی ئەوە؟!

﴿ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ﴾ (خوا) هەموو دەنگەکان بە جیاوازی زمانیانو جیاوازی پێویستیانەوە دەبیستێ ﴿ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ بە هەموو ئاشکراو نهێنیەک، وە پەنهانو ڕووداوەکانی پێشوو داهاتوو، کاملو تەواو ئەو خوایەیە کە خاوەن ئەو وەسفە جوانانەیە، تەنها ئەو شایستەی ئەوەیە کە بپەرسترێتو دڵسۆزی بۆ ئاینەکە دەربېردرێت.

(٧٧-٨٠): ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ٧٧ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ٧٨ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٧٩ تَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ يَتَوَلَّوۡنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ لَبِئۡسَ مَا قَدَّمَتۡ لَهُمۡ أَنفُسُهُمۡ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ خَٰلِدُونَ ٨٠ ﴾

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ﴾ واتە: سنوور مەبەزێنو دەستڕێژی مەکەنە سەر هەقو ڕاستی بە شتی پووچو بێ بنەما، وەک ئەو وتەیان دەربارەی مەسیح کە لە پێشەوە ئاماژەی پێکراوە، وە وەک ڕۆچوونی هەندێ لە زاناو پیاو چاکانیان لە شوێنکەوتنی ﴿ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ ﴾ واتە: پێشتر گومڕابوون ﴿ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا ﴾ لە خەڵکی بە بانگەواز کردنیان بۆ لای ئەو ئاینەی ئەوان لەسەرین ﴿ وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴾ واتە: ڕاستە ڕێگا، گومڕابوونی خۆیانو گومڕا کردنی خەڵکیان پێکەوە کۆکردەوە، بە ڕاستی ئەوانەن پێشەوای گومڕاکان کە خوا ﷻ ئاگاداری داوە دەربارەیان، وە لە شوێنکەوتنیانو بۆچوونە گومڕاکەرەکانیان.

لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ
دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ
يَعۡتَدُونَ ٧٨ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ
لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٧٩ تَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ
يَتَوَلَّوۡنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ لَبِئۡسَ مَا قَدَّمَتۡ لَهُمۡ
أَنفُسُهُمۡ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَفِي ٱلۡعَذَابِ هُمۡ
خَٰلِدُونَ ٨٠ وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ
أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا
مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ٨١ ۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةٗ
لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ
أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ
ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنۡهُمۡ قِسِّيسِينَ وَرُهۡبَانٗا وَأَنَّهُمۡ
لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ٨٢ وَإِذَا سَمِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَى
ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعۡيُنَهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ مِمَّا عَرَفُواْ
مِنَ ٱلۡحَقِّۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ٨٣

پاشان دەفەرموێ: ﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ واتە: دەرکرانو دوور خرانەوە لە میهرەبانی خوا ﷻ ﴿عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ﴾ واتە: بە شایەتیدانو دانپێدانانی ئەوان، بەوەی کە بەڵگە بەجێهێنراوە بەسەریانداو ئاگادار کراونەتەوە (إقامة الحجة) بەڵام ئەوان بەرهەڵستیان کردو، یاخی بوون لە بەرانبەریدا ﴿ذَٰلِكَ﴾ کوفرو نەفرین ﴿بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ﴾ واتە: بە سەرپێچی کردنیان بەرانبەر بە خوا ﷻو ستەم کردنیان لە بەندەکانی خوا ﷻ بوو بە هۆکاری بێبروایی‌و دوورکەوتنەوەیان لە میهرەبانی خوا ﷻ، چونکە بەڕاستی تاوانو ستەمەکان سزا بە دوای خۆیاندا دەهێنن.

لەو سەرپێچیانەی کە سزاو تۆڵەی بۆ ڕەوا کردن، ئەوان: ﴿كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُ﴾ واتە: نەریتیان وا بوو تاوانیان ئەنجام دەدا، وە هەندێکیان ڕێگری لەوی تر نەدەکرد، دوایی بەشدار دەبوون لەو تاوانەدا، ئەوەی کە ئەنجامیداوەو ئەوەی بێدەگ بووە، ئەوەی کە بێدەنگ بووە لە قەدەغەکردنی خراپە، لە کاتێدا تواناشی هەبووە بەسەریەوە.

ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە فەرمانی خوایان بە کەم تەماشا دەکرد، تاوانو سەرپێچی زۆر ئاسان بوو بە لایانەوە، ئەگەر ئەوان پەروەردگاریان بە گەورە تەماشا بکردایە زۆر بە پەلە دەچوون بە دەمیەوە، وە بەوە تووڕە دەبوون کە خوا پێی تووڕە دەبێ، بە ڕاستی بێدەنگ بوون بەرانبەر سەرپێچی لەگەڵ تواناداو، سزای لەسەر پێویست دەبێ، چونکە کاری خراپی گەورە بە دوای خۆیدا پەلکێش دەکات: لەوانە: بێدەنگی خۆی لە خۆیدا تاوانە، وە ئەگەر ڕووبەڕوشی نەبێتەوە، پێویستە نکوڵی لە کردەوەی خراپ بکات.

وە لەوانــە: وەک لــە پێشــەوە بــاس کــرا، بەڵگەیە لەســەر بــە کەم تەماشــا کردنــی تاوانو گــوێ پــێ نەدانی.
وە لەوانــە: ئەمــە وا دەکات ســەرپێچیکاران بوێــر بن لەســەر ئــەو تاوانەی ئەنجامــی دەدەن، ئەگــەر بەرپــەرچ نەدرێنــەوە شــەڕو خراپەکاریان زیاتــر دەبێو بــەڵاو موســیبەتی دنیایی‌و دوارۆژ گەورەتــر دەبــێ، ئەو کات ئەوان بە هێــزو بازووەوە دەردەکەون، پاشــان چاکەکاران لاواز دەبــن لــە ڕووبەڕووبوونــەوەی خراپەکارانــدا، تــا وایــان لــێ دێــت ئەوەی کە ســەرەتا توانیویانــە ئەنجامــی بدەن ئێســتا ناتوانن.
وە لەوانــە: نکوڵــی کــردن بــەواز هێنانی لــە کاری خراپە بەوە زانســت لاواز دەبــێو نەفامی تەشــەنە دەســەنێت‌و زۆر دەبێــت، چونکە بێگومان ســەرپێچی لەگــەڵ دووبــارە بوونەوەی‌و ئەنجامدانــی لــە لایــەن زۆرێــک لــە خەڵکیــەوە، وە نکوڵــی نەکردنــی دینــدارانو خــاوەن زانســتەکان لــە بەرانبەریــدا، خەڵکــی وا تێدەگــەن کــە ئــەوە ســەرپێچی نیــە، وە ڕەنگــە نەفامێــک وا تێبگــات ئــەوە عیبادەتێکی چاکــە، ئایا چــی خراپەکاریەک لــەوە خراپترە کە شــتێک خــوا حەرامی کردبێ ئەو بــە حەڵاڵی بزانێت؟ وە هەڵگێڕانەوەی ڕاســتیەکان لەســەر دەروونو نیشــاندانی پــووچو بــێ مانــا بە هەقو ڕاســتی؟!
وە لەوانــە: بەڕاســتی لــە بێدەنــگ بــوون بەرانبــەر ســەرپێچی ســەرپێچیکاران، هەنــدێ جار تــاوانو گونــاە جــوان دەکات لە پێــش چاوی خەڵکــی، تا هەندێکیــان پەیــڕەوی هەندێکی تریــان دەکــەن، مــرۆڤ ئالودەو هۆگــر دەبێت بــە پەیڕەو کردن بــە هەمــوو جۆرەکانیەوە، وە بنیــادی خــۆی لەســەر ئەوانــە دائەڕێژێــت. ئەگــەر بێدەنــگ بــوون لــە نکوڵــی نەکردن بگاتــە ئەم ئاســتە، خــوا ﷻ جەختی کردوەتــەوە کــە نەوەکانی ئیســرائیل -ئەوانــەی بێبڕوا بــوون- نەفرینــی لێکــردن بە هۆی ســەرپێچی کــردنو دەســتدرێژیانەوە، وە ئەم ســەرپێچیە گەورەیــەی لە نێو ئەوانــەدا تایبەتی کــردوە ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ بە خۆشەویســتیو دۆستایەتی‌و سەرخستن. ﴿لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ﴾ بەڕاســتی ئەمــە شــمەکێکی بــێ بــاوە، وە گرێبەســتو مامەڵەیەکــی بــە زیانە. ئــەوە تووڕەیــی خوایە کە هەموو شــتێک بە بۆنــەی تووڕەیی ئەوەوە تــووڕە دەبێــت، وە نەمریی بەردەوام لە ســزای زۆر گەورەو بە ئێشــدا، بەڕاســتی ســتەمیان لە دەروونــی خۆیــان کرد، کە ئەم شــوێنە خراپەی بۆ پێشخســتن، وە ســتەمیان لــە خۆیان کرد بــە هۆی ئەوەی نــازو نیعمەتــی بەردەوامیان لە دەســتی خۆیــان دەرکرد.

﴿ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ ﴾ بێگومـان بڕواهێنـان بـە خـوا ﷻو بـە پێغەمبەر ﷺو بەوەی کـە دابەزێنـراوە بۆی، ئـەوە دەگەیەنێت کـە پێویسـتە لەسـەر بەنـدە دۆسـتایەتی پەروەردگارو دۆسـتایەتی پشـتیوانانی ئـەو بکات، وە دژایەتـی ئەوانـەی کـە بێبڕوایـی پێدەکـەنو دژایەتی دەکـەنو ڕۆچوون لە سـەرپێچی کردنیـدا، مەرجـی دۆسـتایەتیو بڕوابـوون بـە خـوا ﷻ ئەوەیە کـە دوژمنانی خـوا نەکات بـە دۆسـت، وە ئەوانە هیـچ مەرجێکیان تێـدا نەبوو، ئەویـش بەڵگەیە لەسـەر نەبوونی مەرج لەسـەر دانـراو ﴿ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴾ واتـە: ئەوانەی لە سـنووری خوا ﷻ دەرچـوونو بڕوایـان پێـی نەهێنـاوە، وە بـە پێغەمبەرەکەشـی، وە لـە تاوانباریان لە سـنوور دەرچوونیـان دۆسـتایەتیو پشـتیوانی کردنـی دوژمنانی خـوا بوو.

(٨٢-٨٦): ﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ ۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُوا۟ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿٨٦﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: نزیکترینی ئەو دوو دەسـتە (جوولەکەو گاور) لە مسـوڵمانانەوە، وە لە دۆسـتایەتیو خۆشەویسـتنیانەوە، وە دوورترینـی ئەو دوو دەسـتەیە: ﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ﴾ ئـەو دوو دەسـتەیە بـە گشـتی گەورەترین دەسـتەو تاقمـن لە دژایەتی کردنی ئیسـلامو مسـوڵمانان، وە زۆرترینی ئەوانـەن کە هەوڵیان داوە زیـان بـە بـڕواداران بگەیەنـن، وە بـە هـۆی گومڕایـیو ئێرەیی بـردنو بەرهەڵسـتی کـردنو کەللـە ڕەقـیو بێبڕواییانەوە زۆر ڕقیـان لێیانە.

﴿ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ﴾ خوا ﷻ بۆ ئەمـە چەند هۆکارێکی دروسـت کـردوە: لەوانـە: ﴿ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا ﴾ واتە: زانـاو دیندارو خواپەرسـتان لە پەرسـتگاکاندا خواناسـی دەکەن، زانسـت لەگەڵ خواناسـیدا دەبێتـە مایـەی ئـەوە دڵ نـەرمو ناسـک دەکات، وە ڕقو کینە لـە ناخدا دەشـۆرێتەوە، لەبەر ئەوەیـە وەک جوولەکـە دڵـڕەقو موخەنـەت نیـن، وە وەک بت پەرسـتانی تـر توند نین.

وە لەوانــە: ﴿ وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾ واتــە: لووت بــەرزیو یاخی بوونیــان تێدانیە، بۆ ملکــەچ بوونــی هەقو ڕاســتی، بــە هۆی ئــەوەی نزیکــیو خۆشەویســتیان لــە بڕوادارانەوە، چونکــە بەڕاســتی خۆ بــە کــەم زان نزیکترە لــە خێرو چاکــە لە لــووت بەرزیەوە.
وە لەوانــە: ﴿ وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ ﴾ موحەممــەد ﷺ کاریگــەری لەســەر دڵو دەرونیــان دروســت دەکاتو ملکەچــی دەبن، ئەبینی ئەســرین لــە چاویــان دەڕژێو بە کوڵ دەگریــن بــە هۆی ئــەو هەقو راســتیەی کە دەیانناســی، بۆیــە بڕوایــان هێناو دانیــان پێدانا.
پاشــان وتیــان: ﴿ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ ﴾ واتــە: ئــەوەی دابەزیــوە بــۆ ســەر موحەممــەد ﷺ، کــە (ئۆممەتەکــەی) شــایەتی بۆ خــوا ﷻ دەدەن بــە یەکتاپەرســتی، وە بۆ پێغەمبەرەکــەی بــە نێردراویو ڕاســتی ئــەو پەیامە پیرۆزە، وە شــایەتی لەســەر ئۆممەتەکانی پێشــوو دەدەن بــە بە ڕاســت دانــانو بە درۆ خســتنەوە.

وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا جَاءَنَا مِنَ الْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا
رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَابَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا جَنَّاتٍ
تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ
الْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ
أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿٨٦﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا
طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ
الْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا
وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ
بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ
فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ
أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ
ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُوا
أَيْمَانَكُمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾
يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنصَابُ وَالْأَزْلَامُ
رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾

ئوممەتی موحەممەد ﷺ دادپەروەرن‌و شایەتیان وەرگیراوە، وەک چۆن خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴿١٤٣﴾﴾ البقرة. وەک ئەوە وایە پەلە بکەن لە بروا پێ هێنانەدا، وتیان: ﴿وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا جَاءَنَا مِنَ الْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ﴾ واتە: چ شتێک ڕێگریمان لێ دەکات لە بروا هێنان بە خوا، لە کاتێکدا هەقمان لە لایەن پەروەردگارەوە بۆ هاتووە، کە هیچ گومانێکی تێدا نیە، وە ئێمە ئەگەر بروا بهێنین‌و شوێنی هەق بکەوین ئومێدمان وایێ کە خوا ﷻ بمانخاتە بەهەشتەوە لەگەڵ پیاوچاکاندا، چی ڕێگریەک ڕێگریمان لێدەکات؟ ئایا ئەوە پێویست بەوە ناکات پەلە بکرێت بۆ ملکەچ بوون بە ئیمان، وە لێی دوا نەکەوێت؟

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَأَثَابَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا﴾ واتە: بە هۆی ئەو تێگەیشتنەیانەوە لە ئیمان، وە بە هۆی ئەو گوفتارەوە کە پاڕانەوە پاداشتی دانەوە بە ﴿جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ﴾ ئەم دەقانە دەربارەی ئەو گاورانە دابەزیون کە بڕوایان بە موحەممەد ﷺ هێنا، وەک نەجاشی‌و هاوشێوەکانی، لەوانەی کە بڕوایان پێ هێناوە.

وە بە هەمان شێوە بەردەوام هەتا ئێستا تیایاندا هەیە ئاینی ئیسلام هەڵدەبژێرێت، وە بۆی دەردەکەوێت کە ئەوەی لەسەری بوون‌و باوەڕیان پێی هەبوو بەتاڵ‌و پووچ‌و بێ مانایە، بێگومان ئەوان نزیک‌ترن لە جولەکەو بتپەرستەکانی تر لە ئیسلامەوە. کاتێک کە باسی پاداشتی چاکەکارانی کرد بە هەمان شێوە باسی خراپەکارانیش دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿٨٦﴾﴾ چونکە ئەوان بێ بڕواییان کرد بەرانبەر بە خواو ئایەتە ڕوون‌و ئاشکراکانیان بە درۆ خستەوە.

(٨٧-٨٨): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٨٧ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ٨٨ ﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ ﴾ لـە خواردنو خواردنــەوەکان، ئـەوە نیعمەتێکــە خوا ﷻ دایباراندوە بەســەرتاندا، کەواتە: ســوپاسو ستایشــی بکـەن، وە ڕەتــی مەکەنــەوە بــە کوفــر پێکردنــی، یــان وەرنەگرتنــی، یــان بڕواتــان وابێ کە حەرامــە، بــەو شــێوەیە دەتوانــن لە نێــوان درۆ کــردن بەســەر خــوا ﷻو بێبڕوایــی بەرانبەر بە نیعمەتەکانــی، وە بڕوابــوون بــەوەی کــە ئــەوەی حەڵاڵــەو پاکــە بــە حــەرامو پیــس دا بنێن، بەراســتی ئەمــە ســتەمە، بێگومــان خــوا ﷻ دەســتدرێژی قەدەغە کــردوە، دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾ بەڵکــو دەیان بوغزێنێو خەشــمو قینیــان لێ هەڵدەگرێ ســزایان دەدات لەسەری.

پاشــان فەرمانــی کردوە بــە پێچەوانەی ئەوەی کــە بتپەرســتەکان لەســەری دەڕۆن، وە ئەوانەی کــە حەرامکراوەکانــی خــوا ﷻ حــەڵاڵ دەکــەن، دەفەرمــوێ: ﴿ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا ﴾ واتــە: بخــۆنو بخۆنەوە لە نــازو نیعمەتەکانی خوا ﷻ کە دەســتەبەری کــردوە بۆتان، وە بــە هــۆی ئــەوەی هۆکارەکانــی بــۆ ئاســان کــردوون، ئەگەر حــەڵاڵ بــێو دزێتــی نەبێو داگیــر نەکرابێــت، وە هاوشــێوەی ئەوانــەش نەبێــت لەو ماڵانەی کــە بە ناهــەق وەر دەگیرێن. لــە هەمــان کاتتدا پاک بێو پیس نەبێت، ئەوەی کە پیســە لە شــتە پیســەکان لــەم چوارچێوەیە دەردەچێت.

﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾ لــە جێبەجێکردنــی فەرمانەکانــداو دوورکەوتنــەوە لــە قەدەغەکــراوەکان ﴿ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴾ بێگومــان بــڕوا بوونتــان بــە خــوا ﷻ خۆپارێــزیو لەبــەر چاوگرتنــی مافەکانــی ئەوتــان لەســەر پێویســت دەکات، ئیمانتان تــەواو نابێ بــەوە نەبێت، بە هەمــان شــێوە ئایەتەکە بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی کە ئەگەر کەســێک حەرامێک حــەڵاڵ بکات لەســەر خــۆی لە خــواردنو خواردنــەوەو هەروەهــا کەنیــزەکو هاوشــێوەکانی، بێگومان ئەوە ئــەو شــتە بەهــۆی حەرامکردنیــەوە حــەرام نابێــت، بــەڵام ئەگــەر ئــەو کارەی ئەنجامــدا ئەوە پێویســتە لــە ســەری کەفارەتی ســوێندێک بــدات، وەک خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ ١ ﴾ التحریم. جگــە لــەوە نەبــێ کە کەفارەتــی حەرام کردنــی خێزان بریتیــە لە (الظهــار).

(٨٩): ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٨٩) ﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ ﴾ واتـە: لـە سـوێندەکانتان ئـەو سـوێندانەی کـە بێ مەبەسـتو بێ نیـاز بە زارەکییـە، بریتیە لەو سـوێندەی کە سـوێند خۆر لە سـوێند خواردنەکەیـدا نیەتی ئـەوەی نەبووە، یـان خواردوویەتی بـە گومانی ئـەوەی کە تەواو بێـت، بـەڵام دوایـی پێچەوانەکەی ڕاسـت بـووە ﴿ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ﴾ واتـە: بـەو سـوێندانەی کـە لـە ناختانـەوە دەردەچـێو بـە دڵ گرێیـان دەدەن، وەک چۆن لە دەقێکـی تـردا هاتـوە: ﴿ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ (٢٢٥) ﴾البقرة.

﴿ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ ﴾واتـە: کەفارەتـی ئـەو سـوێندەی کـە بـە مەبەسـت خواردووتانە: ﴿ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ ﴾(خـواردن دانـە دە هەژارە) ئەو خواردنـە ﴿ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ ﴾واتـە: دە هـەژار پۆشـتە بکـەن، پۆشـتە کـردن ئەوەیـە کـە کەسـێک بتوانێ نوێـژی پێوە بـکات ﴿ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ﴾واتـە: ئازاد کردنـی کۆیلەیەکی بـڕوادار، وەک لەم شـوێنەدا بەنـدار کـراوە، هەر کاتێـک یەکێک لەم سـیانەی جێبەجـێ کرد ئەوە سـوێندەکەی چارەسـەر دەبـێ ﴿ فَمَن لَّمْ يَجِدْ ﴾(بـەڵام ئەگـەر هیـچ) یەکێـک لـەم سـیانە (ی نەتوانـی) ﴿ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ﴾(سـێ ڕۆژ بـە ڕۆژووبـێ) ئەوانـەی کـە باسـکرا ﴿ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ﴾دەبنـە کەفارەتـیو دەیسـڕێتەوەو بەرگـری لێـدەکات لە تـاوان ﴿ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ ﴾لـە سـوێند خواردنی درۆ بـە خوا، وە لە زۆر سـوێند خواردن، وە ئەگەر سـوێندتان خـوارد بیپارێـزنو مەیشـکێنن، تەنیا بە مەرجێـک نەبێ ئەو شـکاندنە خێرو چاکـەی تێدابێت، تـەواوی پاراسـتن بریتیـە لـەوەی کـە خێـرو چاکـە بـکات، وە نابـێ سـوێندەکەی ڕێگری لێـکات لـە کاری چاکـە ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ﴾ڕوونکـەرەوەی حـەڵاڵو حـەرامو ئەحکامەکانـە ﴿ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾واتـە: (بەڵکـو سـوپاس گـوزاری پەروەردگارتـان بن) لە کاتێکـدا فێری کـردوون کە پێشـتر نەتـان دەزانی.

پێویسـتە لەسـەر بەنـدەکان سوپاسـی خوا بکەن لەسـەر ئـەو فـەزڵو منەتەی کـە کردوویەتی بەسـەریاندا، لە زانسـتو زانیـاری دەربارەی بڕیـارو فەرمانـە شـەرعیەکانو ڕوونکردنەوەیان.

إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ
فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ
ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟
ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُوا۟ ۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا
ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٩٢﴾ لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓا۟ إِذَا مَا ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّأَحْسَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ
ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٩٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَىْءٍ
مِّنَ ٱلصَّيْدِ تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ
بِٱلْغَيْبِ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْتُلُوا۟ ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۚ وَمَن قَتَلَهُۥ
مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا
عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًۢا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّٰرَةٌ طَعَامُ مَسَٰكِينَ
أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِۦ ۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا
سَلَفَ ۚ وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنْهُ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾

**(٩٠-٩١):** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾: خـوا ﷻ سەرزەنشـتی ئـەم شـتە ناشـرینانە دەکات، وە هــەواڵ دەدات ئەوە لە کردەوەی شـەیتانەو پیسـە ﴿ فَٱجْتَنِبُوهُ ﴾ واتە: وازی لێبهێنن ﴿ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ واتە: بەڕاسـتی سـەرکەوتن بە دەسـت نایەت تەنهـا بە واز هێنـان لـە قەدەغەکراوەکانـی خـوا نەبـێ، بـە تایبـەت ئـەم بـەد ڕەوشـتیانە، بریتیە لە: ئـارەق: مانـای: هەموو شـتێک عەقـڵ تێک بـدات، واتە: بەسەرخۆشـی بیپۆشـێت، قومـار: بریتیە لـەو زۆرینانــەی کە لە جیاتـی تێدانیە لە هـەردوو لایەنـەوە، وەک ڕەهــن کردن هاوشـێوەکانی.

(الأنصـاب) بریتیـە لە: بتـەکانو هاوبەشـەکانو هاوشـێوەکانیان، لەوانەی کە دەپەرسـترێن لە غەیـری خوا.

(الأزلام) فاڵگرتنـەوە بـۆ دەرکەوتنـی بەختـی چـاک، ئـا ئـەم چـوارە خـوا ﷻ قەدەغـەو سـەرکۆنەی کـردوە، وە هەواڵـی داوە لـەو زیانانـەی کـە دەبێتـە مایـەی واز هێنـانو دوورکەوتنەوەیـان.

لەوانـە: ئەوە پیسـە لـە ڕووی مەعنەوویـەوە، ئەگەر چی بە هەسـت پیس نەبێـت، وە هەموو ئەو شـتە پیسـانەی کە پێویسـت دەکات (مرۆڤ) لێی بـە دوور بێتو نزیکـی نەکەوێتەوە.

وە لەوانـە: ئـەوە لە کردەوەی شـەیتانە، کـە سەرسـەختترینی دوژمنەکانە، گومانـی تێدا نیە پێویسـتە لـە دوژمن بـە ئاگا بێـت، وە دەبێ بـە ئاگا بـێ نەکەوێتـە داویـەوە، وە نەکەوێتە نـاو کردەوەیـەوە، بـە تایبەت ئـەم کردەوە ناشـرینانە، تکایـە ورە بەرزی بە خـۆ دورگرتن لـە کردەوەی دوژمنی ئاشـکرای سەرسـەخت.

لەوانــە بەنــدە ناتوانێت ســەرفراز بێ، تەنها بۆ خۆپاراسـتن لــەو کارانە، چونکــە دەرباز بوون لێیان شـتێکی داوا کراوەو خۆشویسـتراوە.
وە لەوانــە: بە ڕاسـتی ئــەم کارە ئـاژاوەو دووبەرەکـی دەکاتە نـاو خەڵکەوە، وە شــەیتانیش سـوورە لەسـەر بـڵاوە پێکردنـی، بــە تایبەت ئـارەق‌و قومار، بـۆ ئەوەی لــە نێـو براوادارانـدا ئـاژاوەو دووبەرەکـی بنێتــەوە، بێگومان لە ئـارەق خواردنــەوەدا عەقڵ لە دەسـت دەدرێت‌و توانـای بیر کردنــەوەی نامێنێـت، ئــەوەش دەبێتــە مایــەی ڕق‌و کینــە لــە نێـوان ئــەوو بــرا براوادارەکانیـدا، بــە تایبــەت ئەگــەر تانــەو تەشــەری لەگەڵـدا بێـت، کــە ئــەو سـیفەتە لە تایبەتمەندیەکانی ئارەق خۆرە، بەڕاسـتی هەندێ جار سـەر ئەکێشـی بۆ کوشتن، وە ئەوەیشی لــە قومـاردا هەیــە ســەرکەوتنی لایەنێکە بەســەر لایەنەکەی تـردا، وە بردنی ماڵەکــەی بەبێ پێدانی شـتێک بــە بەرانبەرەکــەی، ئــەوە گەورەترین هۆکارە بـۆ ڕق‌و کینەو ئـاژاوە نانەوە (لــە نێـو کۆمەڵگا).
وە لەوانــە: بەڕاسـتی ئەوانــە بــەر لــە دڵ دەگــرن‌و جەسـتەش شـوێنی دەکەوێـت، لــە یادکردنــەوەی خــوا ﷻ و لــە نوێــژ کــردن، ئــەو دووانــەی کــە بەنــدە بــۆ ئــەو ئامانجــە دروسـتکراوە، وە خــۆش گوزەرانیشــی تەنهــا بەوانــەوە بەسـتراوە، ئــارەق‌و قومــار بەرهەڵسـتی لێدەکــەن لــەو دووانــە بــە گەورەتریــن بەرهەڵسـتی، وە دڵـی ســەرقاڵ دەبـێ پێیانــەوە هەتـا تەمەنێــک یــان کاتێکـی درێــژی لــە دەسـت دەچێـت نازانێت لــە کوێیە.
چــی تاوانــێ لــەوە گەورەتــرە خاوەنەکــەی پیــس بــکات‌و بیگێڕێــت لــە یەکێــک لــە خەڵکــە خراپــەکان، وە بیخاتــە نــاو بازنــەو داوی شــەیتان، هەتـا ملکەچـی دەکات وەک چــۆن ئاژەڵــی لاواز ملکــەچ دەبــێ بــۆ خاوەنەکــەی، وە بەنــدە وەردەگێڕێــت‌و لــە خشــتەی دەبــات‌و ڕق‌و کینــە لــە نێـو براوادارانــدا دروســت دەکات، وە وەرتــان بگێــڕی لــە یــادی خــواو لــە نوێــژ کــردن؟! ئایــا لــە ســەرووی ئــەم خراپەکاریــەوە شـتێکی گەورەتـر هەیــە؟! ئـا لەبــەر ئەمــە خــوا ﷻ پێشـانی عەقڵــە تــەواوەکان دەدات بــە فەرمــوودەی: ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾ چونکــە عاقــڵ ئەگــەر تەماشــای هەنــدێ لــەو خراپەکاریانــە بــکات ڕادەچەڵەکــێ‌و نەفســی خــۆی دەپارێــزێ، وە هەرگیــز پێویســت بــە ئامۆژگــاری‌و ســەرکۆنەکردنی توونــد نــاکات.
(٩٢): ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٩٢﴾ ﴾:

واتــە: گوێڕایەڵـی کردنی خوا ﷻو پێغەمبــەر ﷺ وەک یەک وایە، هەر کەسـێک گوێڕاڵی خـوا ﷻ بکات بێگومـان گوێڕایەڵـی پێغەمبەر ﷺی کـردوە، وە هەر کەسـێک گوێڕایەڵی پێغەمبـەر ﷺ بـکات، بێگومـان گوێڕایەڵـی خوای کـردوە، ئـەوەش بۆ ئەوەیە بە سـەرجەم فەرمانەکانـی خـواو پێغەمبەرەکـەی هەسـتێتو بە جێیـان بهێنێ، بە ئاشـکراو بـە نهێنی، وە ئـەوەی کـە فـەرزمو سـونەتەمو پەیوەندی هەیـە بە مافـی خەڵکـەوە، وە واز هێنـان لەوەی خـوا قەدەغـەی کـردوە، بـە ڕاسـتی ئـەم فەرمانـە گشـتگیرترین فەرمانـە، وەک دەبینیت سـەرجەم فەرمـانو قەدەغەکـراوەکان بە ئاشـکراو نهێنی دەچنـە ئەو چـوار چێوەیەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَٱحۡذَرُواْ﴾ واتـە: (وریابـن) لـە سـەرپێچی خـوا ﷻو پێغەمبەرەکەی، بـە ڕاسـتی ئەوە لـە خراپتریـن زەرەرمەنـدی ڕوونو ئاشـکرا دایـە ﴿فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ﴾ لەوەی کـە فەرماتـان پێکـراوەو ئـەوەی قەدەغەتـان لێکـراوە ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ بەڕاسـتی پەیمانـی خـوای گەیانـد، ئەگـەر ڕێگـای ڕاسـت بگرنـە بـەر تەنها بۆ خۆتانـە، وە ئەگـەر ڕێگـای خراپیش بگرنە بەر ئەوە لەسـەرتان دەکـەوێ، وە خوا ﷻ تەنها خـۆی لێپرسـینەوەتان لەگـەڵ دەکات، وە پێغەمبەر ئەوەی لەسـەر شـانی بوو بـە جوانترینو تەواوتریـن شـێوە گەیاندی.

**(٩٣):** ﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٩٣﴾

کاتێـک کـە حەرام بوونی ئـارەق دابـەزی، وە جەختی تەواوی لەسـەر کرایـەوە، هەندێ لە بـڕواداران ئاواتیـان دەخواسـت کـە حاڵی براکانیـان بزانـن کاتێک کە پێش هاتنی ئیسـلام دەیـان خـواردەوە، پاشـان خـوای گەورە ئـەم ئایەتەی نـاردەوە خـوار: ﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ﴾ واتـە: هیـچ تاوانێکیـان لەسـەر نیـە ﴿فِيمَا طَعِمُوٓاْ﴾ لە ئـارەقو قومـار پێـش حـەرام بوونـی، وە لـە کاتێکـدا نەرێنـی بوونـی گونـاە لەوانەی کە باسـکراوە بەنـد کراوە بـە فەرمایشـتی: ﴿إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتە: بە مەرجێـک ئـەوان وازیـان لەسـەر پێچـی هێنابـێو بڕوایەکـی تەواویـان بە خوا هەبـوو بێ کـە ببێتـە مایـەی کـردەوەی چاک، پاشـان بـەردەوام بووبـن لەسـەری، ئەگەرنـا بێگومان بەنـدە تەنهـا لـەو کاتەدا وەسـف دەکـرێ جگە لـە کاتێکی تـر، وە نایێـت تا بەو شـێوەیە نەیێـت، تـا دەگاتـە سـەرەمەرگ بـەردەوام دەبێ لـە چاکەکاریـی، چونکە بەڕاسـتی خوای گـەورە چاکـە کارانی لە بەندایەتـی کردنی خۆیدا خـۆش دەوێ، وە ئـەو چاکەکارانەی کە

سوودیان هەیە بۆ مرۆڤەکان، وە دەچێتە چوارچێوەی ئەم ئایەتە پیرۆزەوە هەر کەسێک کە خواردنێکی حەرام بخوات، یان کارێکی قەدەغەکراو ئەنجام بدات، پاشان دان بە تاوانەکەیدا بنێ‌و داوای لێخۆشبون لە خوا بکات بڕوا بهێنێ‌و کردەوەی چاک ئەنجام بداو خۆپارێز بێت، ئەوە بێگومان خوا لێی خۆش دەبێ‌و تاوانەکەی لەسەر لادەبات.

(٩٤-٩٦): ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللَّهُ بِشَيْءٍ مِّنَ الصَّيْدِ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَخَافُهُ بِالْغَيْبِ ۚ فَمَنِ اعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٩٤) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۚ وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِ ۗ عَفَا اللَّهُ عَمَّا سَلَفَ ۚ وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ اللَّهُ مِنْهُ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ ذُو انتِقَامٍ (٩٥) أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۗ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ (٩٦) ﴾:

ئەمە یەکێکە لە منەتەکانی خوا ﷻ بەسەر بەندەکانیەوە، کە هەواڵی پێداون بەوەی کە لە داهاتوویەکی نزیکدا بە قەزاو قەدەری خۆی چی دەکات، لە بەر ئەوە گوێڕایەڵی بکەن وە هەرچی پێش دەخەن، یا لەسەر بنەمای بەرچاو ڕوونی بێت، وە کێ مسوڵمان دەبێ لەسەر بەڵگە مسوڵمان بێ‌و کێش بێبڕوا دەبێ با ئەویش لەسەر بەڵگە بێ، دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ بێگومان خوا ﷻ بە پەنهانی ئیمانەکەتان تاقی دەکاتەوە ﴿ لَيَبْلُوَنَّكُمُ اللَّهُ بِشَيْءٍ مِّنَ الصَّيْدِ ﴾ واتە: بە شتێکی زۆرنا، دەردەسەریەکی ئاسان، وەک ئاسانکاریەک لە لایەن خۆیەوە، ئەویش ئەو ڕاو کردنەیە کە خوا ﷻ تاقیتان دەکاتەوە پێی ﴿ تَنَالُهُ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ ﴾ واتە: دەتوانن بە ئاسانی ڕاویان بکەن، لەبەر ئەوە تاقی کردنەوەکە بێتە جێ، نەک لە توانادا نەبێت بە دەست یان ڕم، ئەو کات تاقیکردنەوە هیچ سوودێکی نابێت.

پاشان باسی حیکمەتی ئەو تاقیکردنەوەیە دەکات دەفەرموێ: ﴿ لِيَعْلَمَ اللَّهُ ﴾ زانستێکی ئاشکرایە بۆ خەڵک کە پاداشت‌و سزای لەسەر دادەمەزرێ ﴿ مَن يَخَافُهُ بِالْغَيْبِ ﴾ دەی چۆن خوا ﷻ شتێکی قەدەغەی کردوە لەسەر بەندە کە بە ئاسانی تواناو دەسەڵاتی بەسەر قەدەغە کراوەکەدا هەیەو ئەنجامی نادات، ئەمە پاداشتی بێ پایان وەردەگرێت، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی بە پەنهانی لە خوا ناترسێت، وە لە تاوان سڵ ناکاتەوە ئەگەر نێچیرێک بکەوێتە بەر دەستی ڕاوی دەکات ﴿ فَمَنِ اعْتَدَىٰ ﴾ (هەر کەس کاری وا بکات) لە ئێوە ﴿ بَعْدَ ذَٰلِكَ ﴾ (دوای

ئـەوەی) بەڵگـەی بـۆ ڕون بوەتـەوەو ڕێگـای بـۆ ئاشـكرا بـووە، ﴿ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ واتـە: سـزایەكی بـە ئێـش كـە كـەس ناتوانـێ وەسـفی بـكات جگـە لـە خـوا نەبێـت، چونكـە هیـچ بیانوویەكـی نیـە بـۆ ئـەو دەسـتدرێژیەی كـە كردوویەتـی، وە لەبـەر چاوگرتنـی ئـەو كەسـەی لێـی دەترسـێ لـەو كاتانـەی كـە خەڵكـی لـە دەوروبـەری نیـە، بـەڵام ئاشـكرا كردنـی ترسـی خـوا لەبـەر چـاو خەڵكـی هەنـدێ جـار دەبێتـە مایـەی ئـەوەی مـرۆڤ لـە خەڵكـی بترسـێ، بۆیـە لەسـەر ئـەوە پاداشـت وەرناگـرێ.
پاشـان بـە ئاشـكرا بـاس لـە قەدەغەكردنـی كوشـتنی نێچیـر دەكات لـە كاتـی ئیحـرام بەسـتندا، دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْتُلُواْ ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ﴾ واتـە: حەرامـە لـە حـەج و عەمـرەدا، وە قەدەغـە كـردن لـە كوشـتنی هەمـوو پێشـهاتە سـەرەتاییەكانی كوشـتن دەگرێتـە خـۆ لە بەشـداری كـردن لـە كوشـتندا، وە ڕێ پێشـاندانو هـاوكاریو یارمەتیدانـی لەسـەر كوشـتن، تەنانـەت خـوای گـەورە گۆشـتی نێچیرەكەشـی حـەرام كـردوە، هەمـوو ئەمانـەش لـە پێنـاوی ئـەو قوربانیـە گـەورە دایـە، دیـارە كـە حەرامـی كـردوە لەسـەر ئـەو كەسـەی كـە ئیحرامـی بەسـتوە، كوشـتنو ڕاوكردنـی ئـەو شـتەی كـە پێـش ئیحـرام حـەڵاڵ بـووە بـۆی.
كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا ﴾ واتـە: بـە ئەنقەسـت بیكـوژێو ڕاوی بـكات ﴿ فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ ﴾ واتە: لەسـەری پێویسـتە حوشـتر، یان مانگا، یـان بزنو مەڕ لـە وێنـەی ئـەو نێچیـرەی كە كوشـتوویەتی سـەری دەبـڕێو دەیكات بـە خێـر. وە لە بەر چـاو گرتنـی هاوشـێوەی دەبـێ ﴿ يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ ﴾ واتە: دوو كەسـی دادگەری زانـا بڕیار لەسـەر ئەو هاوشـێوانە بـدەن، وەک چۆن هاوەڵانـی پێغەمبەری خـوا كردوویانە، وەک ئـەوەی كـە بڕیاریـان داوە لـە بری كۆترێـک بەرخێک سـەرببڕێت، وە لـە نەعامەدا حوشـترێک، وە لـە بـری گـای كێویـدا لەسـەر جیـاوازی جۆرەكانـی مانگایـەک، وە بـە هەمان شـێوە هەر شـتێک لـە شـتێک بچێت هاوشـێوەكەی دەكرێ بـە قوربانـی، ئەگەر لە هیـچ نەچـوو ئـەوە بە ئەنـدازەی خـۆی (دەبێت شـتێک بكرێتە خێـر)، وەک چۆن یاسـایە لـەو شـتانەی كـە لەناوچـون، وە ئـەو كەفارەتـە پێویسـتە ﴿ هَدْيًۢا بَـٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ ﴾ واتە: لە حەرەمـی مەككـە سـەرببڕدرێت ﴿ أَوْ كَفَّـٰرَةٌ طَعَامُ مَسَـٰكِينَ ﴾ واتـە: لـە بری هاوشـێوەی ئـەوەدا لـە ئاژەڵ خـواردن بدات بـە هەژاران. زۆربـەی زانایان دەڵێن: پاداشـت دروسـتە، لە بـری ئـەوەدا خـواردن دروسـت بكرێتو بیـدات بە هـەژار بۆ هـەر یەكێک مشـتێ گەنم،

یــان نیــو (صاع) لە جگــە لــە گەنــم ﴿أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ﴾ خواردەمەنــی ﴿صِيَامٗا﴾ واتە: لە بەرانبــەر خواردنــی هــەر هەژارێــک ڕۆژێ بــە ڕۆژو دەبێــت ﴿لِّيَذُوقَ﴾ لە بــری ئەوەی کە باســکرا ﴿وَبَالَ أَمۡرِهِۦ﴾.

﴿وَمَنۡ عَادَ﴾ (هــەر کــەس دووبــارە ڕاو بکات لــە کاتی ئیحرام) لــە دوای ئەمە ﴿فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾. ( واتــە: ئــەوە خــوا تۆڵــەی لێدەکاتــەوە، وە خــوا زاڵــی خــاوەن تۆڵە ســێنە)

خــوا ﷻ باســی کوشــتنی نێچیــر بــە ئەنقەســت دەکات، لەگــەڵ ئــەوەدا کەفارەتەکــە بــە ئەنقەســتو بــە هەڵــەش دەگرێتــەوە، وەک چۆن ئەوە یاســایەکی شــەرعیە: هەر کەســێک مرۆڤێــک بکوژێــت، یــان ماڵی چاکو بە نــرخ بفەوتێنێ، ئەوە پێویســتە قەرەبــوو ببژێرێت بــە هــەر شــێوەیەک بێت، ئەگــەر فەوتاندنەکەی بــە ناهەق بــوو، چونکە خــوا ﷻ بژاردنو ســزاو تۆڵــە ســەندنی لە بری دانــاوە، ئەمە بــۆ بە ئەنقەســت، بەڵام بۆ بە هەڵە ســزای لەســەر نیــە، تەنهــا بژاردنــی لەســەرە، ئەمــە بۆچوونــی زۆربــەی زانایانە لــەم بەنــددار کردنەی کە خــوا ﷻ باســی کــردوە، وە هەندێ لــە زانایان پێیــان وایە بژاردنەکــە تایبەتە بە ئەنقەســت، ئــەوەش ڕووکەشــی دەقەکەیــە، جیاوازی لــە نێــوان ئەمەو زەمانــەت کردن لە کوشــتنی بە هەڵــەدا لــە نەفــسو ماڵەکان، لەم شــوێنەدا مافی خــوای تێدایــە، وەک چۆن تاوانبــار نابێت، هەمــان بژاردنیشــی لەســەر نیە، بــە لەناوبردنــی نەفسو ماڵــی مرۆڤەکان.

أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ
وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ
إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩٦﴾ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ
قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟
أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ
شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ
غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا
تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾ قُل لَّا يَسْتَوِى ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ
وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ
لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ
أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ
ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾
قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا۟ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾ مَا جَعَلَ
ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾

لـە كاتێكدا ڕاوكـردن ڕاوی دەریـاو ڕاوی دەشـت دەگرێتـەوە خـوا ڕاوی دەریـای جیاكردوەتـەوە، دەفەرمـوێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ﴾ واتـە: حـەڵاڵ كـراوە بـۆ ئێـوە ڕاوكردن كـە لـە ئیحرام دان، لـە دەریـاو خواردەمەنیەكانـی ئێـوی، ئەوانـەی زینـدوون تیایـدا، یـان مـردوون، بەڵگەیـە لەسـەر حەڵاڵـی مـردارەوە بووی دەریـا ﴿مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ﴾ واتـە: سـوود لـە حـەڵاڵ بوونیـدا بـۆ ئێوەیـەو لەبـەر قازانجتانـە، وە قازانجـی ئەوانـەی كـە دەگەڕێـن لەگەڵتانـدا ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا﴾ لـە وشـەی (الصیـد) ڕاوكـردن ئـەوە وەردەگیرێـت، كـە دەبێـت ڕاوكـراو ئـاژەڵ بـێ، چونكـە مـرۆڤ ڕاو ناكرێـتو ناخورێـت، بێگومـان ئـەوەی كـە نەخورێـت ڕاوناكرێـت، وە نـاوی ڕاوی لـێ نانرێـت ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾ لـە خـوا ﷻ بترسـن لـە جێبەجـێ كردنـی فەرمانـەكانو واز هێنـان لە قەدەغەكراوەكان، وە پشـتی پێ ببەسـتن لەسـەر فەرمانبـەرداری كردنی بە علمـەوە، چونكە بـە ڕاسـتی ئێوە بـۆ لای ئـەو كۆدەكرێنـەوە لـە ڕۆژی قیامەتـدا، پاداشـتتان دەداتـەوە ئایا هەسـتاون بـە بەجێهێنانـی فەرمانەكانـی تا بـە جوانترین شـێوە پاداشـتتان بداتـەوە؟! یان بە جێتـان نەهێنـاوە، سـزاتان بـدات؟!

**(٩٧-٩٩):** ﴿جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٩٩﴾﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات كـە (كەعبەی بۆ خەڵـك) داناوە ﴿ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَٰمًا لِّلنَّاسِ﴾ واتـە: هەسـتن بـە بەجێهێنـانو بـە گەورەدانانـی دنیـاو دواڕۆژیان، بە هـۆی ئەم

کەعبەوە (کە لە نوێژ ڕووی تێدەکەن) ئیسلامەتیان تەواو دەبێتو بەوەش گوناهیان لەسەر لادەبرێت، وە دیاری بە نرخو بێ پایانو خێرو چاکەی زۆر بە دەست دێنن، وە بەو هۆیەوە ماڵ دەبەخشرێتو وە هەموو خەڵکی لێ کۆدەبێتەوە لە هەموو ڕەگەزەکان، لەوێ یەکتر دەناسنو پشت بە یەکتر دەبەستن لە هەندێ کاروباردا، وە ڕاوێژی گشتی لە ناو یەکتردا دەکەن، وە پەیوەندی نێوانیان لە بەرژەوەندی دنیاو دوارۆژدا دادەمەزرێت.
خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴿٢٨﴾ ﴾ الحج.
لە پێناو ئەوەی ئەو ماڵە جێی بەجێهێنانی بەندایەتی خەڵکە، لە زانایان وتویانە: بەڕاستی حەجی ماڵی خوا ﷻ فەرزی کیفایەیە لە هەموو ساڵێکدا، ئەگەر خەڵکی واز لە حەج کردن بهێنێننو لەگەڵ ئەوەدا توانایان هەبێت، تاوانبار دەبن، بەڵکو ئەگەر خەڵکی واز لە حەج کردنەکەی بهێنێنن، ئەوە هێزو شکۆیان نامێنێو قیامەت هەڵدەستێت.
کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ﴾ واتە: هەروەها قوربانیە نیشانەدار کراوەکانو نیشانەدار نەکراوەکانی داناوە کە گەورەترینو بەڕێزترین جۆرەکانی قوربانیە، کە خەڵکی بەجێی دێنن، سوودی لێ وەربگرنو پاداشتیش لەسەر بدرێنەوە ﴿ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ لە زانیاریە بێسنوورەکانی خۆیەتی کە ئەو ماڵە پیرۆزەی بۆ دیاری کردوون، دەزانێ لە بەرژەوەندی دنیاو دوارۆژتان دایە.
﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ واتە: با ئەم دوو زانستە لە نێو دڵەکانتاندا جێگیر بێتو یەقینو دڵنیاییتان هەبێت، کە خوا ﷻ تۆڵەی زۆر بە تینە لە ئێستاو لە داهاتوودا، بۆ ئەو کەسەی کە لێی یاخی دەبێت، وە بێگومان بە سۆزو بە بەزەییە بۆ هەر کەسێک داوای لێ خۆشبوونی لێ بکاتو بە گوێی بکات، ئەم زانستو زانیاریە ئەوەتان بۆ بە بەرهەم دێنێ کە لە سزای بترسنو هیواو ئومێدتان بە لێبووردنو لێ خۆشبوونی هەبێت، وە پێویستیەکانی ترسو ئومێد بزانن.
﴿ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ﴾ بێگومان (پێغەمبەر ﷺ) وەک چۆن فەرمانی پێکرا گەیاندیو بە ئەرکی سەر شانی خۆی هەستا دیارە جگە لەوانەش، بەڕاستی هیچ شتێک لەسەر ئەو نیە لەو کارەدا ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴾ (ئەوەی ئاشکرای

دەکەن‌و ئەوەی دەیشارنەوە خوا دەیزانێ جا بۆیە) بە زانیارو زانستی (بێسنووری) خۆی پاداشتان دەداتەوە.

(١٠٠): ﴿ قُل لَّا يَسْتَوِي ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ ۚ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾

﴿ قُل ﴾ بە خەڵکی بڵێ: ئاگاداریان بکەرەوە لە خراپەو هانیان بدە بۆ چاکەو: ﴿ لَّا يَسْتَوِي ٱلْخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ ﴾ لە هەموو شتێکدا یەکسان نیە، نە لە کوفرو ئیمان، نە خواپەرستی‌و سەرپێچی، نە دەستەی بەهەشت‌و دەستەی دۆزەخ، نە کردەوە خراپەکان‌و کردەوە چاکەکان، نە ماڵی حەلاڵ‌و ماڵی حەرام.

﴿ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ ٱلْخَبِيثِ ﴾ (ئەگەر سەرسامیشت بکات زۆری پیس) بێگومان هیچ سوودێک بە خاوەنەکەی ناگەیەنێ، بەڵکو زیان بە دین‌و دنیای دەگەیەنێ.

﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ فەرمانی کردوە بە مرۆڤە ژیرەکان، واتە: ئەوانەی کە خاوەن عەقڵی تەواوو بۆچوونی چاکن، بە ڕاستی خوا ﷻ لەگەڵیاندا دەدوێت، ئەوانەن کە جوامێریان لێ دەکەوێت‌و ئومێدی خێریان لێ دەکرێت.

پاشان هەواڵ دەدات کە سەرکەوتن پەیوەستە بە تەقوای خوا ﷻ ئەویش جێبەجێ کردنی فەرمان‌و قەدەغەکراوەکانیەتی، هەر کەسێک لێی بترسێ ئەوە سەرکەوتوو دەبێت، وە ئەوەی واز لە خواپەرستی بهێنێ ئەوە زەرەرمەند دەبێ‌و سوودی زۆری لە دەست دەچێ.

(١٠١-١٠٢): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَسْـَٔلُوا۟ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا۟ بِهَا كَـٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾

خوا ﷻ قەدەغەی کردوە لە بڕواداران کە پرسیار لە شتێک بکەن ئەگەر بۆیان ڕوون ببێتەوە خەم‌و خەفەت بخۆن‌و بێتاقەت بین، وەک ئەوەی پرسیاری حاڵی باوک‌و باپیرانیان لە پێغەمبەر ﷺ بکەن، ئایا لە بەهەشتدان یان لە دۆزەخ. ئەم پرسیارەو هاوشێوەکانی کە هیچ سوودێک بە بڕوادار ناگەیەنێت، یان ئەو پرسیارانەی کە ڕوونادەن، یان وەک ئەو پرسیارانەی کە بە هۆیەوە فەرمانی توند لە شەرعدا دادەمەزرێت، ڕەنگە هەندێ جار ئوممەت ناچار بکات، یان وەک ئەو پرسیارەی کە پەیوەندی پێیەوە نیە، ئەم پرسیارەو هاوشێوەکانی قەدەغە کراوە.

بەڵكـو ئەو پرسـیارانە هیچ شـتێک لەوانەی پـێ دانامەزرێت ئەمـە فەرمانی پێكـراوە، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۖ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٤٣ ﴾ النحل.

﴿ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ ﴾ واتـە: ئەگـەر پرسـیارەكەتان لـە شـوێنی خۆیـدا بێـت كاتێک كـە قورئانتـان بـۆ دادەبەزێت، پرسـیار دەكـەن دەربـارەی ئایەتێک كـە ئاڵـۆزە، یـان حوكمێک كە شـاراوەیە لـە لاتان، لـە كاتێكدا كـە وەحی لە ئاسـمانەوە دادەبەزێـت بۆتـان ڕوونو ئاشـكرا دەكرێـت، ئەگەرنـا بێدەنگ ببـن لەوەی لێـی بێدەنگ بـووە ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ ﴾ واتـە: بێدەنگ بـووە لەبەر سـوودو قازانجی بەندەكان، هەر شـتێک خـوا لێـی بێدەنگ بووە ئـەوە بـە ڕەوای بینیوە لێـی گـەڕاوە ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴾ واتە: بـەردەوام بـە لێبـوردە وەسـف كـراوە، وە بە نـەرمو نیانیو چاكـە خـوازی، دەی بڕۆنە دەم لێخۆشـبوونو چاكـە خوازیـەوە، وە داوای میهرەبانـیو ڕەزامەنـدی لێ بكەن.

ئـەم بابەتانەی كـە لێتان قەدەغـە كـراوە ﴿ قَدۡ سَأَلَهَا قَوۡمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡ ﴾ واتە: (گەلانی پێش ئێوە پرسـیاریان كرد) هاوشـێوەی ئەم پرسـیارانە، ئەمە پرسـیاری بۆ خۆ چەواشـەكرنە نـەک بۆ ڕێنمایی كـردن، كاتێک بـۆ ڕوون كردنـەوەی پرسـیارەكەیان ئایەتێک) دابەزی بۆیـان ﴿ أَصۡبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴾ (بـە هۆیـەوە كافـر دەبـنو هەڵدەگەڕێنـەوە)، وەک پێغەمبـەر ﷺ دەفەرموێ: {دَعُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ، إِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَثْرَةُ سُؤَالِهِمْ واخْتِلافُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَاجْتَنِبُوهُ، وَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِأَمْرٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ} (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: البخاري برقم: (٧٢٨٨)، ومسلم برقم: (١٣٣٧)).

واتـە: وازم لـێ بێنـن لـەوەی لێـم قەدەغـە كـردوون، بێگومـان ئەوانـەی پێش ئێـوە لەناو چـوون بە هۆی زۆر پرسـیار كـردن لـە پێغەمبەرانیان، وە جیاوازیـان لەگـەڵ پێغەمبەرانیاندا ئەگـەر شـتێكم لێ قەدەغـە كردن خۆتانی لـێ دووربگـرن، وە فەرمانم پێكـردن بە كارێک بـە پێی توانـا لێم وەربگـرنو ئەنجامـی بدەن.

(١٠٣-١٠٤): ﴿ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ١٠٣ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسۡبُنَا مَا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَآۚ أَوَلَوۡ كَانَ ءَابَآؤُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَهۡتَدُونَ ١٠٤ ﴾:

خوا ﷻ سەرزەشـتی بتپەرسـتان دەكان كە شـەرعو یاسـایان دارشـت بەبێ ئەوەی خوا ﷻ مۆڵەتـی دابـن، وە ئەوەیـان حـەڕامو یاسـاغ كـرد كـە خـوا ﷻ حـەڵاڵو ڕەوای كـردوە،

بـەو بۆچوونـە پووچانەی خۆیـان هەندێ لـە ئاژەڵەکانی خۆیانیـان قەدەغە کردبوو، لەسـەر نەریتـی خۆیـان کـە پێچەوانە بـوو لەگەڵ ئـەوەدا کە خـوا دایـەزانـدووە، وەک دەفەرموێ: ﴿ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ ﴾ بریتـی بوو لە حوشـترێک گوێیان دەبڕیو پاشـان سـواربوونیان قەدەغـە دەکـرد، وایان دەزانـی بەرێـزە ﴿ وَلَا سَآئِبَةٍ ﴾ بریتیە لە حوشـتر، یـان مانگا، یان مەڕ ئەگەر بگەشـتبایتە تەمەنێـک دایاندەمەزراندو سـواری نەدەبوونو باریان لێنەدەخسـتو گۆشـتیان نەدەخـوارد، وە هەندێکیـان هەنـدێ لـە ماڵەکـەی نـەزر دەکـرد هەتـا ببێـت بە سـائیبە ﴿ وَلَا حَامٍ ﴾ واتـە: حوشـترێک نـە سـواری دەبـوون، نـە باریـان لێ دەنـا، ئەگەر بگەشـتبایەتە ئـەو دۆخـە تایبەتەی خۆی لـە نێوانی خۆیانـدا دیاریان کردبـوو، هەموو ئەمانە بتپەرسـتەکان بەبـێ بەڵگە قەدەغەیـان کردبوو، ئەوە تەنها درۆو بوختانـە بە ناوی خواوە ﷻ، وە لـە گەمژەیـیو بێ عەقڵیانـەوە دەرچـووە، وە لەبەر ئەمە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ ﴾ نـە بەڵگـەی نەقڵی لەسـەرە، وە نـە عەقڵ بە چاکی دەزانـێ، لەگەڵ ئەمەشـدا سـەریان سـووڕ دەما بە بۆچوونەکانی خۆیان کە لەسـەر نەفامیو سـتەم داڕێژراوە!

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُوا حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَأَصَابَتْكُم مُّصِيبَةُ الْمَوْتِ ۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِن بَعْدِ الصَّلَاةِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ إِنِ ارْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۙ وَلَا نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللَّهِ إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الْآثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰ أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا فَآخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْأَوْلَيَانِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِن شَهَادَتِهِمَا وَمَا اعْتَدَيْنَا إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يَأْتُوا بِالشَّهَادَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَا أَوْ يَخَافُوا أَن تُرَدَّ أَيْمَانٌ بَعْدَ أَيْمَانِهِمْ ۗ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاسْمَعُوا ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿١٠٨﴾

جا ئەگەر بانگ بکرێن ﴿ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ ﴾ پشتی تێدەکەنو وەری ناگرن ﴿ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ﴾ لە ئاین، ئەگەر بۆچوونەکەشتان پەسند نەبێت، بێگومان هیچ ئاینێک نیە رزگاری بکات لە سزای خوا ﷻ.

ئەگەر باوکو باپیرانیان زاناو شارەزا ببوونایە ئەوە کارەکە ئاسان دەبوو، بەڵام باپیرانیان بێ عەقڵو نەزان بوون، واتە: شتێکیان لە لا نەبوو لە عەقڵدا جێی ببێتەوە، وە هیچ زانستو زانیاریەکیان نەبوو، دەی بفەوتێتو لەناوبچێ ئەو کەسەی شوێنی نەفامێک دەکەوێت کە هیچ زانستێکی نیەو عەقڵێکی چاکیشی نیە، وە وازی لە شوینکەوتنی ئەوە هێنا کە خوا دایبەزاندوە، وە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیشی پشت گوێ خستوە، کە دڵ پڕ دەکات لە زانستو بڕواو ڕێنماییو دڵنیایی.

(١٠٥): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ﴾ واتە: کۆشش بکەن بۆ چاککردنو تەواو کردنو پابەند بوونتان بە ڕێگای ڕاستەوە، بێگومان ئێوە ئەگەر خۆتان باش بکەن، ئەو کەسەی کە وێڵو گومڕابووە لە ڕێگای ڕاست زیانتان پێ ناگەیەنێ، وە هەرگیز ڕێنمایی وەرناگرێت بۆ ڕێگای ڕاست، تەنهاو تەنها زیان بە خۆی دەگەیەنێ.

ئەمە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی فەرمانکردن بە چاکەو قەدەغەکردن لە خراپە، زیان بە مرۆڤ ناگەیەنێت ئەگەر وازی لێ بهێنێتو پشت گوێی بخات، چونکە بە ڕاستی هیدایەتو ڕێنمایی کامڵ نابێت تەنها بەوە نەبێت کە پێویستە لەسەری، لە فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە، بەڵێ، ئەگەر نەیتوانی نکوڵی بکات لە خراپە بە دەستو زمانی، بەڵکو بە دڵی پێی ناخۆش بوو ئەوە گومڕابوونی گومڕاکەران زیانی لێ نادات.

كە دەفەرموێ: ﴿إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا﴾ واتە: گەڕانەوەتان لە ڕۆژی دواییداو كۆكردنەوەتان بۆ لای خوایەو خوا ﷻ ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾ (هەواڵتان پێدەدات لەوەی كردووتانە) لە چاكەو خراپە.

(١٠٦-١٠٨): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِۚ تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ ثَمَنٗا وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ وَلَا نَكۡتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلۡأٓثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنۡ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسۡتَحَقَّآ إِثۡمٗا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَحَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَوۡلَيَٰنِ فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعۡتَدَيۡنَآ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجۡهِهَآ أَوۡ يَخَافُوٓاْ أَن تُرَدَّ أَيۡمَٰنُۢ بَعۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡمَعُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات كە فەرمان لە خۆ دەگرێت، بە شایەتیدانی دوو كەس لە كاتی وەسیەت كردندا، ئەگەر مرۆڤ گەیشتە سەرەتاكانی مردنو نیشانەكانی لێ دەركەوتن، پێویستە لەسەری وەسیەت بنووسێت، وە دوو كەسی دادپەروەر بكات بە شایەت، لەو كەسانەی شایەتیان لێوەردەگیرێ ﴿أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ﴾ واتە: دوو كەس لەسەر ئاینی ئێوە نەبن لە جوولەكە، یان گاور، یان هاوشێوەیان، ئەویش لە كاتی پێویستیدا ئەگەر مسوڵمان دەست نەكەوتن ﴿إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: سەفەرو گەشتتان كرد لە زەویدا ﴿فَأَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِ﴾ (تووشی حاڵەتی مەرگ بوون) واتە: بیانكەن بە شایەت، وە فەرمانی نەكردوە بە شایەتی دانیان لەم شوێنەدا نەبێ، چونكە لەو حاڵەتەدا شایەتیدان وەرگیراوە، وە جەخت دەكاتەوە كە بمێننەوەو ڕایانبگرن بۆ دوای نوێژ ﴿تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ كە بە گەورەی دەزانن ﴿فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ﴾ (سوێندیان بدەن بە خوا كە) ئەو دووانە ڕاست دەكەن، نە دەیگۆڕن نە كەمو زیادی دەكەن، ئەمە: ﴿إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ﴾ لە شایەتیدانەكەدا، ئەگەر ئەوانتان بە ڕاست زانی ئەوە كێشەی تێدا نیە سوێندیان بدەن.

﴿لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ﴾ واتە: بە سوێندەكانمان ﴿ثَمَنٗا﴾ واتە: بەوەی كە درۆی تێدا ناكەین لەبەر دونیا ﴿وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ﴾ ڕەچاوی خزمایەتی ناكەین ﴿وَلَا نَكۡتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ﴾ بەڵكو چۆن بیستومانە بەو شێوە شایەتی دەدەین ﴿إِنَّآ إِذٗا﴾ واتە: ئەگەر شاردمانەوە ﴿لَّمِنَ ٱلۡأٓثِمِينَ﴾.

واتە: ﴿فَإِنۡ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا﴾ واتە: ئەو دوو شایەتە ﴿ٱسۡتَحَقَّآ إِثۡمٗا﴾ واتە: كە نیشانەیانی بە دی كرد، بەڵگە بوو لەسەر بە درۆ خستنەوەی ئەو دوو شایەتە، وە خیانەتیان كردوە ﴿فَـَٔاخَرَانِ

يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَانِ ﴾ واتە: با دوو پیاو لە خزمو کەسی مردووەکە، با نزیکترین کەسبن لە مردووەکە ﴿ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا ﴾ واتە: ئەو دووانە درۆ دەکەن شایەتیەکەیان گۆڕیوەو خیانەتیان کردوە ﴿ وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ واتە: ئەگەر ستەممان کردبێو لە ڕاستی لامان دابێو شایەتی ناهەق مان دابێ (ئەوە ئێمە لە ستەمکارانین).

خوا ﷻ دەفەرموێ: دەربارەی ڕون کردنەوەو دانایی ئەو شایەتی دانەو جەختکردنەوە لە سەری وەک گەڕانەوەی بۆ لای میراتگرانی مردوو کاتێک کە خیانەت لە هەردوو شایەتەکە دەردەکەوێ: ﴿ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ ﴾ واتە: نزیکترە ﴿ أَن يَأْتُوا۟ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ ﴾ کاتێک کە جەخت دەکاتەوە لەسەر شایەتیدانی ئەو دوو شایەتە بە چاکترین شێوە ﴿ أَوْ يَخَافُوٓا۟ أَن تُرَدَّ أَيْمَٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ﴾ واتە: سوێندەکانیان قبوڵ نەکرێو پاشان بگەڕێتەوە بۆلای خاوەن مردوو.

﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾ واتە: ئەوانەی کە وەسف کراون بە فاسق بون، ئەوانە ڕێنموییان ناوێت بۆ لای ڕێگای ڕاست، بە پوختی ئەگەر مردوو کەوتە سەرە مەرگەوە لە گەشتو سەفەردا بوو، یان هەر شێوەیەکی تر گومانی ئەوە دەکرا شایەتی باوەڕ پێکراو کەم بێت ئەوە پێویستە لە سەری وەسیەت بکات بە دوو شایەتی مسوڵمانی باوەڕ پێکراو ئەگەر نەیبینیەوە، تەنها دوو شایەتی بێبڕوا نەبێ، ئەوە دروستە وەسیەتیان بۆ بکات، ئەگەر میراتگرانی مردوو شایەتی ئەو دوو بێبڕوایەیان وەرنەگرت، یان کەوتنە گومانەوە لێی، ئەوە لە پاش نوێژ سوێندیان دەدەن، بەوەی کە خیانەتو درۆیان نەکردوەو قسەیان نەگۆڕیوە، بۆ ئەوەی بێتاوان دەربچن لەو گومانەی کە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، ئەگەر پاش سوێند خواردنەکەش بڕوایان پێیان نەکردنو بەڵگەیەکیان بینیەوە کە ئاماژەی دەکرد لە سەر درۆی ئەو دوو شایەتە، ئا لەو کاتە ئەگەر خاوەن مردووەکە ویستیان با دوو کەس لە ئەوان سوێند بخوات: کە شایەتی ئەمان تەواوترو ڕاسترە لە شایەتی ئەو دوو بێبڕوایە، وە ئەو دووانە خیانەتو درۆیان کردوە، ئەو کاتە شایستەی ئەوە دەبن کە داوای دەکەن.

ئەم دەقە پیرۆزانە دەربارەی چیرۆکی (تمیم الداری) و عەلی کوڕی بەڕا چیرۆکێکی بەناوبانگە کاتێک کە (العدوی) وەسیەتی بۆیان کرد، خوا زاناترە، ئەو دەقانە دەبن بە بەڵگە بۆ چەند فەرمانو بڕیارێک:

لەوانە: بێگومان وەسیەت کردن ڕێگە پێدراوە، وە پێویستە کاتێک کەسێک دەکەوێتە سەرەمەرگەوە وەسیەت بکات.

لەوانە: وەسیەت کردن گرنگە، ئەگەر مرۆڤ گەیشتە سەرەتاکانی مردنو نیشانەکانی دەرکەوت لەبەر ئەوەی عەقڵی تەواوە.

لەوانە: بەڕاستی شایەتی دانی وەسیەت پێویستە دوو کەسی دادپەروەر بێت.

لەوانە: شایەتیدانی دوو بێبڕوا لەم وەسیەتەداو هاوشێوەکانی دروستە لەبەر گرنگی وەسیەت، ئەمەشە مەزهەبی پێشەوا ئەحمەدە، زۆرێک لە زانایانی خاوەن زانست بۆچوونیان وایە کە ئەم حوکمە نەسخ کراوەتەوە. ئەمە وتەیەکی بێ بەڵگەیە.

لەوانە: هەندێ جار سوود لە ئاماژەی حوکمو واتاکەی وەردەگیرێت کە شایەتیدانی بێبڕوا لە کاتێکدا کە کەس نەبوو جگە لەوان، تەنانەت ئەگەر لەم بابەتەیشدا نەبێت دروستە، وەک چۆن پێشەوا ئیبنو تەیمیە ئەم بۆچوونەی هەیە.

لەوانە: دروستە مسوڵمان لەگەڵ بێبڕوادا گەشت بکات ئەگەر مەترسی لەسەر نەبێت.

لەوانە دروستە گەشت بکرێت بۆ بازرگانی، ئەگەر خاوەن مردوو لە دوو شایەتەکە کەوتە گومانەوە، وە نیشانەیەک دەرنەکەوت کە ئاماژە بکات بە خیانەت کردنیان، وە خاوەن مردووەکان ویستیان جەخت بکەنەوە لە سەر ئەو دوو شایەتیدانە ڕایدەگرن هەتا دوای نوێژ، پاشان سوێندیان دەدەن بەو شێوەیەی کە خوای گەورە باسی کردوە.

لەوانە: ئەگەر گومان دروست نەبوو لە شایەتیدانیان ئەوە پێویست ناکات ڕابگیرێنو جەخت لەسەر شایەتیدانیان بکرێتەوە.

لەوانە: بە گەورە تەماشا کردنی شایەتیدان لەبەر ئەوە خوا ﷻ دایەتیە پاڵ خودی خۆی، وە پێویستە گرنگی پێبدرێتو بە دادپەروەری بەجێ بهێنرێ.

لەوانە: دروستە هەردوو شایەتەکە تاقی بکرێتەوە کاتێک کە لێیان دەکەونە گومانەوە، وە جیابکرێنەوە هەتا تەماشای شایەتیدانیان بکرێت.

وە لەوانە: ئەگەر ئاماژەکان دەرکەوتن لەسەر درۆی ئەو دوو شایەتە لەم مەسەلەیەدا ئەوە دوو کەس لە خاوەن مردووەکە هەڵدەستن سوێند بە خوا دەخۆن بەم شێوەیە: بەڕاستی سوێندی ئێمە لە سوێندی ئەوان ڕاسترە، وە بێگومان ئەو دووانە خیانەتو درۆیان کردوە، دواتر ئەوەی کە داوای دەکەن پێیان دەدرێتەوە. ئەو کات ئاماژەکە لەگەڵ سوێندەکەیاندا بە بەڵگە تەماشا دەکرێت.


يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآ
إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ
ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ
ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَإِذْ عَلَّمْتُكَ
ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ
مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ
طَيْرًۢا بِإِذْنِى وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى وَإِذْ تُخْرِجُ
ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ
جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ
إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّۦنَ أَنْ ءَامِنُواْ
بِى وَبِرَسُولِى قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾
إِذْ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ
أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم
مُّؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا
وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾

**(١٠٩--١١٠):** ﴿ يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ ﴾

**خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی ڕۆژی دوایی وە ئەوەی لەو ڕۆژەدایە لە نارەحەتیو ناخۆشیەکان، بێگومان لەو ڕۆژەدا سەرجەم پێغەمبەران کۆدەکاتەوەو لێیان دەپرسێت: ﴿ مَاذَآ أُجِبْتُمْ ﴾ واتە: ئوممەتەکانتان چۆن وەڵامتانیان دانەوە؟ ﴿ قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآ ﴾ تەنها تۆ دەزانیت ئەی پەروەردگارا، بە ڕاستی تۆ زۆر لە ئێمە زاناتری ﴿ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴾ واتە: هەموو کاروبارە پەنهانو ئاشکراکان دەزانیت، ﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ ﴾ واتە: بە دڵەو زمانت یادی بکە، وە پێویستیەکان بەجێبهێنەو سوپاسگوزاری پەروەردگارت بکە کە ئەو هەموو نازو نیعمەتەی ڕشتوە بەسەر تۆدا، کە نەیڕشتوە بەسەر جگە لە تۆدا.**

**﴿ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ﴾ واتە: بەهێزم کردووی بە ڕووحو وەحی کە پاکی کردویتەوە، وە هێزێکی پێبەخشیوی لە بەجێهێنانی فەرمانەکانی خواو بانگەواز لە پێناو ڕێگاکەیدا، وتراوە: مەبەست لە (روح القدس) جبریلە ﷺ وە خوا ﷻ پشتیوانی کردوە بە جیبریلو بەردەوام بوون لە گەڵیدا، وە جێگیر کردنی لە شوێنە نارەحەتەکاندا. ﴿ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ﴾ مەبەست لە قسەکردن ئەو قسەکردنە نیە کە تەنها پێی**

بوترێـت قسـه، بەڵکـو مەبەسـت لە قسـەکردن ئـەو قسـەکردنەیە سـوود بە سـوود بێت بۆ قسـەکەرو قسـە لەگەڵ کراو، ئەویش بانگەوازە بۆ لای دینی خوا ﷻ. وە ئەوەی بۆ عیسا ﷺ بـووە لـەوەدا، بـۆ هیچ یەکێـک لـە پێغەمبەرانی خـاوەن هێـزو توانـا نەبووە قسـەکردن لە تەمەنـی گەورەییـدا، بـە پەیـامو بانگەواز بـۆ لای چاکـە، وە قەدەغەکرنی خراپـە، وە لەوان جیابوەتـەوە، بـەوەی کـە لەنـاو بێشـکەدا قسـەی لەگـەڵ خەڵکدا کـردوە، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ ﴾مريم.

﴿ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ ﴾ وشـەی کتێـب لـەم دەقـەدا هەمـوو کتێبەکانی پێشـین دەگرێتـەوە، بـە تایبـەت تـەورات، وە ئەو شـارەزاترین کەس بـوو لـە پێغەمبەرانی بەنـی ئیسـرائیل پـاش موسـی بـە تـەورات، وە بە هەمـان شـێوە ئینجلیـش دەگرێتـەوە کە بـۆ خـۆی دابەزیـوە. (الحكمة) بریتیـە لـە زانینـی نهێنیەکانـی، وە سـودو بڕیارەکانی، وە بانگـەوازو فێـر کردن بـە چاکتریـن شـێوە، وە ڕەچاوکردنی ئـەوەی کە پێویسـتە بکرێت بە باشـترین شـێوە.

﴿ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ ﴾ واتـە: باڵندەیەکـی دروسـتکراو بە بـێ ڕوح، فووی پیادەکـەی دەبـێ باڵندە بە ویسـتی خوا ﷻ، وە چارەسـەری ئەوکەسـە دەکەی کـە نابینایە، نـە چاوی هەیـەو نـە دەبینـێ ﴿ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِي ﴾، ئـەم دەقانە ڕوونکـراوەنو لـە موعجیـزە گەورەکانـن، کە پزیشـکو هاوشـێوەکانی لـە بەرانبەریدا بە چۆکـدا دێـن، خـوا ﷻ بەوانە پشـتیوانی لـە عیسـا ﷺ کـردو بانگەوازەکەی پـێ بەهێز کـردوە. ﴿ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ ﴾ کاتـێ کە ڕاسـتیان بۆ هات پشتبەسـت بەو بەڵگە ڕوونو ئاشـکرایانە کە پێویسـتی دەکـرد بـڕوای پـێ بهێنـن ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ ﴾ واتـە: پاشـان بیریـان لەوە کردەوە کە عیسـا ﷺ بکوژن، وە بۆ ئەو مەبەسـتە هەوڵو تواناکانیان خسـتە کار، خوا ﷻ دەسـتیانی لە ئاسـتی پاراسـتو بەرگـری لێکـرد، ئەمانە هەموویـان منەتو چاکـەی زۆرن خـوا ﷻ داویەتـی بەسـەر بەنـدەو پێغەمبەرەکـەی عیسـای کـوڕی مەریەمـەوە، وە بانگـی کـردوە بـۆ ئـەوەی سوپاسـگوزاری بـکاتو پێی هەسـتێ، پاشـان ئەو بـە جوانترین شـێوە بەجێـی هێنـاوە، وە ئارامـی گرتـوە وەک چـۆن بـرا پێغەمبەرەکانـی خـاوەن هیممـەتو خۆڕاگـر بـوونو ئارامیـان گرت.

(١١١-١٢٠): ﴿ وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ أَنۡ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ
بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ ١١١ إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ
عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِۖ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١١٢ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا
وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ١١٣ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ
ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةٗ مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا
وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ١١٤ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ
أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١١٥ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي
وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ
فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ١١٦ مَا قُلۡتُ لَهُمۡ
إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ
أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ١١٧ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ
أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١١٨ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا
ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١١٩ لِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
وَمَا فِيهِنَّۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ ١٢٠ ﴾:

واتــە: یــادی ئــەو نیعمەتانەم بکــەرەوە کــە پشــتیوانو شــوێنکەوتوانم بۆم ئاســان کردیت، سرۆشــم خســتمە دڵــی هاوەڵە کانتــەوەو بڕوایان هێنــا بە منو بــە پێغەمبەرە کەم، یان لەســەر زمانــی تــۆ نیگام بۆ کــردن کە بــڕوا بهێنن بــەوەی کە لە لایەن خــواوە دابەزیــوە، ئەوانیش وەڵامیــان دایــەوەو ملکــەچ بــوون، وتیــان: بڕوامــان بــە خــوا ﷻ هێنــا وە شــایەتی بدە کە ئێمــە مســوڵمان بوویــن. کۆیان کــردەوە لە نێوان ئیســلامەتی بە ئاشــکراو ملکــەچ بوون بە کــردەوەی چــاک، وە بڕواهێنــان لەناخەوە کــە خاوەنە کــەی ڕزگار دەکات لــە دووڕویی.

(الحواريون): واتە: پشــتیوانان، وەک چۆن خوا ﷻ دەفەرموێ: عیســای کوڕی مەریەم دەڵێ: ﴿ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ١٤ ﴾ الصف.

﴿ إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾ واتــە: ســفرەیەک خواردنــی تێــدا بــێ، ئەمــە بــۆ ئــەوە نەبوو کــە گومانیــان لە توانــای خــوا ﷻ هەبــێ، بــەڵام بــۆ پێشــنیار کردنو ئــەدەب بــوو. وە کاتــێ کە پرســیارو پێشــنیارە کەیان جــۆرێ لــە نەرێنــی ملکــەچ بوونی پێــوە دیار بــوو، وە ئەم وتەیــە لە لایەن پشــتیوانانەوە لەوەیــە گومانــێ تێدا بەدی بکرێت، عیســا ؑ ئامۆژگاری کــردن فەرمووی:

﴿ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ بە ڕاستی بڕوادار بەو ئیمانەی کە هێناویەتی دەبێ بەردەوامی بکات لەسەر تەقوای خوا ﷻو ملکەچی فەرمانەکانی بێت، وە پێشنیار نەکات کە نازانێت پاش ئەوە چی دەبێ.

پشتیوانان وتیان: ئێمە مەبەستمان ئەوە نیە، بەڵکو مەبەستمان چاکەیەو پێویستیمان بەوە هەیە ﴿ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا ﴾ ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان پێویستیان پێیەتی ﴿ وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا ﴾ بە ئیمان، کاتێ نیشانەکان بە چاوی خۆمان دەبینین، ئەوە ئیمان دەبێت بە چاوی ڕاستەقینە، وەک چۆن پێشتر زانستی ڕاستەقینە بوو، وەک چۆن (ئیبراهیم) خۆشەویستی خوا ﷺ پرسیاری لە پەروەردگاری کرد نیشانی بدات چۆن مردوو زیندوو دەکاتەوە ﴿ قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِي ٢٦٠ ﴾ البقرة، (واتە: ئایا بڕوات نەهێناوە؟ فەرمووی: با، بەڵام بۆ ئەوەی دڵم ئارام بگرێ). بە ڕاستی مرۆڤ زیاتر پێویستی بە زانستو دڵنیایی و بڕوا هەیە لە هەموو کاتێکدا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا ﴾ واتە: ڕاستی ئەوە بزانین کە هێناوتە. ﴿ وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾ تا ببێتە سوودێک لە پاش ئێمە، شایەتیت بۆ بدەین، ببێتە بەڵگەو ڕونکەرەوەیەکی زیاتر.

قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةٗ مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ١١٤ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١١٥ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ١١٦ مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ١١٧ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١١٨ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١١٩ لِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا فِيهِنَّۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ ١٢٠

کاتێک ئەوەی بیست لە عیسا ﷺ وە لە نیەتیان تێگەیشت، وەڵامی پرسیارەکەیانی دایەوەو فەرمووی: ﴿ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةٗ مِّنكَ ﴾ واتە: هەتا کاتی دابەزینی ببێت بە جەژنو وەرزێک، یادی ئەم نیشانەو موعجیزە گەورەی تێدا بکرێتەوە، بۆ ئەوەی بپارێزرێو بە پێی ڕۆشتنی کاتو مانگو ساڵەکان لە بیر نەکرێ. وەک چۆن خوا ﷻ جەژنو قوربانی مسوڵمانی کردۆتە یادەوەریەک بۆ بیرکردنەوە لە ئایەتەکانی، وە ئاگادارکردنەوەیەک لە سەر سوننەتی پێغەمبەرانو ڕێگای ڕاستو چاک.

﴿ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾ واتە: بیگێڕێت بە ڕزقو ڕۆزی بۆمان.

عیسا ﷺ داوای کرد (سفرەکە) دابەزێ لە بەر ئەم دوو سودە، سوودو بەرژەوەندی ئاین، تا وەک نیشانەو بەڵگەیەک بمێنێتەوە، بۆ بەرژەوەندی دونیا ئەویش وەک ڕزقو ڕۆزیەک.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ لەبەر ئەوەی نیشانەی ڕاستەقینەی بەچاوی بینیوە، وە بەهۆی سەرسەختیو ستەمکاریەوە بێ بڕوایی کردوە، بۆیە شایستەی سزایەکی بەئێشو تۆڵەی توندە. وە بزانە بەڕاستی خوا ﷻ پەیمانی داوە کە دایدەبەزێنێت، وە هەڕەشەی لێکردون ئەگەر بێ بڕوایی لە بەرانبەردا بکەن، وە باسی ئەوەی نەکردوە کە ئەو دایدەبەزێنێت، دەگونجێ کە داینەبەزاندێت بەهۆی ئەوەی ئەوان ئەوەیان هەڵنەبژادێ. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لە ئینجیلدا باس نەکراوە کە لە بەردەستی گاورەکاندایە، وە بوونیشی نیە، وە دەگونجێ دابەزیبێت وەک چۆن خوا پەیمانی داوە، بێگومان خوا ﷻ پەیمانی خۆی ناشکێنێت، وە باسنەکردنی دەکرێت لەو ئینجیلانەی کەلە بەردەستیاندایە بە هۆی ئەوەوە

بـێ کـە لـە یادیان کردبێ. یـان لە ئینجیلدا بە هیچ شـێوەیەک بـاس نەکرابێت، بـەڵام تەنها بـۆ ماوەیـەک بێت لـە نێوانیانـدا، قۆناغ بە قۆنـاغ و جیل بە جیـل لەیەکتر وەریـان گرتبێ، خـوای گـەورە بـە پێویسـتی نەزانیبێـت لـە ئینجیلدا باسـی بـکات، وە فەرمایشـتی خوا ﷻ لـە سـەر ئەم واتایـە دەبێتە بەڵگـە وەک دەفەرمـوێ: ﴿وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّـٰهِدِينَ﴾ خوا زاناتـرە، بە حەقیقەتـی بارودۆخەکە.

﴿وَإِذْ قَالَ اللَّهُ يَـٰعِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ اتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ ئەمـە سـەر زەنشـت کردنـی گاورەکانە ئەوانەی کـە وتیان: بە ڕاسـتی خـوا ﷻ یەکێکە لە سـیان، خـوا ئـەم وتەیە بە عیسـا دەفەرمـوێ، عیسـا ﷺ خۆی لێـی بـەری دەکاتو دەڵێ:

﴿سُبْحَـٰنَكَ﴾ لـەم وتـە ناشـرینە، کە شایسـتەی گەورەیـی تۆ نیە.

﴿مَا يَكُونُ لِيَ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ﴾ واتـە: نابـێو ناکـرێو لـە من ناوەشـێتەوە شـتێ بڵێـم کەبـە هیچ جـۆرێ مافی منـی پێوە نیە،بەڕاسـتی هیچ یەکێـک لە دروسـتکراوەکان نە فریشـتەو نەپێغەمبـەرانو نـە جگە لە ئـەوان مافـی پەروەردگارێتیـان نیە، بێگومـان هەموان بەنـدەنو لـە ژێر فەرمانـی خـوادان، وە هەژارو بێ دەسـەڵاتن.

﴿إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَ﴾ بەڕاسـتی تـۆ شـارەزاتری بـە ناخـی مـن ﴿أَنتَ عَلَّـٰمُ الْغُيُوبِ﴾ ئەمـەش لە تـەواوی ئـەدەبو ئەخلاقی مەسـیحە ﷺ لە قسـەکردنی لەگەڵ پەروەرگاریـدا، نەیفەرموو: (لم أقل شيئا من ذلك) واتە: هیـچ نایـەژم دەربـارەی ئـەوە، بـەڵام هەواڵی دا کە ئـەو نەرێتی ئـەوە لە خـۆی دەکات کە قسـەیەک بڵێـت پێچەوانەی ئـەو پلە بـەرزە بێت کە خوا ﷻ پێی بەخشـیوە، بەڕاسـتی ئەمە لـەو شـتە مەحـاڵو ئەسـتەمانەیە، وە خوای گـەورەی بە پـاک ڕاگرتوە بە ئەو پـەڕی پاک ڕاگرتـن، وە هەمـوو زانسـتەکانی گەڕاندوەتـەوە بۆ پەروەردگـاری خاوەن پەنهـانو نهێنی. پاشـان ڕایگەیانـدوە بـە باسـکردنی ئـەوەی کە خـوا ﷻ فەرمانی پـێ کردوە بـە نەوەکانی ئیسـرائیل دەفەرمـوێ: ﴿مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِي بِهِۦٓ﴾ من بەندەیەکی شـوێن کەوتووم بە فەرمانـی تۆ نـەک بوێر بـم بەرانبـەر بـە گەورەییـت. ﴿أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ﴾ واتە: فەرمانـم پـێ نەکـردوون تەنهـا بـە بەندایەتی خوای تـاکو تەنهـا نەبێت، قەدەغـەم کردوە مـنو دایکـم بکەن بـە دوو پەرسـتراو بێجگە لـە خوا.

وە ڕوونـی دەکاتـەوە کـە من بەندەیەکـی پەروەردە کـراوم وەک چۆن خـوا پەروەردگاری ئێوەیـە بـە هەمـان شـێوە پەروەردگـاری منیشـە، ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ﴾

شـایەتی دەدەم کـێ بـەم کارە هەسـتاوەو کـێ پێی هەڵنەسـتاوە.
﴿ فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ﴾ هـەر خـۆت چاودێـر بـووی بـە سـەر نهێنیەکانیانـەوە ﴿ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ بینین‌و بیسـتن بە زانسـت، زانسـتی تۆ دەوری هەمـوو زانیاریەکانـی داوە، بیسـتن بە بیسـتراوەکان، وە بینین بـە بینراوەکان، بە ڕاسـتی تۆ پاداشـتی بەندەکانـت دەدەیتـەوە، بـەوەی کـە دەربارەیـان دەیزانی لـە چاکـەو خراپە. ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ﴾ تـۆ میهرەبانتریـت لـە نەفسـی خۆیـان، وە شـارەزاو زاناتریت بە بارودۆخیـان، ئەگـەر ئـەوان بەنـدەی لە سـنور دەرچـو نەبن ئـەوە هەرگیز سـزایان نادەیت ﴿ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ واتـە: بـە ڕاسـتی لێبوردنـت لـە تـەواوی هێزو دەسـەڵاتەوە سـەرچاوەی گرتـوە، بـە پێچەوانـەی کەسـێک ببـورێ‌و خـۆش ببێـت لە بێ توانایـی‌و بـێ دەسـەڵاتیدا، (الحکیـم): ئەوپەڕیـی دانایـی تـۆ دەگەیەنێت کە لە کەسـێک خـۆش ببیـت هـۆکارو پێویسـتیەکانی لێبوردنـی گرتبێتە بەر.
﴿ قَالَ ٱللَّهُ ﴾ خـوا ﷻ دەفەرمـوێ کاتـێ کـە حاڵی بەندەکانـی ڕوون دەکاتـەوەو کە کێ سـەرکەوتووە تیایـداو کـێ دۆڕاوەو بەدبەخـت بـووە، ﴿ هَٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ﴾ ڕاسـتگۆکان ئەو کەسـانەن زمـان‌و ڕەفتاریـان وەک یەک بـووەو نیەت‌و مەبەسـتیان تەنها بـۆ خـوا ﷻ بـووە، لـە ڕۆژی قیامەتـدا ئـەم بەرهەمـە دەبیننـەوە، کاتـێ کـە خـوا ﷻ لە شـوێنی بەرێـز دایان دەنێ لـە نزیک خۆی، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَهُمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾ واتـە: وە ئەوانـەی کـە درۆیـان کردوە بە پێچەوانـەی بڕواداران دەبـن، دەرنجامی درۆو بوختانەکانـی دەبیننەوە، وە بەرهەمـی کـردارە ناشـرینەکانیان دەدروێننەوە.
﴿ لِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ لەبەر ئەوەی دروسـتکەری ئەرزو ئاسـمانەکانەو ڕێکخەریانە بـە فەرمانی قـەدەری‌و بڕیاری شـەرعی‌و بڕیـاری پاداشـتی، بۆیە دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ هیـچ شـتێک لـە خـوا ﷻ گیـر نابێ، بەڵکـو هەموو شـتەکان ملکەچـی ئەون‌و لـە ژێـر فەرمانی ئـەو دان‌و بـە فەرمانی ئـەو دەجوڵێن.

سوورەتی (المائدة) تەواو بوو

سوپاس‌و ستایش بۆ خوای پەروەردگار




## تەفسیری سوورەتی (الأنعام)
## مەککیە (١٦٥) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٢): ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى عِندَهُۥ ثُمَّ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴿٢﴾ ﴾

ئەمە هەواڵێکە لە لایەن خواوە دەربارەی سوپاسو ستایشو پیاهەڵدانە بە سیفەتە تەواوەکانی، وە بە تایبەت ئەمانەی کە لێرەدا ئاماژەیان پێکراوە، سوپاسو ستایشی خۆی دەکات لەسەر دروستکردنی ئاسمانەکانو زەوی، کە بەڵگەن لەسەر تەواویو دەسەڵاتی خوا ﷻ، وە بە هەمان شێوە لەسەر زانستی بەرفراوانو میهرەبانیو دانایی، وە دروستکردنی ئاسمانو زەویو ڕێکخستنیان بە تاکو تەنهاو بەبێ هاوبەش، وە لەسەر گێڕانی تاریکیو ڕۆشنایی، وە ئەو دروست کردنە گشتگیرە بۆ هەست پێکراوەکان، لەوانە: وەک شەوو ڕۆژ، خۆرو مانگ، لە ڕووی مەعنەوی، وەک: تاریکی نەفامیو گومان، وە هاوبەش دانان بۆ خواو سەرپێچیو بێئاگایی، وە نوورو ڕۆشنایی زانستو ئیمان، وە دڵنیاییو گوێڕایەڵی.

وە هەموو ئەوانە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەن کە خوای پەروەردگار شایستەی پەرستنو دڵسۆزی بۆ بوونە لە پەروەردگارێتی دا.

وە لەگەڵ ئەم بەڵگەدا ڕوونکردنەوەیداو دەفەرمووێ: ﴿ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴾ واتە: هاوتاو هاوبەش بۆ خوا ﷻ دادەنێن.وەک خوا ﷻ بە گەورەیان دادەنێن، لەگەڵ ئەوەدا ئەو پەرستراوانە لە هیچ سیفەتێکی تەواودا

لەگەڵ خـوادا یەكسـان نیـن، بـە ڕاسـتی ئەوانـە هـەژارو بـێ توانـاو ناتـەواون لـە هەمـوو ڕوویەكـەوە.
﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن طِينٍ ﴾ ئەویـش بـە دروسـتكردنی بنچینەتانو باوكتـان ئادەم ﷺ ﴿ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلًا ﴾ واتـە: كاتێكـی دیـاری كـردوە بـۆ مـاوەی مانەوەتـان بـۆ خۆتـان چێـژ وەردەگـرنو تاقـی دەكرێنـەوەو تووشـی بـەڵاو موسـیبەت دەبـن بـەوەی كـە بۆتـان دابەزێنـراوە لـە لایـەن پێغەمبەرانـەوە ﴿ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ الملك، (واتـە: تاقیتـان دەكەینـەوە كـە كامەتـان كردەوەتـان باشـترە)، وە تەمەنتـان درێـژ دەكات بـۆ ئـەوەی پەنـدو ئامۆژگـاری وەربگـرن ﴿ وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴾ بریتیـە لـە ژیانـی دواڕۆژ، كـە بەنـدەكان لـەم دونیایـەدا دەگوازرێنـەوە بـۆ ئـەوێ، ئنجـا بـە پێـی كردەوەكانیـان پاداشـتیان دەداتـەوە لـە چاكـەو خراپـە.
﴿ ثُمَّ ﴾ لەگـەڵ ئـەم ڕوونكردنـەوە تـەواوەو بەڵگـە یەكلاكـەرەوەدا ﴿ أَنتُمْ تَمْتَرُونَ ﴾ واتـە: ئێـوە بـە گومانـن لـە پەیمـانو هەڕەشـەی خـوا، وە پاداشـت دانـەوە لـە ڕۆژی دوایـیـدا.
وە خـوا ﷻ بـە كـۆ باسـی تاریكـی كـردوە، ئەویـش بـە هـۆی زۆریو جـۆراو جۆری ڕێگاكانـی تاریكـی، بـەڵام بـە تـاك باسـی ڕووناكیو نـوری كـردوە، لەبەر ئـەوە تەنها یـەك ڕێگـا هەیە كـە دەیگەیەنێتـە لای خوای گـەورە، جگە لـەو ڕێگایـە ڕێگایەكی تر نیـە، ئـەو ڕێگایە زانسـتی ڕاسـتەقینەو كـردار پێكردنی لە خـۆ دەگرێـت، وەك چۆن خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ﴾ الأنعام.
(٣): ﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِى ٱلْأَرْضِ يَعْلَمُ سِرَّكُمْ وَجَهْرَكُمْ وَيَعْلَمُ مَا تَكْسِبُونَ ﴿٣﴾ ﴾:
واتـە: ئـەو لـە ئاسـمانەكانو زەویـدا پەرسـتراوە، خەڵكـی ئاسـمانەكانو زەوی پەروەردگاریـان دەپەرسـتن ملكەچـی بـۆ بەهێـزیو دەسـەڵاتی ئـەو دەنوێنـن، فریشـتە نزیكـەكان، پێغەمبـەرانو نێـردراوان، وە ڕاسـتگۆیانو شـەهیدانو پیاوچـاكان، خـوای پەروەردگـار بـە نهێنـیو ئاشـكراتان دەزانێـت، وە بـە هەمـوو كردەوەیەكیـش كـە دەیكـەن، دەی خۆتـان لەسـەرپێچی كردنـی بپارێـزن، وە هـەوڵو كۆششـتان بخەنـە كار بـەو كردەوانـەی كـە لـە خـوا نزیكتـان دەكاتـەوە، وە ئاگاداربـنو خۆتـان بپارێـزن لە هـەر كردەوەیـەك كـە دوورتـان بخاتـەوەو لـە میهرەبانـی خـوا بێبـەش بـن.

(٤-٦): ﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤﴾ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّن لَّكُمْ وَأَرْسَلْنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيْهِم مِّدْرَارًا وَجَعَلْنَا ٱلْأَنْهَٰرَ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٦﴾ ﴾

ئەمــە هەواڵێکــە لــە لایــەن خــوای گــەورەوە لــە پشــت تێکردنــی بــت پەرســتەکانو دژایەتــیو درۆکردنیــان، بــە ڕاســتی ئــەو ئایەتانــە هیــچ ســوودێکیان پــێ ناگەیەنــن، هەتــا ســزای خوایــان لەســەر پێویســت دەبێــت، دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ ﴾ کــە بەڵگەیــە لــە ســەر ڕاســتی یــەکلا کــەرەوە، کــە بانگیــان دەکات بــۆ شــوێن کەوتنــیو وەرگرتنــی ﴿ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴾ هەرگیــز بــە خەیاڵیانــدا نایــەو گوێبیســتی نابــن، بەڵکــو دڵیــان بــە شــتێکی تــرەوە ســەرقاڵە ﴿ فَقَدْ كَذَّبُوا۟ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ﴾ واتــە: ڕاســتی ئەوەیــە کــە شــوێنی بکەوێــت، وە سوپاســی خــوای لەســەر بکرێــت، کــە بــۆی ئاســان کــردوون، وە جێبەجــێ بکرێــت، بــەڵام ئــەوان پێچەوانــەی ئــەوە جوڵانــەوە کــە پێویســت بــوو لەســەریان، بۆیــە شایســتەی ئــەوە بــوون ســزایەکی بــە ئێــش بدرێــن ﴿ فَسَوْفَ يَأْتِيهِمْ أَنۢبَٰٓؤُا۟ مَا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ واتــە: لــە داهاتوویەکــی نزیکــدا بــە چــاوی خۆیــان ئــەوە دەبینــن کــە گاڵتەیــان پــێ دەکــرد، کــە بێگومــان ئــەوە ڕاســتو هەقــە، وە خــوای پەروەردگــار درۆو بوختانــی درۆزنــەکان ئاشــکرا دەکات، ئەوانــەی کــە گاڵتەیــان بــە زینــدوو بوونــەوەو بەهەشــتو دۆزەخ دەکــرد، جــا ئەگــەر ڕۆژی قیامــەت هــات بــە درۆزنــان دەوتــرێ: ئەمــە ئــەو دۆزەخەیــە کــە ئێــوە گاڵتەتــان پێــی دەکــرد، خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۙ لَا يَبْعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُ ۚ بَلَىٰ وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰذِبِينَ ﴿٣٩﴾ ﴾النحــل. (واتــە: وە هاوبــەش دانــەران ســوێندی قورسیشــیان بــە خــوا خــوارد. کــە ئــەوەی دەمــرێ خــوا زینــدووی ناکاتــەوە، بــا خــوا بەڵێنــی ڕاســتی داوە، بــەڵام زۆربــەی خەڵکــی نازانــن . تاکــو ئــەوەی تێــدا دەکەونــە ڕاجیایــیو ناکۆکیــەوە بۆیــان ڕوون بکاتــەوەو بــۆ ئــەوەی ئەوانــەی بێبــڕوان بزانــن کــە درۆکار بــوون).

پاشــان فەرمانیــان پێــدەکات کــە دەرسو وانــە لــە ئوممەتەکانــی پێشــین وەربگــرن، وە دەفەرمــوێ: ﴿ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ ﴾ واتــە: چەندیــن لــەو ئوممەتانەمــان

لــە ناوبــرد، بــە دوای یەکتــردا کــە ئایەتەکانــی ئێمەیــان بــە درۆ دەزانــی، پێــش ئــەو لــە ناوبردنەیــان مۆڵەتمــان پێــدان بــەوەی کــە ﴿ مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَا لَمۡ نُمَكِّن ﴾ بــۆ ئــەوان لــە مــاڵو منــداڵو خــۆش گوزەرانــی ﴿ وَأَرۡسَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡهِم مِّدۡرَارٗا وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَنۡهَٰرَ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ ﴾ سروشــتو ســەوزاییان بــۆ جــوان دەبــوو، هەتــا خــوا بیــەوێ، لــە کشــتوکاڵو بەروبوومــەکان بــە ئــارەزووی خۆیــان چێژیــان لــێ وەردەگــرت.

لــە بەرانبــەردا هەرگیــز سوپاســگوزاری پەروەردگاریــان نەبــوون لەســەر ئــەو نــازو نیعمەتانــە، بەڵکــو روویــان کــردە ئــارەزوو بــازیو هەمــوو ئــەو جــۆرە خــۆش گوزەرانیانــە ســەرقاڵی کــردن لــە یــادی خــوا.

پاشــان پێغەمبەرانمــان بــۆ نــاردن بــە بەڵگــەی روونو ئاشــکرا، کەچــی بــە راســتیان نەزانیــن، بەڵکــو بەرپەرچیــان دانــەوە، ئنجــا خــوای دادگەریــش بــە هــۆی گوناهەکانیانــەوە لــە نــاوی بــردن ﴿ وَأَنشَأۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِمۡ قَرۡنًا ءَاخَرِينَ ﴾ واتــە: لــە دوای ئــەوان دروســتمان کــرد گــەلو نەتەوەیەکــی تــر، ئەمــە ســوننەتو یاســای خــوای گەورەیــە لــە ئۆممەتەکانــی پێشــینو ئەوانــەی کــە دوای ئەمــان دێــن، دەی پەنــدو عیبــرەت وەربگــرن ئــەی ئــەو کەســانەی کــە خــوای گــەورە ئــەم چیرۆکــەی ئەوانــی بــۆ بــاس کــردوون.

(٧-٩): ﴿ وَلَوۡ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ كِتَٰبٗا فِي قِرۡطَاسٖ فَلَمَسُوهُ بِأَيۡدِيهِمۡ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧﴾ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ مَلَكٞۖ وَلَوۡ أَنزَلۡنَا مَلَكٗا لَّقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ ﴿٨﴾ وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم مَّا يَلۡبِسُونَ ﴿٩﴾ ﴾:

ئەمــە هەواڵێکــە لــە لایــەن خــواوە بــۆ پێغەمبەرەکــەی لەســەر کەشــیو سەرســەختی توونــدی بێبــڕواکان، بــە درۆ خســتنەوەو بــە درۆ دانانــی ئــەو پەیامــەی کــە بــۆت هێنــا بــوون لەبــەر کەمتەرخەمــی نەبــوو، وە لەبــەر نەفامیــان نەبــوو، بەڵکــو لەبــەر ســتەمو گومراییــان بــوو، وە هیــچ چارەیەکیــان نەبــوو بەرانبــەر بــە ئێــوە، دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَوۡ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ كِتَٰبٗا فِي قِرۡطَاسٖ فَلَمَسُوهُ بِأَيۡدِيهِمۡ ﴾ واتــە: بــە ئەوپــەڕی دڵنیابوونــەوە ﴿ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾ بــە ســتەمو خــۆ بــەزل زانینــەوە دەیانــوت: ﴿ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴾ چ بەڵگەیــەک لــەوە روونو ئاشــکراترە، ئەمەیــش قســە ناشــرینەکانیانە بەرانبــەری، کــە خۆیــان بــە زل دەزانــی بەرانبــەر بــەو ڕاســتیانەی کــە هەســتیان پێدەکــرێو ئــەو

کەسەی کە کەمترین عەقڵی هەبێ ڕەدی ناکاتەوە؟! ﴿ وَقَالُواْ ﴾ بە هەمان شێوە ئەمە چەواشەکاریەکی ڕوونو ئاشکرایە لە سەر نەفامیو نەبوونی زانستو زانیاری بەوانەی کە لە عەقڵدا جێیان دەبێتەوە. ﴿ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ مَلَكٞۖ ﴾ واتە: خۆزگە فریشتەیەک دادەبەزی بۆ سەر موحەمەد ﷺ یارمەتی دەدا لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو پەیامە، بە گومانی ئەوان ئەو مرۆڤە، وە پەیامی خوا تەنها دەبێ لای فریشتەوە بێ.

خوای کاربەجێ لە ئاشکرا کردنی میهرەبانیو بەزەیی خۆیەوە بە بەندەکانی دەفەرموێ: کاتێک کە مرۆڤێکی ڕەوانە کردوە لەسەر شێوەی خۆیان کە بڕوای پێ بهێنن، لەسەر بنەمای زانستو بیرکردنەوەی قووڵو پەنهانی.

﴿ وَلَوۡ أَنزَلۡنَا مَلَكٗا ﴾ بە پەیامەکەمان، ئەوە بڕواهێنان پێی لە هەقو ڕاستیەوە سەرچاوەی نەدەگرت، وە بە هەمان شێوە بڕواهێنانو شایەتیدان (واتە: لە کاتی بینینی فریشتە) بۆی بە تەنها هیچ سودێکی نەدەبوو، ئەمە ئەگەر بڕوایان پێی بهێنایە، بەڵام بە زۆری ئەوان لەم حاڵەتەدا بڕوایان پێی نەدەهێنا، خۆ ئەگەر بڕوایان پێ نەهێنایە کار لە کار دەترازاو سزایان بۆ پێش دەهاتو چاوەڕوانیان نەدەکرا، چونکە بەڕاستی ئەمە سوننەتی خوای گەورەیە بەرانبەر بەو کەسانەی پێشنیارو داوای بەڵگەکانی خوا ﷻ دەکەنو دوایی بڕوای پێ ناهێنن.

بێگومان ناردنی پێغەمبەرێک کە مرۆڤ بێت بە بەڵگە ڕوونەکانەوە، کە خوای گەورە باشتری لێ دەزانی ئەمە بۆ بەندەکانی باشترو لە بارترە، لەگەڵ ئەوەدا دواخستنو مۆڵەت پێدانی بێبڕواو درۆزنەکان لە بڕوانەهێناندا بۆ ئەوان باشترە، وە داواکردنیان بە دابەزاندنی فریشتە شەڕو خراپەی تێدایە بۆیان ئەگەر هەستی پێ بکەن، لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر فریشتە دابەزێ بۆ سەریان ئەوان ناتوانن قسەی لەگەڵدا بکەنو لە توانایاندا نابێ.

وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا
يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ
سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ قُلْ سِيرُوا۟
فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ
﴿١١﴾ قُل لِّمَن مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُل لِّلَّهِ ۚ كَتَبَ عَلَىٰ
نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ
فِيهِ ۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ ۞ وَلَهُۥ
مَا سَكَنَ فِى ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٣﴾ قُلْ
أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيًّا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَهُوَ
يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ ۗ قُلْ إِنِّىٓ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ ۖ
وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلْ إِنِّىٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ
رَبِّى عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ مَّن يُصْرَفْ عَنْهُ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمَهُۥ ۚ
وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ
لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ
﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٨﴾

﴿ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا ﴾ چونکە حیکمەت هەر ئەوە دەخوازێ ﴿ وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴾ واتە: ئەو کات کارەکەیان لێ دەشێوا، وەک چۆن خۆیان لە خۆیان شێواند، چونکە ئەوان کارەکانیان لە سەر ئەم بنەمایە دارشت کە شێواندن لە خۆدەگرێو هەقو ڕاستی تێدا دەرناکەوێ.

کاتێک کە هەقو ڕاستی بە چاکترین ڕێگاو پتەوترین بنەماوە بۆیان دابەزی، نەبووە مایەی هیدایەتو ڕێنمایی، لەگەڵ ئەوەدا بووە مایەی ڕێنمایی بۆ کەسانی تر، بێگومان ئەوان خۆیان تاوانبارن کە دەرگای هیدایەتیان بەسەر خۆیان داخستو لە بەرانبەردا دەرگاکانی گومراییان بە ڕووی خۆیاندا والآکرد.

(١٠-١١): ﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١٠﴾ قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ ﴾

خوا ﷻ لە دڵدانەوەی پێغەمبەرەکەی ﷺ دا لە ئارامگرتنو هەڕەشەکردنی دوژمنانیدا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدِ ٱسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾ کاتێک کە پێغەمبەرانیان بە بەڵگەی ڕوونو ئاشکراوە هاتن بۆ لایان ئەوان بە درۆیان دانانو گاڵتەیان پێ کردن، وە بە هەمان شێوە بەو پەیامەش کە بۆیان دابەزیوە، پاشان خوا ﷻ بە هۆی بێبروایی‌و بە درۆخستنیانەوە لە بەینی بردن وە سزایەکی بۆ دیاری کردن کە شایستەیان بێت ﴿ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُوا۟ مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ واتە: ئاگادار بن ئەی درۆزنەکان! ئەگەر بەردەوام بن لەسەر بە درۆ دانان، ئەوە هەمان چارەنووسی پێشینی خۆتانتان دەبێت.

بە ڕاستی ئەگەر گومانتان لەوەدا هەبوو ئەوە بەسەر زەویدا بگەڕێن، پاشان سەرنج بدەن، سەرەنجامی ئەوانە ببینن کە لەسەر زەوی بوون کە بەڵگەکانی خوایان بە درۆ دادەنا، جگە لە گەلێکی لە

ناوچوو هیچی تر نابینن، وە چەندین ئۆممەتی تر کە بوون بە پەندی زەمانەو تیاچوون، بە ڕاستی ئەوەی پاشماوەکانی ئەوانی بینی ترس دایگرت، هەموو خۆشیو خۆشگوزەرانیەکان خوای بە دەسەڵاتو تۆڵە سێنەر کۆتایی پێهێنا، بە ڕاستی باڵەخانەکانیان وانەیەکە بۆ کەسە ژیرو عاقڵەکان، ئەم گەشتو سەفەرەی کە خوا ﷻ فەرمانی پێکردوە گەشتی دڵو جەستەکانە کە تێیدا وانەو پەندەکان لە دایک دەبێت، بەڵام تەنها تەماشاکردن بەبێ بیرکردنەوە هیچ سوودێکی نیە.

(١٢): ﴿ قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ١٢ ﴾:

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: ﴿ قُل ﴾ بەو بت پەرستانەی کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن ئاگاداریان بکەرەوەو وایان لێ بکە ببنە یەکتاپەرست ﴿ لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتە: کێ دروستکەری ئەوانەیە، کێ دەسەڵاتی هەیە بەسەریانداو کاروبارەکانیان بەڕێوە دەبات؟ ﴿ قُل ﴾ بەوان (بڵێ:) ﴿ لِّلَّهِ ﴾ وە ئەوان دان بەوەدا بنێنو نکوڵی لێ نەکەن، ئایا بۆچی کاتێک کە دانیان بە تاکو تەنهاییو دەسەڵاتی تەواوی خوادا نا، دان نانێن بە دڵسۆزیو یەکتاپەرستیدا بۆ خوا؟!

کە دەفەرموێ: ﴿ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ ﴾ واتە: جیهانی سەرەوەو خوارەوە هەمووی لە ژێر موڵکو فەرمانی ئەو دایە، وە خوا ﷻ میهرەبانیو چاکەی خۆی بۆ بەرفراوان کردوون، وە بە ڕەحمەتو منەتی خۆی داپۆشیوون، وە لەسەر خۆی نووسیوەتی بە ڕاستی میهرەبانی زاڵە بەسەر تووڕەییدا، وە بەخشین لە لای ئەو باشترە لە خۆگرتنەوە، وە بەڕاستی خوا ﷻ دەرگاکانی میهرەبانیو بەخشندەیی خۆی بۆ بەندەکانی واڵا کردوە، ئەگەر خۆیان بە هۆی تاوانەکانیانەوە دەرگاکان لە خۆیان دانەخەن، وە بانگی بۆ کردوون ئەگەر تاوانو سەرپێچیو تاوانەکانیان ڕێگریان لێ نەکات.

وە کە دەفەرموێ: ﴿ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ ﴾ ئەمە سوێندێکە لە لایەن خواوە کە بێگومان ڕاستگۆترینی هەواڵ بێژەکانە، وە بێگومان لەسەر ئەوە چەندین بەڵگەی ڕوونی باس کردوە کە شایستەی ئەو پەڕی یەقینو دڵنیاییە، بەڵام ستەمکاران تەنها سەرکەشیو نکوڵیان بەرانبەر بە دەسەڵاتی خوا ﷻ نواند لەسەر دروستکردنەوەی دروستکراوەکان لە ڕۆژی دواییدا، هەتا ڕۆچوون لە سەرپێچیداو بوێریان نواند بە بێبڕوابوون پێی، ئنجا دنیاو دوارۆژیان لە دەستدا، ئا لەبەر ئەمە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ (واتە: ئەوانەی بێبڕوان، خۆیانیان لە دەست داوە بۆیە ئیمان ناهێنن).

(١٣-٢٠): ﴿ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٣﴾ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا
فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ
وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾
مَّن يُصۡرَفۡ عَنۡهُ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمَهُۥۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا
كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يَمۡسَسۡكَ بِخَيۡرٖ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ
وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٨﴾ قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ
لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ أَئِنَّكُمۡ لَتَشۡهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخۡرَىٰۚ قُل لَّآ أَشۡهَدُۚ قُلۡ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ
وَٰحِدٞ وَإِنَّنِي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُۘ ٱلَّذِينَ
خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾

بزانە بە ڕاستی ئەم سوورەتە پیرۆزە باس لە دانپێدانان بە یەکتا پەرستی دەکات بە هەموو بەڵگە عەقڵیو نەقڵیەکانەوە، بەڵکو هەمووی لەوە نزیکە باس لە گەورەی یەکتاپەرستی بکات، وە مشتو مڕو وتو وێژی هاوبەش دانەرانو ئەوانەی پێغەمبەرانیان بە درۆ داناوە.

خوا ﷻ لەم ئایەتانەدا لەوە دەدوێت کە دەبێتە مایەی هیدایەتو بتپەرستانی پێ لەناو دەبات، باس لەوە دەکات کە ﴿ وَلَهُۥ ﴾ (وە هی) خوایە ﷻ ﴿ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ ﴾ ئەویش دروستکراوەکانە بە گشتی لە مرۆڤو جنۆکەو فریشتەو ئاژەڵو بێ گیانەکان، هەموویان دروستکراوی بەڕێوەبرانو لە ژێر باری فەرمانی خوای بە دەسەڵاتو بەهێزدان، ئایا دەگونجێ بە عەقڵو نەقڵ ئەو کەسانە بپەرسترێن کە گەیشتوونەتە لوتکەی دەسەڵات، ئەوانەی کە نەخێریان بە دەستەو نە شەڕ؟ لە بەرانبەردا واز لە دڵسۆزی نواندن بۆ دروستکەر بهێنێت، کە خێرو شەڕ بە دەستیەتیو خاوەن هەموو سیفەتە بەرزەکانە؟ یان عەقڵی تەواوو ساغو سروشتی ڕاستەقینەو پاک مرۆڤ بانگ دەکات بۆ لای دڵسۆز بوون لە بەندایەتیداو خۆشویستنو ترسانو ئومێدو هیوا بوون بە پەروەردگاری جیهان؟! ﴿ ٱلسَّمِيعُ ﴾ بۆ هەموو دەنگەکان بە جیاوازی هەموو زمانەکانو جۆری پێویستیەکان ﴿ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ بەوەی کە بووەو بەوەی کە دەبێت، وە ئەوەشی کە نەبووە، ئەگەر ببێ چۆن دەبێ، شارەزایەو دەزانێت بەوەی کە ئاشکراو نهێنیە.

﴿ قُلۡ ﴾ واتە: بێژە: بەو بتپەرستانە ﴿ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا ﴾ لەو دروستکراوە بێ توانایانە پشتیوانیم لێ بکەنو سەرم بخەن؟ جگە لە خوا ﷻ کەس ناکەم بە دۆستو پشتیوان، چونکە ئەو بەدیهێنەرو دروستکەری ئاسمانەکانو زەویە ﴿ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُ ﴾ واتە: خوا ڕۆزیو بژێوی دەری هەموو دروستکراوەکانە، بەبێ ئەوەی پێویستی پێیان هەبێت، دەی چۆن دەگونجێ

کەسێک بێجگە لە دروستکەرو ڕۆزی دەرو دەوڵەمەندی ستایش کراو بکەم بە دۆستو پشتیوان؟! ﴿قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَسْلَمَ﴾ بە یەکتاپەرستیو ملکەچی کردنی بە گوێڕایەڵی، چونکە من لە پێشترم لە کەسانی تر بە فەرمانبەرداریو جێبەجێ کردنی فەرمانی پەروەردگارم.

﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ واتە: بە هەمان شێوە قەدەغەم لێکراوە هابەش بۆ خوا بڕیار بدەم، نە لە بیرو باوەڕدا نە لە کۆڕو مەجلیسو کۆبوونەوەدا، ئەمە گەورەترینی فەرزەکانەو پێویستی ترینی پێویستیەکانە.

﴿قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ واتە: بە ڕاستی سەرپێچ کردن لە هاوبەش داناندا دۆزەخ بۆ هەتا هەتایی لەسەر خاوەنەکەی پێویست دەکات، وە پەروەردگاریش تووڕە دەکات، بە ڕاستی ئەو ڕۆژە، ئەو ڕۆژەیە کە بەندە لە سزاو تۆڵەی خوا ﷻ دەترسێ، چونکە بە ڕاستی هەر کەسێک لەو ڕۆژەدا سزای لەسەر دووربخرێتەوە ئەوە ڕەحمی پێکراوە، وە هەر کەسێک دەربازی ببێت لێی ئەوە بێگومان دەرچووەو ڕزگاری بووە، وە هەر کەسێک دەر نەچێتو ڕزگاری نەبێت، ئەوە بە ڕاستی بەد بەختو تیاچووە.

وە لە بەڵگەکانی یەکتاپەرستی خوا ﷻ، ئەوەیە کە بە ڕاستی ئەو تاکو تەنهایە بە لابردنی ناخۆشی زیانەکانو پێدانی خێرو خۆشی بۆ مرۆڤ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ﴾ لە هەژاری، یان نەخۆشی، یان نارەحەتی، یان خەمو خەفەت، یان هاوشێوەکانی ﴿فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ سوودو زیان تەنها لە لایەن خواوەیە، هەر ئەو شایستەی ئەوەیە بە تاکو تەنهایی بپەرسترێ.

﴿وَهُوَ ٱلْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِۦ﴾ هیچ کەس ناتوانێ هەڵسو کەوتو ڕەفتار بکات، وە جوڵەکەریش ناتوانێ جوڵە بکات، وە وەستاویش ناتوانێ بوەستێ تەنها بە ویستی خوا نەبێت، بۆ هیچ دەسەڵاتدارێک نیە شوێنو دەسەڵاتی خۆی بە جێبهێڵێ، بەڵکو هەموویان بەڕێوەبراوو دەسەڵات بەسەردا سەپێنراون، ئەگەر ئەو دەست ڕۆیشتوو بێت ئەوە بێجگە لەو دەست بەسەرا ڕۆیشتوە، بۆیە تەنها ئەو شایەنی پەرستنە ﴿وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ﴾ لەوەی فەرمانی پێدەکاو قەدەغەی دەکات، وە ئەوەی پاداشتی دەداتەوەو سزای دەدات، وە ئەوەی دروستی دەکاتو سەرەنجامی بۆ دیاری دەکات ﴿ٱلْخَبِيرُ﴾ زاناو شارەزایە بەسەر هەموو کارە نهێنیو شاراوەکاندا، ئەمانە هەموویان لە بەڵگەکانی یەکتاپەرستین.

قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً قُلِ اللَّهُ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا
الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً
أُخْرَىٰ قُل لَّا أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ
﴿١٩﴾ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمُ الَّذِينَ
خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى
اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِآيَاتِهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الظَّالِمُونَ ﴿٢١﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ
جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا أَيْنَ شُرَكَاؤُكُمُ الَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٢٢﴾
ثُمَّ لَمْ تَكُن فِتْنَتُهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴿٢٣﴾
انظُرْ كَيْفَ كَذَبُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾
وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ
وَفِي آذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِن يَرَوْا كُلَّ آيَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا بِهَا حَتَّىٰ إِذَا
جَاءُوكَ يُجَادِلُونَكَ يَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ
الْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْأَوْنَ عَنْهُ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّا
أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ وُقِفُوا عَلَى النَّارِ فَقَالُوا
يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾

﴿ قُلْ ﴾ پێیان بڵێ کاتێک کە ڕوونمان کردەوە بۆیان ڕێگاکانی ڕێنمایی‌و هیدایەت: ﴿ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادَةً ﴾ لەسەر ئەم بنەما گەورەیە؟ ﴿ قُلِ اللَّهُ ﴾ گەورەترین شایەتیە، بە ڕاستی ئەو ﴿ شَهِيدٌ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ﴾ هیچ شایەتیەک لە شایەتی ئەو گەورەتر نیە کە شایەتی بۆ من دەدات بە دانپێدانان‌و کردەوە، دان بەوەدا دەنێت کە من بە ئێوەم ڕاگەیاند، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾الحاقة

خوا ﷻ داناو بە دەسەڵاتە، لە حیکمەت‌و دانایی ئەو ناوەشێتەوە کەسێک بە درۆ دان بە پێغەمبەرایەتیدا بنێ‌و وا گومان ببات لە لایەن خواوە نێر درابێ بەڵام وانەبێ، وە وا گومان ببات خوا ﷻ فەرمانی پێکردبێ بە بانگەوازی خەڵک لە کاتێکدا خوا فەرمانی پێنەکردوە، وە خوا ﷻ خوێن‌و ماڵی ئەو کەسانەی بۆ حەڵاڵ کردوە کە پێچەوانەی دەجوڵێنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەڕاستی بزانێ‌و دانی پێدابنێ وە دان بە کردەوەکانیشیدا بنێ، پشتیوانی دەکات لەسەر ئەو موعجیزە دیارو بەڵگە ئاشکرایانە، وە هەر کەسێک پێچەوانەی بجوڵێتەوەو سەرشۆڕی دەکات، دەی چ شایەتیەک لەم شایەتیدانە گەورەترە؟!

وە کە دەفەرموێ: ﴿ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا الْقُرْآنُ لِأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ ﴾ واتە: خوا ﷻ بەم قورئانە پیرۆزە نیگای بۆ کردم بۆ سوودو بەرژەوەندی ئێوە، بۆ ئەوەی ئاگادارتان بکەمەوەو بتان ترسێنم لە سزایەکی بە ئێش، وە ئاگادار کردنەوەش تەنها بە باس کردنی ئەوە دەبێ کە ئاگاداری پێ دەکرێتەوە، لە هاندان‌و ترساندندا، وە بە ڕوونکردنەوەی گوفتارو کرداره ئاشکراو نهێنیەکاندا، ئەوەی کە بەندە بە جێی بهێنێ ئەوە بە دەم ئاگادارکردنەوەکەوە ڕۆشتوە.

ئەم قورئانە ئاگادار کردنەوەی تێدایە بۆ ئەوانەی لەگەڵیاندا دواوە، وە بە هەمان شێوە

هەمـوو ئـەو کەسـانەی کـە قورئانیان پـێ دەگـات هەتـا ڕۆژی دوایـی، بێگومـان هەموو داواکاریەکانـی خـوا ﷻی لـە خـۆ گرتووە.
کاتێـک کـە خـوا ﷻ شـایەتیدانی خـۆی ڕوونکردوەتـەوە کـە گەورەترین شـایەتی دانە لەسـەر یەکتاپەرسـی خـۆی، دەفەرموێ: بەوانـە بڵێ کـە دژایەتی هەواڵی خـوا ﷻ دەکەنو پێغەمبەرانـی بـە درۆ دەخەنـەوە ﴿ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ ۚ قُل لَّآ أَشْهَدُ ﴾ واتـە:ئەگـەر ئەوانیـش شـایەتی نارەوایاندا تۆ شـایەتی لەو جـۆرە مـەدە لەگەڵیاندا.
هاوسـەنگی بکە لە نێوانی شـایەتیدانی ڕاستگۆی ڕاسـتگۆیاندا، وە پەروەردگاری جیهانیاندا، وە شـایەتیدانی پاکترینـی مرۆڤایەتی کە پشـتیوانی کـراوە بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە لەسـەر یەکتاپەرسـتی خـوای تـاکو تەنها کـە هیـچ شـەریکو هاوەڵێکی نیـە، وە شـایەتی دانی ئەوانـەی کـە هاوەڵ بـۆ خوا ﷻ دادەنێـن، ئەوانەی کـە عەقڵو ئاینـی خۆیانیان شـێواندوە، وە ڕەوشـتو بۆچوونـی خۆیانیـان پـووچ کردوەتـەوەو مرۆڤە ژیـرەکان گاڵتە بـە عەقڵیان دەکەن.
بەڵکـو بـە پێچەوانـەی شـایەتیدانی سروشـتیان جوڵانەتـەوە، وە قسـەکانیان پێچەوانـەی عەقڵیانـە لـە چەسـپاندنی ئـەوەی کـە لەگـەڵ خـوادا دروسـتکەرێکی تـر هەیە، خـۆت بۆ خـۆت یەکێـک لـەم دوو شـایەتی دانـە هەڵبژێـرە، ئەگـەر عاقڵـی، ئێمـە بۆ خۆمـان ئەوە هەڵدەبژێریـن کـە خوا ﷻ بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ هەڵیبـژاردووە کە فەرمانـی پێکردووین بـە پەیڕەو پـێ کردنـی، دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ واتە: تـاکو تەنهایە بێجگە لـە ئـەو کـەس شایسـتەی پەرسـتنو پەروەردگارێتی نیـە، وەک چـۆن تـاکو تەنهایە لە دروسـتکردنو ڕێکخستندا.
﴿ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴾ لـەو بتانـەو هەمـوو ئەوانـەی کـە لەگـەڵ خـوا ﷻ دەکرێـن بـە هاوبـەش، ئەمـە حەقیقەتـی یەکتاپەرسـتی پەروەردگارێتیـە بـۆ خوا ﷻو نەفـی کردنی دژەکەیەتـی، کاتێـک کە شـایەتیدانی خـۆی ڕوون کـردەوەو شـایەتیدانی پێغەمبەرەکەی لەسـەر یەکتاپەرسـتی، وە شـایەتیدانی بتپەرسـتەکان ئەوانـەی کـە زانسـتیان پێ نیە لەسـەر پێچەوانەکـەی، باسـی کردوە کە خـاوەن کتێبەکان لە جوولەکـەو گاورەکان ﴿ يَعْرِفُونَهُۥ ﴾ واتە: ڕاسـتیو دروسـتی یەکتاپەرسـتی دەزانن ﴿ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمُ ﴾ واتە: هیچ گومانیان لـە پێغەمبەرایەتـی نیـە، وەک چـۆن گومانیـان لـە منداڵەکانیان نیـە، بە تایبەت کـورەکان کـە بـە زۆری لـە باوکیان دەچـن، وە دەگونجـێ ڕاناوەکـە لێـرەدا بگەڕێتەوە بـۆ پێغەمبەر

موحەممەد ﷺ وە خـاوەن کتێبەکان هیچ گومـانو دوو دڵیان نیە لە ڕاسـتی پەیامەکەی، بە هـۆی ئـەوەی بەڵگـە گەلێکی زۆریـان لە لایە لە مـژدە پێدانیان بـە هاتنیو ئەو سـیفەتانەی کـە لـە کتێبەکەیاندا بـاس کراوە، جگـە لە موحەممەد ﷺ کەسـی تـر ناگرێتەوە، پـڕاو پڕ لەگەڵ ئـەودا دێـتو دەیپێکێت.

وە دەفەرمـوێ: ﴿ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ واتـە: نەفسـی خۆیانیـان دۆڕاند کە دروسـتکراوە بـۆ بڕواهێنـانو یەکتاپەرسـتی، وە بـێ بەشـیان کـرد لـە فـەزڵو چاکـە لـە لایـەن خوای باڵادەسـت ﴿فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ ئەگـەر بڕوایـان نەبوو ئەوە پرسـیار لە شـەڕو خراپە مەکە کـە تووشـیان دەبێ.

(٢١): ﴿وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢١﴾﴾:

واتـە: هیـچ کەسـێک ئەوەنـدەی ئـەو کەسـە یاخـیو سـتەمکار نیە کـە یەکێک لـەم دوو وەسـفە دەگرێتـە خـۆی، دەی چۆن ئەگـەر هەردووکیانی تێـدا بێ، درۆ هەڵبەسـتن دەرهەق بـە خـوا ﷻ، یـان درۆ کردن بـەو ئایەتانەی کـە بۆ پێغەمبـەران دابەزیـوە، بە ڕاسـتی ئەمە سـتەمکار تریـن کەسـە، وە سـتەمکاریش هەرگیز ڕزگـاری نابێت.

وە دەچێتـە ئـەم چـوار چێوەیـەوە هەمـوو کەسـێک درۆ بـە دەم خـواوە بکات بە بانگەشـە کردنـی هـاوەڵ پەیـدا کردن بۆی، یـان پشـتیوانی، یان وا گومان بيات دروسـتە کەسـێکی تـر بپەرسـترێت، یـان خـوا ﷻ هـاوەڵو منداڵ بۆ خـۆی دیاری بـکات، وە هەر کەسـێک پەیامـی پێغەمبـەران ڕەت بکاتـەوە، یان کەسـێک بخاتە ئاسـتی ئەوان.

(٢٢-٢٤): ﴿وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَيۡنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ لَمۡ تَكُن فِتۡنَتُهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ ﴿٢٣﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡۚ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٢٤﴾﴾:

واتـە:خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی سـەرەنجامی بـت پەرسـتان لـە ڕۆژی دواییـدا، بێگومـان پرسـیاریان لـێ دەکرێو سـەرکۆنە دەکرێن، پێیان دەوتـرێ: ﴿أَيۡنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ﴾ واتـە: خـوا ﷻ هاوەڵو هاوبەشـی نیـە، بەڵکو ئـەوە تەنها گومـانو درۆی ئـەوان بـوو ﴿ثُمَّ لَمۡ تَكُن فِتۡنَتُهُمۡ﴾ واتـە: پاشـان هیـچ وەڵامو بەهانەیەکیـان نیـە کاتـێ کـە تاقـی دەکرێنـەوە بـەو پرسـیارە، تەنهـا ئەوە نەبـێ نکوڵـی لـە شـیرکو هاوەڵدانانیان دەکـەن، وە دوایـی سـوێند دەخۆن بـە خـوای پەروەردگار کە بە هیـچ جۆرێـک هاوەڵیان بـۆ خـوا ﷻ پەیدا نەکردوە ﴿ٱنظُرۡ﴾ بەسـەر سـووڕمانەوە تەماشـای حاڵیـان بکە ﴿كَيۡفَ

كَذَبُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ ﴾واتـە: درۆیەکیان کرد تەنها خۆیان زیانیان پێگەیشـتو بەسـەر خۆیاندا شـکایەوە ﴿ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾واتـە: (لێیـان ون بـوو ئـەو بـتو) هاوەڵانەی کە گومانیـان دەبـرد لەگـەڵ خـوادا هاوبەشـن، بـەرزیو بڵنـدی بۆ خـوا ﷻ لـەو کارە خراپە بەرزیەکـی گـەورەو بـێ وێنە بـۆ پەروەردگار.

(٢٥): ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾

واتـە: لـەو بتپەرسـتانە هەندێکیـان هەنـدێ کات بـە هـۆی هەنـدێ پێشـهاتەوە گوێت بۆ دەگـرن، بـەڵام بیسـتنێک کـە ئامانجیان ئـەوە نیە هەقو ڕاسـتی ببیسـنو شـوێنی بکەون، بۆیە سـوود لـەو بیسـتنە وەرناگـرن چونکـە مەبەسـتیان خێرو چاکـە نیە.

﴿ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً ﴾واتـە: پەردەمـان داوە بەسـەر دڵیاندا، تا لە فەرمایشـتی خوا ﷻ تێنەگەن، فەرمایشـتی خوا ﷻ لە هاوشـێوەی ئەو شـتە پیسـانە بپارێـزرێ ﴿ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ ﴾ کردوومانـە ﴿ وَقْرًا ﴾واتـە: کەڕیمـان خسـتوەتە نـاو گوێچکەیان سـوود لـەوە وەرناگرن کـە قازانجی هەیـە بۆیان.

﴿ وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا ﴾واتـە: ئەمـە ئەوپـەڕی سـتەمو یاخی بوونە، ئـەو بەڵگەو نیشـانانەی کـە ئامـاژە بە هـەقو ڕاسـتی دەکـەن ملکەچی نابـنو بەڕاسـتی نازانـن، بەڵکو مشـتو مـڕی بـێ ماناو دەمـە دەمێ تێـدا دەکەن لـە بەرانبەر ڕاسـتیدا بۆ ئـەوەی بە درۆی بخەنەوە.

بۆیە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾واتە: (ئـەم قورئانـە) لـە پـەڕەی پێشـین وەرگیراوە کـە لە لایـەن خـواوە نەهاتوە، وە لـە لایەن پێغەمبەرەکانیشـەوە نەهاتـووە، ئەمـە یەکێکـە لە کوفرەکانیـان، ئەگەر نا چۆن ئـەو کتێبەی کـە هەواڵـی ئۆممەتەکانـی پێشـینو دواینی تێدایـە، وە ئەو ڕاسـتیە حاشـا هەڵنەگرانەی کە پێغەمبـەران هێناویانـە لـە چیـرۆکو ئەفسـانەی پێشـینان پـڕە لە دادپـەروەری لـە هەموو ڕووەکانـەوە، (بە ناڕاسـتی دەزانن؟!).

(٢٦): ﴿ وَهُمْ يَنْهَوْنَ عَنْهُ وَيَنْـَٔوْنَ عَنْهُ وَإِن يُهْلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾

واتـە: ئـەو بتپەرسـتانەی کـە درۆ بەدەم خـوا ﷻ دەکـەنو پێغەمبـەران بـە درۆ دەخەنەوە، ئەوانـە هـەم گومـڕانو هـەم خەڵکـی گومـڕا دەکـەن، ئـەو دوو سـیفەتەیان پێکـەوە کۆ

کردۆتـەوە، ڕێگـری لە خەڵکی دەکەن شـوێنی ڕاسـتی بکـەونو ئاگاداریـان دەکەنەوە، وە خۆیـان لـەو هیدایەتـە دوور دەخەنـەوە، با دڵنیابـن بەو کردارانەیـان هیچ زیانێـک بە خواو بەنـدە بڕواداره‌کانی ناگەیەنـن ﴿ وَإِن يُهۡلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴾ (بەڵکـو تەنیا زیان بە خۆیـان دەگەیەنـن، کەچی هەسـت ناکەن).

(٢٧-٢٩): ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالُوٓاْ إِنۡ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا وَمَا نَحۡنُ بِمَبۡعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾:

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی دۆخـی بتپەرسـتەکان کاتێـک کـە ئامـادە دەکرێن بۆ دۆزەخ ﴿ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴾ بـۆ ئـەوەی سـەرکۆنەو سەرزەنشـتیان بکات، بە ڕاسـتی شـتێکی سەرسـووڕهێنەر دەبینێـت، وە دۆخێکـی ناخۆشو پـڕ لـە ئابڕووبەرانـە، دەیانبینێت چـۆن شـایەتی لەسـەر خۆیـان دەدەنو دان دەنێـن بـە بێبڕوایـیو تاوانباریانـدا، وە ئـاوات دەخـوازن کـە بگەڕێنەوە بـۆ دنیا.

بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ
وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالُوا إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ
بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ وُقِفُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا
بِالْحَقِّ ۚ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ
﴿٣٠﴾ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ
بَغْتَةً قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ
عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا
إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۖ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ
﴿٣٢﴾ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ
وَلَٰكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ
رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّىٰ أَتَاهُمْ
نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ
﴿٣٤﴾ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ
نَفَقًا فِي الْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي السَّمَاءِ فَتَأْتِيَهُم بِآيَةٍ ۚ وَلَوْ شَاءَ
اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴿٣٥﴾

﴿ فَقَالُوا يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٧﴾ بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ﴾ واتە: بە ڕاستی ئەوانە درۆ دەکەن، ڕاستیەکانیان لە ناخی خۆیاندا دەشاردەوە، وە کاتێکی زۆریان لەبەر دەستدا بوو، بەڵام خۆزگەو حەزە خراپەکانیان ڕێگریان لێ کردن لە بڕوا هێنان، وە دڵیان بەتاڵ بوویەوە لە خێرو چاکە، ئەوانە درۆ دەکەن لەو ئاوات خواستنە، بەڵکو تەنها ئامانجیان ئەوەیە سزا لە خۆیان دور بخەنەوە.

﴿ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴾ (واتە: ئەگەر بشگەڕێنرێنەوە بۆ دنیا، دیسان ئەوەی لێیان قەدەغە کرابوو ئەنجامی دەدەن، بێگومان ئەوانە درۆزنن).

﴿ وَقَالُوا ﴾ نکوڵیان لە زیندوو کردنەوە دەکردو دەیانوت: ﴿ إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا ﴾ حەقیقەتی دۆخی ئێمەو دروستکردنمان چیە جگە لە ژیانی دونیا نەبێ بە تەنها ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴾ (واتە: خۆ ئێمە زیندوو ناکرێینەوە).

(٣٠): ﴿ وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ وُقِفُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ ۚ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

﴿ وَلَوْ تَرَىٰ ﴾ بێبڕواکان ﴿ إِذْ وُقِفُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ ﴾ بە ڕاستی کارێکی گەورە دەبینی، زۆر ئەستەمو پڕ لە مەترسیە.

﴿ قَالَ ﴾ بە سەرزەنشت کردنەوە پێیان دەوترێ: ﴿ أَلَيْسَ هَٰذَا ﴾ ئەو سزایەی کە دەیبینن ﴿ بِالْحَقِّ ۚ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا ﴾ دانی پێدا دەنێن، بەڵام ئەو دانپێدانانە هیچ سوودێکی نیە بۆیان، ﴿ قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ (واتە: بچێژن سزای سەخت بە هۆی بێبڕواییتانەوە).

(٣١): ﴿ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا

فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ ﴾:

بە ڕاستی ئەوانەی دیداری خوایان بە درۆ خستەوە لە هەموو خێرێک بێ بەش بوون، ئەو بە درۆ خستنەوەیان بوو بە مایەی ئەوەی سنوورەکانی خوا بە بێ باکانە بشکێنن‌و تاوانی گەورە ئەنجام بدەن ﴿ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ ﴾ ئەو کات ئەوان لە خراپترین دۆخدان، لە خراپی حاڵیاندا پەشیمانی دەردەخەن ﴿ قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا ﴾ بەڵام ئەم پەشیمانیە کاتەکەی بەسەرچووە.

﴿ وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴾ تاوانەکانیان هەڵگرتووەو قورسە بەسەریانەوەو ناتوانن لێی ڕزگایان بێ، بۆیە بۆ هەتا هەتایی لە دۆزەخدا دەمێننەوە، وە شایستەی خەشم‌و قینی خوا دەبن بۆ هەتا هەتایە.

(٣٢): ﴿ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۖ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾:

ئەمە حەقیقەتی دنیاو دوارۆژە، بەڵام ژیانی دونیا گاڵتەو گەپ‌و سەرقاڵیە، گاڵتەیە بۆ جەستەو، سەرقاڵیە بۆ دڵ، دڵ سەرقاڵی هەیە، وە دەروون عیشقی هەیە، خەفەتیش لە ناویاندا هەڵواسراوە، خۆ سەرقاڵ بوون پێیەوە وەک یاری منداڵان وایە. بەڵام دوارۆژ، بە ڕاستی ﴿ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ﴾ لە خودو سیفەت‌و مانەوەو بەردەوامی، وە ئەوەی کە نەفس حەزی لێدەکات‌و چاو چێژی لێوەردەگرێت، لە نازو نیعمەتەکانی دڵ‌و ڕووح خۆشکەرەکان لە بەهەشتدا هەیە.

بەڵکو بۆ هەموو کەسێک نیە، بەڵام تەنها بۆ لە خوا ترسان‌و خۆپارێزانە ئەوانەی کە فەرمانەکانی خوا ﷻ بەجێ دێنن، وە واز لە قەدەغەکراوەکانی خوا دەهێنن.

﴿ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ واتە: ئایا ئێوە عەقڵتان نیە، بیری پێ بکەنەوە، تا بزانن کام لەم دوو دنیایە شایستەی هەوڵ بۆ دانە.

(٣٣-٣٥): ﴿ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ
يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّىٰ أَتَاهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا
مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ ﴿٣٤﴾ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ
اسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي الْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي السَّمَاءِ فَتَأْتِيَهُم بِآيَةٍ ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى
الْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾:

واتە: بە ڕاستی ئێمە دەزانین ئەوەی کە درۆزنان دەربارەی تۆ دەیڵێن بێزارو خەمبارت

دەکات، وە ئێمەش فەرمانێکمان پێ نەکردووی لە ئارامگرتن لە بەرانبەریاندا، تەنها بۆ ئەوە نەبێ پلەو پایەت پێ بەرز بکەینەوە، گومان مەبە کە وتەکانیان لە دوو دڵیەوە بەرانبەر بە تۆ سەرچاوەی گرتبێ.

﴿ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ ﴾ واتە: چونکە ئەوان ڕاستگۆیی تۆ دەزانن و دەتناسن لە بارو دۆخت ئاگادارن، تەنانەت پێش پێغەمبەرایەتی پێیان دەوت دەست پاک (الأمین) ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾ واتە: بێگومان ئەوان نیشانەکانی خوا ﷻ بە درۆ دادەنێن، کە خوا ﷻ ویستویەتی لەسەر دەستی تۆ بڵاوی بکاتەوە ﴿ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا۟ عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا۟ وَأُوذُوا۟ حَتَّىٰٓ أَتَىٰهُمْ نَصْرُنَا ﴾ کەواتە: ئەی موحەممەد ﷺ ئارام بگرە، وەک چۆن پێغەمبەرانی پێش تۆ ئارامیام گرت سەردەکەوی وەک چۆن ئەوان سەرکەوتن ﴿ وَلَقَدْ جَآءَكَ مِن نَّبَإِى۟ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ بۆ ئەوەی دڵو دەروونت بچەسپێت و ئارام بگرێت.

﴿ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ ﴾ واتە: سەخت و گرانە لەسەرت لەبەر ئەوەی تۆ سووری لەسەر ئەوەی بڕوا بهێنن، دەی توانای خۆت لەو بوارەدا بەکاربهێنە، بێگومان لە توانای تۆدا نیە هیدایەتی کەسێک بدەی کە خوا ویستی لەسەر هیدایەت دانی نەبێت ﴿ فَإِنِ ٱسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِىَ نَفَقًا فِى ٱلْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِى ٱلسَّمَآءِ فَتَأْتِيَهُم بِـَٔايَةٍ ﴾ واتە: ئەو کارە بکە، بێگومان هیچ سوودێکی نابێت بۆیان، ئەمە یەکلاکردنەوەیە بۆ ئەوەی حەزو گومانی نەمێنێ لە هیدایەت وەرنەگرتنی و هاوشێوەی ئەو سەرسەخت و یاخی بووانە.

﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ﴾ بەڵکو حیکمەتی خوا ﷻ وای پێویست کردوە کە ئەوان لەسەر گومرایی خۆیان بمێننەوە.

﴿ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ ئەوانەی کە حەقیقەت و ڕاستیەکان نازانن، وە لە جێگای خۆیان دایان نانێن.

۞إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَالْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ
يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ ۚ قُلْ إِنَّ اللَّهَ
قَادِرٌ عَلَىٰ أَن يُنَزِّلَ آيَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا
مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ
مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾
وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِي الظُّلُمَاتِ ۗ مَن يَشَإِ
اللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾ قُلْ
أَرَأَيْتَكُمْ إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُ اللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ السَّاعَةُ أَغَيْرَ اللَّهِ
تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ
مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَاءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا
إِلَىٰ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَاهُم بِالْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ لَعَلَّهُمْ
يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَا إِذْ جَاءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا وَلَٰكِن قَسَتْ
قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا
نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّىٰ
إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾

**(٣٦-٣٧)**: ﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَالْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٣٦﴾ وَقَالُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ ۚ قُلْ إِنَّ اللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰ أَن يُنَزِّلَ آيَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾﴾:

خوا ﷻ به پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ﴾ واتە: ئەوانە بە دەم بانگەوازو بڵاوبونەوەی پەیامەکەتەوە دێن‌و، ملکەچی فەرمان‌و قەدەغەکراوەکانت دەبن ﴿الَّذِينَ يَسْمَعُونَ﴾ ئەوانەی بە دڵەکانیان گوێبیستی دەبن‌و سوودی لێ وەردەگرن، بەڕاستی ئەوانە خاوەن دڵو بیستنن. لێرەدا مەبەست لە بیستن: بیستنی دڵو بە دەمەوە هاتنە، ئەگەرنا تەنها بیستن بە گوێ باش‌و خراپ تێیدا بەشدار دەبن، هەموو ئەوانەی کە توانایان هەیە بەڵگەیان بەسەرا سەپێنراوە بە بیستنی نیشانەکانی خوا ﷻ، هیچ بیانویەکیان بۆ نەماوەتەوە لە بە دەمەوە نەهاتنی.

﴿وَالْمَوْتَىٰ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ﴾ دەگونجێ ئەم واتایە بەرانبەر بێ بە واتای پێشوو، واتە: تەنها ئەوانە بە دەمی بانگەوازەکەتەوە دێن کە دڵەکانیان زیندووە، بەڵام ئەوانەی کە دڵیان مردووە هەست بەو خۆشیە ناکەن کە بڕوادارانی تێدایە، بە ڕاستی ئەوانە بە دەمی تۆوە نایەن‌و گوێڕایەڵی فەرمانەکانت نابن، دیداری هەموویان لە ڕۆژی قیامەتدا دەبێت، خوا ﷻ زیندوویان دەکاتەوە، پاشان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

وە دەگونجێ مەبەست لە دەقەکە تەنها لە سەر ڕووکەشی بێت، خوای پەروەردگار بڕیاری گەڕانەوە دەدات، وە لە ڕۆژی دوایدا هەموو مردووەکان زیندوو دەکاتەوە پاشان هەواڵیان پێ دەدات بەو کردەوانەی کە ئەنجامیان داوە.

ئەمە هاندان لە خۆدەگرێت لە بە دەمەوە هاتنی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ وە ترساندن لە پێچەوانەکەی، ﴿وَقَالُوا﴾ ئەوانەی پێغەمبەر بە درۆ دەخەنەوە بە هۆی سەرکەشی‌و یاخی بوونیانەوە ﴿لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِّن رَّبِّهِ﴾ مەبەستیان بەو قسەیە دابەزاندنی نیشانەکانی

هەڵبژاردنە[٣]، ئەو هەڵبژاردنانەی کە بە عەقڵە لاوازو بۆچوونە نارەواکانیان هەڵیدەبژێرن، وەک دەڵێن: ﴿لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ الْأَرْضِ يَنبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ الْأَنْهَارَ خِلَالَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ السَّمَاءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِيَ بِاللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾﴾الإسراء

﴿قُلْ﴾ لە وەڵامی ئەواندا بڵێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰ أَن يُنَزِّلَ آيَةً﴾ کەم تەرخەمی لە قودرەتو دەسەڵاتی خوا ﷻ نیە دەربارەی ئەوە، ئەی چۆن هەموو شتەکان ملکەچی گەورەیی خوای گەورەن، زەلیلی ژێر دەسەڵاتی ئەون؟! بەڵکو زۆربەی خەڵکی نایزانن، ئەوان بە هۆی نەزانیو نەفامیانەوە داوای نیشانە گەلێکیان دەکرد کە خێری تێدا نەبوو بۆیان، ئەگەر بۆیان دابەزیایە بڕوایان پێی نەدەهێناو سزایان بۆ پێش دەهات، وەک چۆن ئەوە سوننەتی خوایە گۆڕانی بەسەردا نایەت، لەگەڵ ئەمەدا ئەوان ئەگەر مەبەستیان ئەوە بووایە ڕاستیەکانیان بۆ ئاشکرا ببێتو ڕێگاکانیان بۆ ڕوون ببێتەوە، وە موحەممەد ﷺ هەموو بەڵگە یەکلاکەرەوەکانی بۆ هێنان، کە بەڵگەن لەسەر هەقو ڕاستی بە شێوەیەک کە مرۆڤ دەتوانی لە هەر بابەتێک لە بابەتەکانی ئاین چەندین بەڵگەی عەقڵیو نەقڵی تێدا بەدی بکات، بە جۆرێکی وا کە لە دڵەکاندا کەمترین گومانو دوو دڵیان تێدانەمێنێ.

بەرزیو بڵندی بۆ ئەو خوایەی کە پێغەمبەرەکەی بە ڕێنماییو ئاینی ڕاستەقینە ناردوە، وە پشتیوانی لێکردوە بۆ ئەوەی لە ناو بچێ ئەو کەسەی بە لای خواوە لە ناو چوو لە ڕووی بەڵگەی ڕوونو ئاشکرا، وە بۆ ئەوەی بژی ئەوەی بە لای خواوە دەژی لە ڕووی بەڵگەوە، بە ڕاستی خوا ﷻ زۆر بیسەرو زانایە.

(٣٨): ﴿وَمَا مِن دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُم ۚ مَّا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِن شَيْءٍ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴿٣٨﴾﴾

واتە: هەموو زیندەوەرەکانی سەر زەویو هەوا لە ئاژەڵو دڕندەو باڵندەکان هەموویان تەنها ئوممەتێکن، دروستمان کردوون وەک چۆن ئێوەمان دروست کردوە، وە ڕزقو ڕۆزیمان پێداون وەک چۆن ڕزقو ڕۆزیمان بە ئێوە داوە، وە ویستو دەسەڵاتمان جێبەجێ بوە بەسەریاندا وەک چۆن جێبەجێکراوە بەسەر ئێوەدا.

---

٣) مەبەست لە هەڵبژاردن ئەوەیە کە بێبڕواکان بەویستی خۆیان داوای دابەزاندنی نیشانەیەکیان دەکردو، خوای گەورەش ئەگەر ئەو نیشانەی دابەزاندبایە لەسەر ویستی خۆیان ئەوە ئەوان دیسانەوە یاخی دەبوون، ئنجا سزایان لەسەر پێویست دەبوو، ئەمەش سۆزی خوایە بەرانبەر بەوان وەک لە پێشتر ئاماژەی پێکراوە. وەرگێڕ.

﴿ مَّا فَرَّطْنَا فِي ٱلْكِتَٰبِ مِن شَيْءٍ ﴾ واتە: هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردوەو لێی بێئاگا نەبووین لە (لوح المحفوظ) بەڵکو هەموو شتەکان بچووک تا گەورە لە (لوح المحفوظ)دا جێگیر کراوە، هەموو ڕووداوەکان ڕودەدەن، پڕاوپڕی ئەوەی کە نووسراوە، ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە بە ڕاستی کتێبی یەکەم هەموو زیندەوەرەکانی لە خۆگرتوە، ئەمەیش یەکێکە لە پلەو پایەکانی قەزاو قەدەر، چونکە بە ڕاستی چوار پلەن:

یەکەم: زانستی خوا ﷻ بە هەموو شتەکان.

دووەەم: کتێبەکەی کە دەوری هەموو بوونەوەری داوە.

سێیەم: ویستو دەسەڵاتی جێبەجێکراوی بەسەر هەموو شتێکدا.

چوارەم: دروستکردنی هەموو دروستکراوەکان تەنانەت کردەوەی بەندەکانیش.

وە دەگونجێ مانای کتێب لێرەدا بە مانای قورئان بێت، وە واتاکەشی هەمان واتای ئەوە بێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَيْءٍ ﴿٨٩﴾ ﴾النحل.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ ﴾ واتە: سەرجەم ئۆممەتەکان لە ڕۆژی دوایی دا لە خزمەتی پەروەردگاردا کۆدەکرێنەوە لەو دۆخە گەورەو ناسکەدا، پاداشتیان دەداتەوە بە دادپەروەریو چاکەی خۆی، وە بڕیاری خۆی بەسەریاندا جێبەجێ دەکات ئەو بڕیارەی کە هەموو ئەوانەی لە ئاسمانو زەویدان لەسەری ستایشی دەکەن.

(٣٩): ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا صُمٌّ وَبُكْمٌ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ ۗ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٩﴾ ﴾:

ئەمە حاڵی ئەو کەسانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە نیشانەکانی خوا ﷻ بە درۆ دەخەنەوە، وە بە هەمان شێوە پێغەمبەرانیش، بەڕاستی ئەوان دەرگای هیدایەتو ڕێنماییان بەسەر خۆیاندا داخست، وە دەرگاری خراپەکاریان بە ڕووی خۆیاندا واڵا کرد ﴿ صُمٌّ ﴾ لە بیستنی هەقو ڕاستی ﴿ وَبُكْمٌ ﴾ لە قسەکردن پێی، قسە ناکەن تەنها قسەی پووچو بێ مانا نەبێت ﴿ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ ﴾ واتە: ڕۆچوون لە تاریکی نەفامیو بێ برواییو ستەمو سەرکەشیو سەرپێچیدا، ئەمە گومراکردنی خوایە بۆ ئەوان ﴿ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ لەبەر ئەوەی خوا ﷻ تاکو تەنهایە بە ڕێنماییو گومرایی کردن بە پێی ویستو حیکمەتی خۆی.

(٤٠-٤١): ﴿ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴿٤١﴾ ﴾:

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: ﴿ قُلْ ﴾ بە هاوبەش دانەران بۆ خوا (بڵێ)، ئەوانەی

لە ڕێگای خوا لایانداوە ﴿ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ ئەگەر نارەحەتیو سزایەکتان بەسەردا بێتو نەتوانن بەرگری لێ بکەن، ئایا داوا لە پەرستراوو بتەکانی خۆتان دەکەن؟ یان داوا لە پەروەردگاری هەق دەکەن؟ ﴿ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴾ ئەگەر ئەمە حاڵی ئێوەیە لە گەڵ پەرستراوەکانتاندا کەلە کاتی ناخۆشیەکاندا ئەوانتان بیر دەچێ، چونکە دەزانن ئەوان هیچ زیانو قازانجێک بە ئێوە ناگەیەنن، وە بە هەمان شێوە مردنو ژیانو زیندوو بونەوەش.

وە بە ئەوپەڕی دڵسۆزیەوە لە خوای پەروەردگار دەپاڕێنەوە، چونکە دەزانن سوودو زیان بە دەستی ئەوە، کە وەڵامی کەسی ناچارو نارەحەت دەداتەوە، ئەی بۆچی لە کاتی خۆشیدا هاوەڵی بۆ دادەنێن؟ ئایا هیچ بەڵگەیەکی نەقڵی یان عەقڵیتان لە لا هەیە؟ یان ئێوە زانستێکتان هەیە دەربارەی ئەمە؟ نەخێر بەڵکو درۆ بەدەم خواوە دەکەن.

(٤٢-٤٥): ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴿٤٤﴾ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ ﴾ لە گەلەکانی پێشینو ئەو سەدانەی کە ڕابورد، پێغەمبەرانی ئێمەیان بە درۆ خستەوە، وە سەرسەختیو نکوڵیان دەکرد بەرانبەر بە ئایەتو نیشانەکانی ئێمە ﴿ فَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ﴾ واتە: تووشی هەژاریو نەخۆشیو بەڵاو موسیبەتمان کردن، وەک میهرەبانیەک لەلایەن ئێمەوە بە ئەوان ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَضَرَّعُونَ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ لای ئێمەو لە ناخۆشیەکاندا پەنامان بۆ بهێننو کزی بنوێنن ﴿ فَلَوْلَآ إِذْ جَآءَهُم بَأْسُنَا تَضَرَّعُوا۟ وَلَٰكِن قَسَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾ واتە: دڵیان ڕەق بوو نەرم نەبوویەوە بەرانبەر بە ڕاستی ﴿ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ وا گومانیان دەبرد کە ئەوەی لەسەری دەڕۆن ئاینی هەقو ڕاستەقینەیە، سەردەمانێکی دوورو درێژ لە گومراییو بەتاڵیدا دەژیان شەیتانیش گەمەی بە عەقڵیان دەکرد ﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَٰبَ كُلِّ شَىْءٍ ﴾ دەرگای خۆشیەکانی دنیایان بە ڕوودا دەکەینەوە ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُوا۟ بِمَآ أُوتُوٓا۟ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ ﴾ واتە: لە هەموو خێرو چاکەیەک بێ ئومێد بوون، ئەم بێ ئومێدیە لە سزا بەهێزترە، کاتێک کە لە پڕێکدا تۆڵەمان لێ سەندنەوە هەتا سزاکەیان قورسترو موسیبەتو بەڵاکەیان گەورەتر بێت.

فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ۚ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾
قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم
مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ
ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ
بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا
نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ۖ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ
فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا
يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ
عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ ۖ
إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ ۚ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ۚ
أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾ وَأَنذِرْ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحْشَرُوٓا۟ إِلَىٰ
رَبِّهِمْ ۙ لَيْسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ
﴿٥١﴾ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِىِّ يُرِيدُونَ
وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ
عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾

﴿فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟﴾ واتە: سزای بە ئێش دران، وە هەموو پەیوەندیەکیان پچڕا ﴿وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ لە سەر ئەو ویستو بڕیارەی کە درۆزنەکانی پێ لەناو بردوە، بێگومان بەو شێوەیە نیشانەو ئایەتەکانی ڕوون دەبێتەوە، وە ڕێزگرتن لە دۆستەکانیو سەرزەنشت کردنی دوژمنەکانی، وە پێغەمبەرانیش لەو پەیامەی بۆیان دابەزی ڕاستیان فەرموو.

(٤٦-٤٧): ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ ثُمَّ هُمْ يَصْدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات وەک چۆن لە دروستکردنو ڕێکخستنی شتەکاندا تاکو تەنهایە، بە ڕاستی ئەوە بە هەمان شێوە لە یەکتاناسی پەروەدگارێتیدا تەنهایە، دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمْعَكُمْ وَأَبْصَٰرَكُمْ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم﴾ واتە: ئەگەر خوا ﷻ هەستی بیستنو بینینی لێوەربگرێتەوە، ئەو کات بەبێ بیستنو بە بێ بینینو بەبێ عەقڵ دەمێننەوە ﴿مَّنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِهِ﴾ ئەگەر جگە لە خوا کەسێک نەبێ ئەوانەتان پێ ببەخشێ، ئەی بۆچی بەندایەتی شتێکتان دەکرد کە دەسەڵاتی بەسەر هیچدا نیە تەنها مەگەر ویستی خوای لەسەر بێ؟! ئەمە یەکێکە لە بەڵگەکانی یەکتاپەرستیو بەتاڵ بوونەوەی شیرکو هاوبەش دانان، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ﴾ واتە: جۆراو جۆرو چەند بارەیان دەکەینەوە، بە هەموو هونەرێکەوە بۆ ئەوەی هەقو ڕاستی دەربکەوێ، وە ڕێگای ستەمکارانیش ئاشکرا ببێ ﴿ثُمَّ هُمْ﴾ لەگەڵ ئەم ڕوونکردنەوە تەواوەدا ﴿يَصْدِفُونَ﴾ واتە: پشت لە ئایەتەکانی خوا دەکەنو ڕووی لێوەردەگێڕن.

﴿ قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ ﴾ واتـە: پێـم بڵێـن: ﴿ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغْتَةً أَوْ جَهْرَةً ﴾ واتـە: لـە نـاکاودا، یـان پێشـەکیەکی لـە پێـش ئاماژە پێکـردوە کە دەتـان زانـی دەکەونە نـاو ئەو تاوانەوە.

﴿ هَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ ئەوانـەی کـە بـوون بـە هۆی ئـەوەی سـزا بدرێن بە هـۆی سـتەمو سەرسـەختیو یاخی بوونیانـەوە، دەی خۆتان بپارێزن لە سـەر ئـەوەی بەردەوام نەبـن لە سـتەم کردن، چونکـە لەناو چوونو سەرلێشـێواوی هەمیشـەیی بـە دوادا دێت.

(٤٨-٤٩): ﴿ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾:

خـوای گەورە باسـی پوختـەی پەیامی سـەرجەم پێغەمبـەران دەکات کە بریتیە لـە مژدەدانو ترسـاندن، وە لـە بـەر پێویسـتی مـژدەدەرو مـژدە بـۆ دراو، وە ئـەو کردەوانـەی کـە بەندە ئەنجامـی دەدات بـەو هۆیانـەی مـژدەی پـێ دەدرێ، وە ترسـێنەرو ترسـێنراو، وە ئـەو کردەوانـەی کە دەیکات ترسـاندنی لە سـەر پێویسـت دەبێـت، بەڵکو خەڵکی بـوون بە دوو بەشـەوە بـە پێـی وەڵامدانـەوەو و وەڵامنەدانەوەیـان بـۆ بانگـەوازی پێغەمبەران.

یەکـەم: ﴿ فَمَنْ ءَامَنَ وَأَصْلَحَ ﴾ واتـە: هـەر کەسـێک بـڕوا بهێنـێ بـە خواو فریشـتەکانو کتێبـە ئاسـمانیەکانو پێغەمبـەرانو ڕۆژی دوایـی، وە ئیمانو کردەوەو نیەتـی چاکی هەبێت ﴿ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ ﴾ ئـەوەی لـە داهاتـودا دێـت ﴿ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ واتـە: لەسـەر ئەوەی کـە ڕابورد.

دووەم: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلْعَذَابُ ﴾ واتـە: سـزایان لێدەکـەوێو دەیچێـژن ﴿ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴾ (واتـە: بـە هـۆی ئـەو کـردەوە خراپانـەی کـە ئەنجامیـان دەدا).

(٥٠): ﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ إِنِّى مَلَكٌ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾:

﴿ قُلْ ﴾ خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکـەی دەفەرمـوێ: کـە ڕوو بکاتـە ئـەو کەسـانە داوای هەڵبژاردنـی نیشـانەکان دەکـەن بە پێی ویسـتی خۆیـان، یان ئەو کەسـانەی کە پێـی دەڵێن: دە لێمـان گـەڕێ بـا لەگـەڵ خـوادا کەسـێکی تر بپەرسـتین، تـۆش پێیان بڵـێ: ﴿ لَّآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِى خَزَآئِنُ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: من پێتـان ناڵێم خەزێنـەو ڕزقو ڕۆزی میهرەبانی خوا ﷻ لە لای منـە ﴿ وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ ﴾ بێگومـان ئەوانە هەمـووی تەنها لە لایەن خـوای گەورەوەیە، ئەگـەر خـوای پەروەردگـار دەرگـای میهرەبانی لە خەڵک بکاتـەوە کەس ناتوانـێ دایبخات،

وە ئەگـەر دەرگـای میهرەبانـی دابخـات کـەس ناتوانـێ ئـەو دەرگایـە بکاتـەوە، خـوا ﷻ تـاکو تەنهایـە، وە زانایە بـە پەنهـانو ئاشـکراکان ﴿عَـٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ فَلَا يُظۡهِرُ عَلَىٰ غَيۡبِهِۦٓ أَحَدًا ۝٢٦ إِلَّا مَنِ ٱرۡتَضَىٰ مِن رَّسُولٖ ۝٢٧﴾ الجـن.

﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ﴾ (وە پێتـان نالێـم مـن فریشـتەم) کە بتوانم بە ویسـتی خۆم کار بکـەمو فەرمانـم جێبەجـێ بکـرێ، من لە سـەرووی پلـەو پایـەی خۆمەوە کە خـوای گەورە بـۆی دیـاری کـردووم سـنوور نابەزێنـم، ﴿إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ﴾ واتە: ئەمـە ئەوپەڕی پلـەو پایـەی منـە، کە شـوێنی هیچ نەکەوم جگـە لەوەی کە سـروشو نیگام بـۆ هاتوە، خۆم بـۆ خۆم کـرداری پێدەکـەم، وە بانگەوازی هەمـوو خەڵکی دەکـەم بۆ لای.

ئەگـەر بـە پلـەی مـن زانـرا، توێژەر بـە دوای چیـدا دەگـەڕێ لە من، یـان کارێکـی لە من دەوێ کـە مـن بانگـەوازم بـۆ نەکـردوە، ئایا دەکرێ مـرۆڤ پابەنـد بکرێ بە شـتێکەوە کە بانگـەوازی بـۆ نەکـرد بـێ؟ وە بـۆ چ شـتێک، ئەگـەر بانگـم کردن بـۆ لای ئـەو پەیامەی کـە دابەزیـە، لـە بەرانبـەردا ئێـوە ناچـارم دەکـەن بانگەشـە بۆ شـتێک بکـەم کە لـە پلەو پایـەی منـدا نیـە، ئایـا ئەمە سـتەمو یاخـی بوونێـک نیە لـە لایـەن ئێـوەوە؟ پێیان بڵـێ: لە نێوانـی ئەوانـەی بانگـەوازی منیـان پـێ قبوڵـەو ملکەچی ئـەوە دەبـن کە لەلایـەن خواوە دابەزیـوە، وە لـە نێـوان ئەوەی کە بەو شـێوەیە نیـە ﴿قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ﴾ شـتەکان لـە جێگـای خۆیـدا دادەنێـن، وە ئـەوە هەڵدەبژێرن کە پەسـندە.

(٥١-٥٥): ﴿وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا
شَفِيعٞ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ۝٥١ وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ مَا عَلَيۡكَ
مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَمَا مِنۡ حِسَابِكَ عَلَيۡهِم مِّن شَيۡءٖ فَتَطۡرُدَهُمۡ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝٥٢
وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لِّيَقُولُوٓاْ أَهَـٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنۢ بَيۡنِنَآۗ أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ
بِٱلشَّـٰكِرِينَ ۝٥٣ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۖ كَتَبَ رَبُّكُمۡ عَلَىٰ
نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَ أَنَّهُۥ مَنۡ عَمِلَ مِنكُمۡ سُوٓءَۢا بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٞ
رَّحِيمٞ ۝٥٤ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلِتَسۡتَبِينَ سَبِيلُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ۝٥٥﴾

ئـەم قورئانـە ئاگادارکردنەوەیە کە بۆ هەمـوو خەڵکی، بەڵام ئەوەی کە سـوودی لێوەردەگرێ ﴿ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ﴾ ئـەوان دڵنیـان لـەم دنیایـە دەگوازرێنـەوە بۆ ماڵی هەمیشـەیی، بۆیـە ئـەوەی چاکە دەیکـەنو واز لەوە دەهێنـن کە خراپە.

﴿لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ﴾ واتـە: جگـە لـە خـوا ﷻ ﴿وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ﴾ واتـە: هیـچ کەس

نیـە کارو باریـان بـەرێ بخات، تـا ئەوەی پێویسـتە بە دەسـتی بهێنـن‌و ئەوەی خراپـە لێیان بـە دور بخاتـەوە، وە هیـچ تکا کارێکیشـیان نیـە، چونکە دروسـتکراو هەموویـان هیچیان بە دەسـت نیەو هەژارن.

﴿لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ (بەڵکـو لە) خوا بترسـن‌و بـە جێبەجێکردنی فەرمانەکانـی‌و دوورکەوتنەوە لـە قەدەغەکراوەکانـی، چونکـە ترسـاندن ئـەوە پێویسـت دەکات، وە هۆکارێکـە لـە هۆکارەکانـی.

﴿وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ واتـە: ئەوانـەی خوانـاس‌و دڵسـۆزن لـە کـۆڕو مەجلیسـی خۆتیـان دوور مەخـەرەوە، لـە پێنـاو ئـەوەی حـەز بکـەی خەڵکێکـی تـر لـە دەورت کـۆ ببێتـەوە، لەوانـەی کـە پابەندن بـە پاڕانـەوە لە خـوا ﷻ بە نوێـژو هاوشـێوەکانی، وە داوا لـە پەروەردگاریـان دەکەن لە سـەرەتای ڕۆژو لـە کۆتاییەوە، ئـەوان تەنها مەبەسـتیان خـوای گەورەیە، هیـچ مەبەسـت‌و ئامانجێکیان نیە تەنها ئـەو ئامانجە گـەورە نەبێ.

ئەوانـە شایسـتەی دەرکـردن‌و پشـت تێکـردن نیـن، بەڵکـو شایسـتەی دۆسـتایەتی‌و خۆشەویسـتی‌و نزیکردنـەوەن، چونکـە پـاک‌و پاڵفتەن لە خەڵکـی ئەگەر هەژاریـش بن، لە ڕاسـتیدا سـەربەرزن، ئەگـەر چـی لـە لای خەڵکی بە کەم تەماشـا بکرێـن. ﴿مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ﴾ واتـە: هـەر کەس لێپرسـینەوەی خۆی لەگـەڵ دەکـرێ‌و کـردەوەی چـاک‌و خراپیـش هەیە.

﴿فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ﴾ بـە ڕاسـتی پێغەمبـەر ﷺ بـە جوانتریـن شـێوە ئەو فەرمانـەی جێبەجـێ کـرد، ئەگـەر هـەژارەکان دابنیشـتایەن لـە گەڵیانـدا ئارامـی دەگرت‌و بـە جوانتریـن شـێوە مامەڵەی لەگـەڵ دەکردن‌و لە خـۆی نزیکـی دەکردنـەوە، بەڵکو ئەوان زۆرینـەی کـۆڕو مەجلیسـی پێغەمبەریـان پێـک دەهێنا (خـوا لێیـان ڕازی بێت).

هـۆکاری دابەزینـی ئەم ئایەتانـە ئەوە بوو، هەندێ لە دەسـەڵاتدارانی قورەیـش هاتنە خزمەت پێغەمبـەر ﷺ وتیـان: ئەگـەر حـەز دەکەی ئێمە بـڕوات پێ بهێنیـن‌و شـوێنت بکەوین، ئەوە فـڵان کـەس‌و فڵان کـەس لە هـەژارەکان لـە خـۆت دوربخـەرەوە، بەڕاسـتی ئێمە شـەرم دەکەیـن عـەرەب بمانبینێت لەگـەڵ ئەوانەدا دانیشـتووین، ئەویش لەبەر ئـەوەی حەزی کرد بـە مسـوڵمانبوونیان شـوێنی بکـەون، لـە ناخی خۆیـدا ئەوەی باس کـرد، خوای گـەورە بەو دەقانەو هاوشـێوەکانی سەرزەنشـتی کرد.

وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ
عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ وَإِذَا
جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ
رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا
بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾
وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ
﴿٥٥﴾ قُلْ إِنِّى نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۚ قُل
لَّآ أَتَّبِعُ أَهْوَآءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ
﴿٥٦﴾ قُلْ إِنِّى عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَكَذَّبْتُم بِهِۦ ۚ مَا عِندِى مَا
تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ
خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِىَ
ٱلْأَمْرُ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٨﴾ ۞ وَعِندَهُۥ
مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ
وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ
ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾

﴿ وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ﴾ واتە: ئەمە لە تاقیکردنەوەی خوایە بۆ بەندەکانی، کە هەندێکیانی دەوڵەمەند کردووەو هەندێکیشیان ناودارو هەندێکیشیان هەژار، ئەگەر منەتی خۆی کرد بەسەر هەژاردا بە بڕواهێنان، ئەوە دەبێتە بەڵا بۆ دەوڵەمەندو ناوداران. وە ئەگەر دەوڵەمەند مەبەستی شوێنکەوتنی هەقو ڕاستی بێت ئەوە مسوڵمان دەبێتو ئیمان دەهێنێت، ڕێگری لێناکات ئەگەر هەر کەسێکی تر مسوڵمان ببێت یان نا، ئەوە ڕێگری لێناکات بەشداری ئەوە بکات کە دەیبینێ، لە خوارووی خۆیەوە بێ، بە دەوڵەمەندی، یان بە ناوبانگی، وە ئەگەر ڕاست نەکات لە شوێنکەوتنی هەقدا ئەوە دەبێتە بەربەستێک کە شوێنی ڕاستی نەکەوێت.

وە بە چاوێکی کەم تەماشای هەژارە بڕوادارەکانیان دەکردو وتیان: ﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ﴾ ئەمە وای لێکردن کە شوێنی ڕاستی نەکەون، چونکە نەفسو دەروونیان پاک نەبوو، خوای گەورە لە وەڵامی بەرهەڵستیەکانیاندا لە بەرانبەر بە بڕواهێنانی بڕوادارە هەژارەکان، وە هیدایەت وەرنەگرتنیان دەفەرموێ: ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ ئەوانەی نیعمەتەکان دەناسنو دانی پێدا دەنێن، وە کردەوەی چاک بە جێ دەهێنن، فەزڵو منەتی خۆی دەکات بەسەریاندا، جگە لە کەسێک سوپاسگوزار نەبێ؟ خوا ﷻ دانایە فەزڵو چاکەی خۆی نارژێنێ بەسەر کەسێکدا شایستەی ئەوە نەبێ، ئەوانەی ئەو وەسفەیان لە خۆ گرتووە بە پێچەوانەی ئەو کەسەی خوا ﷻ منەتی کردوە بەسەریاندا بە بڕواهێنان، لە هەژارو هاوشێوەکانیان، بەڕاستی ئەوانە سوپاسگوزارن.

کاتێک کە خوا ﷻ قەدەغەی کردوە لە پێغەمبەرەکەی لە دەرکردنی بڕوادارە خواناسەکان، لە بەرانبەردا فەرمانی پێکردوە بەرێز گرتنو بە گەورە تەماشا کردنیان، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ﴾ واتە: ئەگەر بڕواداران هاتن بۆ لات سڵاویان

لێ بکەو بەخێر هاتنیان بکە، وە مژدەیان بدەرێ کە خوا ﷻ بە میهرەبانیو چاکەی خۆی پاداشتیان دەکاتو هیمەتیان بەرز ڕادەگرێت، وە هانیان بدە بە هەر هۆکارێک بیانگەیەنێت بە ئامانج.

وە بیانترسێنە لە گوناهو تاوان، وە فەرمانیان پێ بکە لە داوای لێخۆشبوون لە سەرپێچی کردن، بۆ ئەوەی لێخۆش بوونی خوا بەدەست بهێنن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ أَنَّهُ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوءًا بِجَهَالَةٍ ثُمَّ تَابَ مِن بَعْدِهِ وَأَصْلَحَ﴾ واتە: پێویستە لەگەڵ وازهێنان لە گوناهو پەشێمان بوونەوە، کردەوەی چاک ئەنجام بداتو فەرزو ئەرکەکانی سەرشانی کە خوا پێویستی کردوە لەسەری جێبەجێ بکات، وە هەر کردەوەیەکی خراپیشی کردوە بە ئاشکراو بە نهێنی چاکی بکاتەوە.

ئەگەر هەموو ئەوانەی بەدی کرد ﴿فَأَنَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: لێبوردەییو میهرەبانی خۆی بەسەردا ڕشتوە، بە پێی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی.

﴿وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ﴾ واتە: ڕوونی دەکەینەوەو ئاشکرای دەکەین، وە ڕێگای هیدایەت لە ڕێگای گومڕایی جیا دەکەینەوە، بۆ ئەوەی ببێتە ڕێنمایکار بۆ ئەوانەی دەیانەوێت ڕێنمایی وەر بگرن، تا هەق دەربکەوێ کە پێویستە شوێنی بکەوێ.

﴿وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ الْمُجْرِمِينَ﴾ کە دەیگەیەنێت بە تووڕەییو سزای خوا، بێگومان ڕێگاکانی تاوانباران ئەگەر ڕوون ببێتەوەو دەربکەوێت، دەتوانرێت لێی دوور بکەوێتەوە، بە پێچەوانەی ئەوەی ئاڵۆزو تێکەڵ بێ، ئەوە ئەو مەبەستە گەورەیە کە بە جێ نایەت.

(٥٦-٥٨): ﴿قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ۚ قُل لَّا أَتَّبِعُ أَهْوَاءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ قُلْ إِنِّي عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَكَذَّبْتُم بِهِ ۚ مَا عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ ۚ إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ الْحَقَّ ۖ وَهُوَ خَيْرُ الْفَاصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِ لَقُضِيَ الْأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ۗ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِالظَّالِمِينَ ﴿٥٨﴾﴾:

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ بەو بتپەرستانەی کە لەگەڵ خوادا ﷻ پەروەردگارێکی تر دەپەرستن بڵێ: ﴿إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ لەو بتو پەرستراوانەی کە نە زیان دەگەیەننو نە سوود، وە نە مردنو ژیانو زیندووبونەوەیان بە دەستە، بە ڕاستی ئەمە بە تاڵو پووچە، وە هیچ بەڵگەیەکتان نیە تەنها شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو نەبێ، کە شوێنکەوتنی گەورەترین گومڕاییە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿قُل لَّا أَتَّبِعُ أَهْوَاءَكُمْ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا﴾ واتە: ئەگەر شوێنی هەواو ئارەزووتان بکەوم ﴿وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ﴾

بە شێوەیەک لە شێوەکان، بەڵام ئەوەی من داوام کردوە بۆ یەکتاپەرستیو دڵسۆزیم کردوە بۆ خوا ﷻ، بەڕاستی ئەوە هەقە کە لەسەر بەڵگەی یەکلاکەرەوەی دادەمەزرێت.

وە من ﴿ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي ﴾ واتە: لەسەر بەڵگەیەکی ڕوونو ئاشکرام، وە بێجگە لە ئەمە هەمووی بەتاڵە، بە ڕاستی ئەمە شایەتی دانێکە لە لایەن پێغەمبەرەوە کە قبووڵی هیچ دوو دڵیو گومانێک ناکات، ئەو ڕاستگۆترین شایەتە بەسەر خەڵکەوە بە ڕەهایی، کە بڕواداران بڕوایان پێ هێناوە، وە ڕاستیان بە تەواوەتی بۆ دەرکەوتووە بەو فەزڵو منەتەی کە خوا ﷻ کردوویەتی بەسەریاندا.

﴿ وَكَذَّبْتُم بِهِ ﴾ بەڵکو ئێوە ئەی بتپەرستەکان بە درۆتان خستەوەو بڕواتان پێ نەهێنا، ئەو شایستەی ئەوە نیە کە ئەوەی بەرانبەر دەکەن، دەبوو بڕواتان پێ بهێنایە، وە ئەگەر بەردەوام بوون لەسەر بە درۆدانانی ئەوە باش بزانن، بەڕاستی دووچاری سزا دەبن بەبێ هیچ گومانێک، ئەوە لەلایەن خواوەیە، ئەو خوایەی ئەگەر ویستی لەسەر بێ بۆتان دادەبەزێنێتە خوارەوە، وە ئەگەر پەلەی تێدا بکەن ئەوە هیچ شتێک بە دەست من نیە ﴿ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ﴾ وەک چۆن خوا ﷻ فەرمانی دا بە فەرمانی شەرعی، فەرمانی کردو قەدەغەیشی کرد، بە هەمان شێوە لە داهاتویەکی نزیکدا فەرمان دەکات بە فەرمانی پاداشتی، پاداشتو سزا دەدات بە پێی دادگەریو حیکمەتی خۆی، تانە دان لە بڕیاری خوا ﷻ بە ڕەهایی ڕەد دەدرێتەوە، چونکە بە ڕاستی ڕێگای ڕوون کردۆتەوە، وە هەقو ڕاستی بۆ بەندەکانی باس کردوەو یەکلای کردۆتەوە، وە هیچ بەڵگەیەکی بۆ نەهێشتونەتەوە بۆ ئەوەی ئەگەر هەر کەسێک لەناو چوو، لە سەر بەڵگەی ڕوونو ئاشکرا لەناو بچێ، بۆ ئەوەی بژی ئەوەی دەژی لەسەر بنەمای بەڵگەوە بژی ﴿ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ ﴾ لە نێوان بەندەکانیدا لە دنیاو دواڕۆژدا، جیایان دەکاتەوە بە جیاکردنەوە، سوپاسی دەکەن تەنانەت ئەو کەسەشی کە بڕیاری بەسەردا جێبەجێ دەکرێتو هەقو ڕاستی ڕووبەڕووی دەکرێتەوە ﴿ قُل ﴾ بەوانەی کە پەلە دەکەن لە سزا داندا بە نەفامیو یاخی بوونو ستەم کاریەوە ﴿ أَنَّ عِندِي مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِيَ ٱلْأَمْرُ بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ ﴾ ئەوە دەکەوتە سەر شانی ئێوە، وە هیچ خێرێکی تێدا نە دەبوو بۆ ئێوە.

بەڵکو بڕیار لە لای خوای کارزانو لێبوردە ئەوەیە ئەگەر سەرپێچیکاران سەرپێچی بکەنو بوێری بنوێنن لە ئاستی قەدەغەکراوەکانیدا، لە بەرانبەردا لێیان خۆش دەبێو ڕزقو ڕۆزیان پێ دەدا لەگەڵ نازو نیعمەتە ئاشکراو شاراوەکاندا ﴿ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ هیچ شتێک لە بارو دۆخەکانی ئەوان لە لای خوا ﷻ شاراوە نیە، دەرفەتیان پێ دەداو پشت گوێیان ناخات.

(٥٩): ﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٥٩ ﴾:

ئەم دەقە یەکێکە لەو دەقە هەرە گەورانەی کە بە درێژی باس لە زانستی گشتگیری خوا ﷻ دەکات، بەڕاستی ئەمە باس لە هەموو شاراوەکان دەکات، وە ڕوونی دەکاتەوە کە خوا ﷻ زاناو شارەزایە دەربارەی هەموو دروستکراوەکانی، وە زۆرێک لەوانە فریشتە نزیکەکانو پێغەمبەرە نێردراوەکانیش پێی نازانن، وە بە ڕاستی ئەوەی لە دەشتو چۆڵەوانی دایە لە ڕووەکو گیاندارو لەو بەردو خۆڵ، وە ئەوەیشی لە ناو دەریاکاندایە لە گیاندارانو کانزاو ڕاوکراوەکانی، وە جگە لە مانەش، وە سەرانسەری ئەوانە لە خۆ دەگرێت.

﴿ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ ﴾ لە ڕووەکو دەشتو دەریاو شارو چۆڵەوانیو دنیاو دوارۆژ تەنها خوا ﷻ پێی دەزانێت.

﴿ وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ ﴾ لە دانەوێڵەو بەروبوومو کشتوکاڵو ئەو دەنکە دانەوێڵانەشی کە مرۆڤ دەیان چێنێت، وە ئەو تۆوانەیشی کە لە چۆڵەوانیدا سەوز دەبن بە هەموو جۆرەکانیەوە ﴿ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ ﴾ ئەمە گشتگیرە لە پاش تایبەت ﴿ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴾ ئەویش (لوح المحفوظ) کە هەموو ئەوانەی گرتۆتە خۆ، وە هەندێ لەوانەی کە باسکرا عەقڵی عاقڵان دەگەشێنێتەوە، وە دڵی شارەزایانو پیاو چاکان دەهەژێنێ، ئەمە بەڵگەیە لە سەر گەورەیی پەروەردگارو زانستی پەروەردگاری لە هەموو وەسفەکاندا.

وە ئەگەر هەموو خەڵک لە سەرەتایانەوە تا کۆتاییان کۆ ببنەوە لە سەر ئەوەی دەووری هەندێ لە سیفەتەکانی خوا ﷻ بدەن ئەوە هەرگیز تواناو دەسەڵاتیان نیە بەسەریداو دەستەوسان دەمێنن، پاکیو بێگەردی بۆ پەروەردگاری خاوەن زانستی بەرفراوان، سوپاسگوزاری بڵندو بێ پایان.

بەرزی بۆ ئەو خوایەی کە هیچ کەس ناتوانی وەسفکردنی بژمێرێ، بەڵکو تەنها خۆی دەتوانێ وەسفی خۆی بکات لە سەرووی وەسفی بەندەکانیەوە، بە ڕاستی ئەم دەقە بەڵگەیە لە سەر زانستی گشتگیرو بەرفراوانی خوا ﷻ بە سەر هەموو شتەکاندا، وە کتێبە پیرۆزەکەی کە دەوری هەموو ڕوداوەکانی داوە.


وَهُوَ الَّذِي يَتَوَفَّاكُم بِاللَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِالنَّهَارِ ثُمَّ
يَبْعَثُكُمْ فِيهِ لِيُقْضَىٰ أَجَلٌ مُّسَمًّى ثُمَّ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ ثُمَّ
يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ الْقَاهِرُ فَوْقَ عِبَادِهِ
وَيُرْسِلُ عَلَيْكُمْ حَفَظَةً حَتَّىٰ إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ
رُسُلُنَا وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلَاهُمُ الْحَقِّ
أَلَا لَهُ الْحُكْمُ وَهُوَ أَسْرَعُ الْحَاسِبِينَ ﴿٦٢﴾ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن
ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ تَدْعُونَهُ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَانَا مِنْ
هَٰذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ اللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ
ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾ قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَىٰ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن
فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم
بَأْسَ بَعْضٍ انظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ وَكَذَّبَ
بِهِ قَوْمُكَ وَهُوَ الْحَقُّ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٍ
مُّسْتَقَرٌّ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾ وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا
فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ
الشَّيْطَانُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ الذِّكْرَىٰ مَعَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٦٨﴾

(٦٠-٦٢): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾ ﴾:

ئەمە هەمووی دان پێدانانە بە پەروەردگاریێتی خوا، وە دەکرێتە بەڵگە بەسەر بتپەرستانەوە، وە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە تەنها خوا شایستەی خۆشەویستیو بە گەورە دانانە، هەواڵی داوە کە ئەو تاکو تەنهایە لە بەڕێوەبردنی بەندەکانیدا لە حاڵەتی زیندوو بوونەوەو مردنیاندا، بە ڕاستی ئەو لە شەودا دەیانمرێنێ، جووڵەکانیان هێور دەبێتەوەو نامێنێ، وە جەستەیان پشوو دەدات، وە زیندوویان دەکاتەوە بە لە خەو هەستان بۆ ئەوەی بە دوای بەرژەوەندی دنیاو دوارۆژیاندا بگەڕێن، خوای پەروەردگار دەزانێ چ کارو کردەوەیەک ئەنجام بدەن، پاشان خوای گەورە بەو شێوە کاروباریان بەڕێوە دەبات، هەتا ماوەی دیاریکراویان تەواو دەبێ، پاشان بەم ڕێکخستنە ئەجەلیان بۆ دیاری دەکرێت، ئەویش: ئەجەلی ژیانو ئەجەلێکی تر پاش ئەوە، ئەویش بریتیە لە زیندووکردنەوە لە پاش مردن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ﴾ نەک بۆ لای کەسێکی تر ﴿ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ لە خێرو چاکەو خراپە ﴿ وَهُوَ ﴾ خوا ﷻ ﴿ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦ ﴾ ویستی گشتگیری خۆی لە ناویاندا جێبەجێ دەکات، ئەوان هیچ شتێکیان بە دەست نیە، تەنانەت جوڵەو وەستانیشیان تەنها بە ویستو فەرمانی ئەوە، وە لەگەڵ ئەوەدا فریشتانێک دەکات بە چاودێر بەسەر بەندەکانیدا، بەندە دەپارێزنو هەموو کردەوەکانی دەنووسنو دەپارێزن، وەک چۆن دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامٗا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ الانفطار، ﴿ إِذۡ يَتَلَقَّى ٱلۡمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٞ ﴿١٧﴾ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ﴿١٨﴾ ﴾ ق.

ئەمە پارێزگاری لێکردنێتی لە ژیانی دنیادا.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ تَوَفَّتْهُ رُسُلُنَا ﴾ واتە: فریشتەی نێردراو بە گیان کێشانیان ﴿ وَهُمْ لَا يُفَرِّطُونَ ﴾ لەوەدا، هەر کەسێک ئەجەلی هات نە چرکەیەک زیادی دەکەن نە چرکەیەک کەمی دەکەنەوە، هیچ یەکێک لەوانە جێبەجێ ناکەن تەنها بە پێی فەرمانو بڕیاری پەروەردگار نەبێت ﴿ ثُمَّ ﴾ پاش مردنو ژیانی بەرزەخیان، وە ئەوەی تیایدایە لە چاکو خراپ ﴿ رُدُّوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ ﴾ واتە: ئەو خوایەی کە سەروەریان دەکات بە بڕیاری قەدەریی، جێبەجێ دەکات لە ناویاندا لە جۆرەکانی بەڕێوەبردن، پاشان پشتیوانیان دەکات بە فەرمانو قەدەغەکراوەکانی، وە پێغەمبەرانی بۆ ناردوونو کتێبە پیرۆزەکانی بۆ دابەزاندوون، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان تا ئەوانەی کاری چاکەیان کردوە پاداشتیان بداتەوە، وە ئەوانەشی کاری خراپەیان کردوە سزایان بدات، لەسەر کارە خراپەکانیان، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَلَا لَهُ ٱلْحُكْمُ ﴾ تاکو تەنهایەو هاوەڵی نیە ﴿ وَهُوَ أَسْرَعُ ٱلْحَٰسِبِينَ ﴾ لە بەر تەواوی زانستی وە چاودێریکردنی کردەوەکانیانو پاراستنیان، کە لە (لوح المحفوظ)دا جێگیری کردوە، پاشان فریشتەکان لەو کتێبەی کە لەبەر دەستیاندایە جێگیریان کردوە، ئەگەر خوای گەورە تاکو تەنها بێت لە دروستکردنو ڕێکخستندا، وە زاڵو دەسەڵاتدار بێت بە سەر بەندەکانیدا، وە گرنگی پێدابن لە هەموو بارودۆخەکانی ژیانیاندا، وە بڕیاری قەزاو قەدەر تەنها لە لای ئەو بێت، لەگەڵ بڕیاری شەرعیو بڕیاری پاداشت دانەوەدا، ئەی بۆ بتپەرستەکان لا دەدەن لەو خوایەی کە ئەمە سیفەتو وەسفەکانێتی، وە پەنا دەبەن بۆ لای شتێک کە هیچی بە دەست نیە، تەنانەت بە قەد گەردیلەیەک سوودو قازانجیان پێ ناگەیەنێت؟! دەی سوێند بە خوا! ئەگەر دەیانزانی میهرەبانیو لێبووردەییو سۆزی خوا چەندە زۆرە بە سەریانەوە، ئەوانیش لە بەرانبەردا بە ئاشکرا هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەنو کوفری پێدەکەن، وە بوێری دەنوێنن بەرانبەر بە گەورەیی خوا ﷻ بە بوختان کردنو قسەی پڕو پووچ، لەگەڵ هەموو ئەوانەدا خوا ﷻ لێیان خۆش دەبێو ڕزقو بژێویان دەدات، ئەو کات دەگەڕانەوە بۆلای پەروەردگاریانو بە عەقڵ خۆشیان دەویست، وە لە نەفسو هەواو ئارەزووی خۆیان تووڕە دەبوون کە گوێڕایەڵو ملکەچی داواکانی شەیتان بوون، ئەو شەیتانەی کە شایستەی ڕیسوا کردنە، بەڵکو ئەوان گەلێکی بێ عەقڵن.

(٦٣-٦٤): ﴿ قُلْ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ تَدْعُونَهُۥ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾

﴿ قُلْ ﴾ واتە: بەو بتپەرستانەی کە هاوەڵ بۆ خوا ﷻ دادەنێن، وە لەگەڵ پەروەردگاردا کەسێکی تر دەپەرستن، پابەندیان دەکات بەوەی کە دانیان ناوە بە یەکتاپەرستی پەروەردگارێتی، لەسەر

ئەوەی کە نکوڵیان دەکرد لە یەکتاپەرستیدا ﴿ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾ واتە: لە ناخۆشیو نارەحەتیەکانی، کاتێ کە بە گیردێنو هیچ بیانوویەکتان نامێنی، لە پەروەردگارتان دەپاڕێنەوەو داوای لێدەکەن بە دڵێکی پڕ لە ترسو زمانێکی پڕ لە نزاو پاڕانەوە، لەو حاڵەتە ناخۆشەدا دەڵێن: ﴿ لَّئِنْ أَنجَىٰنَا مِنْ هَٰذِهِۦ ﴾ ئەم نارەحەتیەی کە تێی کەوتوین ﴿ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ (سوپاسگوزاری بۆ) خوا ﷻ، واتە: دان بە نیعمەتەکانیدا دەنێین، وە بەکاری دەهێنن بۆ گوێڕایەڵی کردنی پەروەردگاریان، ئەوانەی کە پارێزگاریان لێ کردوە بۆ ئەوەی لە سەرپێچیدا بەکاری نەهێنن.

﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنْهَا وَمِن كُلِّ كَرْبٍ ﴾ واتە: بە تایبەت لەم نارەحەتیە، وە لە هەموو نارەحەتیو خەمو پەژارەکان بە گشتی ﴿ ثُمَّ أَنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴾ واتە: وەفاتان نابێ بەرانبەر بەو بەڵێنانەی کە داوتانە وە نیعمەتەکانی خواتان بیر دەچێ، دەی چ بەڵگەیەک لەمە ڕوونترە لە سەر خراپیو نارەوایی هاوەڵدانان، وە چاکیو دروستی یەکتاپەرستی؟!

(٦٥-٦٧): ﴿ قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوْمُكَ وَهُوَ ٱلْحَقُّ ۚ قُل لَّسْتُ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٍ مُّسْتَقَرٌّ ۚ وَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾:

واتە: خوای گەورە دەسەڵاتی هەیەو بە توانایە لە سەر ناردنی سزا بۆتان لە هەموو ڕووێکەوە ﴿ مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ ﴾ واتە: بتانکات بە ﴿ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ﴾ لە فیتنەو دووبەرەکیدا هەندێکتان ئازارو جەربەزەی هەندێکی ترتان بدەنو لە ناو یەکدا کوشتار بەرپا بکەن.

خوا ﷻ دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو ئەوانە، دەی خۆتان بپارێزن لە سەرپێچیکردن بەو هۆیەوە تووشی سزا دەبنو لە ناوتان دەبات، لەگەڵ ئەمەدا کە خوا دەسەڵاتدارە بەسەر ئەوەدا، بەڵام میهرەبانی خوا ﷻ سزای ڕەجم کردنی بە گشتی لەسەر ئەم ئوممەتە هەڵگرتوە، وە بە هەمان شێوە بومە لەرزەو ڕۆچوونی زەویش کە لە ناویان دەبات، بەڵکو هەندێکتان بە هۆی هەندێکتانەوە سزا دەدات، وە هەندێکتان دەکاتە دەسەڵاتدار بەسەر هەندێکتانەوە، وەک سزایەکی پێش هاتوو کە ژیرو عاقڵو زاناکان هەستی پێدەکەن.

﴿ ٱنظُرْ كَيْفَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَٰتِ ﴾ واتە: بەڵگەو نیشانەیان بۆ دەگۆڕین، بە چەندەها جۆری جیاواز بۆیان دەهێنین، کە هەمووی ئاماژە بە هەقو ڕاستی دەکات ﴿ لَعَلَّهُمْ يَفْقَهُونَ ﴾ واتە: بەڵکو تێبگەن کە بۆچیو لە پێناو چیدا دروستکراون، وە تێبگەن لە حەقیقەتە شەرعیەکانو داواکاریەکانی

پەروەردگار. ﴿وَكَذَّبَ بِهِۦ﴾ واتە: بە قورئان ﴿قَوۡمُكَ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ﴾ کە هیچ گومانو دوو دڵیەکی تێدا نیە ﴿قُل لَّسۡتُ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ﴾ کردەوەکانتان بپارێزنو پاداشتان بدەمەوە، بەڵکو من ترسێنەرو ڕاگەیەنەرم، ﴿لِّكُلِّ نَبَإٖ مُّسۡتَقَرّٞ﴾ واتە: کاتی خۆی بۆ دیاری کراوە نە پێش دەکەوێو نە دوا دەکەوێ ﴿وَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ﴾ بەو بەڵێنانەی پێتان دراوە بە سزاو تۆڵەسەندنەوە.

(٦٨-٦٩): ﴿وَإِذَا رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٦٨ وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَلَٰكِن ذِكۡرَىٰ لَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ٦٩﴾

مەبەست لە قسەی ناشایستە بەرانبەر بە نیشانەکانی خوا ﷻ: قسە کردنێکە پێچەوانەی ڕاستی بێت، لە جوانکردنی وتارە پووچەکانو بانگەواز کردن بۆ لایو پیاهەڵدانی شوێنکەوتوانیو پشت کردن لە هەقو ڕاستی، تانەو تەشەردان لە شوێنکەوتوانی، خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە پێغەمبەرەکەی، وە پاشان بە ئوممەتەکەی ئەگەر بینیان کەسێک قسەی ناشایستە بەرانبەر بە نیشانەکانی خوا دەکات بە یەکێک لەوانەی کە باسکرا، لێیان دوور بکەونەوەو دامەنیشن لە کۆڕو مەجلسی ئەو کەسانەدا کە سەرقاڵ بوونە بە شتی پووچو بێ ماناو بەردەوام بوون لەسەری، هەتا واز دەهێننو باسەکەیان دەگۆڕن بۆ شتێکی تر.

ئەگەر قسەکەیان گۆڕی بۆ شتێکی تر ئەوە قەدەغەکردنیش لا دەبرێ، ئەگەر بەرژەوەندیەکی تێدا بێت ئەوە فەرمانی پێکراوە، وە ئەگەر بەو شێوە نەبوو ئەوە هیچ سوودێکی تێدا نیەو فەرمانی پێ نەکراوە، لە سەرزەنشت کردنی قسەی بێ ماناو بەتاڵ، گرنگی داوە بە لێکۆڵینەوەو تەماشاکردنو گفتوگۆکردنی ڕاستەقینە، پاشان دەفەرموێ: ﴿وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ﴾ واتە: ئەگەر لەگەڵیان دانیشتی بێئاگا بووی یان لە بیرت چوو ﴿فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە قسەی پڕوپووچ دەکەن، هەر کەسێک قسەی نادروست بکات، یان کارێکی قەدەغەکراو بکات، بێگومان دانیشتن حەرامە لەو شوێنەدا کە شتی خراپی تێدا ئامادە کرابێ، کە توانای نەبێ ئەو شتە خراپە لا ببات، ئەم قەدەغەکردنە بۆ ئەو کەسەیە کە لەگەڵیاندا دابنیشێ، وە لەو شوێنەدا تەقوای خوا نەکرێ، بەوەی کە لەگەڵیاندا بەشدار بێت لە گوفتارو کردەوەی حەرام کراودا، یان لە بەرانبەریاندا بێدەنگ بێو نکوڵیان لێ نەکات، ئەگەر تەقوای خوای کردو فەرمانی بە چاکە کردو قەدەغەی لە خراپە کرد، بەو شێوەیە شەڕو خراپەی لە سەر لادەچێ، یان بۆی سووک دەکرێ، ئەمە هیچ کێشەو تاوانێکی تێدا نیە،


وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَلَٰكِن
ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ
لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن
تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ
وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ
ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟ ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ
وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾ قُلْ أَنَدْعُوا۟ مِن دُونِ
ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ
هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ
حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ۗ قُلْ إِنَّ
هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنْ
أَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ ۚ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ
ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن
فَيَكُونُ ۚ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ۚ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ
عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٧٣﴾

بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ واتە: بیریان دەخاتەوەو ئامۆژگاریان دەکات لەبەر ئەوەی خۆیان بپارێزن‌و تەقوای خوا ﷻ بکەن.

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پێویستە لەسەر ئەو کەسەی ئامۆژگاری دەکاو بیری دەخاتەوە قسەیەک بکات کە نزیک بێت لە مەبەست‌و ئامانج‌و خۆپارێزی تێدا بێ، وە هەروەها بەڵگەیە کە ئەگەر یاد خستنەوەو ئامۆژگاری کردن ببێتە مایەی دوور خستنەوەی ئامۆژگاری کراوو دۆخەکە خراپتر بکات، ئەوە وازهێنان لەو کاتەدا پێویستە، چونکە ئەگەر پێچەوانەی ئامانج‌و مەبەست بوو، ئەوە پێویستە وازی لێ بهێنێت.

(٧٠): ﴿وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبْسِلُوا۟ بِمَا كَسَبُوا۟ ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾﴾:

پێویستە لەسەر بەندەکان بە دڵسۆزیەوە خوا ﷻ بپەرستن، بەندایەتی بکەن بە تاک‌و تەنهایی‌و هاوەڵ‌و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن، وە تواناکانیان خەرج بکەن لە پێناو ڕەزامەندی خوادا، ئەویش بەوە دەبێت دڵ ڕوو بکاتە خوا ﷻ، وە ئەو کۆشش‌و هەوڵەی بەندە بە سوودو ڕاستی بێت، نەک بە گاڵتەو گەمە ئەنجامی بدات، وە بە دڵسۆزیەوە لەبەر خوا ﷻ بێت، نەک بۆ ڕیایی‌و ناوبانگ.

ئەمە ئاینی ڕاستەقینەیە شایستەی ئەوەیە پێی بوترێت ئایینداری، بەڵام کەسێک بڕوای وابێ کە لەسەر ڕاستیە، وە خۆی بە دیندارو لە خوا ترس بزانێت، لە کاتێکدا

ئاینەکـەی بـە گەمەو گاڵتـە وەر گرتبێتو پشـت گوێی خسـتبێ، وە دڵـی وەر چەرخابێت لـە خۆشەویسـتی خوا ﷻو ناسـینی، وە ڕوو بکاتە هەمـوو ئەوانەی کە زیانـی پێدەگەیەنێت، وە لـە بەتاڵیـدا ڕۆبچێـت، وە جەسـتەی لـەم ژیانـەدا بـە شـتی خـراپ ڕابوێرێـت، چونکە کـردەوەو کۆشـش کـردن ئەگـەر بـۆ بێجگە لە خـوا ﷻ بوو ئـەوە دەبێتـە گاڵتـەو گەمە. ئەمـە فەرمانـی خوایـە دەبـێ وازی لـێ بهێنـرێو ئاگادار بێـت، وە بـە خۆیەوە نەنـازێ، با تەماشـای حاڵـی بـکات، و لەو کـردەوە خراپانەی خـۆی بپارێـزی، وە با لە خۆبایـی نەبێت بـە ڕێگرتنـی لـە نزیـک بوونەوە لـە خوا ﷻ.

﴿ وَذَكِّرۡ بِهِۦٓ ﴾ واتـە: بـە قورئانـی پیرۆز یـادی بەندەکان بخـەرەوە، بە فەرمـان کردن، وە شـیکردنەوەو درێـژە پێـدان، وە بە چاکترین شـێوە، بە باسـکردنی ئەو وەسـفە جوانانەی کـە تێیدایـە، وە دوور خسـتنەوەیان لـەوەی کـە زیانـی هەیـە بۆیـان، وە درێـژە پێدانـی جۆرەکانـی، وە ڕوونکردنـەوەی ئـەوەی کـە تیایدایـە لـە وەسـفە ناشـرینەکان کـە دەبێتە مایـەی واز هێنـان لێی.

وە هەمـوو ئەمانـە بـۆ ئەوەیـە کـە هیـچ کـەس تیانەچێـت بـە هـۆی ئـەو خراپانـەی کە کردوویەتـی، واتـە: پێـش ئەوەی بەنـدە بخزێتـە ناو تاوانـەوەو بـە بوێریەوە تـاوان ئەنجام بـداتو بـەردەوام بـێ لەسـەر ئـەو ڕەفتـارە ترسـناکە، دەیخاتـەوە یـادی، وە ئامۆژ گـاری دەکات، لەبـەر ئـەوە بسـڵەمێتەوەو سـەر کۆنە بکرێـتو دەسـت لـەو کارە هەڵبگـرێ.

﴿ لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ ﴾ واتـە: پێـش ئـەوەی تـاوان دەوری بـداتو دایپۆشـێ، پاشـان هیـچ دروسـتکراوێک نەتوانێـت سـوودی پـێ بگەیەنـێ، نـە نزیکو نە هـاوڕێ، وە کـەس جگـە لە خـوا ﷻ پشـتیوانی نـەکات، وە هیچ تـکا کارێـک نەتوانێت تـکای بۆ بـکات.

﴿ وَإِن تَعۡدِلۡ كُلَّ عَدۡلٖ ﴾ واتـە: تەنانـەت هەرچی ماڵی دنیایشـی هەیە لـە فیدیەو برێتی خۆیـدا بیـدات، وە تەنانـەت ئەگـەر پـڕاو پـڕی زەوی ئاڵتونیـش بێـت ﴿ لَّا يُؤۡخَذۡ مِنۡهَآ ﴾ واتـە: لێـی وەرناگیرێـت ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانـەی کـە بەو شـێوە وەسـف کـراون ﴿ ٱلَّذِينَ أُبۡسِلُواْ ﴾ واتـە: لـە نـاو چوونو بـێ ئومێـد بوون لـە خێـر، ئەویـش ﴿ بِمَا كَسَبُواْۖ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ ﴾ واتـە: ئاوێکـی زۆر گـەرمو بـە کـوڵ، کـە گەرمیەکـەی زۆر زۆر بێ ڕووخسـاریان دابماڵـێو نێـو سـکیان ببڕێتو لـەت لەتی بـکات ﴿ وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴾ واتـە: (وە سـزایەکی زۆر بـە ئێشـیش بـە هۆی ئەوەی کـە بێبـڕوا بوون).

(٧١-٧٣): ﴿ قُلْ أَنَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنْ أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ ۚ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ ۚ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ۚ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٧٣﴾ ﴾:

﴿ قُلْ ﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بە بتپەرستەكان بڵێ: كە لەگەڵ خوا ﷻدا شتی تر دەپەرستن، ئەوانە كە بانگتان دەكەن بۆ ئاینی خۆیان، وە وەسفی پەرستراوەكانیان دەكەن، كە مرۆڤی عاقڵ تەنها بە وەسفەكەی تێدەگات كە پێویستە خۆی لێی بپارێزێت، بێگومان هەموو ژیرو عاقڵێك ئەگەر تەماشای مەزهەبی بتپەرستەكان بكات پووچیو بەتاڵی بۆ دەردەكەوێت، پێش ئەوەی بەڵگەی لەسەر پووچیو بەتاڵبوونەوەی باس بكرێت، دەفەرموێ: ﴿ أَنَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا ﴾.

ئەمە وەسفێكە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە كە جگە لە خوا دەپەرسترێن، بە ڕاستی ئەوە نە قازانج دەگەیەنێو نە زیان، وە هیچ شتێك لەو كارەدا نیە، تەنها فەرمان لە لای خوایە.

﴿ وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴾ واتە: هەڵگەڕێینەوە پاش ئەوەی خوا هیدایەتی داوین بۆ گومڕاییو سەر لێشواوی، لە ژیریو هیدایەتەوە بۆ گومڕایی، لە ڕێگای بەرەو بەهەشتی پڕ لە فەڕو بەرەكەتەوە بۆ ئەو ڕێگایەی كە هەر كەسێك شوێنی بكەوێت بەد بەختو چارەڕەش دەبێو بۆ دۆزەخ ڕەوانە دەكرێت.

ئەمە حاڵێكە كە خەڵكی ژیرو عاقڵ پێی ڕازی نابێت، وە خاوەنەكەی ﴿ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: سەری لێ شێواندووەو گومڕای كردووەو وێڵ بووە لە ڕێگای ڕاستی كە دەیگەیەنێت بە ئامانجەكەی، تا ماوەتەوە ﴿ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ﴾ وە شەیتانەكانیش بانگی دەكەن بۆ ڕچە ڕێو گومڕایی، ئەویش لە نێوانیاندا بە سەرگەردانی دەمێنێتەوە.

بە گشتی ئەمە حاڵی خەڵكیە مەگەر خوا ﷻ پاراستبێتی، ئەوان دەبینن خەڵكی سەرنجڕاكێشو دڵرفێنی تێدا هەیە، وە بانگەشەكەری دژ بە یەك، بانگەوازی پەیامو عەقڵی ڕاستەقینەو سروشتی پاك ﴿ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ﴾ وە بەرز بوونەوە بۆ بەرزترینی بەرزیەكان.

وە بانگكەرانی شەیتانو ئەوەی شوێنی دەكەوێت، وە نەفسو دەروونی فەرمانكەر بە

خراپـە، بانگـی دەکـەن بـۆ گومڕایـی، وە دابەزیـن بـۆ نزمتریـن پلـەی خواری خـوارەوە، هەنـدێ لـە خەڵکـی لەگـەڵ بانگخـوازی هیدایەتـدان لـە هەمـوو کارو بارەکانـدا یـان لە زۆربەیانـدا. وە هەندێکیـان پێچەوانـەی ئەمـەن. وە هەندێکی تریان هـەردوو بانگەوازەکە بە لایانـەوە وەک یـەک وایـە، بە بـێ جیـاوازی، هـەردوو کاریگەریەکە بەر یـەک دەکەون لـە لای ئـەوە، لەم شـوێنەدا خۆشـبەختان لـە بەدبەختـان جیـا دەکرێنەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰ ﴾ واتـە: هیـچ ڕێنماییەک نیـە جگە لەو ڕێنماییـەی کـە خوا ﷻ لەسـەر زمانـی پێغەمبەرەکەیەوە موحەممـەد ﷺ ناردویەتی، جگە لە ئـەوە گومڕایی‌و سەرلێشـواویی‌و لـە نێو چوونـە ﴿ وَأُمِرۡنَا لِنُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ بەوەی گوێڕایەڵـی یەکتاپەرسـتی ببین، خۆمان بسـپێرینە فەرمـانو بەرگرتنەکانـی، وە ببیە بەندەی ڕاسـتەقینەی خـوا ﷻ، بـە ڕاسـتی ئەمـە گەورەتریـن نیعمەتە کە خوا ڕشـتوویەتی بەسـەر بەندەکانـدا، وە جوانترین پەروەردەیە گەیاندوویەتی پێیـان. ﴿ وَأَنۡ أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتە: فەرمانمـان پێکـراوە نوێژەکان بـە جێبهێنین بە پایـەو مەرجو سـوننەتو تەواوکاریەکانیەوە ﴿ وَٱتَّقُوهُ ﴾ بـەوەی کـە خوا ﷻ فەرمانی پێکـردوە، وە دوورکەوتنەوە لەوەی کە خوا ﷻ قەدەغـەی کـردوە ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴾ واتـە: کـۆ دەکرێنـەوە لـە ڕۆژی دواییـدا، پاداشـتتان دەداتـەوە بـە پێـی بـاشو خراپـی کردەوەکانتان.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ ﴾ بـۆ ئـەوەی فەرمـان بـە بەندەکان بـکاتو ڕێگریـان لـێ بـکات، وە پاداشـتیان بداتەوەو سـزایان بـدات ﴿ وَيَوۡمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُۚ قَوۡلُهُ ٱلۡحَقُّ ﴾ ئـەوەی کـە هیـچ گومانێکـی تێدانیـە، وە شـتی خراپو بـێ مانا ناڵێـت ﴿ وَلَهُ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ ﴾ واتـە: لـە ڕۆژی دواییـدا، تایبەتـی کـردوە بـە باسـکردن -لەگـەڵ ئەوەدا خـۆی خـاوەن هەمـوو موڵکەکانـە- وە لەبەر ئـەوە موڵکو خاوەندارێتـی ئـەو نابڕێتـەوە، وە هیـچ موڵکێـک بۆ کـەس نامێنـێ تەنها بۆ خـوای تاکو باڵادەسـت دەبێ.

﴿ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾ ئـەو خوایـەی کـە خـاوەن حیکمـەتو دانایـی تـەواوە، وە نازو نیعمەتـی بێ کۆتاو چاکـەی گەورەیە، وە زانسـتی کە دەوری هەمـوو نهێنـیو ئاشـکراکانی داوە، کـەس شـایەنی پەرسـتن نیە جگە لـەو نەبێ، وە هیـچ پەروەردگارێـک نیـە جگـە لـەو نەبێ.

(٧٤-٨٣): ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ
أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ
فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبْرَٰهِيمَ
مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ
ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا
كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ
ٱلْأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ
هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي
لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا
رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ
أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا
تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي
فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠
مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ قَالَ
أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيْـًٔا وَسِعَ رَبِّي
كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ
أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا فَأَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ
﴿٨١﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٨٢﴾ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ
ءَاتَيْنَٰهَآ إِبْرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٨٣﴾ ﴾:

وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ
أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبْرَٰهِيمَ
مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ
﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ
قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْأٓفِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا
رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ
ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ
أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ
﴿٧٨﴾ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ
حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ قَالَ
أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ
إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيْـًٔا وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا أَفَلَا
تَتَذَكَّرُونَ ﴿٨٠﴾ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ
أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا
فَأَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨١﴾

كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ ﴾ هەتا كۆتایی چیرۆكەكە، خوا ﷻ (بە پێغەمبەر ﷺ) دەفەرموێ: باس لە چیرۆكی ئیبراهیم عليه السلام بكە، وە وەسفو پیاهەڵدانی بكەو بە گەورە تەماشای بكە لە بانگەواز كردنیدا بۆ یەكتا پەرستیو قەدەغە كردنی لە بتپەرستی، كاتێك كە بە ئازەری باوكی وت: ﴿ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً ﴾ واتە: هیچ سوودو زیانێكی نیە، وە هیچی لەو كارەدا نیە ﴿ إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾ كاتێك بەندایەتی شتێكتان كرد كە شایانی پەرستن نیە، وە وازتان لە بەندایەتی پەروەردگارو ڕۆزیدەرو ڕێكخەری كاروبارەكانتان هێنا.

﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾ كاتێك كە ئامادەمان كرد تا بانگەواز بۆ یەكتاپەرستی بكات ﴿ نُرِيٓ

إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتـە: تـا بە چـاوی خۆی ئەو بەڵگـە یەکلاکەرەوانە ببینێت ﴿ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴾.

بـە ڕاسـتی (ئینسـان) بە پێی هێـزی بەڵگـە دڵنیایی بەهێز دەبێو زانسـتی تەواو دەچەسـپێت بە هەمـوو داواکاریەکان.

﴿ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ ﴾ واتـە: کاتـێ کە تاریک بوو ﴿ رَءَا كَوْكَبًا ﴾ لەوەیە ئەو ئەسـتێرە گەشـاوانە بـێ، چونکـە کـە بە تایبـەت بـاس کـردوە، بەڵگەیە لەسـەر زیاتـر دەرکەوتنی، بۆیـە، -خـوا زاناتـرە- وتراوە: ئـەوەی کە وتوویەتـی: ئەو ئەسـتێرە زوهرەیە.

﴿ قَالَ هَٰذَا رَبِّي ﴾ واتـە: بـە مەبەسـتی خۆدابەزانـدن بـۆ ئاسـتی نەیارەکانـی، واتـە: ئەمـە پەروەردگارمـە، بێـن ببینیـن، ئایا شـایەنی پەروەردگارێتیـە؟ وە ئایا بەڵگەمـان هەیە بۆ ئەو مەبەسـتە؟ بەڕاسـتی ناگونجـێ بۆ مرۆڤی عاقـڵ هەواو ئـارەزووی خۆی بکات بە پەرسـتراو بەبێ بەڵگـەو دەلیل.

﴿ فَلَمَّآ أَفَلَ ﴾ واتـە: کاتـێ ئـەو ئەسـتێرە ئاوابـوو ﴿ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْأَفِلِينَ ﴾ واتـە: ئـەوەی کە دیـار نامێنی لە پێـش چاو ئەوەی کە دەیپەرسـتێ، بێگومان پەرسـتراو پێویسـتە ڕاگیـراو بـێ بـە بەرژەوەندی ئەو کەسـەی کە دەیپەرسـتێت، وە کارەکانی بـۆ ڕێک بخات لە هەمـوو ڕووەکانەوە.

بـەڵام ئـەوەی کـە کاتێکـی زۆر تێپـەڕ دەبێت ئـەو هێشـتا نادیـارە، ئەمە کەی شایسـتەی بەندایەتـی بـۆ کردنە؟ مەگەر کەسـێک بیپەرسـتێت زۆر گەمـژەو کەم عەقـڵو گێل بێ؟!

﴿ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا ﴾ واتـە: هەڵهـات، کـە بینـی زیاتـر دەرکەوتـوەو ڕووناکتـرە لە ئەسـتێرەکان تـرە ﴿ قَالَ هَٰذَا رَبِّي ﴾ خـۆی دابەزانـە ئاسـتی ئـەوان ﴿ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ هـەژار کـەوتو دەسەوسـان مایـەوە بـۆ ڕێنمایـی پەروەردگـاری، بـۆی دەرکـەوت ئەگـەر خـوا ﷻ ڕێنمایی نەکات، ئـەوە کەس نیـە ڕێنمایـی بـکات، وە ئەگـەر پشـتیوانی نەکات بـۆ گوێڕایەڵـی کردنـی پەروەردگاری، ئـەوە کـەس نیە پشـتیوانی لـێ بکات.

﴿ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكْبَرُ ﴾ لـە ئەسـتێرەو مانـگ گەشـاوەتر بـوو ﴿ فَلَمَّآ أَفَلَتْ ﴾ ئـەو کات هیدایـەتو ڕێنمایـی دەرکـەوتو گومراییـش کـەوتو نەمـا ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴾ کاتـێ کـە بەڵگـەی ڕوون ئاشـکرا دەرکەوت زاڵ بـوو بەسـەر بەتاڵیـی پووچیو بـێ ماناییدا.

﴿ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ﴾ واتــە: بـۆ خــوای تــاک‌و تەنها، ڕووم کردە خواو پشــتم کــردە غەیری خــوا ﴿ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ واتــە: خــۆی بــەری کرد لــە شــیرک‌و هــاوەڵ دانــان، وە ملکەچی کــرد بۆ یەکتاپەرســتی، لەســەر ئــەوە بەڵگــەی ڕوونــی بۆ هێنانــەوە، ئەوەی کە باســمان کــرد لە شــیکردنەوەی ئەو دەقانــەدا ئــەوە تــەواوە، ئەویش ئەوەیە شــوێنی گفتوگۆو مشــت‌و مڕ بــوو، لــە ئیبراهیمەوە بــۆ گەلەکــەی، وە ئاشــکرا کردنــی پووچــی‌و بەتاڵی ئــەو ئەســتێرەو مانــگ‌و خۆرانەی کە بــە ئاســمانەوەن‌و هاوشــێوەکانیان، بەڵام هــەر کەس وتی: ئــەوە پێگەی تەماشــا کردنی بوو لــە قۆناغــی منداڵیدا، ئــەوە هیچ بەڵگەیەکــی پێ نیــە. ﴿ وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ ۚ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ ﴾ دەمــە دەمــێ چ ســوودێکی هەیــە بۆ کەســێ کــە هیدایەتی بــۆ ڕوون نەبوو بێتــەوە؟ بــەڵام ئــەوەی خــوا ﷻ هیدایەتــی دابــێ‌و گەیشــتبێتە بەرزترینــی پلــەی دڵنیایی، بەراســتی -ئەو کەســە بــۆ خۆی- بانگــی خەڵکــی دەکات بۆ ئــەوەی کە لەســەریەتی.

﴿ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ ﴾ بێگومــان ئــەوە زیــان‌و ســوودێک بــە مــن ناگەیەنێــت ﴿ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيْـًٔا ۗ وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا ۗ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴾ دەزانــن کــە بــە ڕاســتی تەنهــا خــوا ﷻ پەرســتراوی بە هــەق‌و شایســتەیە بــۆ بەندایەتــی کردن.

﴿ وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ ﴾ کــە هیــچ توانایەکیان نیەو ناتوانن ســوود بگەیەنن ﴿ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا ﴾ واتــە: تەنهــا بــە شــوێنکەوتنی هەواو ئــارەزوو ﴿ فَأَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾؟

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ
وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢ وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ
قَوۡمِهِۦۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ٨٣
وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ كُلًّا هَدَيۡنَاۚ وَنُوحًا هَدَيۡنَا
مِن قَبۡلُۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ
وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٨٤
وَزَكَرِيَّا وَيَحۡيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلۡيَاسَۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
٨٥ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطٗاۚ وَكُلّٗا فَضَّلۡنَا عَلَى
ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨٦ وَمِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡ وَإِخۡوَٰنِهِمۡۖ وَٱجۡتَبَيۡنَٰهُمۡ
وَهَدَيۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٨٧ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي
بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۚ وَلَوۡ أَشۡرَكُواْ لَحَبِطَ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ ٨٨ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ
وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ
بِهَا بِكَٰفِرِينَ ٨٩ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ
قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ٩٠

خـوا ﷻ ئەو دوو دەسـتەیە جیـا دەکاتەوەو دەفەرمـوێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ﴾ واتە: تێکەڵیـان نەکردوە ﴿إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾ ئاسایش لـە تـرس‌و ناخۆشـی‌و نارەحەتـی (واتـە: هەرچەنـدە مانـدوو بـن لـە پێنـاو خـوادا هەسـت ناکەن ماندوون، چونکـە دڵیان زۆر خۆشـە)، وە ڕێنمایـی بـۆ ڕێگـای ڕاسـت، ئەگـەر ئـەوان بـڕوا هێنانیـان بـە ڕەهایـی تێکـەڵ بە سـتەم نەکـردوە، نە بە شـیرک‌و هـاوەڵ دانـان‌و سـەرپێچی کـردن، ئـەوە ئاسـایش‌و ڕێنمایـی تەواویـان بـە دەسـت دەکەوێت.

بـەڵام ئەگـەر بڕواهێنانیـان تەنهـا بـە هاوەڵدانـان تێکـەڵ نەکردوە بە تەنها، بەڵکو گوناهو سـەرپێچی دەکەن، ئـەوە بنەمای (أصل) هیدایەتیـان وەرگرتـوە، وە بنەمای ئاسایشـیش، ئەگەر چـی تەواویش نەبێت. تێگەیشـتن لە دەقەکـە ئەمەیـە، ئەوانـەی ئـەم دوو فەرمانەیـان بـە دەسـت نەهێنـاوە (دوورکەوتنـەوە لە شـیرک‌و سـەرپێچی کـردن) ئـەوە ڕێنمایی‌و ئاسـایش بە دەسـت ناهێنـن، بەڵکو بەشـیان تەنهـا سـەر لێشـێوان‌و گومراییە.

خـوای گـەورە کاتێـک شـایەتی دا بـۆ ئیبراهیـم ﷺ لـە ڕوون کردنـەوەی بەڵگـە یەکلاکـەرەوەکان، فەرمـووی: ﴿وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ﴾ واتـە: سـەرکەوت بەسـەریانداو زەلیلـی کـردن.

﴿نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُ﴾ وەک چـۆن پلـەی ئیبراهیممـان نزیـک کـردەوە لـە دنیـاو دوارۆژدا، بەڕاسـتی زانسـت پلەی خاوەنەکەی بـەرز دەکاتەوە بەسـەر بەندەکاندا بە چەندین پلـە، بـە تایبـەت زانایـەک کار بـە زانستەکەی بـکات، خـوا دەیکات بە پێشـەوا بـە پێی بارودۆخـی، شـوێنی کردەوەکانـی دەکـەون، وە شـوێن پێیەکانـی هەڵدەگـرن، وە بەر پێی خۆیـان ڕۆشـن دەکەنـەوە بە نـووری ئـەو، وە بە زانسـت‌و زانیاری ئـەو لە تاریکە شـەودا.

وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ ﴿١١﴾ ﴾ المجادلـة، (واتـە: ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو خـاوەن زانیارین بـە چەندین پلە خـوا بەرزیان دەکاتەوە).

﴿ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴾ زانسـتو دانایـی دانانێت لە شـوێنی گونجاوی خۆیـدا نەبێ، وە خـوا ﷻ شـارەزاترە بـە دیـاری کردنی ئەو شـوێنە (ی کـە حیکمەتی خۆی تێـدا دادەنێ).

(٨٤-٩٠): ﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ كُلًّا هَدَيۡنَاۚ وَنُوحًا هَدَيۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحۡيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلۡيَاسَۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطٗاۚ وَكُلّٗا فَضَّلۡنَا عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡ وَإِخۡوَٰنِهِمۡۖ وَٱجۡتَبَيۡنَٰهُمۡ وَهَدَيۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۚ وَلَوۡ أَشۡرَكُواْ لَحَبِطَ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾:

کاتێـک خـوا ﷻ باسـی ئیبراهیمـی کـرد کـە بەنـدەو خۆشەویسـتی خۆیەتـی، وە باسـی منـەتو چاکـەی خـۆی کـرد بەسـەریەوە لە زانسـتو بانگـەوازو ئـارام گرتن لەسـەری، باسـی ئـەو ڕێزەی خوای بـۆ کردوە لە بەخشـینی نەوەی چاکـەکار، وە خوا ﷻ باشـترینو پاکتریـن دروسـتکراوی لـە وەچـەی ئـەو خسـتۆتەوە، بە ڕاسـتی ئەمـە ڕێزێکـی گەورەیە هاوشـانی نیـە، دەفەرمـوێ: ﴿ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ ﴾ کوڕەکەی کە ئیسـرائیلە، باوکـی ئـەو گەلەی کە خـوا ﷻ فەزڵـی دابـوون بەسـەر جیهانیاندا.

﴿ كُلًّا ﴾ (هـەر یـەک) لە ئـەوان ﴿ هَدَيۡنَا ﴾ (هیدایەتمـان دان) بۆ ڕێگای ڕاسـت، لـە زانسـتو کـردەوەدا ﴿ وَنُوحًا هَدَيۡنَا ﴾، ﴿ مِن قَبۡلُ ﴾ ڕێنمایـی کردنی لـە جۆرێکی تایبەتـی ڕێنماییـە کـە تەنها بـۆ تاکەکانی جیهان دەبـێ، ئەوانیـش بریتین لە (أولـوا العزم) خـاوەن هیممەتـن لە پێغەمبـەران، کە ئـەو یەکێکە لـە ئەوان.

﴿ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ ﴾ دەگونجـێ ئـەم ڕانـاوە بگەڕێتـەوە بـۆ نـووح عليه السلام چونکـە نزیکترین بـاس کـراوە، چونکە خـوا ﷻ لەگەڵ باسـی (لوط)دا باسـی کـردوە، ئەویش لـە نەوەکانی نووحـە، نـەک لە نـەوەی ئیبراهیـم، چونکـە برازایەتی.

وە دەگونجـێ ڕاناوەکـە بگەڕێتـەوە بـۆ ئیبراهیـم، چونکـە سـیاقی دەقەکـە وەسـفی ئـەو

دەکاتو پیایا هەڵدەدات، وە ئەگەر چی لووط لە وەچەی ئیبراهیم نیە، بێگومان لەسەر دەستی ئەو بڕوای هێناوە، ئەوەش ڕێزیکە بۆ ئیبراهیم کە لەوە گەورەترە کە تەنیا کوڕی بێت.

﴿ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ ﴾ کوڕی داوود ﴿ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ ﴾ کوڕی یەعقووب ﴿ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴾ هەردوو نەوەی عیمران ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾ وەک چۆن وەچەی ئیبراهیممان کردنە چاکە خواز، چونکە بە چاکی بەندایەتی بۆ خوا ﷻ نوانـدو چاکیش بوو لەگەڵ دروستکراوەکاندا ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ بەو شێوە دەیانگێڕین لە وەسفو ڕاستگۆیی‌و نەوەی چاکە خواز بە پێی چاکەکانیان ﴿ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ ﴾ کوڕەکەی ﴿ وَعِيسَىٰ ﴾ کوڕی مەریەم ﴿ وَإِلْيَاسَ كُلٌّ ﴾ لە ئەوان ﴿ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ لە ڕەوشتو کردەوەو زانستدا، بەڵکو ئەوان پێشەوای گەورەو سەرمەشقی پیاوچاکانن ﴿ وَإِسْمَٰعِيلَ ﴾ کوڕی ئیبراهیم، باوکی ئەو نەتەوەی کە باشترین نەتەوەیە، ئەویش نەتەوەی عەرەبە، وە باوکی پێشەوامان پێغەمبەر موحەممەدە ﷺ ﴿ وَيُونُسَ ﴾ کوڕی مەتا ﴿ وَلُوطًا ﴾ کوڕی هاڕوون برای ئیبراهیم ﴿ وَكُلًّا ﴾ (هەر یەک) لەو پێغەمبەرو نێردراوانە ﴿ فَضَّلْنَا عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ چونکە پلەکانی فەزڵو چاکە خوازی چوارن: ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە باسی کردووەو دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّۦنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ وَحَسُنَ أُو۟لَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ﴾النساء

ئەو پێغەمبەرانە خاوەن پلەی بەرزن، بەڵکو باشترینی پێغەمبەرانن بە شێوەیەکی گشتی. ئەو پێغەمبەرانەی خوا لە کتێبەکەیدا باسی کردوون، بێگومان باشترن لەو پێغەمبەرانەی کە باسی نەکردوون ﴿ وَمِنْ ءَابَآئِهِمْ ﴾ واتە: باوکی ئەو پێغەمبەرانەی کە باسکران ﴿ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ وَإِخْوَٰنِهِمْ ﴾ واتە:هیدایەتی باوکو نەوەو برای ئەو پێغەمبەرانەماندا ﴿ وَٱجْتَبَيْنَٰهُمْ ﴾ واتە: هەڵمانبژاردن ﴿ وَهَدَيْنَٰهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾.

﴿ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: ئەو ڕێنماییەی باسکرا ﴿ هُدَى ٱللَّهِ ﴾ کە هیچ ڕێنماییەک نیە جگە لە ڕێنمایی ئەو نەبێت ﴿ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾ دەی تەنها داوای هیدایەت لە ئەو بکەن، بەڕاستی ئەگەر هیدایەتتان نەدات، ئەوە کەس ناتوانێت ڕێنماییتان بکات جگە لە ئەو، وە ئەوەی کە ویستویەتی ڕێنمایی بکات ئەوانەن کە باسکران.

﴿ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ ﴾ لە سەر گریمانە ﴿ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ بە ڕاستی هاوەڵدانان

کـردەوە پـووچ دەکاتـەوە، وە دەبێتـە مایـەی چوونە نـاو دۆزەخ بـۆ هەتا هەتایـی، ئەگەر ئـەو پـاکو هەڵبژاردانـە هاوەڵیان بۆ خـوا ﷻ دابنایە حاشـای ئـەوان کردەوەکانیان هەموو پـووچ دەبـووەوە، وە جگـە لە ئـەوان لە پێشـترە بۆ هـاوەڵ دانان.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانـەی کـە باسـکران ﴿ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡ ﴾ واتـە: ئەی موحەممـەد ﷺ بە شـوێن ئـەو پێغەمبـەرە هەڵبژێردراوانەدا برۆو شـوێنیان بکـەوە، بێگومان پێغەمبـەری خوا شـوێن پێـی پێغەمبەرانی هەڵگرتوە، هەموو سـیفەتە تەواوەکانـی لە ئەوانەوە وەرگرتوە.

بۆیـە سـەرجەم چاکەو تایبەتمەندیەکان لـەودا کۆبوەتەوە، کە سـەرجەم مرۆڤایەتی کەڵکیان لێوەرگرتـوە، وە بـە هەمان شـێوە گـەورەی سـەرجەم پێغەمبەرانەو پێشـەوای خـۆ پارێزانە، دەی سـڵاوو درودی خـوا بـڕژێ بۆ سـەر گیانی پاکیو سـەرجەم پێغەمبەرانی پێشـوو.

بـەم تێبینیـە هاوەڵان بۆچوونیـان وایە کە پێغەمبـەری خوا باشـترینی پێغەمبەرانە ﴿ قُل ﴾ بـۆ ئەوانـەی کـە پشـتیان لـە بانگەوازەکـە کـردوە ﴿ لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ ﴾ واتـە: داوای مـاڵو پاداشـت ناکـەم لـە بـری ئـەو بانگەوازەی کـە دەیکـەم، چونکـە دەبێتە هۆی ڕێگریتـان لـە هیدایـەت وەرگرتـن، بەڵکو تەنها پاداشـتی مـن لەلایـەن خواوەیە ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴾ ئامۆژگـاری یەکتـری پێدەکـەن، ئـەوەی قازانجـی هەبێت بۆیان کاری پێدەکـەن، وە ئـەوەی زیانـی هەبێـت لە خۆیانـی دوور دەخەنەوە، وە یـادی یەکتری پـێ دەکەنـەوە بە ناسـینی خوا ﷻ و وەسـفەکانی، وە ئامۆژگـاری یەکتری پێدەکەن لەسـەر ڕەوشـتە بەرزەکانو ئـەو ڕێگایانەی دەیانگەیەنێـت پێی، وە ئامۆژگـاری یەکتری پێدەکەن لـە دوور کەوتنەوە لە شـتە ناشـرینەکان، وە ئەو ڕێگایانـەی بەرەو ئەو شـوێنە دەیانبات، جا ئەگـەر یادکردنەوەیـەک بـێ بـۆ هەموو جیهانیـان، ئـەوە گەورەترین نیعمەتـە کە خوا ﷻ بەخشیویەتی پێیان، پێویستە لەسەریان وەریبگرنو سوپاسگوزاری لەسەر بکەن.

وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾

(٩١): ﴿ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾ ﴾

ئەمە ناشرین کردنە بەرانبەر بە نەرێنی کردنی پەیامی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن جوولەکە وا گومانیان برد کە خوای گەورە بۆ سەر هیچ مرۆڤێک هیچی دانەگرتووە، هەر کەسێک ئەمەی وتبێ ئەوە وەکو پێویست خوای نەناسیوەو ڕێزی نەگرتوە، وە هەروەها بە گەورەی نەزانیوە، چونکە تانەی داوە لە حیکمەتو دانایی خوا، وە وای دەزانی کە بەندەکانی فەرامۆش کردوە، نە فەرمانیان پێدەکاتو نە قەدەغەیان لێدەکات، ئەمە نەرێنی کردنی گەورەترین منەتو فەزڵی خوایە، کە کردوویەتی بەسەر بەندەکانیدا، ئەویش بریتیە لەو پەیامەی کە مرۆڤەکان ناگەنە خۆشبەختیو سەرکەوتنی ڕاستەقینە تەنها بە شوێن کەوتنی ئەوە نەبێ، دەی چی لە کەدار کردنو ناشرین کردنێک بەرانبەر بە خوا لەمە گەورەترە؟!! ﴿ قُلْ ﴾ واتە: پێیان بڵێ وتەی خراپو ئەوەی کە دەیڵێن ﴿ مَنْ أَنزَلَ ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِى جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ ﴾ئەویش بریتیە لە تەوراتی پیرۆز ﴿ نُورًا ﴾ لە تاریکی نەفامیدا ﴿ وَهُدًى ﴾ لە گومراییدا، وە ڕێنمایی کارە بۆ لای ڕێگای ڕاست بە زانستو کردارەوە، کە بریتیە لەو کتێبەی کە ناوبانگی دەرکردوە، دەرگای دڵو گوێیەکانی بە ڕووی خۆیدا والآ کردوە، تەنانەت ئەوان لە بەریان دەگرتەوە لە چەند پەڕە کاغەزێکدا بە ویستی خۆیان دەستکاریان دەکرد، ئەوەی لەگەڵ هەواو ئارەزووی ئەواندا بگونجایە دەریان دەخستو ئاشکرایان دەکرد، وە ئەوەی پێچەوانەی بۆچوونیان بوایە دەیان شاردەوە.

﴿ وَعُلِّمْتُم ﴾ لەو زانستانەی کە فێری بوون لەو کتێبە پیرۆزەدا ﴿ مَّا لَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنتُمْ وَلَآ ءَابَآؤُكُمْ ﴾ ئەگەر پرسیاریان لێکەی دەربارەی ئەم کتێبەی کە وەسف کراوە بەو وەسفانە، وەڵامی ئەو پرسیارە بدەرەوە﴿ قُلِ ٱللَّهُ ﴾ کە دایبەزاندوە، ئەو کات ڕاستی دەردەکەوێ وەک دەرکەوتنی خۆر، وە بەڵگەش لە سەریان پێویست دەبێت، پاشان ئەگەر ناچاریانت کرد پابەند بن بەمەوە ﴿ ذَرْهُمْ فِى خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴾ واتە: وازیان لێ بهێنە، کە لە ناو بەتاڵی خۆیاندا گاڵتەو یاری بکەن، هەتا دەگەن بەو ڕۆژەی کە بەڵێنیان پێدراوە.

(٩٢): ﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾:

﴿ وَهَٰذَا ﴾ واتە: ئەم قورئانەی کە﴿ أَنزَلْنَٰهُ ﴾ (دامانبەزاندوە) بۆ تۆ ﴿ مُبَارَكٌ ﴾ واتە: وەسفکردنی بەرەکەتە، ئەویش بە هۆی ئەو هەموو خێرو نازو نیعمەتانەی کە تێدایە ﴿ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾ واتە: بە ڕاست دانەری کتێبەکانی پێشووەو شایەتیان بۆ دەدات ﴿ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلْقُرَىٰ ﴾ واتە: بە هەمان شێوە دامانبەزاندوە کە خەڵکی مەککەو دەوروبەری ئاگادار بکاتەوە، بەڵکو سەرجەم شارو شارۆچکەو وڵاتەکان، خەڵکی ئاگادار بکاتەوە لە سزاو تۆڵەی خوا، وەک چۆن ئوممەتەکانی پێشووی بەو سەرەنجامە گەیاند.

﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ﴾ چونکە ترس لە دڵدا هەبێ ئەوە دڵ زیندوو دەکاتەوەو ملکەچی فەرمانەکانی خوا دەبێت ﴿ وَهُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴾ واتە: بەردەوام دەبن لە سەری، وە پایەو سنوورو مەرجو ئادابو تەواوکەرەکانی بە جوانترین شێوە دەپارێزێ، خوای گەورە بمانگێرێ بە یەکێک لە ئەوان.

(٩٣-٩٤): ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِىَ إِلَىَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَىْءٌ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَٰكُمْ وَرَآءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَٰٓؤُا۟ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٩٤﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: هیچ کەس لەوە ستەمکارترو تاوانبارتر نیە کە درۆ هەڵبەستێ بە دەم خواوە، بەوەی وتەیەک بداتە پاڵ خوای گەورە، یان فەرمانو بڕیارێک ئەو لێی بەری بێت، بە ڕاستی ئەمە گەورەترین ستەمی دروستکراوەکانە، چونکە درۆی تێدایە، وە

گۆڕینـی ئاینـەکان، لـە بنەمـاو، لقەکانیـەوە، وە بیداتە پـاڵ خوا، ئـەوە بە ڕاسـتی خراپترین کارە.

وە بانگەشـە کـردن بـۆ پێغەمبەرایەتیش دەچێتـە ئـەو چوارچێوەیەوە، کە بێگومـان خوا ﷻ وەحـی بۆ نـاردوە، بەڵام لـەوەدا درۆ دەکات، ئەو لەگەڵ درۆکردنیدا بـە دەم خوای گەورەوە، وە بوێری بەسـەر هێزو دەسـەڵاتیەوە، پێویسـت دەکات لە سـەر خەڵک شـوێنی بکەون، وە لەسـەر ئەوە جیهاد بکـەن خوێنو ماڵـی دوژمنانیان بۆ حـەڵاڵ بکرێت.

وە دەچێتـە چوارچێـوەی ئـەم ئایەتەوە، هەر کەسـێک بانگەشـەی پێغەمبەرایەتی بکات وەک موسـەیلەمەی درۆزن و ئەسـوەدی عەنەسـیو موختار، وە هاوشـێوەی ئەوانە کە هەمان وەسفی هەبێـت، ﴿ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثْلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾ واتە: کێ لەو کەسـە سـتەمکارترە کە بڵێت من وەک خـوا دەسـەڵاتم هەیـە، لە بری خوای گەورە شـەرعو یاسـا بـۆ خەڵکی دابنـێ؟ هەموو ئەوانـە دەچنـە ئـەم چوارچێوەیـەوە کە دژایەتـی قورئـان دەکـەن، وە دەڵێن: ئێمـە دەتوانین هاوشـێوەی قورئان شـتێک بهێنین.

وە چ سـتەمێک لـەوە گەورەتـرە لە بانگەشـە کردنی کەسـێکی هـەژاری بێ توانـای ناتەواو لـە هەموو ڕوویەکـەوە بەرانبەر بـە پەروەردگاری بە هێـزو دەوڵەمەند کە خاوەن دەسـەڵاتی ڕەهایـە لـە هەمـوو ڕویەکـەوە لـە خـودو نـاوو سـیفاتەکانی ؟!کاتـێ کـە سەرزەنشـتی سـتەمکارانی کـرد باسـی ئـەو سـزایانەی کرد کـە بۆی دیـاری کـردوون لـە ڕۆژی دوایی دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ فِى غَمَرَٰتِ ٱلْمَوْتِ ﴾واتە:نارەحەتیو ناخۆشـیەکانی سـەرەمەرگ، شـتێکی ترسـناک دەبینـی، وە حاڵەتێـک کـە کـەس لـە تواناییدا نیە وەسـفی بـکات. ﴿ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓا۟ أَيْدِيهِمْ ﴾ بـۆ ئـەو سـتەمکارانە کـە ئامادەکراون بـۆ لێدانو سـزا، کاتێ کـە ڕووحیان لە جەسـتیان دەر دەهێنـن پێیان دەڵێـن: ﴿ أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ ﴾ واتـە: سـزای بـە ئێـش ئـەو سـزایەی کـە سەرزەنشـتو ڕیسـواتان دەکات، پاداشـتیش بـە پێـی کردەوەیە، بە ڕاسـتی ئەم سـزایە ﴿ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ﴾ لـە درۆ کردنتـان بەدەمیـەوەو ڕەتکردنـەوەی ڕاسـتی، کـە پێغەمبەرانی بـۆ نێـردراوە ﴿ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴾ واتـە: خۆتـان بـە گـەورە دەزانـی لـە مل کەچکـردن بـۆی، وە خـۆ تەسـلیم بـوون بـۆ بڕیارەکانی، ئـەم دەقە بەڵگەیە لەسـەر سـزاو ژیانـی بـەرزەخ، بـە ڕاسـتی ئەم وتـارە، وە ئەو سـزایە کـە ڕووبـەڕووی ئـەوان دەکرێتەوە، ئـەوە لـە کاتـی ئامادەبوونی پێـش مـردن (سـەرەمەرەگ)و دوای مردنە.

دەبێتــە بەڵگــە کە ڕۆح جەســتەیە، دەچێتــە ناو جەســتەوەو دەریش دەچێ، وە قســەی لەگەڵدا دەکــرێو لــە جەستەشــدا جێگیر دەبێو جیــاش دەبێتــەوە، ئەمە حاڵیانە لــە بەرزەخدا.
بــەڵام لــە ڕۆژی دواییدا، کاتــی پێی دەگــەن بێپارەو تەنهــان، بەبێ ماڵو منداڵو ســەروەتو ســامان، بــە بــێ هێزو ســەربازو پشــتیوان، وەک چــۆن خوا ﷻ ســەرەتا دروســتی کردوون، ڕووتو قووتــن لــە هەموو شــتێ، چونکە شــتەکان لە کاتێکــدا دەبنو دەســت دەکەون پاش بــە دیهاتنــی هۆکارەکانی، کە ئــەوە دەبێ بــە هۆکاری.
لــەو ڕۆژەدا هەمــوو ئــەو کاروبارانــەی پەیوەنــدی بە دنیــاوە هەبوو لێــی دادەبڕێــن، جگە لە کــردەوەی چــاکو کــردەوەی خــراپ نەبــێ، کــە ئــەوە توێشــووی ڕۆژی دواییــە، هەموو گەشــەکردنو خۆشــی خەمبــاریو ســزاو چێــژ وەرگرتــن بــە پێــی کردەوەکانــە، تەنهــا کــردەوەکان ســوود یــان زیــان دەگەیەنن، یــان دڵ خۆش دەکــەن یان خەفەتبــارت دەکەن، بێجگــە لەوانــە لە ماڵو منــداڵ، وە هێزو پشــتیوان هەموو ئەوانــە ڕۆیندەنو تێپــەڕ دەبن، بۆیە دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَقَدۡ جِئۡتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَتَرَكۡتُم مَّا خَوَّلۡنَٰكُمۡ ﴾ واتــە: پێمــان بەخشــیونو ڕشــتومانە بەســەرتاندا ﴿ وَرَآءَ ظُهُورِكُمۡۖ ﴾ هیــچ ســوودێکی پێتــان نەگەیانــد ﴿ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمۡ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ أَنَّهُمۡ فِيكُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْۚ ﴾.
بــت پەرســتان هــاوەڵ بــۆ خوا ﷻ پەیــدا دەکــەن، وە لەگــەڵ ئــەودا فریشــتەو پێغەمبەرانو پیاوچــاکان دەپەرســتن، ئەوانــە هەموویــان هــی خوای گــەورەن، بەڵکــو لەم دروســتکراوانە بەشــێک بۆ خۆیان دیــاری دەکەنو لە بەندایەتیکردندا دەیانپەرســتن، ئەمــە کارێکی نابەجێو ســتەمە دەیکەن، بەڕاســتی هەمووان بەندەی خوای گەورەن، وە خوا ﷻ خاوەنیانەو شایســتەی ئەوەیــە بیپەرســتن، بتپەرســتیان لــە پەرســتنداو بۆ هەندێ لــە بەندەکانــە، لە پلــەو پایەی خوا دادەبەزێنــن، لــەڕۆژی دوایــدا سەرزەنشــت دەکرێــنو پێیــان دەوتــرێ: ﴿ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمۡ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ أَنَّهُمۡ فِيكُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيۡنَكُمۡ ﴾ واتــە: نێوانــی ئێــوەو ئەوانــەی هاوەڵتــان بــۆ دادەنان پچرا لــە تکاکردنو هاوشــێوەکانی، هیــچ ســوودێکی پێنەگەیاندن.
﴿ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴾ لــە قازانجو ئاســایشو خۆشــبەختیو ڕزگار بوون کە شــەیتان بۆتانــی ڕازاندبوویــەوەو لە دڵەکانتاندا جوانــی کردبوو، بە زمانتان دەرتــان دەبڕی، وە بــەو گومانــە خــراپو پووچە لــە خۆتان بایی بــوون، کە هیــچ حەقیقەتێکی نیــە، کاتێ دێت کــە بۆتــان دەردەکەوێ پێچەوانــەی ئەوەی کە بانگەشــەتان بۆ دەکــرد، وە دەردەکەوێت کە ئێــوە زیانتان لە مــاڵو نەفسو منداڵــی خۆتان داوە.

إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ
ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَيِّ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ
وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ
ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟
بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ
﴿٩٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ
قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ
خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا وَمِنَ ٱلنَّخْلِ مِن طَلْعِهَا قِنْوَانٌ
دَانِيَةٌ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ
مُتَشَٰبِهٍ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمْ
لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٩٩﴾ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ
وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ
﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ
صَٰحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾

**(٩٥-٩٨):** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ مِنَ ٱلْحَيِّ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيْلَ سَكَنًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٩٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٩٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾﴾

خـوا هـەوڵ دەدات دەربـارەی تـەواوی گەورەیی‌و دەسـەڵات‌و هێـزی بەرفراوان‌و میهرەبانـی خـۆی، وە گرنگـی دانـی بـە دروسـتکراوەکانی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ﴾ واتـە: گشـتگیرە بـۆ هەمـوو ئـەو دانەوێڵانەی کـە خەڵکـی دەیچێنـن، وە ئەوانەیشـی کە دەسـتی مـرۆڤ پێـی ناگـات، وەک ئـەو دانەوێڵانـەی کە خـوا ﷻ جێگیریـان دەکات لە دەشـت‌و چۆڵەوانیدا، بە دەسـەڵاتی خـۆی دانەوێڵەکان لـە ژێر زەویدا لەت دەکاو کشـت‌و کاڵـی لـێ دەڕوێنـێ بـە هەمـوو جـۆرو شـێوەیەک سـوودیان لـێ وەردەگرن.

وە هەروەهـا ناوکـی درەختەکان لەت دەکات لـە خورماو میوەو هاوشـێوەکانی، ئنجا هەموو دروسـتکراو سـوودی لێدەبینن لە مـرۆڤ‌و ئاژەڵ‌و ئەوەی بەسـەر زەویـدا ڕێ دەکات، چێژ وەردەگـرن لـەوەی کـە خـوا ﷻ لەتی کردوەو سـەوزی کـردوە لـە دانەوێڵەو تـۆوەکان، لێـی هەڵدەگـرن‌و بـە جۆرەها شـێوەی تر سـوودی لێوەردەگرن، کـە خوا ئامـادەی کردوە بۆتان.

وە خـوا ﷻ پێیـان پێشـان دەدات کـە عەقـڵ لـە بەرانبەریدا سەرسـام دەبـێ، وە نیشـانیان دەدات جوانتریـن‌و سەرنجڕاکێشـترین بـە دیهێنراوەکانـی، وە تـەواوی حیکمـەت‌و دانایی خـۆی، تا بـەوە زیاتر بیناسـن‌و بەتـاک‌و تەنها بیپەرسـتن، تا بزانن کـە بەڕاسـتی تەنها ئەو ڕاسـت‌و هەقـە، وە بەندایەتـی کـردن جگـە لە بـۆ ئەو بەتـاڵ‌و بـێ مانایە.

﴿ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ ﴾ وەک چۆن زینـدەوەر لـە (منـی) دەری دەهێنـێ، وە جوچکە لـە هێلکـە دەردەهێنـی، وە لە دانەوێڵـەو ناوک کشـتو کاڵو دارو درەخـت دەردەهێنی. ﴿ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ ﴾ ئـەوەی کـە هیچ گەشـە ناکات، یـان ڕووحی تێـدا نیە ﴿ مِنَ ٱلْحَىِّ ﴾ وەک چـۆن لـە درەختو کشـتو کاڵـەکان نـاوکو دانەوێڵـە دەردەهێنێ، وە لـە باڵندە هێلکـە بـەدی دەهێنـێ ﴿ ذَٰلِكُمُ ﴾ ئـەوەی کـە بیـەوێ دەیـکات، وە تـاکو تەنهایە لە دروسـتکردنو ڕێکخسـتنیاندا ﴿ ٱللَّهُ ﴾ پەروەردگارتـان، واتـە: ئەو خوایـەی کە خاوەنی پەروەدگارێتـیو بەندایەتیـە بەسـەر بەندەکانیـەوە بـە گشـتی، ئـەو خوایـەی کـە نـازو نیعمەتـی خۆی ڕشـتوە بەسـەر هەموو جیهانـدا ﴿ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴾ واتە: چۆن لە پەرسـتنی ئـەو لا دەدەنو پشـت دەکـەن لـە پەرسـتنی کەسـێک کە ئەمـە پلـەو پایەیەتـی، وە پەنا دەبـەن بـۆ بەندایەتـی شـتێک کـە هیچـی بـە دەسـت نیـە نـە قازانـجو نـە زیـان، وە نە مـردنو نە ژیـانو نە گەڕانـەوە؟!! وە کاتێک خوا ﷻ باسـی کەرەسـتەی دروسـتکردنی خوادەمەنیـە بـۆ ماوەکانـی کردوە، باسـی منەتو چاکەی خـۆی کردوە بـە ئامادەکردنو دابیـن کردنـی شـوێنی نیشـتە جێبـوون، وە ئامادەکردنـی هەمـوو ئەوانـەی کـە مـرۆڤ پێویسـتی پێیەتـی، لـە تاریکـیو ڕۆشـنایی، وە ئەوەیشـی لەسـەر ئەوانـە دادەمەزرێت لە هەمـوو جۆرەکانی سـوودو بەرژەوەندی، دەفەرمـوێ:﴿ فَالِقُ ٱلْإِصْبَاحِ ﴾ واتە: وەک چۆن لەتکـەری دانەوێڵەیـەو ناوکەکەیەتـی، بـە هەمان شـێوە ئەو بـە دیهێنەری تاریکی شـەوە بـۆ هەمـوو سـەر زەوی، بـە ڕۆژو شـەبەقی بـەرە بەیـان کـە قۆنـاغ بـە قۆنـاغ ڕووناکی دەکاتـەوە، هەتـا تاریکـی شـەو بـە تەواوەتـی نامێنـێ، وە ڕووناکیو ڕۆشـنایی گشـتی جێگـای دەگرێتـەوە، گۆڕینـی دروسـتکراو بـەو شـێوەیە لە بەرژەوەنـدو قازانجـی دنیاو دواڕۆژی بەندەکانـە لـە هەمـوو ڕوویەکەوە. وە کاتێ کە دروسـتکراوەکان پێویسـتیان بە ئارامـیو پشـوودانو جێگیـر بوونە کە تـەواو نابـێ تەنها بە بوونـی ڕۆشـناییو ڕووناکی نەبـێ ﴿ وَجَعَلَ ﴾ خـوا ﷻ ﴿ ٱلَّيْلَ سَكَنًا ﴾ بـۆ ئـەوەی مرۆڤـەکان تیایدا ئـارام بگرن لـە ماڵەکانـی خۆیانـدا، وە ئاژەڵەکانیـش بـۆ شـوێنی پشـودانیان، وە باڵندەکانیـش بۆ ناو هێلانەکانیـان، بەشـێک لـە پشـوو وەربگـرن، پاشـان خـوا ﷻ ئـەوە لادەبـات بـە ڕۆژو ڕۆشـنایی پـڕی دەکاتـەوە، بـەو شـێوەیە هەتـا ڕۆژی دوایـی ﴿ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ حُسْبَانًا ﴾ واتـە: خـۆرو مانگـی کـردوە بـە هـۆکاری زانینـی کات، بـە هـۆی ئەوانەوە بـە کاتـەکان دەزانـرێو ڕێکدەخـرێ، کاتەکانی خواپەرسـتیش بـەو شـێوە ڕێکدەخرێ،

وە سـەرجەم مامەڵـەو کاروبارەکانـی ژیـان، وە پێـی دەناسـرێتەوە مـاوەی ئـەو کاتانەی کـە ڕۆیشـتوە، ئەگـەر خۆرو مانـگ، جێگۆڕکێیـان نەبێ، ئـەوە خەڵکی بـە ئەندازەگرتنی کاتەکانـی نەدەزانـی، ئنجـا هەمـوو تواناکانیـان دەخسـتە کار بـۆ ئـەوەی شـتێ بزانن لە کاتـەکان، بەڵکـو سـەرەنجام کـەس نەیدەزانـی جگـە لە چەنـد کەسـێکی کـەم نەبێ لە خەڵکـی دوایـی کۆشـشو مانـدو بوونێکـی زۆر، بەو شـێوەیە زۆرێـک لـە بەرژەوەندییە گرنگەکانـی بەنـدەکان لـە دەسـت دەچوو.

﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئـەو ئەندازە گیریەی پێشـووە ﴿ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴾ لـە عیزەتو گەورەیی پەروەردگـارە هەمـوو دروسـتکراوەکان ملکەچی ئەو بـوون، هەموویان سەرشـۆڕو زەلیلن لـە ژێـر فەرمانـی ئـەودا، بە شـێوەیەکە هیـچ کـەس ناتوانـێ سـنووری خـۆی تێپەڕێنێ کـە خـوای گـەورە بـۆی دیـاری کـردوە، نـە بـۆی پێـش دەکـەوێو نـە دوادەکەوێ ﴿ ٱلۡعَلِيمِ ﴾ کـە زانسـتی دەوری هەموو ئاشـکراو نهێنـیو سـەرەتاو کۆتاییەکانی داوە.

وە لـە بەڵگـە عەقڵیـەکان ئەوەیـە کـە زانسـتی خـوا ﷻ دەوری هەمـوو دروسـتکراوە گەورەکانـی داوە، وە ڕامـی کردوە لە سـەر ئەنـدازەو یاسـایەکی تۆکمـەی داهێنراو، کە عەقـڵ سەرسـام دەبێت لـە جوانیو تەواویـدا، وە گونجانی لەگـەڵ بەرژەوەنـدیو بڕیاردا.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۗ ﴾ کاتێـک کـە ڕێگاکانتـان لـێ ون دەبێـت، خـوای گـەورە ئەسـتێرەکانی کردۆتـە ڕێنیشـاندەرێک بۆ خەڵکـی بۆ ئـەوەی ئـەو ڕێگایانـە بدۆزنەوە کـە دەیانـەوێ بیگرنـە بەر بـۆ بەرژەوەندی و بازرگانـیو گەشـتەکانیان. لەوانـە کۆمەڵـە ئەسـتێرەیەک هـەن بـەردەوام دەبینرێـن و لـە شـوێنی خۆیـان ناجوڵێـن، وە لەوانـە هەنـدێ لە ئەسـتێرەکانی تـر بـەردەوام دەجوڵێن ئەوانـەی کـە لەو بـوارەدا شـارەزان باش لەو جوڵانـە تێدەگـەن، وە ڕووبـەڕوو کاتەکانی پـێ دەناسـنەوە، ئـەم دەقـە بەڵگەیـە لەسـەر ڕێگـە پێدان بـە فێر بوونی زانسـتی ناسـینو شـوێنی ئەسـتێرەکان کـە بەو زانسـتە دەوترێـت زانسـتی ڕێکردن، بـە ڕاسـتی هیدایەت تـەواوو جێگیـر نابـێ ئیلا بـەو شـێوەیە نەبێ.

﴿ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾ واتـە: ڕوونمان کردۆتەوەو ئاشـکرامان کـردوە، وە هەموو جۆرو ڕەگەزێکمـان لە یەکتر جیاکردۆتەوە بە شـێوەیەک کە نیشـانەکانی خـوا ﷻ زۆر ڕوونو ئاشـکرایە ﴿ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾ واتە: بۆ ئەو کەسـانەی خاوەن زانسـتو زانیارین، بەڕاسـتی وتـارەکان ئاڕاسـتەی ئـەوان دەکرێتو داوای وەڵامیـان لێدەکرێت، بـە پێچەوانەی نەفامو

نەزانــەکان ئەوانــەی کە بەرهەڵســتی نیشــانەکانی خوای گــەورە دەکەن، وە ئەو زانســتەی کــە پێغەمبــەران هێناویانــە، ئەوانــە هیــچ ڕوونکردنەوەیەک ســوودی نیە بۆیــان، وە هیچ ڕوونکردنــەوەو درێــژە پێدانــی ئالۆزیەکانیان لە ســەر لانابــات ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ ﴾ ئەویــش ئادەمــە ﷺ خــوا هەمــوو ئەوانــەی لە تەنها کەسـێک دروســت کــردوە کــە ئادەمــە، وە بــەردەوام لە زیــاد بووندانو ســەر ئەرزیــان پڕ کــردوە، هەریەک لەوانــە لــە ڕەوشــتو ئەخلاقو تــاکاردا ئەوەندە جیــاوازن کە ڕێکخســتنیان زۆر ئەســتەمە کــەس ناتوانــێ وەســفی بــکات، خوای گــەورە شــوێنێکی بۆ جێگیــر کــردوون، واتە: کە ســەرەنجام دەگەڕێنــەوە بــۆ ئــەوێ، وە ئامانجێــک کە بــۆ لای دەبرێن کە ئەویــش بریتیە لــە شــوێنی مانــەوەی هەتــا هەتایــی (دار القــرار)، کــە جگــە لەو شــوێنە مــرۆڤ لە هیچ جێگایەکــی تــر جێگیــر نابــێ، وە لــە ســەرووی ئــەو دنیایــەوە ژیانێکــی دیکە نیــە، ئەو شــوێنە بریتیــە لــەو جێگایــەی کــە مــرۆڤ دروســتکراوە بۆ ئــەوەی لێــی جێیگــر بێت، وە لــە دنیــادا هاتوەتــە بــوون بــۆ ئــەوەی بــە دوای هــۆکاری بــە دەســتهێنانیدا بگەڕێت، ئــەوەی کــە لەســەری دەژیــنو تەمەنــی تێدا بەســەر دەبــەن، خوای گــەورە ئەســپەردەی کــردوون لــە پشــتی باپیرەو لە ناوســکی دایکانیان، پاشــان لە دنیادا، پاشــان لــە بەرزەخدا، هەمــوو ئەوانــە لــە ســەر شــێوەی ئەســپەردە کردنــە، چونکە جێگیــر نابــێ، بەڵکــو تیایدا دەگوازرێتــەوە هەتــاوەکو دەگات بە شــوێنی نیشــتەجێکراو، بــەلاَم ئەم دنیایە ئەســپاردە کــراوەو تێپــەڕ دەبێ.

﴿ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ ﴾ واتــە: دەربــارەی ئایــەتو نیشــانەکانی خــوا لە بەڵگــەو ڕوونکراوەکانــی تێبگەن.

(٩٩): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشۡتَبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍۗ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾:

ئەمــە یەکێکــە لــە منەتــە گەورەکانی خــوا ﷻ کــە دروســتکراوەکانی پێ ناچــار دەکات لــە نەوەکانــی ئــادەمو هاوشــێوەکانی، ئەویــش ئەوەیە کــە خوا ﷻ لــە ئاســمانەوە بارانی بەســەر یەکــدا بارانــدوە، کاتێــک کە مرۆڤ پێویســتی پــێ دەبێت بــە هۆی ئــەو بارانەوە خــوا هەمــوو چەکەرەیــەک دەڕوێنێ کە مــرۆڤو ئاژەڵــەکان لێی دەخــۆن، هەموویان بە

فەزڵـی خـوا ﷻ دڵخۆش دەبـن‌و ڕزق‌و بژێویـان بەرفراوان دەبـێ، گرانی‌و بـێ ئومێدی‌و قـات‌و قڕی لـە نێوانیاندا لادەبـرێ، و دڵەكان خۆش دەبن‌و ڕووخسـارەكان دەگەشـێنەوە، وە لەلایـەن خـواوە سـۆزو میهرەبانـی دادەبـارێ بـە سـەر بەندەكانـدا بـە هـۆی ئـەوەوە چێـژ وەردەگـرن‌و بە خۆشـی دەژیـن، ئەمـەش ئـەوە پێویسـت دەكات كـە تواناكانیان بخەنـە كار بـۆ سوپاسـكردنی ئەو نـازو نیعمەتانەو بەندایەتـی كردنی‌و گەڕانـەوە بۆ لای‌و خۆشویستنی.

كاتێـك بە گشـتی باسـی ئەو شـتانەی كرد كە بە ئـاو دەڕوێـن لە جۆرەكانـی درەخت‌و چەكەرەكـراوەكان، باسـی كشـت‌و كاڵ‌و دار خورمـای كـردوە لەبـەر ئـەوەی سـوودو قازانجـی زۆرریـان هەیـە، وە هەروەهـا بژێـوی زۆرێـك لـە مرۆڤەكانـە، دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِرًا نُّخْرِجُ مِنْهُ ﴾ واتـە: لـەو چەكـەرە كـراوە سـەوزانە ﴿ حَبًّا مُّتَرَاكِبًا ﴾ هەندێـك بەسـەر هەندێكی ترەوەیە، لـە گەنم‌و جۆو برنج‌و هاوشـێوەكانی لـە جۆرەكانی كشـتوكاڵ.

لـە وەسـفكردنیدا بـەوەی كـە لەسـەر یـەك كەڵەكـە بـووە، ئاماژەیـە بـە ئـەوەی كـە ناوكەكانـی زۆرە، وە هەموویـان لـە یـەك دانـە چەكـەرە دەكـەن‌و تێكەڵ نابـن، بەڵكو ناوكـەكان جیاجیـاو بـەش بەشـن، وە یـەك ڕیشـەو بنەڕەتیـان هەیـە، بـە هەمان شـێوە ئاماژەیـە بـە زۆری بـە بەرهـەم‌و خەرمانـی، بـۆ ئـەوەی بەشـێكی زۆر بمێنیتـەوە بـۆ هەڵگرتـن‌و پاشـەكەوت كـردن.

﴿ وَمِنَ ٱلنَّخْلِ ﴾ خـوای گـەورە دەریهێنـاوە ﴿ مِن طَلْعِهَا ﴾ ئەویـش بریتیـە كیـف یان هەگبـە، كـە لەو كیفـە دەردەچـێ ﴿ قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ ﴾ واتە: چەند پەلێكی هێشـووی شـۆڕ بـووەوە ئاسـانە بـۆ هەر كەسـێك بیـەوێ بیهێنێتە خـوارەوە، بـا هەرچەند بەرزیـش بێت، قەدی دارخورماكە بە شـێوەیەك دروسـتكراوە كە بە ئاسـانی مرۆڤ دەتوانێ سـەربكەوێ بەسـەریدا ﴿ وَ ﴾ خـوا بـەو بارانـە دەیڕوێنـێ ﴿ وَجَنَّٰتٍ مِّنْ أَعْنَابٍ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ ﴾ ئەمانـە هەموویـان لە درەختـە بە كەڵك‌و بە سـوودەكانن، بۆیـە خوای گەورە بـە تایبەت باسـی كـردوە، پاش ئەوەی بە گشـتی باسـی دارو درەخت‌و هەمـوو ڕووەكەكانی كردوە.

﴿ مُشْتَبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ﴾ دەگونجـێ بگەڕێتـەوە بـۆ هەنـارو زەیتون كە لـە دارو گەڵادا لەیـەك دەچـن، بـەڵام لـە بەرهەمـەوە جیـاوازن، وە دەگونجـێ ماناكـەی بگەڕێتـەوە بۆ هەمـوو دارو درەخـت‌و میوەیەك، كـە هەندێكیان لـە هەندێكی تریان دەچن‌و لە وەسـفدا

لــە یــەک نزیکــن، وە هەندێکیان هیچ هاوشــێوەیەک نیە لــە نێوانیاندا، بەندەکان ســوود لە هەمــووی وەردەگــرن، دەیکــەن بە بژێــویو لێی هەڵدەگــرن، بۆیە خوای گــەورە فەرمانی کــردوە بــە تەماشــا کردنــی وەک دەفەرمــوێ: ﴿ٱنظُرُوٓاْ﴾ تەماشــا کردنێــک بــە بیرو هــزرو پەنــد وەرگرتــن ﴿إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ﴾ واتــە: هەمــوو دارو درەختەکان بە تایبــەت خورما کاتێــک کە بــەر دەگرێ.

﴿وَيَنۡعِهِۦٓ﴾ واتــە: تەماشــای کاتــی دەرچوونــیو کاتێــک کە بــەر دەگــرێو پێدەگات بــە ڕاســتی لەوەدا پەنــدو ئامۆژگــاری هەیــە، وە دەکرێتە بەڵگە لــە ســەر میهرەبانی خواو بەخشــندەیی بەرفراوانــیو تــەواوی هێزو دەســەڵاتی بەســەر بەندەکاندا، بــەڵام خۆ هەموو بەندەیــەک بیــر ناکاتەوەو پەندو ئامۆژگــاری وەرناگرێت، وە مەرجیش نیە هەر کەســێک بیــر بکاتــەوە لە مەبەســت تێبگــات، بۆیە خــوای گەورە ئــەو نیشــانانەی تایبەتــی کردوە بــە بــڕواداران ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾ بــڕواداران بــە هۆی ئــەو بڕوایەی کە هێناویانــە، وایــان لــێ دەکات کار بــە ناوەڕۆکی بڕوا هێنــان بکەن، لەوانــە: بیر کردنەوە لە نیشــانەکانی خــوا ﷻ، وە تێگەیشــتن لە دەرنجامەکانــی کە عەقڵو پاکیو شــەرع ئاماژەی پێدەکەن.

(١٠٠-١٠٤): ﴿وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡۖ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٞۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ فَٱعۡبُدُوهُۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ قَدۡ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَنۡ أَبۡصَرَ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ عَمِيَ فَعَلَيۡهَاۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿١٠٤﴾﴾:

خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات لەگــەڵ چاکەخــوازی بەرانبەر بــە بەندەکانیدا، وە پێناســاندنیان لە نیشــانە ڕوونو ئاشــکراکان، بتپەرســتان لە قورەیشو هاوشــێوەکانیان هاوەڵیان بۆ خوا ﷻ دادەنــا داوایــان لــێ دەکردن دەیانپەرســتن، لــە جنۆکەو فریشــتەکان، ئەوانــەی کە خۆیان دروســتکراوێکن لــە دروســتکراوەکانی خوا ﷻ، هیــچ تایبەتمەندیەکــی پەروەردگارێتیو پەرســتنیان نیــە، کردوونیــان بــە هاوبــەش لەگەڵ ئەو کەســەی کــە بڕیارو دروســتکردن تەنهــا لــە لای ئــەوە، ئــەو بژێوی دەرە بــە هەمــوو ماناکانــی بژێــوی دان، وە بەرگریکارە بەرانبــەر هەمــوو ناڕەحەتیــەکان، وە بە هەمان شــێوە لە گەوجــیو نەفامی بتپەرســتان ئەوە

بــوو لــە دەروونــی خۆیاندا بوختــانو درۆیان هەڵدەبەســتی بۆ خــوا ﷻ بــە دانەپاڵی کوڕو کــچ بەبــێ زانســتو زانیــاری. دەی کێ لەو کەســە ســتەمکار ترە بــە بــێ زانیاریی درۆو بوختــانو خراپتریــن ناتــەواوی بــە دەم خــواوە هەڵبەســتێ کــە وا پێویســت بــوو خوا ﷻ بــە پــاک ڕابگیرێــت لــەو شــتە خراپانــە؟!! بۆیــە هەمــوو ئــەو بوختانانــە ڕەتدەکاتەوەو دەفەرمــوێ: ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ بێگومــان خوا ﷻ پــاکو بێگەردە لــە هەموو ئەو ســیفەتە خــراپو ناتەواوانــەی دەدرێنــە پاڵی.

﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتــە: دروســتکەرێتی بە وردترین شــێوە، کە هاوشــێوەی نیــە، ڕێکــی خســتوون بــە جوانتریــنو چاکترین شــێوە، کــە خــاوەن عاقڵەکان پــەی پێ نابــەن، وە هیــچ کەســێک لەگەڵیــدا لە دروســتکردندا بەشــدار نیە.

﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ﴾ واتــە: خــوا ﷻ چــۆن منداڵــی دەبێ لــە کاتێکدا کــە ئــەو پەرســتراوو گــەورەو بــێ نیــازە کــە ژنو هاوســەری نەبــووە، وە بــێ نیــازە لە بەندەکانــیو دەوڵەمەنــدە، لــە کاتێکــدا ئەوانــە هەموویــان هــەژارنو پێویســیان پێیەتــی، ناچــارن لــە هەمــوو حاڵێکــدا بگەڕێنــەوە بۆ لای.

وە منــداڵ دەبــێ لــە ڕەگەزی باوکی بێــت، وە خوا ﷻ دروســتکەری هەموو شــتێکە، هیچ لــە دروســتکراوەکان لەو ناچــن بە جۆرێ لــە جۆرەکان.

وە کاتێــک باســی دروســتکردنی هەمــوو شــتەکانی کــردوە، باســی بەرفراوانــی زانســتی کــردوە، بــە هەمــوو دروســتکراوەکانەوە، دەفەرمــوێ: ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ وە باســکردنی زانســت پــاش دروســتکردن، ئاماژەیــە بــە بەڵگەیەکــی عەقڵی لە ســەر جێگیر بــوونو زانســتی تــەواوی، ئەویش بریتیە لــەم دروســتکراوانە، وە ئەوەیش لــە خۆدەگرێت لــە یاســای تــەواوو دروســتکراوی تۆکمــە، بێگومــان ئــەوە بەڵگەیە لــە ســەر بەرفراوانی زانســتی پەروەردگــارو تــەواوی حیکمــەتو دانایــی، وەک چــۆن دەفەرمــوێ: ﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾الملــک، هەروەهــا کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ ﴾یــس.

ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَٱعْبُدُوهُ
وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ
يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ قَدْ جَآءَكُم
بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا
وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿١٠٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ
وَلِيَقُولُواْ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٥﴾ ٱتَّبِعْ
مَآ أُوحِيَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ
﴿١٠٦﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُواْ وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا
وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٧﴾ وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ
مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ
عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ
﴿١٠٨﴾ وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ
بِهَا قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ
لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ
يُؤْمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾

﴿ ذَٰلِكُمُ ﴾ ئـەوەی کـە دروسـتی کردوەو ئەندازەی کێشـاوە ﴿ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ﴾ واتە: پەروەردگاری پەرسـتراو کە شایستەی ئـەو پـەڕی خـۆ بەکـەم نوانـدنو ئەوپەڕی خۆشەویسـتیە بـۆی، ئـەو پەروەردگـارەی کـە هەمـوو دروسـتکراوەکانی پـەروەردە کـردوە بـە پاکترین نـازو نیعمـەت، وە بە دووری گرتـوون لـە هەمـوو ناتـەواویو خراپەکاریـەک ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَٱعْبُدُوهُ ﴾ واتـە: کاتێـک کـە دەرکـەوتو جێگیـر بوو هیـچ کەس شایسـتەی پەرسـتش نیـە جگـە لـە خـوا نەبـێ، دەی ڕوو بکەنـە خـواو بـە هەمـوو شـێوەیەک بەندایەتـی بۆ بکەنو دڵسـۆزی بـۆ بنوێنـن، مەبەسـتان تەنهـا ئـەو بێـت، بەڕاسـتی ئەوە پێویسـتە لە سـەر دروسـتکراو کە لـە پێناوی ئـەوەدا دروسـتکراوە ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾الذاريات (واتـە: مـرۆڤو جنۆکـەم تەنیـا بـۆ ئەوە دروسـت کـردوە بمپەرسـتن).

﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴾ واتـە: هەمـوو دروسـتکراوەکان لـە ژێـر دەسـەڵاتو فەرمانـی خـوادان بە دروسـتکردنو ڕێکخسـتنو بە جێهێنانـی کاروبارەکانیـان، وە ئەوەی کـە زانـراوە ئـەو فەرمانـەی کـە کاری تێـدا کـراوە بـەردەوام بـوونو تـەواو بوونـی، وە کەماڵـی ڕێکخسـتنی بـە پێـی حاڵـی ئەو کەسـەیە کـە بریـکارە لـە سـەری، وە بریکاری خـوا ﷻ بەسـەر شـتەکانەوە وەک بریـکاری مرۆڤەکان نیـە، چونکە بریـکاری مرۆڤەکان لـە بری کەسـێکی تـرەو بریکار بـۆ کراو شـوێنی بریـکار کار دەکەوێ، بـەڵام خوا خۆی بریـکاری نەفسـی خۆیەتـی، کە تـەواوی زانسـت لـە خۆدە گرێـت، وە بە چاکترین شـێوە ڕێکدەخـرێ کـە پـڕە لـە دادپـەروەری، بـۆ هیـچ کەسـێک نیـە شـارەزایی بەسـەر خوادا بنوێنـێ، وە لە دروسـتکراوەکانیدا کـەمو کوڕیەک دەربهێنێ، وە لە ڕێکخسـتنیدا ناتەواویو عەیبێـک دەربهێنـێ، لە بریکاریـدا: خوا ﷻ بەڵێنـی داوە کە ئاینەکەی لە هەمـوو گۆڕانێک

بپارێــزی، وە بە هەمان شـێوە بـڕواداران بپارێزیو پشـتیوانیان بکات، دەربارەی هەر شـتێک کـە بـڕواو ئاینەکەیـان نەهێڵـێ ﴿ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾ لەبەر گەورەییو دەسـەڵاتو تـەواوی، واتـە: چاوەکان پەی پـێ نابەنو دەوری نـادەن، وە ئەگەر چی ببینـێو دڵ خۆش بـێ بـە بینینـی پەروەردگـاری نەفی کـردن بە پـەی پێبردنـی نەفی بینینـی نـاکات، بەڵکو بـە تێگەیشـتن دەیسـەلمێنێ، ئەگـەر نەفی پـەی پێبردنـی کرد کـە بریتیە لـە تایبەتمەندی وەسـفەکانی بینیــن بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی کـە بینین جێگیـر دەبێت.

بـە دڵنیاییــەوە ئەگەر مەبەسـتی نەفـی کردنی بینیــن بووایە دەیفەرمـوو: (لاتـراه الأبصار) واتـە: چـاوەکان نایبینــن، وە هاوشـێوەی ئەوە، کەواتـە زانرا ئـەوە نابێتە بەڵگە بـۆ مەزهەبی (المعطلة) ئەوانــەی کـە نەفـی بینینـی خـوا دەکـەن لـە ڕۆژی قیامەتـدا، بەڵکـو بەڵگەیە لـە سـەر پێچەوانەی وتەکـەی ئـەوان ﴿ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ﴾ واتە: زانسـتی ئـەو دەوری هەمـوو ئاشـکراو نهێنیەکانی داوە، وە بیستنیشـی بە هەموو دەنگە ئاشـکراو شـاراوەکان، وە بینینیشـی بـە هەمـوو ئەوانـەی کە دەبینـرێ، بچـووک بێ یـان گـەورە، بۆیـە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴾ئـەو خوایـەی کـە کارنـاسو وردبینـە ئاگـاداری هەمـوو وردەکاریـەکانو نهێنـیو شـاراوەکانە بە گشـتی، لە سـۆزو بەزەیـی ئەو بەندەکـەی بەرەو بەرژەوەنـدی ئاینەکـەی دەبـات، وە دەیگەیەنێـت بـەرەو ڕێگایـەک کە بەندە هەسـتی پێ نـاکاو کۆششـی بـۆ نـاکات، وە لـە ڕوویەکـەوە دەیگەیەنـێ بە خۆشـبەختی هەتـا هەتایی کـە گومانـی بـۆ نەبـردوە، تەنانـەت هەنـدێ ڕووداو بەسـەریدا دەهێنـێ کە پێی ناخۆشـەو ئـازاری پـێ دەچێـژێ، بۆیـە داوا لە خـوا دەکات لە سـەری لای بـدات، خوا زانایـە بەوەی کـە دینـی ئەو چـاکو پتـەوە وە تـەواوی ئەو لەسـەر ئـەوە وەسـتاوە، دەی پاکـی بۆ ئەو خوایـەی کە بەسـۆزە بۆ هەر شـتێک کە بیـەوێ، وە میهرەبانـە بەرانبەر بە بـڕواداران ﴿ قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ عَمِىَ فَعَلَيْهَا وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴾ کاتێـک کـە خوای گـەورە نیشـانە ڕوونەکانی ئاشـکرا کـردوو بەڵگەکانی خسـتە ڕوو کە بەڵگەیە لەسـەر ڕاسـتی لە هەمـوو ڕووەکانـەوە، بەندەکانی ئاگـادار کردۆتـەوە، وە هەواڵی داوە کـە ڕێنماییـان پێچەوانەکـەی تەنهـا بـۆ خۆیانـە، دەفەرمـوێ: ﴿ قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ ﴾ واتـە: چەندیـن بەڵگـەی ڕوون کـە ڕاسـتیان دەرخسـتووە، وە دڵ وا لێدەکـەن بە هاوشـێوەی چـاو چۆن خـۆر دەبینێت بەو شـێوە حەقیقەتو ڕاسـتیەکان هەسـت پێ بکات، وە زمـان پـاراویو ڕوونکردنـەوەو ئاشـکرا کـردنو واتا پڕاوپـڕەکانو ڕاسـتیە جوانەکان

لـە خۆدەگرێـت، چونکـە لـە لایـەن پەروەردگارێکـەوە هاتووە کـە بەندەکانی پـەروەردە کـردوە، بـە جۆرەهـا نـازو نیعمەتی ئاشـکراو نهێنی، کـە گەورەتریـن‌و باشـترینیان ڕوون کردنـەوەی دەقـەکان‌و ئاشـکراکردنی ئاڵۆزیەکانە.

﴿ فَمَنْ أَبْصَرَ ﴾ بـەو نیشـانانەی کـە جێگای پەنـدو ئامۆژگارین، وە کار بـە داخوازیەکانی بـکات، ﴿ فَلِنَفْسِهِۦ ﴾ ئـەوە خـوا ﷻ دەوڵەمەنـدو بێ نیـازە ﴿ وَمَنْ عَمِيَ ﴾ واتـە: بەوەی کـە ببینـێ‌و بیـری لـێ نەکاتـەوە، وە سەرزەنشـت وەرنەگـرێ، ڕاسـتی بـۆ دەربکـەوێ‌و گوێڕایەڵـی نەبـێ‌و خـۆی بـۆ دانەنوێنـێ، بێگومان ئـەم کەسـە زیانەکانی کوێـری کردوە ﴿ وَمَآ أَنَا۠ ﴾ واتـە: ئـەی پێغەمبـەر ﷺ ﴿ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴾ مـن پارێـزەرو چاودێـر نیم بـە سـەر کردەوەکانتانـەوە، بەڵکـو کاری مـن تەنهـا ڕاگەیاندنـە، بێگومـان ئـەوەی کە لە لایەنـی خـواوە بـۆم دابەزیـوو گەیاندم، ئەمە پیشـەی منـە، وە جگـە لەمە مـن فەرمانداری هیـچ شـتێک نیم.

(١٠٥-١٠٧): ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْـَٔايَٰتِ وَلِيَقُولُواْ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ١٠٥ ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ١٠٦ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُواْ وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ١٠٧ ﴾[٤].

(١٠٨): ﴿ وَلَا تَسُبُّواْ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّواْ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١٠٨ ﴾

خـوا ﷻ قەدەغـەی کـردوە لـە بـڕواداران کارێـک لـە بنەمـادا دروسـتە بەڵکـو ڕەوایـە، ئەویـش بریتیـە لـە تانەو تەشـەردان لـە پەرسـتراوی بتپەرسـتەکان، ئـەوەی کە کـراوە بە پەرسـتراوێک‌و لەگـەڵ خـوادا دەپەرسـترێ، ئـەوەی کـە نزیک دەبێتـەوە لە خوا بـە گاڵتە پێکـردن‌و تانـەو تەشـەردان لێـی، بـەڵام کاتێـک کـە ئـەم تانەدانـە ڕێگا خـۆش دەکات بـۆ ئـەوەی بتپەرسـتان جوێنی ناشـرین بـە پەروەردگار بـدەن، کـەوا پێویسـت دەکات بە پـاک ڕابیگـرن لە هەمـوو کەم‌و کورتی‌و تانـەو وتەیەکی ناشـرین، خوا قەدەغەو یاسـاغی کـردوە کـە جنێـوو تانـە بدرێت لـە پەرسـتراوی بتپەرسـتەکان، چونکـە ئـەوان دینەکەی خۆیـان دەپارێـزن‌و دەمارگیریـی لـە پێنـاودا دەکـەن، چونکـە هەمـوو نەتـەوەو گەلێـک خـوای گـەورە کردەوەکانیانـی لـەلا جـوان کردوە بە چـاک تەماشـای دەکـەن، زیانی لێ دوور دەخەنـەوە، وە بـە هەمـوو ڕێگـاکان بەرگـری لێدەکـەن، تەنانـەت جنێـوو تانـە بـە

٤) شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێ ئەم سێ ئایەتەی تەفسیر نەکردوە.

پەروەردگـاری جیهـان دەدەن ئـەو پەروەردگارەی کـە گەورەیی خۆی داچەقانـدوە لە دڵی پیـاو چـاکانو خراپەکارانـدا، پاشـان هەمـوو خەڵکـی گەڕانەوەیـان تەنها بـۆلای خوایە لە ڕۆژی دواییـدا، ئنجـا هەواڵیـان پێ دەدات بـەو کردەوانەی کـە ئەنجامیان داوە لـە خێرو لە چاکـەو خراپە.

ئـەو ئایەتـە بەڵگەیە لەسـەر یاسـایەکی شـەرعی ئەویش بریتیە لـەوەی هـۆکارەکان ڕەچاو دەکرێـن لـەو کارانـەی کـە پێـی دەگـات، وە هـۆکارە حـەرام کـراوەکان ئەگـەر چـی دروسـتیش بێـت ئـەوە قەدەغـە دەکرێت ئەگـەر زیانـی بـە دوادا بێت.

(١٠٩-١١١): ﴿ وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ۚ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُواْ لِيُؤْمِنُوٓاْ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ ﴾:

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَقْسَمُواْ ﴾ بتپەرسـتە درۆزنـەکان سـوێندیان خـوارد بـۆ پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ ﴿ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ﴾ واتـە: سـوێندێک کە جەختیان لە سـەر دەکردەوە. ﴿ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ ﴾ بەڵگەیـە لەسـەر ڕاسـتی موحەممـەد ﷺ ﴿ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ﴾ وە ئـەم قسـەیەی کـە کردیان مەبەسـتیان ڕێنیشـاندان نەبوو بەڵکو مەبەسـتیان بەرگـری کردن بوو لـە خۆیـان، وە بەرگـری کـردن لـەوەی کـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ دابەزیـوە، بێگومـان خوای گـەورە بە بەڵگەی ڕوونو ئاشـکرا پشـتیوانی لـە پێغەمبەرەکەی کـردوە، ئەگەر مرۆڤ لای لێکاتـەوە کەمتریـن گومـانو ئاڵـۆزی نابینـی لە ڕاسـتی ئـەو پەیامەدا.

بێگومـان سـوننەتی خوا ﷻ وایە لـە بەندەکانیدا ئەوانەی کـە داوای نیشـانەی پێغەمبەرایەتی دەکـەن لـە پێغەمبـەرەکان ئەگـەر ئـەو نیشانانە بێنە جێو لـە بەرانبـەردا ئەوان بـڕوای پێ نەهێنـن، ئەوە ڕاسـتەوخۆ سـزایان بۆ پێش دێـت، بۆیە دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: ئەو خوایەی کە ویسـتی لەسـەر بێـت دەینێرێت، وە ئەگەر ویستیشـی لەسـەر نەبـێ ناینێـرێ، من لـەو کارەدا هیچ شـتێکم نیە.

داواکردنـی ئێـوە بـە نیشـانەکانە لە مـن داواکردنێکە لـە توانای مندا نیـە، بەڵکو ئێـوە دەبێ داوای ڕوون کردنـەوەی ئـەوە بکـەن کە مـن بۆم هێنـاونو بەڕاسـتی بزانن، بـە دڵنیاییەوە بـە جێهـات، وە لەگەڵ ئەوەشـدا نازانرێ ئـەوان ئەگەر

نیشـانەكانیان بـۆ بێت ئایا بـڕوای پێدەهێننو بەڕاسـتی دادەنێـن، بەڵكو زۆربـەی حاڵی وایە كـە بڕوای پێ ناهێنـن، بۆیە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَا إِذَا جَاءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾.

﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾

واتـە: وە سـزایان دەدەیـن ئەگـەر یەكـەم جـار بڕوایـان پێـی نەهێنـا، ئـەوە بانگخوازەكە دێـت بۆ لایـان بەڵگەیان بەسـەردا دەسـەپێنێ، بـە هەڵگێڕانـەوەی دڵەكانیان، وە بەربەسـت دروسـتكردن لـە نێـوان ئـەوانو بـڕوا هێنانـدا، وە سەرنەخسـتنیان بۆ ڕێگای ڕاسـت.

ئەمـە لە دادگـەریو دانایـی خوایە بەرانبـەر بەندەكانی، ئـەوان خۆیان وایان بەسـەر نەفسو دەروونـی خۆیانـدا هێنـا، دەرگـای هیدایەتـی بـۆ كردنـەوە كەچی نەچـوون بـە دەمیەوە، وە ڕێگـای بـۆ ئاشـكرا كـردن نەیانگرتـە بـەر، لـە پـاش ئـەوە ئەگـەر بێبـەش بكرێـن لـە سەرخسـتنی خـوا ﷻ ئـەوە بێگومـان لەگـەڵ دۆخیانـدا گونجـاوە. بـە هەمـان شـێوە بڕواهێنانیـان هەڵواسـی تەنهـا بە ویسـتی توانـای خۆیانەوە، بە بێ پشـت بەسـتن بە خوا ﷻ ئەمـەش گەورەتریـن هەڵەیـە، ئـەوان ئەگـەر نیشـانە گەورەكانیـان بـۆ بـەدی بهاتبایە، لە دابەزاندنـی فریشـتە بۆ لایانو شـایەتی بدایـەت بە ڕاسـتی پەیامی پێغەمبـەر موحەممەد ﷺ وە قسـەكردنی مـردوو، وە زیندووكردنەوەیـان پـاش مـردن، وە كـۆ كردنـەوەی هەمـوو شـتێك هەتـا قسـەیان لەگەڵـدا بـكات ﴿ قُبُلًا ﴾ ڕوو بـەڕوو لـە پێـش چاویان بەڕاسـت دانانـی پەیامـی پێغەمبـەر ﷺ هێشـتا هـەر بڕوایان نەدەهێنا، ئەگەر خوا ﷻ ویسـتی لەسـەر نەبووایـە، بـەڵام زۆربەیـان نەزانو نەفامـن، بۆیـە بڕواهێنانیان لەسـەر هێنانی چەنـد بەڵگەو نیشـانەیەك بەسـتەوەو قەتیـس كرد.

بەڵكـو عەقـڵو زانسـت ئەوەیـە كـە مـرۆڤ مەبەسـتی شـوێنكەوتنی ڕاسـتی بێـت، وە بە دوایـدا بگەڕێـت بەو شـێوەیەی خـوا ﷻ ڕوونی كردوەتەوەو پاشـان كاری پـێ بكات، وە پشـت بە خوا ﷻ ببەسـتێت لە شـوێنكەوتنیدا، وە خۆی نەداتە دەسـتی هـەواو ئارەزوویەوە، هەروەهـا داوای كۆمەڵـە نیشـانەیەكی هەڵبـژاردن نـەكات كە هیـچ سـوودێكی تێدا نیە.

۞ وَلَوْ أَنَّنَا نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا
عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ قُبُلًا مَّا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوٓا۟ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ
وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ يَجْهَلُونَ ﴿١١١﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ
عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ
زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا
يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ
وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا۟ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِى
حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ۚ
وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ
بِٱلْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ
صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ
﴿١١٥﴾ وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِن
يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿١١٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ
أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١١٧﴾ فَكُلُوا۟
مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾

(١١٢-١١٣): ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِىٍّ عَدُوًّا شَيَٰطِينَ ٱلْإِنسِ وَٱلْجِنِّ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا۟ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾

خـوا ﷻ لـه دڵدانـه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ره‌كـه‌ی موحه‌ممـه‌د ﷺ ده‌فه‌رمـوێ: وه‌ك چـۆن دوژمنانێكمـان دانـاوه بانگه‌وازه‌كه‌ت ڕه‌ت بكه‌نـه‌وه‌و دژایه‌تیـت بكـه‌نو ئیره‌یـی‌و حه‌سـوودیت پـێ ببـه‌ن، به‌ڕاسـتی ئه‌مـه سـوننه‌تی ئێمه‌یـه، بۆ هـه‌ر پێغه‌مبه‌رێك كه ده‌ینێریـن دیاریمـان كردوه بۆ نـاو خه‌ڵكی دوژمنانێـك له شـه‌یتانه‌كانی مـرۆڤ‌و جنۆكه، بـه پێچه‌وانـه‌ی په‌یامـی پێغه‌مبه‌ره‌كانیانه‌وه مامه‌ڵـه بكه‌ن.

﴿ يُوحِى بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ ٱلْقَوْلِ غُرُورًا ﴾واتـه: هه‌ندێكیـان بـه هه‌ندێكیـان ڕاده‌گه‌یه‌نـن، وه ئـه‌وه‌ی كه بانگه‌شـه‌ی بۆ ده‌كـه‌ن به‌تاڵ‌و بـێ مانایه، ده‌سـته‌واژه‌ی جوانی بـۆ ڕێـك ده‌خـه‌ن، هه‌تـا ده‌یخه‌نـه چاكتریـن چوار چێـوه‌وه بـۆ ئه‌وه‌ی كـه‌م عه‌قڵـی پێ هه‌ڵخه‌ڵه‌تێنـن‌و گه‌مژه‌كانـی پـێ ملكـه‌چ بكـه‌ن، كـه هیـچ نازانن‌و لـه واتـاكان تێناگه‌ن، به‌ڵكـو سه‌رسـوڕمانیان به وتـه ڕازاوه‌كان‌و ده‌سـته‌واژه چه‌واشـه كاریه‌كان، تـا وا تێده‌گه‌ن هـه‌ق پـووچ‌و به‌تاڵـه‌و به‌تاڵیـش ڕاسـتیه، بۆیـه ده‌فه‌رمـوێ: ﴿ وَلِتَصْغَىٰٓ إِلَيْهِ ﴾واتـه: بۆ ئـه‌وه‌ی گـوێ بگرێ بۆ ئـه‌و وتـه ڕازاوه‌و بریقه‌دارانـه‌ی كه بـۆی ده‌كه‌ن ﴿ أَفْـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ ﴾چونكـه بڕوایـان نیـه به ڕۆژی دوایـی، وه خـاوه‌ن عه‌قڵێكی باش‌و بـه سـوود نیـن، كه له‌سـه‌ر ئـه‌وه هانیـان بدات.

﴿ وَلِيَرْضَوْهُ ﴾پـاش گـوێ گرتنیـان، سـه‌ره‌تا گوێی بـۆ ده‌گرن ئه‌گـه‌ر حه‌زیـان لێی بوو، وه ده‌سـته‌واژه‌و ده‌ر بڕینـه‌كان بـه لایانه‌وه جوان بوو، ئـه‌وه پێی ڕازی ده‌بن‌و لـه دڵه‌كانیاندا

جوانــی دەکــەن، تــا دەبێتــە بڕوایەکــی قــووڵو ڕۆچــوو ســیفەتێکی جیانەکــراوە. پاشــان ســەرەنجام بــە زمانو بە کــردەوە گوناهو تــاوان ئەنجــام دەدەن، وە ئەوەی لە پێویســتیەکانی ئــەو بڕوایەیــە کەمتەرخەمــی تێــدا ناکەن لــە کاری خراپو بــێ مانا.

ئەمــە حاڵــی ئەو کەســانەیە کە سەرســام بــوون بە شــەیتانەکانی مــرۆڤو جنۆکــە، ئەوانەی کــە قبووڵــی بانگەوازەکــەی دەکــەن، بــەڵام ئەوانەی کــە بڕوایان بــە ڕۆژی دوایــی هەیە، خــاوەن عەقڵــی کامڵو تــەواون، ئــەوان هەرگیز ناخەڵەتێن بە قســەو دەســتەواژەی بێ بنەما، بەڵکــو بــە دوای حەقیقەتــدا دەگەڕێن، بــە دوای ئــەو ڕاســتیانەدا دەگەڕێن کــە بانگخوازان ئامــاژەی پێدەکــەن. ئەگــەر ڕاســت بێــت وەریدەگــرنو گوێڕایــەڵ دەبــن ئەگــەر چــی دەربڕینەکەیشــی بــە هێــز نەبێــتو وتەکانیشــی زۆر ڕوون نەبــێ، وە ئەگەر بەتــاڵو پووچ بێــت ڕەتــی دەکەنەوە بەســەر خاوەنەکەیــدا، ئەگەر خاوەنەکەی هەر کەســێک بــێ، ئەگەر چــی بەرگێکــی ڕێــکو پێــک بکاتە بــەر وتەکانــی لە حەریر ناســک تــر بێت.

لــە حیکمــەتو دانایەکانــی خوا ﷻ ئەوەیــە دوژمنی بــۆ پێغەمبــەران داناوە، وە بــۆ ڕێگای ناڕاســتو پووچیــش خەڵکێکــی دانــاوە پشــتیوانی لێدەکــەنو بانگــەوازی بــۆ دەکــەن، لە بەرانبــەردا بــۆ بەندەکانی خــوا تاقیکردنەوەو بــەڵاو نارەحەتی دانــاوە، بۆ ئەوەی ڕاســتگۆ لە درۆزن جیــا بکاتــەوە، وە عاقــڵ لــە نەفام، وەچاو ســاغ لــە کوێر.

وە لــە حیکمەتــی خــوا ﷻ لــەوەدا ئاشــکرا کــردنو ڕوون کردنــەوەی هــەقو ڕاســتیە، بێگومــان هــەق دیــارەو دەگەشــێتەوە، ئەگەر خراپەو پووچ هەســتایە ســەر پێ، ئەوە ڕاســتی لــە بەرانبەریــدا ڕادەوەســتێو بەرگــری دەکات، ئــەو کات بەڵگەی ڕاســتی دەردەکــەوێ بە نیشــانەو ئەوانــەی کــە ئامــاژەی پێدەکــەن، وە خراپــەو بەتاڵ هەرچەنــدە زانیــاری هەبێتو ئاشــکرا بــێ شــوێنکەوتووانی پێشــبڕکێی لەســەر دەکەن.

(١١٤-١١٥): ﴿ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡتَغِي حَكَمٗا وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مُفَصَّلٗاۚ وَٱلَّذِينَ
ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٞ مِّن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتۡ
كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾:

ئــەی پێغەمبــەر ﷺ پێیــان بڵــێ: ﴿ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡتَغِي حَكَمٗا ﴾ واتــە: دادوەری دەبەم بۆ لای ئــەو، وە ملکــەچ دەبــم بــە فەرمــانو قەدەغەکراوەکانــی، بێگومــان جگــە لە خــوا دادوەری بەســەرا دەکرێــت، نەک دادوەری بــکات، وە هەموو بەڕێوەبردنو دادوەریەکی دروســتکراو ناتــەواویو کــەمو کــوڕیو زوڵمو ســتەمی تێدایە.

ئـەوەی كـە پێویسـتە بكرێت بـە دادوەر ئەوە خوای تـاكو تەنهاو بێ هاوەڵە، ئەو كەسـەی كـە هەموو فەرمانـەكان بـە دەسـتێتی ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مُفَصَّلٗاۚ ﴾ واتە: سـەرجەم بڕیارەكانی ڕوونو ئاشـكرایە لە حەڵاڵو حەرامو حوكمە شـەرعیەكانو بنەماكانی ئایـنو لقەكانی، ئـەو خوایەی كە هیـچ ڕوونكراوەیەك لە سـەرووی ڕوونكـراوەی ئەوەوە نیـە، وە هیـچ بەڵگەیەك لە سـەرووی بەڵگـەی ئەوەوە نیـە، وە هیچ وتەیەك لـە وتەی ئەو بەهێزتـر نیـە چونكە فەرمانەكانی بـە حیكمەتو میهرەبانی داپۆشـراوە.

وە خـاوەن كتێبەكانی پێشـین لە جوولەكەو گـاورەكان دان بەو ڕاسـتیە دادەنێن ﴿ يَعۡلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٞ مِّن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّۖ ﴾ بۆیـە هەواڵـەكان بـە دوای یەكتـردا دێـن ﴿ فَلَا ﴾ گومانت نەبێ لـەوەدا، وە لـە دوو دڵان مەبە.

پاشـان بـە درێـژی وەسـفی كـردوە ﴿ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ ﴾ واتـە: ڕاسـتە لە هەواڵـداو دادپـەروەرە لە فەرمـانو قەدەغەكردندا، هیچ هەواڵێك ڕاسـتتر نیە لـەو قورئانەی كـە دابەزیـوە، وە دادوەرتـر نیە لـە فەرمـانو قەدەغەكراوەكانـی ﴿ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ ﴾ بۆیـە پاراسـتویەتی بە بەرزتریـن جۆرەكانی ڕاسـتگۆیی، وە بە ئەوپەڕی هەقو ڕاسـتی بۆیە ناكـرێ بگۆڕدرێتو بخرێتـە هەڵبژاردنەوە.

﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ﴾ بـە هەمـوو دەنگـەكان بە جیاوازی زمـانو پێویسـتیەكانەوە ﴿ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ ئـەوەی كە زانسـتی دەوری هەموو ئاشـكراو نهێنـیو ڕابـردوو داهاتوی داوە.

(١١٦-١١٧): ﴿ وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ١١٦ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ١١٧ ﴾

خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەكـەی موحەممـەد ﷺ دەفەرموێ: ئاگـاداری دەكاتەوە لـە گوێڕایەڵی كردنـی زۆربـەی خەڵكانـی سـەر زەوی ﴿ وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ﴾ بێگومـان زۆرینەیـان ئاینەكەیـان شـێواندوە، وە بـە هەمـان شـێوە كردەوەو زانسـتەكانیانیش وە ئاینەكەیـان تێكـداوە، وە لـە كردەوەكانیانـدا شـوێنی ئارەزووەكانیـان دەكـەون، وە زانستەكانیان هیـچ ڕاسـتیەكی تێدانیـە، وە ناگـەن بـە ڕێگای ڕاسـت، بەڵكو ئامانجیـان ئەوەیـە شـوێنی گومانێـك بكەون كە هیـچ ڕاسـتیەكی تێدا نیە، وە قسـەی پڕوو پـووچ دەكـەن لەسـەر خـوای گەورە بەبـێ زانسـت، هەر كەسـێك لـەو پلەو پایـەدا بێت شـایەنی ئەوەیـە خـوا بەندەكانـی لـێ ئاگـادار بكاتـەوەو وەسـفی بارودۆخیـان بـۆ بكات،

چونكــە ئەمــە ئەگەرچی لەگــەڵ پێغەمبەری خــوادا دەدوێ ئەوە ئۆممەتەكەشــی شــوێنی ئەو دەكــەون لــە هەمــوو بڕیارەكاندا كــە تایبەت نیــە بە پێغەمبــەرەوە.

خــوای گەورە خاوەن ڕاســترین وتەو ڕاســترین باســە ﴿ هُوَ أَعْلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾ وە زانایــە بــەوەی ڕێنموویــی وەردەگــرێ‌و ڕێنموویــی دەكات، پێویســتە لەســەرتان -ئەی بــڕوادارن- شــوێنی ئامۆژگاری‌و فەرمــان‌و قەدەغــە كراوەكانی بكەون، چونكە ئــەو زاناترە بــە بەرژەوەندیتــان‌و بــە بەزەیــی تــرە بۆتان لــە نەفســی خۆتــان زیاتر، ئــەم دەقــە بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی كــە مــەرج نیە هــەق‌و ڕاســتی لــە لای زۆرینە بــێ، وە نابێتــە بەڵگە لەســەر كەمــی شــوێنكەوتووان لــە كارێــك لــە كارەكان لەســەر ناهــەق بــێ، بەڵكــو حەقیقەت‌و ڕاســتی پێچەوانــەی ئەوەیــە، چونكــە شــوێنكەوتووانی هــەق‌و ڕاســتی لــە ڕووی ژمــارەوە كەمینــەن، گــەورەن لــە لای خوا لــە ڕێزو پاداشــتدا، بەڵكو پێویســتە بۆ هەق‌و ناهــەق بەڵگە بهێنرێتــەوە بــە هەمــوو ئــەو ڕێگایانــەی دەكرێ پێــی بگەن.

(١١٨-١١٩): ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَـٰتِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١١٨﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا ٱضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَآئِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾:

خــوا ﷻ فەرمــان دەكات بە بــڕواداران كــە پێویســتیەكانی بڕواهێنان بەجێبهێنــن، وە ئەوان ئەگــەر چــی بــڕوادارن با لــەو ئاژەڵانــە بخۆن كــە ناوی خــوای لەســەر هێنــراوە، وە جگە لەوانــەش لــەو زیندەوەرانــەی كــە حــەڵاڵ كــراون‌و بڕوایــان وایە كــە حەڵاڵــە، با وەك نەفامــەكان هەڵــس‌و كــەوت نەكــەن لــە حــەڕام كردنــی زۆرێــك لــە حەڵاڵــەكان كە لە لایــەن خۆیانــەوە دایــان هێنابــوو، وە گومڕابوونیان بــە هۆی شــەیتانەكانەوە.

خوا باســی نیشــانەی بــڕواداری كردوە كــە دەبــێ پێچەوانەی خەڵكــی نەفــام بجوڵێتەوە لەو داب‌و نەریتە سەرزەنشــت كراوانەدا، كە شــەرع‌و یاســای خــوای تێدا دەگــۆڕن، وە ئەوان چ شــتێك بەرگریــان لــێ دەكات، كە لــە خواردنێ بخۆن ناوی خوای لەســەر هێنــراوە، چونكە بێگومــان خــوا بۆیانــی ڕوون كردۆتــەوە ئــەوەی حەڕامــی كــردوە لە ســەریان، بــە ڕوون كردنەوەیەكــی ئاشــكراو دیــار؟ هیچ ئاڵــۆزی‌و گومانێك نەمــاوە كە بەرگری لــە خواردنی هەنــدێ حــەڵاڵ كراو بــكات، بە خۆپاراســتن لــە حەڕام.

وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ
لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ وَإِنَّ كَثِيرًا
لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ
﴿١١٩﴾ وَذَرُوا ظَاهِرَ الْإِثْمِ وَبَاطِنَهُ إِنَّ الَّذِينَ يَكْسِبُونَ الْإِثْمَ
سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ
يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ
إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ
﴿١٢١﴾ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ
فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا كَذَٰلِكَ
زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا
فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا وَمَا
يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا جَاءَتْهُمْ
آيَةٌ قَالُوا لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ اللَّهُ
أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ سَيُصِيبُ الَّذِينَ أَجْرَمُوا صَغَارٌ
عِندَ اللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا كَانُوا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٤﴾

ئەم دەقە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بنەڕەتی شتەکانو هەموو خواردەمەنیەکان ڕەواو حەڵاڵە، بە مەرجێک شەرعی خوا حەرامی نەکردبێ، وە لەسەر ڕەوایەتی دەمێنێتەوەو موباحە، ئەوەی کە خوا لێی بێدەنگ بووە ئەوە حەڵاڵە، چونکە حەرامەکان خوا ﷻ بە درێژی باسی کردوە، ئەوەی خوا ﷻ بە درێژی باسی نەکردبێ حەرامو قەدەغە نیە. لەگەڵ ئەوەدا ئەو حەرامەی کە خوا ڕوونی کردۆتەوەو بە درێژی باسی کردوە لە کاتی ناچاریدا حەڵاڵی کردوە، وەک چۆن دەفەرمووێ: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ﴾واتە: هەتا دەگاتە ئەو فەرمایشتەی: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣﴾﴾المائدة

واتە: پاشان ئاگاداری داوە لە زۆربەی خەڵکی ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِم﴾ واتە: تەنها بە هەواو ئارەزووەکانیان ﴿بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾ وە بەبێ بەڵگە، بابەندە خۆی بپارێزێ لە وێنەی ئەوانەو نیشانەکانیان -وەک چۆن خوا ﷻ وەسفی کردوون بۆ بەندەکانی- کە بێگومان بانگەوازیان ڕوون نیەو هیچ بەڵگەیەکی شەرعیان بە دەستەوە نیە، تەنها ئەوە نەبێ شوێن هەندێ لە گومانە فاسیدەکان کەوتوون بە پێی ئارەزووە خراپەکانیانو بۆچوونە کورتەکانیان. ئەوانە دەستدرێژیو سەرکەشیان کردوە بەسەر شەرعی خواو بەندەکانیەوە، وە خوا ﷻ دەستدرێژی کەرانی خۆش ناوێ. بە پێچەوانەی ئەوانەی ڕێنموویان وەرگرتووەو لەسەر ڕێگای ڕاستن، بە دڵنیاییەوە ئەوان هەمیشە بانگەواز بۆ هەقو ڕاستیو هیدایەت دەکەن، وە پشت بە بانگەوازەکانیان دەبەستن بە بەڵگەی ڕوونو ئاشکرای عەقڵیو نەقڵی، وە لە بانگەوازەکەیاندا تەنها شوێنی ڕەزامەندی پەروەردگاریان دەکەون.

(١٢٠): ﴿ وَذَرُواْ ظَٰهِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَبَاطِنَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡسِبُونَ ٱلۡإِثۡمَ سَيُجۡزَوۡنَ بِمَا كَانُواْ يَقۡتَرِفُونَ ١٢٠ ﴾:

مەبەست لە تاوانو گوناه هەموو سەرپێچیەکە کە بەندە ئەنجامیان دەدات، واتە: دەیخاتە ناو تاوانو کێشەو گرفتەوە لەو شتانەی کە پەیوەندی هەیە بە مافی خواو بەندەکانی، خوا ﷻ قەدەغەی کردوە لە بەندەکانی، تاوان کردن بە جەستەو ئەندامانی جەستە بە ئاشکراو نهێنی، وە پەیوەندی هەیە بەدڵەوە. بەندە ناتوانی واز لە تاوانو سەرپێچی بهێنێ مەگەر پاش ئەوەی زانستو زانیاری دەربارەی هەبێ، ناسینی سەرپێچیەکانی دڵو جەستە پێویستە لەسەر کەسی ژیرو تێگەیشتوو. زۆرێک لە خەڵکی هەندێک لە تاوانەکان لە لایان شاراوەیە بە تایبەت سەرپێچیەکانی ناو دڵ، وەک لووت بەرزیو شانازی کردن بە خۆو ڕووپامایيو ڕیایی کردنو هاوشێوەی ئەوانە، تەنانەت زۆرێک لەو تاوانانەی تێدایە، بەڵام هەستی پێ ناکات، ئەمەش بە هۆی پشت هەڵکردنە لە زانستو زانیاریو نەبوونی ژیریو دانایی. پاشان هەواڵ دەدات ئەوانەی کە تاوان بە ئاشکراو نهێنی ئەنجام دەدەن، پاداشت دەدرێنەوە بە پێی ئەوەی کردویانە، بە ئەندازەی تاوانەکانیان، زۆر بێ یان کەم، ئەم پاداشتە لە ڕۆژی دواییدا دەبێ، هەندێک جار لە دنیادا بەندە سزا دەدرێ، بۆ ئەوەی تاوانەکانی لەسەر سووک بکرێ.

(١٢١): ﴿ وَلَا تَأۡكُلُواْ مِمَّا لَمۡ يُذۡكَرِ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسۡقٞۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ١٢١ ﴾:

هەر سەربڕینێک ناوی غەیری خوای لەسەر هێنرابی دەچێتە چوار چێوەی ئەم دەقەوە، وەک ئەوەی سەردەبڕدرێت بۆ بتو پەرستراوەکانیان، بێگومان ئەمە لەوانەیە کە بۆ غەیری خوا ﷻ سەربڕاوە، کە بە دەقی قورئان قەدەغەکراوە. وە دەچێتە ئەو چوار چێوەیەوە ئەوەی ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە، با لەبەر خوا ﷻ سەربڕابێ، وەک: قوربانی یان گۆشتو خواردن، ئەگەر ئەوەی سەری دەبڕی بە ئەنقەست ناوی خوای نەهێنابێ، لە لای زۆرێک لە زانایان. وە لەم گشتگیریە دەردەچێ ئەوەی ناوی خوای بیر دەچێت، بە کۆمەڵە دەقێکی تر، کە بەڵگەن لەسەر لابردنی نارەحەتی لەسەری. وە دەچێتە چوار چێوەی ئەم دەقەوە ئەوەی کە دەمرێ بەبێ سەربڕین لە مردار بووەکان، چونکە ناوی خوایان لەسەر نەهێنراوە.

خوا ﷻ بە تایبەت باسی کردوە لە ڕستەی: ﴿ حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ ﴾ وە دەگونجێ هۆکاری دابەزینی دەقەکە بە هۆی ئەو ئایەتەوە: ﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡ ﴾ بە بێ زانیاریی، بتپەرستان کاتێ کە بیستیان خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ مردارەوە

بوویان قەدەغە کردوەو سەربڕینیان حەڵاڵ کردوە، ئەوان مردارەوەبوویان بە حەڵاڵ دەزانی، لە دژی خوا ﷻ و پێغەمبەردا ﷺ وتیان: دەمە دەمیّ و مشتو مڕێکی بێ بەڵگەیە، ئایا ئێوە ئەوە دەخۆن کە کوشتوتانە ئەوەش ناخۆن کە خوا کووشتویەتی؟ مەبەستیان پێی مردارەوە بوو بووە.

ئەمە بۆ چوونێکی خراپە، پشت بە هیچ بەڵگەیەک نابەستێ، بەڵکو پشت دەبەستێ بە بۆچوونە پووچو بێ ماناکانیان کە ئەگەر هەقو ڕاستی شوێنی ئەوان بکەوتبایە ئەوا ئەرزو ئاسمانەکانو ئەوەی تیایاندایە لەناو دەچوون.

دەک بەدبەخت بێو سەرشۆڕ بێ هەر کەسێک ئەو عەقڵانە پێش دەخات بە سەر بڕیارو فەرمانی خوادا کە گونجاوە لەگەڵ بەرژەوەندیە گشتیەکانو قازانجە تایبەتیەکاندا. ئەمە سەرسوڕ هێنەر نیە کە لەلایەن ئەوانەوە شتێکی وای بۆ بکرێ، چونکە ئەم بۆچوونانەو هاوشێوەکانی لە چپەی دۆستە شەیتانەکانیان وەریان گرتووە، ئەوانەی کە دەیانەوێ خەڵکی وێڵ بکەن لە ئاینەکەی خۆیان، بانگیان بکەن تا ببن بە یەکێک لەو کەسانەی کە ئاگری دۆزەخیان پێ خۆش دەکرێ.

﴿ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ ﴾ واتە: لە شیرکو هاوەڵدانانیاندا وەک لە حەڵاڵ کردنی حەرامەکانو لە حەرام کردنی حەڵاڵەکان ﴿ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ﴾ چونکە ئێوە ئەوانتان دەکرد بە دۆستی خۆتان بێجگە لە خوای گەورە، لەگەڵ ئەواندا یەک بوون بە پێچەوانەی مسوڵمانانەوە، لەبەر ئەمەیە ڕێگاکانی ئەمان هەمان ڕێگای ئێوەیە. ئەم ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، ئەوەی کە لە دڵەکاندا ڕوو دەدات لە ئیلهامو خورپەی دڵ، کە لای سۆفیەکان ئەمەو هاوشێوەکانی زۆر باون، نابێتە بەڵگە کە ئەوە هەقو ڕاستیە وە نابێ بە ڕاست بزانرێ هەتا دەخرێتە پێش کتێبی خواو سونەتی پێغەمبەرەکەی، ئەگەر شایەتی بۆدا بەوەی کە قبووڵە ئەوە هیچ کێشەیەکی تێدا نیەو وەردەگیرێت، وە ئەگەر بە پێچەوانەوە بێت ئەوە ڕەد دەکرێتەوە، وە ئەگەر هیچ نەزانرا دەربارەی ئەوە دەوەستێ نەبەڕاستی دەزانێو نەبە درۆ. چونکە وەحیو ئیلهام لە لایەن خواوە دەبێو وە لەلایەن شەیتانیشەوە دێ، بۆیە دەبێ جیاکاری لە نێوانیاندا بکرێ، وە ئەگەر جیاکاری لە نێوانیاندا نەکرێ ئەوە هەڵەو سەرپێچی ڕوودەدات کە کەس ناتوانێ جیای بکاتەوە جگە لە خوا ﷻ.

(١٢٢-١٢٤): ﴿ أَوَمَن كَانَ مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ

﴿ ... جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَـٰبِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُواْ فِيهَا ۖ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ قَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ رُسُلُ ٱللَّهِ ۘ ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ۗ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا كَانُواْ يَمْكُرُونَ ﴿١٢٤﴾ ﴾:

خوا دەفەرمویّ: ﴿ أَوَمَن كَانَ ﴾ هەر کەسێک پێش ئەوەی هیدایەت دانی خوای بۆ بێت ﴿ مَيْتًا ﴾ لە تاریکی کوفرو نەفامیو تاوانو سەرپێچیدا، ﴿ فَأَحْيَيْنَـٰهُ ﴾ بە نووری زانستو ئیمانو گوێڕایەڵی، لە نێوان خەڵکیدا بەو نوورو ڕۆشناییەوە ڕێدەکات، چاو ساغە لە کارەکانیدا ڕێنمایی کراوە بۆ ڕێگاکەی، خێرو چاکە دەناسیّو کاری بۆ دەکاتو لە خۆیدا جێبەجێی دەکاتوە بانگەشەی بۆ دەکات، خراپە دەناسیّو ڕقی لێیەتی، هەوڵ دەدات وازی لێبهێنێو لە نەفسو دەروونی دووری بخاتەوە، وە خەڵکیشی لێ ئاگادار بکاتەوە.

ئایا ئەمە وەکو کەسێک وایە کە لە تاریکستانی نەفامیو گومڕاییو کوفرو سەرپێچیدا بیّ؟ ﴿ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ﴾ سەری لێتێک چووەو ڕێگاکانی لیّ تێکەڵ بووە، پاشان تووشی خەمو خەفەتو بیتاقەتیو بێزاری بووە.

خـوا ﷻ عەقڵەکانــی ئاگــادار کردۆتــەوە بــەوەی کــە هەســتی پێدەکــەنو دەیناســن، کــە بێگومــان ئەمــەو ئــەوە هاوتــای یــەک نیــن، وەک چــۆن شــەوو ڕۆژو ڕۆشــناییو تاریکــی وە زینــدوو مــردوو هاوشــێوەی یەکتــر نیــن، ئەمــە وەک ئــەوە وایــە بوتــریّ: چــۆن دەبــیّ کەســێک ئەگــەر کەمتریــن عەقڵیشــی هەبێــت، باروودۆخــی بــەم شــێوەیە بێــت کەلــە تاریکیــدا ویــڵو تیاراماب‌یّ؟! وەڵام دەداتــەوە بــەوەی کە ﴿ زُيِّنَ لِلْكَـٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ شــەیتانەکان بــەردەوام کردەوەکانیــان لــەلا جــوان دەکــەنو لــە دڵەکانیانــدا دەیڕازێننــەوە، تــا ئەوانیــش بــە چــاک تەماشــای دەکــەنو وای دەبینــن کە هــەقو ڕاســتیە، پاشــان دەبــیّ بــە بیــرو باوەڕێــک لــە ناخیانــداو ســیفەتێکی قــووڵو ڕۆچــوو جیانەبــووەوە لێیــان. لەبــەر ئەمەیــە ڕازی بــوون بــەو خراپــەو شــتە ناشــرینانەی کــە لەســەری دەڕۆن، ئەوانــە لــە تاریکــی گومڕاییــدا دەمێننــەوە.

تیایاندایە سەرۆکو دەسەڵاتداراانو پێشەواکان، وە تیایاندایە شوێنکەوتووانو سەربازان، ئەوانەی سەرەتا خراپترین دۆخیان بۆ خۆیان دیاری کرد، بۆیە دەفەرمویّ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَـٰبِرَ مُجْرِمِيهَا ﴾ واتە: ئەو دەسەڵاتدارانەی کە ستەمو تاوانیان زۆر گەورە بوو، وە بە خراپترین شێوە لە سنوور دەرچوون، ﴿ لِيَمْكُرُواْ فِيهَا ﴾ بە

پیلانو فێڵ، وە بانگەواز بۆلای ڕێگای شەیتانو دژایەتی کردنی پێغەمبەرانیان بە وتەو کردەوە.

فێڵو گومانیان تەنها بۆ نەفسی خۆیان دەگەڕێتەوە، ئەوان بەردەوام فرو فێڵ دەکەن، وە خواش فێڵیان پووچ دەکاتەوەو پیلان دەگێڕێت، وە خوا ﷻ چاکترین پیلان گێڕانە.

بە هەمان شێوە خوای گەورە زانایانی هیدایەت داوە کە ڕووبەڕووی ستەمکاران ببنەوە، وتەکانیان ڕەت بکەنەوەو جیهادیان لە بەرانبەردا بکەن، وە هەموو ڕێگاکان بگرنە بەر بۆ ئەوەی بگەن بەو ئامانجە، خوای گەورەش یارمەتیان دەداتو بۆچوونەکانیان بە هێز دەکاتو پێکانیان جێگیر دەکات، وە ڕۆژگار دەگێڕێت لە نێوان ئەوانو دوژمنەکانیاندا، هەتا سەرەنجام سەرکەوتن دەبەخشێت بە لەخواترسان، بۆیە گەورە دەسەڵاتدارانی ستەمکاری جێگیر کردوە لەسەر بەرنامە پووچەکانیانو بەرپەرچی هەقو ڕاستی دەدەنەوە، کە لە لایەن پێغەمبەرانەوە هاتووە، ئەویش بە هۆی ئیرەیی بردنو گومراییانەوە، وتیان: ﴿ قَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ حَتَّىٰ نُؤۡتَىٰ مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ رُسُلُ ٱللَّهِۘ ﴾ بە پێغەمبەرایەتیو پەیامەکەی. وە لەمەدا بەرپەرچی خوای گەورەیان داوەتەوە، وە سەرسام بوون بە هەواو ئارەزووەکانیانو لووت بەرز بوونە بەرانبەر ئەو ڕاستیەی کە لە سەر دەستی پێغەمبەران دابەزیوە، ئەمە تانە دانیانە لە سەر خوا ﷻ.

خوای گەورە وەڵامی تانە پووچەکانیانی داوەتەوە کە ئەوان بۆ خێرو چاکە ناشێن، وە تیاندا نیە بێ بە بەندەیەکی چاکە خواز بۆ خوا، دەی چۆن دەبن بە پەیامبەرو نێردراو، ﴿ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ حَيۡثُ يَجۡعَلُ رِسَالَتَهُۥۗ ﴾ لە زانستی خوای گەورە ئەوەیە دەزانێ کێ چاکە و دەتوانێ ئەو بارە گرانە هەڵبگرێ، وە ئەو کەسە وەسف کراوە بە ڕەوشت بەرزو دوورە لە هەموو خووڕەوشتێکی ناشرین، خوا ﷻ بە حیکمەتو دانایی خۆی بە پێی پێویست پێی دەبەخشێ، وە ئەگەر بەو شێوەیە نەبوو خوا ﷻ چاکترین بەهرەی خۆی لە شوێنێکدا دانانێ کە شایستەی ئەوە نەبێو خۆی پاک نەکردبێتەوە. وە ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر تەواوی حیکمەتی خوا، چونکە ئەگەر چی خوا ﷻ میهرەبانو بەخشندە بێو خاوەن چاکەی زۆر بێ، بێگومان ئەو دانایە بەخشندەیی خۆی لە شوێنێکدا دانانێ تەنها بۆ کەسی شایستە نەبێت.

پاشان هەڕەشەی کردوە لە تاوانبارو خوێن مژەکان، دەفەرموێ: ﴿ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ صَغَارٌ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: سەرزەنشتو سەرشۆڕی، وەک چۆن لووت بەرزیان نواند بەرانبەر بە هەقو ڕاستی، خوا ﷻ زەلیلی کردوون: ﴿ وَعَذَابٌ شَدِيدُۢ بِمَا كَانُواْ يَمۡكُرُونَ ﴾ واتە: بە هۆی فێڵو تەڵەکەیانەوە، نەک بە هۆی ستەمی خوا لێیان.

فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن
يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا
يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢٥﴾ وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا ۗ قَدْ فَصَّلْنَا
ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ ۞ لَهُمْ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ
رَبِّهِمْ ۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٧﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ
جَمِيعًا يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ۖ وَقَالَ
أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلْإِنسِ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَآ
أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثْوَىٰكُمْ خَٰلِدِينَ فِيهَآ
إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٢٨﴾ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّى
بَعْضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٢٩﴾
يَٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ
يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِى وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ
هَٰذَا ۚ قَالُوا۟ شَهِدْنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَا ۖ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا
وَشَهِدُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾

(١٢٥): ﴿ فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢٥﴾ ﴾:

خـوای گـەورە دەفەرمـوێ:- ڕوونـی دەکاتـەوە بـۆ بەندەکانـی نیشـانەی خـۆش بەختـیو ڕێنمایـی و نیشـانەی گومڕایـیو سەرلێشـێواوی-هەر کەسـێک کـە خـوا بیەوێـت ڕێنمایـی بـکات بۆ ئاینی ئیسـلام دڵو دەروونی گوشـادو بەرفـراوان دەکات، بـە دڵنیایـیو ڕووناکـی ئیمـان، نەفـسو دەروونـی پێـی ئـارام دەبێو پاشـان حەز لە کاری چاک دەکاتو چێـژی لێوەردەگرێ بـە بـێ ئـەوەی بە لایـەوە گـران بـێ، بێگومـان ئـەوە نیشـانەی ئەوەیە کـە خـوا ڕێنمایی کـردوە، وە فـەزڵو منەتـی خۆی کـردوە بەسـەریدا بە سـەرکەوتنو گرتنەبەری باشـترین ڕێگا.

وە نیشـانەی ئـەو کەسـەی کـە خـوا بیـەوێ گومـڕای بـکات نەفـسو دەروونـی تەنـگ دەکات لـە بڕواهێنـانو زانسـتو دڵنیایـی، وە دڵـی پڕ دەبێ لـە گومـانو دوو دڵیو حەزی تێرکردنـی ئارەزووەکانـی، هەرگیـز ناگـا بـە خێرو چاکـە وە دڵی بـە خێرو چاکـە توونـد دەبـێ، بـە شـێوەیەکی وا توونـد دەبـێ وەک ئەوەی بەرەو ئاسـمان سـەربکەوێ، واتە: وەک ئـەوە وایـە داوای لێبکرێـت بچێـت بـۆ ئاسـمان کـە توانـای نەبـێ سـەربکەوێ. وە ئەمـە هـۆکاری بڕوانەبوونیانە، بێگومان خوا ﷻ پێویسـتی کردوە شـەیتان زاڵ بکات بەسـەریاندا، چونکـە ئـەوان دەرگـای چاکەکانیان بەسـەر خۆیاندا داخسـت.

ئەمـە تەرازوویەکـە گۆڕانـی بەسـەردا نایـەت، بەڕاسـتی هەرکەسـێک ببەخشـێو لـە خوا بترسـێو بـڕوای بـە ڕۆژی دوایـی هەبـێ بێگومـان خـوا کاری بـۆ ئاسـان دەکات. وە هەرکەسـێک ڕژدیو چروکـی بـکات و خـۆی وا دەربخـات کە پێویسـتی بە خـوا نیە وە

بـڕوای بـە ڕۆژی دوایـی نەبێـت، ئـەوە بێگومـان ڕێـی ئاسـانی بـۆ سـەخت دەکات.
(١٢٦-١٢٧): ﴿ وَهَٰذَا صِرَاطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا ۗ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِندَ رَبِّهِمْ ۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢٧﴾ ﴾:

واتـە: ڕێگەیەکـی ڕاسـتەو دەیگەیەنێتـەلای خـوا ﷻ وە ڕەزامەندی ئەو، بێگومـان فەرمانو بڕیارەکانـی ڕوون کردۆتـەوە، وە خێـرو چاکـەی لـە یەکتـر جیاکردۆتـەوە، بـەڵام ئـەم درێـژە پێـدانو ڕوون کردنەوەیـە بـۆ هەمـوو کەسـێک نیـە، بەڵکـو تەنهـا بـۆ ﴿ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴾ بێگومـان ئەوانـە فێـر بوونو سـوودیان لە زانسـتەکەیان وەرگـرت وە خوا ﷻ پاداشـتی بـێ پایـانو جوانـی دانـەوە، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ وە بەهەشـت ناوبـراوە بـەماڵی ئاشـتی (دار السـلام) چونکـە هیچ عەیـبو ناتـەواویو خەمو خەفەتـی تێـدا نیـە، وە جگـە لەوانـە هەرشـتێک کـە مـرۆڤ خەمبـار بـکات، وە ئـەوە وا پێویسـت دەکات کـە خۆشـیەکانی بەهەشـت لە ئەو پـەڕی تەواویـدان، بە شـێوەیەک کە هیـچ وەسـفکەرێک لـە توانایـدا نیە وەسـفی بکات، وە لەسـەرووی ئـەوەوە ئـاوات بە هیچ ناخـوازرێ، لە خۆشـیو چێـژی ڕووحو دڵو جەسـتە، وە پێیـان دەدرێ ئـەوەی کە نەفسو دەروون چێـژی لێوەردەگـرێو چـاو لەزەتی لێدەبینـێ، وە بۆ هەتا هەتایی تیایـدا دەمێننەوە، ﴿ وَهُوَ وَلِيُّهُم ﴾ کـە پشـتیوانیان لێـدەکاتو کارەکانیـان بـۆ ڕێکدەخـات، وە لەهەمـوو کارەکانـدا نەرمو نیانـە لە گەڵیاندا، وە پشـتیوانیان دەکاو وە هەموو هۆکارەکانیان بۆ ئاسـان دەکات، دەیـان گەیەنـێ بـە خۆشەویسـتی ئـەو، لە بـەر ئـەوە پشـتیوانیان دەکات بە هۆی کـردەوە چاکەکانیانـەوە، وە ئـەو پێشـینانەی کە مەبەسـتیان تیایدا ڕەزامەندی خـوا بووە، بە پێچەوانەی کەسـێک کە پشـتی لـە پەروەردگـاری کردبێو شـوێنی هـەواو ئارەزووەکانی کەوتبـێ، بەڕاسـتی ئەوکەسـە شـەیتان بـە سـەریدا زاڵ بـووەو پشـتیوانی لێکـردوەو دینو دنیای تێـک داوە.

(١٢٨-١٣٥): ﴿ وَهَٰذَا صِرَاطُ رَبِّكَ مُسْتَقِيمًا ۗ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ لَهُمْ دَارُ السَّلَامِ عِندَ رَبِّهِمْ ۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢٧﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ قَدِ اسْتَكْثَرْتُم مِّنَ الْإِنسِ ۖ وَقَالَ أَوْلِيَاؤُهُم مِّنَ الْإِنسِ رَبَّنَا اسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَا أَجَلَنَا الَّذِي أَجَّلْتَ لَنَا ۚ قَالَ النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ ۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٢٨﴾ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعْضَ الظَّالِمِينَ بَعْضًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٢٩﴾ يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا شَهِدْنَا عَلَىٰ أَنفُسِنَا

﴿ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُواْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾ ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَـٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَـٰتٌ مِّمَّا عَمِلُواْ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾ وَرَبُّكَ ٱلْغَنِىُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۚ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَـَٔاتٍ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ قُلْ يَـٰقَوْمِ ٱعْمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَـٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ﴾ واتـە: هەمـوو مـرۆڤو جنۆکـەکان، ئـەوەی گومـڕا بووەو ئەوەشـی کەسـانی تـری بێ بـڕوا کردوە، بـە سـەر کۆنەکردنەوە بەو جنۆکانـەی کـە مرۆڤەکانیـان لە ڕێ دەر کـردوەو شـتە خراپەکانیان لە پێـش چاویان جوان کـردوەو هانیـان داون بۆ سـەرپێچیکردن پێیان دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ قَدِ ٱسْتَكْثَرْتُم مِّنَ ٱلْإِنسِ ﴾ واتـە: لـە گومڕاکردنیـانو ڕێگرتنیـان لـە بڵاوبوونـەوەی بانگـەوازی خوا، چـۆن دەستپێشـخەریتان کـرد بەسـەر قەدەغەکراوەکانـدا، وە بوێریتـان کـرد لـە دژایەتی پێغەمبەرانـم ﷺ، وە هەسـتان بـە دژایەتیکردنـی خوا ﷻ، هەوڵتـان دەدا خەڵکی لـە ڕێگای خـوا ﷻ لابـدەنو بـەرەو دۆزەخی ڕەوانە بکـەن؟ ئەمرۆ نەفرینو سـزای من پێویسـت بوو لەسـەرتان، وە سـزاتان زیاتـر دەکەین بە پێی بـێ بڕوایی کردنتانو لـەڕێ لادانی خەڵکیتان، وە هیـچ بیانوویەکتـان نیـە بیهێننـەوەو هیـچ پەناگەیەکیشـتان نیـە تـا بۆی بـڕۆن، وە هیچ تکاکارێکیـش نیـە تکاتـان بـۆ بـکات، وە پاڕانەوشـتان گوێـی لـێ ناگیرێـت، با پرسـیار نـەکات ئـەو کاتـەی کـە سـزاو سەرشـۆڕیان بۆ پێویسـت دەبـێ، لەبـەر ئەوەیـە خوا ﷻ باسی هیچ بیانوویەکیانی نەکردوە.

بـەڵام دۆسـتانیان لە مرۆڤـەکان بیانووی وەرنەگیراویـان هێنایـەوە، وتیان: ﴿ رَبَّنَا ٱسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ ﴾ واتـە: هەریـەک لـە جنۆکـەو مـرۆڤ کەڵکیـان لەیەکتـر وەرگـرتو بەهرەمەنـد بـوون، جنۆکـە کەڵکـی وەر دەگـرت بـە گوێڕایەڵـی مـرۆڤو بەندایەتـی کردنـیو بـە گـەورە زانینـیو پەنـا بـۆ بردنـی، مرۆڤیـش کەڵکـی وەرگرت بە بەدەسـت هێنانـی ئامانجەکانـی، بـە پێـی خزمەتکردنی جنۆکـە بۆی لـە هەنـدێ ئارەزووەکانی. مرۆڤ جنۆکـەی دەپەرسـت، لـە بەرانبـەردا جنۆکـە خزمەتی دەکـردو هەنـدێ لە پێویسـتیەکانی دنیـای بـۆ فەراهـەم دەهێنا. واتـە: تاوانمـان کـردو تـازە ڕەت ناکرێتەوە.

﴿ وَبَلَغْنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِىٓ أَجَّلْتَ لَنَا ﴾ واتـە: ئـەو تەمەنـەی تـەواو بەسـەرمان بـردو هـەق وابوو

بگەڕێینـەوە، ئیسـتا بە ویسـتی خۆت چیمـان پێدەكەی بیكـە، وە دادوەری لـە نێوانماندا بكە چـۆن دەتـەوێ، بەڕاسـتی هیچ بەڵگـەو بیانوومان بە دەسـتەوە نەمـاوە، فەرمـانو بڕیار تەنها لـە لای تۆیـە، ئـەم قسـەیە جـۆرێ لە ملكەچـی خۆبەكـەم زانینـی تێدایـە، بەڵام لـە كاتی خۆیـدا نیـە، بۆیـە خـوا ﷻ بـە دادپـەروەری خـۆی بڕیاریـان لـە نێوانـدا دەدات، كە هیچ سـتەمێكی تێدا نیـە، دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلنَّارُ مَثۡوَىٰكُمۡ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ﴾.

ئـەم بڕیـارە لـە ئەوپـەڕی زانسـتو حیكمەتـی خـواوە دەرچـوە، ئـەم ئایەتەی بەم ڕسـتە كۆتایـی پێهێنـاوە، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴾ وەک چۆن زانسـتی دەوری هەمـوو شـتەكانی داوە بە گشـتی، بـە هەمان شـێوە دانایـی هەمـوو شـتەكانی گرتوەتەوەو پۆشیویەتی.

﴿ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعۡضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعۡضَۢا بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾ واتـە: وەک چـۆن دەسـەڵاتی جنۆكەمـان زاڵ كـرد بـۆ گومڕاكردنـی دۆسـتەكانیان لـە مرۆڤـەكان، وە گرێبەسـتمان لـە نێوانیانـدا كـرد لەسـەر بنەمـای هـاوكاریو پشـتیوانی، بـە هۆی ئـەو كارە ناپەسـەندو خراپانـەی دەیانكـرد. بـە هەمان شـێوە لـە سـوننەتی ئێمـەدا ئەوەیـە هەموو سـتەمكارێک سـتەمكارێكی تـری بـۆ دیـاری دەكەیـن هاوشـێوەی خـۆی پشـتیوانی لـێ بـكات، هانی بـدات بـۆ خراپـەو بەرگـری لـێ بـكات، وە دوری بخاتـەوە لـە چاكـەو لـە پێـش چاوی ناشـرینی بـكات، ئـەوەش یەكێكە لە سـزا گەورەكانـی خوا ﷻ، كە شـوێنەواری ناشـرین بـە جێدەهێڵـێو زۆر مەترسـیدارە. وە تـاوان تاوانـی سـتەمكارە، ئـەو خۆی زیانـی لە خۆی داوە، چونكـە ﴿ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ﴾فصلـت.

بـە هەمـان شـێوە ئەگـەر تـاوانو سـتەمو خراپەكاریـان زۆر بـوو، وە ڕێگریـان كـرد لەو مافانەی كە لەسـەر شـانیانە، خوا ﷻ سـتەمكارێک دەكاتە دەسـەڵاتداریان بۆ ئەوەی سزایان بـداتو بـەزۆرو سـتەمیان لـێ قەدەغـە بكات چەنـد ئەنـدازەی ئـەوەی كە مافـی خوا ﷻ و بەندەكانیـان نـەداوە بـە شـێوەیەک لەسـەری پاداشـت وەر نەگـرن، وەک چـۆن ئەگەر بەنـدەكان خۆیـان چـاک بكەنو بـەردەوام بن خـوا ﷻ پێشـەواكانیان بۆ چـاک دەكاتو دەیانگێڕێـت بـە پێشـەوای داد پەروەرو بـە ویژدان، نەک دەسـەڵاتداری سـتەمكارو خوێن مژ.

پاشـان خـوا ﷻ سـەر زەنشـتی هەمـوو ئەوانـە دەكات كە پشـت لە هـەق دەكـەنو ڕەتی دەكەنـەوە، لـە جنۆكـەو مرۆڤـەكان، وە هەڵەكانی بـۆ ڕوونكردونەتەوە، دانیان بـەوەدا ناوە،

دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَـٰتِي ﴾ دەقـە ڕوونو ئاشـكراکان کـە بـە درێـژی باسـی فەرمـانو قەدەغەکـراوەکانو خێـرو شـەڕو پەیمـانو ترسـاندنیان تێدایـە، ﴿ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَـٰذَا ﴾ وە فێرتان دەکەن کـە ڕزگـار بـوونو سـەرکەوتن تیایـدا تەنهـا بـە فەرمـان بـەرداری فەرمانەکانـی خـواو دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغەکراوەکانـی دەبێـت، وە بەدبەختیو سـەر لێشـێوان لە لەدەسـت دانـی ئەوانـەدا دەبـێ، ئەوانیـش دانیـان بـەوەدا نـاو ﴿ قَالُواْ ﴾ (وتیـان:) بەڵـێ ﴿ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَاۖ وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا ﴾ بـە جوانـیو ڕازاوەیو بریقـەی، وە چێـژی، پێـی ڕازی بوون هەتا دووری خسـتنەوە لـە دواڕۆژ ﴿ وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَـٰفِرِينَ ﴾ بەڵگـەی خوایـان لەسـەر پێویسـت بوو، تا گشـت کەس پێی زانـی تەنانەت خـودی خۆیان خـوا ﷻ لەگەڵیانـدا دادگـەری نوانـدو، پێیانی فەرمـوو: ﴿ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ ﴾ لـە کۆمەڵی ﴿ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ ﴿٣٨﴾ ﴾الأعـراف.

وەک پیشـەی ئەوانیـان کـرد، بـە دینـی ئێـوە و بەهرەمەنـد بـوون، وەک چـۆن ئێـوەش بەهرەمەنـد بـوون، وە ڕۆچوون لـە خراپەکاریدا، وەک چـۆن پێش ئێوە ڕۆچوون، بەڕاسـتی ئـەوان زەرەر مەنـد بـوون. واتە: ئەوانەی پێشـین لە ئەوانو ئەوانەشـی کە لـە دوای ئەوانەوە دێـن. چـی دۆڕانێک گەورەتـرە لە دۆڕانی بەهەشـتی پڕ لە نـازو نیعمـەت، وە بێبەش بوون لـە نزیکـی خـوای پەروەردگـار؟! بەڕاسـتی ئـەوان جیـاوازن لە ئەنـدازەدا بـە جیاوازیەکی زۆرو گەورە.

ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا
غَٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ۚ وَمَا رَبُّكَ
بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٣٢﴾ وَرَبُّكَ ٱلْغَنِىُّ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۚ
إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا
يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾
إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَءَاتٍ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ قُلْ يَٰقَوْمِ
ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ
مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ۗ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾
وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا
فَقَالُوا۟ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا ۖ فَمَا كَانَ
لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ
يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْ ۗ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿١٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ
زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ
شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا۟ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ ۖ
وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١٣٧﴾

﴿ وَلِكُلٍّ ﴾ لـه ئـەوان ﴿ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ﴾ بـە پێـی کردەوەکانیـان، چـاک بـێ یـان خـراپ، هەموو کـەس بە پلەی خـۆی شـوین کەوتوو وەک پێشـەوا نیـە، وە کەسـی ئاسـایی وەک سـەرۆکو دەسـەڵاتدار نیـە، وەک چـۆن خـاوەن پاداشــت لــە بەهەشــتدا وەک یەکتــر نیــە، ئەگەر چـی پێکەوەش سـەرکەوتوو بوونو دەچنــە بەهەشــت، لــە نێوانیانــدا جیــاوازی هەیـە، کـەس نازانـی جگـە لـە خـوا ﷻ نەبـێ، لەگەڵ ئـەوەدا هەموویـان ڕازین بەو پلـەی خـوا پێیانی بەخشـیوە.

داوا لــە خــوا دەکەیــن بمــان گێــڕێ لــە ئەهلـی فیردەوسـی بـەرز، کـە خـوا ﷻ دایناوە بۆ ئەوانـەی کە نزیکـن، وە ئەوانەی کـە پاکـو خۆپارێـزن ﴿ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعْمَلُونَ ﴾ پاداشـتی هەمـوو کەسـێ دەداتەوە بـە پێی کردەوەکـەی، وە بەوەی کە لـە نیـەتو مەبەسـتی دەزانـێ، بۆیـە خـوا ﷻ فەرمانی بـە بەندەکان کـردوە بە کـردەوەی چـاکو کـردەوەی خراپـی لـێ قەدەغـە کـردون، بـۆ ئـەوەی ڕەحمیـان پـێ بـکاتو بەرژەوەندیـان بپارێـزێ، ئەگـەر نـا خوا ﷻ بەراسـتی دەوڵەمەنـدو بێنیازە پێویسـتی بە هیچ یەکێـک لـە دروسـتکراوەکانی نیـە، گوێڕایەڵی خواپەرسـتان هیچ سـوودێک بـە خوا ﷻ ناگەیەنـێ، وەک چـۆن سـەرپێچی خراپـەکاران هیچ زیانێکـی پێناگەیەنێـت. ﴿ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ ﴾ بە لـە ناوبـردن ﴿ وَيَسْتَخْلِفْ مِنۢ بَعْدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوْمٍ ءَاخَرِينَ ﴾.

ئەگـەر زانیتـان پێویسـتە ئـەم دونیا بەجـێ بهێڵـن وەک چۆن پیـش ئێوە بە جێیان هێشـت، بـۆ نەوەکانـی دوای خۆتـان، وەک چـۆن پێـش ئێـوە بە جێیـان هێشـتوو چۆڵیـان کرد بۆ ئێـوەو، ئـەی بـۆ ئێـوە پاڵتـان لـێ داوەتـەوە کردوتانە بە شـوێنی مانـەوەی هەتـا هەتایی؟ وە لـە بیرتـان چـوو ئـەم دونیا شـوێنی تێپـەڕ بوونـە نـەک نیشـتەجێ بـوون، بێگومان لە

پێشتانەوەماڵێـک هەیـە هەمـوو نـازو نیعمەتەکانـی تێـدا کـۆ بوەتـەوە، وە پارێـزراوە لە هەمـوو ناتەواویـەک؟ ئەویـش ئـەو شـوێنەیە کـە پێشـین‌و پاشـین هەوڵی بـۆ دەدەن، ئەو شـوێنەی ئەگـەر پێـی بگـەن، ژیانـی بـەردەوام‌و نەبـڕاوە لەوێیـە، ئـەوە ئامانجێکـە هیـچ ئامانجێـک لەوە گەورەتـر نیە، وە داواکراوێک لە سـەرووی هەمـوو داواکراوەکانەوەیە، وە خوازراوێکـە هەمـوو خوازراوەکانـی تر بـە بوونی دەفەوتێ، لەو شـوێنە سـوێند بە خوا ﷻ! ئـەوەی نەفس حـەزی لێ دەکات‌و چـاو چێژی لێ وەردەگـرێ هەیـە، وە وە کێبڕکێکاران کێبڕکێـی لەسـەر دەکەن، لـە چێـژی ڕۆحەکان‌و خۆشـیە نەبـڕاوەکان، نیعمەتی جەسـتەو دڵـەکان، وە نزیـک بوون لـە زاناترینـی پەنهانەکان.

خـوا ﷻ خـاوەن هیمەتێکە پەیوەسـتە بەو شـکۆمەندیانەوە، وە ویسـتێکی هەیە گەیشـتوەتە بەرزتریـن پلـە!! کـێ لـەوە دامـاو تـرە ڕازی بێـت بـە کەمـی، وە کەمتریـن خەمـی بازرگانیەکـی دۆڕاو بـێ. بـا بـە دووری نەزانـێ ئەوکەسـەی بێ ئاگایەو پشـتی کـردوە لە دوارۆژ، کـە نازانێت چەنـدە نزیکەو بە پەلە دێـت ﴿ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَآتٍ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴾ واتـە: ناشـتوانن پەکـی خوا ﷻ بخـەن، وە خۆتـان دەرباز بکەن لە سـزای، چونکـە بەڕاسـتی نێوچاوانتـان لەبـەر دەسـتی خوادایـە، وە ئێـوە لە ژێـر فەرمـان‌و بڕیاری ئەودان.

﴿ قُلْ ﴾ ئـەی پێغەمبـەر ﷺ بە گەلەکەت بڵـێ: ئەگەر بانگەوازت کـردن بۆ لای خوا ﷻ، وە بۆیانـت ڕوون کـردەوە چی بوویانەو چی لەسـەریانە لە مافەکانی، ئەوانیـش لە بەرانبەردا بەرهەڵسـتیان کردو مەلکەچی فەرمانەکانی نەبوون‌و شـوێنی هـەواو ئارەزووەکانیان کەوتن‌و بـەردەوام بوون لەسـەر هاوبەش دانانیـان، ﴿ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ ﴾ واتە: لەسـەر ئـەو حاڵەتـەی کە لەسـەری دەڕۆن‌و پێی ڕازیـن، ﴿ إِنِّي عَامِلٌ ﴾ لەسـەر فەرمانی خوا ﷻ، وە شـوێن ڕەزامەنـدی ئەو دەکەوم.

﴿ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِ ﴾ مـن یـان ئێـوە؟ ئەمـە ویژدانـە لـە شـوێنێکی ئـاوا گـەورەدا، کاتـێ کـە کـردەوەکان‌و ئەوانـەی کـە کار دەکـەن ڕوون کردوتـەوە، وە پاداشـتی گرێـداوە بە تەماشـا کردنـی بینراو، نموونـەی ڕوونـی هێناوەتەوە کـە پێویسـت بـە گلەیـی‌و گازندە نـاکات.

بـە دڵنیاییـەوە زانیوەتـی کـە سـەرنجام چـاک لـە دنیـاو دوارۆژدا بـۆ لەخوا ترسـانە، وە بـڕواداران باشـترین سـەرنجامیان هەیە، وە هەر کەسـێ پشـت لە پەیامی پێغەمبـەران بکات،

سـەرەنجامی تاریـکو خراپـە، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾ هەمـوو ستەمکارێ، ئەگـەر چـی لـە دنیـادا چێـژ وەر بگرێـت، ئـەوە سـەرنجامی نەمـان کۆتاییە {إِنَّ اللهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ حَتَّى إِذَا أَخَذَهُ لم يُفْلِتْهُ} (أخرجه البخاري برقم: (٤٦٨٦)، ومسلم برقم: (٢٥٨٣)).

واتـە: خـوای گـەورە مـاوەی ستەمکار دەدات تاکـو ئـەو کاتـەی دەیگرێت، ئیتـر بەری نادات).

(١٣٦-١٣٩): ﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا فَقَالُوا۟ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَا ۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمْ ۗ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿١٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٍ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ قَتْلَ أَوْلَٰدِهِمْ شُرَكَآؤُهُمْ لِيُرْدُوهُمْ وَلِيَلْبِسُوا۟ عَلَيْهِمْ دِينَهُمْ ۖ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١٣٧﴾ وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾﴾

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات دەربـارەی ئـەوەی کـە بتپەرسـتەکان لـە سـەرینەو ئەوانـەی کـە پێغەمبەریـان ﷺ بـە درۆ دادەنـا بـە هـۆی کـەم عەقڵـیو نەفامیانـەوە، وە خـوا ﷻ هەنـدێ لە خورافیاتەکانیانـی بـاس کـردوە بـۆ ئـەوەی گومڕاییان ئاشـکرا بـکات، وە ئاگـاداری بکاتەوە، دژایەتـی کردنی هاوشـێوەی ئـەو کەم عەقڵانـە بەرانبەر بەو هەقو ڕاسـتیەی کـە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتـی، هەرگیـز لـە کـەداری نـاکات، چونکـە ئەوانە لەو ئاسـتەدا نیـن کە بـەرەو ڕووی هـەقو ڕاستی قسـە بکـەن، پاشـان باسـی کـردوە کـە ئـەوان ﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلْحَرْثِ وَٱلْأَنْعَٰمِ نَصِيبًا﴾وە بەشـێکیان بۆ هاوبەشو پەرسـتراوەکانیان جیا کردبووەوە لـە کاتێکـدا خـوا ﷻ بۆ بەندەکانی دروسـتی کردبـوو، وە بەدیهێنابـوو تابێ بە مایـەی بژێوی بۆیـان، بەڵکـو ئـەوان دوو شـتی ترسـناکیان پێکـەوە کۆکردەوە، بەڵکو سـێ شـتی ترسـناک: منـەت کـردن بوو بەسـەر خوا ﷻ لە دانانی بەشـێک بـۆی لەگەڵ ئـەوەدا بیـرو باوەڕیان وابوو کـە ئـەوەی دەیـدەن بە خـوا ﷻ وەک بەخشـینو کۆمەکیـە لە لایـەن ئەوانەوە.

ئـەو بڕیـارە پـڕ لـە ستەمەیان کـە پێیـان وابـوو ئـەوەی بەشـی خوایـەو بـۆ خوایـە هیچ گرنگیەکیـان پـێ نەئـەداو بەبـای خەیاڵیـان نەدەهـات، ئەگـەر چـی بگەیشـتبایەتە لای بتەکانیـان. وە ئـەوەی بۆ شـەریکەکانیان بڕیاریان دابـوو گرنگیان پێ دەداو دەیان پاراسـت کـە هەرگیـز نەدەگەیشـتە لای خوا.

بـەو شـێوەیە ئەگـەر کشـتوکاڵو بەرهـەمو ئـەو ئاژەڵانەیـان دەسـت بکەوتایە کـە خوای گـەورە بـۆی هێنابوونـە بـوون دەیـان کـرد بـە دوو بەشـەوە: دەیانوت: ئـەم بەشـە بۆ خوا بـە وتەو بیـرو بـڕوای خۆیان، ئەگەرنـا خوای گـەورە هیچ شـتێک وەرناگـرێ کە تاکو تەنهـا بـۆ ئـەو نەبێـت، وە هیـچ کردەوەیـەک وەرناگرێ کە بەشـی کەسـێکی تـری تێدا دابنرێـت، وە بەشـێکی تریـان تایبـەت کردبوو بە بـتو پەرسـتراوەکانیان.

ئـەو بەشـەی کە بـۆ خـوا ﷻ دایان نابـوو ئەگـەر تێکـەڵ ببوایـە لەگـەڵ بتەکانـدا بەبای خەیاڵیانـدا نەدەهـات، دەیانوت: خوا پێویسـتی پێـی نیە، وە ئەوەی بۆ بتو پەرسـتراوەکانیان دیـاری کردبـوو ئەگـەر شـتێکی بـۆ خـوا ﷻ تێـدا بوایـە ڕەتیـان دەکـردەوەو وەریـان نەدەگـرت، وە دەیـان ووت چونکـە بتـەکان هـەژارن پێویسـتە بەشـی خۆیـان بەتـەواوی وەربگـرن. بـە ڕاسـتی ئەمـە خراپترینو سـتەمترین بڕیـارە؟! ئـەوەی دیاریـان کردبوو بۆ دروسـتکراوەکان لـە بەخشـین کۆششـیان تێـدا دەکردو بـە جوانی دەیـان پاراسـت زیاتر لـەوەی کـە دەیان بەخشـی بە خـوا ﷻ.

وە دەگونجـێ ڕاڤەکردنـی ئـەم ئایەتـە لـە فەرمـوودەی صەحیحـدا ئامـاژەی پێکرابـێ لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ دەفەرمـوێ، خـوا دەفەرموێ: {أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ، مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ} (أخرجه مسلم برقم: (٤٦)).

واتـە: مـن بـێ نیازترینی شـەریکەکانم لە هـاوەڵ بۆ دانان، هەر کەسـێک بەشـدارم بکات بە شـتێ ئـەوە وازی لێدەهێنمو لەوەیشـی کە بەشـداری کردوە).

مانـای ئایەتەکـە ئـەوە دەگەیەنـێ ئەوەی کە دایـان نابـوو، وە خۆیان پێ نزیـک دەکردەوە لـە بتەکانیـان، ئـەوە خـۆ نزیـک کردنەوەیەکـی تەواو بـوو بۆ غەیـری خوا، هیچ شـتێکی بـۆ خـوا ﷻ تێـدا نەبـوو، وە ئـەوەی کـە دایـان نابـوو کـە بـۆ خـوا ﷻ بـێ بـە گومانی خۆیـان بەهەمـان شـێوە ئـەوەش ناگا بە خـوای گـەورە، چونکە هاوبەشـی تێدا بـوو لەگەڵ خـوادا ﷻ، بەڵکـو ئـەوە بەشـی بتو پەرسـتراوەکانیان بـوو، چونکە خـوا ﷻ بێنیـازە لێی کردەوەیـەک وەرناگـرێ کـە کەسـێکی تر لـە دروسـتکراوەکانی تێدا بەشـدار بکرێ.

وە لـە گەمژەیـیو گومڕایـی بتپەرسـتەکان ئەوە بـوو شـەیتانەکانیان کوشـتنی ڕۆڵەکانیان بـۆ ڕازاندنـەوە، ئەوانـەی منداڵـە نێرینەکانیـان زینـدە بەچاڵ دەکـرد، بە هـۆی هەژاریەوە، وە مێینـەکان بـە هـۆی ئابـڕو شـەرەفەوە. هەموو ئەوانـە لە فێڵەکانی شـەیتان بـوو، ئەوانەی دەیانەوێـت، تووشـی تیاچـوونو لەناچوونیان بکـەنو ئاینەکەیان لێ بشـێوێنن بە کوشـتنی کەسـانی بێ تـاوان، ئـەو کارەیان دەکـرد کە لـە ئەوپـەڕی خراپی ناشـرینیدابوو.

وە بـەردەوام هاوبەشـەکانیان ئەوانەیـان لـە لا جـوان دەکـردن، هەتـا ڕیشـەی دادەکوتـاو دەبـوو بـە کارێکـی جوانو پەسـەند لـە لایان، وە ئەگـەر خوا ﷻ بیویسـتبایەت ئـەو کارە قێزەونـە نەکـەن، ڕێگـری لە باوکان دەکـرد منداڵەکانی خۆیـان بکوژن، ئـەوە نەیاندەکرد. بـەڵام حیکمەتـی وا پێویسـتی کرد تێوانـی خۆیـانو کردەوەکانیان چۆڵ بـکاتو بەرەبەرە کێشـیان بکات، و پشـت گوێیان بخـات، بۆیە دەفەرمـوێ: ﴿ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴾ واتـە: وازیـان لـێ بهێنـە لەگـەڵ درۆو بوختانەکانیانـدا، خەمیان بـۆ مەخۆ، بێگومـان ئەوان زیان بـە خـوا ﷻ ناگەیەنن.

وە یەکێکـی تـر لـە گومڕاییەکانیـان ئـەوە بـوو ئـەو ئاژەڵانەی کـە خوا ﷻ بـۆی حەڵاڵ کـردوون بەگشـتی، وە کردبویـە ڕۆزیو ڕەحمەتێـک، بـۆ خۆیـان چێـژو سـوودیان لـێ وەردەگـرت، لەخۆیانـەوە بیدعـەو داهێنانـی بـێ بنەمایان تێـدا دەکرد.

وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ
بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ
ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُوا۟
يَفْتَرُونَ ﴿١٣٨﴾ وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ
لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً
فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ
عَلِيمٌ ﴿١٣٩﴾ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓا۟ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ
عِلْمٍ وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّوا۟
وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ۞ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ
مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا
أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۚ
كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ۖ
وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٤١﴾ وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ
حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟
خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾

ئەوان لە لایەن خۆیانەوە هەندێ زارەوەیان دانابوو بۆ ئاژەڵەکان، دەیانوت: ﴿وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ﴾ واتە: حەرامە ﴿لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ﴾ واتە: دروست نیە کەس لێی بخوا کەسانێک نەبێ مەگەر خۆمان بمانەوێ، یان بە شێوەیەک وەسفی بکەین -لە لایەن خۆیانەوە.

هەموو ئەمانە بە گومانی خراپی خۆیان بوو بە بێ بەڵگەو دەلیل، بێجگە لە هەواو ئارەزووە پووچو بێ ماناکانیان نەبێ.

وە ئاژەڵانێک بە هیچ جۆرێ قەدەغە نییە، بەڵکو ئەوان بە ویستی خۆیان پشتیانیان قەدەغە کردبوو بۆ سوار بوونو باریان لێ بنرێت، وە دەیانپاراستن ناویان نابوون (الحام)[٥]. وە ئاژەڵو ماڵاتێک لە کاتی سەربڕیندا ناوی خوایان لەسەر نەدەهێنا، بەڵکو ناوی بتەکانیان لەسەر دەهێنا، وە ئەوانەی کە دەیپەرستن لە غەیری خوا ﷻ، وە هەموو ئەو کردارانەیان دەدایە پاڵ خوا، بەراستی ئەوان درۆزن بوون لەو بووختانەی کە کردیان.

﴿سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُوا۟﴾ لەسەر خوا ﷻ لە حەڵاڵ کردنی هاوبەش دانان، وە قەدەغە کردنی حەڵاکراوەکان لە خواردن ئەو شتانەی سوودو قازانجیان هەیە.

وە یەکێکی تر لە ڕەفتارە خراپو ناشرینەکانیان ئەوە بوو، هەندێ ئاژەڵو ماڵاتیان دیاری دەکرد دەیانوت ئەوەی کە لە سکی دایە حەرامە لەسەر ئافرەتان بێجگە لە نێرینەکان، دەیانوت: ﴿مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا﴾ واتە: حەڵاڵە بۆیان نابێ ئافرەتان تیایدا بەشدار بن ﴿وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا﴾ واتە: لە ژنەکانمان، ئەمە ئەگەر بە زیندوویی لە دایک بێ، بەڵام ئەگەر بە مردوویی هاتە دنیاوە ئەوە ئافرەتان تێیدا بەژدارن، واتە: حەڵاڵە بۆ نێرو بۆ مێ ﴿سَيَجْزِيهِمْ﴾ خوا ﷻ

٥) (حام) بریتیە: لە حوشترێکی نێر کە لە پشتی ئەو دە سک پەیدا ببێت. وەرگێر.

﴿ وَصۡفَهُمۡ ﴾ وەسفی شتێکیان کردوە کە خوا ﷻ حەڵاڵی کردوە، بەڵام ئەوان حەرامیان کردوە، وە پێناسەی حەڵاڵیان بە حەرام کردوە پێچەوانەی شەرع و یاسای خوا جوڵاونەتەوە، بۆیە ئەو شتە قیزەونەیان داوەتە پاڵ خوا ﴿ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ ﴾ کە مۆڵەتی پێداون لەسەر ئەو گومراییە بەردەوام بن.

﴿ عَلِيمٌ ﴾ بە ئەوان هیچ نهێنیەکی لێ ناشاردرێتەوە، وە زانایە بە هەموو کارو کردەوەکانیان وەبەوەی کە دەیڵێن و درۆی بەدەمەوە دەکەن، وە ئەویش لێیان خۆش دەبێ و ڕزق و ڕۆزیان دەدات.

(١٤٠): ﴿ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوۡلَٰدَهُمۡ سَفَهَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفۡتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِۚ قَدۡ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ١٤٠ ﴾

پاشان خوا ﷻ گەمژەیی و بێ عەقڵی و زیان باری ئەوانی ئاشکرا کردوە وەک دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوۡلَٰدَهُمۡ سَفَهَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖ ﴾ واتە: زیان بار بوون و عەقڵ و ماڵ و ئاینیان لەدەستداو گومرا بوون بەو کارە گەوجانەی کە کردیان. ﴿ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ﴾ واتە: کە خوا ﷻ کردبوویە میهرەبانی و ڕزق و ڕۆزیەک بۆیان، بەڵام ئەوان بەخشندەیی خوایان ڕەت کردەوە، بەڵکو بەوەشەوە نەوەستان تا حەرامیان کرد کە ئەوە لە حەڵاڵترینی حەڵاڵەکانی خوا ﷻ بوو. وە هەموو ئەمانە ﴿ ٱفۡتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ﴾ واتە: درۆیەکە کە هەموو بێ بڕوایەکی سەرسەخت هەڵی دەواسێ. ﴿ قَدۡ ضَلُّواْ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴾ واتە: بەڕاستی ئەوان گومرا بوون بە گومرابوونێکی دوور, وە لە هیچ شتێک لە کارەکانیاندا ڕێنموویی و هیدایەت نەدرابوون.

(١٤١): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٖ مَّعۡرُوشَٰتٖ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖۚ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ١٤١ ﴾:

کاتێک کە خوای گەورە باسی ڕەفتاری بتپەرستانی کرد لە زۆرێک لەوانەی کە خوا ﷻ حەڵاڵی کردوە لە کێڵگەو ئاژەڵەکان، ئنجا باسی فەزڵ و نیعمەتەکانی خۆی دەکات بەسەریانەوە، وەکاری ئەوان لە کێڵان و ئاژەڵەکان دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٖ ﴾ واتە: جۆرەها باخ و باخات و ڕووەکی جیاواز. ﴿ مَّعۡرُوشَٰتٖ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ ﴾ واتە: هەندێکیان بەسەر هەندێکی ترەوەیە، هەندێکیان داربەستیان دەوێ و هەندێکی دیکە نایەوێ.

وە ئەمــە ئاماژەیەکــە بۆ زۆری خێرو قازانجیــان، وە خوای گەورە بەندەکانــی فێر کردوە کە چۆن کەپریــان بۆ دەکەنو ســوودیان لێوەردەگــرن، ﴿ وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ ﴾ واتــە: هەمــووی لە جێگــای خۆیدا، وە لەیــەک ئاو دەخۆنــەوە، خوای گــەورە فەزڵی هەندێ لــەو خواردنانەی داوە بەســەر هەندێکــی تریاندا، وە خوا ﷻ خورماو کشــتوکاڵەکانی تایبەت کــردوە لەســەر جیــاوازی زۆرو جۆری قازانجیــان، وە لەبەر ئــەوەی ســەرچاوەی بژێوین بۆ زۆربەی دروستکراوەکان.

﴿ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهٗا ﴾ لــە دارو درەختیــدا ﴿ وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖۚ ﴾ لە بەرهەمو تامیــدا، وەک ئــەوە وایــە بوتــرێ خوای گــەورە ئەم باخو باخاتەی بۆ دروســت کــردوە، وە ئەمانــەی بــۆ داوەتە پاڵــی؟ هــەواڵ دەدات کە بەدیهێنــاوە بۆ قازانجــی بەندەکان ﴿ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ ﴾ واتــە: دار خورمــاو کشــتووکاڵ ﴿ إِذَآ أَثۡمَرَ وَءَاتُواْ حَقَّهُۥ يَوۡمَ حَصَادِهِۦۖ ﴾ واتــە: مافــی کشــتووکاڵ بــدەن کــە بریتیە لــە زەکات کــە بگاتە ئەنــدازەی پێویســت کە شــەرع بــۆی دیــاری کــردوە، فەرمانــی کردوە لــە کاتــی خۆیــدا زەکاتەکە دەربکــرێ لەو ڕۆژەی کــە دروێنــە دەکــرێ، لەبــەر ئــەوە دروێنــەی کشــتوکاڵ بــە پلــەی ســاڵ بۆ ســاڵ دێ. چونکــە لەکاتــی دروێنــەدا چــاوو دەروونــی هــەژاران بــۆی دەڕوانــێ، وە دەرکردنــی لــەو کاتــەدا ئاســانتر دەبێ لەســەر خاوەنەکــەی، وە خــوا کە دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ ﴾ ئــەم دەقــە هەمــوو زیادەڕەویــەک دەگرێتەوە لــە خواردنــدا، ئەویش بریتیــە لــە تێپەڕاندنی ســنوری ئاســایی، وەک خــاوەن کشــتوکاڵەکە ماڵەکــە بــە شــێوەیەک بخوات کــە زەرەرو زیــان بە دەرکردنــی زەکات بگەیەنــێ، هەروەها زێــدەڕەوی کردن لە دەرکردنــی زەکاتدا، بــە شــێوەیەک کــە زیاد لە پێویســت زەکاتــی ماڵەکــەی دەربکاتو زیــان بە مــاڵو منداڵی خــۆی بگەیەنــێ، هەمــوو ئەمانە لــە چوارچێــوەی زێدەڕەویــدان کە خــوا ﷻ قەدەغەو نەهی لێکــردوەو خۆشــی نــاوێ، بەڵکو ڕقی لێدەبێو خەشــمو قینی بەســەرا دەبارێنــێ، وە ئەم دەقە بەڵگەیە لەســەر پێویســت بوونی دەرکردنی زەکات لە بەروبوومەکاندا، وە کشــتوکاڵ ســاڵی بەســەردا نایــەت، بەڵکــو ســاڵی ئەو دروێنــە کردنــە لەکاتی خۆیــدا، وە خورمــاش لە کاتی پێگەیشــتنیدا. بێگومــان دووبارە زەکاتــی دەرناکاتەوە ئەگەر چەند ســاڵێک لای خاوەنەکەی بمێنێتــەوە بەمەرجێک مەبەســتی پێی بازرگانــی نەبێت، چونکە خوا ﷻ فەرمانــی پێنەکردوە زەکاتەکــەی دەربــکات تەنها لــە کاتی دروێنــەدا نەبێ.

وە ئەگــەر ئافــاتو نەخۆشــیەکی هــات بەســەردا پێش ئــەوە بەبێ کــەم تەرخەمــی لەلایەن

خـاوەن چێنـراوی بەروبوومەکـەوە، ئەوە نابێژێـرێ، وە دروسـتە لە خورمـاو بەروبوومەکە بخـوات پێـش ئـەوەی زەکاتی لێدەربـکات، ئـەوە بـە زەکات ناژمێردرێـت، بەڵکو زەکات لـەوە دەردەکـرێ کە پـاش ئـەوە دەمێنێتەوە.

وە پێغەمبـەر ﷺ نێـردراوی دەنـارد بـۆ کۆکردنـەوەی بەرهەمـەکان، فەرمانـی پێدەکرد کە بـۆ خاوەنەکـەی سـێ یەک یـان چوار یـەک بەجێبهێڵـێ بە پێـی بەکارهێنانی بـۆ خواردنی مـاڵو منداڵی.

(١٤٢-١٤٤): ﴿ وَمِنَ ٱلْأَنْعَـٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾ ثَمَـٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ۖ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾:

واتـە: لـە نـاو ئاژەڵاندا هەندێکـی بۆ بارسـواریو سـواربوون دەگونجـێ، وە هەندێکی تری بـۆ ئـەوە ناگونجێ، بەهـۆی ئەوەی کـە بچووکـە، وەک مەڕو بـزنو هاوشـێوەکانی ئەمانە سـوود لە گۆشـتو لـە خوریەکەیـان وەردەگیـرێ، ئـەوەی کە بـۆ بارکردنو سـواربوون دەشـێ دەبێ بە دوو بەشـەوە.

بـەڵام ئـەوەی بۆ خـواردنو جۆرەها سـوودی تر دەشـێن ئـەوە هەمووی دەخورێ سـوودی لێوەردەگیـرێ، لەبـەر ئەمەیـە دەفەرمـوێ: ﴿ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ﴾ واتـە: ڕێگاکانـیو کردەوەکانـی مەگرنـە بەر، کە لـەو چوارچێوەیـەدا ئەوەیە هەندێـک لەو شـتانە حـەرام بکـەن کە خـوا ﷻ بۆی حـەڵاڵ کردون.

﴿ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾ فەرمانتـان پـێ نـاکات تەنها بـە زەرەرو خراپەکاریتـان نەبێت. ئەم ئـاژەڵو ماڵاتانـەی کە خوای گـەورە منەتی کـردوە بەسـەر بەندەکانیداو هەمـووی حەڵاڵ کـردوە بەم شـێوەیە درێـژەی پێداوە:

ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾

﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ﴾ نێرو مێ ﴿وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ﴾ بەو شێوەیە، ئەمە چوار دانە، هەموویان لە چوار چێوەی ئەوانەن کە خوا ﷻ حەڵاڵی کردوە، هیچ جیاوازیەک نیە لە نێوان هیچیاندا. بەوانە بڵێ کە بە ویستی خۆیان شتێ حەڵاڵ دەکەنو شتێ حەڕام دەکەن، یان هەندێکی حەڕام دەکەن لەسەر ئافرەتانو حەڵاڵی دەکەن بۆ پیاوان، پێویست بکرێتو بسەپێنرێت بەسەریاندا کە هیچ جیاوازیەک نیە لە نێوان ئەوانەی کە حەڵایان کردوەو ئەوانەی کە قەدەغەیان کردوە: ﴿ءَآلذَّكَرَيْنِ﴾ لە مەڕو بزن ﴿حَرَّمَ﴾ واتە: خوا ﷻ حەڕامی کردوە، ئێوە ئەمناڵێنو ڕەتی ناکەنەوە ﴿أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ خوا ﷻ حەڕامو یاساغی کردوە لە مەڕو بزن، ئەمە وتەی ئێوە نیە، نە قەدەغەکردنی نێرینەو نە قەدغەکردنی مێینە لەو دوو تاقمە، ئەوە ماوەتەوە ئەگەر سک پڕی نێرو مێ بگرێتەوە، یان نادیار بێ، دەفەرموێ: ﴿أَمَّا﴾قەدەغەو حەڕامی دەکەن ئەوەی ﴿ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ مێینەی مەڕو مێینەی بزن بە بێ جیاوازی لە نێوان نێرو مێدا، بە هەمان شێوە ئێوە قسەی لەو جۆرە ناکەن.

ئەگەر ئێوە هیچ کام لەم سێ وتانە ناڵێن، دەی بۆ کوێ دەڕۆن؟ ﴿نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ لەوتەو بانگەشەکانتاندا، گومانی تێدا نیە ئەوان ناتوانن قسەیەکی چاک بکەن کە لە عەقڵدا جێی ببێتەوە، جگە لەیەکێ لەم سیانە نەبێت، تەنها ئەوە دەڵێن: هەندێ لەو ئاژەڵانەی کە خۆیان زاراوەیان بۆی داناوەو حەڕامیان کردوە لەسەر مێیەنەکانیان جگە لە نێرینەکانیان، یان لە کاتێ لە کاتەکاندا حەڕامیان کردوە یان هاوشێوەی ئەو بتانە، کە ئەوەی زانستو زانیاری هەبێت هەست دەکات ئەو ووتانە لە نەفامیو عەقڵێکی لاوازو بۆچونێکی فاسدەوە سەرچاوەی گرتووە، خوای گەورە شتی

لـەو جـۆرەی دانەبەزاندوە، ئەوانیـش هیچ بەڵگەیەکیان بەدەسـتەوە نیە بۆ ئـەو کارە خراپانە. پاشـان بە هەمان شـێوە بۆ حوشـترو مانگاو هاوشێوەکانیشی باسـی کردوە. کاتێک کە پوچی‌و بـێ مانایـی ووتەکانیانـی بـۆ ڕوون بوویـەوە پێیانـی فەرمـوو:- پـێ ووتنێک کە هیـچ فێڵ‌و فرێـک ڕزگاریـان نـاکات ئیلا شـوێنکەوتنی یاسـاو پرۆگرامـی خوا نەبـێ: ﴿أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا﴾واتـە: هیچتـان بـۆ نەماوەتەوە جگە لە بانگـەوازێ نەبێ کـە خۆتانیـش بڕوای پـێ ناکەن، ئەوەیـە کە دەڵێن: بە ڕاسـتی خـوای گەورە بەوە وەسـیەتی بـۆ کردوین وە سـروش‌و نیگـای بۆ کردوین وەک چۆن بـۆ پێغەمبەرانیـش کردویەتی، بەڵکو سروشـی بـۆ کردویـن بە نیگایـەک کە جیـاوازە لەگـەڵ بانگەشـەی پێغەمبـەران‌و دابەزاندنی کتێبـە پیـرۆزەکان، بەڕاسـتی ئەمـە بوختـان‌و درۆ هەڵواسـینێکی ڕوون‌و ئاشـکرایە، کـە هیچ کەسـێ بەلایـەوە نامـۆ نیـە، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيۡرِ عِلۡمٍ﴾ واتـە: لەگـەڵ درۆکردنیـداو درۆکـردن بـەدەم خوای گـەورەوە، مەبەسـتی لـەوەدا ئەوەیـە بەندەکانـی خـوا گومرا بـکاو لـە ڕێگای ڕاسـت دووریـان بخاتەوە بـە بێ هیـچ بەڵگەیەکـی عەقڵـی‌و دەلیلێکـی نەقڵـی.﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەوانـەی کـە هیـچ مەبەسـتێکیان نیە جگە لـە درۆکردن بـەدەم خوای گـەورەوە.

(١٤٥-١٤٦): ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾﴾:

کاتێک کە خوا ﷻ باسـی سەرزەنشـتی بتپەرسـتانی کرد لەسـەر حەڵاڵ کردنی هەندێ لەو حەرامانـە دایانـە پاڵی خـوای گەورە، وە بەرپەرچـی دانەوەو فەرمانی کرد بـە پێغەمبەرەکەی کـە ئـەو شـتانە بـۆ خەڵکـی ڕوون بکاتەوە کـە خـوا ﷻ حەرامی کـردوە لە سـەریان، بۆ ئـەوەی بزانـن غەیـری ئـەوە حەڵاڵـە، وە هەرکەسـێک قەدەغە کـردن بداتە پاڵ خـوا ئەوە درۆزنـەو بەرپـەرچ دەدرێتـەوە، چونکـە حـەرام کـردن دەبـێ تەنها لـە لایەن خـواوە بێ‌و لە سـەر زمانـی پێغەمبەرەکەی بـێ، وەک بـە پێغەمبەرەکەی فەرمـووە: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ﴾ واتـە: خواردنـی حەرام بەبـێ گوێدانە سـوود وەرگرتن لێی‌و بە بـێ خـواردن‌و نەخواردنی.

﴿ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً ﴾مـردارەوە بـوو ئەوەیـە کە گیانـی دەربچێت بەبێ سـەربڕینێکی شـەرعی بێگومـان ئـەوە حـەڵاڵ نیـە. وەک چۆن خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ ﴿٣﴾ ﴾المائدة ﴿ أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا ﴾بریتیـە لـەو خوێنـەی کە لە کاتـی سـەربڕیندا دەردەچێـت، ئـەو خوێنە زیانـی هەیە ئەگەر لەجەسـتەدا بمێنێتـەوە، بەڵام ئەگـەر لـە جەسـتە دەرچوو ئـەوە زیانـی نامێنێو گۆشـتەکە حەڵاڵ دەبـێ. تێگەیشـتن لەم دەقـە ئەوەیـە ئـەو خوێنەی کـە دەمێنێتـەوە لە ناو گۆشـتدا پاش سـەربڕین حـەڵاڵو پاکە.
﴿ أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ ﴾ واتـە: ئـەم سـێ شـتە پیـسو زیـان بەخشـە، خوا ﷻ حەرامـی کـردوە وەک بەزەییـەک بەبەندەکانـی وە بـۆ خۆپاراسـتنێک کـە نزیکی شـتی پیـس نەکەونـەوە ﴿ أَوۡ ﴾ جگـە لـەوەی مەگـەر ﴿ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ ﴾ واتـە: جگە لـەو سـەربڕاوەی بـۆ غەیـری خـوا ﷻ سـەربڕابێ لە بـتو پەرسـتراوەکان کە بتپەرسـتان دەیانپەرسـتن، بەڕاسـتی ئەمـە لەو تاوانو سـەرپێچیانەیە کـە دەرچوونە لـە فەرمانی خوا ﷻ بۆ سـەرپێچیکردن.
﴿ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ ﴾واتـە: لەگـەڵ ئـەو شـتە حـەرام کراوانەدا هەر کەسـێک ناچاربـوو پێی، واتـە: پێویسـتی وای لێکـرد بـە ناچـاری شـتێکی لـێ بخـوات وە بترسـێ لـەوەی نەفسـی تیا بچێت .
﴿ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ ﴾، ﴿ غَيۡرَ بَاغٖ ﴾واتـە: بیـەوێ بیخوات، بەبێ ناچاری وە بەبێ سـنوور تێپەڕانـدن بـەوەی کـە زیاد لـە پێویسـت بخـوات ﴿ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ واتـە: ئەو پەروەردگـاری لێبووردەیـە بەرانبـەر بە هەرکەسـێ کـە حاڵی بـەو شـێوەیەیە. زانایان بیرو ڕای جیاوازیـان هەیـە دەربـارەی ئـەوەی ئایـا ئـەوەی حەرامە تەنهـا ئەوەیە کە لـەم دەقەدا هاتـووەو باسـکراوە، لەگـەڵ ئەوەی هەنـدێ قەدەغەکراو هەیـە تیایدا باس نەکـراوە، وەک دڕنـدەو هەموو چەڕنـووک دارێک لـە باڵندەو هاوشـێوەکانی.
هەندێکیـان دەڵێـن: ئـەم دەقـە دابەزیـوە پێـش حـەرام کردنـی ئەوانـە کـە لـە دەرەوەی دەقەکـە بـە فەرمـوودە حـەرام کـراوە، پێچەوانەی ئـەم تایبـەت (حصر) کردنـە ناکەن کە باسـکراوە تیایـدا، کـە لەدوای ئـەوە قەدەغە کراوە، لەبەر ئـەوە نەیبینیوە لەوەی کە سـروش کـراوە بـۆی لەو کاتـەدا. وە هەندێکیشـیان دەڵێـن: ئەم دەقە گشـتگیرە بۆ هەمـوو ئەوانەی کـە حـەرام کـراوە، بـە ڕاشـکاوی، وە هەندێـک لە واتـای دەقەکـەو هەموو هـۆکارەکان وەردەگیرێت.

بێگومـان لـە وتـەی خوا ﷻ لـە هـۆکاری قەدەغەکردنـی مـردارەوە بوو خوێنو گۆشـتی بـەراز، یـان تەنهـا گۆشـتی بـەراز: ﴿ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ ﴾وەسـفێکی گشـتیە بـۆ هەمـوو قەدەغەکراوێکـی حـەرام کـراو، چونکـە حـەرام کـراوەکان هەموویـان پیسـن، ئەمەش لە پیسـە قیزەونەکانـە کـە خـوا ﷻ حـەرامو یاسـاغی کـردوە لەسـەر بەندەکانـی، وە وەک ڕێزێـک بـە دور بـوون لەوانـەی کە پیسـن.

لـە درێژە پێدانی ئەو شـتانەی کە پیسـنو لە سـوونەتدا حـەرام کراون، بێگومانن سـوننەت قورئان ڕاڤە دەکاتو مەبەسـتی ئاشکرا دەکات.

ئەگـەر خـوا ﷻ لـە خواردەمەنیـەکان هیچـی قەدەغـە نەکردبێ بێجگـە لەوانـەی کە باس کـراوە، وە حـەرام کردنیـش پێویسـتە سـەرچاوەکەی لە لایـەن خواوە بـێ، ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی ئەو بتپەرسـتانەی کـە قەدەغەیـان کرد لەسـەر خۆیان ئەوانـەی کە خوا ﷻ حەڵاڵـی کردبـوو، ئـەوە درۆیـان بەدەم خـواوە کـردوەو وتەیەکیـان داوەتە پـاڵ خوا ﷻ کـە ئـەو نەیفەرمووە.

وە لـە دەقەکـەدا گریمانەیەکـی بەهێـز هەیە ئەگـەر خوا ﷻ باسـی بـەرازی نەکردبایەت، ئەویـش ئەوەیـە میانـەی دەقەکـە پێچەوانـەی وتـەی پێشـووی بتپەرسـتەکانە، لـە حـەرام کردنیـان کـە خـوا ﷻ حەڵاڵـی کردبـوو، وە ڕۆچـوون لـەو کارەدا، بـە پێـی ئـارەزوی هەڵخەڵەتـاوی خۆیـان، ئەویـش لـە ئاژەڵـی ماڵاتـدا بـە تایبەت.

وە هیـچ لەوانـە حـەرام نیـە تەنها ئـەوە نەبێ کـە لە ئایەتەکـەدا باسـکراوە: مرداربـووەوە لە ناویانـدا، وە ئـەوەی لـە پێنـاوی غەیری خـوا ﷻ سـەربڕابێت، بیجگـە لەوانـە، حەڵاڵە. وە دەگونجـێ بۆنـەی بـاس کردنـی بـەراز لێرەدا لەسـەر ئـەم گریمانە، هەنـدێ لـە نەفامەکان بیخەنـە چـوار چێـوەی ئاژەڵـی مـاڵات، ئـەوە جۆرێکـە لـە جۆرەکانـی مـەڕ، وەک چۆن نەفامەکانـی گـاورەکانو هاوشـێوەکانیان وا گومـان دەبـەن، بـە خێـوی دەکـەنو زیـادی دەکـەن وەک چـۆن مـەڕو مـاڵات بەخێـو دەکرێـت، جیـاوازی ناکـەن لـە نێوانـی ئەوو ئاژەڵەکانـی تـردا وەک مـەڕو بزنو هاوشـێوەکانی، بەڕاسـتی ئەمە حەرامو یاسـاغە لەسـەر ئـەم ئوممەتـە بە گشـتی، بەهـۆی بەپـاک ڕاگرتنو پاراسـتنیان.

بـەڵام ئەوەی قەدەغەکراوە لەسـەر خـاوەن کتێبەکان هەندێکـی پاکە، بەڵکو حـەرام کراوە لەسـەریان وەک سـزایەک بۆیـان، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ ﴾ ئەویـش وەک وشـترو ئـەوەی لـەو بچێـت. وە لەسـەریان قەدەغەمـان

کـردوە ﴿ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ ﴾هەنـدێ لە شـوێنەکانی ئەوانیـش: ﴿ شُحُومَهُمَآ ﴾ واتــە: بــەزو چەوریان.

هەمـوو بەزەکانیـان قەدەغـە نەکـرا، بەڵکـو بـەزو چـەوری سـەر سـمتو ناوسـک، لەبەر ئەمـە بـەزی حەڵاڵی جیـا کردوەتـەوە لەوانـە، دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ ﴾واتـە: ئـەو بەزەی تێکـەڵ بە ڕیخۆڵـە دەبـێ ﴿ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ﴾(واتە: یان تێکـەڵ بووبـێو لکابێت بە ئێسـکەوە).

﴿ ذَٰلِكَ ﴾ قەدەغەکـردن لەسـەر جوولەکـە ﴿ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ ﴾واتە: (بە هۆی) سـتەمو دەسـتدرێژیان لەسـەر مافەکانـی خوا ﷻ و مافی بەنـدەکان، خوای پەروەردگار ئەم شـتانەی لێ قەدەغـە کردن، وەک سـزاو تۆڵەیەک.

﴿ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴾ لـە هەموو ئەوانـەی دەیڵێنو کاری پێدەکەینو بڕیاری لەسـەر دەدەین، ئایـا کـێ لـە خـوا ﷻ ڕاسـت بێژتـرە، وە ئایـا کـێ حوکـمو بڕیـاری لـە هـی خـوا ﷻ جوانترو چاکترە.

فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا ۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ ۖ فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ ۚ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾ ۞ قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾

(١٤٧): ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾﴾:

﴿فَإِن كَذَّبُوكَ﴾ واتە: ئەگەر ئەو بتپەرستانە بە درۆیان خستیتەوە، تۆ بەردەوام بە لەسەر بانگەوازەکەت‌و هاندان‌و ترساندنیان، وە هەواڵیان بدەرێ کە خوا ﷻ ﴿ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ﴾ واتە: گشتگیرە بۆ هەموو دروستکراوەکان، دەی پەلە بکەن بۆ ئەو میهرەبانیە بە گرتنەبەری هۆکارەکانی، کە گەورەترین‌و بنەمای بە ڕاستدانانی موحەممەد ﷺ لەو پەیامەی کە هێناویەتی، ﴿وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ واتە: ئەوانەی تاوان‌و ستەمیان زۆرە کە گەیاندوونی بە تووڕەیی خوا ﷻ، کە گەورەترینیان بە درۆ دانانی موحەممەدە ﷺ.

(١٤٨-١٤٩): ﴿سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا ۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ ۖ فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾﴾:

ئەمە هەواڵێکە لەلایەنی خوای گەورەوە کە بێگومان بتپەرستەکان بەڵگە دەهێننەوە لەسەر هاوبەش دانان بۆ خواو حەرامکردنی ئەو شتانەی کە خوا حەڵاڵی کردوە بە قەزاو قەدەر، وە ویستی بەرفراوانی خوای گەورە بۆ هەموو شتێ لە خێرو چاکە دەکەنە بەڵگە بۆ خۆیان بۆ ئەوەی لۆمەو سەرزەنشت لەسەر خۆیان لا ببەن. بێگومان ووتیان: ئەوەی کە خوا ﷻ هەواڵی دا دەربارەیان کە لە داهاتوویەکی نزیکدا دەڵێن وەک چۆن لە دەقێکی تردا ئاماژەی بۆ کراوە: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ﴿٣٥﴾﴾ النحل

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات بێگومـان ئـەم بەڵگەیـە زۆرێ لـە ئوممەتەکانـی پێغەمبەرانیـان پێ خسـتبووە درۆوە دەیانکـرد بـە بەڵگـە بۆ خۆیـان، هیـچ سـوودو قازانجێکـی پێنەگەیاندن، بـەردەوام ئەمـە پیشـەیان بـووە هەتا خـوا لەنـاوی بردنو سـزاو تۆڵـەی ئەوەیان چەشـت. ئەگـەر بەڵگەیەکی ڕاسـت بوایە، ئەوە ڕێگری سـزای لێدەکردنو سـزای بـۆ ڕەوا نەدەبینین، چونکـە خـوا ﷻ سـزای خۆی تەنهـا بۆ کەسـێ بـە ڕەوا دەبینێ شایسـتەی بێـت. زانرا کە ئەمـە بەڵگەیەکـی بـێ بنەماو بـێ باوە لـە چەنـد ڕوویەکەوە:

لەوانـە: خوا ﷻ باسـی کـردوە ئەگـەر بەڵگەو بیانوەکانیان دروسـت بوایە سـزایان لەسـەر پێویسـت نەدەبـوو. وە لەوانـە: بێگومان بەڵگـە دەبێ لەسـەر بنەمایەکی زانستی دابڕێژرێت. وە لەوانـە: ئەگـەر تەنهـا پشـت بـە گومانو بـە گۆترە وتـن ببەسـتێت کە هیـچ کەڵکو سـوودێکی نیـە لـە زانینی هەقو ڕاسـتی، ئەوە بێ بنەمـاو بەتاڵە، بۆیـە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ﴾ ئەگـەر ئـەوان زانسـتو زانیاریان هەبووایە لـە کاتێکدا ئـەوان سەرسـەخترین دوژمـن بـوون- دەریـان دەخسـت، کاتـێ کـە دەریـان نەخسـتو ئاشـکرایان نەکـرد، دەرکـەوت ئـەوان هیـچ زانیاریەکیان پـێ نیە.

﴿ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴾ هـەر کەسـێک بەڵگەکانـی لەسـەر گومـانو درۆ دابڕێژرێـت، ئـەوە پـووچ دۆڕاو سەرلێشـێواوە، ئـەی دەبـێ چـۆن بـێ ئەگەر کەسـێ لەسـەر گومڕایـیو سەرکەشـیو شـەڕو خراپـە بونیـادی بنـێ؟

لەوانـە: بێگومـان بەڵگـەی خـوا ﷻ بەهێـزە بیانـووی بـۆ هیـچ کەسـێ نەهێشـتوەتەوە، کـە پێغەمبـەرانو کتێبـە ئاسـمانیەکانو عەقڵـە ژیـرەکانو سروشـتە پاکـەکانو ڕەوشـتە بەهێـزەکان، لەسـەری یەکدەنـگ بـوون، بۆیـە دەرکەوتـووە هەرکەسـێ پێچەوانـەی ئەم بەڵگانـە بجوڵێتـەوە، بەڵگـەی یەکلاکـەرەوە، ئـەوە بـێ بنەماو پووچـە، چونکـە پێچەوانەی ڕاسـتی پـووچو بـێ بنەمایە.

لەوانـە: خـوا ﷻ تواناو دەسـەڵاتێکی داوە بە هەموو کەسـێ کە دەتوانی ئەرکی سـەر شـانی خۆی بەجێبهێنێ.

خـوا ﷻ هیچ شـتێکی پێویسـت نەکـردوە لەسـەر بەندەکەی کە لـە توانایدا نەبـێ. وە هیچ شـتێکی لـێ قەدەغـە نەکـردوە کە لە توانایـدا نەبێ. بەڕاسـتی بەڵگـە هێنانەوە لـە پاش ئەمە بە قـەزاو قەدەر سـتەمێکی ڕوونو سەرکەشـیەکی دیارە.

وە لەوانـە: خـوا ﷻ بەزۆر کردەوەکان بەسـەر بەندەکانیدا ناسـەپێنێ، بەڵکـو کردەوەکانیان

شـوێنی ویسـتو ئارەزووەکانیـان دەکەوێـت ئەگـەر بیانەوێـت ئەنجامـی دەدەن، وە ئەگەر بیانـەوێ دەسـتی لـێ هەڵدەگـرن. ئەمـە شـتێکی ڕوونو ئاشـکرایە نکوڵی لێنـاکات مەگەر کەسـێکی لـووت بەرزبێتو پێچەوانەی ڕاسـتی بجوڵێتەوە، بێگومان هەموو کەسـێ جیاوازی دەکات لـە نێـوان جوڵـەی ئارەزوومەندانـەو جوڵـەی زۆرداری، لەگـەڵ ئـەوەدا هەمووان لە چـوار چێوەی ویسـتەکانی خـوای گـەورەدان. وە لەوانە: ئەوانـەی بەڵگە دەهێننەوە لە سـەر سـەرپێچیەکانیان بـە قـەزاو قـەدەر، پێچەوانـەی ئـەوە دەجوڵێنـەوە. ئـەوان ناتوانـن ئەوە لە خویـان دور بخەنـەوە، بـە ڵکـو ئەگـەر کەسـێک خراپەیـان بەرانبەر بـکات بەلێـدان، یان بردنـی مـاڵ یـان هاوشـێوەی ئـەوە، بەڵگـە بـە قـەزاو قـەدەر بهێنێتـەوە، ئـەو بەڵگەیەیان لێوەرنەدەگـرت بەڵکـو لێـی تـووڕە دەبوون بـە توندترین شـێوە.

ئـای چەندە سـەیرە، چـۆن دەیکەن بـە بەڵگە بۆ سـەرپێچیکردنو سـنور بەزاندنـی خوا ﷻ وە ڕازی نابـن بـۆ هیچ کەسـێ بەڵگـە بهێنێتەوە لـە بەرانبەر تـووڕە بوونیاندا؟!

وە لەوانـە: بەڵگەهێنانەوەیـان بەقـەزاو قـەدەر مەبەسـتیان پێـی ئەوە نەبـووە بەڵگـە بەقەزاو قـەدەر بهێننـەوە، وە دەیـان زانـی ئـەوە نابێتـە بەڵگەو بیانـوو، بـەڵام تەنها مەبەسـتیان ئەوە بووە بەرپەرچی هەقو ڕاسـتی بدەنەوە، بەشـێوەیەک تەماشـای هەقیان کردوە وەک شـتێک بەدەسـتی خۆیـان بەکاریـان هێناوە، بۆ هەر شـتێ کـە بەدڵیـان نەبووبێ ڕەتیـان کردۆتەوە پێـی ئەگـەر بیانیـش زانیایە کـە هەڵەیە.

(١٥٠): ﴿ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ ۚ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾ ﴾:

واتـە: (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بـەو کەسـانە بڵـێ کـە حەڕامکراوەکانـی خوایـان حـەڵاڵ کـردوەو دایانەتـە پاڵ خوای گـەورە شـایەتەکان ئامادە بکـەن ئەوانەی کە شـایەتی دەدەن خـوا ﷻ ئەمـەی حـەڕام کردوە.

ئەگـەر ئـەم ووتەیان پـێ وترا ئەوا ئـەوان دەکەونـە نێـوان دوو کەوانەوە: یـان ئەوەیە هیچ شـایەتێک ناهێنـن بۆ ئەو مەبەسـتە ئـەوکات بانگەوازەکەیان بـێ بنەماو بەتـاڵ دەبێو خاڵی دەبێـت لـە شـایەتو بەڵگە. یـان کەسـێک ئامـادە دەکەن شـایەتیان بـۆ بـدات، وە نابێت شـایەتی بدات بـۆ ئەمە ئیلا کەسـێکی بووختان کـەری تـاوان بارنەبێت، کەسـێک کەلەناو خەڵکیـدا شـایەتی لێوەرنەگیرێـت، وە بێگومـان ئەمـە لەوشـتانە نیە کە کەسـانی ڕاسـتگۆو

متمانەپێکـراو شـایەتی بـۆ بـدەن بۆیـە خـوای گـەورە نەهـی کـردوە لـە پێغەمبەرەکەیو شـوێنکەوتووانی دەربـارەی ئـەم شـایەتیە، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِن شَهِدُواْ فَلَا تَشۡهَدۡ مَعَهُمۡۚ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ﴾ واتـە: بتـەکانو خـوا ﷻ پێکـەوە لە هاوشـانی یەکـدا دادەنێن. ئەگـەر ئەوان بـێ بـڕوان بـە ڕۆژی دوایـیو یەکتاپەرسـت نیـن ئـەوە هـەواو ئارەزوویـان لەگـەڵ بیرو باوەڕیانـدا دەگونجـێ، هەروەهـا لـە نێـوان هاوبـەش دانـان بـۆ خـواو بەدرۆدانانـی هەقو ڕاسـتیدا دەژیـن، ئەگـەر کەسـێک ئەمـە پلـەو پایـەی بـێ هەقـی خۆیەتـی کـە خوا ﷻ قەدەغـەی بـکات لەسـەر باشـترین دروسـتکراوەکانی کـە شـوێنی بکـەوێو شـایەتیان بۆ بـدات، بـەو شـێوەیە دەرکەوت کە بـە حەرامکردنیـان لـە حەڵاڵەکانی خوای گـەورە تەنها بەهـۆی هـەواو ئـارەزووە گومڕاکانیانـەوە بووە.

(١٥١-١٥٣): ﴿ قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗاۖ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُم مِّنۡ إِمۡلَٰقٖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكُمۡ وَإِيَّاهُمۡۖ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَۖ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ وَإِذَا قُلۡتُمۡ فَٱعۡدِلُواْ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰۖ وَبِعَهۡدِ ٱللَّهِ أَوۡفُواْۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ﴾:

خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکـەی دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ ﴾ بەوانـەی کـە حەرامکراوەکانـی حەڵاڵ کـردو بـە ڕەوای بینـی ﴿ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡ ﴾ قەدەغـە کردنێکی گشـتگیر بـۆ هەمـوو کەسـێ کـە هەمـوو قەدەغەکـراوەکان لـە خۆبگرێت لە خـواردنو خواردنـەوەو ووتەو کـردەوەکان.

﴿ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗا ﴾ واتـە: نـە کـەم نە زۆر. وە ڕاسـتی هاوبـەش دانان بۆ خـوا: ئەوەیە کە دروسـتکراو بپەرسـترێ وەک چۆن خوا دەپەرسـترێ، یان بەگەورە تەماشـا بکرێ وەک چـۆن خوا بە گەورە تەماشـا دەکـرێ، یان جـۆرێ لـە تایبەتمەندیەکانـی پەروەردگارێتیو پەرسـتراوی بدرێتە پاڵی.

ئەگـەر بەنـدە بەتـەواوی وازی لـە هاوبـەش دانـانو شـیرک هێنـا ئـەوە بەکەسـێکی

یەکتاپەرسـت لە قەڵەم دەدرێ، کەسـێکی دڵسـۆز بۆ خـوا لەهەموو ڕووەکانـەوە، ئەمە مافی خوایەبەسـەر بەندەکانیـەوە کـە بیپەرسـتن‌و هاوەڵـی بـۆ بڕیـار نەدەن.

پاشـان بە گەورەترین ماف دەسـت پێدەکات لە دوای مافی خـۆی دەفەرموێ: ﴿وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾ لـە وتـەو کـرداره چاک‌و جوانـەکان، هەموو وتـەو کردەوەیـەک ببێتە مایەی سـوودو قازانـج بـۆ دایـک‌و باوک یـان دڵخـۆش کردنیـان، بەمە دەوتـرێ چاکـە، ئەگەر چاکـە بوونـی هەبوو ئەوە سـەرپێچی نامێنێ، ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم﴾ لـە نێرو مێیەکان ﴿مِّنْ إِمْلَٰقٍ﴾ واتـە: بەهـۆی هەژاری‌و دەسـت کورتی لـە ڕزق‌و ڕۆزیـدا، وەک چۆن لە سـەردەمی جاهیلیەتـی پێـش ئیسـلام کـە پڕ بـوو لە سـتەم‌و بوونی هەبـوو، ئەگـەر قەدەغە کرابێتـن لـە کوشـتنی منداڵەکانیـان ئـەوە بێگومـان قەدەغەیان لێکـراوە کە بەبـێ هۆیەکی پێویسـت بیانکوژن، یـان منداڵـی غەیری خۆیان لە پێشـترە.

﴿نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ﴾ واتـە: ڕزق‌و بژێـوی هەمـووی دەدەین، ئێـوە ڕزق‌و ڕۆزی خۆتـان‌و منداڵەکانتـان نادەن، لەسـەرتان پێویسـت نیـە ژیانیان تەنـگ بکەنەوە.

﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ﴾ بریتیـە لـە تاوانە گـەورەو قیزەونـەکان ﴿مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ﴾ واتـە: نزیکـی ئاشـکراو نهێنـی مەکەونەوە، کـە پەیوەندی هەیە بـە دڵ‌و ناخەوە. نەهـی کردنـی نزیـک کەوتنەوە لە گوناهـەکان کاریگەر ترە لـە نەهیکردنـی ئەنجامدانیان، بـە ڵکـو قەدەغەکردنەکە پێشـەکی هـۆکارەکان دەگرێتەوە کـە دەیگەیەنێت بـەو گوناهە.

﴿وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ﴾ ئەویـش بریتیـە لە نەفسـی مسـوڵمان لـە نێرو مێ‌و منـداڵ‌و گـەورەو چـاک‌و خـراپ، وە ئـەو بـێ بڕوایەی کـە پەیمانی لەگـەڵ مسـوڵمانان‌دا بەسـتوە. ﴿إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ وەک: زیناکەرێکـی خـاوەن ژن یـان پیاو، وە کەسـێک نەفسـێ بکـوژێ، وە کەسـێ وازی لـە ئاینەکـەی هێنابـێ‌و لە کۆمەڵـی مسـوڵمان جیابووبێتەوە.

﴿ذَٰلِكُمْ﴾ ئـەوەی کـە باسـکرا ﴿وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾ لـە لایـەن خـواوە ﷻ ڕاسـپێرابن، پاشـان بیپارێـزن، پاشـان چاودێـری بکـەن‌و پێـی هەسـتن.

ئـەم دەقـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی بەندە بـە پێـی ئاسـتی عەقڵـی، فەرمانەکانی خـوا بەجێ دەهێنێ.


وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُ
وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا
وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ وَبِعَهْدِ
اللَّهِ أَوْفُوا ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ۝
وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ
فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ
تَتَّقُونَ ۝ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ تَمَامًا عَلَى الَّذِي
أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَاءِ
رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ۝ وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ فَاتَّبِعُوهُ
وَاتَّقُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ۝ أَن تَقُولُوا إِنَّمَا أُنزِلَ الْكِتَابُ
عَلَىٰ طَائِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَافِلِينَ
۝ أَوْ تَقُولُوا لَوْ أَنَّا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْكِتَابُ لَكُنَّا أَهْدَىٰ
مِنْهُمْ فَقَدْ جَاءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ
فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا سَنَجْزِي الَّذِينَ
يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَاتِنَا سُوءَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُوا يَصْدِفُونَ ۝

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ ﴾ بە خواردن یان گۆڕینەوە لەسەر حەزی نەفسو دەروونتان، یان بە بێ هۆكار وەربیگرن، ﴿ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾ واتە: جگە لە بەرژەوەندیو سوودو قازانجی ئەوان نەبێت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروست نیە كە لێی نزیك ببێتەوەو هەڵسو كەوتی پێ بكات بە شێوەیەك كە زیان لە كەسی هەتیوو بدات یان بە شێوەیەك بێ كە نە زیانی بۆی هەبێو نە بەرژەوەندی ﴿ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ﴾ هەتیوو ﴿ أَشُدَّهُ ﴾ تا باڵغ دەبێتو دەگاتە هێزو توانای خۆی وە دەزانێت چۆن مامەڵە بكات.

ئەگەر باڵغو ژیرو پێگەیشتوو بوو ئەو كات ماڵەكەی پێدەدرێو بە ویستی خۆی مامەڵەی پێدەكات. ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە هەتیوو پێش كامڵ بوونی عەقڵو ژیری بەربەستو قەدەغەی دەخرێتە سەر، وە خاوەندارەكەی مامەڵە بە ماڵەكەیەوە دەكات بەباشترین شێوە، ئەم بەربەستە بە پێگەیشتنو كامڵ بوونی عەقڵی هەتیوەكە كۆتایی پێدێت ﴿ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ ﴾ بە دادپەروەریو بێ زیادو كەم ئەنجامی دەدەن.

ئەگەر لەو بوارەدا هەوڵتاندا، ئەوە ﴿ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ واتە: بە پێی توانای وە لێی بەرتەسك ناكرێتەوە، هەر كەسێك سووربێت لەسەر بەئەمەك بوونی لە كێشانەو پێوانەدا، پاشان كەمتەرخەمیەكی لێدەركەوتو زیادەڕەوی تێدا نەكردبوو پێی نەزانیبوو، ئەوە بێگومان خوا لێبووردەو بەخشندەیە، زانا ئوصولیەكان ئەم دەقەیان كردۆتە بەڵگە بەوەی كە خوای گەورە ئەرك ناخاتە سەرشانی هیچ كەسێك كەلە توانایدا نەبێت، وە لەسەر ئەوەی هەر كەسێك لە خوا بترسێت لەوەی كە خوا فەرمانی پێكردوە وە بە پێی توانا كاری پێ

بــکات ئــەوە لەســەرووی ئــەوەوە هیچــی لەســەر نیــە ﴿ وَإِذَا قُلْتُمْ ﴾وتەیــەک کــە حوکمــی خەڵکــی پــێ بکــەن وە لــە وتارەکانــدا درێــژەی پــێ بــدەن ﴿ فَٱعْدِلُوا ﴾لــە ووتەکانتانــدا بــە لەبەرچاوگرتنــی ڕاســتیەکان لــەوەی کــە خۆتــان پێتــان خۆشــەو پێتــان ناخۆشــە. وە بــە ویــژدان بــوون لــە نەشــاردنەوەی ئــەوەی پێویســتە ئاشــکرا بکرێــت. بێگومــان لادان لــەوەی کــە ڕقــت لێیەتــی بەشــێوەیەک کــە قســەی لەســەر بکەیــت ئــەوە ســتەمێکی قەدەغــە کــراوە، بەڵکــو تەنانــەت ئەگــەر زانایــەک قســە لــە ســەر وتــەی خــاوەن بیدعــەکان بــکات، پێویســتە لەســەری مافــی هەمــوو وەک خــۆی دیــاری بــکات، وە ڕوونــی بکاتــەوە چــی ڕاســتەو چــی بــێ بنەمــاو پووچــە، وە چــی لــە هەقــەوە نزیکــەو لێیــەوە دوورە. زانــا فقیهــەکان باســیان کــردوە، پێویســتە لەســەر دادوەر لــە کاتــێ دادگایــی کردنــدا لــە نێــوان دووکەســدا دادپــەروەر بــێ لــە تەماشــاکردنو وتەکانیــدا.

﴿ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُوا ﴾ئەمــە ئــەو پەیمانــە دەگرێتــەوە کــە لــە بەندەکانــی وەرگرتــوە، لــە بەجێهێنانــی مافەکانــیو پاراســتنیان، وە لــەو پەیمانانــەی کــە بەنــدەکان لــە نێــوان یەکتــردا دەیبەســتن، هەمــوو ئــەو پەیمانانــە پێویســتە پارێزگاریــان لــێ بــکات، وە حەرامــە بیانشــکێنێو بەتاڵیــان بکاتــەوە.

﴿ ذَٰلِكُمْ ﴾ ئــەو بڕیــارو فەرمانانــەی کــە باســکراوە ﴿ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ئــەوەی کــە پێــی ســپاردوونو ڕوونــی کردۆتــەوە بۆتــان لــەو فەرمــانو بڕیارانــە، وە هەڵدەســتن بــە بەجێهێنانــی وەســیەتەکانی خــوا ﷻ بــە ئەوپەڕی دڵســۆزیەوە، وە دەزانــن چــی بڕیــارو فەرمانێــک لەخــۆ دەگرێــت. کاتێــک کــە زۆرێک لــەو فەرمانە گــەورەو گرنگانــەی ڕوون کــردەوە ئامــاژەی بــۆ کــرد، وە بــۆ ئــەوەی کــە لەوانــە بەرفراوانتــرە، دەفەرمــوێ: ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا ﴾واتــە: ئــەم بڕیــارو فەرمانانــەو هاوشــێوەکانی کــە خــوا ﷻ لــە کتێبەکەیــدا بــۆ بەندەکانــی ڕوون کردۆتــەوە ئــەوە ڕێگــای ڕاســتی پەروەردگــارە، ڕێگایەکــی کــورتو پوخــتو ئاســانە ﴿ فَٱتَّبِعُوهُ ﴾ تــا ســەرکەوتن بەدەســت بهێنــن و بــە هیــواو ئاواتەکانتــان بگــەن.

﴿ وَلَا تَتَّبِعُوا ٱلسُّبُلَ ﴾واتــە: ڕێگایــەک پێچەوانــەی ئــەم ڕێگایــە بێــت، ﴿ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ﴾واتــە: دوورتــان دەکاتــەوەو جیاتــان دەکاتــەوە بەڕاســتو بــە چەپــدا لــە ڕێگــای خــوا ﷻ، ئەگــەر لــە ڕێگــای ڕاســت لاتــان دا ئــەوە بــە دڵنیایــی

ڕێگـای دۆزەخ دەگرنـە بـەر، ﴿ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ بێگومـان ئێـوە ئەگـەر فەرمانەکانـی خـوا ﷻ بەجێبهێنـن بەزانسـتو کـردەوە ئـەوە دەبـن بەیەکێـک لـە بەنـدە خوانـاسو سـەرکەوتووەکانی خـوای گـەورە. وشـەی ڕێگـای بەیـەک باسـکردوە وەهەروەهـا داویەتیـە پاڵـی چونکـە تاکـە ڕێگایەکـە کـە مـرۆڤ دەگەیەنـێ بـە خـوای پەروەردگـار.

(١٥٤-١٥٧): ﴿ ثُمَّ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ تَمَامًا عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا۟ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ۗ سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾:

﴿ ثُمَّ ﴾ لـەم شـوێنەدا، مەبەسـت پێـی ڕیزبەنـدی کاتـی نیـە (الترتيـب الزمـاني) بێگومـان سـەردەمی مووسـا پێـش سـەردەمی قورئـان بـوو کـە بـۆ پێغەمبـەر موحەمەد ﷺ دابـەزی، بەڵکـو مەبەسـت پێـی ڕیزبەنـدی هەواڵیـە.

پاشـان خـوا بەخشـیویەتی بـە ﴿ مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ ﴾ بریتیـە لـە تـەورات ﴿ تَمَامًا ﴾ بـە نیعمەتەکانـیو تەواوکردنـی چاکەکانـی بەسـەریەوە، ﴿ عَلَى ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ ﴾ لـە گەڵـی مووسـا، خـوا ﷻ نیعمەتـی ڕشـت بەسـەر چاکەخوازەکانیانـدا بـە جۆرەهـا نیعمـەت کـە لـە ژمـاردن نایـەت. لـە گەورەتریـنو تەواوترینـی ئـەو نیعمەتانـە دابەزینـی تـەورات بـوو بۆیـان، خـوا ﷻ نیعمەتـی خـۆی تەواوکـرد بەسـەریانەوە وە پێویسـتی کـرد لەسـەریان سووپاسـگوزاری بکـەنو بـە چاکتریـن شـێوە بەجێـی بهێنـن، ﴿ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ﴾ هەمـوو شـتەکانی لـە حـەڵاڵو حـەرام بـۆ ڕوون کردنـەوە وە لـە فەرمـانو بیـرو بـڕواو هاوشـێوەکانی ﴿ وَهُدًى وَرَحْمَةً ﴾ واتـە: ڕێنموویـان دەکات بـۆ چاکـەو ڕێگـای خراپیـان پێدەناسـێنێ لـە هەمـوو کاروبارەکانـدا ﴿ وَرَحْمَةً ﴾ خـۆش بەختـیو میهرەبانـی خـۆیو چاکـەی زۆریـان بـۆ فەراهـەم دەهێنـێ ﴿ لَّعَلَّهُم ﴾ بە هـۆی دابەزینی کتێـبو ئەوانـەی کـە ڕوونـی کردۆتـەوە بۆیـان ﴿ بِلِقَآءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴾ بێگومـان ئەوە بەڵگـەی یەکلاکـەرەوە لـە خۆدەگـرێ لـە سـەر زیندووبونـەوەو پاداشـتو کـردەوەکان، کـە ببێتـە مایـەی ئـەوەی بـڕوا بەخـوا بهێنـنو خۆیـان ئامـادە بکـەن.

﴿ وَهَٰذَا ﴾قورئانـــی پیـــرۆز ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ مُبَارَكٌ ﴾واتـــە: خێـــرو چاکەیەکـــی زۆرو زانســـتێکی بەرفراوانـــی تێدایـــە، وە ســـەرجەم زانســـتەکان لـــەو قورئانـــەوە ســـەرچاوە دەگـــرن، هەروەهـــا ســـەرجەم پیرۆزیـــەکان لەوێـــوە ســـەرچاوە دەگـــرن، هیـــچ خێرێـــک نیە ئیـــلا قورئـــان بانگەشـــەی بـــۆ کـــردووەو هانـــی خەڵکـــی لەســـەر داوە وە باســـی گرنگترینـــی بەرژەوەندیەکانـــی کـــردوە، وە هەمـــوو شـــەڕو خراپەیەکـــی لـــێ قەدەغـــە کـــردون و، خەڵکـــی لـــێ ئاگـــادار کردوەتـــەوە، وە باســـی هـــۆکاری ئەنجامـــدان و ســـەرەنجامی خراپـــی کـــردوە ﴿ فَٱتَّبِعُوهُ ﴾بـــەوەی کـــە فەرمانـــی پێکـــردووەو قەدەغـــەی کـــردوە، بنەمـــای ئاینەکەتـــان لەســـەر ئـــەوە دابڕێـــژن ﴿ وَٱتَّقُواْ ﴾واتـــە: خۆپارێزبـــن و لـــە خوابترســـن لـــەوەی بـــە پێچەوانـــەی فەرمانەکانـــی بجوولێنـــەوە ﴿ لَعَلَّكُمْ ﴾ئەگـــەر شـــوێنی بکـــەون ﴿ تُرْحَمُونَ ﴾باشـــترین هـــۆکار بـــۆ بەدەســـت هێنانـــی میهرەبانـــی خـــوا شـــوێنکەوتنی ئـــەم کتێبەیـــە بـــە زانســـت و کـــردەوە.

﴿ أَن تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أُنزِلَ ٱلْكِتَٰبُ عَلَىٰ طَآئِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا ﴾ واتـــە: ئـــەم کتێبـــە پیرۆزەمـــان داگـــرت بـــۆ ئـــەوەی بیانووتـــان ببڕیـــن وە بـــۆ ئـــەوەی نەڵێـــن نامـــەو کتێـــب تەنهـــا بـــۆ دوو دەســـتەی بەرلـــە خۆمـــان دابەزیـــوە کـــە بریتیـــە لـــە جوولەکـــەو گـــاورەکان ﴿ وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَٰفِلِينَ ﴾واتـــە: بڵێـــن کتێبمـــان بـــۆ دانەبەزیـــوە وە ئـــەو کتێبـــەی کـــە بـــۆ ئـــەو دوو دەســـتەیە دامـــان بەزانـــدوە ئێمـــە هیـــچ زانســـت و زانیاریەکمـــان لەســـەری نیـــە.

بۆیـــە خـــوا ﷻ کتێبێکـــی بـــۆ دابەزانـــدوون هیـــچ کتێبێـــک لـــە ئاســـمانەوە دانەبەزیـــوە کـــە هەمـــوو کتێبەکانـــی لـــە خـــۆ گرتبـــێ و ڕوونتـــرو ئاشـــکراتر بـــێ لـــەو کتێبـــە کـــە قورئانـــە ﴿ أَوْ تَقُولُواْ لَوْ أَنَّآ أُنزِلَ عَلَيْنَا ٱلْكِتَٰبُ لَكُنَّآ أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ﴾ واتـــە: یـــان بیانـــوو دەهێننـــەوە بـــەوەی کـــە هیدایەتتـــان پـــێ نەگەیشـــتوە، یـــان بیانـــوو دەهێننـــەوە بـــەوە کـــە بـــە تـــەواوی پێتـــان نەگەیشـــتوە، بێگومـــان لـــە کتێبەکەتانـــدا بنەمـــاو تـــەواوی هیدایـــەت بەدەســـتهاتووە، بۆیـــە دەفەرمـــوێ: ﴿ فَقَدْ جَآءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ ئەمـــە (اســـم جنـــس)ە، هـــەر شـــتێک کـــە هـــەق و ڕوون بـــێ لـــە خـــۆی دەگرێـــت.

﴿ وَهُدًى ﴾لـــە گوومڕایـــی ﴿ وَرَحْمَةٌ ﴾واتـــە: خۆشـــبەختی لـــە دیـــن و دنیاتانـــدا. ئەمـــە ملکەچبوونـــی فەرمانەکانـــی خـــوا پێویســـت دەکات، وە بڕوابـــوون بـــە هەواڵەکانـــی هـــەر کەسێک کـــە درۆی بەدەمـــەوە بـــکات و پێـــی ســـەربەرز نەبێـــت ئـــەوە لـــە ســـتەمکارترینی

ستەمکارەکانە، بۆیە دەفەرمووێ: ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ﴾ واتە: ڕووی لێوەربگێڕێو پشت گوێی بخات.
﴿ سَنَجْزِى ٱلَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ ءَايَٰتِنَا سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ﴾ واتە: ئەو تۆڵەیەی کە خاوەنەکەی ناشرین دەکات لەسەری توونـد دەکات ﴿ بِمَا كَانُوا۟ يَصْدِفُونَ ﴾ واتە: بە هۆی ئەو لادانەیانەوە کە دەیانکرد بۆ نەفسی خۆیانو جگە لە خۆیان، وەک پاداشتێک لەسەر کردەوە ناشرینەکانیان.
﴿ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ ﴿٤٦﴾ ﴾فصلت. ئەم دەقانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە زانستی قورئان گەورەترینو تەواوترینو بەرفراوانترین زانستە، وە تەنها بە قورئان ڕێنمایی بۆ ڕێگای ڕاست بە دەست دێ، ڕێنماییەک پێویست ناکات لە گەڵیدا شوێنی بیرۆکەی فەلسەفەزان بکەوێ، وە هەر زانستێکی تر لە زانستی پێشینو دوایین. بێگومان کتێبی ئاسمانی تەنها بۆ دوو دەستە دابەزیوە لە جولەکەو گاور. بەشێوەیەکی گشتی ئەوان خاوەن کتێبن، هیچ یەکێک لە دەستەکانی تر ناچنە ئەو چوار چێوەیەوە ، نە مەجوس نە هاوشێوەکانیان. وە هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نەفامەکان لەسەری بوون پێش دابەزاندنی قورئان، لە نەفامی گەورەو نەبوونی زانست وەک ئەوەی کە لە لای خاوەن کتێبەکان هەبوو، ئەوانەی کە لە لایان بوو ناوەڕۆکی زانست وە بێئاگا بوون لە خوێندنەوەی کتێبەکان.

هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ
ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا
لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟
إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ
مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ
﴿١٥٩﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ
فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ قُلْ إِنَّنِى هَدَىٰنِى رَبِّىٓ
إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ
مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ
رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ
﴿١٦٣﴾ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِى رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَىْءٍ ۚ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ
نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم
مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ
خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى
مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾

(١٥٨): ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾

﴿ هَلْ يَنظُرُونَ ﴾ خوا ﷻ دەفەرمووێ: ئایا ئەوانەی زوڵمو ستەمو یاخیبونیان بەردەوامە تەماشا ناکەن ﴿ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ﴾ پێشهاتەکانی سزا، وە پێشهاتەکانی دوارۆژ، کاتێ کە دێ بۆ لایان ﴿ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ﴾ بۆ ئەوەی گیانیان بکێشێ، بێگومان ئەوان ئەگەر گەیشتنە ئەو دۆخە، برواهێنانو کردەوەی چاک هیچ سوودێکی نامێنێ ﴿ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ ﴾ بۆ یەکلاکردنەوەی دادوەری لە نێوان بەندەکاندا، وە پاداشتدانەوەی چاکەکارانو خراپەکاران.

﴿ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ﴾ کە بەڵگەیە لەسەر نزیک بوونەوەی ڕۆژی دوایی.

﴿ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ﴾ لە دەرەوەی دابو نەریتە، کە دەزانێت قیامەت نزیک بووەتەوە.

﴿ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ﴾ واتە: ئەگەر هەندێ لە نیشانەکانی خوا دەرکەوت، کەسی بێ بڕوا هیچ سوودێک لە بڕوا هێنانەکەی وەرناگرێ، ئەگەر بروا بهێنێ، وە بە هەمان شێوە نە بڕوادارێکی کەمتەرخەم لەپاش ئەوە خێرو چاکەی زیاتر بکات، بەڵکو تەنها ئەوە سوودی پێدەگەیەنێت لەو بڕوایەیە کە پێشتر هێناویەتی، وە ئەو چاکەش کە پێش بینینی نیشانەکان کردویەتی.

حیکمەت لەمەدا ئاشکرایە، بە دڵنیاییەوە بڕواهێنان کاتێ سوودی دەبێ ئەگەر بڕوایەک بێت لە پەنهانەوە دەرچووبێ، وە بە ویستو هەڵبژاردنی خۆی بێ، بەڵام کاتێ کە ئایەتو نیشانەکانی بینی، ئەوە کار دەگاتە شایەتیدان، ئەوکات بڕواهێنان هیچ سوودێکی

نابێـت، چونکـە لـە بڕواهێنانـی ناچـاری دەچـێ، وەک بڕواهێنانـی کەسـێک کـە دڵنیاییە خنـکاوە لـە نـاو ئاودا، یـان کەسـێک دڵنیا بێت دەسـووتێ لـە ناو ئاگـردا، وە هاوشـێوەی ئەمانـە، کـە مـردن بـە چـاوی خـۆی ببینـێ واز لـەوە بهێنـێ کـە پێشـتر لەسـەری بووە، وەک چـۆن خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوٓا ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ ﴿٨٥﴾ ﴾غافر[١]

بێگومـان فەرمـوودەکان زۆرن لـە پێغەمبـەرەوە کە مەبەسـت لە هەنـدێ نیشـانەکانی خوا، هەڵهاتنـی خـۆرە لـە خـۆر هەڵاتـەوە، وە ئەگەر مرۆڤـەکان ببینن بـڕوا دەهێنـن، ئەوکات بڕواهێنـان هیچ سـودێکیان پێناگەیەنێتو دەرگـای تەوبەو داوای لێخۆشـبوون دا دەخرێت.

لـە کاتێکدا ئەمە هەڕەشـەیەکە بۆ ئەوانـەی پێغەمبەر ﷺ بە درۆ دەخەنـەوەو لە چاوەڕوانیدان، وە ئـەوان چاوەڕوانـی پێغەمبـەرو ﷺو شـوێنکەوتووانی دەکەن بە درێژایی سـاڵ.

﴿ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴾ لـە داهاتوویەکـی نزیکـدا دەزانن کێ شایسـتەی ئاسایشـە. ئەم دەقـە بەڵگـەی شـوێنکەوتووانی مەزهەبـی ئەهلی سـوننەو جەماعەیـە لە جێگیـر کردنی ئەو کردەوانەیـە کـە خـوا ﷻ بە ویسـتی خۆی دەیـکات، لـە (استواء)و دابەزیـنو هاتنی خوا بەبێ تەشـبیە کردن بە سـیفەتی دروسـتکراوەکان.

وە لـە قورئـانو سـوننەتدا دەربـارەی ئـەم بابەتـە شـتی زۆر هەیـە. وە هەروەهـا بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە لە کـۆی نیشـانەکانی هەڵهاتنی خـۆرە لە خـۆر هەڵاتـەوە، وە بێگومان خـوا دانایـە، نەریتو سـوننەتی بـەو شـێوەیە بڕواهێنان لـە کاتێکدا سـوودی هەیـە ئەگەر خاوەنەکـەی بەویسـتی خـۆی بـڕوا بهێنێ نـەک بە ناچـاری، وەک لە پێشـەوە بـاس کرا. وە مـرۆڤ بـە هـۆی بڕواهێنانیەوە چاکـە بەدەسـت دەهێنێـت، گوێڕایەڵـیو خۆپارێزی لە کاتێکـدا سـوودی هەیـەو گەشـە دەکات، ئەگـەر بەندە بـڕوادار بێ. جـا ئەگـەر دڵ بەتاڵ بـوو لـە بڕواهێنان ئـەوە هیـچ سـوودێکی پێناگەیەنێ.

(١٥٩-١٦٠): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ ﴾:

خـوا ﷻ پەیمـان بەوانە دەدات کـە ئاینەکەیان پـەرشو بڵاوکردەوەو بوون بـە بەش بەشو دەسـتە دەسـتەوە، هەر کۆمەڵـەو ناوێکیان بۆ خۆیان دیـاری کردبوو کە هیچ سـوودێکی بۆ

ئاینەکەیـان نەبـوو، وەک: جولەکـەو گاوەرو ئاگرپەرسـتەکان، یان ئیمانی پێـی تەواو نابێ، بەشـێک لە بنەماو یاسـاکانی شـەرع وەربگرێـتو بیکات بە دیـن، وە واز لە هاوشـێوەکانی بهێنـێ، یـان ئەوەی لە پێشـترە، وەک چـۆن ئەوە حاڵی دەسـتەی بیدعـەکارو گومرابوەکانە، ئەوانـەی کـە ئوممەت پەرش‌و بـڵاو دەکەنەوە.

دەقـە پیرۆزەکـە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی کە دیـن فەرمـان دەکات بە یەکگرتـن‌و برایەتی، وە نەهـی دەکات لـە پەرش‌وبـڵاوی‌و جیاوازی لە ناو ئاین دۆسـتاندا، وە لەسـەرجەم بابەت‌و بنەمـاو لقەکاندا.

وە فەرمانـی پێکـردوە کە خۆی بـەری بکات لەوانـەی دینەکەیان پەرش‌و بـڵاو دەکەنەوە، دەفەرمـوێ: ﴿ لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ ﴾ واتـە: نـە تـۆ لـە ئەوانی‌و نە ئـەوان لە تـۆن، چونکە پێچەوانـەی تـۆ جوڵانەتـەوەو یاخـی بـوون ﴿ إِنَّمَا أَمْرُهُمْ إِلَى اللَّهِ ﴾ واتـە: دەگەڕێنەوە بۆ لای خـوا، بە پێـی کردەوەکانیان پاداشـتیان دەداتـەوە﴿ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ ﴾.

پاشـان باسـی سـیفەتی پاداشـت دەکاتـەوەو دەفەرمـوێ: ﴿ مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ ﴾ بـە زمان‌و کـردەوە، ئاشـکراو نهێنـی، کە پەیوەنـدی هەیە بە مافی خـواوە، یان مافی دروسـتکراوەکان ﴿ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ﴾ ئەمـە کەمترین چەنـد بەرانبەرە.

﴿ وَمَن جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰ إِلَّا مِثْلَهَا ﴾ ئەمـە لـە تـەواوی دادپـەروەری‌و چاکـە خوازیەتـی، وە بێگومـان ئـەو سـتەم نـاکات بـە ئەنـدازەی کێشـی گەردیلەیـەک، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ (واتـە: بـە هیـچ شـێوەیەک ئـەوان سـتەمیان لـێ ناکـرێ).

(١٦١-١٦٥): ﴿ قُلْ إِنَّنِي هَدَانِي رَبِّي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٦١) قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ (١٦٣) قُلْ أَغَيْرَ اللَّهِ أَبْغِي رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ ۚ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ (١٦٤) وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ الْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ (١٦٥) ﴾

خـوا ﷻ فەرمـان دەکات بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ بڵێ‌و ئاشـکرای بکات ئەو ڕێبازە ڕاسـتەی کـە لەسـەری دەڕوات، ڕێبازێکی ڕاسـت‌و میانـڕەوە، کە بیـرو بڕوای بەسـوودو کردەوەی چـاک‌و فەرمـان کردن بـە هەموو ئەو شـتەی کە چاکە لە خـۆ دەگرێـت، وە قەدەغەکردن لـە هەمـوو ئەوانـەی کە خراپە، ئـەو ڕێبازەیە کە پێغەمبەرانی پێشـوو لەسـەری دەڕۆیشـتن،

بـە تایبەت پێشـەوای پێغەمبەران، خۆشەویسـتی خـوای میهرەبان ئیبراهیم ﷺ ئـەو ڕێبازو دینـە پاکـە کە لای داوە لـە هەموو دینێکـی لارو لەوێر، لـەو ئاینانەی کە لادانـی تێدا کرا، وەک جولەکەو گاورو بتپەرسـتان.ئەمە گشـتیە پاشـان تایبەتـی کردوە لەوانـە بەڕێزترین‌و چاکتریـن پەرسـتش، دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي ﴾ واتـە: سـەربڕینم، ئەمـەش لەبـەر گەورەیـی‌و ڕێـزی ئەم دوو پەرستشـەیە،.وە بەڵگەن لەسـەر خۆشەویسـتی خوا ﷻو، دڵسـۆزی بـۆ نواندنـی، وە خـۆ نزیک کردنەوە بـە دڵو زمان‌و جەسـتە، وە بە سـەربڕین کە بریتیـە لە بەخشـینی ئەو ماڵەی کە بە لای نەفسـەوە خۆشەویسـتە، بەو کەسـەی کـە ماڵەکە لـە لای خۆشەویسـترە، ئەویش خوا ﷻ.

هـەر کەسـێک لـە نوێـژو قوربانیەکانیدا دڵسـۆزی بنوێنـێ، ئەو لـە سـەرجەم کردارەکانیدا دڵسـۆزی دەنوێنێ. وە کـە دەفەرموێ: ﴿ وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي ﴾واتە: ئـەوەی ئەنجامی دەدەم لە ژیانمـدا، وە ئەویشـی خـوا ﷻ دەیهێنێ بەسـەرمدا، وە ئەو چارەنووسـەی بەسـەرمدا دێت لە چونیەتـی مردنمـدا، هەمـووی: ﴿ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ﴾ لـە بەندایەتی کردندا، وەک چـۆن هاوەڵو هاوبەشـی نیە لـە دەسـەڵات‌و بەڕێوەبردندا.

ئـەم دڵسـۆزیە بـۆ خوا ﷻ لـە لایەن منـەوە دانەهێنـراوە، بە هەواو ئـارەزووی خـۆم، بەڵکو ﴿ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ ﴾ بڕیارێکـی حەتمیـە، تەنهـا دەبـێ شـوێنی ئـەو بکـەوم‌و فەرمانەکانـی جێبەجـێ بکـەم ﴿ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴾ لـەم ئوممەتە.

﴿ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ ﴾ لـە دروسـتکراوەکان ﴿ أَبۡغِي رَبّٗا ﴾واتـە: ئایـا بـۆ مـن چاکـەو دەگونجێ کەسـێکی تـر بکەم بـە پەروەردگارو پشـتیوانم؟! لە کاتێکـدا هەموو خەڵکی لەژێر سـایەی میهرەبانـی‌و پەروەردگارێتـی ئـەودان، وە ملکەچـن بـۆ بڕیارەکانی. پێویسـتە لەسـەر من‌و بێجگـە لـە مـن کـە خـوا ﷻ بـکات بـە پەروەردگـاری، وە پێـی ڕازی ببـێ، وە دە خۆی هەڵنەواسـێ بـە هیـچ یەکێک لـە دروسـتکراوە هـەژارو بێتواناکان.

پاشـان هانی داوەو ترسـاندویەتی بە باسـکردنی پاداشـت، دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٍ ﴾ لـە خێرو شـەڕو خراپـە ﴿ إِلَّا عَلَيۡهَاۚ ﴾ وەک چـۆن خوا دەفەرمـوێ: ﴿ مَّنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَاۗ ٤٦ ﴾فصلـت.

﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ﴾ بەڵکـو هەموو کەسـێ تاوانی خۆی لەسـەر خۆیەتی. وە ئەگەر کەسـێک ببێتـە هـۆی گومراکردنـی کەسـێکی تـر، ئـەو تاوانـی هۆکارەکـەی دەکەوێتە سـەر، بـە بـێ ئەوەی لـە تاوانـی تاوانبار کـەم ببێتـەوە ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرۡجِعُكُمۡ ﴾ لـە ڕۆژی

دوایـی دا ﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾ لـە خێـرو خراپـەی، وە پاداشـتان دەداتەوە بـە چاکترین پاداشـت.

﴿ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَائِفَ الْأَرْضِ ﴾ هەندێکتـان شـوێنی هەندێکی ترتـان دەگرنەوە، وە کردوونـی بە جێنشـین لەسـەر زەویـدا، وە ئـەوەی تیایدایـە فەراهەمی هێنـاوە بۆتان، وە تاقیکردونەتـەوە، تا تەماشـا بـکات چۆن ڕەفتـار دەکەن.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ ﴾ لـە هێـزو لـەش سـاغیو ڕزقو ڕۆزیو دروسـت کـردنو ڕەوشـتدا ﴿ لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ﴾ کردەوەکانتـان لـە یەکتر جیـاوازە ﴿ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ ﴾ بـۆ هەر کەسـێک سـەرپێچی بـکاتو نیشـانەکانی بە درۆ بخاتـەوە ﴿ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ بـۆ هـەر کەسـێک کە بـڕوا بهێنێو کـردەوەی چاک ئەنجـام بـدات، وە تەوبـە بـکات لە لەناوبـەرەکان (واتـە: گوناهە گـەورەکان.

تەفسیری سووڕەتی (الأنعام) تەواو بوو
سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهانییان


سُورَةُ الأَعۡرَافِ
بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
الٓمٓصٓ ١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ
لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم
مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ
٣ وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ
قَآئِلُونَ ٤ فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ
إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٥ فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ
ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٦ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ٧
وَٱلۡوَزۡنُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّۚ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٨ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ
أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظۡلِمُونَ ٩ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰكُمۡ
فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَۗ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ
١٠ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَٰكُمۡ ثُمَّ صَوَّرۡنَٰكُمۡ ثُمَّ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ
ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ١١

## تەفسیری سوورەتی (الأعراف)
## مەککیە (٢٠٦) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٧): ﴿ الٓمٓصٓ ١ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ
فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ
بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ٢ ٱتَّبِعُواْ مَآ
أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ
أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ٣ وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ
أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ
٤ فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ
أَن قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ٥ فَلَنَسۡـَٔلَنَّ
ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ
٦ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ٧ ﴾

خوا ﷻ لە روونکردنەوەی نامەیەکی گەورەو بەرێز کە قورئانە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ ﴾ واتە: کتێبێکی گەورەیە سەرجەم پێویستی ئینسانەکان لە خۆدە گرێت، لەگەڵ هەموو داواکاریەکانی پەروەردگارداو سەرجەم ئامانجە شەرعیەکان، تەواوو درێژە پێدراوە ﴿ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ ﴾ واتە: دڵتەنگ‌و دوو دڵی‌و گومان، بەڵکو بۆ ئەوەی بزانی ئەم قورئانە نێردراوەتە خوارەوە لەلایەن خوای کاردروستی ستایش کراو، (وەک لە شوێنی دی دەفەرموێ): ﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ٤٢ ﴾ [فصلت]

بێگومان قورئان ڕاسترین وتەیە، دەی تۆش دڵتی بۆ گوشادو ئاسوودە بکە، وە دەروونتی پێ دڵنیا بکە، فەرمان‌و قەدەغە کراوەکانی بە ئاشکرا ڕابگەیەنەو لە لۆمەو سەرزەنشتی هیچ کەسێک مەترسە ﴿ لِتُنذِرَ بِهِۦ ﴾ واتە: خەڵکی پێ بترسێنەو ئامۆژگاریان بکەو یادیان بخەرەوە تا بیانووی یاخی بووان نەهێڵی ﴿ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ واتە: تا ببێتە ئامۆژگاری‌و یادەوەریەک بۆ کۆمەڵی مسوڵمانان، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٥ ﴾

الذاریات، (واتە: بە بیر بێنەوە، بێگومان بە بیر هێنانەوە سوود بە بڕواداران دەگەیەنێ).
ئامۆژگاری یەکتری پێدەکەن بۆ ڕێگای ڕاستو کردەوەی ئاشکراو نهێنی، وە ئەوەی دەبێتە بەربەست لە نێوان ڕەوشتو هەڵسو کەوتەکانیدا، پاشان لەگەڵ بەندەکانیدا دەدوێتو سەرنجیان ڕادەکێشی بۆ لای قورئان، دەفەرموێ: ﴿ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم ﴾ واتە: ئەو کتێبەی کە دەیەوێ لەبەر ئێوە دایبەزێنێ، دەفەرموێ: ﴿ مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾ (لە لایەن پەروەردگارتانەوە) کە دەیەوێت پەروەردەی ئێوەی پێ تەواو بکات، ئەم کتێبەی بۆ دابەزاندووە کە ئەگەر پەیڕەوی بکەنو شوێنی بکەون ئەوە پەروەردە کردنتان تەواو دەبێو نازو نیعمەتەکانی بەسەرتاندا دادەبارێنێ، وە ڕێنمایتان دەکات بۆ کردەوەو ڕەوشتی باش ﴿ رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ﴾ واتە: مەیانکەن بە پشتیوانو شوێنی هەواو هەوسیان بکەون، وە لەو پێناوەدا واز لە هەق بهێنن.
﴿ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴾ ئەگەر بیر بکەنەوەو بەرژەوەندی خۆتان بزانی بووایە، ئەوە فەزڵی خراپەتان نەدەدا بەسەر چاکەدا، وە دوژمن بەسەر دۆستدا.
پاشان ئاگاداریان دەکاتەوە لە سزاو تۆڵەی ئەو ئوممەتانەی کە پەیامی پێغەمبەرەکانیان بە درۆ دەخستەوە، بۆ ئەوەی خۆیان نەچوێنن بەوان، دەفەرموێ: ﴿ وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا ﴾ واتە: بە سزای بە ئێشو سەختمان ﴿ بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ ﴾ واتە: لە ئەوپەڕی بێ ئاگابوونیاندا، بەختورەش بە دڵیاندا نەدەهات لەناو بچن، کاتێ کە سزایان بۆ هات نەیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن، وە ئەو پەرستراوانەی دەیانپەرستن هیچ سوودێکیان پێنەگەیاندن، وە نکوڵیان لەوە نەدەکرد کە ئەنجامیان دابوو لە ستەمو سەرپێچی.
﴿ فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴾، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَمۡ قَصَمۡنَا مِن قَرۡيَةٖ كَانَتۡ ظَالِمَةٗ وَأَنشَأۡنَا بَعۡدَهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ ١١ فَلَمَّآ أَحَسُّواْ بَأۡسَنَآ إِذَا هُم مِّنۡهَا يَرۡكُضُونَ ١٢ لَا تَرۡكُضُواْ وَٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰ مَآ أُتۡرِفۡتُمۡ فِيهِ وَمَسَٰكِنِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡـَٔلُونَ ١٣ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ١٤ فَمَا زَالَت تِّلۡكَ دَعۡوَىٰهُمۡ حَتَّىٰ جَعَلۡنَٰهُمۡ حَصِيدًا خَٰمِدِينَ ١٥ ﴾ الأنبياء
کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ ﴾ واتە: پرسیار لە گەلەکانی پێشوو دەکەین کە پێغەمبەریان بۆ دابەزیوە، چۆن وەڵامیان داوەتەوە؟ ﴿ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٦٥ ﴾ القصص، (واتە: لە ڕۆژێکدا بانگ دەکرێنو پێیان دەوترێ: چۆن وەڵامی پێغەمبەرانتان دایەوە؟).

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَسْـَٔلَنَّ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾ واتە: لە گەیاندنی پەیامەکانی پەروەردگاریاندا، وە پێغەمبەرانیان چۆن وەڵامیان دانەوە.

﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم ﴾ واتە: لەسەر هەموو خەڵکی بە گشتی بەو کردەوانەی کە کردوویانە ﴿ بِعِلْمٍ ﴾ لە لایەن خواوە ﷻ بە کردەوەکانیان ﴿ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴾ لە هیچ کاتێکدا، وەک دەفەرموێ: ﴿ أَحْصَىٰهُ ٱللَّهُ وَنَسُوهُ ﴿٦﴾ ﴾ المجادلة؛ وە هەروەها کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ المؤمنون.

(٨-٩): ﴿ وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾:

ئنجا باسی پاداشتی کردوە لەسەر کردەوەکان، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ ﴾ واتە: کێشانەو پێوانە لە ڕۆژی قیامەتدا بەڕاستیو دادگەرانە دەبێ کە زوڵمو ستەمی تێدانیە.

﴿ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾ واتە: بەوەی تەرازووی چاکەکانی قورستر بێت بەسەر خراپەکانیدا، ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی کە ڕزگاریان بووە لە ناخۆشیەکان، وە گەیشتوون بە نازو نیعمەتەکان، ئەوانەی قازانجی گەورەو خۆشبەختی بەردەوامیان بەدەست هێناوە ﴿ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾ ئەوەی کە تای تەرازووی خراپەکانی سووک بێت ئەوە بڕیاری بەسەرا دەدرێت ﴿ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُم ﴾ خۆشگوزەرانی بەردەوامیان لە دەست دا، وە سزای بە ئێشو توونديان بەدەست هێنا ﴿ بِمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَظْلِمُونَ ﴾ وەک پێویست گوێڕایەڵیان نەکردو بە دەمیەوە نەهاتن.

(١٠): ﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿١٠﴾ ﴾:

وەک منەت کردنێک بەسەر بەندەکانیدا بە باسکردنی شوێنی نیشتەجێ بوونو گوزەرانیان، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: دامان مەزراندنو جێگیرمان کردن بە شێوەیەک کە دەتوانن ماڵ دروست بکەنو کێڵگەی تێدا بڕوێنن، وە بە جۆرەها شێوە سوودی لێ وەربگرن.

﴿ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ ﴾ ئەوەی کە لە بەرهەمی دارو درەختەکانو ڕووەکو کانزاکانی نێو زەویو جۆرەها بازرگانی دەردەچێت بێگومان ئەوە تەنها خوای گەورە دایمەزراندوەو کارئاسانی بۆ کردوون، وە هۆکارەکانی بۆ ڕام کردوون ﴿ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾ واتە: کەچی زۆر کەمتان شوکرانە بژێری خوا دەکەن، ئەو خوایەی کە جۆرەها نازو نیعمەتی ڕشتوە بەسەرتانداو سزاکانی لەسەر لابردوون.

قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ
وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ
فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّـٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ
﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ
صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ
وَعَنْ أَيْمَـٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَـٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ
ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ
أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ وَيَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ
شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ
لَهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ لِيُبْدِىَ لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ
مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ
أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَـٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴿٢١﴾
فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ ۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا
يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن
تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾

(۱۱-۱۵): ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَـٰكُمْ ثُمَّ صَوَّرْنَـٰكُمْ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿١١﴾ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّـٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ ﴾:

خـوا ﷻ لەگـەڵ ئـەوەی ئـادەم ؑدا دەدوێ، دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَـٰكُمْ ﴾ بـە دروسـتکردنی بنەمـاو توخمتـان کـە لەوێـوە دەرچـوون، باوکتـان ئـادەم ؑ ﴿ ثُمَّ صَوَّرْنَـٰكُمْ ﴾ پاشـان بـە جوانتریـن‌و ڕێکتریـن شـێوە نیگارمـان کێشـاون، وە خـوای گـەورە فێری هەمـوو ناوەکانی کـردوە، تا نێـوەڕۆکـو ناخـی پـێ کامـڵو تـەواو بـکات.

پاشـان فەرمانـی بـە فریشـتە بەڕێـزەکان کـردوە کـە سـوژدە بـۆ ئـادەم بـەرن سـوژدە بردنێکـی ڕێـز لێگرتن، وەک دەرخسـتن‌و ئاشـکرا کردنی فـەزڵو چاکەی ئـادەم، ئەوانیش فەرمانبـەرداری فەرمانی پەروەردگاریان بوون، ﴿ فَسَجَدُوٓا۟ ﴾ هەموویان بە گشـتی ﴿ إِلَّآ إِبْلِيسَ ﴾ سـەرپێچی کـردو سـوژدەی بۆ نەبـرد، چونکە خۆی بـە گەورە دەزانی‌و سەرسـام بـوو بە هەواو ئارەزوی، پاشـان خـوای گەورە سـەرکۆنەی کردو فەرمـووی: ﴿ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ ﴾ کـە بـە دەسـتی خۆم دروسـتم کرد، واتـە: ڕێزم لێنـاو بەو شـێوەیە فەزڵو چاکەمـدا بەسـەر غەیری خۆیـدا، بەڵام تـۆ فەرمانی منت پێشـێل کـردو کەمتەرخەمیت تێدا کـرد؟ ﴿ قَالَ ﴾ ئیبلیسـی شـەیتان بەرپەرچی پەروەردگـاری دایەوەو وتـی: ﴿ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ﴾ (مـن باشـترم لـەو) پاشـان بەڵگەی بـۆ ئەو بانگەشـە بـێ بنەمایـە هێنایـەوە وتی: ﴿ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴾ وە مانـای ئەمـە ئەوەیـە کـە ئەوەی لـە ئاگر دروسـتکراوە چاکترو بەڕێزتـرە لـەوەی لـە خۆڵ دروسـتکراوە، چونکـە ئاگر هابەسـەر خۆڵەوە؟!

بــە ڕاســتی ئــەم پێوانەو بــەراورد کردنــە خراپتریــن ئەندازەگیریە، ئــەو بۆچوونە بــێ بنەمایە لە چەنــد ڕوویێکەوە:

لەوانــە: ئــەو قیــاس‌و پێوانەیە لــە بەرانبەر فەرمانــی خوادا بە ســوژدە بردن هاتــوە، وە قیاس‌و پێوانــە ئەگــەر ڕووبــەڕووی ئایەتێــک بوونەوە ئەوە قیاســێکی بــێ بنەمایە، چونکە مەبەســت لــە قیاســدا بــۆ ئــەو حوکمەیــە کــە هیــچ دەقێکــی لەبــارەوە نەهاتبــێ، کــە نزیک بــێ لەو کارانــەی کــە دەقیان لەســەر هاتووە، وە ببێتــە شــوێنکەوتووی ئەوان، بەڵام ئەو قیاســەی کە ڕووبــەڕووی دەقەکــە دەبێتــەوەو هەڵیدەوەشــێنێتەوە ئەوە خراپترین جۆری قیاســە.

لەوانــە: کــە دەفەرموێ: ﴿ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ ﴾ تەنها ئەم قســەیە بەســە بــۆ ناتەواوی ئیبلیســی پیس، چونکــە ئــەوە بەڵگەیــە لەســەر ناتــەواوی خۆی، بــەوە کە سەرســام بــووە بە خــۆی‌و خۆ بە زل گرتــەوە، وە قســە کردنــی لەســەر خوا بــە بــێ زانســت. وە چ ناتەواویەکــە، وە چ کەم‌و کورتیــەک لەمە گەورەتــر هەیە؟

لەوانــە: ئــەو درۆی کــرد لــە بە چــاک دانانی ئاگر بەســەر قــوڕو خۆڵدا، چونکە کەرەســتەی خــۆڵ ئــارام‌و هێمــن‌و لەســەرخۆو ســەنگینە، وە هەروەهــا ســەرجەم پیت‌و بەرەکەتی ســەر زەوی لــە دارو درەختــەکان‌و جۆرەهــا ڕووەکەکان بە جیــاوازی ڕەگەزیانــەوە تێیدا بەبەرهەم دێــن، بەڵام ئاگر ســووکی‌و ســووتان‌و هەڵەشــەیی تێدایە؟!

لەبــەر ئەمــە ئیبلیس پلــەی دابەزیە خوارەوە لــە بەرزترین پلــەو پایەوە بۆ نزمترینــی نزمەکان خــوا ﷻ پێــی فەرمــوو: ﴿ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا ﴾ واتە: لــە بەهەشــت ﴿ فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا ﴾ چونکە شــوێنی پــاک‌و خاوێنەکانــە، ناگونجێ پیســترین‌و خراپترین دروســتکراوی خوا ﷻ تێــدا نیشــتەجێ بــێ، ﴿ فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾ واتــە: ئەوانــەی کــە ســەرکۆنەو بێ نرخ کــراون، وەک پاداشــتێک بەرانبــەر بــە لووت بەرزی‌و سەرســام بــوون بە خۆی.

کاتێــک کــە دوژمنــی خــوا دوژمنایەتــی خــۆی لەگــەڵ خــوا، هەروەهــا لەگــەڵ ئــادەم‌و نەوەکانیــدا ئاشــکرا کــرد، داوایەکــی لــە خوا ﷻ کــرد، کە مۆڵەتــی بدات تــا ڕۆژی دوایی بــۆ ئــەوەی نەوەکانی ئادەم لــە خشــتەبەرێت. وە کاتێک کــە حیکمەت‌و دانایــی خوا ﷻ وا پێویســت دەکات کــە بەندەکانــی تاقی بکاتــەوە بۆ ئــەوەی ڕاســتگۆو درۆزن دەرکەوێ، وە کــێ گوێڕایەڵــی دەکاو کێیش نایکات، وەڵامــی داواکاریەکەی دایــەوەو فەرمووی: ﴿ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴾ (واتــە: بێگومــان تۆ لــە مۆڵــەت پێدراوانی).

(١٦-١٧): ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ١٦ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ

خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ ﴾
ئیبلیس کاتێک لە میهرەبانی خوا ﷻ بێ ئومێد بوو، وتی: ﴿ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ ﴾ واتە: بۆ خەڵک (دادەنیشم) ﴿ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴾ واتە: هەموو تواناکانم دەخەمە کار بۆ لە لاڕێ بردنی خەڵکی لە ڕێگای ڕاستو دوورخستنەوەیان.

﴿ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ﴾ واتە: لە هەموو ڕووەکانەوە، وە لە هەموو ئەو ڕێگاکانەوە کە توانای هەیە بەسەریاندا، وە کاتێ کە شەیتانی نەگلیس هەستی بەوە کرد کە نەوەکانی ئادەم لاوازنو پێناگایی سەردەکێشێ بەسەر زۆربەیاندا، تواناکانی خستە کار بۆ گومراکردنیان، گومانی بردو گومانەکەی ڕاست دەرچوو وتی: ﴿ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴾ بێگومان بەجێ هێنانی سوپاسگوزاری، لە ڕەوشتی ئەو کەسانەیە کە ڕێگای ڕاست دەگرنە بەر، ئەویش دەیەوێت لەو ڕێگەیان دوور بخاتەوە، وە پێی هەڵنەستنو جێبەجێی نەکەن، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر.

خوا ﷻ لەبەر ئەوە ئاگادارمان دەکاتەوە لە وتەکانی ئیبلیسو سوور بوونی لەسەر گومراکردنمان، تا ئاگادار بین خۆمان ئامادە بکەین بەرانبەر دوژمنەکانمان، وە بە زانیاری خۆمانی لێ بپارێزین، وە ئەو کەلێنانە دابخەین کە مەترسی ئەوەی لێدە کرێت شەیتان بێتە ژوورەوە، ئەمەش گەورەترین نیعمەتی خوایە بەسەرمانەوە.

(١٨): ﴿ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا ۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ ﴾
خوا ﷻ بە ئیبلیسی فەرموو: ﴿ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا ﴾ بە شێوەیەکی بە کەم تەماشا کردنو سەرزەنشتکردنەوە فەرمووی دەرچن، نەک بە شێوەیەکی ڕێزدارانە ﴿ مَّدْحُورًا ﴾ دوورین لە خوا ﷻو دوورین لە میهرەبانیو لە هەموو خێرو چاکەیەکی تر.

﴿ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ ﴾ (دۆزەخ پڕ دەکەین) لە تۆو لەوانەی کە شوێنت دەکەون هەموویان ﴿ أَجْمَعِينَ ﴾ ئەمە سوێندێکە لە لایەن خواوە ﷻ، بێگومان دۆزەخ شوێنی بێ گوێو سەرپێچیکارانە، پێویستە شەیتانو شوێنکەوتووانی لە جنۆکەو نەوەکانی ئادەم پڕی بکەنەوە. پاشان ئادەمی ئاگادار کردەوە لە ئاشوب و فیتنەی ئیبلیس و فەرمووی:

(١٩-٢٣): ﴿ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا
مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِىَ لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا
رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ

ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾﴾:

خـوا ﷻ فەرمانـی بـە ئـادەمو حـەووای خێزانی کـردوە، کـە پێی بەخشـیوە تا بیێتـە مایەی ئارامـی دڵو دەروونـی، بۆ خۆیان بخۆنو بخۆنـەوە چۆن دەیانەوێت، وە بـە ئارەزووی خۆیان چێـژی لـێ وەربگـرن، تەنهـا ئـەوە نەبـێ دارێکی لـێ قەدەغە کـردن، تەنها خـوا ﷻ خۆی دەزانـێ ئـەو دارە چیـە، وە دیـاری کردنـی ئـەو دارە هیچ سـوودێکی تێـدا نیـە. وە حەرامی کـرد لـەو دارە بخـۆن بـە بەڵگـەی ئـەوەی دەفەرمـوێ: ﴿فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بـەردەوام فەرمانـی خوایـان ﷻ جێبەجێ دەکرد، هەتـا شـەیتان هەڵیخەڵەتاندن بـە فێڵەکانی، ختوورەی خسـتە دڵیانەوەو لـە بەرچاوی جوان کـردنو فریوی دانو وتـی: ﴿مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ﴾ واتـە: لـە رەگـەزی فریشـتە ﴿أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ﴾ وەک لـە ئایەتێکـی تـردا دەفەرمـوێ: ﴿هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾﴾ طه.

وە لەگـەڵ ئەم قسـەیەدا سـوێندی بەخوا بۆ خـواردن و وتـی: ﴿إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ واتـە: مـن لەوانـەم کـە ئامۆژگاریتـان دەکەم، ئـەوەی پێـم وتن هـەر ئەوەیە کە پێـم وتن. بـە وتەکانـی فریویـان خـوارد، وە لـەو حاڵەتـەدا هـەواو ئـارەزوو زاڵ بـوو بەسـەر عەقڵدا.

﴿فَدَلَّىٰهُمَا﴾ واتـە: لـە بەرزتریـن پلـەوە دایبەزاندن کـە بریتی بـوو لە دووری لـە گوناهو سـەرپێچی بـۆ پیسـی و خراپی، پاشـان دەستپێشـخەری خواردنـی دارەکەی بـۆ کردن.

﴿فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا﴾ واتـە: (کاتێـک درەختەکەیـان خـوارد) عەورەتی هەردووکیـان دەرکـەوت، پاش ئـەوەی کە داپۆشـرا بوو، ڕووتـی نێوەڕۆکـی دڵو دەروون لـە تەقـوای خـوا ﷻ، کاریگەری هەبوو لەسـەر ڕووتـی دەرەوەو جلو بەرگیـان، هەتا جلو بەرگـی لەبەریان دارنـی عەورەتیان دەرکـەوت، وە کاتێ کە عەیـبو عەورەتیان دەرکەوت بـۆ یەکتـر، شـەرم دایگرتن، هەسـتان بە پەلکـو گـەڵای داری بەهەشـت، دەسـتیان کرد بە داپۆشـینی عەورەتیان.

﴿وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ﴾ ئـەوان لـەو دۆخـە سـەرکۆنەکراوو سەرزەنشـت کـراوەدا بـوون، (خـوا پێـی فەرمـوون:) ﴿أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ بۆچـی ئـەو تاوانەتـان ئەنجامـداو گوێڕایەڵـی دوژمنەکـەی خۆتانتـان کـرد؟ لەو کاتـەدا خـوای گـەورە منەتـی کرد بەسـەریاندا بـە داوای لـێ خۆشـبوونو تەوبـە کردن،

قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ
مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ
فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا
تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ
لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ
ذَٰلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَا بَنِي آدَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ
الشَّيْطَانُ كَمَا أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ الْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا
لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْآتِهِمَا إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ
حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ
﴿٢٧﴾ وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً قَالُوا وَجَدْنَا عَلَيْهَا آبَاءَنَا وَاللَّهُ أَمَرَنَا
بِهَا قُلْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ
﴿٢٨﴾ قُلْ أَمَرَ رَبِّي بِالْقِسْطِ وَأَقِيمُوا وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ
وَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾
فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا
الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ اللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾

ئەوانیش دانیان بە تاوانەکەیاندا ناو، داوای لێخۆشبوونیان لە پەروەردگاریان کرد، وتیان: ﴿رَبَّنَا ظَلَمْنَا أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ واتە: ئەو گوناهەمان کرد کە لێت قەدەغە کردبووین، وە نەفسی خۆمان تووشی گوناە کرد، بە ڕاستی هۆکاری زەرەرمەندیمان بە دەست هێنا، ئەگەر بە میهرەبانی خۆت لێمان خۆش نەبی، وە هاوشێوەی ئەم تاوانانە، خوا ﷻ لێیان خۆش بوو، وەک دەفەرموێ: ﴿وَعَصَىٰ آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ اجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾﴾طه.(واتە: .. پاشان خوا هەڵیبژاردو تەوبەی لێ وەرگرتو ڕێنمایی کرد).

بەو شێوەیە ئیبلیس بەردەوام بوو لەسەر یاخیبوونو ملهوڕیەکانی بەبێ ئەوەی خۆی دابڕنێ لە سەرپێچیەکان، ئادەم ﷺ دانی بە تاوانەکەیدا ناو، داوای لێ خۆشبوونی کردو، پەشێمان بوویەوەو خۆی داڕنی لە تاوان، ئەگەر تاوانێکی ئەنجام بدایە خوا ﷻ هاوکاریو ڕێنمایی دەکرد، وە لە بەرانبەردا ئیبلیس ئەگەر تاوانێکی ئەنجام بدایە بەردەوام دەبوو لەسەر سەرپێچی کردن، ئەوە بێگومان هیچی دەست نەدەکەوت جگە لە دوورتر بوونی لە خوا ﷻ.

(٢٤- ٢٦): ﴿قَالَ اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ذَٰلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾﴾
واتە: کاتێک کە خوا ﷻ ئادەمو خێزانو وەچەکانی دابەزاندە سەر زەوی هەواڵی پێدان بە مانەوەیان لەسەر زەویدا، وە ژیانێکیان پێدەبەخشێ کە بە دوایدا مردن دێت، پڕە لە تاقیکردنەوەو بەڵا، ئەوان بەردەوام لەو دۆخەدا دەژین، پێغەمبەرانیان بۆ دەنێریو کتێبیان بۆ دادەبەزێنی تا دەمرن، هەر لەوێدا دەنێژرێن، پاشان کاتێک کە تەواو بوون خوا ﷻ زیندوویان دەکاتەوەو لەوێ دەریان دەهێنێ بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی ڕاستەقینە کە ئەویش ماڵی مانەوەیە.

پاشان خوا ﷻ منەتی کرد بە سەریاندا لە پۆشاکی پێویستدا، وە ئەو پۆشاکەی کە جوانو ڕازاوەیە، وە بەو شێوەیە سەرجەم شتەکانی تر وەک خواردنو خواردنەوەو ئامرازەکانی گواستنەوەو ژنو ژنخوازیو هاوشێوەکانی. بێگومان خوا ئەوەی گرنگو پێویستە ئاسانی کردوەو ڕوونی کردوەتەوە بۆ بەندەکانی، ئەمە لە خودی خۆیدا مەبەست پێی نیە، بەڵکو خوا ﷻ دایبەزاندوە بۆ ئەوەی ببێتە هاوکاریەک بۆ بەندایەتی کردنیان بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ﴾ واتە: بەڵام پۆشاکی تەقواو پارێزکاری باشترە لە پۆشاکی ئاسایی، چونکە بە ڕاستی پۆشاکی خۆپارێزی لەگەڵ بەندەدا بەردەوام دەمێنێتەوەو کۆتایی پێ نایەت دەبێتە مایەی جوانکردنی دڵو ڕووح.

بەڵام پۆشاکی ئاسایی ئامانج تێیدا ئەوەیە بۆ ماوەیەکی کاتی عەورەتی مرۆڤی پێ دابپۆشرێ، یان مرۆڤ بۆ جوانی بیپۆشێ، جگە لەوە هیچ سوودێکی تری نیە. وە بە هەمان شێوە ئەگەر وادابنرێ کە ئەم پۆشاکە نەبێ ئەوە عەیبو عاری بە ئاشکرا دەردەکەوێ کە لە ناچاریدا دەرکەوتنی زیانی پێناگات، وە ئەگەر وادابنرێ پۆشاکی خۆپارێزی نەبێ ئەوە عەیبو عاری ناخی دەردەکەوێ، بۆیە تووشی ڕسواییو سەرگەردانی دەبێت.

وە کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾ واتە: ئەوەی کە باسکرا بۆتان دەربارەی (دارِنرانی) پۆشاک، بۆ ئەوەیە کە ئەوەتان بیربکەوێتەوە، چ شتێک سوددی هەیە بۆتانو چیش زیانی هەیە، وە خۆتان بە پۆشاکی ئاشکرا دەپۆشن کە دەبێتە پارێزگاریەک بۆ ناخو دەروونتان.

(٢٧): ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾:

خوا ﷻ وەک ئاگادار کردنەوەی نەوەکانی ئادەم، دەفەرموێ: با شەیتان ئەوەیان بەسەر نەهێنێ کە بەسەر باوکیانیدا هێنا ﴿ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ ﴾ بەو شێوەیەی کە سەرپێچی کردنتان لەلا جوان بکاو هانتان بداو بانگتان بکات بۆ لایو ئێوەش گوێڕایەڵی بکەن ﴿ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ ﴾ دایبەزاندن لە بەرزترین شوێنەوە بۆ نزمترین شوێن، شەیتان دەیەوێت هەمان کار بە ئێوەش بکات، وە کۆڵ نادات و ماندوو نابێت، تا تووشی فیتنەتان دەکات ئەگەر بتوانێ، پێویستە لەسەرتان ئاگاداری خۆتان بنو ڕێو شوێنی توند بگرنەبەر، وە جلو بەرگی شەڕی بەرانبەر بپۆشنو بێ ئاگا نەبن لەو شوێنانەی کە دوژمن دەیەوێت لەو

کەلێنانەوە زەفەریان پێ بێت.
وە ﴿ إِنَّهُۥ ﴾(بێگومان خوا) بەردەوام چاودێریتان دەکات ﴿ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ ﴾لە شەیتانەکانی جنۆکە ﴿ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ بڕوا نەبوون دۆستایەتی پێویست دەکات لە نێوان مرۆڤ شەیتاندا، (وەک لە شوێنی دی دەفەرموێ:) ﴿ إِنَّهُۥ لَيْسَ لَهُۥ سُلْطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾النحل.
(٢٨-٣٠): ﴿ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ قُلْ أَمَرَ رَبِّى بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا۟ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۚ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ ۗ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

خوا ﷻ لە ڕوون کردنەوەی ناشرینی حاڵی هاوبەش دانەراندا، دەفەرموێ: ئەوانەی تاوان ئەنجامدەدەنو دەیدەنە پاڵ خوا ﷻ و دەڵێن خوا فەرمانیان پێدەکات، ﴿ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً ﴾ (فاحشة) بریتیە لە هەموو کارێکی بەدو ناقوولاو ئابرو بەر، وە گەڕان بە دەوری کەعبەدا بە ڕووتی .
﴿ قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا ﴾لەمەدا ڕاستیان کردوە، ﴿ وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ﴾ وە لەمەدا درۆیان کردوە، بۆیە خوا ﷻ ئەم درۆ هەڵبەستانو دانە پاڵە ڕەت دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ﴾واتە: ئەوە لە کەماڵو حیکمەتی ئەو ناوەشێتەوە، کە فەرمان بە بەندەکان بکات کاری خراپەی ئەنجام بدەن، نە ئەمەی بتپەرستان دەیکەنو نە جگە لە ئەوەش.
﴿ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾چ درۆ هەڵبەستنێک لەوە گەورەترە؟! پاشان خوای پەروەردگار باسی ئەوە دەکات کە فەرمان بە چ دەکات؟ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَمَرَ رَبِّى بِٱلْقِسْطِ ﴾واتە: بە دادپەروەری لە بەندایەتی کردنو مامەڵەکردندا، نەک بە زوڵمو ستەم.
﴿ وَأَقِيمُوا۟ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ ﴾واتە: ڕوو بکەنە خوا ﷻ، وە کۆشش بکەن بۆ ئەوەی بە جوانترین شێوە بەندایەتی ئەنجام بدەن، بە تایبەت نوێژ بە ئاشکراو نهێنی بە چاکترین شێوە بە جێ بهێنن، وە بە پاکی بگرن لە هەموو کەمو کورتیو ناتەواوەیەک ﴿ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ واتە: مەبەستیان ئەوە بوو بە دڵێکی پاکەوە خوا ﷻ بە تاکو تەنها بپەرستن.
(الدعاء): پاڕانەوەی داواکردن لە خۆ دەگرێت، وە بە هەمان شێوە پاڕانەوەی بەندایەتیش،

واتە: لە بەندایەتی کردندا ڕیایی‌و ئێرەیی مەکەن تەنها مەبەستتان ڕەزامەندی خوا ﷻ بێ لە پارانەوەکانتاندا.

﴿كَمَا بَدَأَكُمْ﴾ (وەک) یەکەمجار ﴿تَعُودُونَ﴾ بۆ زیندوو بوونەوە، وەک چۆن دەسەڵاتی هەبوو بەسەر بەدیهێنانتان بە هەمان شێوە دەسەڵاتی هەیە بەسەر ئەوەی جارێکی تر دروستتان بکاتەوە، بەڵکو دروستکردنەوە ئاسانتریشە.

﴿فَرِيقًا﴾ لە ئێوە ﴿هَدَىٰ﴾ واتە: خوا ﷻ ڕێنمایی کردن بۆ هیدایەت‌و هۆکارەکانی بۆ ئاسان کردن‌و بەربەستەکانی لەسەر ڕێ لابردن ﴿وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ الضَّلَالَةُ﴾ واتە: بوون بە هۆکاری ئەوەی کە گومڕاییان لەسەر پێویست بێ، وە کاریان لەسەر ڕیسوا بوونی خۆیان کرد.

﴿إِنَّهُمُ اتَّخَذُوا الشَّيَاطِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾ (واتە: بێگومان ئەوان لە جیاتی خوا، شەیتانەکانیان بە دۆستی خۆیان گرتبوو)، (جا وەک خوا دەفەرموێ:) ﴿وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾﴾ النساء. کاتێک کە دۆستایەتی خوایان لە خۆیان داڕنی‌و دۆستایەتی شەیتانیان هەڵبژارد چونکە پێیان باش بوو، ئەوە بەشێکی تەواویان وەرگرت لە دۆستایەتی‌و سەرشۆڕی، وە تووشی زەرەرو زیانێکی یەکجار گەورە بوون.

وە پێیان وا بوو کارێکی زۆر چاک دەکەن، چونکە حەقیقەت‌و ڕاستیەکانیان لەلا هەڵگێڕا بۆوە، وایان گومان دەبرد ئەوەی خراپ‌و بێ بنەمایە چاکە، وە ئەوەیشی چاکە خراپ‌و بێ بنەمایە! ئەم دەقانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە سەرجەم فەرمان پێکراوو قەدەغەکراوەکان لە پێناو قەدەغە کردنی فاشیحەو فەرمان کردن بە کارێک دابەزیون کە لە عەقڵدا جێی دەبێتەوەو حیکمەت‌و بەرژەوەندی تێدایە، وەک چۆن خوای گەورە باسی کردووە کە ناگونجێ (لە عەقڵی سەلیم جێی) نەبێتەوە، وە ئەو تەنها فەرمان بە دادپەروەری‌و دڵسۆزی دەکات.

هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هیدایەت‌و ڕێنمایی بە فەزڵ‌و چاکەو منەتی خوایە، وە گومڕا کردنی ئینسان بە هۆی ئەوەوەیە بە نەزانی‌و ستەم کاریەوە پشتیوانی لە شەیتان‌و دۆستەکانی دەکات، ئەوە دەبێتە مایەی گومڕا بوونی نەفس‌و دەروونی. وە ئەو کەسە وا دەزانێ هیدایەت دراوە لە کاتێکدا ئەو هەر گومڕایە، ئەوە هیچ بیانوویەکی نیە، لەبەر ئەوە توانای نەبووە هیدایەت وەربگرێ، بەڵام ئەو بە ویستی خۆی وازی لەو ڕێگایە هێناوە کە بەرەو هیدایەت دەیبات.



يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا
وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ (٣١) قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ اللَّهِ
الَّتِي أَخْرَجَ لِعِبَادِهِ وَالطَّيِّبَاتِ مِنَ الرِّزْقِ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ آمَنُوا
فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ
لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ (٣٢) قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا
بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ
بِهِ سُلْطَانًا وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٣٣) وَلِكُلِّ أُمَّةٍ
أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ
(٣٤) يَا بَنِي آدَمَ إِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي فَمَنِ
اتَّقَى وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٣٥) وَالَّذِينَ كَذَّبُوا
بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا
خَالِدُونَ (٣٦) فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ
بِآيَاتِهِ أُولَئِكَ يَنَالُهُمْ نَصِيبُهُمْ مِنَ الْكِتَابِ حَتَّى إِذَا جَاءَتْهُمْ
رُسُلُنَا يَتَوَفَّوْنَهُمْ قَالُوا أَيْنَ مَا كُنْتُمْ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ
قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا وَشَهِدُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ (٣٧)

(٣١): ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ (٣١)﴾

پاش ئەوەی خوا ﷻ پۆشاکێکی داپۆشەری عەیبو عاری نەوەکانی ئادەمی دابەزاند، ئنجا دەفەرموێ: ﴿يَا بَنِي آدَمَ خُذُوا زِينَتَكُمْ عِنْدَ كُلِّ مَسْجِدٍ﴾ واتە: لە کاتی نوێژەکانتاندا عەورەتتان داپۆشن نوێژی سوننەت بێ، یان فەرز، چونکە بە ڕاستی داپۆشینی جوانی بەخششە بۆ جەستەتان، وەک چۆن دەرخستنی جەستە بە ناشرینو بێزراو دێتە بەرچاو. وە دەگونجێ مەبەست لە جوانی لێرەدا لە سەرووی جلو بەرگی پاکو خاوێنەوە بێ، لەم فەرمانەدا ئەمانە لە خۆ دەگرێت، داپۆشینی عەورەت لە ناو نوێژدا، وە بە کارهێنانی خۆ جوانکردنەوە تیایدا، وە پاکی شوێنی نوێژ لە هەموو پیسیەک.

پاشان دەفەرموێ: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا﴾ واتە: لەو ڕزقو ڕۆزیانەی کە پاکو پوختن ﴿وَلَا تُسْرِفُوا﴾ واتە:لە زۆر خۆریدا، زێدەڕۆیی یان بە مانای ئەوە دێ کە زیاد لە ئەندازەی پێویست بێ کە خراپترینیان لە خواردنو خواردنەوەکان دایە، کە زیان بە جەستە دەگەیەنێ، یان بە مانای زیاتر ڕازاندنەوەیە لە خواردنو خواردنەوەو جلو بەرگدا، یان بە تێپەڕاندنی حەڵاڵە بۆ لای حەرام ﴿إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ واتە:بێگومان خوا ﷻ زێدەڕۆیکارانی خۆش ناوێن، چونکە زیانی هەیە بۆ جەستەی مرۆڤو بژێوی ژیانی، تا هەندێ جار تووشی بێ توانایی‌و هەژاری دەکاتەوە کە نەتوانێت لەو ماڵو سەروەتو سامانە بۆ خۆی سوودی لێ وەربگرێ بە شێوەیەکی تەندروست، وە خەڵکیش لێی سوودمەند بن، لەم دەقە پیرۆزەدا فەرمان بە خواردنو خواردنەوە دەکات، وە قەدەغەی وازهێنان لێیان دەکات، وە بە هەمان شێوە زێدەڕۆییش تیایاندا قەدەغە دەکات.

(٣٢-٣٣): ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ۚ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣٢﴾ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّىَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەربـارەی نکوڵـی کردنی ئەوانـەی کە حـەڵاڵ کراوەکانی خوایان حـەڕام کردوە دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ﴾ لـە جۆرەکانی پۆشـاک بە هەمـوو بەشـەکانیەوە (جلو بەرگی جـوانو خشـڵو هاوشـێوەکانی)، ئەوانەی پـاکو خاوێـن لـە ڕزقو ڕۆزیدا، لە خـواردنو خواردنەوە بـە هەموو جۆرەکانیـەوە، واتە: ئـەو کەسـە کێیـە کە نـازو نیعمەتەکانـی خوا ﷻ بەسـەر بەندەکانیـدا قەدەغـە دەکات، وە ئـەو کەسـە کێیـە بەریان لەسـەر تەنـگ دەکاتەوە؟ پـاش ئەوەی خـوا فراوانی کـردوە؟!! وە ئـەم بەرفراوانیـە لـە لایـەن خـوای گـەورەوە بـۆ بەندەکانـی لـە ڕەوا بینینی خـواردنو خواردنـەوەکان، بـۆ ئەوەیـە تا بتوانن بە چاکترین شـێوە عیبـادەتو بەندایەتی بـۆ بکەن، بە ڕەواو حەڵاڵـی نەبینیـوە تەنها بۆ بـڕواداران نەبێ، بۆیە دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ هِىَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾واتـە: بڵـێ ئـەم زینـەتو جوانیـە بۆ ئەو کەسـانەیە کە لـە ژیانـی ئەم دونیایـەدا ئیمانیـان هێناوە. وە تێگەیشـتن لـە ئایەتەکە ئەوەیە هەر کەسـێک بـڕوا بـە خـوا ﷻ نەهێنێ، بەڵکو نـازو نیعمەتەکانـی بۆ سـەرپێچی کـردن بەکاربهێنێ ئەوە نـە تایبەتـە بـۆیو نە ڕەوایـە، بەڵکو لەسـەری سـزا دەدرێ، وە لـە ڕۆژی دوایدا پرسـیاری لێ دەکرێ لەسـەر ئەو نـازو نیعمەتانـە ﴿ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ ﴾ واتە:ڕوونـی دەکەینەوەو ئاشـکرای دەکەیـن ﴿ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ (بـۆ کرمەڵێـک کـە دەزانـن)، چونکە ئەوان سـوود لـەو نیشـانانە وەردەگـرن، کە خوا ﷻ درێـژەی پێـداوە، وە دەزانن ئەوە لە لایـەن خواوەیە، بە عەقـڵ وەریدەگرنو (بـە دڵ) لێـی تێدەگەن.

پاشـان باسـی ئەو قەدەغەکراوانـەی کردوە کە لـە شـەریعەتەکانی پێشـوودا قەدەغەی کرد بـوو، دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّىَ ٱلْفَوَٰحِشَ ﴾واتـە:تاوانـە گـەورەکان، بە هـۆی دزێوو ناشـرینیو بۆگەنیانـەوە، وەک زیناو نێربازی هاوشـێوەکانی.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴾ واتـە: ئـەو گوناهانـەی کـە پەیوەندیـان هەیە بە جوڵـەی جەسـتەوە، وە ئەوانـەی پەیوەندیـان هەیـە بـە جوڵەی دڵـەوە، وە خۆ بـەزل زانینو سەرسـام بـوون بە خـۆو ڕیاکـردنو دوو ڕوویی، وە هاوشـێوەی ئەوانـە، ﴿ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْىَ

بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾واتـە: ئـەو گوناهانەی کـە دەکرێـن، وە دەبنە مایـەی سـەرپێچی فەرمانەکانی خـوا ﷻو پێشـێل کردنـی مافەکانـی خـوای دادگـەر، بێگومان سـزا پێویسـت دەکەن، وە دەسـت درێژیـن بۆ سـەر خەڵک، لـە خوێنو ماڵو شـەرەفو ناموسـیاندا، وە ئەمـە هەموو ئـەو گوناهانـە دەگرێتـەوە کـە پەیوەندیـان بە مافەکانـی خواو مافـی بەندەکانـەوە هەیە.

﴿ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا ﴾(سـلطان) واتە:بەڵگە، بەڵکو بەڵگەی یەکتاپەرسـتی ناردۆتـە خـوار، هاوبـەش دانـان: ئەوەیـە لەگـەڵ خـوا ﷻ یەکێک لـە دروسـتکراوەکان بکرێـت بـە هاوبەش لـە پەرسـتندا. وەک ڕیا کردنو سـوێند خواردن بە غەیـری خوا ﷻو هاوشـێوەی ئەوانـە. ﴿ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ لـە نـاوو سـیفاتو کـردەوەکانو شەرعو یاسـاکانیدا.

خـوا ﷻ هەمـوو ئەمانەی حـەرامو قەدەغە کردوە، بـە هۆی ئەوەی چەندیـن زیانو خراپەی تایبەتـیو گشـتی بە دوای خۆیـدا دەهێنێ، وە بە هەمان شـێوە سـتەمو بێ فەرمانـیو بوێری کـردنو شـەرم نەکردن لـە خوا ﷻ، وە گۆڕینو دەسـتکاری کردنـی ئاینی خوا.

(٣٤): ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٞۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ٣٤ ﴾:

واتـە:خـوا ﷻ نەوەکانی ئادەمـی دەرکردە سـەر زەویو لـەوێ جێگیری کـردن، وە وادەو ماوەیەکـی بـۆ دانان، هیـچ ئوممەتێک لـە ئوممەتەکان نە سـاتو وەختێـک دوا دەکەوێت لـەو کاتـەی بۆی دیاری کـراوە، وە نـە سـاتێک دوا دەکەوێت.

(٣٥-٣٦): ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٣٥ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٣٦ ﴾:

واتـە: کاتێـک کە خـوا ﷻ نەوەکانی ئادەمـی دەرکرد لە بەهەشـت، تاقیکردنـەوە بە ناردنی پێغەمبـەرانو دابەزاندنـی کتێبـە ئاسـمانیەکان، ئایەتەکانـی خوایـان بەسـەردا دەخوێننەوەو حوکمەکانیـان بـۆ ڕوون دەکەنەوە.

پاشـان باسـی فـەزڵو چاکـەی ئەوانـە دەکات کـە وەری دەگـرنو جێبەجێی دەکـەن، وە زەرەرمەنـد بوونـی ئـەو کەسـانەی کـە پشـتی تێدەکـەنو وەری ناگـرن ﴿ فَمَنِ ٱتَّقَىٰ ﴾ لەوانـەی کـە خـوا ﷻ حەرامـی کـردوە لـە شـیرکو تاوانـی گـەورەو بچووک.

﴿ وَأَصۡلَحَ ﴾ ئاشـکراو نهێنیەکانـی چاکردبـێ ﴿ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ ﴾ لـەو شـەڕەی کە تەنها ئـەوان لێـی ناترسـن ﴿ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾ لەوەی کـە ڕوویداوە، وە ئەگەر تـرسو خەمباری

نەمـا ئەمن‌و ئاسـایش‌و خۆش گوزەرانی هەمیشـەیی بـەدی دێت ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ ﴾ واتـە: ئەوانـەی نـە بـە دڵ بڕوایـان هێنـاوەو نە بـە جەسـتە ملكەچیان كـردوە ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ واتـە: وەك چـۆن سـوكایەتیان بـە نیشـانەكانی كـردو بـەردەوام بوون لـە بـە درۆ زانینی سـووكایەتی‌و سەرزەنشـت كران بە سـزایەكی بە ئێش‌و بـەردەوام.

(٣٧): ﴿ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ٣٧ ﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَمَنۡ أَظۡلَمُ ﴾ واتـە: كـێ لـەو كەسـە سـتەمكارترە ﴿ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾ بـە هـاوەڵ بۆدانـان‌و بەكـەم تەماشـا كردن‌و درۆكـردن بەدەمیـەوە كە نەی وتبـێ ﴿ أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ ﴾ ئـەوەی كـە ڕوون‌و ڕاسـتە هیدایـەت دەرە بـۆ ڕێگای ڕاسـت ئەوانـە ئەگـەر چـی لـە دنیـادا چێژیـان وەرگـرت، وە بەشـی خۆیان بـەدەس هێنـا لەوەی كـە لە (لـوح المحفـوظ) دا نووسـرابوو، ئەوە هیـچ بێ نیازیان نـاكات، ماوەیەكـی كەم چێژ وەردەگـرن‌و بۆماوەیەكـی زۆریـش سـزا دەدرێن.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ ﴾ واتە: ئەو فریشـتەی كەتایبەت كراوە بە ڕووح كێشـان كاتێـك كـە كات‌و مـاوەی تـەواو دەبێـت ﴿ قَالُوٓاْ ﴾ واتە: لەو كاتـەدا بە سەرزەنشـتەوە پێیـان دەڵـێ: ﴿ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ لـەو بتانـەی كـە دەتانپەرسـتن، ئـا ئێسـتا كاتـی پێویسـتیە، ئەگەر دەتوانـن قازانجتان پـێ بگەیەنن یـان زیانتان لەسـەر لابەن ﴿ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا ﴾ واتـە:لەبـەر یـەك هەڵوەشـانەوەو پووچـەڵ بوونـەوە، وە ناتوانـن بێ نیازمـان بكـەن لە كەمترین سـزای خـوای دادگـەر ﴿ وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ ﴾ (بـۆ خۆیان شـایەتی لەسـەر خۆیان دەدەن بۆیە) شایسـتەی سـزای بـە ئێشـی بەردەوامن.

قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ
فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ
فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ
عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ
(٣٨) وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ
فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ (٣٩) إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ
وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ
نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ (٤٠) لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٞ وَمِن فَوۡقِهِمۡ غَوَاشٖۚ
وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ (٤١) وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ
فِيهَا خَٰلِدُونَ (٤٢) وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا
لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ
وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٤٣)

(٣٨): ﴿ قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ (٣٨) ﴾: فریشتەکان پێیان دەڵێن: ﴿ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ ﴾ لە دەستەی ئەو گەلانە ﴿ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ ﴾ ئەوانەی کە ڕابووردو وەک ئێوە لەسەر هەمان ڕێبازی کوفرو خۆبەزل زانین بوون بۆیە هەموویان پێکەوە شایستەی سزاو سەرشۆڕی بوون لەلایەنی خواوە ﷻ، ئەوسا هەر ئوممەتو گەلێک لەو ئوممەتانەی شایستەی دۆزەخ بوونو دەخرێنە ناو دۆزەخەوە، وەک چۆن دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا مَّوَدَّةَ بَيۡنِكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُ بَعۡضُكُم بِبَعۡضٖ وَيَلۡعَنُ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا وَمَأۡوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ (٢٥) ﴾ العنكبوت.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا ﴾ واتە: هەموو ئەهلی دۆزەخ لە ناو ئاگردا کۆبوونەوە لەوانەی کە لە سەرەتا هاتنە دنیاوەو لەوانەشی کە لە دوایا کۆتاییان پێکهاتوە لە دەسەلاتدارو بێ دەسەلاتەکان، وە لە چاولێکەرو شوێنکەوتووان.

﴿ قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ ﴾ واتە: تاقمی پەیڕەوکاران، شوێنکەوتووی دەسەلاتدارەکان دەڵێن: ﴿ لِأُولَىٰهُمۡ ﴾ واتە: بە دەسەلاتدارەکانیان، سکالا دەبەنە لای خوا ﷻ کە ئەوان گومرایان کردوون، ﴿ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِ ﴾ واتە: خوایە چەند هێندە سزایان بدە، چونکە بە ڕاستی ئەوان گومرایان کردین، وە شتە ناشرینەکانیان لەلا جوان کردین.

(٣٩): ﴿ وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ (٣٩) ﴾:

واتــە: دەســەڵاتداران بــە شــوێنکەوتووانو پەیڕەوکارانیان دەڵێــن: ﴿ فَمَا كَانَ لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ ﴾ واتــە: هەموومــان پێکــەوە بەشــدار بوویــن لــە گومڕایــیو سەرلێشــێواویدا، وە هــۆکاری ســزا بوویــن، دەی چاکــەی ئێــوە کامەیــە بەســەر ئێمــەوە؟! ﴿ قَالَ ﴾ خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ لِكُلٍّ ﴾ بــۆ هەمووتــان ﴿ ضِعْفٌ ﴾ چەنــد قاتو چەنــد بەرانبەر لە ســزادان هە یە.

﴿ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾ بەڵکــو ئــەوەی کــە زانراوە ســزای دەســەڵاتدارانو گــەورە پیــاوان ئەوانــەی کــە خەڵکــی بەلاڕێــدا دەبــەن توندتــرو ســەخترە لــە ســزای پەیــڕەوکاران، وەک چۆن نازو نیعمەتی پێشــەواو دەســەڵاتدارە دادپــەرو ڕێنمایی کارەکان گەورەتــرە لە پاداشــتی پەیــڕەوکاران.

وەک خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ زِدْنَاهُمْ عَذَابًا فَوْقَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُوا يُفْسِدُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾النحــل.

ئــەم ئایەتانــەو هاوشــێوەکانی بەڵگــەن لەســەر ئەوەی کــە هەمــوو ئەوانەی کــە ئایەتەکانی خــوا بــە درۆ دەخەنــەوە، بــۆ هەتــا هەتایی لــە دۆزەخــدا دەمێننەوە، لــە ســەرجەم تاوانەکان بەشــدارن، ئەگەرچــی لە ئەنــدازەدا جیاوازن بە پێــی کردەوەکانیــانو کەللەڕەقیانو ســتەمو درۆکردنیــان بــە دەم خــوای گــەورەوە، وە ئــەو خۆشەویســتیەی لــە دنیــادا لە نــاو یەکتردا هەیانبــووە، لــە ڕۆژی دوایــیدا پێچەوانــە دەبێتــەوە، دەبێتــە دوژمنکاریو نەفریــن لێکردن.

(٤٠-٤١): ﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَاسْتَكْبَرُوا عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ ﴿٤١﴾ ﴾

واتــە: خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات دەربــارەی ئەو کەســەی کــە ئایەتەکانی بــە درۆ دەخاتەوەو بڕوایــان پــێ ناهێنــێ، لەگەڵ ئەوەی کــە ئایەتەکان ڕوونو ئاشــکران، وە لە ئاســتیاندا خۆی بــە گــەورە زانیــوە کــە گوێڕایەڵــی بڕیارەکانــی نەکــردوە، بەڵکــو درۆی کردووەو پشــتی تێکــردوە، بێگومــان ئــەو جۆرە کەســانە بێ هیوان لە هەمــوو خێرو چاکەیــەک، دەرگاکانی ئاســمان بــە ڕووی ڕووحیاندا ناکرێتــەوە کاتێک کە دەمــرنو ڕووحەکانیان بــەرز دەبێتەوە بــۆ ئاســمان، داوا دەکات، بــەڵام ڕێگەی پــێ نادرێت.

وەک چــۆن لــە دنیــادا بەرزنەبووەتــەوە بــۆ بڕواهێنان بــە خواو ناســینیو خۆشویســتنی، بە هەمــان شــێوە پــاش مردنیــش بــەرز نابێتەوە، بە ڕاســتی پاداشــت بــە پێــی کردەوەیە.

ئـەم ئایەتـە ئـەوەی لـێ دەفامرێتەوە کـە بێگومـان ڕووحـی بـڕواداران ئەوانـەی ملکەچی فەرمانەکانـی خـوا بـوو ون، نیشـانەکانی خوایـان بـە ڕاسـت زانیـوە دەرگای ئاسـمانیان بۆ دەکرێتـەوە، هەتـا بـەرز دەبنـەوە بـۆ لای پەروەردگـار، وە بـەرز دەبێتـەوە هەتـا خوا ﷻ ویستی لەسـەر بێ، وە دەگەشـێتەوە بە نزیک بوون لـە پەروەردگاری، وە چێـژ وەردەگرێ لـە ڕەزامەندی.

وە فەرمایشـتی خوای گەورە دەربـارەی ئەوانەی دەچنە دۆزەخـەزە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَلُ﴾ (ناچنە بەهەشـت) ئەو حوشـترەیە کە ناسـراوە ﴿فِى سَمِّ ٱلْخِيَاطِ﴾ واتـە: هەتا حوشـتر نەچێتە کونـی دەرزی درووماەوە کـە بریتیە لە گەورەتریـن ئاژەڵەکان لـە ڕووی جەسـتەوە، وە دەرزیـش تەنگتریـن‌و بچووکترین کونی شـتەکانە، ئەمـە یەکێکە لە نموونـە مەحاڵەکان.

واتـە: وەک چـۆن ئەسـتەمە حوشـتر بچـێ بـە کونـی دەرزیـدا بـە هەمان شـێوە ئەسـتەمە ئەوانـەی ئایەتەکانـی خـوا بـە درۆ دەخەنەوە بچنـە بەهەشـتەوە، (وەک چۆن لە شـوێنی تر دەفەرمـوێ:) ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴿٧٢﴾﴾ المائـدة. وە لێـرەدا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ﴾ ئەوانـەی کـە سـەرپێچی‌و سـتەم‌و لـە سـنوور دەچوونیـان زۆر بووە.

﴿لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٌ﴾ واتـە: ڕایەخـی ژێریـان ئاگـرە ﴿وَمِن فَوْقِهِمْ غَوَاشٍ﴾ واتـە: لێفەی سەریشـیان بە ئاگر داپۆشـراوە ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: بەو شـێوە سـەختە پاداشـتێکی تەواویـان دەدرێتـەوە، بێگومـان پەروەردگارت سـتەم لـە بەندەکانی ناکات.

(٤٢-٤٣): ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٤٢﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ۖ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ۖ وَنُودُوٓا۟ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾﴾:

کاتێـک خوای گەورە باسـی سـزاو تۆڵـەی سـەرپێچی کاران‌و سـتەم کارانی کرد، پاشـان باسـی پاداشـتی گوێڕایەڵانی دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ واتـە: بە دڵەکانیان ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ بـە جەسـتەیان، ئنجـا بڕواهێنان‌و کردەوەی چاکیـان کۆکردەوە، لـە نێـوان کـردەوەی ئاشـکراو کـردەوەی نـاو ناخـدا، لـە نێـوان بەجێهێنانی فـەرزەکان‌و وازهێنـان لـە قەدەغەکراوەکاندا.

وە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ ڕستەیەکی گشـتگیرە بـۆ هەمـوو کردەوە چاکـەکان، ئـەوەی کـە پێویسـتەو ڕەواو دروسـتە، وە هەنـدێ لـەو کردەوانـە لـە توانای مرۆڤـدا نیـن، خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَآ ﴾ واتە: بـە ئەندازەی وزەو توانـای خۆیەتـی، ئـەوەی لـە توانایـدا نیـە ئەرکـی ناخرێتـە سـەر، لـەم حاڵەتەدا پێویسـتە لەسـەری کـە لە خوا بترسـێ بە پێـی توانا، وە ئەگـەر نەیتوانـی هەندێ لە واجبـەکان بەجێ بهێنـێ کـە جگـە لـەو دەتوانـێ بەجێـی بهێنـێ ئـەوە لەسـەری ناکـەوێو تاوانبـار نابێت، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾البقرة، یـان دەفەرموێ: ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴿٧٨﴾ ﴾الحج. هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴿١٦﴾ ﴾التغابـن.

لەگەڵ بێ توانابیدا واجب نیە، وە لە ناچاریدا حەرامو قەدەغەکراو نیە.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ واتـە: ئەوانەی وەسـف کراون بـە بڕواهێنانو کـردەوەی چاک ﴿ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ واتـە: جـێ گۆڕکێیـان پێناکـرێ، چونکە جۆرەها لـەززەتو نازو نیعمەتـی تێدایـە، هەموو ئـاواتو داواکاریەکیـان بە دی دێ.

﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ ﴾ ئەمـەش لـە گەورەیـیو بەخشـندەیی خوایـە لەسـەر بەهەشـتیەکان، وە ئـەو ڕقو کینـەی کـە لـە دڵەکانیانـدا هەیە، وە ئـەو کێبڕکێیـەی کە لە نێوانیاندایـە، خـوا ﷻ لێیـان دادەڕنـێ، هەتـا دەبن بـە برایەک کـە یەکتریان خـۆش بوێ، بـە هەمـوو پێوەرەکانـی برایەتی.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾الحجـر.

خـوا ئەوەنـدە ڕێزیـان لـێ دەنێـت، کە هـەر تاکێکیان لـە ناو بەهەشـتدا وا گومـان دەبات کـەس ئەوەنـدی ئـەو نـازو نیعمەتی پـێ نەبەخشـراوە، ئەمەش هەمـوو هۆکارەکانـی ڕقو کینـەو حەسـوودیو ئیرەیـی لە نـاو دەبات.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ واتـە: بـۆ هـەر شـوێنێک بیانەوێ بە ئاسـانی دەیبـەن بـە دەوری کۆشـکەکاندا، یـان بـە دەوری بـاخو باخاتـەکان، بـە چەندین شـوێنی خۆشـدا تێدەپـەڕن، وە پـڕن لـە خێـرو خێراتێـک کـە هەرگیز دوایـی نایەت.

وە کاتێـک کـە ئـەو نیعمەتانـەی خوایـان بـە چـاوی خۆیـان بینـی دەڵێـن: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا ﴾ بـەوەی کـە منەتی کـردوە بەسـەرماندا، وەحی کردوە بـۆ دڵەکانمانو

بڕوایـان پێـی هێنـاوە، وە دڵەکانـی گوێڕایـەڵ کردوە بۆ کـردەوەی چاک تـا گەیاندوونی بـەم دنیایە، وە خوا ﷻ ئیمانو کردەوەکانی پاراسـتووین تا گەیاندینی بەم شـوێنە، سـوپاس بـۆ ئـەو پەروەردگـارەی کە چاکتریـنو بەرێزتریـن نیعەتی خـۆی پێ بەخشـیووین کە لە ژمـاردن نایـەن ﴿ وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ﴾ واتـە: دڵەکانمـان شایسـتەی هیدایەت نەبـوو، ئەگـەر خـوای گەورە بـە منەتی خـۆی هیدایەتـی نەدابایـن ﴿ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ﴾ واتـە: کاتێـک کـە چێژ لەو نـازو نیعمەتانـە وەردەگرن کـە پێغەمبـەران هەواڵیان پێدابـوو، ئـەوە بـوو بـە حەقیقەتێکـی ڕاسـتەقینەی دڵنیاکـەرەوە بۆیـان، پـاش ئـەوەی کە پێشـتر زانسـتێکی ڕاسـتەقینە بـوو لەلایـان، وتیـان: بە ڕاسـتی بەدەسـتمان هێناو بـە چاوی خۆمـان پەیمانـی پێغەمبەرانمـان بینـی، وە ئـەوەی کە هێنابوویـان هەمـووی حەقیقەت بوو، کەمتریـن گومـانو ئاڵـۆزی تێـدا نەبـوو ﴿ وَنُودُوٓاْ ﴾ بە چـاوی ڕێـزو حورمەتـەوە بانگ دەکرێـن ﴿ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا ﴾ واتـە: ئێـوە دەبـن بـە خاوەنی ئەو بەهەشـتەو بە ناوتانـەوە دەکـرێ، لـە کاتێکـدا کـە بێبڕوایـان ئاگـری دۆزەخ کراوە بـە ناویانـەوە، ئەو بەهەشـتە بـە ئێـوە بەخشـراوە ﴿ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ (واتە: بـە هۆی ئەو کـردەوە چاکانەی کـە دەتـان کرد).

هەنـدێ لـە زانایانی پێشـین (سـلف) دەڵێـن: بەهەشـتیەکان لە ئاگـر ڕزگاریان بـووە بە لێ خۆشـبوونی خـوا ﷻ وە بـە میهرەبانـی خـوا خراونەتە بەهەشـتەوە، وە پلەو پایـەی بەرزیان بەسـەردا دابـەش کـراوەو بوون بـە خاوەنی کـردەوەی چـاک، ئەویش بە هـۆی میهرەبانی خواوەیە.

وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا
رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ
مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٤ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن
سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ٤٥ وَبَيۡنَهُمَا
حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ
أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ٤٦
۞وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا
مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٧ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم
بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ٤٨
أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ
لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ٤٩ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ
ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ
إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٥٠ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا
وَلَعِبٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ
لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ٥١

(٤٤-٤٥): ﴿وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ (٤٤) ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ (٤٥)﴾:

خـوا -كاتێـك كـه باسـی جێگیـر بوونـی هــەردوو ئــەو دوو كۆمەڵــەی كــرد لــە هــەردوو دنیــا، وە هەواڵــی پێغەمبەرانیــان بــە چــاوی خۆیــان بینــی لــە پاداشــتو ســزا- دەفەرمــوێ: بەهەشــتیەكان بانگــی دۆزەخیەكانیــان كــرد، ﴿أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا﴾ كاتێــك كــە بەڵێنــی پێدایـن لەسـەر ئیمـانو كـردەوەی چـاك بـە بەهەشـت، بـە ڕاسـتی چووینـە نێـو بەهەشـتەوەو ئـەو وەسـفەی كـە بۆمـان كرابـوو بـە چـاوی خۆمـان بینیمـان ﴿فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ﴾ لـە سـەر بێبڕوایـیو سـەرپێچی ﴿حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ﴾ بێگومـان بینیمـان پەیمانـی ڕاسـتەقینەی خـوا ﷻ ڕاسـت بـوو، وە بـۆ هەمـوو خەڵكـی ڕوون دەبێتـەوە، دەی كـێ لـە خـوای گـەورە ڕاسـت بێژتـرە، وە گومانو دوو دڵیـان لـە لا نەمـا، وە ئـەوەی كـە پێشـتر بەڵێنیـان پێدرابـوو ئەمـڕۆ لـە حەقیقەتـدا بینیـان، وە بـڕواداران لـە ئەوپـەڕی دڵخۆشـیدا بـوون بـە پەیمانـی خـوای پەروەردگـار، وە بێبڕوایـان بـێ ئومێـد بـوون لـە هەمـوو خێرێـكو شـایەتیان لەسـەر خۆیانـدا كـە ئـەوان شایســتەی دۆزەخــن.

﴿فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ﴾ واتــە: لــە نێوانــی دۆزەخیــەكانو بەهەشــتیەكاندا، دەڵــێ: ﴿أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ﴾ نەفریــنو دووریــان لــە گشــت خێــرو چاكەیــەك ﴿عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بــە هــۆی ئــەوەی كاتێــك كــە دەرگــای میهرەبانــی بــۆ واڵا كــردن ئەوان بــە شــێوەیەكی ســتەمكارانە دەرگاكەیــان بــە ڕووی خۆیانــدا داخســتو خەڵكیــان لەســەر ڕێگــای ڕاســت پەشــێمان دەكــردەوە، بۆیــە خۆیــان گومڕابــوونو خەڵكیشــیان بــە دوای خۆیانــدا گومــڕا كــرد.

خـوا ﷻ دەیـەوێ ڕێگـای ڕاسـت بگرنـە بـەر ﴿ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا ﴾ وە ئـەوان دەیانـەوێ ئـەو ڕێگایـە بـە خـوارو نارێـک پێشـانی خەڵـک بـدەن ﴿ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴾ (واتـە: بێگومـان ئـەوان بـە ڕۆژی دوایـی بێبـڕوا بـوون).

وە ئەمـەی کـە بـوو بـە مایـەی ئـەوەی کـە لـە ڕێگـای ڕاسـت لابـدەنو شـوێنی هـەواو ئارەزووەکانیـان بکـەون، بـڕوا نەبوونیـان بـوو بـە ڕۆژی دوایـیو نەترسـانیان لـە سـزای خوایـی، وە نەبوونـی ئومێدیـان بـە پاداشـت. تێگەیشـتن لـەم بانگـەوازەدا ئەوەیـە کـە بـە ڕاسـتی ڕەحمـەتو چاکـەی خـوا ﷻ بـۆ بـڕواداران گشـتگیرە، وە چاکەکانیشـی بەردەوامـە.

(٤٦-٤٩): ﴿ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ٤٦ وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٧ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ٤٨ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ٤٩ ﴾

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞ ﴾ واتـە: لـە نێوانـی بەهەشـتیەکانو دۆزەخیەکانـدا پەردە هەیـە پێـی دەوتـرێ: ﴿ ٱلۡأَعۡرَافِ ﴾ نـە لـە بەهەشـتەو نە لـە دۆزەخـە، بەسـەر هەردوو کیاندا دەڕوانـێ، ئـەوەی لەسـەر ئـەو شـوێنەیە تەماشـای دۆخـی هـەردوو کۆمەڵەکـە دەکات، وە لەسـەر ئـەو پەردەیـە پیاوانێـک هـەن هـەر یەکـە لـە بەهەشـتیو دۆزخیـەکان دەناسـنەوە ﴿ بِسِيمَىٰهُمۡ ﴾ واتـە: بـە هـۆی نیشـانەو شـێوەی تایبەتیانـەوە جیایـان دەکەنـەوە، ئەگـەر دەسـتەی بەهەشـتیەکان ببینـن بانگیـان دەکـەن ﴿ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ﴾ واتـە: سـڵاویان لـێ دەکـەن، وە ئـەوان تـا ئێسـتا نەچوونەتـە بەهەشـتەوە، بەڵکـو ئومێدیـان هەیـە، وە خـوای بـە بەزەیـی ئومێـد ناخاتـە دڵـی کەسـێکەوە مەگـەر ڕێـزی لـێ نابێـت.

﴿ وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴾ کاتـێ کـە ڕوویـان وەردەگێـردری، شـتێکی ناشـرینو نابـووت دەبینـن ﴿ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ کاتـێ کـە ئەوانـەی لەسـەر ئەعرافـن دەسـتەی بەهەشـت دەبینـن، ئومێـدی ئـەوە دەکـەن لـەوان بـن، بۆیـە سـڵاویان لێدەکـەنو ڕێزیـان لێدەگـرن، وە کاتـی ڕوو وەردەگێـرن بەبـێ ویسـتی خۆیـان بـە لای کۆمەڵـی دۆزەخـدا، پەنـا دەگـرن بـە خـوا ﷻ لـەو حاڵـەی تێیـدان، بـە شـێوەیەکی گشـتی.

پاشـان باسـی تایبـەت دەکات پـاش باسـکردنی گشـتیو دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ ﴾ ئـەوان لـە کۆمەڵـی دۆزخـن، لـە دنیـادا خـاوەن رێـز شـکۆو شـەرەف بـوون، دەسـتەی ئەعـراف پێیـان دەڵێـن، کاتـێ کـە دەیانبینـن بـە تەنهـا سـزا دەدرێـن، بەبـێ ئـەوەی کـەس پشـگیریان لـێ بـکاتو بـە دەمیانـەوە بچێت: ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ ﴾ ئـەو کۆمەڵـەی کـە لـە دنیـادا پشـتان پێیـان دەبەسـت لـە خۆشـیو ناخۆشـیەکاندا، ئـا ئەمـرۆ هەڵوەشـایەوەو هیـچ سـوودێکی پـێ نەگەیانـدن، چ شـتێک سـوودی پـێ گەیانـدن؟ بەرانبـەر بـە هـەقو ئـەو کەسـەی پەیامەکـەی پـێ هێنابـوو.

پاشـان کەسـانێکیان پـێ پیشـان دەدرێ لـە ئەهلـی بەهەشـت کـە لـە دنیـادا هـەژارو لاواز بـوون، ئەوانـەی کـە لـە دۆزەخـدان گاڵتەیـان پـێ دەکـردن، بـە ئەهلـی دۆزەخ دەڵێـن: ﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ ﴾ ئەوانـەی کـە خـوا ﷻ خسـتوونیە بەهەشـتەوە ﴿ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍ ﴾ بـە هـۆی ئـەوەی بـە کەمتـان دەزانیـنو سـەرتان لـە خۆتـان سـوورما بـوو، بێگومـان ئێـوە سـوێندتان خـوارد کـە خـوا ﷻ نایانخاتـە بـەر میهرەبانـی خـۆی، وە بۆتـان دەرکـەوت لەلایـەن خـواوە ﷻ کـە ئێـوەش لـێ پرسـینەوەتان لەگەڵـدا دەکرێـت. ﴿ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ ﴾ (برۆنـە بەهەشـت) بـە هـۆی ئـەو کردەوانـەی کـە کردووتانـە، واتـە: بـە لاوازەکان دەوتـرێ فەرمـوون بچنـە بەهەشـتەوە بـە هـۆی ئـەو کـردەوە چاکانـەی کـە کردووتانـە ﴿ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ ﴾ لـەو ناخۆشـیانەی کـە لـە داهاتـوودا دێـت ﴿ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴾ لـە سـەر ئـەوەی کـە رابـوورد، بەڵکـو ئێـوە لـە ئاسایشـی تـەواو دان، دڵخۆشـن بـە هەمـوو خێـرو چاکەیـەک.

ئەمـەش ئـەو فەرمایشـتەی خوایـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجۡرَمُواْ كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ ٢٩ وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ ٣٠ ﴾ تـا دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ ٣٤ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ٣٥ ﴾ المطففـین.

زانایـانو توێژەرەوانـی قورئـان بۆچوونـی جیاوازیـان هەیـە دەربـارەی ئـەوەی کـە دەسـتەی ئەعـراف کێـن؟ وە کردەوەکانیـان چیـە؟ بـۆ چوونـی تـەواو ئەوەیـە ئـەوان گەلێکـن چاکـەو خراپەکانیـان یەکسـانە، نەخراپەیـان زۆرتـرە بچنـە دۆزەخـەوە، وە نـە چاکەیـان زیاتـرە بچنـە بەهەشـتەوە، ئـەوان لـە ئەعـراف دەمێننـەوە هەتـا خـوای کاربەجـێ ویسـتی لەسـەر بێـت، پاشـان خـوا ﷻ ئەگـەر بیـەوێ بـە میهرەبانـی خـۆی

دەیانخاتـە بەهەشـت، چونکـە ڕەحمـەت‌و میهرەبانـی پێشـی خەشـم‌و تووڕەیـی کەوتووە، وە دەوری هەمـوو شـتێکە داوە.

(٥٠-٥٣): ﴿ وَنَادَىٰٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا۟ عَلَيْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُوا۟ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٥١﴾ وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ ۚ يَوْمَ يَأْتِى تَأْوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ قَدْ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾

وە دۆزەخیـەکان بانـگ‌و هـاوار لـە بەهەشـتیەکان دەکـەن کاتێـک کـە سـزا دەدرێـن، وە کاتێـک کـە برسـێتی‌و تینویەتـی تینیـان بـۆ دێنـێ هاواریـان بـۆ دەکـەن‌و دەڵێـن: ﴿ أَنْ أَفِيضُوا۟ عَلَيْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ﴾ لـە خـواردن، بەهەشـتیەکان وەڵامیان دەدەنـەوەو دەڵێـن: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا ﴾ واتـە: (خـوا قەدەغـەی کـردوە) خـواردن‌و خواردنـەوەی ئـاوی بەهەشـت ﴿ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ (لەسـەر بێبڕوایـان) ئـەوە وەک سـزایەک بۆیـان لەسـەر ئـەو بێبڕواییـەی کـە بـە ئایەتەکانـی خـوا ﷻ کردیـان، وە بـە هـۆی ئـەوەی ئـەو ئاینـەی کـە فەرمانیـان پێکرابـوو پابەنـد بـن پێـی، وە پەیمانیـان پێدرابـوو بـە پاداشـتی تـەواو ﴿ لَهْوًا وَلَعِبًا ﴾ واتـە: دڵیـان سـەرقاڵ بـوو بـە شـتێکی تـرەوەو پشـتیان تێکـرد، وە بـە گاڵتەجاڕیەوە تەماشـایان دەکـرد ﴿ وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾ بـە جوانـی‌و ڕازاوەییەکانـی، بـەو هۆیـەوە خەڵکێکـی زۆر بانگەشـەی بـۆ دەکـردو دڵـی پێـی خـۆش بـوو، وە وایـان دەزانـی لـە پاڵیـا دەحەسـێنەوەو پشـتیان کـرد لـە ڕۆژی دوایـی‌و لـە بیریـان کـرد.

﴿ فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ ﴾ واتـە: وازیـان لێدەهێنیـن، بـا سـزا بچێـژن ﴿ كَمَا نَسُوا۟ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا ﴾ وایـان دەزانـی ئـەوان تەنهـا بـۆ ئـەم دنیایـە دروسـتکراون، وە هەرگیـز لـە داهاتـوودا پاداشـت نادرێنـەوە.

﴿ وَمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴾ ئینـکاری کردنیـان بـە هـۆی کەمتەرخەمـی نەبـوو لـە ئایەتەکانـی خـواو شـێوەی ئاشـکراکردنیان،

وَلَقَدْ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً
لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ يَوْمَ يَأْتِى تَأْوِيلُهُۥ
يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ
فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى
كُنَّا نَعْمَلُ قَدْ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟
يَفْتَرُونَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ
فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ
يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ
بِأَمْرِهِۦٓ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾
ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾
وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا
إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ
ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا
سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ
ٱلثَّمَرَٰتِ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾

بەڵکو بێگومان ﴿ جِئْنَٰهُم بِكِتَٰبٍ فَصَّلْنَٰهُ ﴾ واتە: هەموو ئەوانەی کە خەڵک پێویستی پێی دەبێ ڕوونمان کردۆتەوە ﴿ عَلَىٰ عِلْمٍ ﴾ واتە: لە ڕووی زانستیەوە لەلایەن خوای گەورەوە بە بارودۆخی بەندەکان لە هەموو کاتو شوێنێکدا، وە ئەوەی کە بەرژەوەندی ئەوانی تێدایەو ئەوەیشی بەرژەوەندی ئەوانی تێدا نیە، درێژە پێدانێک نەبووە لەسەر بنەمانی نەزانین لە کارووبارەکان، کە بێ ئاگابێ لە هەندێ بارووددۆخو بڕیارێکی نەگونجاو دەر بکات، بەڵکو درێژە پێدانێک بوو لەسەر بنەمای زانستێک کە دەوری هەموو شتەکانی داوە، وە بەرفراوانی میهرەبانی بۆ هەموو شتێک.

﴿ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ واتە: بڕواداران بە هۆی ئەم کتێبەوە هیدایەت دەدرێن لە گومرایی، وە ئاشکرا کردنی هەقو باتڵ، وە بە هۆی ئەوەوە میهرەبانی خوایان بەسەردا دەبارێ، ئەویش بریتیە لە خێرو خۆشبەختی لە دنیاو دوارۆژدا.

ئەوانەی کە سزایان لەسەر پێویست بوو بڕوایان بەم کتێبە پیرۆزە نەهێناو گوێڕایەڵی فەرمانو قەدەغە کراوەکانی نەبوون، هیچ فرتو فێڵێکیان نەما ئیلا ئەوە نەبێ کە سزایان لەسەر پێویست بێ، وەک قورئان ئاماژەی پێکردوە.

بۆیە دەفەرموێ: ﴿ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُۥ ﴾ واتە: ڕوودانی ئەوە کە خوا هەواڵی پێداوە وەک یوسف ﷺ کاتێک کە خەوەکەی هاتە دی فەرمووی: ﴿ يَوْمَ يَأْتِى تَأْوِيلُهُۥ يَقُولُ ٱلَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ ﴾ واتە: پەشیمانو دەستی خۆیان دەگەزن لەوەی کە ڕوویدا، تکای ئەوە دەکەن کە لە تاوانەکانیان خۆش بێت دان بەوەدا دەنێن کە پێغەمبەران هێناویانە: ﴿ قَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَآءَ فَيَشْفَعُوا۟ لَنَآ أَوْ نُرَدُّ ﴾ بۆ دونیا ﴿ فَنَعْمَلَ غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ﴾؟ بە ڕاستی کات بەسەرچوو بۆ گەڕانەوە بۆ دونیا ﴿ فَمَا

نَنفَعُهُمْ شَفَعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾المدثر، وە داوای گەڕاندنەوەیـان بـۆ دونیـا بۆ ئـەوەی کاری چاکـی تێدا بکەن درۆیە، بەڵکو تەنها مەبەسـتیان ئەوەیە سـزا لەسـەر خۆیـان لابەن خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾الأنعام، (واتـە: ئەگـەر گێڕراباشـنەوە هـەر دەگەڕانـەوە سـەر ئـەوەی کـە ڕێگرییـان لێـی کـراوە، وە بێگومـان درۆزنـن).

﴿قَدْ خَسِرُوٓا أَنفُسَهُمْ﴾ کاتێـک کـە نەفسـی خۆیانیـان لـە ناوبـرد، ئـەم زەرەرمەندیـەش وەک لـە دەسـتدانی مـاڵو منداڵ نیـە، بەڵکو ئەمـە دۆڕانێکە بە هیـچ شـێوەیەک پڕنابێتەوە.

﴿وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾ لـە دنیادا، لەوەی کە نەفسـیان ئاواتی بۆ دەخواسـتو شـەیتان پەیمانـی پێدابـوون، بە شـێوەیەک کاریان تێـدا کرد کـەوا نەزانن لێپرسـینەوەیان لەسـەر دەکریـت، وە بەتاڵیو گومرایی خۆیانو ڕاسـتی پەیامـی پێغەمبەرانیان بۆ دەرکەوت.

(٥٤): ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ۗ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾

خـوا ﷻ ڕوونـی دەکاتەوە کە ئەو تـاکو تەنیایەو هاوەڵی نیـە، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ﴾ وە ئـەوەی کـە (لـە ئاسـمانەکانو زەویـ)ش دایـە، دەربـارەی گەورەییو بەرفراوانیو فەرمانو وردەکاریەکانی، وە داهێنانو دروسـتکراوەکانی.

﴿فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ﴾ واتە: سـەرەتای ڕۆژی یەک شـەممە بوو، کۆتاییەکـەی ڕۆژی جومعە بـوو، کاتـێ کە لێبویـەوەو فەرمانی خۆی بەسـەردا سـەپاندن ﴿ٱسْتَوَىٰ﴾ خـوا ﷻ (بەرز بویـەوە) ﴿عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ (بۆ سـەر عەرشـی) گـەورە، کـە دەوری ئاسـمانەکانو زەویو ئەوەشـی کـە تێیدایـە داوە، بـەرز بویـەوە، بـە بـەرز بوونەوەیـەک شایسـتەی گەورەیـی ئـەو بێـت، بـەرز بـووەوە سـەر عـەرش، وە دەوری هەمـوو موڵکێکـی دا، وە کاروبـاری بەندەکانـی بـە ڕێ خسـتوە، وە بڕیـاری گەردوونی ڕایی کـرد، لەگەڵ بڕیـاری دینیدا، بۆیە دەفەرمـوێ: ﴿يُغْشِى ٱلَّيْلَ﴾ تاریکـی ﴿ٱلنَّهَارَ﴾ ڕۆشـنایی، هەمـوو سـەر زەوی تاریـک دەکاتو نەوەکانـی ئـادەم ئارامـی تێـدا وەردەگـرن، وە دروسـتکراوەکان دەگەڕێنـەوە بۆ شـوێنی حەوانەیـان، وە لـە مانـدوو بـوونو ڕۆشـتنە پشـوو دەدەن، لـەوەی کـە لـە ڕۆژدا بەسـەریان دێت.

﴿يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا﴾ هـەر کاتێـک شـەو دێـت ڕۆژ نامێنێ، وە هـەر کاتێک ڕۆژ دێت شـەو

کۆتایی دێت و نامێنێ، بەم شێوەیە بەردەوامە هەتا هەموو جیهان دەپێچێتەوە، پاشان بەندەکان لە دونیا دەگوازرێنەوە بۆ دنیایەکی تر.

﴿ وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ ﴾ واتە: لە ژێر بارو ڕێکخستنی خوا دان، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خاوەن سەرجەم وەسفەکانی کامڵ بوون، دروستی کردوەو بە گەورەی داناوە، هەڵبەتە ئەمەش ئاماژەیە بۆ تەواوی دەسەڵاتی خوا ﷻ، وە ئەوەی کە تیایدایە لە بڕیارو ڕێکخستن و وردەکاری، وە بەڵگەیە لەسەر حیکمەت و دانایی خوا ﷻ، وە ئەو هەموو سوودو کەڵکە گرنگە، وە ئەوەشی لە خوار ئەوانەوەیە بەڵگەیە لەسەر بەرفراوانی میهرەبانی خوا ﷻ، وە تەنها ئەو پەرستراوی ڕاستەقینەیەو پێویستە تەنها بەندایەتی بۆ ئەو بکرێت.

﴿ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ ﴾ واتە: بێداربن هەموو ئەو بەدیهێنراوانەی کە سەرجەم دروستکراوەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوە بە هەموو جۆرو شێوەکانیەوە خوا ﷻ دروستی کردوون، بەدیهێنان فەرمانی (الكونية والقدرية) گەردوونی و چارەنووسەکان لە خۆ دەگرێت، وە فەرماندان سەرجەم بڕیارە ئاینی و شەرعیەکان لە خۆدەگرێت، وە پاشان بڕیاری پاداشتیش، وە ئەوەش لە شوێنی مانەوەی هەتا هەتایی دەبێت ﴿ تَبَارَكَ ٱللَّهُ ﴾ واتە: گەورەیی و بێگەردی لە هەموو کەم و کوڕیەک و هەموو خێرو چاکەیەک تەنها بۆ خوا ﷻ، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە بە تەواوترین شێوە وەسف کراوە، وە پاکی بۆ ئەو خوایەی کە خێرو چاکەی بێ پایانی زۆری ڕشتوە بەسەر دروستکراوەکانیدا، هەموو بەرەکەتێک لە گەردووندا بە هۆی ڕەحمەتی خواوەیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ وە کاتێک کە باسی گەورەیی و دەسەڵاتی ڕەهای خۆی کرد کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بە تاک و تەنها بپەرسترێ لە هەموو کارو بارەکاندا، فەرمانی کردوە بەمەو دەفەرموێ:

(٥٥-٥٦): ﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾:

پاڕانەوە دەچێتە چوارچێوەیەوە: پاڕانەوەی داواکردن و پاڕانەوەی بەندایەتی بۆ کردن، فەرمانی کردوە بە نزاو پاڕانەوە لێکردنی ﴿ تَضَرُّعًا ﴾ واتە: بە زەلیلی و کڕوزانەوە لە پاڕانەوەدا ﴿ وَخُفْيَةً ﴾ واتە: بە نهێنی، چونکە مەترسی ڕیایی

لێدەکرێت، بەڵکو بە نهێنیو بە تایبەت خوا ﷻ بپاڕێنەوە، ﴿إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ﴾ واتە: ئەوانەی دەستدرێژی دەکەن لە هەموو کاروبارەکاندا (خوا خۆشی ناوێن)، لەو دەست درێژیانە: ئەوەیە کە ئینسان داوای شتێک لە خوا ﷻ بکات بۆی نەگونجێ، یان ڕۆبچێ لە داواکردندا، یان زۆر دەنگی بەرز بکاتەوەو هاوار بکات، هەموو ئەمانە لە چوارچێوەی دەست درێژی کردنە لە پاڕانەوەدا کە بێگومان قەدەغەن، ﴿وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: بە سەرپێچی کردن ﴿بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا﴾ واتە: بە گوێڕایەڵی، چونکە سەرپێچیەکان خوورەوشتو کردەوەو ڕزقو ڕۆزیەکان تێکدەدەنو لەباری دەبەن، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ ﴿٤١﴾﴾ الروم. وەک چۆن گوێڕایەڵیەکان دەبنە مایەی چاکردنی کردەوەو ڕزقو ڕۆزی لە دنیاو دوارۆژدا...

﴿وَٱدْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا﴾ واتە: هاوارو نزا بیات بۆ خوا ﷻ، هیوای لێوەرگرتنی هەبێو بترسێ لەوەی ڕەت بکرێتەوە، بە پێچەوانەی پاڕانەوەی کەسێک کە سەرسام بێ بە خۆی، وە خۆی لە پلەو پایەی خۆی بە گەورەتر بزانێ، یان پاڕانەوەی کەسێک بێئاگا بێو نەزانێ چی دەڵێ، وە پوختەی ئەوەی کە خوا ﷻ باسی کردوە دەربارەی ئادابەکانی پاڕانەوە: دڵسۆزی بۆ خوای تاکو تەنها، چونکە ئەوە دەبێتە مایەی پاڕانەوە بە پەنهانی، وە شاردنەوەو پەنهانی پاڕانەوە تەنها بۆ خوا بێ، بە دڵێکی پڕ لە ترسو پڕ لە ئومێدو هیوا نەک بێئاگا بێت لەوەی داوای دەکات، وە هەروەها بێ باک نەبێ لە وەرگرتنی پاڕانەوەکەی، ئەمە لە چاکترین شێوەکانی پاڕانەوەیە، چونکە ئیحسانو چاکە لە هەموو بەندایەتی کردنێکدا بریتیە لەوەی کۆششی تێدا بکرێو بە تەواوترین شێوە ئەنجام بدرێ، وە هیچ کەمو کورتیەکی تێدا نەبێ لە هیچ ڕوویێکەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَحْمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ﴾ لە بەندایەتی کردنی خوا ﷻ، ئەوانەی چاکە خوازن بەرانبەر بەندەکانی خوا ﷻ، بەندە تا چاکەی زیاتر بکات نزیکتر دەبێ لە میهرەبانی خوا ﷻ، ئەم دەقە هاندانی تێدایە بۆ چاکەو چاکەکاری.

(٥٧-٥٨): ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ ٱلْمَآءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَشْكُرُونَ ﴿٥٨﴾﴾:

خـوا ﷻ شـوێنەوارێ لـە شـوێنەوارەکانی دەسـەڵاتی خـۆی ڕوون دەکاتەوە، کـە یەکێکە لـە بەخشـینەکانی میهرەبانی خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦ ﴾ واتـە: ئـەو بایانەی کە مـژدەدەرن بـە باراندنی بارانی ڕەحمەت بە ویسـتی خـوا ﷻ بـۆ سـەر زەوی، مـژدە دەدات بـە خەڵکـی بـە ڕەحمـەتو میهرەبانـی خـوا ﷻ، وە دڵەکانیـان ئاسـوودە دەبـێ پێـش باراندنـی ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَقَلَّتْ ﴾ بایـەکان ﴿ سَحَابًا ثِقَالًا ﴾ هەنـدێ لـەو بایـە باڵی پێوە دەنـێو دەیپێچێتـەوە، بایەکی تـر دەیپێتێنێ ﴿ سُقْنَٰهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ ﴾ شـوێنێکی وشـکانی کـە خەریکـە ئاژەڵەکانـی لـە نـاو دەچـن، وە خەریکە خەڵکەکەیشـی بـێ ئومێـد دەبـن لـە میهرەبانـی خـوا ﷻ ﴿ فَأَنزَلْنَا بِهِ ﴾ واتە: بـەو هەورو بارانــە بەســەر شـوێنێکی مـردوودا ﴿ ٱلْمَآءَ ﴾ واتە: بارانێکی بـە خوور لەنـاو هەورەکانەوە، وە خـوا ﷻ بـە ویسـتی خـۆی بایەکیان بـۆ ڕەوانـە دەکات بەش بەشـی بکات ﴿ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾ بـەو شـێوە لـە ڕەحمـەتو میهرەبانـی خـوادا ﷻ دەبـن لـە نـازو نیعمەتەکانـی چێـژ وەردەگرن.

کە دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ واتـە: وەک چۆن زەویمان زینـدوو کـردەوە پـاش ئەوەی کـە مردبوو، بـە هەمان شـێوە مـردووەکان لـە گۆڕەکانیان دەردەهێنیـنو زیندوویـان دەکەینـەوە، پاش ئەوەی کە ئێسـکو پروسـکیان لـەتو پەتو بـڵاو بوەتـەوە، بێگومـان ئەمـە بەڵگـە هێنانەوەیەکی ڕوونـە، بە ڕاسـتی جیاوازی لـە نێوان ئـەم دوو کارەدا نیـە، وە ئـەوەی کـە نکوڵـی لە زینـدوو بوونـەوە دەکات لەگەڵ ئـەوەدا بە چـاوی خـۆی هاوشـێوەکەی دەبینـێ، ئەمـەش جگـە لـە نکوڵـی کـردنو یاخی بـوون لە ڕاسـتیەکان هیچـی تـر نیە، ئـەم ئایەتـە هاندەرە لەسـەر پەنـد وەرگرتـنو بیرکردنـەوە لە بەخشـەکانی خـوا ﷻ، وە تێڕوانینیـان بە باشـترین شـێوە، نـەک تەنها خۆیان لێـی بێئاگا بکەنو پشـت گوێـی بخەن.

وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ
إِلَّا نَكِدٗاۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ ٥٨
لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم
مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ٥٩
قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٦٠ قَالَ يَٰقَوۡمِ
لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦١
أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ
مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٦٢ أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ
عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ
٦٣ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ
كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ ٦٤ ۞ وَإِلَىٰ
عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ
غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ٦٥ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ
إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٖ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٦٦
قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي سَفَاهَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٦٧

پاشـان خـوا ﷻ بـاس لـە جیـاوازی ئـەو زەویانـە دەکاتـەوە کـە بارانیـان بەسـەرا دەبارێنـیٚ دەفەرمویٚ: ﴿وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ﴾ واتـە: خۆڵێکـی بـە پیـتو بـە بەرەکەت، کاتێـک کـە بارانـی بەسـەردا دەبـاریٚ ﴿يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ﴾ واتـە: کـە ئامادەکـراوە بـۆی ﴿بِإِذۡنِ رَبِّهِۦ﴾ واتـە: بـە ویسـتو ئـارەزووی خـوا ﷻ، هـۆکارەکان لـە بەدیهاتنـی شـتەکاندا سـەربەخۆ نیـن، بەڵکـو پێویسـتیان بـە فەرمانـی خـوا هەیە ﴿وَٱلَّذِي خَبُثَ﴾ لـە زەوی ﴿لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗا﴾ واتـە: درکـو داڵ نەبـیٚ شـتی بە سـوودی لیٚ نـارویٚ.

﴿كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ﴾ واتـە: بـەش بەشـی دەکەینو روونـی دەکەینـەوەو نموونەی بـۆ دەهێنینەوە، بـۆ ئـەو گەلـەی کـە شـوکرانە بژێـری خـوا ﷻ دەکـەنو دان بـە نـازو نیعمەتەکانیدا دەنێـن، وە بـە کاری دەهێنـن لـە ڕەزامەندی خـوا ﷻدا، بێگومان ئەوانە سـوود لـە فەزڵو چاکـەی خـوا وەردەگـرن کـە لـە کتێبەکەیـدا هێناویەتـی، وە شـوێنی داواکاریەکانـی دەکـەون، چونکـە دەزانن ئەوە باشـترین نـازو نیعمەتە لەلایـەن پەروەردگاریانـەوە، بۆیە بـە دڵخۆشـیو خۆ بە کـەم زانینەوە وەریدەگـرن، وە بیری لـیٚ دەکەنەوەو تێیـدا ڕادەمێنن هـەر کەسـەو بـە پێـی تێگەیشـتنو خـۆ ئامـادە کردنـی ڕووناکـی خوایی بـۆ دێت.

ئەمـە نموونەیـە بـۆ ئـەو دڵانـەی کاتێـک کـە وەحیـان بـۆ دادەبـەزیٚ کـە بریتیـە لـە کرۆکـی ژیـان، وەک چـۆن باران سـەرچاوەیە بۆ ژیـان، دڵە پـاکو خاوێنـەکان کاتیٚ وەحیـان بـۆ دێـت وەری دەگـرنو لێیـەوە فێـر دەبن، وە بـە پێـی خاوێنـی بنەماکانیانو چاکـی بنەڕەتیـان سـەوز دەبـن، بـەڵام ئـەو دڵانەی کـە پیسـنو هیـچ خێرێکیـان تێدا نیـە، ئەگـەر وەحـیو سروشـیان بۆ بێـت لە هیـچ شـوێنێکدا جێگـەی نابێتـەوە، بەڵکو لە بێناگایـدا دەبـیٚ یـان دژایەتـی دەکات، ئەمـە وەک ئـەوە وایە بـاران ببارێت بەسـەر لمو

بەردەکانــدا کــە هیچ کاریگەریان لەســەر دروســت نــاکات، ئەمە وەک ئەو فەرمایشــتەی خوایــە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ زَبَدًا رَّابِيًا ﴿١٧﴾ ﴾الرعد، (واتــە: خــوا لــە ســەرێوە ئــاوی ناردۆتە خــوار چەند دۆڵو شــیوێک هــەر کامێکیــان بە ئەندازەیــی خۆیی ئاوی تــێ ڕژاوەو بۆتــە لێزماو ســەرەنجام لێزماوەکە کــەف و خشــب و خاڵێکی بەرز بــووەوەی هەڵگرت هەروەهــا لەو (کانزایــان)ەی ئاگریان دەدەنــە بــەرو (قاڵیــان دەکەنــەوە) بە مەبەســتی دروســتکردنی خشــڵ، یــان کەلوپەلیش خڵتــەو کەفــی وەک وی هەیە).

(٥٩-٦٤): ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٥٩﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٦٠﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٦٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾:

خــوا ﷻ بــاس لــە بەڵگەکانــی یەکتاپەرســتی دەکات بــە کۆمەڵــە بەڵگەیەکی گشــتگیر، بەڵگــە بــە پشــتیوانی کــردنو باســکردنی ئــەو کارەســاتانە دەهێنێتــەوە کــە بەســەر پێغەمبەرانــدا هاتــووە کاتێک کە بانگەشــەی گەلەکانیان کــردوە بۆ یەکتاپەرســتی، بەڵام نکوڵیان لێکردوە، باســی ئەوە دەکات کە چۆن یەکتاپەرســتانی ســەر خســتوە، وە ئەوانەی کــە دژایەتیــان کــردوون ســەرجەمیانی لــە ناوبــرد، وە چــۆن پشــتیوانی لــە بانگــەوازی پێغەمبــەران کــردوە لە ســەر یــەک ئاینو یەک بیــرو بــاوەڕ، دەربارەی نــووح ﷺ کە یەکــەم پێغەمبــەر بــووە دەفەرمــوێ: ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ ﴾ بانگیــان دەکات بۆ یەکتاپەرســتی خــوای تــاکو تەنهــا، کاتێک کــە بتەکانیــان دەپەرســت ﴿ فَقَالَ ﴾ پێی وتــن: ﴿ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ ﴾ واتــە: بــە تــاکو تەنهــا ﴿ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ ﴾ چونکە دروســتکەرو ڕزقو ڕۆزیــدەرو ڕێکخــەری ســەرجەم کارەکانــە، وە بێجگە لــەو هەمووی دروســتکراوو ڕێکخــراوە، هیــچ دەســەڵاتو توانایەکیــان نیــە لــەو کاروبارانــەدا، ئەگەر گوێڕایەڵــی نەکــەن ئەوە ســزایان دەدات، وە ئەمە لە ئامۆژگاریەکانێتــی ﷺ وە لە نەرمو نیانیەتــی لەگەڵیانــدا، چونکە ترســاوە لــەوەی بۆ هەتا هەتایی ســزا بدرێن، هاو شــێوەی برا پێغەمبەرەکانــی کــە هاوســۆزو هاوخەم بوون بــۆ گەلەکانیــان زیاتر لە بــاوکو دایکیان،

کاتێـک کە ئەم قسـەیەی پێوتن بە ناشـرینترین شـێوە وەڵامیان دایـەوە ﴿ قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ ﴾ واتـە: دەسـەڵاتدارە دەوڵەمەنـدەکان ئەوانـەی کـە خەڵکی شـوێنیان دەکەوتن، ئەوانـە سروشـتیان وابوو کـە بەرانبەر بەهەقو ڕاسـتی لـووت بەرزی بنوێنـن وە ملکەچی پێغەمبـەران نەبـن ﴿ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ خـوا ﷻ ناشـرینیان بـکات بـەوەوە نەوەسـتان کـە گوێڕایەڵـی پێغەمبەرانیـان نەکـەن، بەڵکو لە جیاتـی ئەوە لـووت بەرزیان بەسـەردا کردن، وە بە ناشـرینترین شـێوە لەکەداریان کـردن، بەوەی کـە گومڕاییان داوە پاڵیان.

وە بە گومڕاکردنیشـەوە نەوەسـتان هەتـا گومڕاکردنێکـی ڕوونو ئاشـکرایان داوە پاڵیان، ئەمـە گەورەتریـن جـۆری لووت بەرزیە کـە لاوازترین کەسـیش ئەوە ئەنجام نـادات، ئەم وەسـفە پـڕاو پڕە لەسـەر گەلی نـووح ﷺ، ئەوانەی کـە بتەکانیان هێنـاو وێنایان کردو بـە دەسـتەکانی خۆیان دایان تاشـی، لەو شـتە بێ گیانانەی کـە نەدەبیسـتنو نە دەبینن، وە هیـچ سـوودێکیان نیـە بۆیان، هەسـتان لە جێی دروسـتکەری ئاسـمانو زەویـدا دایان نان، وە هەرچـی لـە توانایانـدا بووایە لـە جۆرەکانی قوربانـی درێغیـان نەدەکرد لـە پێناویاندا، وە ئەگـەر ئـەوان بیـرو هزرێکیـان نەبووایـە کـە بەڵگەیان لەسـەر پێویسـت بکرایە ئەوە بڕیـار دەدرا بەسـەریاندا بـەوەی کـە شـێتەکان لـەوان عاقڵتـرو ژیرتـرن، نـووح ﷺ وەڵامـی دانـەوە بـە شـێوەیەکی زۆر جـوانو نـەرمو نیـان، بەڵکـو گوێڕایەڵـی بکـەن، فەرمـووی: ﴿ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ ﴾ واتـە: ئـەی گەلەکـەم! مـن گومـڕا نیـم لە هیچ شـتێکدا، بەڵکـو مـن هیدایـەت دەرو ڕێنمایـی کارم، بەڵکـو هیدایەتـی ﷺ لە شـێوەی هیدایەتـی براکانـی بـوو، لـە پێغەمبەرانـی خۆڕاگـری بەهێـزو دان بەخـۆدا گـرو خاوەن هیممـەت (أولـوا العـزم)، بەرزتریـن جـۆری هیدایـەتو تەواوترینیان بریتیە لـە هیدایەتی پێغەمبەرایەتـی کە تەواوو کامڵە، بۆیـە دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتـە: پەروەردگـاری منـەو پەروەرگاری ئێـوەو هەمـوو خەڵکیە، ئـەو پەروەردگارەی کە هەمـوو خەڵکـی پـەروەردە کـردوە بـە جوانتریـنو چاکترین شـێوە، کـە گەورەترینیان پێغەمبەرانـی بـۆ بەندەکانی نـاردووە، فەرمانیان پـێ دەکات بە کردەوەی چاکو ڕەوشـتی بـەرزو بەڕێـزو عەقیدەی پـاکو چـاک، وە قەدەغەیان لێـدەکات لـە دژو پێچەوانەکانی. بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ ﴾ واتە: کارو پیشـەی من ئەوەیە پەیامـی یەکتاپەرسـتیتان پـێ ڕابگەیەنم، وە بە هەمان شـێوە فەرمـانو قەدەغەکراوەکانیش

بــە شـێوەی ئامۆژگــاریو دڵســۆزیە بۆتــان، ﴿ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ کەواتــە پێویستــە لەســەرتان گوێڕایەڵــی فەرمانەکانــم بکەن ئەگەر ئێــوە دەزانن.

﴿ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ ﴾ واتــە: چــۆن ســەرتان ســوور دەمێنــێ لــە حاڵەتێ کە نابێ ســەرتان لێی ســوور بمێنــێ، ئەویش ئەوەیە کە یادخســتنەوەو ئامۆژگاریتــان بــۆ هاتــووە لەســەر دەســتی پیاوێک لــە خۆتــان حەقیقەتو ڕاســتگۆییو بارودۆخــی بــاش دەناســنو دەزانن؟ بە ڕاســتی ئەمــە پشــتیوانیو چاکەی خوایە بــۆ ئێوە، کــە هــەق وایە لــە جیاتی ئەمــەدا ســوپاسو ستایشــی بکەن.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ لِيُنذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا۟ وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ واتــە: بــۆ ئــەوەی بتــان ترســێنێ لــە ســزای بــە ئێــش، وە ئــەو هۆکارانــەی دەبنــە مایــەی ڕزگــار بــوون بیگرنــە بــەر لە لەخواترســانو پارێــزکاری بە ئاشــکراو نهێنی، بەو شــێوەیە میهرەبانی خوا ﷻ بەســەریاندا دادەبارێ.

بەڵکــو هیچ کەڵکێکی نەبوو، وە ســەرکەوتووش نەبــوو ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ﴾ واتــە: لــەو کەشــتیەی کــە خــوا ﷻ فەرمانی کردبــوو نووح عليه السلام دروســتی بــکات، وە وەحــیو نیگــای بــۆ کــرد کە لــە هەمــوو جــۆرە ئاژەڵێک نێــرو مێیــەک بار بــکات، وە هەروەهــا مــاڵو منداڵو ئەوانــەی کە لەگەڵیــدا بڕوایان هێناوە هەمووی خســتە ســەر کەشــتیەکەو ســەرەنجام ڕزگاریان بوو.

﴿ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴾ لەســەر هیدایەت، هەقو ڕاســتیان بینیو خوا ﷻ پێی نیشــان دان چەندین بەڵگەو نیشــانەی ڕوونو ئاشــکرا لەســەر دەســتی نــووح عليه السلام ئــەوەی کە خــاوەن عەقــڵو ژیریە بــەو نیشــانانە بڕوادەهێنــێ، بەڵام ئــەوان گاڵتــەو لاقرتێیــان پێکردو پێــی کافر بوون.

(٦٥-٧٢): ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ ۚ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِى ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةً ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ ٱللَّهَ وَحْدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا ۖ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ

قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ أَتُجَٰدِلُونَنِي فِي أَسْمَآءٍ سَمَّيْتُمُوهَآ
أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ
﴿٧١﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَمَا كَانُواْ
مُؤْمِنِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾:

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ﴾ واتــە: وە (هود)مــان نــارد بــۆ لای گەلی عادی یەکــەم، ئەوانــەی کــە لەســەر زەوی یەمەنــدا نیشــتەجێ بــوون ﴿ أَخَاهُمْ ﴾ براکەیــان لــە ڕەچەڵەکــدا ﴿ هُودًا ﴾ کــە هــوودە ﷺ بانگیان دەکات بۆ یەکتاپەرســتی، وە شــیرکو سەرکەشــیو ســتەم کردنیان لــێ قەدەغــە دەکات لەســەر زەویدا.

﴿ قَالَ ﴾ (هــود) پێــی وتــن: ﴿ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾ (ئایا خۆتــان ناپارێــزن) لە تووڕەییو ســزای خوا، ئەگەر لەســەر ئــەو ڕێچەی لەســەرین بڕۆن؟

﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦٓ ﴾ بانگەوازەکەیــان ڕەتکــردەوەو تانەیــان لــە بۆچوونەکەیــدا: ﴿ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾ واتــە: بــە ڕاســتی ئێمــە تۆ لــە گێلیو نەفامیــدا دەبینین کە بە کەســێکی ژێــر نایەیتە پێــش چاومان، وە گومانــی تەواومــان هەیــە کە تــۆ یەکێکی لــەو درۆزنانە.

بــە ڕاســتی حەقیقەتەکانیــان لەلا پێچەوانــە بوویەوە، وە لەســەر کوێــری بڕیاریاندا کاتێک کــە تانەیــان لــە پێغەمبەرەکەیاندا بــەوەی کە لــە خۆیاندا هەیــە، بێگومان ئــەو دوورترین کــەس بوو لــەو ڕەوشــتانەوە، بێگومان ئەوان گێــلو گەوجو درۆزنــن، وە چ گەمژەییەک لــەوە گەورەتــرە کە ڕاســتیو هــەق بــە نکوڵی کــردن وەڵام بداتــەوە، وە لــووت بەرزی بنوێنــێ بەرانبــەر گوێڕایەڵــی کردنــی ڕێ پێشــاندەرانو ئامۆژگــاری کاران، وە ملکەچــی شــەیتانی یاخــی بــوو بــکات بــە دڵو بــە گیــان، وە بەندایەتــی لــە شــوێنێکدا بــکات کە شــوێنی ئــەوە نەبــێ، بەندایەتی شــتێک بکات کە هیچ ســوودێکی پــێ نەگەیەنــێ لە دارو درەخــتو بــەردەکان؟!! چ درۆیــەک لــەوە گەورەترو سەرســووڕهێنەرترە کە کەســێک ئەوانــە بداتە پــاڵ خوا؟!!

أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبْتُمْ أَن
جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ
وَاذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ
فِي الْخَلْقِ بَصْۜطَةً فَاذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ اللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ
﴿٦٩﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللَّهَ وَحْدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ
ءَابَآؤُنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ الصَّٰدِقِينَ ﴿٧٠﴾
قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ
أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسْمَآءٍ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم
مَّا نَزَّلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ فَانتَظِرُوٓا۟ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ
الْمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَالَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا
وَقَطَعْنَا دَابِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَمَا كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ
﴿٧٢﴾ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا قَالَ يَٰقَوْمِ اعْبُدُوا۟ اللَّهَ
مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ
هَٰذِهِۦ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِيٓ أَرْضِ
اللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾

﴿قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ﴾ بە شێوەیەک لە شێوەکان (نەفامیم تێدانیە)، بەڵکو ئەو پێغەمبەرێکی نێردراوو ژیر بوو ﴿وَلَٰكِنِّي رَسُولٌ
مِّن رَّبِّ ﴿٦٧﴾ أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠
لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ﴾ پێویستە لەسەرتان بەوە ڕازی بن‌و گوێڕایەڵی‌و ملکەچی فەرمانەکانی پەروەردگار بن ﴿أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ﴾ واتە: چۆن سەرتان سووڕ دەمێنێ لە کارێ کە جێگای سەرسووڕمان نیە، ئەویش ئەوەیە کە خوا ﷻ کەسێکی بۆ ناردوون لە خۆتان، کە باش دەیناسن ئەوەی بەرژەوەندی ئێوەی تێدایە یادتان دەخاتەوە، وە هانتان دەدات لەسەر ئەوەی کە سوودو قازانجی تێدایە بۆتان، ئێوە لەوە سەرتان سووڕماو نکوڵیتان کرد ﴿وَاذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ﴾ واتە: سوپاس‌و ستایشی خوا ﷻ بکەن کاتێک کە ئێوەی کرد بە جێنشین لەسەر زەویدا لە جێگای ئەو ئوممەتانەی کەلە ناوچوون بە هۆی ئەوەی پێغەمبەرانیان بە درۆدەخستەوە، خوا ﷻ ئەوانی لەناوبردو ئێوەی هێشتەوە، تا بزانرێ ئێوە چۆن هەڵس‌و کەوت دەکەن، وە ئاگاداربن لە بە درۆخستنەوەی پەیامی خوا وەکو ئەوان، ئەوسا تووشی سزا دەبن وەکو چۆن ئەوان تووش بوون، ﴿وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَصْۜطَةً﴾ یادی خوا ﷻ بکەنەوە لەسەر ئەو نیعمەتانەی کە بە تایبەت پێی بەخشیون کە بریتیە لەوەی لەش‌و قیافەتی ئێوەی لە هی وان بەرزترو بە تواناترو بەهێزتر دروست کردوە ﴿فَاذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ اللَّهِ﴾ واتە: یادی نیعمەتە بەرفراوانەکانی خوا ﷻو چاکەو بەهرە بەردەوامەکانی بکەنەوە ﴿لَعَلَّكُمْ﴾ ئەگەر یادی بکەنەوە بە سوپاس کردن‌و ماف پێدانی ﴿تُفْلِحُونَ﴾ واتە: سەردەکەون بەوەی کە بەدوایدا

ده‌گه‌ڕێن، وه‌ ڕزگارتان ده‌بێ له‌وه‌ی كه‌ لێی ده‌ترسن، ئامۆژگاری كردنو یاد خستنه‌وه‌، وه‌ فه‌رمانی پێكردن به‌ یه‌كتاپه‌رستی، وه‌ وه‌سفی خۆی بۆ كردن كه‌ ئه‌و ئامۆژگاری كارێكی ده‌ستپاكه‌، وه‌ ئاگاداری كردنه‌وه‌ كه‌ خوا ﷻ سزایان بدات وه‌ك چۆن نه‌ته‌وه‌و گه‌له‌كانی پێش ئه‌وانی سزا داوه‌، وه‌ نازو نیعمه‌ته‌كانی خوای ﷻ یادخستونه‌ته‌وه‌، به‌ڵام ئه‌وان گوێڕایه‌ڵیان نه‌كردو به‌ ده‌میه‌وه‌ نه‌هاتن.

﴿ قَالُوٓاْ ﴾ سه‌ریان سوورما له‌ بانگه‌وازه‌كه‌ی‌و هه‌واڵیان پێدا كه‌ ئه‌وان ئه‌سته‌مه‌ بڕوای پێبهێنن ﴿ أَجِئۡتَنَا لِنَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَحۡدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾؟! خوا ﷻ ڕوویان ناشرین بكات، ئه‌و كاره‌ی كه‌ ئه‌وپه‌ڕی پێویسته‌و گرنگه‌، خستیانه‌ ئاستی ئه‌وه‌ی كه‌ باو باپیرانیان به‌ نه‌فامیه‌وه‌ ده‌یپه‌رستن، به‌ڵكو ئه‌وه‌ی باوباپیره‌ گومڕاكانیان پێش خست به‌ سه‌ریدا، له‌ شیرك‌و هاوبه‌ش دانانو په‌رستنی بته‌كان، به‌سه‌ر ئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌ران بانگه‌شه‌یان بۆ ده‌كرد له‌ یه‌كتاپه‌رستی خوا ﷻ به‌ تاك ته‌نهایی‌و هاوه‌ڵی بۆ دانه‌نرێ، وه‌ پێغه‌مبه‌رانیان به‌ درۆ داناو وتیان: ﴿ فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾ ئه‌مه‌ كردنه‌وه‌ی ده‌رگای خه‌شم‌و قینی خوایه‌ ﷻ به‌سه‌ر نه‌فس‌و ده‌روونیاندا.

هوود عليه السلام پێی فه‌رموون: ﴿ قَالَ قَدۡ وَقَعَ عَلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ رِجۡسٞ وَغَضَبٌ ﴾ واته‌: كار له‌كار ترازا تازه‌ ده‌بی ببێ، بێگومان هه‌موو هۆكاره‌كانی هاتنه‌ جێ‌و كاتی سزاو له‌ نێوچونتان هات. ﴿ أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسۡمَآءٖ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم ﴾ واته‌: چۆن مشتو مڕو شه‌ڕه‌ قسه‌و ده‌مبازی له‌سه‌ر شتێ ده‌كه‌ن كه‌ حه‌قیقه‌ت‌و ڕاستی تێدا نیه‌، ئه‌وه‌نده‌ش نزم‌و بێ نرخ بوون، چه‌ند بتێكیش ده‌په‌رستن ناوتان لێناون، كه‌ هیچ سیفه‌تێكی په‌روه‌ردگارێتی تێدا نیه‌، به‌ قه‌د گه‌ردیله‌یه‌كیش، وه‌ ﴿ مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٖ ﴾ بێگومان ئه‌گه‌ر ڕاست بووایه‌ خوا ﷻ به‌ڵگه‌یه‌كی داده‌به‌زاند، جا دانه‌به‌زاندنی به‌ڵگه‌ بۆ ئه‌و مه‌به‌سته‌، به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر بێبنه‌مایی‌و به‌تاڵی، بێگومان هه‌موو داواكراو كاروباره‌ گرنگه‌كان خوا ﷻ باسی كردوه‌و به‌ڵگه‌ی پێویستی بۆ هێناوه‌ته‌وه‌.

﴿ فَٱنتَظِرُوٓاْ ﴾ وه‌ چاوه‌ڕوانی ئه‌و سزایه‌ بن كه‌ به‌ڵێنم پێدابوون: ﴿ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ ﴾ وه‌ ئه‌و دوو چاوه‌ڕوانیه‌ی جیا كردوه‌ته‌وه‌، چاوه‌ڕوانی ئه‌وه‌ی كه‌ ده‌ترسێ بكه‌وێته‌ ناو سزا، وه‌ ئه‌وه‌ی به‌ ته‌مای سه‌ركه‌وتنو پاداشتی خوایه‌، بۆیه‌ خوا ﷻ

نێوانی ئەم دوو کۆمەڵەی کردوەتەوە، دەفەرموێ: ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ ﴾ واتە: هوود ﷺ ﴿ وَٱلَّذِينَ ﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوە ﴿ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا ﴾ ئەوانەن کە خوا ﷻ ڕێنمایی کردن بۆ ئیمان، وە ئیمانی کردە هۆی ئەوەی میهرەبانیان بەسەردا بباریێ، بە میهرەبانی خۆی ڕزگاری کردن

﴿ وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾ واتە: بە سزای بە ئێش بنەبڕی کردن، کە هیچ کەسیان لێنەمایەوە، وە بایەکی توندو تیژی گەرمی نەزۆکی ناردە سەریان، کە بەسەر هەر شتێکدا تێپەڕ بێ وەک ئێسکی پوکاوی لێ بکات، جا ئیتر وایان بەسەر هات شوێنەواریان نەدەبینرا جگە لە خانووەکانیان نەبێ، تەماشا بکە دەبێ دەرەنجامی ئەوانەی کە ئاگادار کرانەوە چۆن بوو، ئەوانەی کە بەڵگە لەسەریان پێویست بوو، گوێڕایەڵیان نەکرد، وە فەرمانیان پێکرا بڕوا بهێنن، بڕوایان نەهێنا، بۆیە دەرنجامیان لە نێو چوونو سەرشۆڕیو بەدبەختی بوو.

لە شوێنی دی فەرموویەتی: ﴿ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ۝ ﴾ هـود.

وە لێردا دەفەرموێ: ﴿ وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۖ وَمَا كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴾ بە شێوەیەک لە شێوەکان، بەڵکو وەسفی کردن بە درۆو یاخیبوونو لووت بەرزیو خراپەکاری.

(٧٣-٧٩): ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا بِٱلَّذِىٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ فَعَقَرُوا۟ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُوا۟ يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَالَةَ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾:

دەفەرمــوێ: ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ ﴾ واتــە: بــۆ لای گەلــی ســەموود کــە هۆزێکــی ناســراوە، لــە وڵاتــی حیجــر لــە نێــوان شــامدا نیشــتەجێ بــوون. پێغەمبــەری نــارد بــۆ لایــان ﴿ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ﴾ وە پێغەمبەرێــک بانگیــان دەکات بــۆ بــڕوا هێنــانو یەکتاپەرســتی، وە شــیرکو هاوەڵدانانیــان لــێ قەدەغــە دەکات ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴾ بانگــەوازی صالــح ﷺ وەک بانگــەوازی بــرا پێغەمبەرەکانــی بــوو: فەرمانکــردن بــە بەندایەتــی خــوا ﷻ، وە ڕوونکردنــەوەی ئــەوەی کــە جگــە لــە خــوا هیــچ کــەس شایســتەی پەرســتن نیــە.

﴿ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ واتــە: نائاســاییو لــە ڕادە بــەدەر (الخــارق للعادة)یــە، کــە تەنهــا بــۆ ئایەتێکــی ئاســمانی دەبــێ، لــە توانــای مرۆڤــدا نیــە، پاشــان بــەو ئایەتــە تەفســیر کــردوە: ﴿ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ﴾ واتــە: ئەمــە حوشــترێکی بەڕێــزە لەبــەر ئــەوەی دراوەتــە پــاڵ خــوا ﷻ، دانەپاڵــی ڕێــز لێنــان، بــۆ ئێــوە نیشــانەیەکی گــەورەی تێدایــە.

شــێوەی ئــەم ئایەتــە باســکراوە وەک دەفەرمــوێ: ﴿ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ١٥٥ ﴾الشعراء. بیرێکــی گەورەیــان هەبــوو کــە ناســرابوو بــە بیــری حوشــترەکە، لەگــەڵ حوشــترەکەدا کردبوویــان بــە نــۆرە ڕۆژێ بــۆ حوشــترەکە کــە لێــی بخواتــەوە، لــە بەرانبــەردا ســوود لــە شــیرەکەی وەربگــرن، وە ڕۆژێکیــش بــۆ ئــەوان ســوودی لێوەربگــرن.

پێغەمبــەر صالــح ﷺ پێــی فەرمــوون: ﴿ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ﴾ وازی لــێ بهێنــن بــا بــۆ خــۆی لــەم زەویــەی خــوادا بلــەوەڕێ هەقتــان بەســەریەوە نەبــێ، وە هیچــی پێمــەدەنو هەقتــان بەســەریەوە نەبــێ ﴿ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ ﴾ واتــە: بــە کوشــتن یــان هاوشــێوەی ﴿ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ (ئەگەرنــا ســزایەکی ســەختو بــە ئێــش تووشــتان دەبــێ).

وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ وَبَوَّأَكُمۡ
فِي ٱلۡأَرۡضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورٗا وَتَنۡحِتُونَ
ٱلۡجِبَالَ بُيُوتٗاۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي
ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ٧٤ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن
قَوۡمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ أَتَعۡلَمُونَ
أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ
مُؤۡمِنُونَ ٧٥ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ
ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ٧٦ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ
أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ
مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ٧٧ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ
جَٰثِمِينَ ٧٨ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ
رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ
٧٩ وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم
بِهَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨٠ إِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ
شَهۡوَةٗ مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ٨١

﴿وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ﴾ لەسەر زەویدا چێژتان وەردەگرتو داواکاریەکانتان بە دەست دەهێنا ﴿مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ﴾ ئەوانەی کە خوا ﷻ لە بەینی بردن، وە ئێوەی کردە جێنشین لە پاش ئەوان ﴿وَبَوَّأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: سەقامگیری کردن تیایدا، وە ئەو هۆکارانەی بۆ ئاسان کردن کە دەتانگەیەنێت بەوەی کە دەتانەوێت ﴿تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورٗا﴾ واتە: لەسەر ئەو زەویە ڕاستەی کە بەرزی تێدا نیە، خانوو کۆشکی نایابی لێ بەرز دەکەنەوە ﴿وَتَنۡحِتُونَ ٱلۡجِبَالَ بُيُوتٗا﴾ وەک ئێستا کە دەبینرێت، لە شاخو کێوەکانیشدا خانوو دەتاشنو هەڵیان دەکۆڵن بۆ شوێنی نیشتەجێبوونیان، ئەوە بەردەوام دەبێ تا کێوەکان بمێنن.

﴿فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ﴾ واتە: نیعمەتەکانی، وە ئەوەشی کە ئازادی کردوون لە فەزڵو چاکەو ڕزقو ڕۆزیو هێزو توانا ﴿وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ﴾ واتە: زەوی پیس مەکەن بە فەسادو سەرپێچی کردن، چونکە سەرپێچی وڵات کاولو وێران دەکات، خوا ﷻ وڵاتەکەیانی چۆڵ کردن، وە شوێنەکانیان بە ترسناکی مایەوە.

﴿قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ﴾ واتە: دەسەڵاتدارو پیاو ماقوڵانیان، ئەوانەی بەرانبەر ڕاستی لووت بەرزیان نواند ﴿لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ﴾ لە کاتێکدا لاوازەکان هەموویان بڕوادار نەبوون، وتیان: ﴿لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ واتە: ئایا صالح ﷺ ڕاست دەکات یان ڕاست ناکات؟ لاوازەکان وتیان: ﴿إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ﴾ (ئیمانمان هێناوە بە) یەکتاپەرستی خوا ﷻ و ئەو هەواڵەی کە هێناویەتی، وە لە فەرمان کردنو قەدەغە کردنی.

﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ﴾ لووت بەرزی وای

لێکـردن ملکەچـی ئـەو هەقـە نەبـن، کـە هـەژارو لاوازەکان ملکەچـی بـوون.
﴿ فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ ﴾ پێغەمبەرەکەیـان صالـح ﷺ پەیمانـی لێوەرگرتبـوون ئەگەر ئازاری ئـەو حوشـترە بـدەن ئەوە خـوا ﷻ سـزای بـە ئێشـتان دەدات ﴿ وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ ﴾ واتـە: ئـەوان سەرکێشـیو ملهوڕیان کردو لـووت بەرزیان نوانـد، لەو فەرمانـەی کە ئەگەر کەسـێک یاخـی بێ ئەوە سـزای بـە ئێش دەدرێ، بەو شـێوە خوا ﷻ سـزای لەسـەر حەلاڵ کـردن، سـزایەک پێش ئـەوان هیچ کەس نەیچەشـتبوو.
﴿ وَقَالُواْ ﴾ لەگـەڵ ئـەم کـردەوە خراپانـەدا بێبـاک بـوون لە خـوا ﷻ، بەڵکو شـانازیان پێیــەوە دەکــرد: ﴿ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ ﴾ ئەگـەر تـۆ ڕاسـت دەکـەی لـە سـزاداندا، فەرمـووی: ﴿ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ٦٥ ﴾هود، (صاڵحیـش وتـی: بۆ ماوەی سـێ ڕۆژان لـە ماڵەکانتانـدا بگوزەرێنن، دوایی بەلاتـان بۆ دێ، ئـەوە بەڵێنێکـە درۆ نیە).
﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴾ لـە ماڵەکانـی خۆیانـدا خـوا ﷻ ئیبـادەی کـردن دوابـڕوای کـردن، هەموویـان بـە دەمـدا کەوتـنو لـە نـاو چـوون.
﴿ فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ ﴾ کاتـێ کە خوا ﷻ سـزای لەسـەر حەلاڵ کـردن ﴿ وَقَالَ ﴾ صالح ﷺ ڕووی دەمـی تێکـردنو بـە سەرزەنشـتەوە پـاش ئـەوەی خـوا ﷻ لـە نـاوی بـردن وتـی: ﴿ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ ﴾ هەمـوو ئەوانـەی کە خوا ﷻ منی پێـی نـاردوە بۆ لای ئێـوە، بێگومان ئاگـادارم کردنەوە لێیو سـوور بووم لەسـەر هیدایەتو ڕێنمایـی کردنتـان، وە کۆششـم کرد تـا بتانهێنمە سـەر ڕێگای ڕاسـت ﴿ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴾ بەڵکـو ئامۆژگاری ئامۆژگـاری کارانتان ڕەتکـردەوە، وە گوێڕایەڵی هەموو شـەیتانێکی نەفریـن لێکراوتان کرد.
بزانـە زۆرێـک لـە توێژەرەوانـی قورئان ئـەم چیرۆکـە دەگێڕنـەوە، کە گوایە حوشـترەکە لـە بەردێکـی کەڕی سـافو لـووس دەرچـووە، کە پێشـنیاریان کـرد بوو بـۆ صالح ﷺ وە بەردەکـە ژان گرتـی، وەک چـۆن (ئافرەتی) دووگیـان ژان دەیگرێ، ئنجا حوشـترەکە دەرچـوو ئـەوان تەماشـایان دەکـرد، وە کاتـێ کـە کوشـتیان لـە شـیر برابوویـەوە، ناڵەی کـردو دەنگێکـی گـەورەی لێدەرچوو شـاخەکەی بۆ لەت بوو ڕۆیشـتە نێو شـاخەکەوە، وە صالـح ﷺ پێـی فەرموون: نیشـانەی دابەزاندنی سـزا بۆتـان ئەوەیە کە لـە ڕۆژی یەکەمدا لـەو سـێ ڕۆژەی بۆتان دیاری کـراوە، ڕەنگتـان زەرد دادەگەڕێت، وە ڕۆژی دووەم سـوور

دەبێـت، وە سـێیەم: ڕەش دادەگەڕێـت، وەک چـۆن فەرمووی بەو شـێوە بوو.
هەمـوو ئەوانـە لـە ئیسـرائیلەکانەوە وەرگیـراوە کە وا پێویسـت بـوو نەگواسـترایەتەوە بۆ ڕاڤەکردنـی کتێبـی خـوا ﷻ، وە لـە قوڕئانـدا هیـچ شـتێک نیە ئامـاژە بەوە بـکات لە هیچ ڕوویێکـەوە، بەڵکـو ئەگـەر ڕاسـت بووایە خوا باسـی دەکرد، چونکە شـتی سەرسـوڕهێنەرو پەنـدو وانـەی تێدایە کە خوا ﷻ پشـت گوێـی ناخات، بەڵکـو قوڕئان هەنـدێ لەوانەی کە باسـکراوە بـە درۆ دەخاتەوە، بێگومـان صالح ﷺ پێی فەرمـوون: ﴿ تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ ثَلَـٰثَةَ أَيَّامٍ ﴾ واتـە: بـۆ خۆتـان چێـژو لـەززەت وەربگـرن ئـەو مـاوە کەمـە، بە ڕاسـتی خۆشـی چێـژ وەرگرتنتـان تەنها ئـەم ماوەیە.
ئـەوە چ لـەززەت خۆشـیەکە (لـە دونیـا دەیبینـن) کـە پێغەمبەرەکەیـان پەیمانـی پێداون بکەونـە نـاو سـزاوە، وە باسـی پێشـکەیەکانی کردبـێ، ڕۆژ بـە دوای ڕۆژدا ڕوویـدات، بە شـێوەیەک کـە هەموویـان بگرێتـەوە (سـوورو زەردو ڕەش هەڵگەڕێـن لـە سـزادا).
ئایـا ئەمـە پێچەوانـەی قوڕئـان نیە؟ قوڕئـان ئەوەی تیایدایە بەسـە بـۆ ڕێنمایی لـە بێجگە لە خۆی، بەڵێ ئەگەر شـتێک بە ڕاسـتی لە لایەن پێغەمبەرەوە هاتبـێ پێچەوانەی کتێبی خوا ﷻ نەبـێ ئەوە لەسـەر سـەرو سـەرچاو، وەک چـۆن قوڕئـان فەرمانی کـردوە بە شـوێنکەوتنی ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴿٧﴾ ﴾ الحشر.
لـە پێشـەوە ئامـاژەی پێکـرا کـە دروسـت نیـە ڕاڤەکردنـی کتێبـی خـوا ﷻ بـە هەواڵی ئیسـرائیلی، ئەگەر چی دروسـتیش بێـت ڕیوایەتیان لێوە بکرێت دەربـارەی ئەو کارو بارانەی کـە یەکلانەبوەتـەوە درۆیـە، چونکە مانای کتێبی خـوا ﷻ دڵنیایـیو یەکلاکەرەوەیە، بەڵام ئەوانـە نـە بە ڕاسـت دادەنرێو نە بـە درۆ، بۆیـە پێکـەوە ناگونجێنو ڕێـک ناخرێن.
(٨٠-٨٤): ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾:
دەفەرمـوێ: ﴿ وَلُوطًا ﴾ واتە: یـادی بەندەمان لـووط ﷺ بکەرەوە، کاتـێ ناردمان بۆ لای گەلەکـەی، فەرمانـی پـێ دەکردن بـە بەندایەتی خوا ﷻ بـە تاکو تەنهـاو قەدەغەی داوێن پیسـی لـێ دەکـردن، کە پێـش ئەوان کەسـێکی تـر لە جیهانـدا نەیکـرد بـوو، فەرمووی:

﴿أَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ﴾واتــە: ئـەو خــووەی کــە لــە خراپــیو قێزەونیــدا ســنووری بریوە، تــا هەموو جۆرەکانی فاحیشــەی لــە ناو خۆیــدا کۆکردوەتــەوە ﴿ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ناوونانــی بــە فاحیشــە خراپترینو ناشــرینترین کــردار دەگرێتەوە، ئــەوان دایــان هێنا کردیــان بە ســوننەتێک بــۆ دوای خۆیان.

پاشــان ڕوونی دەکاتەوە بە ئایەتــی: ﴿إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ﴾ واتــە: چــۆن واز لــە ئافرەتــەکان دەهێنــن کە خــوا ﷻ بــۆی دروســتکردوون، کــە لەگەڵ ئــارەزوودا دەگونجــێ، وە ڕوودەکەنــە پشــتی پیاوەکانتــان، کــە لــە ئەوپــەڕی پیســی دایە، شــوێنی دەرچوونی پیســیە کــە مرۆڤ قێزو شــەرم لە بــاس کردنی دەکات، ســەرەڕای ئەوە نزیکــی بکەوێتــەوە!! ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾ واتــە: ســنوورەکانی خواتــان پێشــێل کردوەو بــە بوێــریو چاوقایمیــەوە قەدەغەکراوەکانتــان ئەنجامداوە.

وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن
قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ ٨٢ فَأَنجَيْنَٰهُ
وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ٨٣ وَأَمْطَرْنَا
عَلَيْهِم مَّطَرٗاۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ
٨٤ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبٗاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ
مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمْۖ
فَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ
أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَاۚ
ذَٰلِكُمْ خَيْرٞ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ٨٥ وَلَا
تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٖ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن
سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجٗاۚ وَٱذْكُرُوٓاْ
إِذْ كُنتُمْ قَلِيلٗا فَكَثَّرَكُمْۖ وَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ
عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ٨٦ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٞ مِّنكُمْ
ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٞ لَّمْ يُؤْمِنُواْ فَٱصْبِرُواْ
حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَاۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ٨٧

﴿ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ ﴾ واتە: خۆیان پاک ڕادەگرن لە کردەوەی خراپو ناشیرن، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا نَقَمُواْ مِنْهُمْ إِلَّآ أَن يُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ٨ ﴾ البروج. پاشان دەفەرموێ: ﴿ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴾ واتە: مانەوە لەگەڵ ئەوانەی کە سزادران، خوا ﷻ فەرمانی پێکرد کە بە شەو لەگەڵ شوێنکەوتوانیدا ئەو شوێنە بەجێ بهێڵن، بێگومان سزای خوا ﷻ لە بەرەبەیاندا گەلەکەی دەگرێتەوە، بە شەو دەرکردن بێجگە لە ژنەکەی نەبێ، بێگومان ئەو سزایەی تووش بوو، تووشی وانیش بوون.

﴿ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرٗا ﴾ واتە: بەردێکی گەرم لە وردە زیخی گڵ، وە خوا ﷻ ئەو شوێنەی سەرو ژێری کرد ﴿ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴾ لە ناو چوونو تووشی ڕیسوایی بەردەوام بوون.

(٨٥-٩٣): ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبٗاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ
إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٞ مِّن رَّبِّكُمْۖ فَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا
تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُواْ فِي ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَاۚ ذَٰلِكُمْ
خَيْرٞ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ٨٥ وَلَا تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٖ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ
عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجٗاۚ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلٗا
فَكَثَّرَكُمْۖ وَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ٨٦ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٞ مِّنكُمْ
ءَامَنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٞ لَّمْ يُؤْمِنُواْ فَٱصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَاۚ وَهُوَ خَيْرُ
ٱلْحَٰكِمِينَ ٨٧ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ
مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ٨٨ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِي

مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ
شَىْءٍ عِلْمًا ۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ۚ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴿٨٩﴾ وَقَالَ
ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٩٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟
فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩١﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَا ۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَانُوا۟ هُمُ
ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٢﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ ۖ
فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾

واتە: بۆ ئەو هۆزەی کە بەناوبانگە لە مەدیەن، براکەیانمان نارد لە ڕەچەڵەکدا کە شوعەیب ﷺ، بانگی دەکردن بۆ یەکتاپەرستی، خوا بە تاکو تەنها بپەرستن و هاوڵو هاوبەشی بۆ دانەنێن، وە فەرمانی پێدەکردن کە لە کێشانەو پێوانەدا ڕێکو ڕاست بن مافی خەڵکی نەخۆن، وە شتومەکی خەڵکی بە کەم تەماشا مەکەن بە دزیکردنو فرتو فێڵیان لێ مەکەن، وە لەسەر زەویدا دەست مەکەنە گێرەشێوێنیو خراپەکاری بە تاوانو سەرپێچی کردن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَا ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ بێگومان واز هێنان لە تاوان لەبەر فەرمانی خوا ﷻو نزیک بوونەوە لە خوا، باشترو بە سوودترە بۆ ئینسان، لە ئەنجامدانی ئەو تاوانە کە دەبێتە مایەی تووڕەیی‌و خەشمو قینو سزای خوا.

﴿ وَلَا تَقْعُدُوا۟ ﴾ (دامەنیشن) بۆ خەڵکی ﴿ بِكُلِّ صِرَٰطٍ ﴾ ئەو ڕێگایانەی کە خەڵکی بە زۆری بەسەریدا تێدەپەڕی، خەڵکی بترسێنن‌و ئاگاداری بکەنەوە (لە شوێنکەوتنی شوعەیب ﷺ) ﴿ تُوعِدُونَ ﴾ هەر کەسێک ئەو ڕێگایە بگرێت ﴿ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ بۆ هەر کەسێک بیەوێ هیدایەتو ڕێنمایی وەربگرێ ﴿ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا ﴾ واتە: دەتانەوێ ڕێگای خوا ﷻ بە لارو خواری پێشانی خەڵکی بدەن بە پێی ویستو ئارەزووی خۆتان، لە کاتێکدا وا پێویست بوو لەسەر ئێوەو جگە لە ئێوەش ڕێزتان لەو ڕێبازە گرتبایە کە خوا ﷻ بۆ بەندەکانی داناوە، بۆ ئەوەی بیانگەیەنێت بە ڕەزامەندی میهرەبانی خۆی، بەڵکو ئێوە ڕێگریتان کرد لە سەرکەوتن‌و بانگەواز بۆ کردنی، دەخیلە نەکەن ڕێگری خەڵکی بکەن لە ڕێبازی خوا ﷻو دژایەتی بکەن، بە ڕاستی ئەمە سپڵەییە بەرانبەر نیعمەتەکانی خوا ﷻو دژایەتی کردنیەتی.

﴿ وَٱذْكُرُوٓا۟ ﴾ (یادی) نیعمەتەکانی خوا بەسەرتان بکەنەوە ﴿ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ ﴾ واتە: زیادی کردن بە هۆی ژن هێنانو وەچەو لەش ساغیەوە،

بێگومــان تاقیتانــی نەکردۆتەوە بە درەو نەخۆشــی، یا ئەو نەخۆشــیانەی کە کــەمو دەگمەنن لــە نێوتانــدا، وە دوژمنــی زاڵ نەکردوە بە ســەرتانداو لــە ناوتان بیات، وە خاکــی بەش بەش نەکــردوون، بەڵکــو نیعمەتــی ئەوەی پێ بەخشــیون کە کــۆکو یەکدەنگــنو ڕزق ڕۆزیو وەچــەو منداڵی پێبەخشــیوون.

﴿ وَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ بێگومــان ئــەوان بــەردەوام لــە دووبەرەکی دانو ناخیــان پڕیەتی لــە ترسو بیم، وە هیــچ یادەوەریەکی چاکیان بەجێ نەهێشــتوە، بەڵکو لــەم دنیایــەدا نەفرینیــان لە دوای خۆیان بەجێ هێشــتوە، وە لــە ڕۆژی دواییــدا خەمبارترینو ڕیســـواترین کەس دەبن.

﴿ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ ﴾ زۆرینــەی ئــەوان ﴿ فَٱصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَا ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾ هــەق ســەردەخات، وە ســزای نا ڕاســتی پــووچو بــێ بنەمــا دەداتەوە.

۞قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ
وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ
كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ
إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ
ٱللَّهُ رَبُّنَا ۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ۚ رَبَّنَا ٱفْتَحْ
بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴿٨٩﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ
﴿٩٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩١﴾ ٱلَّذِينَ
كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَا ۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَانُوا۟
هُمُ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٢﴾ فَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ
رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَنَصَحْتُ لَكُمْ ۖ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ
كَٰفِرِينَ ﴿٩٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّبِىٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا
بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلْنَا
مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَوا۟ وَّقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا
ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩٥﴾

﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ ﴾ ئەویش گەورەو پیاو ماقوڵانیانە، تیایاندا بوو شوێنی هەواو ئارەزووی کەوتبوو چێژی لێوەردەگرت، کاتێ کە هەقو ڕاستیان بۆ هات، تەماشایان کرد پێچەوانەیە لەگەڵ هەواو ئارەزووە بۆگەنەکانیاندا، لە بەرانبەریدا لووت بەرزیان نواند، بە پێغەمبەرەکەیان شوعەیب ﷺیان وت، وە ئەوانەی لە گەڵیدابوون لە لاوازەکان: ﴿ لَنُخْرِجَنَّكَ يَٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ﴾ هەموو هێزو توانایان بەکارهێنا لە بەرانبەر ڕاستیدا، نە ئاینیان لەبەر چاو گرت، وە نە هیچ هەقو مافێکی تر، بەڵکو تەنها هەواو ئارەزوو ئەو عەقڵە لاوازەی خۆیانیان لەبەرچاو گرت، کە ڕێ پێشاندەریان بوو بۆ ڕێگای خراپ، وتیان: یان دەبێ خۆتو ئەوانەی لەگەڵدان بێنە سەر ڕێبازی ئێمە، یان دەرتان دەکەین لە شارو وڵاتەکەمان، شوعەیب ﷺ بانگەوازی دەکردن ئومێدی هەبوو بروا بهێنن، بەڵام هەر دڵنیا نیە لە شەڕو فیتنەیان، تا هەڕەشەی ئەوەیان لێکرد ئەگەر نەچێتە سەر ئاینەکەیان شار بەدەری دەکەن، وە ئەوانەشی کە لەگەڵیدان لە شوێنکەوتووانی.

﴿ قَالَ ﴾ شوعەیب ﷺ بەسەر سوڕمانەوە پێی وتن: ﴿ أَوَلَوْ كُنَّا كَٰرِهِينَ ﴾ واتە: ئایا شوێنی ئەو ئاینە بەتاڵو پووچەی ئێوە بکەوین، ئەگەر پێشمان ناخۆش بێ لە کاتێکدا کە دەزانین ئاینێکی بێ بنەمایە، ئەوەی کە بانگ دەکرێ بۆ لای ئەو ئاینە، بە جۆرێ حەزی لێی بێ، بەڵام ئەگەر کەسێک بە ئاشکرا ڕەتی بکاتەوەو قسەی ناشرینی پێ بڵێ، چۆن بانگ دەکرێ بۆ سەر ئەو ئاینە؟!!

﴿ قَدِ ٱفْتَرَيْنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنْ عُدْنَا فِى مِلَّتِكُم بَعْدَ إِذْ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنْهَا ﴾ واتە: شایەتیمان لەسەر بدەن، ئێمە ئەگەر گەڕاینەوە بۆ سەر ئەو ئاینە پاش ئەوەی کە خوا ﷻ ڕزگاری کردووین لە شەڕو خراپەی، ئەوە ئێمە درۆزنینو درۆمان بەدەم خواوە کردوە، ئێمە چاک دەزانین هیچ

بوختانێک لەوە گەورەتر نیە کە هاوەڵ بۆ خوا ﷻ بڕیار بدرێت، کە بێگومان ئەو تاکو تەنهاو بێ نیازە، ئەو خوایەی کە نە منداڵی داناوەو نە هاوڕێ، وە هاوبەشی نیە لە موڵکو دەسەڵاتدا.

﴿ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ ﴾ واتە: کە بۆ ئێمە ڕەوایە بگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو ئاینە، بەڕاستی ئەمە مەحاڵە، شوعەیب ﷺ بێ هیوای کردن، کە ئەو لەگەڵیاندا بگونجێت لە زۆر ڕووەوە، لەو ڕووەی کە ئەو حەزی لێیان نیە بە هۆی ئەوەی هاوەڵ بۆ خوا ﷻ بڕیار دەدەن، وە شایەتی داوە ئەگەر شوێنیان بکەوێت، خۆیو ئەوانەی لەگەڵیدان ئەوە درۆزنن: کە ئەمە داننانیان بە منەتی خوا ﷻ بەسەریانەوە، کاتێ کە خوا ﷻ ڕزگاری کردن لە شیرکو کوفر. هەروەها گەڕانەوەیان پاش هیدایەتی خوا ﷻ مەحاڵو ئەستەمە، بە تەماشاکردنیان لەو حاڵەتە ناخۆشەی پێشتر لەسەری بوون، وە دانپێدانانیان بە یەکتاپەرستی، بەوەی کە هیچ کەس شایستەی پەرستن نیە جگە لە خوا نەبێ، تاکو تەنهایە، نابێ بەندایەتی بۆ هیچ کەس بکرێ جگە لە خوای پەروەردگار، وە بێگومان پەرستراوی بتپەرستان پووچو بەتاڵەو لە ئەوپەڕی مەحاڵدایە، وە خوا ﷻ منەتی کردوە بەسەریانداو عەقڵی پێداون کە دەتوانن ڕاستیو پووچو هیدایەتو گومرایی پێ جیا بکەنەوە.

بەڵام لەو ڕووەی کە ویستو دەسەڵاتی خوا ﷻ بەسەر هەموو شتەکانەوە جێبەجێ دەکرێت کە هیچ کەسێک ناتوانێ بێ نیاز بێ لێی، ئەگەر چی هۆکارەکانیش بە دوای یەکتردا بێنو هەموو هێزەکانیش لەسەری یەکدەنگ بن، بەڕاستی ئەوان بڕیار نادەن بەسەر نەفسی خۆیاندا کە ئەگەر بیانەوێ شتێ دەکەن یان وازی لێ دەهێنن، بۆیە جیای کردوەتەوە ﴿ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَا ﴾ واتە: نە ئێمەو نە غەیری ئێمەش، ناتوانین لە ویستی خوا ﷻ دەرباز بین، ئەو ویستەی کە پڕە لە زانستو حیکمەتو دانایی، بێگومان ﴿ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴾ دەزانێ چ شتێک بۆ بەرژەوەندی بەندەکانی چاکو گونجاون.

﴿ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا ﴾ واتە: پشتمان بە خوا بەستوە کە ئەو جێگیرمان دەکات لەسەر ڕێگای ڕاست، وە دەمانپارێزێ لە هەموو ڕێگاکانی دۆزەخ، بەڕاستی هەر کەسێک پشت بە خوا ﷻ ببەستێت ئەوە بە دڵنیایی خوای بەسە، وە کاروباری دینو دنیای بۆ ئاسان دەبێت.

﴿ رَبَّنَا ٱفْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِٱلْحَقِّ ﴾ واتە: ستەم لێکراوو خاوەن ماف سەربخە بەسەر ستەمکارو ناهەقدا ﴿ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْفَٰتِحِينَ ﴾ دادوەریو بڕیاری خوا ﷻ دوو جۆرە:

یەکەم: کردنەوەی دەرگای زانست بە ڕوون کردنەوەی ڕاستی لە بەتاڵو پووچ، وە ڕێنمایی

لە گومڕایی، وە جیا کردنەوەی ئەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن‌و ئەوانەش کە لەسەر ڕێگای چەوتن.

دووەم: دادوەری بە پاداشت، سزادانی ئەوانەی کە سەرپێچی دەکەن‌و ستەمکارن، وە رزگار کردنی ئەوانەی کە بەرێزو پیاو چاکن، داوایان لە خوا ﷻ کرد دادوەری لە نێوان ئەوان‌و گەلەکەیاندا بکات بە هەق‌و دادپەروەری، وە پێشانیان بدات لە ئایەت‌و پەندەکانی، تا هەق‌و ناهەق لە یەک بکرێتەوە. ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ ﴾ هەرەشەیان لێکردن‌و ئاگاداریان کردنەوە لە شوێنکەوتنی شوعەیب عليه السلام: ﴿ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴾ ئەمە ئەو دەروونە خراپەیان کە وای لێ کردن، تا زیان‌و بەدبەختی لە جێگای شوێنکەوتنی ژیری‌و ڕێنمایی دابنێن، نەیانزانی بە ڕاستی زیانی ڕاستەقینە لە شوێنکەوتنی گومڕایی دایە، کاتی کە گیرۆدەی سزای سەخت بوون ئەوجا ئەوەیان زانی.

﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ ﴾ واتە: بومەلەرزەیەکی سەخت ﴿ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴾ واتە: لە ناو خانووەکانیاندا بێ ڕووح کەوتن‌و مردن.

خوا ﷻ بەو حاڵەیانەوە کە مردوون پێی فەرموون: ﴿ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَا ﴾ واتە: وەک ئەوە وابێ لەو شارەدا نەژیابن‌و لە سێبەر دارەکاندا پشوویان نەدابێ‌و لە نمایشگاکاندا گۆرانی‌و ڕەقس‌و سەمایان نەکرد بێ، وە چێژ یان لە باخ‌و باخاتەکان وەرنەگرتبێ، کاتێ کە سزایان بۆ هات گواستنیەوە لە شوێنی خۆشی‌و چێژ وەرگرتنەوە بۆ خەمباری‌و سزای هەتا هەتایی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ شُعَيْبًا كَانُوا۟ هُمُ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ واتە: بە ڕاستی زیانبار بوون، چونکە زیانیان لە ئاین‌و نەفس‌و خێزانیاندا لە ڕۆژی دوایی دا، بێگومان ئەوە زیانێکی ڕوونە، نەک ئەوانەی کە پێیانیان وت: ﴿ لَئِنِ ٱتَّبَعْتُمْ شُعَيْبًا إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴾ (واتە: ئەگەر شوێن شوعەیب بکەون، ئەوە بێگومان ئێوە لە زەرەرمەندان).

کاتێک کە لە نێو چوون پێغەمبەرەکەیان شوعەیب عليه السلام ڕووی تێکردن‌و بە نێویاندا ڕۆیشت ﴿ وَقَالَ ﴾ بە سەرزەنشت‌و سەرکۆنەکردنەوە پاش مردنیان ﴿ يَٰقَوْمِ لَقَدْ أَبْلَغْتُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى ﴾ واتە: پەیامی خوام پێگەیاندن‌و ڕوونم کردەوە تا گەیشت پێتان بە تەواوی‌و تێکەڵی دڵتان بوو ﴿ وَنَصَحْتُ لَكُمْ ﴾ ئامۆژگاری منتان وەر نەگرت‌و ملکەچی ڕێنماییەکان نەبوون، بەڵکو خراپەو سەرکێشتیتان کرد.

﴿ فَكَيْفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوْمٍ ﴾ واتە: دەی چۆن خەم بخۆم بۆ گەلێک کە هیچ خێرو چاکەیەکیان تێدا نەبێ؟ خێرو چاکەیان بۆ هات ڕەتیان کردەوەو وەریان نەگرت، وە هیچ

شتێک شایستەیان نیە جگە لە شەڕو خراپە نەبێ، ئەوانە شایستەی ئەوە نین کە خەمیان بۆ بخورێ، بەڵکو شایستەی ئەوەن بە لەناو چونیان دڵخۆش بیت، خوایە پەنا بە تۆ لە ڕیسوایی شەرشۆڕی، دەی چ گومڕایی‌و سزایەک لەوە بە ئێشترو خراپترە کە چاکترین دروستکراوی خوا ﷻ خۆی لێی بەری بکات؟!

(٩٤-٩٥): ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّبِىٍّ إِلَّآ أَخَذْنَآ أَهْلَهَا بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمْ يَضَّرَّعُونَ ﴿٩٤﴾ ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَوا۟ وَّقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّبِىٍّ ﴾ بانگیان بکات بۆ بەندایەتی خوا ﷻ و دووریان بخاتەوە لەو خراپەی کە لەسەری دەڕۆن، ملکەچ نەبووبن پێی، ئەوە خوا ﷻ تووشی بەلاو موسیبەتی کردوون ﴿ بِٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ ﴾ واتە: بە نەخۆشی‌و هەژاری‌و جۆرەها بەلاو ناڕەحەتی ﴿ لَعَلَّهُمْ ﴾ کاتێ کە تووشیان دەبێ، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا ﷻو ملکەچی هەق‌و ڕاستی بن.

﴿ ثُمَّ ﴾ ئەگەر سوودی نەبوو بۆیان، وە بەردەوام بوون‌و سەرکێشیان زیادی کرد ﴿ بَدَّلْنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلْحَسَنَةَ ﴾ خوا ﷻ رزق‌و ڕۆزی داباراند بەسەریانداو کەوتنە خۆش گوزرانیەوەو بەلاو ناڕەحەتی لەسەر هەڵگرتن ﴿ حَتَّىٰ عَفَوا۟ ﴾ واتە: تا زۆر بوو، کەوتنە ناو هەرزانی‌و ڕزق‌و بژێویان زۆر بوو، خوا ﷻ دەرووی لێکردنەوەو دەرگای میهرەبانی خۆی بە ڕوودا والا کردن، ناخۆشی‌و ناڕەحەتیەکانیان بیر چوویەوە ﴿ وَّقَالُوا۟ قَدْ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ ﴾ واتە: ئەمە شتێکی سروشتیە، هەر لە کۆنەوە بەم شێوە بووەو پاش ئێمەش هەر وا دەبێ، ماوەیەک لە خۆشیدا دەبن‌و ماوەیەک لە ناخۆشی، ماوەیەک لە خۆش گوزرانی‌و ماوەیەک برسێتی، بە پێی گۆڕانی کاتەکان ڕۆژگار دەگوڕێت، وایان زانی ئەوە بۆ پەندو ئامۆژگاری وانە وەرگرتن نیە، وە دڵیان خۆش بوو بەوەی کە هەیانبوو، وە دنیایان زۆر لەلا جوان‌و شیرین بوو، ئیتر گرتنمان بە سزای سەخت‌و بە ئێش ﴿ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴾ واتە: بە خەیاڵیاندا نەدەهات لەناو بچن، وایان دەزانی توانایان دەبێت بەسەر پێشهاتەکانی خواداو هەرگیز لەناو ناچن‌و ناگواسترێنەوە.

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ
مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا
يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا
بَيَاتًا وَهُمْ نَائِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم
بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُوا مَكْرَ اللَّهِ
فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ
لِلَّذِينَ يَرِثُونَ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ أَهْلِهَا أَن لَّوْ نَشَاءُ
أَصَبْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ
﴿١٠٠﴾ تِلْكَ الْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَائِهَا وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ
رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا بِمَا كَذَّبُوا مِن
قَبْلُ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الْكَافِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدْنَا
لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ وَإِن وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ ﴿١٠٢﴾
ثُمَّ بَعَثْنَا مِن بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِآيَاتِنَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ
فَظَلَمُوا بِهَا فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾
وَقَالَ مُوسَىٰ يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٠٤﴾

(٩٦-٩٩): ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَاتًا وَهُمْ نَائِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُوا مَكْرَ اللَّهِ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾: کاتێ خوا ﷻ باسی ئەوانەی کرد کە پێغەمبەران بە درۆ دەخەنەوە، تاقی دەکرێنەوە بە ناخۆشی تا ببێتە ئامۆژگاریو ئاگادارکردنەوە بۆیان، وە بە خۆشی تا نزیک ببنەوە (لە خوای پەروەردگار)، باس دەکات ئەگەر خەڵکی ئەو گوندو شارانە بە دڵ بڕوایان هێنابا، بڕواهێنانی کردەوەی لەگەڵ بایە، وە بە ئاشکراو بە نهێنی ترسی خوایان هەبووایە، بە واز هێنان لە هەموو قەدەغەکراوەکان، ئەوە دەرگای بەرەکەتی ئاسمانەکانو زەوی بۆ واڵا دەکردن، پەیتا پەیتاو بە لێزمە بارانی بۆ دەباراندن، وە زەوی بۆ سەوز دەکردن، تا بە جوانترین شێوە بژین، وە ئاژەڵەکانیان بە باشترینو لە چاکترین کژو گیا تێری خواردبووایە، بە بێ هەست بە ماندوو بوون بکەن، بەڵکو ئەوان بڕوایان نەهێناو لە خوا ﷻ نەترسان ﴿ فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ بە سزاو بەڵاو دارنینی پیتو بەرەکەتەکان، وە بەڵاو نارەحەتی زۆر، ئەوەش بەشێکە لە پاداشتی کردوەکانیان، ئەگەر بە هۆی هەموو تاوانەکانەوە سزایان بدات، ئەوە لەسەر زەمیندا هیچ گیاندارێک نەدەماو هەمووی تیا دەچوو، وەک دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ الروم.

﴿ أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ ﴾ واتە: ئەوانەی کە بڕوا ناهێننو بە درۆی دەخەنەوە ﴿ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ﴾ واتە: سزای سەختمان (بۆیان بێ) ﴿ بَيَاتًا وَهُمْ نَائِمُونَ ﴾ واتە: لە بێئاگاییو پشوو شیرینی خەویاندا.

﴿ أَوَأَمِنَ أَهْلُ ٱلْقُرَىٰٓ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴾ واتـە: چ شـتێک ئاسـایش‌و دڵنیاییـان پێدەبەخشـێ لەو سـزایە، لە کاتێکـدا ئـەوان هۆکارەکانیان بەجێهێنـاوە، وە تاوانی گەورەیـان ئەنجامـداوە، کە هەنـدێ لەو تاوانانـە لەناو چوونیان لەسـەر پێویسـت دەکات؟!

﴿ أَفَأَمِنُواْ مَكْرَ ٱللَّهِ ﴾ بـەرە بـەرە کێشـیان دەکات بە شـێوەیەک کە پێـی نەزانن، وە مۆڵەتیـان دەدا، بەڕاسـتی پلانی بەهێـزە ﴿ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ﴾ واتە: هـەر کەسـێک بـێ باک بێ لە سـزای خـوا ﷻ ئەوە بـڕوای بە پاداشـت دانەوە نیە لەسـەر کـردەوە، وە بڕوای بـە پێغەمبەران نیە بـە بڕواهێنانێکی ڕاسـتەقینە.

ئـەم ئایەتـە پیـرۆزە ترسـاندنی تێدایـە، کـە نابێت بەنـدە لە ئاسایشـدا بـێ‌و ئەمین بـێ بەو بڕوایـەی کـە هەیەتـی. بەڵکـو دەبـێ بـەردەوام بترسـێت لەوەی تووشـی بەڵایـەک ببێت ئیمـان‌و بـڕوای لـە دەسـت بـدات، وە بـەردەوام پێویسـتە ئـەم دوعایـە بـکات: {يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ، ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ} (أخرجـه الترمـذي (٣٥٢٢) وصححـه الألبـاني). واتـە: ئەی هەڵگێڕەنـەرەوەی دڵـەکان دڵـم جێگیـر بکـە لەسـەر ئاینەکەت.

وە کارو کۆشـش بـکات بـە هەمـوو هۆکارێـک ڕزگاری بکات لە شـەڕو خراپـە لە کاتی ڕوودانـی بـەڵاو فیتنـەدا، بێگومـان بەنـدە چەندە پلـەی بـەرز ببێتـەوە، دڵنیا نیە لـە پاکی‌و بـێ وێنەیی دڵ.

(١٠٠-١٠٢): ﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ ۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ تِلْكَ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآئِهَا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤْمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ ۖ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَـٰسِقِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: بەو گەلانـەی کە دێن پاش ئـەو گەلانەی کـە تیاچوون ﴿ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِ أَهْلِهَآ أَن لَّوْ نَشَآءُ أَصَبْنَـٰهُم بِذُنُوبِهِمْ ﴾ واتـە: ئایـا ڕوون نەبوویـەوە بـۆ ئـەو گەلانەی کە ئـەم زەویەیان بـە میرات بـۆ ماوەتەوە، پاش لەنـاو چوونی خەڵکەکـەی پێـش ئـەوان بـە هـۆی تاوانەکانیانـەوە، پاشـان وەک ئەوانەی پێشـین کە لە ناچـوون جوڵانـەوەو ڕەفتاریـان کـرد؟ ئایـا نەیانزانـی ئەگەر خـوا ﷻ ویسـتبای بە هۆی تاوانەکانیانـەوە سـزای دەدان؟ بێگومـان ئەمە سـوننەتی خوایە بۆ پێشـین‌و ئەوانەشـی دوای ئـەوان دێن.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾ واتـە: ئەگـەر خـوا ﷻ ئاگـاداری بكرداناياەتـەوە، ئـەوە هەرگیز بـە ئاگا نەدەبـوون، وە ئەگەر یادی بخسـتنایەتەوە، ئـەوە بیریـان نەدەكـردەوە، وە هیدایـەتو ڕێنمایـی بكردنایـە بە نیشـانەو پەنـدەكان، ئەوە ڕێنموویـیو پەندیـان وەرنەدەگـرت، بێگومـان خـوا ﷻ سـزایان دەداتو دڵیـان ڕەش دەكات، ئنجـا چڵـكو پیسـی دڵیان دادەپۆشـێ، تـا مۆری بەسـەردا دەنێت، هەرگیز ڕاسـتی وەرناگـرێو خێـرو چاكـەی بۆ نـاڕوات، ئـەوەی سـوودی دەبێت بۆیـان ئەوان نایبیسـتن، تەنهـا بـۆ ئـەوە دەبیسـتن بەڵگەیان لەسـەر پێویسـت ببێت.

﴿ تِلْكَ ٱلْقُرَىٰ ﴾ ئەوانـەی كـە لـە پێشـەوە باسـكران ﴿ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآئِهَا ﴾ (بۆتـی دەگێرینـەوەو بـاس دەكەیـن) تـا ببێتـە پەنـدو ئامۆژگـاری بـۆ ئەوانـەی ئامۆژگـاری وەردەگـرن، وە سـەركۆنە كردنـی سـتەمكاران.

﴿ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾ واتە: پێغەمبەران هاتنو بانگەشـەیان كردن بۆ ڕێنماییو شـارەزاكردنیان، وە بـۆ هەمـوو ئەوانـەی كـە دەبـن بـە مایـەی خۆشـگوزەرانیان، خوا ﷻ بە موعجیزەی ئاشكراو ڕوون پشتیوانی لێكردن، بەڵام هیچ سوودێكی پێنەگەیاندن.

﴿ فَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ بِمَا كَذَّبُوا۟ مِن قَبْلُ ﴾ واتـە: بـە هـۆی بـە درۆخسـتنەوەیانو ڕەتكردنـەوەی هـەقو ڕاسـتی لـە یەكـەم جـاردا خـوا ﷻ هیدایەتی نـەدان بـۆ بڕواهێنان، لـە وەڵامی ڕەتكردنـەوەی هەقـدا، وەك دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾ الأنعـام، (واتـە: وە دڵەكانیـانو چاوەكانیـان هەڵدەگێرینـەوە، وەك چـۆن یەكەمجـار بڕوایـان نەهێنـاوە وازیان لـێ دێنین لەسەركێشـی خۆیاندا سەراسـیمابن).

﴿ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ واتـە: وەك سـزایەك لە لایـەن خواوە ﷻ، وە خـوا سـتەمی لێنەكـردوون، بەڵكو ئەوان سـتەمیان لـە خۆیان كرد.

﴿ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ ﴾ واتـە: زۆربـەی ئـەو ئوممەتانەمان نەبینـی كە خوا ﷻ پێغەمبـەری بـۆ ناردبـوون پابەنـد بـن بـە بەڵێنەكانـی خـوای گـەورەوە، كە وەسـیەتی بۆ هەمـوو دروسـتكراوەكان كـرد بـوو، وە ملكەچـی فەرمانەكانیـان نەبوون كە لەسـەر زمانی پێغەمبەران پێیان گەیشـتبوو ﴿ وَإِن وَجَدْنَآ أَكْثَرَهُمْ لَفَٰسِقِينَ ﴾ واتە: لە فەرمانی خوا ﷻ دەرچـوو بـوون، شـوێنی هـەواو ئارەزوویـان كەوتبـوون بەبـێ ڕێنمایی خوایـی، خوا ﷻ بەندەكانـی تاقـی دەكاتـەوە بـە ناردنـی پێغەمبـەرانو دابەزاندنـی كتێبـە پیـرۆزەكان، وە

فەرمانیـان پێـدەکات بە شـوێنکەوتنی پەیـامو بەڵێنەکانـیو ڕێنماییـان دەکات، بەڵام ئەوان فەرمانەکانـی جێبەجـێ ناکـەن جگـە لـە کەمێکیـان نەبـێ لـە مرۆڤـەکان کـە خـوا ﷻ خۆشـبەختی پـێ بەخشـیون، بـەڵام زۆربـەی خەڵکی پشـتیان کردوە لـە ڕێنمایـیو لووت بەرزیـان بەرانبـەر پێغەمبـەران نواندووە، خوا ﷻ لە بەرانبەردا جۆرەها سـزای لەسـەر حەڵاڵ کردوون.

(١٠٣-١٢٩): ﴿ ثُمَّ بَعَثْنَا مِنۢ بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ
كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ (١٠٣) وَقَالَ مُوسَىٰ يَـٰفِرْعَوْنُ إِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ (١٠٤) حَقِيقٌ
عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ ۚ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِىَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
(١٠٥) قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ (١٠٦) فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ
ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ (١٠٧) وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّـٰظِرِينَ (١٠٨) قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ إِنَّ
هَـٰذَا لَسَـٰحِرٌ عَلِيمٌ (١٠٩) يُرِيدُ أَن يُخْرِجَكُم مِّنْ أَرْضِكُمْ ۖ فَمَاذَا تَأْمُرُونَ (١١٠) قَالُوٓا۟ أَرْجِهْ وَأَخَاهُ
وَأَرْسِلْ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَـٰشِرِينَ (١١١) يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَـٰحِرٍ عَلِيمٍ (١١٢) وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ
قَالُوٓا۟ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَـٰلِبِينَ (١١٣) قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ (١١٤)
قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ (١١٥) قَالَ أَلْقُوا۟ ۖ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟
سَحَرُوٓا۟ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ (١١٦) وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ
أَلْقِ عَصَاكَ ۖ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ (١١٧) فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ (١١٨) فَغُلِبُوا۟
هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُوا۟ صَـٰغِرِينَ (١١٩) وَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَـٰجِدِينَ (١٢٠) قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ (١٢١)
رَبِّ مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ (١٢٢) قَالَ فِرْعَوْنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ
فِى ٱلْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا۟ مِنْهَآ أَهْلَهَا ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ (١٢٣) لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَـٰفٍ ثُمَّ
لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ (١٢٤) قَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ (١٢٥) وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِـَٔايَـٰتِ
رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتْنَا ۚ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ (١٢٦) وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ
مُوسَىٰ وَقَوْمَهُۥ لِيُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ ۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَآءَهُمْ وَنَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ
وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَـٰهِرُونَ (١٢٧) قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱلْأَرْضَ
لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ (١٢٨) قَالُوٓا۟ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن
تَأْتِيَنَا وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا ۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ
فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ (١٢٩) ﴾:

واتـە: پـاش ئـەو پێغەمبەرانـەی کـە باسـمان کـرد مووسـای کەلیـم پێشـەوای گـەورەو

پێغەمبـەری دڵسـۆزو بەڕێزمـان نـارد بـۆ لای گەلێکی سـەرکەش و خۆبەزل زان و لە سـنور دەرچـوو، ئەوانیـش بریتـی بوون لـە فیرعەون و دارو دەسـتەکەی لـە پیاو ماقـووڵ و گەورە پیـاوان، خـوا ﷻ نیشـانە گەورەکانـی خۆی پێ پێشـاندان کـە هاوتایـان نەبوو ﴿ فَظَلَمُواْ بِهَا ﴾ واتـە: ئـەوان بە نیشـانەکان بێبڕوا بـوون و گوێڕایەڵیان نەکرد، ئەوەی کـە گوێڕایەڵی نـاکات دیـار: سـتەمکارەو بەڵکـو لـووت بەرزیشـی نوانـدووە بەرانبـەری ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾ چـۆن خـوا ﷻ لە نـاوی بردن و تووشـی سەرزەنشـت کردن و نەفریـن بـوون لە دنیـاو ڕۆژی دوایی دا، ئـای چەند خراپە ئەو بەخشـراوەی پێیان بەخشـرا، ئەمـە بـە کورتی، درێژەی پێـداوە بەوە دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ ﴾ واتە: کاتێ مووسـا هـات بـۆ لای فیرعـەون بانگـی کـرد بـۆ بڕواهێنـان وتـی: ﴿ يَٰفِرۡعَوۡنُ إِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتـە: مـن پێغەمبەرێکم لـە لایەن پەروەردگـاری جیهانەوە کـە پەروەردگاری هەمـوو دروسـتکراوەکانە بـە هەموو مانای پەرسـتراوی، کە لـە چوارچێوەی ئەوانـەدا واز لە بەندەکانـی ناهێنـێ بەبـێ سـوود، بەڵکـو پێغەمبەرانیان بـۆ دەنێرێ کـە مژدەدەرو ترسـێنەر بـن، ئـەو پەروەردگارەی کە هیچ کـەس ناتوانێ لـە بەرانبەریدا بوێری و چاوقایمـی بنوێنێ، وە بانگەشـەی ئـەوە بـکات ئـەو ناردبێتـی بەڵام لـە کاتێکدا ئـەو پەیامی بـۆ نەناردبێ.

جـا ئەگـەر ئەمـە پلەو پایـەی بـێ، وە مـن خـوا ﷻ هەڵیبـژاردووم و تایبەتی کـردووم بە پەیامەکـەی، ئەمـە ئـەوە دەخـوازێ کە هیـچ نەڵێم بە ناوی خـوا ﷻ جگە لە هەق و ڕاسـتی، وە درۆ نەکـەم بەدەمیـەوە، بێگومـان ئەگـەر من شـتێک بڵێم جگـە لەوەی کە بـۆم هاتووە ئـەوە سـزام بۆ پێـش دەخات، جا تۆڵەم لێدەسـەنێ بـە تۆڵەسـەندنی کەسـێکی زاڵ و بە توانا. ئەمـە پێویسـت بـوو بەوەی کـە ملکەچی بـۆ بنوێنن و شـوێنی بکـەون بە تایبـەت کاتێک بەڵگـەی ڕوونیـان بـۆ هات لە لایـەن خـواوە لەسـەر ڕاسـتی پێغەمبەرایەتی، پێویسـت بوو لەسـەریان کـە کار بـە نێوەڕۆکـی پەیامەکـە بکـەن، ئەویـش دوو مەبەسـتی گەورەیـە: بڕواهێنانیـان پێـی و شـوێنکەوتنیان، وە ناردنـی نەوەکانـی ئیسـرائیل ئەو گەلـەی کە فەزڵی دابـوون بەسـەر هەمـوو جیهانـدا، نەوەکانـی پێغەمبـەران و ڕیزبەنـدی یەعقـووب علیه السلام کە پێغەمبـەر مووسـا یەکێک بـوو لەوان.


حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ قَدۡ جِئۡتُكُم بِبَيِّنَةٖ
مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَرۡسِلۡ مَعِيَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ١٠٥ قَالَ إِن كُنتَ
جِئۡتَ بِـَٔايَةٖ فَأۡتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١٠٦ فَأَلۡقَىٰ
عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعۡبَانٞ مُّبِينٞ ١٠٧ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيۡضَآءُ
لِلنَّٰظِرِينَ ١٠٨ قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ
عَلِيمٞ ١٠٩ يُرِيدُ أَن يُخۡرِجَكُم مِّنۡ أَرۡضِكُمۡۖ فَمَاذَا تَأۡمُرُونَ
١١٠ قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ وَأَرۡسِلۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ١١١ يَأۡتُوكَ
بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ١١٢ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرۡعَوۡنَ قَالُوٓاْ إِنَّ
لَنَا لَأَجۡرًا إِن كُنَّا نَحۡنُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ١١٣ قَالَ نَعَمۡ وَإِنَّكُمۡ
لَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ١١٤ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن
نَّكُونَ نَحۡنُ ٱلۡمُلۡقِينَ ١١٥ قَالَ أَلۡقُواْۖ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ سَحَرُوٓاْ
أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ وَجَآءُو بِسِحۡرٍ عَظِيمٖ ١١٦
۞ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ فَإِذَا هِيَ تَلۡقَفُ مَا يَأۡفِكُونَ
١١٧ فَوَقَعَ ٱلۡحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١١٨ فَغُلِبُواْ
هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ١١٩ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ١٢٠

فیرعەون بە مووسای وت: ﴿ إِن كُنتَ جِئۡتَ بِـَٔايَةٖ فَأۡتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١٠٦ فَأَلۡقَىٰ ﴾ (ئەگەر بەڵگەیەکت پێیە بیهێنە بۆمان ئەگەر ڕاست دەکەی؟!) مووسا ﴿ عَصَاهُ ﴾ (گۆچانەکەی فڕێ دایە) سەر زەوی ﴿ فَإِذَا هِيَ ثُعۡبَانٞ مُّبِينٞ ﴾ واتە: بوو بە مارێکی گەورەی ئاشکرا بە خێرایی دەرۆشتو ئەوان دەیانبینی.

﴿ وَنَزَعَ يَدَهُۥ ﴾ (دەستی دەرهێنا) لە باخەڵیەوە ﴿ فَإِذَا هِيَ بَيۡضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴾ بێ ئەوەی بەڵەکیو نەخۆشی هەبێت، ئەمە دوو نیشانەی گەورەو ڕوونە، بەڵگەن لەسەر ڕاستیو دروستی ئەو پەیامەی کە مووسا هێناویەتی، کە بێگومان ئەو پێغەمبەرێکە لە لایەن پەروەردگاری جیهانەوە، بەڵام ئەوانە بڕوا ناهێنن ئەگەر هەر نیشانەیە ببینن، تا بە چاوی خۆیان سزای بە ئێش نەبینن.

بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ ﴾ کاتێ ئەو نیشانانەیان بینیو بڕوایان پێ نەهێنا، بۆ خۆیان لێکدانەوەی نا ماقوڵو خراپیان بۆ دەکرد ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٞ ﴾ واتە: زۆر زاناو لێهاتوە لە جادوو کردندا.

پاشان خەڵکە بێئاگاو کەم عەقڵو لاوازەکانیان ترساند، بەوەی کە مووسا ﷺ ﴿ يُرِيدُ ﴾ بەم کردەوەی ﴿ أَن يُخۡرِجَكُم مِّنۡ أَرۡضِكُمۡ ﴾ واتە: ئەیەوێ لەم وڵاتەی خۆتانە وەدەرتان بنێ ﴿ فَمَاذَا تَأۡمُرُونَ ﴾ واتە: ئەوان لە ناو یەکتردا ڕاوێژیان کرد کە چی لە مووسا بکەن، وە چۆن زەرەرو زیانەکەی لە خۆیان دوربخەنەوە بە گومانی خۆیان، بێگومان ئەوەی کە هێناویەتی، ئەگەر بە هاوشێوەی خۆی بەتاڵی نەکەنەوە زۆرێک لە خەڵکی شوێنی دەکەون، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن بە فیرعەونیان وت: ﴿ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ ﴾ واتە: تۆ لە لای خۆت گلیان بدەرەوەو زیندانیان بکە، وە نوێنەرت بنێرە بۆ ئەو شوێنانەی لە ژێر دەسەڵاتی تۆدان لە شارەکان، با هەموو جادووگەرە بە تواناو شارەزاکان کۆ بکەنەوە، بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی مووسا ﷺ

بینەوە، وتیان: ئەی مووسا شوێن‌و کاتێک لە نێوان ئێمەو خۆتدا دیاری بکە، کە نە ئێمە سەرپێچی لێ بکەین‌و نە تۆش، تا لە شوێنێکی تەختاییدا ئامادە بین بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، وەک لە شوێنی دی مووسا ﷺ پێیان دەفەرموێ: ﴿ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ٥٩ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ٦٠ ﴾طه.

وە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرْعَوْنَ ﴾ داوای پاداشتیان کرد ئەگەر سەرکەوتن ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴾؟ ﴿ قَالَ ﴾ فیرعەون وتی: ﴿ نَعَمْ ﴾ بەڵێ، پاداشتان بۆ هەیە ﴿ وَإِنَّكُمْ لَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴾ ئەویش پەیمانی پێدان پاداشتیان بداتەوەو لە خۆی نزیکیان بخاتەوەو پلەی بەرزیان پێ ببەخشێ، تا خۆیان ماندوو بکەن‌و هەموو تواناکانیان بخەنە کار بۆ ئەوەی سەربکەون بە سەر مووسادا، کاتێک کە لەگەڵ مووسادا ئامادەبوون بە ئامادە بوونی خەڵکێکی زۆر ﴿ قَالُواْ ﴾ بە شێوەیەکی ئاسایی‌و بێ باکانە لەوەی کە مووسا هێناویەتی: ﴿ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ ﴾ ئەوەی کە لە لاتە ﴿ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحْنُ ٱلْمُلْقِينَ ﴾ واتە: یان ئێمە پێش تۆ دەهاوێژین؟ ﴿ قَالَ ﴾ مووسا وتی: ﴿ أَلْقُواْ ﴾ واتە: (ئێوە بیهاوێژن) لەبەر ئەوەی خەڵکی ببینن ئەوان چیان پێیەو مووساش چی پێیە، ﴿ فَلَمَّآ أَلْقَوْاْ ﴾ پەت‌و گوریس‌و گۆچانەکانیان هەڵدایە گۆرەکانی جادووگەرەکەوە ئەوەندە سەرسووڕهێنەر بوو مووسا وا گومانی برد ئەوانە کۆمەڵە مارێکن دێن‌و دەچن، بەڵام ﴿ سَحَرُوٓاْ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴾ هاوشێوەی نەبوو لە سیحرو جادودا.

﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ ﴾ هاوێشتی ﴿ فَإِذَا هِىَ ﴾ بوو بە مارێک‌و دەهات‌و دەچوو ﴿ تَلْقَفُ ﴾ هەمووی ﴿ مَا يَأْفِكُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی هەڵ لووشی کە بە درۆوە خستبوویانە پێش چاوو خەڵکیان پێ هەڵدەخەڵەتاند.

﴿ فَوَقَعَ ٱلْحَقُّ ﴾ واتە: ڕاستی دەرکەوت‌و ئاشکرا بوو لە پێش چاوی هەموو خەڵکیدا ﴿ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ١١٨ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ ﴾ واتە: هەر لەو شوینەدا فیرعەون‌و دارودەستەکەی ژێر کەوتن ﴿ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ﴾ واتە: بەسەرشۆڕی‌و تێکشکاوی گەڕانەوە، وە هەموو ئەو سیحرو جادوانەیان پەرش‌و بڵاو بویەوەو نەگەیشتن بەو ئامانجەی کە چاوەڕوانیان دەکرد.

وە گەورەترین ئەو کەسانەی کە هەق‌و ڕاستیان بۆ دەرکەوت ساحیرو جادوگەران بوون کە ئەوان شارەزای جۆرەکانی سیحرو وردەکاریەکانی بوون بە پێچەوانەی خەڵکانی تر، بۆیە کاتێک کە زانیان ئەمە نیشانەیەکە لە نیشانە گەورەکانی خوا ﷻ کە لە توانی مرۆڤدا نیە.

قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ قَالَ
فِرۡعَوۡنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكۡرٞ
مَّكَرۡتُمُوهُ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لِتُخۡرِجُواْ مِنۡهَآ أَهۡلَهَاۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ
﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمۡ
أَجۡمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ قَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ
إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا
وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ﴿١٢٦﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ
وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ
أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾
قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ
لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾
قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ
عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ
فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ
بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾

﴿ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ واتـە: بڕوامـان هێنـا بـەو پەیامـەی كە بۆ مووسـا هاتووەو بەڕاسـتمان زانـی.

﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ ﴾ فیرعـەون هەڕەشـەی لێكردن لـە بڕواهێنانو پێی وتن: ﴿ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡ ﴾ ئـەو خراپـە كارو شـتە پیسـە دەسـەڵاتدارێكی خوێن مژ بوو بڕیـاری دابـوو كـە تەنهـا دەبـێ گـوێ بۆ قسـەی ئـەو بگیـرێو بڕیـار لـە لایەنـی ئـەوەوە دەربچێـت، وە تەنهـا فەرمانـی ئەو جێبەجـێ بكرێـت، هیـچ كـەس بـۆی نیە لـە فەرمـانو بڕیـاری ئـەو دەربچێـت. بەم شـێوەیە گەلـەكان پـەرشو بـڵاو دەبـوونو عەقڵیـان لاواز دەبـوو، وە نەیاندەتوانـی داوای مافەكانـی خۆیـان بكـەن، بۆیـە خـوا ﷻ دەربـارەی دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ﴿٥٤﴾ ﴾ الزخـرف.

وە لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡ ﴾ واتـە: بەڕاسـتی ئەمە ڕەوشـتێكی ناشـرینە بەرانبـەر مـن كردووتانـەو بوێریتـان نوانـدوە، پاشـان ڕووی كـردە گەلەكـەیو وتـی: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَمَكۡرٞ مَّكَرۡتُمُوهُ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لِتُخۡرِجُواْ مِنۡهَآ أَهۡلَهَا ﴾ واتـە: بـە ڕاسـتی مووسـا پێشـەواكەتانە كـە فێـری جـادووی كـردوون هەردوولاتـان ڕێكەوتـوون كـە مووسـا سـەربخەنو شـوێنی بكـەون، پاشـان زۆربـەی خەڵكـی دواتـان بكـەوێ هەتـا هاوڵاتیـە (قیبتیەكانـی) لـێ دەرپەڕێنـن، وە لە جێگای ئـەوان هۆزەكەی خۆتی تێدا نیشـتەجێ بكەی. بێگومـان ئەمـە درۆیەكـی گەورەیـە خۆی بـاش دەزانـێ، وە ئەوەیشـی لـە بارووذۆخەكە قـووڵ ببێتـەوە كە بێگومان مووسا ؈ كەسـی لەوان كۆنەكـردەوە، بەڵكو ئەوان لەسـەر نێـرداوی فیرعـەون كۆبوونـەوە، ئـەوەی كـە مووسـا هێناویەتـی بەڵگـەو نیشـانەیەكی خواییـە، وە سـاحیرو جادووگـەرەكان هەمـوو توانایەكیان خسـتەكار بۆ ئەوەی سـەركەون

بەسـەر مووسـادا، تـا لە توانا کەوتن‌و ڕاسـتیان بـۆ دەرکەوت، پاشـان شـوێنی کەوتن. ئنجا فیرعـەون هەڕەشـەی لێکردن وتـی: ﴿ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴾(دواتر دەزانن کە) چ سـزایەکتان دەدەم؟! ﴿ لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ ﴾ئەو شـتە پیسـە وای پێشانداوە کە ئەوان سـەر زەوی تێکـدەدەن، وە ئەوەیـان بەسـەردا ئەهێنـێ کـە بەسـەر خراپەکارانـدا جێبەجێی دەکات لـە بڕینـی دەسـت‌و قـاچ بـە پێچەوانەوە، واتە: دەسـتی ڕاسـت‌و قاچـی چەپ.
﴿ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمۡ ﴾واتـە: بێگومـان بە قـەدی دارخورمـادا هەڵتان دەواسـم ﴿ أَجۡمَعِينَ ﴾ واتـە: هەندێکتـان سـزا نـادەم جگـە لـە هەندێکتـان بەڵکـو دەبـێ هەمووتـان ئەو سـزایە بچێـژن، ئـەو جادووگەرانەی کـە بڕوایان هێنابوو، وە هەڕەشـەی لێکرا بـە فیرعەونیان وت: ﴿ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴾واتـە: بـێ باکیـن لـە سـزادانت، خـوا ﷻ باشـترە بـۆ ئێمە چیت لەدەسـت دێ بیکـەو دریغـی مەکـە ﴿ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ ﴾واتـە: دیـارە تـۆ تەنها لەبـەر ئەمە ئازارمـان دەدەیـت‌و نکوڵـی‌و هەڕەشـەمان لێدەکەیـت، ئێمـە هیـچ تاوانێکمـان نیە ﴿ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَا ﴾ئەگـەر ئەمـە تاوانێکـە خاوەنەکەی سەرزەنشـت بکرێ لەسـەری‌و شایسـتەی سـزادان بێت، ئـەوە تاوانـی ئێمەیە، پاشـان داوایان کرد لـە خوا ﷻو پاڕانـەوە کە جێگیریـان بکات‌و ئارامییان پێ ببەخشـێت وتیـان: ﴿ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا ﴾ واتە: (پەروەردگارمـان بـە سـەرماندا) بڕێـژە ﴿ صَبۡرٗا ﴾واتـە: ئارامیەکـی گەورە، کـە بەڵگەیە لەسـەر (التنکیـر) بـە نەناسـراو کـردن، چونکـە ئەمـە بەڵایەکـی گەورەیە مـرۆڤ بەرەو لەناوچـوون دەبـات‌و دەمـرێ، بۆیـە پێویسـتی بە ئـارام گرتنێکـی زۆر هەیە تـا دڵ جێگیر بـێ، وە بـڕوادار دڵنیـا دەبـێ لەسـەر ئیمانەکـەی، هەتاوەکـو ئـەو وەڕەس‌و بێزاریـەی کە هەیەتـی لابچـێ، ﴿ وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ﴾واتـە: گوێڕایەڵـی فەرمانەکانت بین‌و شـوێنکەوتەی پێغەمبەرەکـەت ﷺ ببیـن، ئـەوەی ئاشـکرایە وا دەردەکـەوێ کـە فیرعەون ئەو هەڕەشـەی لێکـردوون‌و جـێ بەجێـی کـرد بەسـەریاندا، وە خـوای گـەورە جێگیـری کـردن لەسـەر بڕواهێنـان، فیرعەون‌و دارودەسـتەکەی، وە سـەرجەم شـوێنکەوتوانیان لـووت بەرزیان نواند بەرانبـەر بـە نیشـانەکانی خـوا ﷻ، وە بە هـۆی خۆ بـەل زانیـن‌و سـتەمکردنیانەوە نکوڵیان کـرد (لـە وەرگرتنـی هـەق)، وە هانـی فیرعەونیانـدا بەرانبـەر بـە مووسـا کە تۆڵـەی لێ بکاتـەوە، چونکـە وا گومانیـان دەبرد کە مووسـا لـە خراپـەکاران‌و ناهەقانە، ﴿ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ بـە بانگـەواز کردنـی بـۆ لای خـوا ﷻو ڕەوشـت‌و ئاکاری بـەرز، وە کـردەوەی چـاک کـە دەبێتە مایـەی خۆشـبەختی لەسـەر زەویدا، ئـەوەی ئەوان

لەسەر دەڕۆن ئەوە فەسادو خراپەکاریە، بەڵام ستەمکاران بێ باکن لەوەی کە دەیڵێن، وە بە خەیاڵیاندا نایەت چی بڵێن.

﴿ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَ ﴾ واتە: واز لە تۆو پەرستراوەکانت بهێنێ، وە لێت قەدەغە بکاتو دژایەتی خەڵکی بکات لە شوێنکەوتنت.

﴿ قَالَ ﴾ فیرعەون لە وەڵامی ئەواندا وتی: بەنی ئیسرائیل لەگەڵ مووسادا بە شێوەیەک دەهێڵێتەوە زیاد نەکەن، بەڵام خۆیو گەلەکەی لە ئاسایشدا بژین: ﴿ سَنُقَتِّلُ أَبْنَآءَهُمْ وَنَسْتَحْيِۦ نِسَآءَهُمْ ﴾ واتە: ئافرەتەکانیان دەهێڵینەوە بۆ خزمەت کردنو نایانکوژین، ئەگەر ئێمە ئەم کارە بکەین ئەوە ئەوان زیاد ناکەنو دەتوانین بەجێ ماوەکانیان بەکاربهێنین ﴿ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَٰهِرُونَ ﴾ لە فەرمانی ئێمە ناتوانن دەرچنو دەسەڵاتی رووبەڕوبونەوەی ئێمەیان نیە، ئەمەش ئەوپەڕی ستەمکاریو لە سنور دەرچوونیانە.

﴿ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ﴾ لەم حاڵەتەدا ئامۆژگاری گەلەکەی کرد لە کاتێکدا ئەوان هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو تەنانەت نەیان دەتوانی بەرگریش لە خۆیان بکەن جگە لە بەرگری پەروەردگار نەبێ ﴿ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ ﴾ واتە: پشت بە خوا ببەستن لە بەدەست هێنانی سوودو قازانجو دوورخستنەوەی ئەو شتەی کە زیانی دەبێ بۆتان، وە متمانەتان بە خوا بێ کە لە داهاتوویەکی نزیکدا کاروبارەکانتان تەواو دەکات ﴿ وَٱصْبِرُوٓا۟ ﴾ واتە: ئارام بگرن لەسەر ئەو ناخۆشیانەی کە بەسەرتاندا دێتو چاوەڕوانی خۆشی بکەن ﴿ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ ﴾ بۆ فیرعەونو گەلەکەی نیە تا حوکمی تێدا بکەن ﴿ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾ واتە: دەیگۆڕێ لە نێوان خەڵکیدا بە پێی ویستو حیکمەتی خۆی، بەڵام سەرەنجام بۆ پارێزکارانە، بێگومان ئەگەرچی ماوەیەکیش تاقی بکرێنەوە لە لایەن خوا ئەوە سەرەنجام سەرکەوتن هەر بۆ ئەوانە ﴿ وَٱلْعَٰقِبَةُ ﴾ سەرەنجامێکی گەشو پرشنگدار بۆ ئەوان دەبێت، ئەمە پیشەی بەندەی خوایە کاتێک کە توانای هەبێت هۆکارەکان دەگرێتە بەر بۆ ئەوەی زەرەرو زیانی خەڵکی لێ بە دوور بێت، وە لە کاتی بێ توانایدا ئارام دەگرێو پشت بە خوا دەبەستێو چاوەڕوانی دەرگای خێر دەکات.

﴿ قَالُوٓا۟ ﴾ واتە: لە کاتێکدا کە ماوەیەکی زۆر لە ژێر ئەشکەنجەو ئازاری فیرعەوندا بوون بە مووسایان وت: ﴿ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِيَنَا ﴾ ئەوان بە خراپترین شێوە سزامان دەدەن منداڵەکانمان سەردەبڕنو ئافرەتەکانمان دەهێڵنەوە ﴿ وَمِنۢ بَعْدِ مَا جِئْتَنَا ﴾ بە هەمان شێوە.

﴿ قَالَ ﴾بـە ئومێـدی ئەوەی کـە دەرگای خێریـان لێ دەکرێتـەوە و ڕزگاریـان دەبێ لەو نەهامەتیـە، پێی وتـن: ﴿ عَسَىٰ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: دەتان کات بە جێنشـینی دوژمنەکانتان لەسـەر زەوی ﴿ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴾ ئایـا سوپاسـگوزار دەبن، یـان بێ بڕوا؟ ئەمـە پەیمانێکە خـوا ﷻ بەجێی هێنـاوە لەو کاتەی کە ویسـتی لەسـەر بووە.

(١٣٠): ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ ﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: پاش ڕوونکردنـەوەی چۆنێتـی مامەڵەکردنی دەسـەڵاتدارانی فیرعەون لـەم کۆتاییانـەدا، خـوا لەسـەر نەریتو سـوننەتی خۆیەتـی لەگـەڵ سـەرجەم ئوممەتەکاندا ئەویـش ئەوەیـە کـە بە خۆشـیو بـە ناخۆشـی تاقیـان دەکاتـەوە، بۆ ئـەوەی بیـر بکەنەوە ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ ﴾ واتـە: بـە وشـکە سـاڵیو قـاتو قڕیو برسـێتی ﴿ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾ واتـە: بەڵکـو پەنـد وەربگـرن لـەو ناخۆشـیانەی کـە بـە هـۆی تاوانەکانیانـەوە خـوا سـەرکۆنەی کـردنو بەسـەریدا هێنـان، ئەمیـش لەبـەر ئەوەی پەشـێمان ببنەوە لـەو بیڕواییەی کـە دەیکەن، بەڵام هیچ سـوودێکی نەبـوو لەگەڵیانـدا بەڵکـو بەردەوام بـوون لەسـەر سـتەمو خراپەکاریی.

فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ
يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ
وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ١٣١ وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ
مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ١٣٢ فَأَرۡسَلۡنَا
عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ
ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ
١٣٣ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا
عَهِدَ عِندَكَۖ لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ
وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ١٣٤ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ
ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ١٣٥ فَٱنتَقَمۡنَا
مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا
غَٰفِلِينَ ١٣٦ وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ
مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ
رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا
مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ ١٣٧

(١٣١): ﴿ فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ١٣١ ﴾:

دەفەرمویّ: ﴿ فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ ﴾ واتە: بەروبوومو ڕزقو ڕۆزی زۆر ﴿ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ ﴾ واتە: ئەمە شایستەی ئیّمەیە، سوپاسی خوایان نەدەکرد لەسەری ﴿ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ ﴾ واتە: برسیّتیو قاتو قڕیی (تووش بووایە) ﴿ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ ﴾واتە: دەیان وت: بە هۆی شومی مووساو شویّنکەوتوانیەتی لە بەنی ئیسرائیل.

خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ئەو ناخۆشیانە هەمووی قەزاو قەدەرە لەلایەن خواوەیە، بە پیّچەوانەی ئەوەی کە ئەوان دەیڵیّن، بیّگومان تاوانو بیّبڕوایی ئەوان هۆکاری ئەوەیە، بەڵام ﴿ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ واتە: زۆربەیان بیّئاگاو نەزانن، بۆیە شتی لەو جۆرە دەڵیّن.

(١٣٢-١٣٣): ﴿ وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ١٣٢ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ١٣٣ ﴾:

ئەوان بە بەردەوامو بەو شیّوەیە لەسەر بیّ بنەماییو پوچی خۆیان دەمیّننەوە ﴿ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴾ واتە: لای ئیّمە یەکلا بووەتەوە گومانمان نیە کە تۆ جادووگەری، ئەگەر چی هەر موعجیزەکمان بۆ بهیّنی تا جادوومان لیّبکەی ئیّمە نە بڕوات پیّ دەکەینو نە بە ڕاستت دەزانین، ئەمەش ئەوپەڕی یاخی بوونو سەرکەشیە کە بیّبڕوایان بگەنە ئاستیّک کە بەڵگەیان بۆ دابەزیّ، یان دانەبەزیّ وەک یەک وابیّ ﴿ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ ﴾ واتە: ئاویّکی زۆر کە هەموو داروو درەختو کشتووکاڵیانی داپۆشی، وە زیانی گەورەی پیّگەیاندن ﴿ وَٱلۡجَرَادَ ﴾ وە کوللە بەروبوومو کشتوکاڵەکانی خواردن

﴿وَٱلۡقُمَّلَ﴾ وتراوە: ئەوە لە کوللە بچوکترە، بەڵام ئەوەی کە ئاشکرایە مەبەستی پێی ئەسپێیە ﴿وَٱلضَّفَادِعَ﴾ کە قاپو قاچاخیان پڕ دەبوو لە بۆقو ئازاری دەدان ﴿وَٱلدَّمَ﴾ یان مەبەستی پێی ئەوەیە کە خوێن زۆر لە لووتیان دەهاتە دەرەوە، یان وەک وتەی زۆربەی ڕاڤەکارانی قورئانە کە دەفەرموون: ئەو ئاوەی کە دەیانخواردەوە دەگۆڕا بە خوێن، ئەوان هیچیان نەدەخواردەوە تەنها خوێن نەبێ، وە هیچیان نەدەخستە سەر ئاگر تەنها خوێن نەبێ ﴿ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ﴾ چەندین بەڵگەی ڕوونو ئاشکرا لەسەر ئەوەی کە ئەوان درۆزنو ستەمکار بوون، وە لەسەر ئەوەی کە مووسا هێناویەتی هەقو ڕاستە.

﴿فَٱسۡتَكۡبَرُواْ﴾ کاتێک کە نیشانەکانیان بینی خۆیان بە گەورە زانی لەو ڕووەی کە بڕوای پێ بهێنن ﴿وَكَانُواْ﴾ هەر لە پێشینەوە ﴿قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ﴾ بۆیە خوا ﷻ سزای دان کە لەسەر سەرکێشیو ستەم بمێننەوە.

(١٣٤): ﴿وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَۖ لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ١٣٤﴾:

دەفەرموێ: ﴿وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ﴾ واتە: سزا، وە دەگونجێ مەبەست پێی تاعونو پەتا بێت، وەک چۆن زۆرێک لە ڕاڤەکارانی قورئان وتوویانە، وە دەگونجێ مەبەست پێی ئەو نیشانانەی پێشوو بێت لە لافاوو کوللەو ئەسپێو بۆقو خوێن، بێگومان ئەوانە سزایەکی سەختو پیسن، ئەوان کاتێک کە تووشی یەکێک لەو سزایە ببونایە دەیانوت ﴿يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ﴾ واتە: تکایان دەبرد بۆ لای مووسا بەو بەڵێنە کە خوا ﷻ پێی داوە لە وەحیو نیگا، ئەگەر ﴿لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ ئەوان لەو وتەیەدا درۆیان کرد تەنها ئەوە نەبێ سزایان لەسەر لابدرێ، وە وا گومانیان برد ئەگەر سزایان لەسەر هەڵبگیرێ ئەوە جارێکی تر سزا نادرێن.

(١٣٥): ﴿فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ١٣٥﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ﴾ تا ئەو ماوەیەی کە خوا ﷻ ویستی لەسەر بوو نەک بۆ هەتا هەتایی، بەڵکو ئەوە کاتی بوو ﴿إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ﴾ ئەو پەیمانەی کە دابوویان بە مووسا عليه السلام بەوەی کە بڕوای پێ بهێنن نەوەکانی ئیسرائیلی لەگەڵدا بنێرن، نە بڕوایان پێهێنا، نە نەوەکانی ئیسرائیلیان لەگەڵیدا نارد، بەڵکو بەردەوام بوون لەسەر بێبڕواییو گومڕاییان.

(١٣٦): ﴿ فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ ﴿١٣٦﴾ ﴾:

واتە: کاتێک کە کاتی لەناوچوونیان هات خوا ﷻ فەرمانی کرد بە مووسا کە شەوڕۆیی بە نەوەکانی ئیسرائیل بکات، وە هەواڵی پێدا کە فیرعەونو سەربازەکانی شوێنی دەکەون، ﴿ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ ﴿٥٣﴾ ﴾الشعراء، خەڵکیان کۆکردەوە، تا دوای نەوەکانی ئیسرائیل بکەونو پێیان بڵێن:

﴿ إِنَّ هَٰؤُلَاءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَائِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَاهُم مِّن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَاءَى الْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَابُ مُوسَىٰ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّا ۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْبَحْرَ ۖ فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الْآخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ الشعراء.

وە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَأَغْرَقْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَكَانُوا عَنْهَا غَافِلِينَ ﴾ واتە: بە هۆی ئەوەی دەقەکانی خوایان بە درۆ دەخستەوەو پشتیان لە هەق کرد بوو.

(١٣٧): ﴿ وَأَوْرَثْنَا الْقَوْمَ الَّذِينَ كَانُوا يُسْتَضْعَفُونَ مَشَارِقَ الْأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا ۖ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ الْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ بِمَا صَبَرُوا ۖ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُ وَمَا كَانُوا يَعْرِشُونَ ﴿١٣٧﴾ ﴾:

دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْرَثْنَا الْقَوْمَ الَّذِينَ كَانُوا يُسْتَضْعَفُونَ ﴾ لەسەر زەویدا، واتە: نەوەکانی ئیسرائیل ئەوانەی کە خزمەتکاری فیرعەون بوون، بە خراپترین شێوە ئازاریان دەدان، وە کردی بە میراتیان ﴿ مَشَارِقَ الْأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا ﴾ مەبەست لە زەوی لێرەدا، زەوی میسرە، کە ئەوان لە پێشتر تیایدا لاوازو زەلیل بوون، واتە: خوا ﷻ هەمووی کرد بە موڵکیان، وە دەسەڵاتداری کردن تیایدا ﴿ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا ۖ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ الْحُسْنَىٰ عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ بِمَا صَبَرُوا ﴾ کاتێ کە مووسا پێی وتن: ﴿ اسْتَعِينُوا بِاللَّهِ وَاصْبِرُوا ۖ إِنَّ الْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ ۖ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ ﴾الأعراف.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَدَمَّرْنَا مَا كَانَ يَصْنَعُ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُ ﴾ لەو باڵەخانە بەرزو شوێنە رازاوانە ﴿ وَمَا كَانُوا يَعْرِشُونَ ﴾ وەک لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةً بِمَا ظَلَمُوا ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾النمل.

وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ
عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا
لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ١٣٨ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ
مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٣٩ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ
أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٤٠ وَإِذۡ أَنجَيۡنَٰكُم
مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُقَتِّلُونَ
أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ
مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ١٤١ ۞وَوَٰعَدۡنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيۡلَةٗ
وَأَتۡمَمۡنَٰهَا بِعَشۡرٖ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗۚ وَقَالَ
مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخۡلُفۡنِي فِي قَوۡمِي وَأَصۡلِحۡ وَلَا تَتَّبِعۡ
سَبِيلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ١٤٢ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ
رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِي وَلَٰكِنِ
ٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡجَبَلِ فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ فَلَمَّا
تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلۡجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكّٗا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقٗاۚ فَلَمَّآ
أَفَاقَ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٤٣

**(١٣٨)**: ﴿ وَجَٰوَزۡنَا بِبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡبَحۡرَ فَأَتَوۡاْ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡۚ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ قَالَ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ١٣٨ ﴾:

پاش ئەوەی خوا ﷻ رزگاری کردن لە دوژمنەکەیان فیرعەونو دارو دەستەکەیو لە ناوی بردن، وە نەوەکانی ئیسرائیل تەنها تەماشایان دەکرد، ﴿ فَأَتَوۡاْ ﴾ واتە: تێپەڕین ﴿ عَلَىٰ قَوۡمٖ يَعۡكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصۡنَامٖ لَّهُمۡ ﴾ واتە: بە کزۆڵیەوە دەیانپەرستنو تەبەروکیان پێوە دەکرد، ﴿ قَالُواْ ﴾ لە نەفامیو بێ عەقڵیانەوە، لە پاش ئەو هەموو نیشانەو بەڵگەی کە بینیان، بە پێغەمبەرەکەیان وت: ﴿ يَٰمُوسَى ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞ ﴾ واتە: ڕێگەمان پێبدە کە ئێمەش بت بپەرستین، وەک چۆن ئەوان دەیپەرستن، ﴿ قَالَ ﴾ بە ئەوانی فەرموو: ﴿ إِنَّكُمۡ قَوۡمٞ تَجۡهَلُونَ ﴾ چی نەفامیەک گەورەترە لە نەفامی کەسێک کە پەروەدگارو دروستکەری نەناسێو بیەوێت هاوتای بکاتەوە لەگەڵ غەیری خوا، لە کاتێکدا نە قازانجو زیان، وە نە مردنو ژیانو زیندوو کردنەوەی بە دەست نیە؟! بۆیە مووسا عليه السلام پێی فەرموون:

**(١٣٩)**: ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٞ مَّا هُمۡ فِيهِ وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٣٩ ﴾:

چونکە پارانەوەیان لەوە بتانە بەتاڵو بێ بنەمایە، خۆی لە خۆیدا پووچە، بۆیە کار بۆ کردنی بەتاڵەو ئامانجەکەشی بە هەمان شێوە بەتاڵە.

﴿ قَالَ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡغِيكُمۡ إِلَٰهٗا فَضَّلَكُمۡ ﴾ واتە: ئایا جگە لە خوا ﷻ داوای پەرستراوێکی ترم لێدەکەن کە بیپەرستن، خوایەک کە تەواو کامڵە لە زاتو سیفاتو کردەوەیدا!

**(١٤٠)**: ﴿ وَهُوَ فَضَّلَكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٤٠ ﴾:

وا پێویستە فەزڵو گەورەییو سوپاسگوزاری خوا ﷻ لەبەر چاو بگرن بەو شێوەیەی

کە بەتاکو تەنها بەندایەتی بۆ بکەنو بێبڕوا بن بە هەموو پەرستراوەکان بێجگە لە ئەو.

(١٤١): ﴿ وَإِذْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۖ يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿١٤١﴾ ﴾:

پاشان باسی یادی خستنەوە بەو منەتەی کە کردوویەتی بەسەریاندا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ ﴾ واتە: لە فیرعەونو دارودەستەکەی ﴿ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ﴾ واتە: بە خراپترین شێوە ئەشکەنجەو ئازاریان دەدان، ئەویش بریتی بوو لە ﴿ يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم ﴾ ڕزگار بوون لە سزایان ﴿ بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴾ نیعمەتێکی گەورەو بێ پایانە، یان لەو سزایەدا کە لە لایەن ئەوانەوە تووشتان هات ئەوە بەڵایەکی گەورە بوو لە لایەن خوای پەروەردگارتانەوە، کاتێک کە مووسا یادی خستنەوە وازیان لەوە هێنا.

(١٤٢): ﴿ وَوَٰعَدْنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَٰهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخْلُفْنِى فِى قَوْمِى وَأَصْلِحْ وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ ﴾:

کاتێک کە خوا ﷻ نیعمەتەکانی تەواو کرد بەسەریانو ڕزگاری کردن لە دوژمنەکەیان، وە لەسەر زەویدا جێگیری کردن ویستی زیاتر نازو نیعمەتی خۆی بڕێژێ بەسەریاندا لە دابەزاندنی کتێب کە سەر جەم حوکمە شەرعیەکان لە خۆدە گرێت، وە بیرو باوەڕو یەکتاپەرستی، بۆیە بەڵێنی دا بە مووسا بە سی شەو وە بە دە شەوی تریش کاملی کرد تا بوو بە چل شەو، بۆ ئەوەی مووسا ئامادە بێ بۆ بەڵێنی خوا ﷻ، وە بۆ ئەوەی دابەزینی کاریگەریەکی گەورەی هەبێ لەسەریانو بە شێوەیەکی جوان پێشوازی لێ بکەن.

وە کاتێک کە مووسا عليه السلام ڕۆیشت بۆ دیدارو ژوانگەی پەروەردگاری، وەسیەتی بۆ هاروون کردو بە ئەوپەڕی پەرۆشیو خەمباریەوە پێوت: ﴿ ٱخْلُفْنِى فِى قَوْمِى ﴾ واتە: ببە بە جێنشیم، وەک من هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکە ﴿ وَأَصْلِحْ ﴾ واتە: شوێنی ڕێگای چاک بکەوە ﴿ وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ ئەوانەی کە تاوانو سەرپێچی دەکەن.

(١٤٣-١٤٤): ﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ

﴿١٤٣﴾ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصْطَفَيْتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذْ مَآ ءَاتَيْتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾:

﴿ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا ﴾ واتە: ئەو کاتەی کە دیاریمان کردبوو بۆ دابەزاندنی کتێب ﴿ وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ ﴾ واتە: بەو شێوەی کە گفتوگۆی لەگەڵدا کرد، لە نیگاو فەرمانو قەدەغە کراوەکانی، ئارەزووی کرد خوا ﷻ ببینێ، بە هۆی ئەو هەموو خۆشەویستیەی کە هەیبوو بۆ پەروەردگاری ﴿ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ قَالَ ﴾ خوا فەرمووی: ﴿ لَن تَرَىٰنِي ﴾ واتە: تۆ لە دنیادا من نابینی، خوا ﷻ دروستکراوەکانی لەم دنیایەدا بە شێوەیەک دروست کردوە کە ناتوانن ببینن، ئەمەش بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە لە بەهەشتدا نایبینن، بەڵگە قورئانیەکانو فەرموودە شیرینەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە خەڵکی بەهەشت خوا دەبینن‌و چێژ لە بینینی وەردەگرن، ئەو کات خوا بە شێوەیەکی تۆکمەتر دروستیان دەکات تا بتوانن پەروەردگاریان ببینن، بۆیە خوا ﷻ بینینی خۆی پەیوەست کردوە لەم دەقەدا بە جێگیر بوونی کێوەکە، بۆیە قەناعەت بە مووسا ﷺ دەهێنێ لە وەڵام نەدانەوەی بینینیدا: ﴿ وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ ﴾ واتە: بەڵام تەماشای لای کێوەکە بکە، ئەگەر لە جێگای خۆی مایەوە ﴿ فَسَوْفَ تَرَىٰنِي ﴾ (واتە: ئەوە تۆش دوای کەمێک من دەبینی)، ﴿ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ ﴾ بێدەنگی ئەستورو بەهێز ﴿ جَعَلَهُۥ دَكًّا ﴾ واتە: شاخەکەی کرد بە خۆڵ، چونکە نەیتوانی لە بەردەم بینینی خوادا خۆی ڕابگرێت ﴿ وَخَرَّ مُوسَىٰ ﴾ کاتێ ئەوەی بینی ﴿ صَعِقًا ﴾ (واتە: لە هۆش خۆی چوو).

بۆی ڕوون بوویەوە بێگومان ئەگەر کێو خۆی نەگرێت لە بەرانبەر بینینی پەروەردگاریدا، ئەوە مووسا لە پێشترە بۆ ئەو مەبەستە، وە داوای لێبوردنی لە خوا کرد لەو پرسیارەی کە کردی، کە لەگەڵ ئەو شوێنەدا نەدەگونجا، بۆیە فەرمووی: ﴿ قَالَ سُبْحَٰنَكَ ﴾ واتە: پاکی‌و گەورەیی بۆ تۆ لە هەر شتێک کە شایستە نیە بە تواناو دەسەڵاتت ﴿ تُبْتُ إِلَيْكَ ﴾ لە هەموو تاوانەکانو ئاکارێکی خراپ لەگەڵیدا ﴿ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ واتە: بڕوای تازە کردەوە ﷺ، بەوەی کە خوا ﷻ بۆی تەواو کرد کە پێشتر نەیدەزانی، کاتێ کە خوا ﷻ ڕێگری کرد لە بینینی، پاش ئەوەی کە تامەزرۆی بوو خێرو چاکەیەکی زۆری پێ بەخشی.

قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٤٥﴾ سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٤٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٤٧﴾ وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌۚ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمۡ وَلَا يَهۡدِيهِمۡ سَبِيلًاۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾ وَلَمَّا سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ وَرَأَوۡاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ ضَلُّواْ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا وَيَغۡفِرۡ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾

دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ واتـە: من تـۆم هەڵبـژاردوەو ڕێزم لێنـاویو تایبەتم کـردووی بـە چاکەی زۆر گـەورە ﴿ بِرِسَٰلَٰتِي ﴾ کـە تایبەخشـم تەنها بە تایبەتریـنو چاکترینی دروسـتکراوەکان نەبـێ ﴿ وَبِكَلَٰمِي ﴾ لەگـەڵ تۆدا بەبـێ هیچ نێواندگیریـەک، ئەمە چاکەیەکـە کە تایبەتە بە مووسـاوە، وە لە نێوان بـرا پێغەمبەرەکانیدا بەوە ناسـراوە ﴿ فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ ﴾ لە نازو نیعمەتەکانـی، وە توونـد دەسـت بـە فەرمانو قەدەغـە کراوەکانمانـەوە بگـرەو گوێڕایەڵی بکـە ﴿ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ واتـە: لـە سوپاسـگوزاران بە لەسـەر ئەوەی کە خوا ﷻ تایبەتـی کـردوویو فەزڵـی خـۆی ڕشـتوە بەسـەرتدا.

(١٤٥): ﴿ وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٤٥﴾ ﴾

ئـەوەی کە بەندەکان پێویسـتیان پێیەتـی وە ﴿ مَّوۡعِظَةٗ ﴾ هانی نەفـسو دەروونەکان بدات بۆ کاری چاک، وە بیانترسـێنێ لە کردەوەی خـراپ ﴿ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ ﴾ لە بڕیارو فەرمانە شـەرعیەکانو عەقیدەو ڕەوشـتو ئادابەکان ﴿ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ ﴾ واتە: بە توندی دەسـتیان پێوە بگرە ﴿ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَا ﴾ بریتیە لەو فەرمانانەی کە پێویسـتو چاکن، بێگومان ئەوانـە جوانتـرو چاکترینیانـن، ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی سـەرجەم فەرمانەکانـی خوا ﷻ لە هەموو شـەریعەتدا تـەواوو دادپـەروەرو چاکـن، ﴿ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾ پاش ئەوەی خـوا ﷻ لـە ناوی بردن شـوێنو پاشـماوەیانی کرد بـە پەند بۆ ئەوانـەی دوای خۆیـان، تا ئەو بڕوادارانـەی کـە خۆیان بە کـەم دەزانن پەنـدو ئامۆژگاری لـێ وەربگرن.

(١٤٦): ﴿ سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ

سَبِيلًاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٤٦﴾:
بەڵام جگە لەوان ﴿سَأَصْرِفُ عَنْ ءَايَـٰتِيَ﴾ واتە: پەند وەربگرن لە ئاسۆی دنیاو نیشانەکانی کتێب ﴿ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ﴾ واتە: لووت بەرزی دەکەن بەسەر بەندەکانی خوادا، وە بەسەر هەقو ڕاستیو ئەو پەیامەی کە مووسا هێناویەتی، هەر کەسێک ئەمە سیفەتو خوی بێت، ئەوە خوا ﷻ لە خێرو چاکەیەکی زۆر بێ بەشی دەکات، وە سەرشۆڕی دەکاتو لە نیشانەکانی خوا تێناگاو سوودی لێوەرناگرێ، بەڵکو ڕاستیەکانی لەلا پێچەوانە دەبێتەوە، خراپە بە باش لە قەڵەم دەدات ﴿وَإِن يَرَوْا۟ كُلَّ ءَايَةٍ لَّا يُؤْمِنُوا۟ بِهَا﴾ بە هۆی بەربەرچدانەوەو وەرنەگرتنیان، وە دژایەتی کردنی خوا ﷻو پێغەمبەرەکەی، ﴿وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلرُّشْدِ﴾ واتە: ڕێگەی هیدایەتو ڕاستو دروست کە بریتیە لەو ڕێگایەی کە دەیگەیەنێ بە خواوماڵی ڕێزو کەرامەتی، ﴿لَا يَتَّخِذُوهُ﴾ واتە: نایکەن بە ڕێبازو ئاینی خۆیان، وە حەزی لێ ناکەن ﴿وَإِن يَرَوْا۟ سَبِيلَ ٱلْغَىِّ﴾ واتە: گومڕاییەک کە خاوەنەکەی بگەیەنێ بە بەدبەختیو نەگبەتی ﴿يَتَّخِذُوهُ سَبِيلًا﴾ هۆکاری لادانیان ئەم لادانەیە: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَـٰفِلِينَ﴾ ڕەت کردنەوەی نیشانەکانی خواو بێئاگا بوونیان لە ئامانجو مەبەستەکانیو بە کەم تەماشا کردنیان، ئەوە بوو بە مایەی ئەوەی کە ڕێگای گومڕاییو سەرلێشێواوی بگرنە بەر، وە واز لە ڕێگای ڕاستو دروستو ڕێنمایی بهێنن.

(١٤٧): ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْۚ هَلْ يُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤٧﴾:
ئەو نیشانە گەورانەی کە بەڵگەن لەسەر ڕاستیو دروستی پەیامی پێغەمبەرانمان ﴿وَلِقَآءِ ٱلْـَٔاخِرَةِ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ﴾چونکە بێ بنەما بوو، هەروەها مەرجەکانی قبووڵ بوونی لە دەست دابوو کە ئەویش بریتی بوو لە بڕواهێنان بە نیشانەکانی خواو بە ڕاست دانانی پاداشتەکانی ﴿هَلْ يُجْزَوْنَ﴾ لە بەتاڵیو پووچی کردەوەکانیان، وە بەدەستهێنانی پێچەوانەی ئامانجەکانیان ﴿إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ بێگومان کردەوەی ئەو کەسەی کە بڕوای بە ڕۆژی دوایی نیە چاوەڕێی پاداشتی لێناکرێت، وە هیچ ئامانجێکی نیە بگا بە ئەوپەڕی، بۆیە کردەوەکانی پەرشو بڵاو بووەتەوەو هیچ بنەمایەکی نیە.

(١٤٨): ﴿وَٱتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌۚ أَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمْ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًاۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُوا۟ ظَـٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾:

سامریی (گوێرەکەی) بۆ دروست کردن، ئنجا مشتێکی لە شوێن پێی پەیامبەر (لە جێی پێی ئەسپەکەی جوبریل هەڵگرت) بوو بە ﴿ لَهُۥ خُوَارٌ ﴾ دەنگی دەهات وەک دەنگی گوێرەکە، وە کردیان بە پەرستراو، پاشان وتی: ﴿ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ﴿٨٨﴾ ﴾ طه.

مووسا ﷺ بۆ ئەوە ڕۆی بە دوای خوادا بگەڕێ‌و بیدۆزێتەوە، بەڕاستی ئەمە لە گەمژەیی‌و کەمی تێڕوانینیانە، چۆن پەروەردگاری زەوی‌و ئاسمانیان لێک چوواند بە گوێرەکەیەک کە ناتەواوترینی ناتەواوەکانە؟!

بۆیە ڕوونی کردەوەو فەرمووی: ئەوە نە لە سیفاتی خودی خوایەو نە لە سیفاتی کردەوەکانی کە بیێ بە پەرستراو ﴿ أَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمْ ﴾ واتە: قسە نەکردن ئەوپەڕی ناتەواوییە، ئەوان باشترن لەو ئاژەڵو بێگیانانەی کە قسە ناکەن ﴿ وَلَا يَهْدِيهِمْ سَبِيلًا ﴾ واتە: ڕێگای دینیان پێ نیشان نادات، وە بەرژەوەندی دنیایان بۆ بە دەست ناهێنێ، چونکە ئەوەی لە عەقڵو پاکیدا جێگیر بووە کە بێگومان پەرستنی پەرستراوێک کە قسە نەکات هیچ سوودو زیانێکی نیە لە ئەوپەڕی گەمژەیی‌و کەم عەقڵی‌و گێلی دایە بۆیە دەفەرموێ: ﴿ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴾ چونکە لە شوێنی شایستەدا بەندایەتیان نەکرد، وە هاوەڵیان بۆ خوا ﷻ دانا، بەبێ هیچ بەڵگەیەک کە خوا دایبەزاندبێ، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسێک نکوڵی لە قسەکردنی خوا ﷻ بکات ئەوە نکوڵی لە تایبەتمەندیەکانی پەروەردگارێتیدا کردوە، چونکە خوا ﷻ باسی کردوە کە قسە نەکردن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کەسە ناکرێ بپەرسترێ.

(١٤٩): ﴿ وَلَمَّا سُقِطَ فِىٓ أَيْدِيهِمْ وَرَأَوْاْ أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّواْ قَالُواْ لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا وَيَغْفِرْ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ ﴾:

﴿ وَلَمَّا ﴾ واتە: کاتێک کە مووسا ﷺ گەڕایەوە ناو قەومەکەی بەو حاڵەوە بینیانی پێی ڕاگەیاندن کە ئەوان گومڕا بوونە، پەشیمان بوونەوە ﴿ سُقِطَ فِىٓ أَيْدِيهِمْ ﴾ واتە: لە خەمو خەفەتو پەشیمانیدا لەسەر ئەو کردەوەی کە کردوویانە ﴿ وَرَأَوْاْ أَنَّهُمْ قَدْ ضَلُّواْ ﴾ واتە: بە ملکەچی ڕوویان کردە خوا ﷻ ﴿ قَالُواْ لَئِن لَّمْ يَرْحَمْنَا رَبُّنَا ﴾ وتیان: ئەگەر ڕێگامان پێ نیشان نەداوە میهرەبانی خۆی نەڕێژێ بەسەرماندا وە سەرکەوتوومان نەکات بۆ کارو کردەوەی چاکە ﴿ وَيَغْفِرْ لَنَا ﴾ وە لە تاوانی گوێرەکە پەرستی لێمان خۆش نەبێ ﴿ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ لەو کەسانە دەبن دنیاو دوارۆژیان دۆڕاندوە.

وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي
مِنۢ بَعۡدِيٓۖ أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡۖ وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأۡسِ
أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِۚ قَالَ ٱبۡنَ أُمَّ إِنَّ ٱلۡقَوۡمَ ٱسۡتَضۡعَفُونِي وَكَادُواْ
يَقۡتُلُونَنِي فَلَا تُشۡمِتۡ بِيَ ٱلۡأَعۡدَآءَ وَلَا تَجۡعَلۡنِي مَعَ ٱلۡقَوۡمِ
ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَۖ
وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ
غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡمُفۡتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ
بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٥٣﴾
وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي نُسۡخَتِهَا
هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ
قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَاۖ فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ قَالَ
رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَۖ أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ
ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي
مَن تَشَآءُۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾

(١٥٠): ﴿وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي مِنۢ بَعۡدِيٓۖ أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡۖ وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأۡسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِۚ قَالَ ٱبۡنَ أُمَّ إِنَّ ٱلۡقَوۡمَ ٱسۡتَضۡعَفُونِي وَكَادُواْ يَقۡتُلُونَنِي فَلَا تُشۡمِتۡ بِيَ ٱلۡأَعۡدَآءَ وَلَا تَجۡعَلۡنِي مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾﴾

واتە: مووسا ﷺ زۆر تووڕە بوو لێیان، چونكە زۆر ئامۆژگاری كردبوونو دڵسۆز بوو بەرانبەریان ﴿قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي مِنۢ بَعۡدِيٓ﴾ واتە: بە ڕاستی ئێوە جێنشینێكی زۆر خراپ بوون لە پاش من، بێگومان ئەوە حاڵەتێكە خاوەنەكەی بەرەو لەناوچوونو تیاچوونی هەتا هەتایی دەبات ﴿أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡ﴾ كاتێك كە پەیمانی پێدان بە دابەزاندنی كتێب بە بۆچوونە خراپەكانی خۆتان دەستپێشخەریتان كردوو پەناتان بردە بەر ئەو ڕەوشتە ناشرینە ﴿وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ﴾ لە خەفەتو دڵ پەرێشانیو تووڕەیدا تەختەكانی فڕێدا ﴿وَأَخَذَ بِرَأۡسِ أَخِيهِ﴾ (پرچی براكەی گرت) واتە: هاروون، ﴿يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِ﴾ وە ڕیشی ڕاكێشا، پێی وت: ﴿مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي ﴿٩٤﴾﴾ طـه.

وە ﴿قَالَ﴾ لێرەدا كە دەڵێ: ﴿ٱبۡنَ أُمَّ﴾ (كوڕی دایكم) ئەمە نەرمو نیانیە كە بەرانبەر بە براكەی بە ناوهێنانی دایك بە تەنها لە كاتێكدا ئەو برای دایكو باوكی بوو، ﴿إِنَّ ٱلۡقَوۡمَ ٱسۡتَضۡعَفُونِي﴾ واتە: (ئەو خەڵكە) بە كەم تەماشایان كردم كاتێك كە پێم وتن: ﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓاْ أَمۡرِي ﴿٩٠﴾﴾ طـه.

﴿وَكَادُواْ يَقۡتُلُونَنِي﴾ واتە: وا گومان نەبەی كەمتەرخەمیم كردبێ كە بتەوێ سزام بدەی، چونكە بە ڕاستی دوژمنان سوورن لەوەی كە كەوتنو سەرسمێك لە من

ببینن، ﴿ وَلَا تَجۡعَلۡنِي مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ وەكو ئەوان مامەڵەم لەگەڵدا مەكە.
(١٥١): ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَۖ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ١٥١ ﴾:

مووسا علیه السلام پەشێمان بووەوە لەو ڕەفتارە بە پەلەیەی كە بەرانبەر بە براكەی ئەنجامیدا پێش ئەوەی پاكیو بێتاوانی بۆ دەركەوێ، ئەو وای گومان دەبرد كەمتەرخەمی كردوە ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي ﴾ (وتی: پەروەردگار لە منو براكەم خۆشبە) هاڕوون ﴿ وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَ ﴾ واتە: لە ناوی دا، وە میهرەبانی خۆت دابارێنە بەسەرماندا لە هەموو ڕوویەكەوە، بە ڕاستی ئەوە باشترین پشتیوانە لە بەرانبەر هەموو شەڕو خراپەیەك، وە سەرچاوەی هەموو خێرو خۆشیەكە ﴿ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ واتە: تۆ بە سۆزترینی بە سۆزانی، بە سۆزتری لە باوكو دایكو منداڵو نەفسمان.
(١٥٢): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ ١٥٢ ﴾:

خوا جل جلاله لە ڕوونكردنەوەی دۆخی ئەو گوێرەكە پەرستانەدا دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ ﴾ واتە: كردیان بە خواو پەرستیان ﴿ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾ واتە: وەك چۆن پەروەردگاریان تووڕە كردو سنوورەكانیان شكاند ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ ﴾ هەر كەسێك درۆ بە دەم خواوە بكات ئەوە درۆ بە دەم شەریعەتەكەیشەوە دەكات، ئەوە بێگومان بێبەش نابێ لە تووڕەیی خوا جل جلاله و سەرشۆڕی لە دنیادا، بێگومان ئەوان تووڕەیی خوایان چێژت كاتێك كە فەرمانی پێ كردن خۆیان بكوژن، خوای گەورە لێیان ڕازی نابێت ئیلا بە ئەنجامدانی ئەو كارە نەبێت.
(١٥٣): ﴿ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ١٥٣ ﴾:

هەندێكیان هەندێكی تریان كوشت تا كوشتار لەناویاندا زۆر بوو، لە پاش ئەوە خوا جل جلاله لێیان خۆش بوو، بۆیە فەرمانو بڕیارێكی گشتگیری باس كرد كە ئەوانو غەیری وانیش دەگرێتەوە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾ لە شیركو هاوبەش دانانو تاوانی گەورەو بچووك ﴿ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِهَا ﴾ بەو شێوەی

کە پەشێمان بوویێتنەوە، وە وازیان لەو تاوانە هێنابێ‌و دڵنیابن لەوەی کە جارێکی تر ناگەڕێنەوە سەری ﴿وَءَامَنُوٓاْ﴾ واتە: بڕوایان بە خوا ﷻ هێنابێ، وە ئەوەی کە پێویستە لەسەریان لە بڕواهێنان، وە ئیمان تەواو نابێ ئیللا بە کردەوەی دڵ‌و کردەوەی جەستە نەبێ ﴿إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا﴾ پاش ئەو دۆخە، دۆخی پەشێمان بوونەوەو تەوبە کردن لە تاوانەکان‌و گەڕانەوە بۆ لای فەرمانەکان ﴿لَغَفُورٞ﴾ واتە: خوا لە هەموو تاوانەکان خۆش دەبێ‌و دەیسڕێتەوە ئەگەر بە قەد پانتای زەوی بێت، ﴿رَّحِيمٞ﴾ بە وەرگرتنی تەوبەو داوای لێخۆشبوون، وە سەرخستن بۆ کاری چاکەو قبوول کردنی.

(١٥٤): ﴿وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ١٥٤﴾

کاتێک کە توورەییەکەی بە نەفس‌و دەروونی خۆیدا ڕشت هێور بووەوەو ڕاستەوخۆ سەرقاڵ بوو بە گرنگترین شتەوە ﴿أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَ﴾ کە پێشتر فڕێی دابوو ئەو تەختانە زۆر بەڕێزو گەورە بوون ﴿وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ﴾ واتە: کە ڕێنمایی‌و بەزەیی لە خۆگرتبوو، وە ئاشکرا کردنی هەق بەرانبەر بە پووچ‌و بەتاڵ، وە جیاکردنەوەی کاری چاک لە کاری خراپ، وە هیدایەتدان بۆ باشترین کردەوەکان لە خوورەوشتی بەرزو سۆزو میهرەبانی، وە هەر کەسێک کاری پێ بکردایە بەختەوەر دەبوو، بەڵام هەموو کەس هیدایەت‌و ڕێنمایی خوا ﷻ وەرناگرێ، بەڵکو کەسێک وەری دەگرێ‌و ملکەچی دەبێ، ئەوانەن کە ﴿لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ﴾ واتە: لێی دەترسن‌و ملکەچی دەبن، بەڵام ئەوەی کە لە خوا ﷻ نەترسێ وە لەوە نەترسێ کە ڕۆژێک لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات ئەوە سەرکەش‌و لە خۆباییتر دەبێ، وە بەڵگەی خوای پەروەردگاری لەسەر پێویست دەبێ.

(١٥٥): ﴿وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَاۖ فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ قَالَ رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَۖ أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي مَن تَشَآءُۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَٰفِرِينَ ١٥٥﴾

دەفەرموێ: ﴿وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ﴾ وە کاتێک کە نەوەکانی ئیسرائیل داوای لێبووردنیان کردو گەڕانەوە سەر ژێری خۆیان ﴿سَبۡعِينَ رَجُلٗا﴾ لە پیاوە چاک‌و هەڵکەوتەکانیان دەست نیشان کرد کە لەلای پەروەردگار داوای لێبووردن بکەن، کە خوا ﷻ

شـوێنێکی بـۆ دیـاری کـرد بـوون لـەوێ ئامـادە بـن، کاتێـک کـە ئامـادە بـوون وتیـان: ئـەی مووسـا ﴿ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهۡرَةً فَأَخَذَتۡهُمُ ﴾ ﴿١٥٣﴾ النسـاء. (واتـە: خوامـان پـێ پیشـان بـدە، بـە ئاشـکرا ببینیـن)، گەورەترین بـێ ئەدەبیـان کـرد بەرانبـەر خـوای گـەورە، بۆیە: ﴿ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ ﴾ لـە ناوچـوونو تیاچـوون، بـەردەوام مووسـا ﷺ دەپاڕایـەوە لـە خـوای گـەورەو دەیفەرمـوو: ﴿ رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ ﴾ واتـە: ئەگـەر بتویسـتبا ئـەوە پێـش ئامـادە بوونمـان هەموویانـت لـە نـاو دەبـرد، بـە ڕاسـتی ئەوانـەی کـە هاتـن داوای لێبـوردن بکـەن خۆیـان سـتەمکار دەرچـوون ﴿ أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ ﴾ واتـە: ئەوانـەی کـە عەقڵیـان لاوازەو گێـلو گەمـژەن، ڕووی کـردە خـوا ﷻ و لێـی پاڕایـەوە، وە بیانـووی بـۆ ئەوانـە هێنایـەوە کـە بوێریان کـرد بەسـەر خوادا کـە عەقڵێکـی تەواویـان نیە وایـان لـێ بـکات کـە ئـەو قسـەو ڕەفتـارە ناشـرینانە نەکـەن، پاشـان فەرمـووی: ﴿ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي مَن تَشَآءُۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَٰفِرِينَ ﴾ واتـە: تـۆ باشـترینی ئەوانـەی کـە لێبـووردەن، وە بـە میهرەبانترینیانـی، وە بەخشـینو ڕێـز تەنهـا لـەلای تۆیـە. وەک ئـەوە وایـە مووسـا وتبێتـی مەبەسـت لـە مەبەسـتی یەکەمـی ئێمـە هەمومـان ئەوەیـە کـە پابەنـد بیـن بـە گوێڕایەڵیتـەوەو ئیمانـت پـێ بهێنیـن، وە ئەو کەسـەی کـە عەقـڵو ژیـری لـە جێگـای خۆیەتـی ئـەوە بـەردەوام لەسـەر ڕێگای ڕاسـتە، بـەڵام ئـەوەی کـە عەقڵـی لاوازەو گێـلو گەمژەیـەو بۆچوونـی ناپەسـندە ئەوە ئـەو کارەی کـردوە کـە کردوویەتـی بـە هـۆی یەکێـک لـەو دوو هـۆکارە، وە لەگـەڵ ئەمـەدا تـۆ میهرەبانتریـنو بەخشـندەترینی بەخشـندەکانی، دەی لێمـان خـۆش بـەو میهرەبانـی خـۆت بەسـەرمان دابارێنـە.

وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ
إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ ۚ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاءُ ۖ وَرَحْمَتِي
وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ
الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ
الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ
فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ
عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ
الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ
عَلَيْهِمْ ۚ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا
النُّورَ الَّذِي أُنزِلَ مَعَهُ ۙ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾
قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي
لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۖ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَيُمِيتُ ۖ
فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ
وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ وَمِن
قَوْمِ مُوسَىٰ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٩﴾

(١٥٦): ﴿ وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ ۚ قَالَ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاءُ ۖ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ۚ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٦﴾ ﴾

خـوا ﷻ وەڵامـی دوعـاو نزاکـەی دایەوە، وە زینـدووی کردنـەوە پـاش مردنیـان، وە لـە تاوانەکانیان خۆش بوو، وە مووسـا ﷺ لە تـەواو بوونـی پارانەوەکەیـدا فەرمووی: ﴿ وَاكْتُبْ لَنَا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةً ﴾ لـە زانسـتی بـە سـوودو بژێـوی فـراوانو کـردەوەی چـاک ﴿ وَفِي الْآخِرَةِ ﴾ لـە دوا ڕۆژیشـدا چاکەمان بۆ بنووسـە، ئەویش بریتیـە لەو پاداشـتەی کـە داینـاوە بـۆ چاکـەکاران ﴿ إِنَّا هُدْنَا إِلَيْكَ ﴾ واتـە: گەڕاینەوە بۆ لای تـۆ دانمـان بـە کەمتەرخەمـی خۆمانـدا نا لـە هەمـوو کاروبارەکانمانـدا ﴿ قَالَ ﴾ خوا فەرمـووی: ﴿ عَذَابِي أُصِيبُ بِهِ مَنْ أَشَاءُ ﴾ بـۆ هـەر کەسـێک خراپـەکار بێو بـە هۆی هـۆکاری خراپەدا بگەڕێـت، ﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ لە ئاسـمانو زەوی، ئەوەی چاکـە خوازەو ئەوەشـی خراپـەکارە، وە بڕوادارو بێبـڕوا، هیچ دروسـتکراوێک نیە بێگومان میهرەبانـی خـوای پێگەیشـتووە، وە بە فـەزڵو چاکـەی خوا داپۆشـراون، بـەڵام میهرەبانی تایبـەت بـە دنیـاو دواڕۆژ بۆ هەمـوو کەس نیـە، بۆیە دەفەرمـوێ: ﴿ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ ﴾ سـەرپێچیەکان گـەورەو بچووکیـان، ﴿ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ ﴾ کـە پێویسـتە بدرێـت ﴿ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ ﴾ وە لـە تـەواوی ئیمان بە نیشـانەکانی خوا ﷻ زانینی ماناکەیەتـی، وە کـردەوە بـە ناوەڕۆکـی، لەوانـە شـوێنکەوتنی پێغەمبـەر ﷺ بـە ئاشـکراو نهێنـی، لـە بنەماکانی ئایـنو لقەکانی.

(١٥٧): ﴿ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ

ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾:

کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ﴾ واتە: خۆپارێزی لە هەموو پێغەمبەران، بێگومان مەبەست لەمەدا موحەممەدە ﷺ کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی عەبدول موتەلیب، سیاقی ئایەتەکە لە حاڵی بەنی ئیسرائیل دەدوێ، وە بڕواهێنان بە پێغەمبەر موحەممەد ﷺ مەرجێکە لە مەرجەکانی بڕوا بوون، ئەوانەی کە بڕوایان پێی هێناوە ئەوانە ئەهلی ڕەحمەتن بە ڕەهایی کە خوا ﷻ بۆی نوسیوون، وە وەسف کردنی بە ئوممی، چونکە لە عەرەبە، ئەو ئۆممەتە نەخوێندەوارەیە کە نە دەزانن بخوێننو نە دەزانن بنووسن لە پێش قورئان هیچ کتێبێکیان نەبووە ﴿ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ ﴾ واتە: ناوو وەسفی بە چاکی لەو دوو کتێبەدا باسکراوە کە گرنگترینیان ئەو بانگەوازەیە کە فەرمانی پێدەکات، قەدەغەی لێدەکات وە ئەو پێغەمبەرە ﷺ ﴿ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾ بریتیە لە هەموو ئەوانەی کە چاکو بە سوودنو قازانجیان هەیە ﴿ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾ بریتیە لە هەموو ئەوانەی کە بە عەقڵو سروشتی دەزانرێ ناپەسندە، فەرمانی پێدەکردن بە نوێژو زەکاتو ڕۆژو حەج، وە بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتیو چاکە لەگەڵ دایکو باوکو بە هەمان شێوە لەگەڵ دراوسێو لەگەڵ خزمەتکاردا، وە سوود گەیاندن بە هەموو خەڵکی، وە ڕاستگۆییو داوێن پاکیو چاکەو ئامۆژگاری، وە ئەوەی هاوشێوەی ئەمانە بێ، وە هاوەڵدانان بۆ خوا ﷻو کوشتنی بە ناهەقو زیناو خواردنەوەی مادە بێ هۆشکەرەکانو ستەم بەرانبەر بە هەموو دروستکراوەکانو درۆو خراپەکارییو هاوشێوەی ئەوانەی قەدەغە کردوە، گەورەترین بەڵگە کە دەلالەت بکات لەسەر ئەوەی ئەو پێغەمبەری خوایە ﷺ ئەوەیە کە بانگەوازی بۆ کردوە، وە فەرمانی پێکردوەو قەدەغەی لێکردوە، وە ئەوەی کە حەڵاڵو حەرامی کردوە، بێگومان ﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ لە خواردنو خواردنەوەو ژنو ژنخوازی ﴿ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ﴾ لە خواردنو خواردنەوەو ژنو ژن هێنان گوفتارو کردارەکان ﴿ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡ ﴾ واتە: لە وەسفی ئەو پێغەمبەرەدا ئەوەیە ئاینەکەی ئاسانەو پڕ لە لێ خۆشبوونەو بارقورسیو گرانی تێدانیە، وە کۆتو بەندکردنو ئەرکی قورسی تێدانیە

کـە لە توانـای مرۆڤدا نەبـێ ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ ﴾ واتـە: ڕێزیـان لێدەگرتو بـە گەورەیـان دەزانـی ﴿ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ﴾ بریتیـە لـە قورئـان کـە هەمـوو تاریکیەکانـی دوو دڵـیو گومـانو نەفامی ڕۆشـن دەکاتـەوە، وە دەسـتی پێوە دەگیـرێ کاتێـک کـە جیـاوازیو دووبەرەکیەکان دژ بـە یەک پەرە دەسێنن ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ ئەوانـەی خێری دنیـاو دوارۆژیان بەدەسـت هێنـا، وە ڕزگاریان بوو لە ناخۆشـیو نارەحەتیەکانـی، چونکـە بێگومان ئەوان دەسـتیان گرت بە هەمـوو هۆکارەکانی سەرکەوتنەوە.

بـەڵام ئەوەی بـڕوا بەم پێغەمبـەرە نەخوێنـدەوارە نەهێنێو ڕێـزی لێ نەگـرێو بە گەورەی نەزانـێو سـەری نەخات، وە شـوێنی ئـەو نوورە نەکەوێ کـە خوا ﷻ بـۆی دابەزاندوە، ئەوە زەرەرمەندو دۆڕاو دەبێ.

(١٥٨): ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلْأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ١٥٨ ﴾

کاتێـک کـە بانگـی شـوێنکەوتووانی تەوراتـی کـرد لـە نەوەکانـی ئیسـرائیل بۆ شـوێنی پێغەمبـەر ﷺ بکـەون، لەوانەیـە کەسـێک وا گومـان بیـات کـە حوکـمو بڕیارەکـە تەنها بـۆ ئەوانـە، بەڵام ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر گشـتگیری، دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾ واتـە: عـەرەبو عەجەمتـان شـوێنکەوتووانی کتێبـە پیـرۆزەکانو هاوشـێوەکانیان ﴿ ٱلَّذِي لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ واتـە: بـە ویسـتی خـۆی کاری تێـدا دەکاتو بڕیـاری لەسـەر دەدات، وە بە حوکمە شـەرعیەکان کە لە چوار چێوەیـدا: پێغەمبەرێکـی گـەورەو بەڕێزتان بۆ دەنێـرێ بانگتان دەکات بـۆ لای خوا ﷻ، وە بـۆ لای شـوێنی بـەرزو بەڕێـز، وە ئاگادارتـان دەکاتـەوە لە هەر شـتێک کە دەبێتـە مایەی دوورکەوتنەوەتـان لە شـوێنی بـەرزو بەڕێز.

﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ واتـە: هیـچ کەسـێک شایسـتەی پەرسـتن نیـە، جگـە لـە خـوا ﷻ کە تـاکو تەنهـاو بـێ هاوەڵە، لـە ڕێگـای پێغەمبەرەکانیـەوە نەبـێ بەندایەتی کردنـی نازانرێ ﴿ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ ﴾ واتـە: لـە کـۆی کاروبارەکانیـدا: زینـدوو کردنەوەو مراندنـە کە کەس بەشـدار نیـە تیایـدا، کـە مردنی کـردوە بـە پردێک بۆ گەیشـتن بەماڵـی مانـەوە، کە هەر کەسـێک بـڕوای پـێ بهێنـێو شـوێنی پێغەمبەرەکـەی بکـەوێ سـەرفراز دەبێ ﴿ فَـَٔامِنُواْ

﴿بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ﴾ واتـە: بڕواهێنانێـک لە ناخـەوە کە کردەوەکانی دڵو جەسـتە لـە خـۆ بگرێـت ﴿ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ﴾ واتـە: بـڕوا بـەم پێغەمبـەرە بهێنـن کـە ڕاسـتە لـە عەقیـدەو بیروبـاوەڕو کردەوەکانیـدا ﴿وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ﴾ لـە بەرژەوەندیەکانـی دنیـاو دوارۆژتـان، بێگومـان ئێـوە ئەگەر شـوێنی نەکەون، ئـەوە گومڕا دەبـن بـە گومڕابوونێکی دوور.

(١٥٩): ﴿وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ ١٥٩﴾:

کـە دەفەرموێ: ﴿وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ﴾ واتە: کۆمەڵێک (لە گەلی مووسـا) ﴿يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ﴾ واتـە: ڕێنمایـی خەڵکـی دەکـەنو فێریـان دەکـەنو فەتوایـان بـۆ دەدەن، وە لـە سـەرجەم کێشـەو گرفتەکانیانـدا بە هـەق دادوەریان لە نێوانـدا دەکەن، وەک چـۆن خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ ٢٤﴾ السجدة.

ئـەم دەقـە بەڵگەیـە لەسـەر فـەزڵو چاکـەی مووسـا ؑ بێگومـان خـوا ﷻ کەسـێکی تێـدا هەڵبـژاردوون کـە ڕێنمایـی تەنهـا بـە فەرمانەکانـی ئـەو دەکـەن، هێنانـی ئـەم دەقە پیـرۆزە جۆرێـک لـە تایبەتمەنـدیو خۆپارێـزی تێدایە لەوانەی پێشـوو، بێگومـان خوا ﷻ پێشـتر کۆمەڵێـک لـە ناتەواویەکانی بەنـی ئیسـرائیلی باس کردوە کـە پێچەوانەیـە لەگەڵ هیدایـەتو ڕێنمایـی دا، لەوانەیـە کەسـێک وا گومـان ببـات ئەمـە هەموویـان دەگرێتەوە، بۆیـە خوا ئاگـاداری کردوونەتەوەو باسـی کۆمەڵێکیانی کردوە کە لەسـەر ڕێگای ڕاسـتنو هیدایەت دراون.

وَقَطَّعْنَٰهُمُ ٱثْنَتَىْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ
مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ
فَٱنۢبَجَسَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ
مَّشْرَبَهُمْ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْغَمَٰمَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ
ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ كُلُوا مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَمَا
ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١٦٠﴾
وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ ٱسْكُنُوا هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ وَكُلُوا مِنْهَا
حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُوا حِطَّةٌ وَٱدْخُلُوا ٱلْبَابَ سُجَّدًا
نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيٓـَٰٔتِكُمْ سَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ
﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْهُمْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ
لَهُمْ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُوا
يَظْلِمُونَ ﴿١٦٢﴾ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ
حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ
حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ
كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾

(١٦٠): ﴿وَقَطَّعْنَٰهُمُ ٱثْنَتَىْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ فَٱنۢبَجَسَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْغَمَٰمَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ كُلُوا مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١٦٠﴾﴾:

كه‌ ده‌فه‌رمووێ: ﴿وَقَطَّعْنَٰهُمُ﴾ واته‌: به‌شمان كردن ﴿ٱثْنَتَىْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا﴾ واته‌: بۆ دوازده‌ هۆزو تیره‌ كه‌ یه‌كتریان ده‌ناسیو سۆزو به‌زه‌ییان بۆ یه‌ك ده‌جوولا، هه‌ریه‌ك له‌ نه‌وه‌كانی ئه‌و تیرانه‌ نه‌وه‌ی یه‌عقووب بوون ﴿وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسْتَسْقَىٰهُ قَوْمُهُۥٓ﴾ واته‌: داوایان له‌ مووسا كرد كه‌ له‌ خوا ﷻ بپاڕێته‌وه‌و داوای ئاویان بۆ بكات كه‌ خۆیانو ماڵاتو ئاژه‌ڵه‌كانیان لێی بخۆنه‌وه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌وان له‌ شوێنێكدا بوون كه‌ ئاوی كه‌م بوو، خوا زاناتره‌، خوا ﷻ نیگاو وه‌حی كرد بۆ مووسا وه‌ڵامی داواكاریه‌كه‌یانی دایه‌وه‌ ﴿أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ﴾ ده‌گونجێ به‌ردێكی دیاریكراو بێ، وه‌ ده‌گونجێ هه‌ر به‌ردێك بێ له‌ به‌رده‌كان، لێی دا ﴿فَٱنۢبَجَسَتْ﴾ واته‌: له‌و به‌رده‌وه‌ ئاو هه‌ڵقولا ﴿ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا﴾ واته‌: دوازده‌ كانی ڕێیان ده‌كرد ﴿قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ﴾ واته‌: دابه‌شی كردبوو به‌سه‌ر هه‌موو تیره‌و هۆزێك له‌و دوازده‌ تیره‌، بۆ هه‌ر یه‌كێكیان كانیه‌كی دیاری كرد بوو، ده‌یان ناسیه‌وه‌و ده‌حه‌سانه‌وه‌، وه‌ ڕزگاریان بوو له‌ هه‌موو ناخۆشیو ناره‌حه‌تیو دووبه‌ره‌كیه‌ك، به‌ ڕاستی ئه‌مه‌ له‌ ته‌واوترینی نیعمه‌ته‌كانی خوایه‌ ﷻ، ﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْغَمَٰمَ﴾ ده‌یپۆشین له‌ گه‌رمای خۆر ﴿وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلْمَنَّ﴾ بریتیه‌ له‌ حه‌لوا ﴿وَٱلسَّلْوَىٰ﴾ بریتیه‌ له‌ گۆشتی باڵنده‌، له‌ چاكترین جۆره‌كانی باڵنده‌یه‌و به‌ تامترینیانه‌، خوای گه‌وره‌ بۆی كۆكردنه‌وه‌ له‌ نێوانی

سـێبەرو خواردنـەوەو خواردنـی خـۆش‌و بەلـەززەت لـە حەلواو گۆشـت، تا لە پشـوودان‌و دڵنیاییـدا بـن ﴿ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا ﴾ واتـە: کاتێـک کـە سوپاسـگوزاری خوایان نەکـردو فەرمانەکانیـان جێبەجـێ نەکرد ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ کـە بـێ بەشـی کردن لـە هەموو چاکەیـەک، وە تووشـی خراپەو نەگبەتـی کـردن، ئەمـەش ئـەو ماوەیە بـوو کە لە تەیهـو سـەرگەردانی‌و بێئاگایـدا دەژین.

(١٦١-١٦٢): ﴿ وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ ٱسْكُنُواْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ وَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ وَقُولُواْ حِطَّةٌ وَٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيٓـَٰٔتِكُمْ سَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَظْلِمُونَ ﴿١٦٢﴾ ﴾:

﴿ وَإِذْ قِيلَ لَهُمُ ٱسْكُنُواْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةَ ﴾ واتـە: بچنـە نـاو ئـەو شـارە کە شـاری ئێوەیە لـەوێ نیشـتەجێ بن کـە ئەویش شـاری ئیلیائـە ﴿ وَكُلُواْ مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ ﴾ واتە: شـارێکە پـڕ لـە دارو درەخـت‌و بەرهەمـی جۆراو جـۆرە، بۆیە خـوا ﷻ، فەرمانـی پێکردن هـەر کاتێ ویسـتیان بخـۆن ﴿ وَقُولُواْ ﴾ واتـە: کاتێـک کە دەچنـە بەردەرگای شـارەکە بڵێـن: ﴿ حِطَّةٌ ﴾ واتـە: تاوانەکانمـان بسـڕەرەوەو لێمان خـۆش بە ﴿ وَٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا ﴾واتـە: لە دەروازەی شـارەکە بچنـە ژوورەوەو ملکەچی بۆ خوا بنوێنن‌و سـوژدەی بـۆ ببـەن، وە سوپاسـگوزاری نـازو نیعمەتەکانی بـن، وە فەرمانـی پێکردن بە لێخۆشـبوون‌و بەڵێنـی پێـدان کە لـە تاوانەکانیان خۆش بێ، وە بە باشـترین شـێوە لە ئێسـتاو لـە داهاتوودا پاداشـتیان بداتەوە فەرمووی: ﴿ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطِيٓـَٰٔتِكُمْ سَنَزِيدُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ لـە خێـری دنیـاو دواڕۆژ، بەڵام ئـەوان ئـەم فەرمانـە خواییەیـان بەجێنەهێنـاو گوێڕایەڵیان نەکـرد، بەڵکـو قسـەکەیان گـۆڕی ﴿ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْهُمْ ﴾واتـە: سـەرپێچی خوایـان کـردو بـە سـووکی تەماشـای فەرمانەکەیـان کـرد ﴿ قَوْلًا غَيْرَ ٱلَّذِى قِيلَ لَهُمْ ﴾لـە بـری ئەوەی داوای لێخۆشـبوون بکـەن‌و بڵێن: ﴿ حِطَّةٌ ﴾ وتیـان: (حبة في شعيرة) واتە: دەنکێـک لـە جـۆدا، وە ئەگەر بە ئاسـانی بتوانن قسـە بگۆڕن ئـەوە گۆڕینـی کردەوەکانیان لـە پێشـترە، بۆیـە بـە پشـتاو پشـت چوونـە ژوورەوە ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ ﴾ کاتێـک پێچەوانـەی فەرمانەکـەی جـوڵان‌و سـەرپێچیان کـرد ﴿ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾واتە: سـزایەکی سـەخت یـان بـە پەتاو تاعـون یان بـە شـێوەیەکی تر لە سـزا ئاسـمانیەکان، وە بێگومـان خـوا ﷻ بـەو سـزا دانەیان سـتەمی لـێ نەکـردوون، بێگومان ئەو سـزایە ﴿ بِمَا

﴿ كَانُوا۟ يَظْلِمُونَ ﴾ واتــە: (بــە هۆی ئەوە بــوو کە) لــە فەرمانی خــوا ﷻ دەرچوونو سـەرپێچیان دەکـرد، بەبـێ ئـەوەی پێویسـتیەک وایـان لـێ بـکات پەنـای بۆ ببـەن، جگە لـەوە نەبـێ کـە خۆیان حەزیـان لە پیسـیو چەپەڵیو شـەڕو خراپـەکاری بوو کـە ئەوە لە ناخیانـدا چێنرابوو.

(١٦٣): ﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ ﴾:

﴿ وَسْـَٔلْهُمْ ﴾ واتــە: پرسـیار لــە نەوەکانی ئیسـرائیل بکــە ﴿ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ ﴾ واتــە: لــە کە نـاری ئەو دەریایــە کاتێک کە ئــەوان ســەرپێچیان کرد سـزای خوایـان لەسـەر پێویسـت بـوو ﴿ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ ﴾ خـوا ﷻ فەرمانـی پـێ کردبـوون کـە ڕۆژی شـەممە بە گـەورە ڕابگـرنو ڕێـزی لـێ بگـرن، وە ڕاوی تێدا نەکـەن، خـوا ﷻ تاقیکردنـەوە بە شـێوەیەک کاتێک کـە نەهەنگەکانیـان دەهاتن ﴿ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا ﴾ واتـە: کۆمـەڵ کۆمـەڵ لەسـەر دەریـا لێیـان نزیـک دەبوونـەوە ﴿ وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ ﴾ واتـە: ئەگـەر ڕۆژی شـەممە بڕۆشـتایە ﴿ لَا تَأْتِيهِمْ ﴾ واتـە: نەهەنگـەکان نەدەهاتنە سـەر ئاوەکەو نزیــک نەدەبوونەوە بۆیــە ئەوانیش هیچیــان نەدەبینی ﴿ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴾ واتــە: تـاوانو لە سـنوور دەرچوونیـان بوو بە مایــەی ئــەوەی ســزایان لەســەر پێویســت بــێو تووشــی ئەو ناخۆشــیە ببــن، خــۆ ئەگەر لە سـنور دەرنەچووبایـەن ئـەوە خـوا ﷻ لێیـان خۆش دەبـوو، لەبەر ئـەوە ڕووبـەڕووی بەڵاو نارەحەتـی بوونـەوە، لـە ڕاوکردنـدا فێڵیـان کرد، چاڵیـان دەکرد بۆیـانو داویـان دەنایەوە، ئەگـەر ڕۆژی شـەممە بهاتبایـەت، وە بکەوتبانەتـە نـاو چـاڵو داوەکانیانـەوە، لـەو ڕۆژەدا نەیـان دەبـرد، ئەگەر ڕۆژی یەک شـەممە بهاتبایــە، دەیانگرتـن، ئەمە زۆر بوو لــە ناویاندا، وە بــوون بە ســێ بەشــەوە:

(١٦٤): ﴿ وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ ﴾:

زۆربەیان سەرکێشیان کردو یاخی بوونو ئەوەیان ئاشکرا کرد. وە دەستەیەکیان بەراشکاوی بەرهەڵستیان لێ کردو نکوڵیان کرد. وە دەستەیەکی تریان ئەوەندەیان بەس بوو، کە ئەوان نکوڵی لێ بکەنو قەدەغەی بکەن وە پێیانیان وت: ﴿ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ﴾ وەک ئەوە وایە بڵێن ئامۆژگاری سوودی نیە بۆ کەسانێک کە سەرسەختن لەسەر سەرپێچی خوا ﷻ وە گوێ بۆ ئامۆژگاری ناگرن،

وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ
عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾
فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ
وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾
فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَـٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾
وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ مَن يَسُومُهُمْ
سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ
﴿١٦٧﴾ وَقَطَّعْنَـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أُمَمًا ۖ مِّنْهُمُ ٱلصَّـٰلِحُونَ وَمِنْهُمْ
دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَبَلَوْنَـٰهُم بِٱلْحَسَنَـٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمْ
يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ
يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَـٰذَا ٱلْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن
يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُۥ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَـٰقُ ٱلْكِتَـٰبِ
أَن لَّا يَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ وَدَرَسُوا۟ مَا فِيهِ ۗ وَٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ
خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ
بِٱلْكِتَـٰبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُصْلِحِينَ ﴿١٧٠﴾

بەڵکو بەردەوامن لەسەر سەرکێشیو یاخیبوونیان، هەر بۆیە دەبێ خوا ﷻ سزایان بدا یان بە لە ناو بردن یان بە سزایەکی بە ئێش، بەڵام ئامۆژگاری کاران، وتیان: بەڵکو ئامۆژگاریان دەکەینو رێگریان لێ دەکەین، ﴿ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ ﴾ واتە: تا لای پەروەردگار بەهانەو بیانوویان نەبێ ﴿ وَلَعَلَّهُمْ ﴾ واتە: واز لە سەرپێچی کردن بهێنن ئێمە بێ ئومێد نابین لە رێنمایی کردنیان بەڵکو ئامۆژگاریەکەمان سوودی هەبێ بۆیان، وە لۆمەو سەرزەنشتەکانیش کاریگەریان لەسەر دروست بکەن. گەورەترین مەبەست لە نکوڵی کردنی خراپەکاریدا بۆ ئەوەیە بێ بە بەهانەیەک، وە بەجێ هێنانی بەڵگە لەسەر ئەو کەسەی قەدەغەی لێدەکرێ، بەڵکو خوا ﷻ هیدایەتی بداو کار بکات بەوەی کە فەرمانی پێکردوەو قەدەغەی لێکردوە.

(١٦٥): ﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ ﴾

﴿ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ ﴾ واتە: وازیان لەوە هێنا کە پێی ئامۆژگاری کرابوو، وە بەردەوام بوون لەسەر فەرمان شکێنیو دەستدرێژییان ﴿ أَنجَيْنَا ﴾ (رزگارمان کرد) لە سزادان ﴿ ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ ﴾ سوننەتی خوا ﷻ بەو شێوەیەیە لە بەندەکانیدا کە ئەگەر سزا

دابەزێ ئەوانەی فەرمان بە چاکە دەکەنو ڕێگری لە خراپە دەکەن ڕزگاریان دەبێ ﴿وَأَخَذْنَا الَّذِينَ ظَلَمُوا﴾ ئەوانەی کە دەستدرێژیان کرد لە ڕۆژی شەممەدا ﴿بِعَذَابٍ بَئِيسٍ﴾ واتە: (سزای) زۆر توندو بە ئێش ﴿بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ﴾ بەڵام دەستەکەی تر بە دەستەی قەدەغەکارانیان وت: ﴿لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ﴾ ڕاڤەزانانی قورئان بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی ڕزگار بوونی ئەم دەستەو لەناوچوونیان، ئەوەی ئاشکرایە وا دەردەکەوێ کە ئەوانیش ڕزگاریان بووە، چونکە خوا ﷻ لەناوچوونی تایبەت کردوە بە ستەمکاران، باسی ئەوەی نەکردوە کە ئەو دەستەیە ستەمکارن. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سزاو تۆڵە تایبەتە بەوانەی لە ڕۆژی شەممەدا دەست درێژیان کرد، لەبەر ئەوەی فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە فەرزی کیفایەیە ئەگەر کۆمەڵێک پێی هەستێ ئەوە لەسەر کۆمەڵێکی تر دەکەوێ، ئەوەندە بەسە کە کۆمەڵێک نکوڵیان لێبکات، وە لەبەر ئەوەی بە هەمان شێوە ئەوانیش نکوڵیان کرد لەسەری بە وتەی: ﴿لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا﴾ ئاشکرایان کرد کە ئەوان زۆر تووڕەن لێیان بە هۆی ئەو کارەی کە دەیکەن ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوان زۆر ئەو کارو کردەوەیان پێ ناخۆش بووە وە خوا ﷻ لە داهاتویەکی نزیکدا بە توندترین شێوە سزایان دەدات.

(١٦٦-١٦٧): ﴿فَلَمَّا عَتَوْا عَن مَّا نُهُوا عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿١٦٦﴾ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ ۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ ۖ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٦٧﴾﴾:

﴿فَلَمَّا عَتَوْا عَن مَّا نُهُوا عَنْهُ﴾ واتە: یاخی بوونو دڵیان ڕەق بوو نەرم نەبوویەوەو ئامۆژگاریان وەرنەگرت ﴿قُلْنَا لَهُمْ﴾ واتە: وتەیەکی قەزاو قەدەری ﴿كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ﴾ واتە: بە ئیزنی خوا ﷻ ببن بە مەیموون، وە خوا ﷻ بێبەشی کردن لە میهرەبانی خۆی، پاشان ئەوانەی کە لە پاش ئەوان مانەوە خوا ڕیسواو زەلیلی کردن دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ﴾ واتە: ڕایگەیاند بە ئاشکراو دای بە گوێچکەیاندا ﴿لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ﴾ واتە: زەلیلو سەرشۆڕیان بکە ﴿إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ الْعِقَابِ﴾ واتە: بۆ کەسێک کە سەرپێچی بکات تەنانەت سزای بۆ پێش دەخات لە دنیادا ﴿وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: بۆ کەسێک کە داوای تەوبە بکاتو بگەڕێتەوە لە تاوانەکانی خۆش دەبێو کەمو کوڕیو ناتەواویەکانی بۆ دەپۆشێو میهرەبانی خۆی دادەبارێنێ بەسەریداو پەرستشەکانی وەردەگرێو پاداشتی دەداتەوە لەسەریان، بێگومان خوا ﷻ ئەو بەڵێنەی کە داویەتی جێبەجێی دەکات

بەردەوام ئەوان لە زەلیلیو سەرشۆڕیدان لە ژێر دەسەڵاتی بێجگە لە خۆیاندان، هەرگیز نابنە خاوەن ئاڵا، وە لە هیچ جەنگێک ئاڵایان سەر ناکەوێ.

(١٦٨-١٧٠): ﴿ وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الْأَرْضِ أُمَمًا ۖ مِّنْهُمُ الصَّالِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَبَلَوْنَاهُم بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِن يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِّثْلُهُ يَأْخُذُوهُ ۚ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن لَّا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ ۗ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَالَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِالْكِتَابِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ الْمُصْلِحِينَ ﴿١٧٠﴾ ﴾

﴿ وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الْأَرْضِ أُمَمًا ﴾ واتە: بەش بەشمان کردن لەسەر زەویدا پاش ئەوەی یەکگرتوو بوون، ﴿ مِّنْهُمُ الصَّالِحُونَ ﴾ ئەوانەی مافی خوا ﷻو بەندەکانیان بەجێ دەهێنا ﴿ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: لە خوار چاکەوە بوون، یان مام ناوەندێتی لە نێوان شیرکو خواپەرستیدا، یان ستەمیان لە نەفسی خۆیان دەکرد ﴿ وَبَلَوْنَاهُم ﴾ لەسەر دابو نەریتو سوننەتی خۆمان ﴿ بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ﴾ واتە: بە ئاسانیو گرانی ﴿ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ لەسەر ئەو کارە خراپەی کە لە سەری دەڕۆشتن، دەگەڕانەوە بۆ لای ئەوەی دروست کراون لە هیدایەتو ڕێنمایی بەردەوام لە نێوانی چاکەخوازو خراپەکارو مام ناوەندیدا بوون ﴿ فَخَلَفَ مِن بَعْدِهِمْ خَلْفٌ ﴾ تا لە پاشیانەوە جێنشینێکی بێ خێرو ناصاڵحو بەدکارو خراپەکار هاتە جێگایان ﴿ وَرِثُوا ﴾ لە پاشیان ﴿ الْكِتَابَ ﴾ کتێبی تەوراتیان گرتە دەستو بوو بە سەرچاوە بۆیان بە هەواو ئارەزووی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد پارەی زۆریان پێ دەدرا کە فتوای نارەواو ناهەق بدەن تا بەرتیلو ڕەشوە لە ناویاندا بە شێوەیەکی بەرچاو بڵاو بوویەوە ﴿ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا الْأَدْنَىٰ ﴾ دانیان بەوەدا دەنا کە ئەوە تاوانو ستەمە ﴿ سَيُغْفَرُ لَنَا ﴾ ئەمە وتەیەکە لە ڕاستیەوە دوورە، بێگومان لە ڕاستیدا ئەوە داوای لێبووردنو لێخۆشبوون نیە ئەگەر بەو شێوە بووایە پەشێمان دەبوونەوە لەسەر ئەو کردەوەی کە کردوویانە، وە دڵنیا دەبوون کە جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ سەری، بەڵام ئەگەر دیسان کاڵایەکی وەک ئەوەیان دەست کەوتبا وەک هاوشێوەی بەرتیل ئەوە وەریان دەگرت، ئایەتو نیشانەکانی خوایان فرۆشت بە کەمترین پارە، وە ئەوەی خراپو بێ سوودە گۆڕیانەوە بەوەی کە چاکو پڕ لە خێرە ﴿ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِم مِّيثَاقُ الْكِتَابِ أَن لَّا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ ﴾ هیچ کێشەیەکیان نیە ئەگەر قسەی ناهەق بکەنو شوێنی هەواو ئارەزوویان بکەون؟ ﴿ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ ﴾ هیچ

گومانو ئالۆزیەکیان تێدا نەبوو، بەڵکو بە ئەنقەست ئەو کارانەیان ئەنجام دەدا، وە ئەوان لە کارەکانی خۆیاندا دڵنیابوونو کەمترین گومانیان نەبوو، بەڕاستی ئەمە گەورەترین تاوانەو توندترین سەرزەنشتە، کە لە کەم عەقڵیو لاوازی بیرو بۆچوونیانەوەیە، کە فەزڵو چاکەی دونیا دەدەن بەسەر دوارۆژدا بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ﴾ ئەوەی کە خوا ﷻ حەرامی کردوە لەسەریان لەو خواردنەی کە لە ڕێگای بەرتیلەوە دەیخۆن بە هۆی دادوەری کردنیان بە پێچەوانەی ئەو حوکمەی کە خوا ﷻ دایگرتووە، وە هاوشێوەی ئەوانە لە جۆرەها قەدەغەکراوی تر، ﴿ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾ واتە: ئایا عەقڵتان نەبوو هاوسەنگی بکەن لە نێوان ئەوەی کە پێویستە خۆنەویستی بۆ بکرێ، وە ئەوەی خۆنەویستی لەسەر بکرێ، وە کامە لە پێشترە بۆ کۆشش کردنو کامەش بخرێتە پاش ئەو، تایبەتمەندی عەقڵ بریتیە لە تەماشاکردنی سەرەنجام، بەڵام ئەوەی تەماشای نزیکێکی کاتی براوە بکات، ئەوە نیعمەتێکی گەورەی بۆ ماوەیی لە دەست دەدات، کامەیە عەقڵو بیرو بۆچوونی ڕاست؟!

بێگومان عاقڵەکان ئەو کەسانەن کە خوا ﷻ وەسفی کردوون، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ ﴾ واتە: ئەوانەی بە توندی دەست بە تەوراتەوە دەگرن، بە زانستو کردەوە، وە لێیەوە فێری فەرمانو بڕیارەکانی ناوی دەبن کە فێربوونی باشترین زانستە.

وە کار بە فەرمانەکانی دەکەن کە بیلبیلەی چاوەو دڵ خۆش دەکاتو ڕووحو دەروون ئاسوودە دەکات، وە دەبێتە مایەی خۆشبەختی دنیاو دوارۆژ. لە گەورەترین ئەوانەی کە پێویستە دەستی پێوە بگرێ بە جێهێنانی نوێژەکانە، بە ئاشکراو نهێنی، خوا ﷻ تەنها لەبەر گەورەیی پلەو پایەو فەزڵو چاکەی باسی کردوە، لەبەر ئەوە تەرازووی بڕوایە، وە بەجێ هێنانی دەبێتە مایەی ئەنجامدانی سەرجەم پەرستشەکان. کاتێک کە کردەوەکانیان هەمووی چاکە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴾ لە گوفتارو کردارو نیەتەکانیاندا، چاکە خوازن بۆ خۆیانو بێجگە لە خۆیان. ئەم دەقەو ئەوەی لەوە دەچێ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا ﷻ پێغەمبەرانی ناردوە بۆ چاکسازی نەک خراپەکاریی، وە بە قازانج نەک زیان، ئەوان نێردراون بۆ خۆشبەختی هەردوو دنیا، هەر کەسی تا چاکتر بێ نزیکترە لە شوێنکەوتنیانەوە.


وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ١٧١ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ ١٧٢ أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِنْ قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِنْ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ ١٧٣ وَكَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ١٧٤ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانْسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ ١٧٥ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِنْ تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَثْ ذَلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ١٧٦ سَاءَ مَثَلًا الْقَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَأَنْفُسَهُمْ كَانُوا يَظْلِمُونَ ١٧٧ مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِي وَمَنْ يُضْلِلْ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ١٧٨

(١٧١): ﴿ وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾ ﴾:

پاشـان خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ ﴾ کاتێـک بەرگریـان کـرد لـە وەرگرتنی ناوەڕۆکی تـەورات، خوا ﷻ پابەندی کـردن بـە کـردەوەوە، کێوەکەی بەسـەریانەوە بـەرز کـردەوە ﴿ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ ﴾ پێیـان وترا: ﴿ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ ﴾ واتـە: بـە توونـدی دەسـتی پێـوە بگـرن ﴿ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ ﴾ خوێندنـەوەو توێژینـەوە، وە ئامۆژگـاری لێوەربگـرن‌و کاری پێبکـەن ﴿ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾ ئەگـەر ئەوەتـان کـرد (بەڵکـو ببنـە کەسـانێکی خۆپارێـز).

(١٧٢-١٧٤): ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَن تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّن بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٧٤﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِن بَنِي آدَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ ﴾ واتـە: لـە پشـتی نەوەکانـی ئـادەم وەچەو نـەوەی دەرهێنـا، وە لێگـەڕاوە تـا زاوزێ بکـەن، وە وەچە بخەنـەوە جیـل لـە دوای جیـل ﴿ وَ ﴾ وە کاتێـک کـە دەریهێنان لە سـکی دایک‌و پشـتی باوکیـان ﴿ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ﴾ واتـە: پەیمانی لێوەرگرتن بە چەسـپاندنی پەروەردگارێتـی، بـەوەی کـە ئـەو دانپێدانانەی لـە بوونیانـدا بەدیهێناوە، کە دروسـتکراوو پەروەردگـارو خاوەنیانـە ﴿ قَالُوا بَلَى ﴾ بێگومـان دانمـان بـەوەدا نـا، خـوا ﷻ بەندەکانـی بەدیهێنـاوە لەسـەر ئاینـی پـاک‌و بێگـەردو تـەواو، هەمـوو کەسـێک لەسـەر ئـەو پاکیە دروسـتکراوە، بەڵکـو ئـەو پاکـی دەگـۆڕێ، بـەوەی کە بەسـەریدا دێـت لە بیرو بـاوەڕی

خـراپو پـووچ، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴾واتـە: تاقـی کردنەوەتـان تەنهـا بـۆ ئەوەیـە، تـا دانی پێـدا بنێن کە پێشـتر دانتـان پێـدا نابـوو، بـەوەی کـە خـوا ﷻ پەروەردگارتانـە، لەبەر ئـەوە نەوەک لـە ڕۆژی دوایـیدا نکوڵـی لـێ بکـەن کە پێشـتر دانتـان پێـدا نەنـاوە، وە وا گومان ببەن کـە خوا ﷻ بەڵگـەی خـۆی لەسـەرتان پێویسـت نەکـردوە، وە ئێـوە ئاگاتـان لێی نەبـووە، بەڵکـو ئێوە دەربـارەی بێئاگابوونو نەتانزانـی. ئەمڕۆ بیانووتان بڕاو کۆتایی پێهـات، وە بەڵگەی خوا ﷻ لەسەرتان پێویست بوو.

یـان بـە شـێوەیەکی تـر بیانـوو دەهێننـەوەو دەڵێـن: ﴿ إِنَّمَآ أَشۡرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةٗ مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ ﴾شـوێن پێـی ئەوانمـان هەڵگرتو دوای شـتە بێماناکانی ئـەوان کەوتین ﴿ أَفَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴾بێگومـان خـوا ﷻ لە دروسـتکردنتاندا ئەوەی پێنیشـانداوون کـە بـاوکو باپیرانتـان لەسـەر هەڵـەو پووچـن، هـەقو ڕاسـتی ئەوەیـە کـە پێغەمبـەران هێناویانـە، ئەمـە بەرپەرچـی ئـەوە دەداتەوە کە بـاوکو باپیرانتان لەسـەری دەرۆشـتنو بە گەورەیـان دەزانی.

بەڵـی هەندێ جار وتـەی باوباپیرە گومڕاکانیـانو مەزهەبە خراپو بێ بنەمایـان، ڕووبەڕوی مـرۆڤ دەبێتـەوە، وا دەزانـێ کـە هەقـە، ئـەوە تەنهـا بە هـۆی ئەوەیـە کە پشـتی کردوە لـە بەڵگەکانـی خوا ﷻ ونیشـانەو ئایەتـە ڕوونەکانی، پشـت کردنـی لـەوەو ڕووتێکردنی لـەوەی کـە خراپـەکاران دەیڵێـن دەیگەیەنێت بـەو حاڵەتە کە فـەزڵو چاکەی پـووچو بێ بنەمـا بدات بەسـەر هـەقو ڕاسـتیەوە، ئەمە بۆچوونـی تەواوو پەسـندە لە شـیکردنەوەی ئەم دەقانەدا.

وتـراوە: بـە ڕاسـتی ئـەم ڕۆژە، ڕۆژێکە کـە خـوا ﷻ بەڵێنـی وەرگرتوە لەسـەر نەوەکانی ئـادەم کاتێـک کـە لـە پشـتی دەری هێنـانو کردنی بە شـایەت لەسـەر خۆیـان، ئەوانیش شـایەتیان دا، ئـەوە دەکاتـە بەڵگە بە سـەریانەوە کە لەو کاتەدا دانیان پێدا ناوە لەسـەر سـتەم کردنیـان لـە بیروایداو یاخـی بوونیان لە دنیـاو دوارۆژدا، بـەڵام ئەم دەقە بەڵگە نیە لەسـەر ئەمـە، وە بـەو بۆنەیشـەوە دانەبەزیـوەو حیکمەتـی خوا ﷻ دوورە لـەوە، بێگومـان واقعیش شـایەتی بـۆ ئەمـە ئـەدات. بێگومـان ئـەم بەڵێـنو پەیمانە کـە باسـی دەکـەن، کاتێک کە خـوا ﷻ نەوەکانـی ئادەمـی لـە پشـتی دەرهێنا، کاتـێ کە لـە جیهانـدا وەک گەردیلە بوو، کـەس باسـی نەکـردوە، وە بـە بای خەیاڵـی کەسـدا نەدەهات، خـوا ﷻ چۆن دەیـکات بە

بەڵگــە کاتێــک کە هەواڵیــان دەربارەی نەزانیــوە، وە نە بینــراوەو نە شــوێنەواری هەبووە؟!!
وە لەبــەر ئــەوەی کە ئــەم کارە ڕوونو ئاشــکرایە، خوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأَيَـٰتِ ﴾ واتــە: ڕوونی دەکەینەوەو ئاشــکرای دەکەیــن ﴿ وَلَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ بەوەی کە خــوا ﷻ لــە بــوونو فیترەتیانــدا دایناوە، وە بــەوەی کە خــوا ﷻ بەڵێنــی پێداوە لەســەری، دوور دەکەونــەوە لــە خراپەکاریی.

(١٧٥-١٧٦): ﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَـٰهُ ءَايَـٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَـٰهُ بِهَا وَلَـٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا ۚ فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ ﴾:

خــوا ﷻ بــە پێغەمبەرەکــەی دەفەرمــوێ: ﴿ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَـٰهُ ءَايَـٰتِنَا ﴾ واتــە: زانســتی کتێبمــان فێــر کــرد، تــا بــوو بــە زانایەکــی گــەورە ﴿ فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ ﴾ واتــە: بــە تەواوەتی زانســتی ڕاســتەقینەی بە نیشــانەکانی خــوا ﷻی لە خۆی دارنــی، چونکــە زانســت بــە پەیامــی خــوا ﷻ خاوەنەکــەی دەکات بە کەســێکی ڕەوشــت بــەرزو خــاوەن کــردەوە، وە بــەرزی دەکاتەوە بــۆ بەرزتریــن پلەو پایــە، ئەم پیــاوە کتێبی خــوای خســتە پشــتیەوە، وە وازی لەو ڕەوشــتە هێنا کە کتێــب فەرمانی پێکردبــوو، لە خۆی دارنــی وەک چــۆن جــلو بــەرگ لە خــۆی دادەرنــێ. کاتێک کە لــە خۆی دارنی شــەیتان شــوێنی کــەوت، واتــە: زاڵ بوو بەســەریدا، کاتێ کــە دەرچوو لە قــەڵای بــەرزو بەهێز، وە دابــەزی بــۆ نزمتریــن پلــە لە خــواری خــوارەوە، بە چاکــی هانیــدا بۆ ســەرپێچی ﴿ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴾ پــاش ئــەوەی لــە خوارترین بــوو، چونکە خــوا ﷻ سەرشــۆڕی کردو، کــردی بە کوێلــەی نەفسو ئارەزووی خــۆی، بۆیە دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَـٰهُ بِهَا ﴾ (ئەگــەر ویســتبامان بەرزمان دەکــردەوە بە هــۆی زانیاریەکــەی) ســەرکەوتووی بکەین بۆ کارو کــردەوەی چــاک، پلــەو پایەی بــەرز ببێتەوە لــە دنیــاو دواڕۆژدا، وەک قەڵغانێ خۆی لــە دوژمنەکانــی پێــی بپاراســتایە، ﴿ وَلَـٰكِنَّهُۥٓ ﴾ کردەوەیــەک ببێتــە مایەی سەرشــۆڕی، خــۆی بنوســێنێ بــە زەویــەوە، واتــە: شــوێنی هــەواو ئــارەزووی خــراپو ئامانجــی دونیــا بکــەوێ، ﴿ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ﴾ وە واز لــە گوێڕایەڵــی پەروەردگــاری بهێنــێ ﴿ فَمَثَلُهُۥ ﴾ لــە توونــدی دەســتگرتنی بە دنیــاوە، وە دابڕانی دڵی لــە دواڕۆژ ﴿ كَمَثَلِ ٱلْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ﴾ واتــە: بــەردەوام مــۆڕە دەکات لــە هەمــوو کاتێکــدا،

ئەمیش بەردەوام سووره لەسەر دنیاو دڵی بۆی یەکلا بووەتەوە، ئاواتەکانی بە هیچ تەواو نابێ ﴿ذَٰلِكَ مَثَلُ ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا﴾ پاش ئەوەی خوا ﷻ نیشانی دان، بەڵام ئەوان ملکەچ نەبوون، بەڵکو بە درۆیان خستەوەو ڕەتیان کردەوە، بە هۆی ئەوەی شوێنی هەواو ئارەزوویان کەوتبوون بە بێ ڕێنمایی، ﴿فَٱقْصُصِ ٱلْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ لە هێنانەوەی نموونە، وە لە پەندو ئامۆژگاریو نیشانەکان، ئەگەر بیر بکەنەوە دەزانن، وە ئەگەر بزانن کاری پێدەکەن.

(١٧٧): ﴿سَآءَ مَثَلًا ٱلْقَوْمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُوا۟ يَظْلِمُونَ ١٧٧﴾

واتە: چەند خراپو ناشرینە نموونەی ئەوانەی نیشانەکانی ئێمە بە درۆ دەخەنەوەو ستەم لە نەفسو دەروونی خۆیان دەکەن بە جۆرەها سەرپێچیو تاوان، بێگومان نموونەی ئەوانە نموونەی خراپە، ئەوەی کە نیشانەو ئایاتەکانی خوای ﷻ پێدراوە، دەگونجی مەبەست پێ تەنها کەسێک بێ، کە خوا ﷻ باسی کردبێ، خوا ﷻ چیرۆکەکەی باس کردبێ تا مرۆڤەکان ئاگادارو وشیار ببنەوە، وە دەکرێت هەموو ئەوانە بگرێتەوە کە خوا ﷻ نیشانەیەک لە نیشانەکانی پێبەخشی بێ، پاشان ئەو لە خۆی دارنی بێت.

ئەم دەقانە هاندەرن بۆ کارکردن بە زانست، بێگومان خاوەنەکەی بەرز دەکاتەوەو پارێزراو دەبێ لە شەیتان، وە ترساندنیشی تێدایە لەوەی کە کردەوەی پێ نەکات، دادەبەزێ بۆ خواری خوارەوەو شەیتان زاڵ دەبێ بەسەریدا، وە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شوێنکەوتنی هەواو ئارەزوو ڕووتێکردنی هۆکارێکە بۆ سەرشۆڕیو زەلیلی.

(١٧٨): ﴿مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِى ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ ١٧٨﴾

پاشان خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو تاکو تەنهایە هەر ئەو هیدایەتدەرە، دەفەرموێ: ﴿مَن يَهْدِ ٱللَّهُ﴾ بەو شێوەی کە سەرکەوتووی بکات بۆ خێرو چاکەو بیپارێزێ لە خراپەکاری وە فێری ئەوەی بکات کە پێشتر نەیزانیوە ﴿فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِى﴾ واتە: بە ڕاستی هەر ئەو ڕێنمایی کراوە، چونکە ئەوە شوێنەواری هیدایەتی خوا ﷻ ﴿وَمَن يُضْلِلْ﴾ گومڕاو سەرشۆڕی بکاو سەرکەوتووی نەکات بۆ خێرو چاکە ﴿فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَـٰسِرُونَ﴾ بۆ خۆتانو خێزانیان تا ڕۆژی دوایی بە ڕاستی ئەوە زیان لێکەوتوویەکی ڕوونو ئاشکرایە.


وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ
بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا
أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ۝ وَلِلَّهِ
الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ
سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ۝ وَمِمَّنْ خَلَقْنَا أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ
وَبِهِ يَعْدِلُونَ ۝ وَالَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم
مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ۝ وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ۝ أَوَلَمْ
يَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ۝
أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ
مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ
بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ۝ مَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُ وَيَذَرُهُمْ
فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ۝ يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا
قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَا إِلَّا هُوَ ثَقُلَتْ فِي
السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً يَسْأَلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا
قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ اللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ۝

**(١٧٩):** ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾:

خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە زۆربەی ئەوانەی کە گومڕابوونو شوێنی ئیبلیسی نەفرین لێکراو کەوتن دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا ﴾ واتە: بەدیمان هێناوەو پێشانمان داوە، ﴿ لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ﴾ واتە: ئاژەڵ باشتر بوو لە ئەوان ﴿ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا ﴾ واتە: تێگەیشتنو هەقی پێ ناگات وە زانستیشی پێ ناگات تەنها بۆ ئەوە نەبێ بەڵگەی لەسەر پێویست بێ ﴿ وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا ﴾ واتە: ئەوەی کە سوودی هەبێ بۆیان، بەڵکو سوودو قازانجی بینینیان لە دەست داوە ﴿ وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا ﴾ بیستنێک کە بگاتە دڵەکانیان ﴿ أُولَٰئِكَ ﴾ ئەوانەی کە بەم شێوە ناشرینە وەسف کراون ﴿ كَالْأَنْعَامِ ﴾ واتە: ئەو ئاژەڵانەی کە عەقڵیان نیە، ئەوانە گرنگیان دا بەوەی کە فەزڵو چاکەی دنیایان دا بەسەر دواڕۆژدا، بۆیە تایبەتمەندی عەقڵیان لێداڕێنرا ﴿ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ﴾ واتە: (بەڵکو ئەوانە گومڕاترن ) لە ئاژەڵەکان، چونکە ئاژەڵەکان بەکارهێنراون بۆ ئەوەی کە دروست کراون، وە ئەوەندە عەقڵیان هەیە زیان لە خۆیان دوور بخەنەوە، بۆیە حاڵیان لەوان باشترە ﴿ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی کە بێئاگا بوون لە شتە بە سوودەکان، بێئاگا بوون لە بڕواهێنان بە خوا ﷻو گوێڕایەڵی کردنو یادکردنەوەی.

دڵو گوێو چاویان بۆ دروست کراوە تا ببێتە مایەی هاوکاریو یارمەتیدانیان بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوا ﷻو مافەکانی، بەڵام ئەوان بە پێچەوانەی ئەو مەبەستو ئامانجە جوڵانەوە. بێگومان ئەوانە شایستەی ئەوەن کە خوا ﷻ دۆزەخیان پێ خۆش بکاو بۆ ئەوە دروستیان بکات، چونکە بە کردەوەی ئەهلی دۆزەخ کاریان دەکرد، بەڵام ئەو کەسەی ئەندامەکانی بۆ

خواپەرستی بەکاربهێنێ، وە دڵی پڕ بکات بە بڕواهێنان بە خوا ﷻو خۆشەویستی خواو لێی بێئاگا نەبێت، بێگومان ئەوانە ئەهلی بەهەشتن، وە بە کردەوەی ئەهلی بەهەشت کار دەکەن.

(١٨٠): ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٨٠﴾

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ﴾ ئەمە ڕوونکردنەوەیەکە بۆ گەورەییو شکۆمەندی خوا ﷻو بەرفراوانی وەسفەکانی کە بێگومان خاوەنی ناوە جوانەکانە، واتە: خاوەنی هەموو ناوێکی جوانو چاکە، بە شێوەیەک کە هەموو ناوێک دیلالەت بکاتە سەر سیفەتێکی تەواوو گەورە بەو شێوە دەبێتە ناوێکی چاکو جوان، ئەگەر دیلالەت بکات لەسەر جگە لە سیفەتێک بەڵکو دیلالەت بکاتە سەر ناوێکی تەواو، ئەوە پێی ناوترێ چاکو جوان، وە بەهەمان شێوە ئەگەر دیلالەت بکاتە سەر سیفەتێک، وە سیفەتی تەواو لەخۆنەگرێت، بەڵکو: یان سیفاتی ناتەواو یان سیفاتێ دابەش بووبێ بۆ لای چاکەو خراپە، ئەوەش پێی ناوترێ چاکو جوان، هەموو ناوێک لە ناوەکانی خوای گەورە دیلالەت دەکاتە سەر هەموو ئەو سیفەتانەی کە لێی وەرگیراوە، هەموو ماناکانی لە خۆدەگرێ.

بۆ وێنە: (العلیم) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا ﷻ خاوەن زانستێکە دەوری هەموو شتەکانی داوە، تەنانەت بە قەد گەردیلەیەک لە ئەرزو ئاسمانەکان لە دەرەوەی زانستی ئەو نیە. وە (الرحیم)بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خاوەن میهرەبانیەکی گەورەیە دەوری هەموو میهرەبانیەکانی داوە، هەروەها (القدیر) بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خاوەن دەسەڵاتی ڕەهایە هیچ شتێک لێی گیر نابێت، وە هاوشێوەی ئەوانە، وە لە تەواوی بوونی بە (حسنی) چاکو جوان تەنها دەبێ بەوە داوای لێبکرێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَٱدۡعُوهُ بِهَا﴾ ئەمە گشتگیرە بۆ پاڕانەوەی خواپەرستیو پاڕانەوەی داوا کردن، بۆ هەر شتێک لە جێگای خۆیدا داوا دەکات، بۆ نموونە دەپاڕێتەوەو دەڵێ: خودایە لێم خۆشبەو ڕەحمم پێبکە بەڕاستی تۆ (غفور رحیم)ی، واتە: لێخۆشبوو بە میهرەبانی، وە تەوبەم لێ وەربگرە بە ڕاستی تۆ (تواب)یت واتە: زۆر تەوبە وەردەگریت، وە ڕزقو ڕۆزیم بدە ئەی خاوەن ڕزقو ڕۆزی ( یا رزاق)، وە نەرمو نیانبە لەگەڵم بێگومان تۆ (لطیف)ی واتە: زۆر بەسۆزو نەرمو نیانی، وە هاوشێوەی ئەمانە ﴿وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ واتە: سزاو تۆڵەیەکی بە ئێش بۆ ئەو کەسانەی کە ناوەکانی خوا ﷻ دەگۆڕنو لادەدەن، وە (إلحاد) لادان لەوەی کە بۆی دانراوە، یان ناوێکی بۆدابنرێ کە شایستەی نەبێ وەک بتپەرستەکان چۆن ناویان بۆ بتەکانیان دادەنا، یان نەرێنی

كردنی ماناو گۆڕینی، وە مانایەكیان بۆ دادەنا لە دەرەوەی ویستی خوا ﷻ و پێغەمبەرەكەی ﷺ یان دەیانچوواند بە شتێكی ترەوە. پێویستە خۆی بپارێزێ لە گۆڕانو لادان لە ناوە جوانەكاندا، بەراستی لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ {إِنَّ لله تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إِسْماً مِائَةً إِلاَّ وَاحِداً، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، إِنَّهُ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ}( أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٢٥٨٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩٨٦)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

واتە: بێگومان خوای بەرز نەوەدو نۆ (٩٩) ناوی هەن، سەد جگە لە یەكێك، هەر كەسێك بیانژمێرێ دەچێتە بەهەشت، بێگومان ئەو تاكەو تاكی خۆش دەوێ.

(١٨١): ﴿ وَمِمَّنْ خَلَقْنَآ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ١٨١ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمِمَّنْ خَلَقْنَآ ﴾ واتە: لە كۆی ئەوەی كە دروستمان كردوە ئوممەتو گەلێكی چاك كە لە ناخی خۆیاندا تەواونو تەواوكاری لە خەڵكانی تردا دەكەن، ڕێنمایی خۆیانو جگە لە خۆیان دەكەن بە هەقو، هەق دەناسنو كاری پێدەكەن، وە خەڵكیش فێر دەكەنو بانگیان دەكەن بۆ كار پێكردنی ﴿ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴾ لە نێوانی خەڵكیدا لە دادوەری كردنیاندا، ئەگەر دادوەری بكەن لەماڵو خوێنو مافەكانو هاوشێوەی ئەوانە، بە ڕاستی ئەوانە پێشەوای ڕێنمایی كارانن، وە سەرداری سەر ڕێگای ڕاستن، ئا ئەوانەن كە خوا ﷻ نیعمەتی خۆی ڕشتووە بەسەریاندا، بە بڕواهێنانو كردەوەی چاكو ئامۆژگاری بە هەقو ڕاستیو ئامۆژگاری بە ئارامگرتن، بێگومان ئەوانە لەو ڕاستگۆیانەن كە پلەیان لە دوای پلەی پێغەمبەرایەتی دێت، كە ئەوانیش لەناو یەكتردا هەر كەسەو بە پێی حاڵی خۆی پلەو پایەی جیاوازە، پاكی بۆ ئەو خوایەی كە هەر كەسێكی بوێ ڕەحمەتو میهرەبانی خۆی دادەبارێنێ بەسەریدا.

(١٨٢-١٨٣): ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ١٨٢ وَأُمْلِي لَهُمْ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ١٨٣ ﴾:

دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾ واتە: ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتو نیشانەكانی ئێمە نیەو بە درۆیان دەخەنەوە كە بەڵگەن لەسەر ڕاستیو دروستی ئەوەی كە موحەممەد هێناویەتی لە هیدایەت، ڕەتیان كردۆتەوەو وەریان نەگرتوە ﴿ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ بە شێوەیەك كە ڕزقو ڕۆزیان لێ دانابڕێ ﴿ وَأُمْلِي لَهُمْ ﴾ واتە: مۆڵەتیان پێدەدا، بۆ خۆیان گوناه بكەن، تا وا گومان دەبەن خوا ﷻ تۆڵەیان لێناسەنێت، ئەوانیش چەواشە دەبنو زیاتر ڕۆدەچن لە تاوانو خراپەو سەرپێچی، ئیتر لە ناكاودا كتوپڕ خوا ﷻ خەشمو قینیان لێ

هەڵدەگرێتو سزایان بە چەند قات بۆ زیاد دەکات، بە شێوەیەک کە هەر هەستیشی پێناکەن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ كَيْدِي مَتِينٌ ﴾ واتە: زۆر بەهێزو وردە.

(١٨٤-١٨٦): ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾ أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ مَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُ وَيَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾

دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِهِم ﴾موحەممەد ﷺ ﴿ مِّن جِنَّةٍ ﴾ واتە: ئایا فێر نەبوونو بیریان نەکردوەتەوە، وە تەماشای حاڵی هاوڕێکەیان ناکەن، کە باش دەیناسنو هیچ شتێکی ئەو لە لایان ئاڵۆز نیە، ئایا ئەوە شێتە؟ دەی با تەماشای ڕەوشتو ڕێنمایی‌و سیفەتەکانی بکەن، وە با تەماشای ئەو بەرنامە بکەن کە بانگەوازی بۆ دەکات، کە تەنها سیفەتی تەواوی تێدا بەدی دەکەن، وە با تەماشای ڕەوشتی بکەن لە بەرزترینو تەواوترین ڕەوشتەکانە، وە با تەماشای عەقڵی بکەن بزانن لە هەموویان داناتر نیە، بێگومان ئەو تەنها بانگەواز بۆ هەموو چاکەیەک دەکاتو ڕێگری لە هەموو خراپەیەک دەکات، ئەی خاوەن عەقڵەکان لەمەدا شێتی بەدی دەکرێ؟! یان ئەو پێشەوای گەورەو ئامۆژگاری کەرێکی ئاشکراو ڕوونە، وە میهرەبانو بە سۆزە؟! بۆیە دەفەرموێ: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾ واتە: بانگی خەڵک دەکات بۆ ئەوەی ڕزگاریان بکات لە سزاو پاداشتیان دەست بکەوێت ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ ئەوان ئەگەر تەماشای بکەن، دەبینن بەڵگەی ڕوونو ئاشکرای تێدایە بۆ یەکتاپەرستی، وە بە هەمان شێوە لەسەر سیفەتی تەواو، ﴿ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ ﴾ بێگومان هەموو ئەوانەی کە لە جیهاندان بەڵگەیەکی گەورەن لەسەر زانستی خوا ﷻو هێزو دانایی‌و چاکەو بەرفراوانی دەسەڵاتی خوا ﷻ، وە جگە لەوانەش سیفەتە گەورەکان کە بەڵگەن لە سەر تاکو تەنهایی خوا لە دروستکردنو ڕێکخستنی، کەوا پێویست دەکات بە تاکو تەنها بپەرستریو سوپاسگوزاری بکرێت.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنْ عَسَىٰ أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ﴾ واتە: با تەماشای حاڵیان بکەنو تەماشای دەروونیان بکەن، پێش ئەوەی ئەجەلیان نزیک ببێتەوەو لە ناکاودا بمرن، لە کاتێکدا ئەوان لە بێئاگاییەکی قووڵدا بن، ئەو کات نەتوانن بە هیچ شێوەیەک خۆیان ڕزگار بکەن ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ ﴾ واتە: ئەگەر بڕوا بەم کتێبە پیرۆزە نەهێنن، جا بە چ وتەیەک بڕوا دەهێنن؟!! ئایا بە کتێبی درۆزنو گومڕاکان بڕوا دەهێنن؟ یان بە درۆی ئەو دەجالانەی

کە درۆ هەڵدەبەستن؟ بەڵام ئەوەی کە گومڕایە هیچ شتێک نابێتە مایەی هیدایەتی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ مَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥۚ وَيَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴾ واتە: لە گومڕایی‌و دوو دڵیدا بخولێنەوەو لێی دەرنەچن، وە هیدایەت وەرنەگرن بۆ ڕێی هەق.

(١٨٧-١٨٨): ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَاۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّيۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَۚ ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗۗ يَسۡـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنۡهَاۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ١٨٧ قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ١٨٨ ﴾

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ ﴾ واتە: درۆزن‌و یاخیبووەکان (پرسیارت لێدەکەن) ﴿ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَا ﴾ واتە: (دەربارەی دونیا تێکچوون) کەی کاتی دێ، وە کەی ڕوودەدات؟ ﴿ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي ﴾ واتە: ئەوە تایبەتە بە خوا ﷻ تەنها ئەو دەیزانێ ﴿ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَ ﴾ واتە: کاتەکەی دەرناکەوێ‌و کەس نایزانێ جگە لە خوا نەبێ ﴿ ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتە: ئەو زانستە شاراوەیە لە لای هەموو ئەوانەی کە لە ئاسمان‌و زەویدا دەژین، ئەوان دەربارەی ڕۆژی قیامەت دەترسن، ﴿ لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗ ﴾ واتە: لە ناکاو لە کاتێکدا کە ئاگایان لە خۆیان نیە، وە خۆیان بۆی ئامادە نەکردوە ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنۡهَا ﴾ واتە: سوورن لەسەر پرسیار کردن لە تۆ دەربارەی ڕۆژی دوایی، وەک ئەوەی کە تۆ شتێکی لێ بزانی، بەڵام نازانن کە تۆ -بە تەواوی زانستت لە پەروەردگارتەوە، وە ئەو پرسیارەی کە هیچ کەڵکێکی نیە- بێ باکن لەو پرسیارانەی کە دەیکەن‌و سوورنین لەسەری دەی بۆ پەیرەویت ناکەن، وە واز لەو پرسیارە بەتاڵە ناهێنن کە هیچ بەرژەوەندیەکی ئەوانی تێدانیە، چونکە بێگومان هیچ پێغەمبەرێک‌و فریشتەیەکی نزیک زانیاری دەربارەی نیە، کە بریتیە لەو کارو فەرمانانەی کە خوا ﷻ لە خەڵکی پەنهان کردوە بە هۆی حیکمەتی تەواوی‌و زانستی بەرفراوانی، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ واتە: بەو شێوەیە سوور بوون لەسەر ئەو پرسیارانەی کە پێویست ناکات سووربن لەسەری، بە تایبەت ئەوانەی کە وازیان لە پرسیاری زۆر گرنگ هێنا، وە وازیان لەوە هێنا کە پێویستە بیزانن، پاشان ڕوویان کردە ئەو شتەی کە هیچ کەس نایزانێ‌و پەی پێ نابات، لە کاتێکدا ئەوان بەرپرسیار نەبوون لەوەی کە بیزانن.

قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ
أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ
إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٨٨﴾ ۞ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم
مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَاۖ فَلَمَّا
تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفٗا فَمَرَّتۡ بِهِۦۖ فَلَمَّآ أَثۡقَلَت دَّعَوَا
ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَٰلِحٗا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾
فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ فَتَعَٰلَى
ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ
﴿١٩١﴾ وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ نَصۡرٗا وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾
وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمۡۚ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡ أَدَعَوۡتُمُوهُمۡ
أَمۡ أَنتُمۡ صَٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ
أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ
صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ
بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ
بِهَاۗ قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾

﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا﴾ واتە: من هەژارو فەرمان بەسەردا کراوم، خێرو چاکەم تەنها لە لایەن خواوە ﷻ بۆ دێت، وە تەنها ئەو دەتوانێ شەڕو خراپەم لێ بە دوور بخات، من هیچ زانستێکم نیە تەنها ئەوە نەبێ کە خوا ﷻ فێری کردووم ﴿وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُ﴾ واتە: ئەو هۆکارانەم بە دەست دەهێنا کە دەمزانی سوودو بەرژەوەندی تێدایە بۆم، وە خۆم دەپاراست لە هەموو ئەوانەی کە دەبنە مایەی زیانو ناخۆشی، بە زانستم بەو شتانەی پێش ڕوودانیان، وە بە سەرەنجامەکانیان، بەڵام بە هۆی نەزانینمەوە تووشی ناخۆشیو نارەحەتی دەبم، وە هەندێ جار بەرژەوەندی دنیاییم لە دەست دەچی، ئەمەش باشترین بەڵگەیە کە من زانستم نیە دەربارەی غەیبو پەنهان ﴿إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ﴾ ترسێنەری سزاکانی دنیاو دواڕۆژم، وە ئەو کردەوانە ڕوون دەکەمەوە کە دەبنە مایەی ئەوەو ئاگادارتان دەکەمەوە ﴿وَبَشِيرٞ﴾ بە پاداشتی ئێستاو داهاتوو، بە ڕوون کردنەوەی ئەو کردەوانەی کە دەیگەیەنێ بەو ئامانجەو هانی دەدا، بەڵام هەموو کەسێک شایستەی ئەم مژدەیە نیە، تەنها ئەوانە سوودی لێوەردەگرن کە بڕوادارن، ئەم دەقە پیرۆزانە نەفامی ئەو کەسانە ڕوون دەکەنەوە کە مەبەستیان پێغەمبەری خوایەو هاواری پێ دەکات بۆ بەدەستهێنانی سوودێک، یان دوورخستنەوەی زیانێک، بێگومان ئەو لەو کاروبارەدا هیچی بە دەست نیە، وە سوود وەرناگرێ ئەگەر خوا ﷻ سوودی پێنەگەیەنێ، وە کەس زیانی لێ بە دوور نابێ کە خوا ﷻ زیانی لێ دوور نەخاتەوە، وە هیچ زانستێکی نیە جگە لەوەی کە خوا فێری کردوە، تەنها لەو ڕووەوە سوود وەردەگرێ

کـە خـوا ﷻ لـە ڕێـی پەیامبەرەکەیـەوە دایبەزانـدوە، لـە مـژدەدانو ترسـاندن، وە کاریـان پـێ بـکات، ئەمـە سـوودی پێغەمبـەرە ﷺ، کـە دەبێتـە مایـەی خۆشـبەختی بـۆ هەمـوو ئەوانـەی کـە شـوێنی کەوتـوون، بـەوەی کـە هانـی بەندەکانـی داوە لەسـەر هەمـوو خێـرو چاکەیـەک، وە ئاگـاداری کردوونەتـەوە لـە هەمـوو خراپەیـەک، وە بـە جوانتریـنو چاکتریـن شـێوە ڕوونـی کردوەتـەوە.

(١٨٩-١٩٣): ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا ۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِۦ ۖ فَلَمَّآ أَثْقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا صَٰلِحًا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ ۚ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾ ﴾:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم ﴾ واتـە: ئـەی ئـەو پیـاوو ئافرەتانـەی کـە لەسـەر زەویـدا بـڵاو بوونەتـەوە بـە هەمووتانـەوە ﴿ مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ﴾ ئەویـش ئادەمـە باوکـی مـرۆڤ ﴿ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا ﴾ واتـە: لـە ئـادەم ژنەکـەی دروسـتکردوە کـە نـاوی حەووایـە بـۆ ئـەوەی لـەلای بحەسـێتەوەو ئـارام بگـرێ، چونکـە ئەگـەر لـە خـۆی بـێ پێکـەوە دەگونجێـن، بـە شـێوەیەک یەکێکیـان بـەوی تریـان دەحەسـێتەوە، هەریـەک لـەو دوانـە ملکەچـی ئـەوی تـر دەبـێ بـە جڵـەوی حـەزو ئـارەزووی ﴿ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا ﴾ واتـە: کاتـێ پیاوەکـە لەگـەڵ هاوسـەرەکەی جـووت بـوو، خـوا ﷻ ویسـتی وابـوو لـەو ئـارەزووەو ئـەو جـووت بوونـە، وەچـەو نـەوە دروسـت بـکات ﴿ حَمَلَتْ حَمْلًا خَفِيفًا ﴾ ئەویـش لەسـەرەتای سـک پڕبـوون کـە مێینـە هەسـتی پێنـاکاتو قـورس نیـە بەسـەریەوە ﴿ فَلَمَّآ ﴾ بـەردەوام بێـت بـەو سـکپڕیەوە ﴿ أَثْقَلَت ﴾ کاتـێ کـە گـەورەو قـورس دەبـێ، ئەوکاتـە سـوزیان بـۆ کۆرپەلەکـە دەجوڵـێ، بـە دەرچوونـی بـە شـێوەیەکی سـاغو تـەواو دوور لـە هەمـوو ناتەواویـەک، ئنجـا دەپاڕێنـەوەو داوا دەکـەن لـە ﴿ ٱللَّهَ ﴾ خـوا ﴿ رَبَّهُمَا لَئِنْ ءَاتَيْتَنَا ﴾ (پەروەردگارمـان ئەگـەر پێمـان ببەخشـی) منداڵێکـی ﴿ صَٰلِحًا ﴾ چـاک، واتـە: تـەواو بـە بـێ کـەمو کـوڕی ﴿ لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾، ئـەوە لـە سوپاسـکراوان دەبیـن، ﴿ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحًا ﴾ بـە پێـی ئـەوەی کـە داوایـان کـرد، بـەو هۆیـەوە نیعمـەت تـەواو بـوو بەسـەریانەوە ﴿ جَعَلَا

لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَا ﴾ واتە: چەند هاوبەشێکیان بۆ خوا ﷻ دانا لە پێدانی ئەو منداڵەدا، کە خوا ﷻ بە تاک و تەنهایی بەدیهێناوە، وە دڵی باوک و دایکی پێخۆش کردوە، بەڵام ئەوان دەیکەن بە بەندەی غەیری خوا ﷻ، یان ناوی دەنێن بە بەندەی جگە لە خوا ﷻ وەک (عبد الحارث) وە(عبد العزى) وە (عبد الكعبة)، وە هاوشێوەی ئەو ناوانە، یان لە پەرستندا هاوەڵی بۆ دادەنێن، پاش ئەوەی کە خوا ﷻ منەتی کردوە بەسەریاندا بەو نیعمەتانەی کە لە ئەژمار نایەن، ئەمە گواستنەوەیەکە لە جۆرەوە بۆ رەگەز، بێگومان سەرەتای وتەکان دەربارەی ئادەم و حەوا بوو، پاشان وتەکانی گواستەوە بۆ رەگەز، گومانی تێدا نیە ئەمە لە نەوەکانیدا بوونی زۆرە، بۆیە خوا ﷻ بریاری بۆ داون لەسەر بەتاڵ بوونەوەی هاوەڵدانان، وە ئەوان لەوەدا ستەمکارن بە ئەوپەری ستەم کردن، جا یەکسانە ئەگەر هاوڵدانان بە زمان بێ یان بە کردەوە، بە ڕاستی خوا دروستکەریانە لە یەک نەفس دروستی کردوون، ئەو خوایەی کە لە ئادەم حەووای دروست کرد، وە لە ناوێکی تردا زۆری کردن، پاشان سۆز و بەزەیی لە نێوانیاندا داناوە کە هەندێکیان بەوی تر ئارام دەگرێ و هۆگری دەبێ و چێژی لێوەردەگرێ، پاشان هیدایەتی داون لەسەرەنجامی ئەو خۆشی و چێژ وەرگرتنە کە منداڵ و وەچە بێتە دنیاوە.

پاشان منداڵی لە سکی دایکیدا داناوە، کاتێکی دیاریکراو، دەروونیان تەماشا دەکات و دەپاڕێنەوە کە منداڵێکی تەواو بێ کەم و کورتییان پێببەخشێت، خوا ﷻ نیعمەتی خۆی تەواو دەکات بەسەریانداو داواکاریەکەیان جێبەجێدەکات. ئایا شایستەی ئەوە نیە بیپەرستن و هاوەڵی بۆ دانەنێن لە بەندایەتی کردنداو دڵسۆزی بۆ بنوێنن؟ بەڵام کارەکە پێچەوانە بووەوە، کەسێکیان کردە هاوەڵ بۆ خوا ﷻ کە ناتوانی ﴿ يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ١٩١ وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ ﴾واتە: ئەوانەی کە دەیپەرستن ﴿ نَصۡرٗا وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴾ ئەگەر نەتوانێ هیچ دروست بکات و تەنانەت بە قەد گەردیلەیەکیش بێ، بێگومان ئەوە دروستکراوەو ناتوانێت ناخۆشی لەسەر ئەو کەسە لابیات کە دەیپەرستێ، دەی چۆن ئەوە دەکرێت بە پەرستراو؟ بەڕاستی ئەوە تەنها ستەمێکی گەورەیەو گەمژەیی و گێلیە. ئەگەر ئێوە ئەی بتپەرستەکان بپاڕێنەوە لەو بتانەی کە دەیانپەرستن جگە لە خوا ﷻ

﴿ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمْ ۚ سَوَآءٌ عَلَيْكُمْ أَدَعَوْتُمُوهُمْ أَمْ أَنتُمْ صَٰمِتُونَ ﴾ مـرۆڤ زۆر لـەو بتانـە بـە تواناتـرە، چونکـە نـە دەبیسـتنو نـە دەبینـن، وە نـە ڕێنمایـی دەکـەنو نـە ڕێنمایـی دەکرێـن، هەمـوو ئەوانـە ئەگـەر کەسـێکی عاقـڵو ژیـر تەماشـا بـکات، بـۆی دەردەکەوێـت ئـەوە چەنـدە بێبنەمـاو بەتـاڵو پووچـە.

(١٩٤-١٩٦): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ۖ فَٱدْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَآ ۖ أَمْ لَهُمْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۗ قُلِ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾ إِنَّ وَلِۦِّىَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾ ﴾: ئەمـە جۆرێکـە لـە بەرەنگاربوونـەوەو بـە گژاچوونـی بتپەرسـتەکان، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ ﴾ واتـە: هیـچ جیاوازیـەک لـە نێـوان ئێـوەو ئەوانـدا نیـە، هەمووتـان بەنـدەی بـێ دەسـەڵاتو بـێ توانـان، ئەگـەر ئێـوە ڕاسـت دەکـەن، لـەوەی کـە شایسـتەی جۆرێـک لـە بەندایەتیـە ﴿ فَٱدْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ ﴾ ئەگـەر وەڵامتانیـان دایـەوەو داواکاریەکەتـان بەدەسـت هێنـا، ئەگـەر وانەبـێ ئـەوە بێگومـان ئێـوە درۆ دەکـەن لـەو بانگەشـەدا، درۆ بـە دەم خـواوە دەکـەن، کـە گەورەتریـن درۆیـە. بە ڕاسـتی ئەمـە پێویسـت بـە ڕوونکردنـەوە نـاکات، ئێـوە ئەگـەر تەماشـای وێنەکـەی بکـەن دەبینـن وێنەکـەی بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەو هیـچ قازانجێکـی بەدەسـت نیـە، ئـەوان قاچیـان نیـە بەڕێگـادا پێی بـڕۆن، وە دەسـتیان نیـە هەڵمەتی پێبـەن بـۆ گیانـی دوژمنەکانیـان، وە چاویشـیان نیـە پێـی ببینـن، وە گوێیـان نیـە پێـی ببیسـن، ئـەوە هیـچ شـتێکی نیـە خـۆی پـێ بپارێـزی، بـە پێچەوانـەی مرۆڤـە کـە هەمـوو ئەوانـەی هەیـە. ئەگـەر وەڵامتـان نادەنـەوە کاتـێ داوایـان لێدەکـەن، ئـەوە ئەوانیـش وەک ئێـوە بەنـدەن، بەڵکـو ئێـوە تەواوتـرن لـەوان، وە بەهێزتـرن لـە زۆرێـک لـە شـتەکان، دەی کەواتـە بۆچـی دەیانپەرسـتن ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ شُرَكَآءَكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴾ واتـە: ئێـوەو هاوبەشـەکانتان هەمووتـان کـۆ ببنـەوە کـە زیـان بـە مـن بگەیەنـن بەبـێ ئـەوەی مۆڵەتـم بـدەنو بـە بـێ ئـەوەی چاوەڕوانـی بکـەن، بێگومـان ناتوانـن کەمتریـن زیانـم پێبگەیەنـن،

بەراستی پشتیوانو دۆستی من تەنها خوایە ﷻ سوودو زیان تەنها بە دەستی ئەوە ﴿ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ ﴾ کە هیدایەتو شیفای تێدایە، کە بەندەکان بە چاکترین شێوە پەروەردە دەکات ﴿ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴾ ئەوانەی نیەتو کردەوەو وتەکانیان چاک بووە، وەک چۆن دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾ البقرة.

بڕوادارانی ڕاستەقینە -کاتێ کە پشتیوانی خوا ﷻ دەکەن بە بڕواهێنانو خۆپارێزی، پشتیوانی لە کەسی تر ناکەن، لەوەی کە سوودو زیانی نیە- خوا ﷻ پشتوانیان دەکاتو نەرمو نیان دەبێ لەگەڵیاندا، وە پشتیوانیان دەکات لەوەی کە خێرو چاکەو بەرژەوەندی تێدایە بۆیان، لە دینو دنیایاندا، وە هەموو خراپەیەکیان بە هۆی ئیمانەکەیانەوە لێ بە دوور دەخات، وەک چۆن خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ﴿٣٨﴾ ﴾ الحج.

(١٩٧-١٩٨): ﴿ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا۟ ۖ وَتَرَىٰهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿١٩٨﴾ ﴾:

ئەمەش بە هەمان شێوە لە باسکردنی ئەم بتانەی کە دەیپەرستن لە غەیری خوا ﷻ شایستەی ئەوە نین لە هیچ شتێکدا بپەرسترێن، چونکە هیچ تواناو دەسەڵاتێکیان نیە لە سەرخستنی خۆیاندا، وە سەرخستنی ئەوانەش کە دەیانپەرستن، وە هێزی عەقڵو وەرگرتنیان نیە، ئەگەر بانگیان بکەی بۆ ڕێنمایی وەری ناگرن، ئەوانە تەنها وێنەیەکن ژیانیان تێدا نیە، دەبینی تەماشات دەکەن بەڵام ئەوان لە ڕاستیدا نابینن، چونکە وێنایان کێشابوون لەسەر وێنەی ئاژەڵەکان، وە لە نەوەکانی ئادەمو هاوشێوەکانیان، وە چاوو جەستەیان بۆ دروستکردبوون، ئەگەر بتبینایە، دەتوت: ئەمە مارە، بەڵام ئەگەر لێی وردبویتەوە دەتزانی ئەوانە بێ گیانو هیچ جوڵەیەکیان نیەو ژیانیان تێدا نیە، بتپەرستان بە چی بۆچونێک ئەمانەیان کرد بە پەرستراو لەگەڵ خوادا ﷻ؟ وە بە چی بەرژەوەندیەک کزۆڵ دەبوون بۆیو بە جۆرەها شێوە بەندایەتیان بۆ دەکرد؟ ئەگەر ئەمە بزانی، دەزانی بتپەرستانو ئەوانەی کە دەیپەرستن، ئەگەر هەموویان کۆ بنەوە مەبەست ئەوە بێ زیان بە کەسێ بگەیەنن، کە خوا ﷻ پشتیوانی لێ بکات، ئەوە ناتوانن بە قەد گەردیلەیەک زیانی پێبگەیەنن، بە هۆی ناتەواوی بێ تواناییانو بێتوانایی ئەوەی کە دەیپەرستن، لە بەرانبەر تەواوی هێزو توانای خوا ﷻ، وە توانای

إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلْكِتَٰبَ ۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ
﴿١٩٦﴾ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَكُمْ
وَلَآ أَنفُسَهُمْ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدْعُوهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ لَا يَسْمَعُوا۟ ۖ
وَتَرَىٰهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿١٩٨﴾ خُذِ ٱلْعَفْوَ
وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ
مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ إِنَّ
ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُوا۟
فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ
لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ۚ
قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ
وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ
فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ وَٱذْكُر رَّبَّكَ
فِى نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ
وَٱلْءَاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ
لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ ﴿٢٠٦﴾

ئەو کەسەی کە تەنها پشت بە خوا ﷻ دەبەستێ.

وتراوە: کە دەفەرمووێ: ﴿وَتَرَىٰهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ وَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ﴾ ئەوە (ضمیر) ڕاناو دەگەڕێتەوە بۆ بتپەرستو ئەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ بە درۆ دەخەنەوە، دەیانبینی تەماشای تۆ دەکەن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە تەماشا کردنێکی پەند وەرگرتن، بەو تەماشا کردنە ڕاستگۆو درۆزن لە یەکتر جیا دەبێتەوە، بەڵام ئەوان تەماشای ڕاستی تۆیان نەدەکردو بە وردی بیریان نەدەکردەوە لە جوانیو تەواویو ڕاستگۆیی.

(١٩٩): ﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾﴾

﴿خُذِ ٱلْعَفْوَ﴾ ئەم دەقە گشتگیرە دەربارەی ڕەوشت بەرزی لەگەڵ خەڵکیدا، وە ئەوەی پێویستە لە مامەڵە کردن لەگەڵیاندا، ئەوەی کە پێویستە کە مامەڵەی پێ بکرێ لە ناو خەڵکیدا، لێبوردەییو لێخۆشبوونە، واتە: لە ناخەوە دەروون پاک بکرێتەوە، وە چی ئاسانە بۆیان لە کردەوەو ڕەوشتی بەرز، ئەرکێک نەخاتە سەرشانیان کە لەگەڵ سروشتیاندا نەگونجێ، بەڵکو هەموو کەسێک بە پێی ئاستی خۆی، لە وتەو کردەوەی جوان، وە لە کەمو کورتیان ببورێ، وە چاو لە ئاستی ناتەواویەکانیاندا دابخات، وە خۆی بە گەورە نەزانێت بەسەر ئەو کەسەوە کە لە خۆی بچوکترە، یان بە هۆی ئەوەی کە عەقڵی تەواو نیە، یان بە هۆی ئەوەی کە هەژارە، بەڵکو بە نەرمو نیانیو دڵفراوانیەوە مامەڵە لەگەڵ هەموویاندا بکات ﴿وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ﴾ واتە: بە هەموو کردارو گوفتارێکی جوانو شیرین، وە ڕەوشتێکی بەرزو تەواو لەگەڵ هەمووواندا نزیک بێ یان دوور، هەوڵبدات کە دەچی بۆ لای خەڵکی بە شێوەیەک لە شێوەکان سوودیان پێبگەیەنیت، یان فێر کردنی زانست، یان هاندان بۆ خێرو چاکە، لە پەیوەندی خزمایەتی، یان چاکە بەرانبەر

بـه‌ دایـك‌و باوك، یان چـاك كردنی نێـوان خه‌ڵكی، یـان ئامۆژگاریه‌كی بـه‌ كه‌ڵك، یان بۆچوونێكـی پێكـراو تـه‌واو، یان هـاوكاری له‌سـه‌ر چاكه‌و خواناسـی، یـان قه‌ده‌غه‌كردنی خراپـه‌كاری، یـان ڕێنمایی بـۆ به‌ ده‌سـت هێنانـی به‌رژه‌وه‌ندیه‌كی ئاینی یـان دنیایی.

كاتێـك كـه‌ هیـچ ڕێگایه‌ك نیه‌ بـۆ ده‌رباز بـوون له‌ ئـازاری نه‌فامه‌كان، خـوا ﷻ فه‌رمانی كـردوه‌، ڕووبـه‌ڕوی نه‌فامه‌كان ببێته‌وه‌ به‌ پشـتێكردنی، وه‌ ڕووبـه‌ڕووی نه‌فامی ئه‌و نه‌بیته‌وه‌، هـه‌ر كه‌سـێ بـه‌ وته‌یـه‌ك ئـازاری دای، یان بـه‌ كرده‌وه‌یه‌ ئـه‌وه‌ تۆ ئـازاری ئه‌و مـه‌ده‌، وه‌ ئـه‌وه‌ی بێبه‌شـی كـردی بێبه‌شـی مه‌كـه‌، وه‌ هـه‌ر كه‌سـێ په‌یوه‌نـدی پچڕاند تـۆ په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵـدا دروسـت بكه‌، وه‌ هه‌ر كه‌سـێ سـته‌می لێكردی تـۆ دادپه‌روه‌ربـه‌ له‌گه‌ڵیدا.

بـه‌ڵام ئـه‌وه‌ی كـه‌ پێویسـته‌ به‌نـده‌ مامه‌ڵـه‌ی پـێ بـكات له‌گـه‌ڵ شـه‌یتانه‌كانی مـرۆڤ‌و جنۆكـه‌دا، خـوا ﷻ ده‌فه‌رمـوێ:

(٢٠٠-٢٠٦): ﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾
إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُوا۟ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴿٢٠١﴾
وَإِخْوَٰنُهُمْ يَمُدُّونَهُمْ فِى ٱلْغَىِّ ثُمَّ لَا يُقْصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ قَالُوا۟ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ۚ
قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾
وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ
تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْـَٔاصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
عِندَ رَبِّكَ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسْجُدُونَ ۩ ﴿٢٠٦﴾ ﴾:

خـوا ﷻ ده‌فه‌رمـوێ: ﴿ وَإِمَّا ﴾ واته‌: له‌ هه‌ر كاتێكدا بـێ‌و هه‌ر چۆنێك بێت ﴿ يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ ﴾ واتـه‌: هه‌سـت بـه‌ ختـوره‌ ده‌كه‌یت، لـه‌ خاوبوونه‌وه‌ لـه‌ كاری چاكه‌، یـان هانـدان له‌سـه‌ر خراپه‌و ئامـاژه‌ بۆ كردنـی ﴿ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ ﴾ واته‌: په‌نا بگره‌و پشـت بـه‌ خوا ﷻ ببه‌سـته‌، بێگومـان ئه‌و ﴿ سَمِيعٌ ﴾ بـه‌وه‌ی كه‌ ده‌یڵێـت ﴿ عَلِيمٌ ﴾ به‌ نیه‌ت‌و لاوازیـت، وه‌ هێـزی په‌نـا بردنـت بـۆ لای، ده‌تپارێـزێ لـه‌ فیتنـه‌و وه‌سوه‌سـه‌و ختـوره‌ی (شـه‌یتانه‌كان)، وه‌ك چۆن ده‌فه‌رمـوێ: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ ﴾ الناس.

كاتێـك كـه‌ به‌نـده‌ هـه‌ر ده‌بـێ تووشـی بێئاگایی ببـێ‌و شـه‌یتانیش زه‌فـه‌ری پێبـات كه‌ بـه‌رده‌وام له‌ سـه‌نگه‌ردایه‌ بـۆی‌و چاوه‌ڕوانـی غافـڵ بـوون‌و بێئاگابوونێتی، یـاد كردنه‌وه‌ی خـوا ﷻ نیشـانه‌ی خۆپارێزانـه‌ لـه‌ گومراكـه‌ران، پیاوی له‌ خـوا ترس ئه‌گه‌ر هه‌سـتی كرد بـه‌ تاوانێـك لـه‌ لایـه‌ن شـه‌یتانه‌وه‌، گوناهێكـی كـرد كـه‌ قه‌ده‌غـه‌ كـراوه‌ یـان وازی له‌

پێویستێک هێنا، بیر دەکاتەوە بزانن لە چی دەرگایەکەوە هاتووە، بیر لەوە دەکاتەوە خوا ﷻ چی پێویست کردوە لەسەری، تەماشا دەکاتو داوای لێخۆش بوون لە خوا ﷻ دەکات، وە کاری چاکەی زۆر دەکات، تا شەیتان بە سەرشۆڕی دەگەڕێنێتەوە کە ئەو بوو بە مایەی ئەوەی تووشی گوناە بێت.

بەڵام ئەوانەی کە براو دۆستی شەیتانەکانن، ئەوانە ئەگەر تاوانێ ئەنجام بدەن، بەردەوام دەبن لەسەری گوناە لە دوای گوناە، شەیتانەکانیش کەمتەرخەمیان لەگەڵدا ناکەن بە یاخی بوون، لەبەر ئەوەی تەماحی تێکرد بوون کاتێک کە بینیانی کەمتەرخەمی ناکەن لە کاری خراپەدا.

﴿ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ ﴾ واتە: بەردەوام ئەو درۆزنانە لە یاخیبوونو کەللە ڕەقیدان لە بەرانبەرت ئەگەر چی ئەو ئایەتانەیان بۆ دابەزێ کە ئاماژە بە هیدایەتو ڕێنمایی دەکەن، ئەگەر نیشانەیەکیان بۆ بهێنیتەوە کە ئاماژە بەڕاستگۆیی تۆ دەکات ئەوە گوێڕایەڵ نەدەبوون ﴿ وَإِذَا لَمْ تَأْتِهِم بِـَٔايَةٍ ﴾ واتە: لەو ئایەتانە نی کە خۆیان هەڵیان بژاردبوو داوایان دەکرد ﴿ قَالُواْ لَوْلَا ٱجْتَبَيْتَهَا ﴾ واتە: ئەی باشە خۆت بۆ ڕێکی ناخەی، تا بڵێن ئەوە ئایەتی فلان کەسە یان موعجیزەی فلان کەسە، وەک ئەوە وایە خۆت ئایەتەکان دابگری، کاروباری هەموو دروستکراوەکان بەڕێوە ببەی، بەڵام ئەوان نەیان زانی تۆ لەو کارەدا هیچ دەسەڵاتێکت نیە.

﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ مِن رَّبِّى ﴾ (پێیان بڵێ:) بێگومان من بەندەیەکی شوێنکەوتووم تەنها فەرمان جێبەجێ دەکەم، وە خوا ﷻ خۆی ئایەتەکان بە پێی حیکمەتو دانایی خۆی دادەبەزێنێ، ئەگەر ئەتانەوێ کاتەکانتان پەرشو بڵاو نەبێو بە خۆڕایی بەسەری نەبەن، وە ئەگەر بەڵگەیەکتان دەوێ کە بۆ هەموو کاتێک بشێو بەتاڵ نەبێتەوە ئەوە قورئانی پیرۆزە، ﴿ بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ ﴾ واتە: مەشخەڵێکە بۆ هەموو داواکاریەکانی پەروەردگارو چاکەکاری مرۆڤایەتی هەر کەسێک بیری لێبکاتەوەو تیاڕابمێنێ دەزانێ کە ئەو قورئانە لەلایەن پەروەدگارێکی قسەلەجێو هەمیشە سوپاسکراوو نێردراوەوە دابەزیوە، بەتاڵ ڕووی تێناکات نەلە ئێستاو نەلە دوارۆژدا نەبە کەم کردنو نەبە زیاد کردن، وە بەوەش بەڵگە پێویست دەبێ بەسەر هەر کەسێ کە ئەو پەیامەی پێگەیشتبێ، بەڵکو زۆربەی خەڵکی بڕوا ناهێنن، وە هەر کەسێک بڕوابهێنێ ئەوە دەبێتە مایەی ﴿ وَهُدًى ﴾ هیدایەت بۆی لە گومڕایی ﴿ وَرَحْمَةٌ ﴾ (وە بەزەیی خوا بۆی) لە

سەرگەردانی، بڕوادار هیدایەت دراوە بە قورئان شوێنی دەکەوێ لە دنیاو دوارۆژداو بەختەوەرە، بەڵام ئەوەی کە بڕواناهێنێ بێگومان لە دنیاو دوارۆژدا گومڕایە ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ ئەمە فەرمانێکی گشتیە بۆ هەموو ئەوانەی گوێیان لە کتێبی خوا ﷻ دەبێ کە دەخوێنرێ فەرمانیان پێکراوە گوێی بۆ بگرێو بێدەنگیش بێ، وە جیاوازی لە نێوان (الإستماع والانصات) گوێگرتن‌و بێدەنگ بوون، (الانصات) بێدەنگ بوون بەرووکەش دەبێ بەوەی کە واز لە قسەکردن بهێنێ، یان سەرقاڵ بێ بە شتێکەوە لە گوێگرتنی، بەڵام (الإستماع) گوێگرتن ئەوەیە کە گوێی بداتێو بە دڵ بیری لێبکاتەوە بێگومان هەر کەسێک بەم دووکارە هەستێ کاتێک کە قورئان دەخوێنرێت ئەوە خێرو پاداشتێکی زۆرو زانستێکی بەرفراوانی دەست دەکەوێ، وە ئیمانی بەردەوامو تازە دەبێتەوەو ڕێنمایی زیاتر وەردەگرێو بەرچاو ڕوون دەبێ لە ئاینەکەیدا، بۆیە خوا ﷻ ڕەحمەتی خۆی دەڕژێنێ بەسەریدا، ئەم دەقە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە هەر کەسێک قورئانی بەسەردا بخوێنرێ گوێی بۆ نەگرێو بێدەنگ نەبێ ئەوە لە میهرەبانی خوا ﷻ بێبەش دەبێو خێرو چاکەیەکی زۆر لە دەست دەدات. ئەوەی کە جەختی لەسەر کراوەتەوە فەرمانی پێ بکات بیسەری قورئان کە گوێی بۆ بگرێو بێدەنگ بێت لە نوێژی ئاشکرادا، کاتێک کە ئیمام دەخوێنێ پێویستە لەسەری بێدەنگ بێت، تەنانەت زۆربەی زانایان دەفەرموون: بێدەنگ بوون‌و گوێگرتن لە قورئان لە پێشترە لە خوێندنی سووڕەتی فاتیحەو هاوشێوەکانی.

﴿ وَٱذْكُر رَّبَّكَ فِى نَفْسِكَ ﴾ یادکردنەوەی خوا ﷻ بە دڵو بە زمان‌و بە هەردووکیان دەبێت ئەوە تەواوترین جۆرەکانی زیکرو یادکردنەوەیە، خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ وە شوێنکەوتووانی کە بە دڵسۆزیەوە یادی خوا ﷻ بکەن ﴿ تَضَرُّعًا ﴾ واتە: بپاڕێوە بە زمانت بە جۆرەها شێوەی پاڕانەوە ﴿ وَخِيفَةً ﴾ لە دڵدا بەوەی کە لە خوا ﷻ بترسێ لەوەی کە کردەوەکەت وەرنا گیرێ، نیشانەی ترس ئەوەیە هەوڵو کۆشش بکات بۆ تەواوکردنی کاری چاک‌و دڵسۆز بوون تێیداو خوا پێ مەبەست بوونی.

﴿ وَدُونَ ٱلْجَهْرِ مِنَ ٱلْقَوْلِ ﴾ واتە: نێوەندگیر بە، وە نوێژەکەت بە دەنگی بەرز مەخوێنە، زۆریش هێواش‌و لەسەر خۆ مەبە، بەڵکو بەنهێنیش مەیکە لەو نێوانەدا ڕێگایەک هەڵبژێرە ﴿ بِٱلْغُدُوِّ ﴾ سەرەتای ڕۆژ ﴿ وَٱلْأَصَالِ ﴾ کۆتاییەکەی، ئەم دووکاتە بۆ

یادکردنـەوەی خـوا ﷻ فەزیڵـەو چاکەیەکـی تایبەتـی تێدایـە ﴿ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْغَـٰفِلِينَ ﴾ ئەوانـەی کـە خوایـان لـە بیرچـووە خـواش ﷻ ئەوانـی لـە بیـر کـردوە، بێگومـان ئەوان بێبەشـن لـە خێـرو بێـری دنیـاو دوارۆژدا، وە پشـتیان کـردوە لـە هەمـوو خۆشـبەختیو سـەرکەوتنێک لـە یادکردنـەوەو بەندایەتیدا، وە ڕوویـان کردۆتە هەمـوو کارێکی خراپو پیـسو سـەرقاڵ بـوون پێیەوە.

ئەمـەش یەکێکـە لـەو ئـادابو ڕەوشـتانەی کە پێویسـتە لەسـەر بەندە بـە جوانترین شـێوە لەبەرچـاوی بگرێـت، ئەویـش زۆر یادکردنـەوەی خوایـە ﷻ بـە درێژایـی شـەوو ڕۆژ بە تایبـەت سـەر لـە ئێوارەو سـەر لـە بەیانی بـە دڵسـۆزیەوە بـە دڵو دەروونێکی پـاکو خۆ بـە کـەم زانینـەوە، دڵو زمانـی پێکەوە وەک یـەک بێ بە ئـەدەبو کزۆڵیـەوەو ڕووبکاتە پاڕانـەوەو یادکردنـەوە، وە بێئاگـا نەبـێ لێـی، چونکـە خـوا ﷻ دوعـاو پاڕانەوەیـەک وەرناگرێـت کە لـە دڵێکـی بێئاگـاوە سـەرچاوەی گرتبێت.

پاشـان خـوا ﷻ باسـی کۆمەڵـە بەندەیەکی کـردوە کە بـەردەوام یـادی دەکـەن ئەوانیش فریشـتەکانن، تـا بزانـن خـوا ﷻ تایـەوێ زۆر بەندایەتـی بکەن لـە کاتێکی کەمـدا بەڵکو دەیـەوێ بـەردەوام بـن ئەگەرچـی کەمیش بـێ، تەنها سـوودو قازانجـی ئێـوەی دەوێ کە بـە چەندیـن قات پاداشـت وەربگـرن، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ ﴾ لە فریشـتە نزیکـەکانو هەڵگرانـی عەرشـی خـوا ﷻ ﴿ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِۦ ﴾ بەڵکـو ملکەچـی فەرمانەکانـی پەروەردگاریـان دەبن ﴿ وَيُسَبِّحُونَهُۥ ﴾ شـەوو ڕۆژ ماندوو نابنو سـارد نابنەوە ﴿ وَلَهُۥ ﴾ تـاکو تەنهایـەو هاوەڵی نیـە ﴿ يَسْجُدُونَ ﴾ با ئینسـانەکان پەیڕەوی فریشـتە بەڕێـزەکان بکـەن وە بـەردەوام بـن لەسـەر بەندایەتـی خوا ﷻ تـاکو تەنها.

سوورەتی (الأعراف) تەواو بوو


سُورَةُ الأَنفَال
بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنفَالِ قُلِ الْأَنفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ
وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِن كُنتُم
مُّؤْمِنِينَ (١) إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ
قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ
يَتَوَكَّلُونَ (٢) الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ
يُنفِقُونَ (٣) أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ
رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ (٤) كَمَا أَخْرَجَكَ رَبُّكَ
مِن بَيْتِكَ بِالْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ لَكَارِهُونَ (٥)
يُجَادِلُونَكَ فِي الْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى الْمَوْتِ
وَهُمْ يَنظُرُونَ (٦) وَإِذْ يَعِدُكُمُ اللَّهُ إِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ أَنَّهَا
لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ الشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ
اللَّهُ أَن يُحِقَّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَيَقْطَعَ دَابِرَ الْكَافِرِينَ (٧)
لِيُحِقَّ الْحَقَّ وَيُبْطِلَ الْبَاطِلَ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ (٨)

## تەفسیری سوورەتی (الأنفال)

## مەدەنییە (٧٥) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٤): ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾

ئەنفـال: بریتیـە لـەو دەسـتکەوتانەی کـە خـوا ﷻ دەیبەخشـێت بـەم ئوممەتـە، لـە ماڵو سـامانی بێبڕوایـان، ئـەم ئایەتانـە لەم سـوورەتەدا دەربـارەی جەنگی (بـدر) دابەزیـون، ئەمە یەکـەم دەسـتکەوتی گـەورە بوو کە مسـوڵمانان دەسـتیان کەوت لە بتپەرسـتان، لـە نێوانی مسـوڵماناندا هەندێـک مشـتو مـڕ روویدا، پرسـیاریان کـرد لـە پێغەمبەر ﷺ، پاشـان ئەم ئایەتـە هاتـە خـوار: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ﴾ (واتـە: پرسـیارت لێدەکەن دەربـارەی ئەم دەسـتکەوتەی جەنـگ؟) چـۆن دابـەش دەکرێو بەسـەر کـێ دابـەش دەکرێ؟

﴿ قُلِ ﴾ پێیـان بڵـێ: دەسـتکەوتەکان بـۆ خـواو پێغەمبەرەکەیەتـی ﷺ چۆنـی بیەوێـت دەیبەخشـێت، نابـێ بەرپەرچـی حوکـمو فەرمانـی خـواو پێغەمبەرەکـەی بدەنـەوە، بەڵکـو پێویسـتە لەسـەرتان ڕازی بـن بە فەرمانو بڕیاری خـواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، ئـەوەش دەچێتە چوارچێـوەی ئـەو ئایەتەوە کـە خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴾ بـە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانـیو دوورکەوتنـەوە لـە قەدەغەکراوەکانی.

﴿ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ﴾ واتـە: نێوانـی خۆتـان چـاک بکـەن لـە کێشـەو دابـڕانو

دووبەرکـیو لـە یەکتـر دوورکەوتنـەوە، لـە جێگـای ئەوانـە برایەتـیو پەیوەنـدیو خۆشەویسـتی بچێنـن، بـەو شـێوەیە یەکدەنگ دەبـنو هەموو ئەوانـە لەناو دەچـن کە دەبنە مایـەی دووبەرەکـیو ناکۆکی نێوانتـان، وە چاک کردنـی نێوانتان جوان کردنی ڕەوشـتتان لەگەڵیـانو لێبـوردن لە خراپـەکارەکان دەخوازێ، ئا بـە مە زۆر لەو ڕقو کینـەی لە دڵەکان هەیـە لادەچـن، وە هەموو ئەوانەی باسـکرا لەم ڕسـتەدا کۆدەبنەوە: ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾ بێگومـان ئیمان دەبێتـە مایەی گوێڕایەڵی خـوا ﷻو پێغەمبەرەکەی ﷺ وەک چـۆن هـەر کەسـێک گوێڕایەڵـی خـواو پێغەمبەرەکـەی نـەکات ئیماندار نیـە، هەر کەسـێک گوێڕایەڵـی بـۆ خـوا ﷻو پێغەمبەرەکـەی ﷺ ناتـەواو بـێو کەمو کورتـی تێدا بـێ، ئەوە بێگومـان ئیمانـی ناتەواوە.

کاتێـک کـە ئیمـان دەکرێـت بـە دوو بەشـەوە: ئیمانێکـی تەواو کە شایسـتەی وەسـفو پیاهەڵدانـە خاوەنەکـەی بە تـەواوی سـەرکەوتووە، وە ئیمانێـک لە خواری ئـەوەوە، نموونە بـۆ ئیمانی تـەواو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾ (أل) لە وشـەی (المؤمنون) گشـتگیرە بۆ هەمـوو بنەماو لـقو پۆکانـی ئیمان.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ ﴾ دڵیـان دەترسـێ، لە ترسـی خوا ﷻ، بۆیـە دوور دەکەونـەوە لـە قەدەغەکـراوەکان، بێگومـان ترسـان لـە خـوا ﷻ گەورەترین نیشـانەیە کـە ڕێگـری لـە خاوەنەکـەی دەکات کە تووشـی گونـاە ببێت.

﴿ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ ﴾ مەبەسـت لێـرەدا ئەوەیـە ئـەوان گوێـی بـۆ دەگـرنو بـە قووڵـی بیـری لێدەکەنـەوە لـەو کاتـەدا ئیمانیان زیـاد دەکات، چونکـە قـووڵ بیرکردنەوە لـە کردەوەکانـی دڵـە، وە لەبـەر ئـەوەی پێویسـتە مانـای ئەوانەیان بـۆ ڕوون بکاتـەوە کە نایزانـن، یـان بیریـان بخاتـەوە لەوانـەی کە لـە بیریـان چۆتـەوە، یان ویسـتێک لـە دڵیدا دروسـت بـکات بـۆ خێرو چاکـە، وە هانی بـدات بـۆ لای گەورەیـی پەروەردگـاری، یان بترسـێ لـە سـزاکانو دوور بکەوێتـەوە لـە سـەرپێچی کردنـی، هەمـوو ئەمانـە ئیمانی پێ زیـاد دەبێ.

﴿ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ ﴾ بـە تـاکو تەنها بەیێ هـاوەڵ بۆ دانـان ﴿ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ واتە: لـە دڵیانەوە پشـت بـە پەروەردگاریان دەبەسـتن لـە بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندیەکانو دوور خسـتنەوەی زیانەکانـی دنیـاو دوارۆژیـان، وە بڕوایـان وایە کە خوا ﷻ ئـەوە دەکات.

وە پشـت بەسـتن پاڵنـەری هەمـوو ئـەو کردەوانەیە، ئـەو کردەوانە دروسـتو تـەواو نابن

تەنها بە پشت بەستن نەبێ بە خوای پەروەردگار ﴿ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتە: لە فەرزو سوننەتەکان، وە کردەوە ئاشکراو نهێنیەکان وەک ئامادەبوونی دڵ لە کاتی ئەنجامدانیدا کە ئەوە بە ڕۆحی نوێژ دەژمێردرێت ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ ئەو بەخشینانەی کە پێویستە وەک: زەکاتو کەفارەتو بژێوی ژنو کەسە نزیکەکان، وە ئەوانەی کە کۆیلەن، وە ئەو بژێویانەی کە سوننەتن، وەک: بەخشین بە هەموو جۆرەکانیەوە.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانەی کە وەسف کراون بەو سیفەتانە ﴿ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ﴾ لەبەر ئەوەی کۆیان کردەوە لە نێوان ئیسلامو ئیماندا، وە لە نێوان کردەوەی ئاشکراو نهێنیدا، وە لە نێوان زانستو کارپێکردنی، وە لە نێوان جێبەجێ کردنی مافەکانی خواو ﷻ مافی بەندەکاندا.

وە خوا ﷻ کردەوەی دڵی پێشخستوە، چونکە ئەصڵو بنەمایە بۆ کردەوە بە ئەندامەکانی جەستە، وە لەوان باشترە، وە هەروەها دەبێت بەبەڵگە کە ئیمان زیادو کەم دەکات، بە کاری چاکە زیاد دەکاو بە کاری خراپە کەم دەکات، پێویستە لەسەر بەندە بڕواو ئیمانی تا بکرێ بەهێزتر بکاتو پتەوتری بکات، وە گرنگترین شتێک کە دەبێتە مایەی ئەوە بیرکردنەوەیە لە کتێبی خوا ﷻ تێ ڕامانە لە بنەماکانیدا، پاشان باسی پاداشتی بڕوادارانی کردوە، فەرموویەتی: ﴿ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ ﴾ واتە: (پلەیان) بەرزە بە پێی بەرزی کردەوەکانیان ﴿ وَمَغْفِرَةٌ ﴾ (لێ خۆشبوون هەیە) بۆ تاوانەکانیان ﴿ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾ خوا ﷻ بۆی ئامادە کردوون لە شوێنی بەرزو بەرێزدا کە چاو نەیبینیوەو گوێ نەیبیستوە، وە بە ختورەش بە دڵی هیچ کەسدا نەهاتووە.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێ نەگات بە پلەکانی ئەوان لە ئیماندا -ئەگەر بچێتە بەهەشتیشەوە- ناگاتە ئەو پلەی کە ئەوان پێی گەیشتوون.

(٥-٨): ﴿ كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴿٥﴾
يُجَٰدِلُونَكَ فِى ٱلْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذْ يَعِدُكُمُ
ٱللَّهُ إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ
ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِلَ ٱلْبَٰطِلَ وَلَوْ كَرِهَ
ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨﴾ ﴾:

خـوا ﷻ لـە سـەرەتای ئـەم جەنگـەدا هەندێ سـیفەتی بـەرزی پێش خسـتوە کە پێویسـتە بـڕواداران پابەنـد بـن پێوەیـان، چونکـە هـەر کەسـێک پابەند بـێ بـەو سـیفەتانەوە ئەوە حاڵـی جێگیـر دەبـێ‌و کردەوەکانـی چاکتـر دەبن، لـە گەورەترینی ئـەو کردەوانـە جیهاد کردنـە لـە پێناوی خوادا ﷻ، وەک چـۆن بڕواهێنانیـان بڕواهێنانێکی ڕاسـتەقینەیە بە هەمان شـێوە پاداشـت دانەوەشـیان هەقـە کە خـوا ﷻ پەیمانـی پێداون، بـە هەمان شـێوە خوا ﷻ پێغەمبەرەکـەی لـە ماڵـی خۆی کـردە دەر بـۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بتپەرسـتەکان لە (بـدر) بە هـەق، کـە خـوا ﷻ پێی خۆشـەو لە قـەزاو قـەدەردا بڕیاری لەسـەر داوە.

لـە کاتێکدا بـڕواداران هیچ بـە خەیاڵیاندا نەدەهـات دەربچن‌و ڕووبەڕووبونەوەی کوشـتاری دوژمنەکانیـان ببنـەوە. کاتێـک کـە بۆیـان ڕوون بویـەوە کـە ئـەوە هەقـە، کۆمەڵـێ لـە بـڕواداران دەمەقاڵـێ‌و مشـت‌و مڕیـان لەو بـارەوە دەکـرد لەگـەڵ پێغەمبەری خـوادا ﷺ، ئەوەنـدە بەلایانـەوە سـەخت بـوو وەک ئـەوەی کـە بـە توونـدی بـەرەو مـردن پەلکێش بکرێـن‌و بە چـاوی خۆیـان مـردن ببینن.

هـەق وابـوو لەو بارەیـەوە دەمەقاڵـێ نەکەن بـە تایبەت پاش ئـەوەی کە بۆیـان دەرکەوت دەرچوونەکەیـان هەقـەو خـوا فەرمانـی پـێ کـردوەو پێـی ڕازیـە، بەڕاسـتی ئەمە شـوێنی مشـت‌و مڕنیـەو بـە هیـچ شـێوەیەک نابێ مشـت‌و مڕی لێـوە بکرێـت، چونکە دەمـە دەمە لـە شـتێکدا دەکرێ کـە جۆرێک لـە دوو دڵی‌و گومانـی تێدابێ، بەڵام کاتێـک کە ڕوون‌و ئاشـکرا بـوو پێویسـتە گوێڕایەڵی بکـەن‌و فەرمانەکان بەجـێ بهێنن.

بێگومـان زۆرێـک لـە بـڕواداران تووشـی ئـەم مشـت‌و مـڕە نەبـوون‌و ڕووبەڕووبونەوەی دوژمنەکانیـان پـێ ناخـۆش نەبـوو، وە بـە هەمـان شـێوە ئەوانـەی کـە خـوا ﷻ سەرزەنشـتی کـردن بـە چاکتریـن شـێوە ملکەچـی جیهـاد کـردن بـوون‌و خـوا پابەندی کـردن‌و چەندیـن هـۆکاری کـردە مایـەی ئـەوەی کـە دڵیـان جێگیـر بێـت، وەک چـۆن دواتـر بـاس دەکات.

خـۆی لـە ئەسـڵدا دەرچوونەکەیان بـۆ ئەوە بـوو ڕێ لە کاروانەکـەی ئەبو سـوفیانی کوڕی حـەرب بگـرن کـە قافڵەیەکی گـەورەی قوڕەیش بـوو بۆ بازرگانی بەرەو شـام دەڕۆشـت، کاتێـک کـە گەڕانەوەیانـی بیسـت پێغەمبـەر ﷺ خەڵکـی هانـداو سـێ سـەدو ئەوەنـدە کەسـی لەگەڵـدا دەرچـوون، وە حەفتـا حوشـتریان لەگەڵدا بوو بـۆ بار کردنـی کەل‌و پەل‌و پێویسـتیەکانیان، بتپەرسـتانی قوڕەیـش ئـەم هەواڵەیـان پێگەیشـت بۆیـە بەهێزێکی زۆرو

کـەلو پـەلو ئەسـپو پێویسـتیەکانی جەنـگ کـە نزیـک دەبـوون لـە هـەزار کـەس دەرچـوون بـۆ فریاکەوتنـی کاروانەکەیان.

خـوا ﷻ پەیمانـی دا بەبڕواداران بـە یەکێک لەو دوو دەسـتەیە، یان ئەوەیـە کاروانیەکەیان دەسـت دەکـەوێ، یـان دەرچوونـە بۆ جەنـگ، بەڵام ئـەوان حەزیان لـە کاروانەکـە کرد، چونکـە مسـوڵمانان بـاری ئابووریان باش نەبـوو، وە لـە ڕووی ڕێژەیشـەوە زۆر کەم بوون، وە لەبـەر ئـەوەی ئەو دەسـتکەوتە بـێ چەکـە، بەڵکو خوا ﷻ شـتێکی تری پـێ خۆش بوو بـۆ ئـەوان کە زۆر لەوە باشـتر بـوو کە ئـەوان حەزیان لـێ دەکرد.

خـوا ﷻ ویسـتی لەسـەر بـوو کـە سـەریان بخـات بـەو دەرچوونەی کـە گـەورە پیاوانی قورەیـش دەرچـوون بـۆ ڕووبەڕووبونـەوەی بـڕواداران ﴿وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ﴾ بـڕواداران سـەربخات ﴿وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ واتـە: لـە ڕەگـو ڕیشـە بێبڕوایـان دەربهێنـێ، وە هەقو ڕاسـتی پێشـانی بەندەکانی بـدات کە بـە خەیاڵیاندا نەدەهات ﴿لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ﴾ بـۆ ئـەوەی کە هـەق دەربکـەوێ ﴿وَيُبْطِلَ ٱلْبَٰطِلَ﴾ بەوەی کـە بەجێی بهێنـێ لەو بەڵگە ئاشـکرایانەی لەسـەر پووچیو ناهەقیـە ﴿وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾ خوا ﷻ پشـت گوێیانی خسـتوە.


إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ
مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ
وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ
عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ
عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ
رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ
﴿١١﴾ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ
آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا
فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ
شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَن يُشَاقِقِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ اللَّهَ
شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَافِرِينَ
عَذَابَ النَّارِ ﴿١٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ
كَفَرُوا زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ
دُبُرَهُ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ
بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦﴾

(٩-١٤): ﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ
فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ
الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ
اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ وَمَا
النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ
حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ
أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً
لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ
وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ
﴿١١﴾ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي
مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ
الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ
الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَمَن
يُشَاقِقِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَافِرِينَ
عَذَابَ النَّارِ ﴿١٤﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ ﴾ واتە: بیر لەو نیعمەتانـەی خوا ﷻ بکەنەوە کاتـێ کـە لـە ڕووبـەڕوو بوونـەوەی دوژمنەکانتان نزیـک بوویـەوە، هاناتان بـۆ خوا ﷻ بـرد، وە داوای ئەوەتـان کـرد کـە پشـتیوانیتان بـکاتو سـەرتان بخـات ﴿ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ ﴾ بـە چەندین شـت هـات بـە دەمتانەوە:

لەوانـە: خـوا ﷻ یارمەتیـدان بـە ﴿ بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴾ واتـە: هەندێکیـان بـە دوای هەندێکـی تریـان دەهاتنە خـوارەوە ﴿ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ ﴾ واتـە: دابەزاندنی فریشـتەکان ﴿ إِلَّا بُشْرَىٰ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی کە مژدەتان پێبدا ﴿ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ﴾ سـەرکەوتنیش تەنهـا لە لای خواوەیـە، بە زۆری ژمارەو خـۆ ئامادەکردن نیـە ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ ﴾ هیچ کەس ناتوانێـت زاڵ بێـت بەسـەریدا، بەڵکـو ئـەو زاڵە بەسـەریاندا با لە ژمـارەو ڕێکخستنیشـدا زیاتر بـن سـەرەنجام تێکیان دەشـکێنێ ﴿ حَكِيمٌ ﴾ لـە کاتێکدا هەموو شـتەکانی ئەنـدازە گیری کـردوە بـە هۆکارەکانەوە، وە هەموو شـتێک لـە جێگای خۆیـدا دادەنێ.

لــە سەرخســتن‌و وەڵامدانــەوەی داواکاریەکانتــان ئەوەیــە ﴿ يُغَشِّيكُمُ ﴾ تــرس‌و بیمــی لە دڵەکانتــان دەرکــردو لابــرد، وە بووە هــۆی ﴿ أَمَنَةً ﴾ دڵنیایــی بۆتان، وە نیشــانەیەک بوو بۆ ســەرکەوتن:

لەوانــە: لــە ئاســمانەوە بارانــی بــۆ باراندن بۆ ئــەوەی پاکتــان بکاتەوە لــە بێ دەســتنوێژی‌و پیســی، وە پاکتــان بکاتــەوە لــە ختــورەو دوودڵــی شــەیتان ﴿ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ ﴾ واتــە: بەهێــزو پتەوی بکات، بێگومــان پتەوکردنی دڵ بنەماو ئەســڵی پتەو کردنی جەســتەیە ﴿ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴾ بێگومــان زەوی ئاســان‌و چــاک، کاتــێ کە بارانی بەســەردا دەبارێ خۆی دەگــرێ‌و پێیەکان جێگیــر دەکات.

وە لەوانە: خوا ﷻ نیگای بۆ فریشــتەکان کردوە ﴿ أَنِّي مَعَكُمْ ﴾ بە پشــتیوانی‌و ســەرکەوتن‌و یارمەتــی دان، ﴿ فَثَبِّتُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ واتــە: دڵیــان قایــم‌و دامەزراو بکــە، وە بەهێزیان بکە بەرانبــەر بــە دوژمنەکانیــان، وە هانیان بدە بــۆ جیهادکردن لە پێنــاوی خوادا ﷻ.

﴿ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ واتــە: کەئــەوە گەورەتریــن ســەربازە لەســەریان بێگومــان خــوا ﷻ ئەگەر بــڕواداران جێگیر بــکات‌و ترس‌و بیــم بخاتە دڵی بــێ بڕواکانەوە ئــەوە بێ بــاوەڕان ناتوانن پتــەوو دامەزراو بــن لەســەری ﴿ فَٱضْرِبُوا۟ فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ ﴾ واتە: لە ســەرووی گــەردن (بدەن) ﴿ وَٱضْرِبُوا۟ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴾ واتە: ســەر پەنجــەکان، ئەم وتــارە، یــان بــۆ ئــەو فریشــتانەیە کــە خــوا ﷻ وەحــی بــۆ کــردوون بــڕواداران جێگیرو دامــەزراو بکــەن، ئــەوەش دەبێتــە بەڵگە کــە ئەوان ڕاســتەوخۆ لــە جەنگی بەدر بەشــداریان کــردوە، یــان بــۆ بــڕواداران کــە خــوا ﷻ هانــی داون‌و فێــری کــردن کە چۆن کوشــتار لەگــەڵ بتپەرســتاندا بکــەن بــە شــێوەیەک کــە هیــچ ڕەحمیان پــێ نەکــەن، لەبــەر ئەوەی ﴿ شَآقُّوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ واتــە: بــە ئاشــکرا دژایەتیــان دەکــردن‌و جەنگیــان لەگەڵــدا بەرپا دەکــردن ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ وە لــە ســزاکانی خــواﷻ دەســەڵاتی دۆســتەکانی دەدا بەســەر دوژمنەکانیــداو دەیانکوژێت.

﴿ ذَٰلِكُمْ ﴾ ئــەو ســزایەی کە باســکرا ﴿ فَذُوقُوهُ ﴾ ئەی ئەو کەســانەی کە دژایەتی خــواو ﷻ پێغەمبەرەکــەی ﷺ دەکــەن بیچێــژن ســزایەکی بەپەلــە لەم دنیایــەدا، ﴿ وَأَنَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾ (واتــە: بێگومــان بۆ کافران ســزای ئاگــر هەیە).

وە لــەم چیرۆکــەدا نیشــانە گەورەکانی خــوا ﷻ بە دەردەکــەوێ کە بەڵگەن لەســەر ئەوەی کە موحەممــەد ﷺ هێناویەتی حەق‌و ڕاســتە

لەوانە: خوا ﷻ پەیمانێکی پێدان پەیمانەکەی بەجێهێنا.

لەوانە: کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قَدْ كَانَ لَكُمْ ءَايَةٌ فِى فِئَتَيْنِ ٱلْتَقَتَا فِئَةٌ تُقَـٰتِلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخْرَىٰ كَافِرَةٌ يَرَوْنَهُم مِّثْلَيْهِمْ رَأْىَ ٱلْعَيْنِ ﴿١٣﴾ ﴾آل عمـران. (بـە ڕاسـتی لـە دوو کۆمـەڵ دا کـە بەرەنگـاری یەکدی بوونـەوە نیشـانەیەکی گەورە بـۆ ئێوە هەیـە، کۆمەڵێکیـان لـە ڕێی خـوادا دەجەنگـیو یەکیشـیان بێبڕوا بـوو، کە بـە دیتنی چاو دوو هێنـدەی خۆیانیـان دەیانبینین).

وە لەوانـە: خـوا ﷻ وەڵامـی بڕوادارانی دایـەوە کاتێک کە داوای یارمەتیـان کرد بە هەموو ئـەو هۆکارانەی کە باسـی کـردوە، وە گرنگیدانێکی زۆر بـە حاڵی بەندە بـڕوادارەکانو کە بـڕواو ئیمانیانـی دامـەزاو کـردو پێیەکانیانی جێگیر کـردو ناڕەحەتیو ناخۆشـیو ختورەی شەیتانی لەسـەر لابردن.

وە لەوانـە: هـەر کەسـێک کـە خـوا ﷻ میهرەبانـی خـۆی بەسـەردا برێـژێ بەندایەتـیو خواپەرسـتی بـۆ ئاسـان دەکات، بـە سـەرجەم هـۆکارە ناوەکـیو دەرەکیەکانـەوە.

(١٥-١٦): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٦﴾ ﴾:

خـوا ﷻ فەرمـان دەکات بـە بەندە بڕوادارەکانـی بە بوێـریو توانای ئیمانـی، وە هەوڵ دان بـۆ بەدەسـت هێنانـی سـەرجەم ئـەو هۆکارانـەی کـە دڵو جەسـتەی پـێ بەهێز دەبـێ، وە قەدەغـەی کـردوە لێـان کاتێـک کـە ڕووبـەڕووی بێبڕوایان دەبنـەوە پشـتیان تێنەکەنو ڕانەکـەن، دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ زَحْفًا ﴾ واتـە: لـە وەسـفی شـەڕکردندا کاتێـک کە ڕووبـەڕووی یەکتـر دەبنەوەو لـە یەکتر نزیـک دەبنەوە ﴿ فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلْأَدْبَارَ ﴾ واتـە: بەڵکـو دامـەزراو بـن لە کوشـتار کردنیانو ئـارام بگرن، بێگومـان ئـەوە دەبێتـە مایەی سـەرکەوتنی دینی خـوا ﷻ، وە بەهێز بوونـی دڵو دەروونی بڕوادارانو ترسـاندنی بێبڕوایـان ﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ ﴾ واتـە: گەڕایـەوە ﴿ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: شـوێنو جێگای ﴿ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾.

ئەمـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی هەڵهاتن لـە جەنگ بەبـێ بیانوو لـە گەورەترینـی تاوانەکانە، وەک چـۆن فەرمـوودەی ڕاسـتو دروسـت لـەو بارەیـەوە هاتـوە، وە وەک چـۆن لێـرەدا

هەڕەشـەی تووونـد ڕووبەڕووی ئـەو کەسـانە دەکاتەوە.
تێگەیشـتن لـە ئایەتەکـە ئـەوە دەگەیەنێ ئـەوەی کـە دەگەڕێتەوە لە شـەڕ لە شـوێنێکەوە دەچێـت بـۆ شـوێنێکی تـر، تـا چاکتر بتوانـێ کوشـتار بـکاتو زیانـی زیاتر بـە دوژمن بگەیەنـێ ئـەوە ئاسـاییەو هیچی تێدا نیـە، چونکە ئەو پشـتی هەڵنەکردوە و ڕابـکات، بەڵکو بـۆ ئـەوە پشـتی هەڵکردوە تا سـەرکەوێ بەسـەر دوژمنـدا تا لـە جێگایەکی تـرەوە زیانیان پـێ بگەیەنـێ، یـان بە جـۆرێ هەڵیان بخەڵەتێنـێ، یان هەر شـێوەیەکی تر لە هاوشـێوەکانی جەنـگو کوشـتار، ئەو کەسـەی دەچێ بۆلای دەسـتەیەکی تـر هاوکاریان دەکات لەسـەر کوشـتاری بێبڕواکان ئەوە دروسـتە ئەمەیش ڕوونو ئاشـکرایە. وە ئەگەر دەسـتەیەک جگە لە شـوێنی جەنگەکە وەک تێکشـکانی مسـوڵمانان لە بەر دەسـتی بێبڕواکاندا، وە پەنابردنیان بـۆ شـارێک لـە شـارەکانی مسـوڵمانان یـان مۆڵگەیەکـی تر لـە مۆڵگـەی مسـوڵمانان، لە سـەردەمی هاوەڵانـدا شـتی لەو جـۆرە بەدیکراوە کـە بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی ئەمە دروسـتە. وە دەگونجـێ ئەمـە ئـەوە ببەسـتێتەوەو قەیـدی بکات ئەگـەر مسـوڵمانان گومانیـان وابوو تێکشـکان باشـترین سـەرەنجامە، بـەڵام ئەگەر گومانیـان برد زاڵ دەبـن بەسـەر بێبڕواکاندا ئـەوە لـەم حاڵەتـەدا ڕێگە نـەدراوە ڕا بکـەنو هەڵبێن.

فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ
وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ
ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ۖ وَإِن
تَنتَهُوا۟ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَعُودُوا۟ نَعُدْ وَلَن تُغْنِىَ عَنكُمْ
فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ
وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَهُمْ
لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ ۞ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ
ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوْ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ
وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ۖ
وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ
تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟
مِنكُمْ خَآصَّةً ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾

**(١٧-١٩):** ﴿ فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ۚ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ۚ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ۖ وَإِن تَنتَهُوا۟ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَإِن تَعُودُوا۟ نَعُدْ وَلَن تُغْنِىَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٩﴾ ﴾

خـوا ﷻ دەفەرموێ -کاتێک کە بتپەرستان لـە جەنگی (بدر)دا تێشـکانو مسـوڵمانەکان کوشـتاریان کـردن-: ﴿ فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ ﴾ بـە هێـزو توانـای خۆتـان ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمْ ﴾ کاتێ کە پشـتیوانی کردن، وەک چۆن لە پێشـر باسـکرا ﴿ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ ﴾ بەو شـێوە پێغەمبەر ﷺ کاتـێ جەنگەکـە چـووە نـاو کەپرەکـەوە لـە خـوا ﷻ دەپاڕایـەوەو داوای سـەرکەوتنی لێ دەکـرد، پاشـان دەرچـووە دەرەوە مشـتێک خۆڵـی هەڵگرت بەرەو ڕوخسـاری بتپەرسـتەکان هەڵیـدا، خـوا ﷻ گەیانـدی بـە ڕوخسـاریان، ئنجـا هەریـەک لەوانـە هەنـدێ زیـخو خۆڵـی بەرکـەوت، لـە ترسـاندا شـوێنەکانی خۆیانیـان چۆڵ کـردو پشـتیان هەڵکردو تێکشـکان.

خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکەی دەفەرمـوێ: بەهێزو بـازووی تۆ نەبـوو -کاتێ کە خۆڵـت هەڵدا- بـۆ ناو چاویان، بەڵکـو ئێمە گەیاندمان پێیـان، بە هێزو توانـای خۆمان ﴿ وَلِيُبْلِيَ ٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلَآءً حَسَنًا ﴾ واتـە: خـوا ﷻ بـە توانایـە لە سەرخسـتنی بڕواداران بەسـەر بـێ بڕوایاندا، بەبـێ جەنگو کوشـتار، بەڵام خـوا ﷻ دەیەوێت بـڕواداران تاقی بکاتەوە، وە بـە هۆی جیهاد کردنـەوە بیانگەیەنێـت بە بەرزترین پلـەو پایە، وە پاداشـتی چاکو بێ پایانیـان بداتەوە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ خـوا ﷻ بـەوە دەزانـی کـە بەنـدە دەیشـارێتەوەو ئەوەیشـی کە ئاشـکرای دەکات، وە ئـەو نیەتانـەی کـە چـاکو خراپـن لـە نێـو دڵیـدا دەیزانـێ، خـوا ﷻ ئەندازەیـەک بـۆ بەندەکانی دادەنێ کـە دەگونجێت لەگەڵ زانسـتو حیکمـەتو بەرژەوەندی

بەندەکانـدا، وە پاداشـتی هەموویـان دەداتـەوە بە پێـی نیـەتو کردەوەکانیان.
﴿ ذَٰلِكُمْ ﴾ (ئـا ئـەم) سـەرکەوتنە لەلایـەن خـواوە ﷻ بـۆ ئێـوە ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيْدِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ واتـە: هەمـوو فـرتو فێڵەکانیان لاوازو بێئـاکام دەکات کە بەرانبەر بە ئیسـلامو ئەهلـی ئیسـلام بەکاری دەهێنـن، وە فێڵەکانیان دەبێتـە مایەی تیاچوونی سـەری خۆیان ﴿ إِن تَسْتَفْتِحُوا۟ ﴾ ئـەی بتپەرسـتەکان، واتـە: داوا لە خوا ﷻ دەکەن سـتەمکارانو زاڵمەکان سـزا بـدات ﴿ فَقَدْ جَآءَكُمُ ٱلْفَتْحُ ﴾ کاتێـک کـە خوا ﷻ تووشـی سـزای خۆی کـردن، وە کردنـی بـە پەنـدو ئامۆژگاریەک بۆ لە خوا ﷻ ترسـان ﴿ وَإِن تَنتَهُوا۟ ﴾ لـە داوای هاوکاری ﴿ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾ لەبـەر ئـەوەی دەرفەتێکـی پێـدانو سـزای بـۆ پێـش نەخسـتن ﴿ وَإِن تَعُودُوا۟ ﴾ واتـە: بـۆ سـەرکەوتنو جەنگـان لەگـەڵ حزبی خوا ﷻ کـە بـڕواداران ﴿ نَعُدْ ﴾ ئـەوە ئێمەیـش دەگەڕێینەوە بۆ سەرخسـتنیان بەسـەرتاندا
﴿ وَلَن تُغْنِىَ عَنكُمْ فِئَتُكُمْ شَيْـًٔا وَلَوْ كَثُرَتْ ﴾ واتـە: دوژمنـانو پشـتیوانانتان ئەوانـەی کـە لەگەڵیانـدا کوشـتار دەکـەنو پشـتیان پێ دەبەسـتن بـە جۆرێ لـە جـۆرەکان ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ هـەر کەسـێک خـوا ﷻی لەگەڵـدا بـێ بێگومـان ئـەوە سـەرخراوە، ئەگەرچی لاوازو بـێ توانـا بـێو لـە ڕووی ژمـارەوە کەمیـش بێت، ئـەم لەگەڵـدا بوونەی کـە خوا ﷻ هەواڵـی پێداوە پشـتیوانی بڕواداران بکات، بە پێـی ئەوەیە کە تا چەند کردەوەو پێویسـتیەکانی بڕواهێنـان بەجـێ دەهێنـن، ئەگەرچـی هەندێ جـار دوژمنـان سـەربکەون بەسـەر بڕواداراندا ئەمـە تەنهـا بـە هـۆی کەمتەرخەمیـی بڕوادارانەوەیـە، وە بەجێنەهێنانی ئـەو پێویسـتیانەیە کە ئیمـان هێنانیـان پێویسـتی کردوە لەسـەریان، ئەگـەر فەرمانەکانـی خوا ﷻ جێبەجـێ بکەن لە هەمـوو ڕووەکانـەوە، ئەوە هەرگیـز ئاڵایان دانابـەزێ، وە دوژمنیش بە یەکجاری سـەرناکەوێ بەسەریاندا.

(٢٠-٢١): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ ﴾:

کاتـێ کـە خـوا ﷻ هەواڵیـدا ئـەو لەگـەڵ بڕواداراندایـە، فەرمانـی پێکـردوون ئـەوەی کـە دەبێتـە هـۆی مانەوەیـان لـە پێویسـتیەکانی بڕواهێنـان بە جێـی بهێنن، دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ بـە جێبەجـێ کردنی فەرمانەکانیـانو دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانیان.
﴿ وَلَا تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ ﴾ واتـە: لـەم فەرمانـەدا کـە بریتیـە لـە گوێڕایەڵـی خـواو گوێڕایەڵـی

پێغەمبەرەکەی ﷺ ﴿وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ﴾ لە کتێبی خوا ﷻ کە دەخوێنرێ بەسەرتاندا، وە فەرمانو وەسیەتو ئامۆژگاریەکانی، پشت تێکردنتان لەم حاڵەتەدا لە بێزراوترینو ناشرینترینی حاڵەتەکانە ﴿وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ قَالُوا سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ واتە: ئەوەندە بەس نیە تەنها بە زارەکی بیڵێن بە بێ ئەوەی کردەوەی پێبکەن، بێگومان خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بەو باروودۆخە ڕازی نین، بڕوا هێنان بە ئاوات خواستن نیە، بەڵکو ئەوەیە کە لە دڵدا جێگیر دەبێو بە کردەوەش کاری پێ دەکرێ.

(٢٢-٢٣): ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ ۖ وَلَوْ أَسْمَعَهُمْ لَتَوَلَّوا وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللَّهِ﴾ نیشانەو ترسو ئاگادارکردنەوە هیچ سوودێکیان پێ ناگەیەنێت، ئەوان ﴿الصُّمُّ﴾ (کەڕن) لە بیستنی هەقدا ﴿الْبُكْمُ﴾ (لاڵن) لە قسە کردنی هەقدا، ﴿الَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ﴾ واتە: ئاقڵ نابنو بیر ناکەنەوە لەوەی کە سوودی هەیە بۆیان، وە گرنگی دەدەن بەوەی کە زیانی هەیە بۆیان، ئەوانە خراپترینی دروستکراوەکانی خوان ﷻ، چونکە خوای گەورە بیستنو بینینو دڵی پێدان بۆ ئەوەی لە گوێڕایەڵی خوا ﷻ بەکاری بهێنن، کەچی ئەوان بۆ سەرپێچی بەکاریان هێنا، وە بەو هۆیەوە خێرو چاکەیەکی زۆریان لە دەست چوو، ئەوان لە ئاستی ئەوەدا بوون ببن بە باشترینی دروستکراوەکانی خوا ﷻ، بەڵام ئەو ڕێگایەیان هەڵنەبژاردو ویستیان وابوو ببن بە خراپترینی دروستکراوو گیاندارەکانی خوا ﷻ.

ئەو بیستنەی کە خوا لێیان نەفی دەکات بیستنی دڵە، بەڵام بیستنی بەجێهێنانی بەڵگە ئەوە بێگومان بەڵگەی خوایان لەسەر پێویست بووە، بەو ئایەتو نیشانانەی کە بیستوویانە، ئەی بۆچی بیستنی بە کەڵک سوودی بە ئەوان نەگەیاند؟ لەبەر ئەوەی نەزانراوە خێرو چاکە لەواندا هەیە تا سوود لە بیستنی ئایەتو نیشانەکانی خوا وەربگرن.

﴿وَلَوْ عَلِمَ اللَّهُ فِيهِمْ خَيْرًا لَّأَسْمَعَهُمْ﴾ لە سەر ئەوەی کە پێویستەو وا دابنرێ ﴿لَتَوَلَّوا﴾ لە گوێڕایەڵی کردن ﴿وَّهُم مُّعْرِضُونَ﴾ واتە: لاناکەنەوە بۆ هەق بە هیچ شێوەیەک! ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا ﷻ ڕێگری بڕواهێنانو چاکە ناکات، تەنها بۆ کەسێک نەبێ کە خێری تێدا نەبێ، کەسێک کە خۆی پاک ناکاتەوەو هیچ بەرهەمێکی نابێت، سوپاسو ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لە هەموو شتێکدا حیکمەتو دانایی داناوە.

(٢٤-٢٥): ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ۖ وَاعْلَمُوا

﴿أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنكُمْ خَآصَّةً ۖ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٥﴾﴾:

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ ﴾ خوا ﷻ فەرماندەکات بە بەندە بڕوادارەکانی بەوەی کە پێویستە لە بڕواهێنان جێبەجێی بکەن ئەویش وەڵامدانەوەی خواو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ واتە: گوێڕایەڵی فەرمانەکانیانو پەلە کردن لە جێبەجێ کردنیدا، وە بانگەواز بۆ کردنیو دوورکەوتنەوە لەوەی کە قەدەغەیان کردوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ ئەمە وەسفێکە بۆ هەموو ئەوانەی کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بانگی بۆ دەکەن، وە ئاشکرا کردنی سوودو حیکمەتێتی، بێگومان ژیانی دڵو ڕووح بە پەرستشی خوا ﷻ بەندە، وە دەستگرتن بە فەرمانی خواو فەرمانی پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ بە بەردەوامی.

پاشان ئاگاداری کردوونەتەوە لە بە دەمەوە نەهاتنی خواو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ ﴾ ئاگاداربن نەکەن فەرمانی خوا ﷻ لە یەکەم ساتدا ڕەت بکەنەوە، چونکە بەربەست لە نێوانی ئێوەو وەرگرتنی نیشانەکان دروست دەبێ، وە دڵتان دەگۆڕێ، بە ڕاستی خوا ﷻ بەربەستێک دروست دەکات لە نێوان ئادەمیو دڵیدا، بە هەر شێوەیەک بیەوێ دڵەکان هەڵدەگێڕێتەوە، بۆیە پێویستە بەندەی خوا ﷻ بەردەوام ئەم زیکرە بکات {يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوب ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ ويا مصَرِّف القُلُوب إصْرِف قَلْبِي عَلَى طَاعَتِك} واتە: ئەی وەرگێڕەری دڵەکان، دڵم جێگیر بکە لەسەر ئاینەکەت، ئەی بگۆڕی دڵەکان دڵم وەرچەرخێنە بۆ لای بەندایەتی خۆت.

﴿ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾ واتە: کۆدەکرێنەوە لە ڕۆژێکدا کە هیچ گومانێکی تێدا نیە، چاکەکار بە چاکەکانی پاداشت دەدرێتەوە، وە خراپەکاریش بە خراپەکانی ﴿ وَٱتَّقُوا۟ فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنكُمْ خَآصَّةً ﴾ بەڵکو ستەمکارو غەیری ستەمکاریش تووشی دەبێت، لە کاتێکدا ستەمو تاوان بە ئاشکرا بکرێتو بەرپەرچ نەدرێتەوە، ئەوە بێگومان سزاو تۆڵە بکەرو بێجگە لە بکەریش دەگرێتەوە، وە خۆپارێزی لەم فیتنەیە بەو شێوە دەبێ کە ڕێگری بکات لە خراپەکاریو ئەهلی شەڕو خراپەکاری بێدەنگ بکرێت بە شێوەیەک کە نەتوانن سەرپێچیو ستەم بکەن.

﴿ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ بۆ کەسێک کە سەرپێچی بکاتو فەرمانەکانی خوا جێبەجێ نەکات.

وَاذْكُرُوا إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ تَخَافُونَ
أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم
مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٢٦) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا
لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ
(٢٧) وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ
عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ (٢٨) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَتَّقُوا
اللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ
وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ (٢٩) وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ
الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ
وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ (٣٠) وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ
آيَاتُنَا قَالُوا قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَا إِنْ هَٰذَا
إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ (٣١) وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا
هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ
أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٣٢) وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ
فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ (٣٣)

**(٢٦):** ﴿ وَاذْكُرُوا إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٢٦) ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرموێ: بە منەت کردن بەسـەر بەندە کانیـدا لەوەی کە سـەری خسـتن پاش ئـەوەی زەلیل بـوون، وە زۆری کردن پاش ئـەوەی کـە کـەم بـوون، وە دەوڵەمەنـدی کـردن پـاش ئـەوەی هـەژار بـوون دەفەرمـوێ: ﴿ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ ﴾ واتـە: بێدەسـەڵات بـوونو لـە ژێـر فەرمانـی غەیـری خۆتـان بـوون ﴿ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ ﴾ واتـە: بتانفرێنـنو تیرۆرتـان بکـەن.

﴿ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ ﴾ ولاتێکـی بـۆ دانـان کـە لەوێـدا بحەسـێنەوەو ئـارام بگـرن، وە لەسـەر دەسـتی ئێـوە دوژمنانتانـی تێکشـکاند، وە مـاڵو سـەروەتو سـامانە کانیان کەوتـە ژێـر دەسـتتان بـەو هۆیـەوە دەوڵەمەنـد بـوون.

﴿ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ واتـە: بـۆ ئـەوەی سوپاسـی خـوا ﷻ بکەن لەسـەر ئـەو منەتو چاکـە گـەورەی کـە ڕشـتوویەتی بەسـەرتاندا، بەوەی کـە بەندایەتـی دە کـەنو هاوەڵی بۆ پەیـدا ناکەن.

**(٢٧-٢٨):** ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ (٢٧) وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ (٢٨) ﴾:

خـوا ﷻ فەرمـان بە بەنـدە بڕوادارە کانـی دە کات کە ئەو ڕاسـپاردانەی خوا بەسـەریانەوەیە جێبەجێـی بکـەن لـە فەرمـانو قەدەغە کـراوە کان، چونکە ئەمانـەتو سـپاردە کان خوا ﷻ نیشـانی ئاسـمانە کانو زەویو چیاکانـی داوە، بـەڵام هیچیـان ڕازی نەبوون کـە هەڵیگرنو ترسـان لەو ئەمانەتە، کەچی مرۆڤ ئەو سـپاردەیەی هەڵگرت بەڕاسـتی ئەو زۆر سـتەمکارو

نەزانــە، هــەر کەسـێک ڕاسـپاردە بەجـێ بهێنێ ئەوە شایسـتەی پاداشـتی بێ پایانــە، وە هەر کەسـێک بەجێـی نەهێنێ، بەڵکـو خیانەتی لێـکات ئەوە شایسـتەی سـزایەو ناپاکی کردوە بەرانبــەر بــە خــواو پێغەمبــەر ﷺ ڕاسـپاردەکەی، وە دەروونــی خــۆی خســتۆتە گێــژاوی ناشــرینترین وەسـفەوە کە ئەویش خیانەتــە، بەو هۆیــەوە گەورەترینو تەواوترین سـیفەتی لە دەســت داوە کــە ئەمانەتو دەسـتپاکییە.

لــە کاتێکـدا کــە بەندە تاقــی دەکرێتەوە بــە مــاڵو منداڵی، هەنـدێ جار خۆشویسـتنی ئەوە وای لێـدەکات نەفـسو دەروونی پێش بخـات بەسـەر بەجێهێنانی ڕاسـپاردەو ئەمانەتەکەیدا، بۆیــە خــوا ﷻ هەواڵیــداوە کە ماڵو منــداڵ هــۆی تاقیکردنەوەیە، خــوا ﷻ بەندەکانی خۆی پێتاقــی دەکاتــەوە، وە ئــەو منداڵانــە قەرزو ســەلەمەن، دەبــێ بدرێتەوە بەو کەســەی کە پێی بەخشـیوە ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴾ئەگــەر ئێــوە عەقــڵو بۆچوونتان بــێ، فەزڵو چاکــەی گــەورەی خــوا ﷻ ناگۆڕنەوە بــە چێژێکی کەمو کۆتایــی پێهاتــوو، مرۆڤی عاقڵ پێوانــە لە نێــوان شــتەکاندا دەکات، ئەوەی لە پێشــترە پێشــی دەخات.

(٢٩): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٢٩ ﴾

جێبەجــێ کردنــی فەرمانەکانی پەروەردگــار بۆ پارێــزکاری کردنی پەروەردگار ناونیشــانی خۆشـبەختیو نیشــانەی ســەرکەوتنە، خــوا ﷻ لــە خۆپارێــزیو لــە خواترســاندا خێــرو پاداشـتێکی بــێ ئەنـدازەی دیــاری کــردوە لــە دنیــاو دوا ڕۆژدا، لێرەدا باســی کــردوە هەر کەسـێک لــە خوا ﷻ بترســێ چوار شــتی دەســت دەکــەوێ هەر یەکەیــان لەویتر باشــترە:

یەکــەم: (الفرقــان) جیاکردنــەوەی هەق لــە ناهــەق، ئەویش بریتیــە لە زانســتو هیدایەت، کــە خاوەنەکــەی وا لێـدەکات هیدایــەتو گومڕایــیو هــەقو ناهــەقو حەڵاڵو حــەڕام لە یەکتــر جیــا بکاتــەوە، وە بە هەمان شـێوە خۆشـبەختان لــە بەدبەختــان جیادەکاتەوە.

دووەمو سـێیەم: (تکفیر السیئات) واتــە: ســڕینەوەی تاوانــەکان، وە (مغفرة الذنـوب) واتە: لێخۆشـبوونی گوناهــەکان، هــەر یەک لــەو دووانە لە ناو ئەویتر دایە بە شـێوەیەکی گشـتی، بــەڵام لە کاتــی کۆکردنەوەدا (تکفیر السیئات) بە مانای ســڕینەوەی گوناهــە بچووکەکان دێــت، وە (مغفرة الذنـوب) بە مانای لێخۆشـبوون لــە تاوانە گــەورەکان دێت.

چــوارەم: پاداشـتی گەورەو بــێ پایان بۆ کەسـێک کە لێــی بترســێ، وە ڕەزامەندی خوا ﷻ پێــش بخات بەســەر ڕەزامەندی نەفسو دەروونیــدا ﴿ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾

(٣٠): ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾:

﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾ واتــە: بیــر بکەرەوە ئەی پێغەمبەر ﷺ لــەو فەزڵو چاکانەی خــوا ﷻ بەســەرتەوە، کاتێــک کە بتپەرســتان لــە (دار الندوة)واتــە: پیلانیان گێــرا لە دژت تــا کــۆتو بەنــدت بکــەن، یــان بتکــوژن -بــە گومانــی خۆیــان ڕزگاریــان بێ لە شــەڕو خراپــەکاری تــۆ. یــەک دەنــگ بــوون لەســەر بۆچوونــی خراپترین کەســیان ئەبــو جەهل نەفرینــی خــوای لێبێ کــە لە هەموو تیــرەو هۆزێــک گەنجێک دیــاری بکەن شمشــێرێکی تیــژی بــدەن بە دەســتەوە تا بــە کۆمەڵ بیکــوژنو لە نێــوان هۆزەکانــدا ون بــێ، ئەو کات بــە ناچــاری هۆزی بەنــی هاشــم ڕازی دەبن بە خوێــن باییەکــەی، چونکە دەســەڵاتیان نابێ لــە ڕووبــەڕوو بوونــەوەی هەموو بتپەرســتانی قورەیشــدا، بۆیە پلانیــان بۆ پێغەمبــەر ﷺ دانا، لــە شــەوێک لە شــەوەکاندا کاتێک لەســەر جێگاکــەی هەڵدەســێ پەلاماری بــدەن، وەحیو نیگــای لە ئاســمانەوە بــۆ هات ئەویــش بــە ڕوویاندا دەرچــوو مشــتێ خۆڵــی ڕووبەڕوویان فڕێــدا خــوا ﷻ چاوەکانــی کوێــر کــردن، تــا خــاو بوونــەوە، کەسێــک هــات بــۆ لایان وتــی: دەک خــوا بــێ ئومێدتان بــکات پێغەمبــەر ﷺ دەرچوو خۆڵی هاویشــت بەســەرتاندا، هــەر یــەک لەوانە تۆزی لەســەر ســەری خۆی لادەبــرد، خــوای گــەورە پێغەمبەرەکەی ﷺ پاراســت لێیــان، وە فەرمانــی پێکردن بــە کۆچکردن خــۆیو هاوەڵانی بۆ مەدینــە، خوا ﷻ پشــتیوانی لێکــرد بــە کۆچکەرانو پشــتیوانان، وە بــەردەوام پێغەمبەر ﷺ ســەربەرز بوو تا بە زەبری هێز ڕۆشــتە ناو شــاری مەککــە، وە زاڵ بوو بەســەر خەڵکەکەیداو هەموویانی خســتە ژێــر ڕکێــفو فەرمانی خۆیــەوە، پاش ئــەوەی کە لەوێ دەرچوو دەترســا لە نەفســی خۆی، پاکــی بــۆ ئەو خوایەی کــە چەندە نــەرمو نیانــە بەرانبەر بــە بەندەکەی، کە هیــچ کەس لەم دنیایەدا ســەرناکەوێ بەسەریدا.

(٣١-٣٤): ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا قَالُوا قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَا ۙ إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ هَٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِنْدِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ ۚ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾:

خـوا ﷻ لـە ڕوون کردنـەوەی سەرکێشـیو کەللـە ڕەقـی ئەوانـەی کـە پێغەمبـەر ﷺ بـە درۆ دەزانـن، دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا ﴾ کـە بەڵگەیـە لـە سـەر ڕاسـتی پەیامـی پێغەمبـەر ﷺ ﴿ قَالُوا۟ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ ئەمـە یەکێکـە لـە یاخـی بـوونو سـتەمەکانیان، ئەگەرنـا خـوا ﷻ تەحەددای کـردوون کـە سـوورەتێک لـە سـوورەتەکانی قورئـان بهێنـن، وە بانگـی هـەر کەسـێک دەکـەن بـۆ ئـەو مەبەسـتە جگە لە خـوا (بانگیـان بکـەن) بێگومـان نەیانتوانی ئـەوە بکەن، بۆیـە بـێ تواناییـان دەرکەوت، ئـەم وتەیە کـە ئەم کەسـە دەیڵێ تەنهـا بانگەشـەیە واقیعو ڕاسـتی بـە درۆی دەخاتـەوە، بـە دڵنیاییەوە زانـراوە موحەممـەد ﷺ نەخوێندەوارە نـە ئەزانێ بخوێنـێو نە ئەزانێ بنووسـێ، وە گەشـتی نەکردوە بۆ ئەوەی شـارەزای هەواڵـی نەتەوەکانی پێشـین بێـت، ئـەم کتێبە پیـرۆزەی هێناوە کـە بەتاڵـی ڕووی تێنـاکات نە لە ئێسـتاو نە لە دواڕۆژدا، چونکـە لـە لایەن خوا ﷻ کاردروسـتی سـتایش کـراوەوە نێردراوەتـە خوارەوە ﴿ وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ ﴾ کە موحەممەد ﷺ بانگەشـەی بـۆ دەکات ﴿ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ ئـەم وتەیـان لەسـەر ئـەوە کـرد کـە زۆر یەکلا بـوون لەسـەر پووچیو بـێ بنەمایـی، وە ئەوەنـدە نەفام بـوون نەیاندەزانـی چـی دەڵێن، ئەگەر ئەوان بیان ویسـتبایە ئـەو گومانەی کـە هەیانە بۆیان ڕوون ببێتـەوە وا پێویسـت بـوو لە بەرانبەر ئەو کەسـەی کە بانگەشـە بۆ هـەق دەکاو دەڵێ هـەق لـە لای منـە بیـان وتبـا: ئەگەر ئـەوە ڕاسـتە لە لایـەن تـۆوە ئـەوە تێمـان بگەیەنەو ڕێنماییمـان بکـە ئـەوە باشـتر بوو بۆیـان. بـەڵام کاتێک وتیـان: ﴿ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ ﴾ تەنهـا بـە وتنـی ئـەم قسـەیەیان دەرکـەوت کـە ئەوانـە گەمـژەو نەفـامو سـتەمکارن، ئەگەر خوا ڕاسـتەوخۆ سـزای بدابوونایە ئەوە کەسـیان نەدەمـان، بەڵام بـە هـۆی بوونـی پێغەمبـەرەوە ﷺ لـە نێوانیاندا سـزای بـە پەلەی لەسـەر هەڵگرتـن، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ﴾ بوونـی پێغەمبـەر ﷺ لـە ناویاندا هـۆکاری ئـەوە بوو کـە سـزا نەدرێن، بەڵام ئـەوان لەگـەڵ ئەو وتـەدا کە بە ئاشـکراو بێ باکانـە دەیانـوت دەیانزانـی چەنـدە خراپە، دەترسـان خـوا ﷻ بـەو هۆیەوە سـزایان بدات، ئنجـا داوای لێبوردنیـان دەکرد بۆیە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾ ئەمـە ڕێگریەکـە ڕێگریـان لێـدەکات کە تووشـی سـزا نەبن پـاش ئەوەی کـە هۆکارەکانی بەجـێ دێت،

وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ
ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓا۟ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ
وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ
عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ
بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ
أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ
عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ
يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ
ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُۥ
فِى جَهَنَّمَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٣٧﴾ قُل لِّلَّذِينَ
كَفَرُوٓا۟ إِن يَنتَهُوا۟ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُوا۟
فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ
لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ
ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِن تَوَلَّوْا۟
فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ ۚ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٤٠﴾

پاشـان دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ﴾ واتە: چ شـتێک ڕێگریـان لێدەکات لـە سـزای خـوا ﷻ لـە کاتێکـدا ئـەوان ڕێگـری خەڵکـی دەکـەن لـە مزگەوتـی حـەڕام بـە تایبـەت کاتێـک کـە ڕێگریان کـرد لـە پێغەمبـەر ﷺ هاوەڵانـی لـە کاتێکـدا ئەمـان لە پێشـتر بوون لـە ئەوان، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا كَانُوٓا۟﴾ واتە: بتپەرسـتەکان ﴿أَوْلِيَآءَهُۥٓ﴾ دەگونجـێ ڕاناوەکـە بگەڕێتـەوە بـۆ خـوا ﷻ، واتـە: دۆسـتانو پشـتیوانانی خـوا ﷻ، وە دەگونجـێ بگەڕێتەوە بۆ مزگەوتـی حەڕام، واتـە: ئـەوان لـە پێشـتر نین لە کەسـانی تر ﴿إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ﴾ ئەوانـەی کە بروایـان هێنـاوە بـە خـواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، خـوا بە تاکـو تەنهـا دەپەرسـتنو بەندایەتی بـۆ دەکەنو دڵسـۆزی بـۆ دەنوێنـن ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بۆیە بانگەشـەی شـتێکیان دەکـرد کـە غەیـری وان لـە پێشـتر بـوو بۆی

(٣٥): ﴿وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾﴾:

واتـە: خـوا ﷻ ماڵـی حەڕامی پیـرۆزی بۆ ئەوە دانـاوە کە ئاینەکـەی تێدا جێبەجـێ بکرێ، وە بـە دڵسـۆزی پەرستشـی تێدا بکـرێ، تەنها بڕواداران بەم کارە هەڵسـان، بەڵام بتپەرسـتان ئەوانـەی کـە ڕێگریـان دەکـرد، نوێژەکانیـان کـە گەورەتریـن جۆرەکانـی پەرسـتن بوو بریتـی بـوو لـە ﴿إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً﴾ واتـە: فیکـەو چەپڵـە لێدانیان ئەنجـام دەدا، ئـەوە کاری ئـەو نەفامانـە بـوو کە تـرسو هەیبەتی خوا ﷻ لـە دڵیانـدا نەبـوو، وە ڕێزیان لـەو شـوێنە پیـرۆزە نەدەگـرت، ئەگـەر ئەمـە نوێژەکانیـان بێت تیایـدا، کـە گەورەترین پەرسـتنە، دەبـێ پەرسـتنەکانی تریـان چـۆن بێ؟! کێ لـە بڕواداران لە پێشـتر بوو بـەم ماڵە پیـرۆزە؟ کە خوا دەربارەیان فەرموویەتـی: ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ

﴿عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ۝٣﴾ المؤمنون. واتـە: تا کۆتایی ئەو وەسـفە جوانانـەی کە خوا ﷻ کردوونی.
بێگومـان خـوا ﷻ ماڵی پیـرۆزی حەرامی کـردوە بە میراتگـری ئەوانو دەسـەلاَتی پێدان، وە -پـاش ئەوەی دەسـەلاَتی پێدان تیایـدا- پێیان دەفەرمـوێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ ۝٢٨﴾ التوبة. (ئـەی ئەوانـەی برواتـان هێنـاوە! بە دڵنیاییـەوە هاوبـەش بۆ خوادانـەرەکان پیسـن, بۆیە با پـاش ئەم سـاڵ «سـاڵی نۆیەمـی کۆچی» توخنـی مزگەوتـی حەرام نەکـەون..).
وە لێـردا دەفەرمـوێ: ﴿فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ﴾ (دە سـزا بچێـژن بـە هـۆی ئـەوەی بێبروا بـوون).
(٣٦-٣٧): ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيۡهِمۡ حَسۡرَةٗ ثُمَّ يُغۡلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحۡشَرُونَ ۝٣٦ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجۡعَلَ ٱلۡخَبِيثَ بَعۡضَهُۥ عَلَىٰ بَعۡضٖ فَيَرۡكُمَهُۥ جَمِيعٗا فَيَجۡعَلَهُۥ فِي جَهَنَّمَۚ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ۝٣٧﴾
لـەم دەقـەدا خـوا ﷻ دژایەتیو فـرتو فێڵی بتپەرسـتان ڕوون دەکاتـەوە، وە پەرپا کردنی جەنـگ لە دژی خـواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە هەوڵدانیان بۆ کوژاندنـەوەی نووری خواو ﷻ و سـڕینەوەی، دەرەنجامـی فێڵەکەیـان دەگەڕێتـەوە بـۆ خۆیـان، فێـڵو پلانی خـراپ تەنها زیـان بـە خاوەنەکـەی دەگەیەنێـت، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتـە: بـۆ ئـەوەی هـەق پووچو بەتـاڵ بکەنـەوەو پووچو بەتاڵیـش سـەربخەن، وە یەکتاپەرسـتی خـوای میهرەبـان پووچ بکەنـەوەو ئاینی بـێ بنەمای بتپەرسـتی لە جێـی دابنێن.
﴿فَسَيُنفِقُونَهَا﴾ واتـە: لەمـەودوا ماڵو سـامانیان دەبەخشـن، تـا بیانگەیەنێـت بە پووچو بەتـاڵ، بـە هۆی ئـەوەی زۆر ڕق ئەسـتورن بەرانبەر بە هەقو ڕاسـتی، پاشـان لـە داهاتوودا ئـەو ماڵو سـامانە دەبێـت بە ﴿عَلَيۡهِمۡ حَسۡرَةٗ﴾ واتـە: داخو پەژارەو ڕیسـواییو زەلیلی، پاشـان ﴿يُغۡلَبُونَ﴾ مـاڵو سـامانەکانیان دەڕوات، وە لـە ڕۆژی دواییـدا بـە توندتریـن شـێوە سـزا دەدرێن، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحۡشَرُونَ﴾ واتە: کۆ دەکرێنـەوە بـۆ ئەوەی سـزاکەی بچێـژن، چونکە ئەوێ شـوێنی پیسو پیسـەکانە.
خـوا ﷻ دەیەوێـت پیـس لـە پـاک جیـا بکاتـەوە، وە پیـسو ناپاکـەکان لەسـەر یـەک

هەڵچنێـت، لـە کـردەوەو مـاڵو سـامانو کەسـەکان ﴿فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُۥ فِى جَهَنَّمَ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ﴾ بێگومـان زەرەرمەنـدان کەسـانێکن کـە خۆیـانو کەسـوکاریان لـە ڕۆژی دوایـیدا لـە دەسـت داوە.

(٣٨-٤٠): ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِن تَوَلَّوْاْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٤٠﴾﴾:

ئەمـەش لـە میهرەبانـیو بەزەیـی خوایە بـۆ بەندەکانی، نـە بێبڕوایيو نـە بـەردەوام بوونیان لەسـەر یاخـی بـوون، ڕێگری لێ نـاکات لەوەی کـە هانیان بدات بـۆ ڕێنمایـیو هیدایەت، وە قەدەغەیـان لـێ بـکات لـە هۆکارەکانـی گومرابـوون، دەفەرمـوێ: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ﴾ لـە بێبڕواییـان، وە مسـوڵمان بـن بـۆ خـوای تـاکو تەنهـا کـە هیـچ هـاوەڵو شـەریکێکی نیـە ﴿يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ﴾ چاوپۆشـی دەکـرێ لـەو ستەمانەی کـە کردوویانـە ﴿وَإِن يَعُودُواْ﴾ بـۆ بێبڕوایـیو یاخـی بـوون ﴿فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾ بـە لـە ناو بردنـی ئەو گەلانـەی کە بـە درۆی دەخەنەوە، با تەماشـا بکـەن بزانـن کەللـەڕەقو یاخی بـووەکان چیان بەسـەر هات، لە مـەودوا هەواڵـی ئەوانەیان بـۆ دێت کـە گاڵتەیـان پێدەکرد، ئەمە قسـەکردنە لەگـەڵ ئەوانـەی کە بـە درۆی دادەنێن. بـەڵام قسـە کـردن لەگـەڵ بڕواداراندا کاتـێ فەرمانـی پێکردوون بـە مامەڵەکـردن لەگەڵ بێبڕواکاندا، دەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ واتە: شـیرکو بتپەرسـتی، وە ڕێگـر کردنـی ئاینی خـوا ﷻ، وە ملکەچکردنیان بە فەرمانەکانی ئیسـلام ﴿وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ﴾ ئامانـج لـە کوشـتارو جیهاد کـردن ئەوەیە شـەڕو خراپەیـان لە ئاین دووربخرێتـەوە، وە ئـەوەش لەسـەر ئایین لا بدرێت کـە هەموو دروسـتکراوەکان لە پێناویدا دروسـتکراون، تـا تەنهـا ئاینـی خـوا ﷻ شـەکاوەو بەرز بـێ بەسـەر سـەرجەم ئاینەکانەوە ﴿فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ﴾ لـەو سـتەمەی کـە لەسـەری دەڕۆن ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ هیچ شـتێکی لێ ناشـاردرێتەوە ﴿وَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ لە گوێڕایەڵـیو خۆیان وێڵ کرد ﴿فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ﴾ کە پشـتیوانی لە بەنـدە بڕوادارەکانی دەکات، وە چـی بەرژەوەنـدی تێدایـە بـۆ دنیـاو دواڕۆژیـان ئاسـانی دەکات ﴿وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ﴾ ئـەو خوایـەی کە سـەریان دەخـاتو فێڵی خراپەکاریـان لـێ دوور دەخاتەوە.


وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾ إِذْ أَنتُم بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا وَهُم بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَىٰ وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ ۚ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَاخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ ۙ وَلَٰكِن لِّيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ ۗ وَإِنَّ اللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ إِذْ يُرِيكَهُمُ اللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلًا ۖ وَلَوْ أَرَاكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٤٣﴾ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ الْتَقَيْتُمْ فِي أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِي أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ ﴿٤٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾

(٤١-٤٣): ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾ إِذْ أَنتُم بِالْعُدْوَةِ الدُّنْيَا وَهُم بِالْعُدْوَةِ الْقُصْوَىٰ وَالرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ ۚ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَاخْتَلَفْتُمْ فِي الْمِيعَادِ ۙ وَلَٰكِن لِّيَقْضِيَ اللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ ۗ وَإِنَّ اللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ إِذْ يُرِيكَهُمُ اللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلًا ۖ وَلَوْ أَرَاكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَازَعْتُمْ فِي الْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٤٣﴾﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ﴾ واتە: لە ماڵی بێبڕواکان دەست کەوت بە زەبرو زۆرە، زۆر بێ یان کەم ﴿فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ﴾ واتە: ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ ئێوەیە، لەبەر ئەوە دەستکەوتی داوەتە پاڵیانو پێنج یەکی لێ دەرکردوە، بەڵگەیە لەسەر ئەمە ئەوەی کە دەمێنێتەوە بۆ ئەوانە، دابەشی دەکەن وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ دابەشی کردوە، ئەو جەنگاوەرەی بە پێی (پیادە) جەنگ دەکات یەک بەشی بەر دەکەوێ، وە ئەوەشی بە ئەسپ جەنگ دەکات دوو بەشی بەر دەکەوێت، بەشێک بۆ خۆیو بەشێک بۆ ئەسپەکەی، بەڵام ئەم پێنج یەکە، دەکرێت بە پێنج بەشەوە، بەشێک بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، لە بەرژەوەندی گشتی مسوڵماناندا خەرج دەکرێ، بە بێ دیاریکردنی بەرژەوەندی تایبەت، چونکە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەوڵەمەندن پێویستییان بەوە نیە، کەواتە زانرا ئەوە بۆ بەندەکانی خوایە، ئەگەر خوا ﷻ دیاری نەکردبێ بۆ چ شتێک خەرج بکرێت، کەواتە بەڵگەیە بۆ بەرژەوەندی گشتی خەرج بکرێت.

پێنـج یەکـی دووەم، بـۆ خـزم‌و کەسـەکانی پێغەمبـەرە ﷺ لـە نەوەکانی هاشـم‌و نەوەکانی موتتەلیـب، وە خـوا ﷻ داویەتـیٰ پـاڵ خزمایەتـی، ئەمە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی هۆکارەکە تەنهـا خزمایەتیـە، دەوڵەمەنـدو هـەژارو نێرو مـێ وەک یەک بەریـان دەکەوێ.

پێنـج یەکی سـێیەم: بـۆ هەتیوەکانـە، ئەوانەن کـە باوکیان لە دەسـت داوەو هێشـتا منداڵن، خـوا ﷻ پێنـج یەکـی بـۆ دیـاری کـردوون، وەک سـۆزێک بۆیـان، لـە کاتێکـدا ئەوان ناتوانـن بەرژەوەنـدی خۆیـان بەڕێـوە ببـەن، ئـەوەی بەرژەوەندیـان بەڕێوە دەبـات کۆچی کـردوەو نەماوە.

وە پێنـج یەکـی چوارەم: بـۆ هەژارەکانە، ئەوانەی کـە داهاتیان پێویسـتیەکانیان پڕناکاتەوە، لە منـداڵ‌و گـەورەو نێرو مێ.

پێنـج یەکـی پێنجـەم: بـۆ ڕێبـوارە، ئەو کەسـەیە کـە دوورە لە کەسـوکاری‌و لە شـارێکی تـرە، هەنـدی لـە توێژەرەوانـی قورئـان دەڵێـن: پێنج یەکـی دەسـتکەوت لـە یەکێک لەم کۆمەڵانـە دەرناچـێ، وە پێویسـت نیـە بـۆ هەموویـان وەک یەکتـر بـێ، بەڵکـو بـە پێـی بەرژەوەنـدی پێیـان دەدرێ، ئـەم بۆچوونـە لە پێشـترە.

خـوا ﷻ پێدانـی پێنـج یەکـی کردوەتە مـەرج کـە دەبێ بـڕوادار بـێ، دەفەرمـوێ: ﴿ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ ﴾.

ئەویـش جەنگـی (بـدر) بوو، خـوا ﷻ لـەو ڕۆژەدا هـەق‌و ناهەقی لـە یەکتـر جیاکردەوە، هەقـی دەرخسـت‌و ناهەقیشـی ڕیسـواو سەرشـۆڕ کـرد ﴿ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ﴾ کۆمەڵی مسـوڵمانان‌و کۆمەڵـی بێبڕوایـان، واتـە: ئەگـەر ئێـوە بڕواتان بـە خوا ﷻ هەیـە، وە بەوەی دایبەزانـدوە بـۆ سـەر پێغەمبەرەکـەی ﷺ لـە ڕۆژی فورقانـدا، کـە ئـەو نیشـانەو بەڵگانەی تێـدا بەجـێ هـات، ئـەوە بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی ئـەو پەیامـەی کـە هێناویەتـی هـەق‌و ڕاسـتە ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ هـەر کەسـێک بیەوێ زاڵ بێ بەسـەریدا شکسـت دەخـوات ﴿ إِذْ أَنتُم بِٱلْعُدْوَةِ ٱلدُّنْيَا ﴾واتـە: کاتـێ کـە ئێـوە لای خوارووی شـیوەکەی لای مەدینـە بـوون، ئەوانیـش لـە لای سـەرووی شـیوەکەی دوورتـر لـە مەدینـەدا بـوون، خـوا ﷻ بـە ویسـتی خـۆی لە یەک شـیودا کـۆی کردنـەوە ﴿ وَٱلرَّكْبُ ﴾ ئـەوەی کە دەرچـوو بـۆ بەدەسـت هێنانـی، وە خوا ﷻ شـتێکی تری ویسـت ﴿ أَسْفَلَ مِنكُمْ ﴾ لە خـوار ئێـوە نزیـک دەریـا ﴿ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ ﴾ ئێوەو ئەوان لەسـەر ئەو وەسـفەو بـەو حاڵە ﴿ لَٱخْتَلَفْتُمْ فِى ٱلْمِيعَـٰدِ ﴾ واتـە: پێـش‌و پـاش دەکەوتـن، یان شـوێنەکانتان بـە جیاواز

هەڵدەبـژاردو لێتـان دەگـۆڕا، یان بێجگە لـەوە نەدەگەیشـتن بەیەکتر لە کاتـی بەڵێنەکەتاندا ﴿وَلَٰكِن﴾ واتـە: بەڵکـو خوا بەو شـێوە کـۆی کردنـەوە ﴿لِّيَقْضِيَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾ واتـە: لـە ئەزەلـدا بەدیهاتـوەو دەبـێ ببێـت ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ﴾ واتـە: تـا ببێتـە بەڵگـە بـۆ ئـەو کەسـەی کـە سەرسـەختی دەکات، بە ویسـتی خـۆیو بە بەرچـاو ڕوونـی کوفر هەڵبژێرێـت، وە هیـچ بیانوویەکی نەمێنێـت ﴿وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ﴾ واتـە: بـڕوادار زیاتر دڵنیایـیو حەقیقەتی بـۆ دەربکەوێ، بەوەی کـە خوا ﷻ ئەو دوو دەسـتەیەی پـێ پێشـان دەدات، کـە ئەوە بەڵگـەو ئاماژەیە بـۆ ئەوانەی بەرچـاو ڕوونن ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ بیسـەرە بـە هەمـوو دەنگـەکان، بـە جیـاوازی زمانەکانو چۆنیەتـی پاڕانەوەیـان، زانایـە بە ئاشـکراو نهێنی.

(٤٣-٤٤): ﴿إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا ۖ وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤٣﴾ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِيَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤٤﴾﴾:

خـوا ﷻ لـە خەودا بتپەرسـتانی پێشـانی پێغەمبـەردا ﷺ ژمارەیان کەم بـوو، ئەویش مژدەی دا بـە هاوەڵەکانـی، ئەوانیـش دڵیان چەسـپاو وئـارام بوونـەوە، ﴿وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا﴾ واتـە: خـۆ ئەگـەر خـوا ﷻ دەربـارەی ژمـارەی ئـەوان هەواڵـی بدابووایـە هاوەڵەکانـت ﴿لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ﴾ هەندێکتان پێشـنیاری شـەڕی دەکرد، وە هەندێکتان پێشـنیاری ئـەوەی نەدەکرد، جیـاوازیو دووبەرەکی دەکەوتـە نێوانتانەوە، تـا دەبووە مایەی شکسـتو تیاچوونتان ﴿وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ﴾ سـۆزداری نوانـد بەرانبەرتان ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ واتـە: لـەوەی کە تیایدایـە لە جێگیر بـوونو پێچەوانەکەی، وە ڕاسـتیو درۆ، خـوا ﷻ بـە دڵەکانتانـی زانـی، بە نـەرمو نیانیو چاکەی خـۆی لەگەڵتانـدا جوڵایەوە، خـوا ڕاسـتی فەرمـوو لەو خـەوەی کـە پێشـانی پێغەمبەرەکەیـدا، بە هەمان شـێوە پێشـانی بڕوادارانیـداو دوژمنانـی لەبـەر چاویـان کـەم کـردەوە، وە ئـەی بـڕواداران! خوا ئێوەشـی لەبـەر چـاوی ئـەوان بە کـەم پێشـاندا، هەر یـەک لـەو دوو دەسـتەیە دەسـتەکەی تری بە کـەم دەهاتـە پێـش چـاو، بـۆ ئـەوەی هەریەکەیـان دەستپێشـخەری بـکات بۆ کوشـتاری ئـەوی تـر، ﴿لِيَقْضِيَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا﴾ لە سـەرکەوتنی بڕوادارانو تێکشـکانی بێبـڕواکان، وە کوشـتنی سـەرۆکو دەسـەڵاتدارە گومڕاکانیـان، هیـچ کەسـێک لەوانـە

ناوێکیـان نەبـوو کە بـاس بکرێت، دوایی ئاسـان بـوو ئەگەر بانگـەواز بکرێن بۆ ئیسـلامو ملکـەچ بـن بۆی، بـە هەمان شـێوە نـەرمو نیانیەک بـوو بەرانبـەر ئەوانەی تر کـە خوا ﷻ بـە ئیسـلام منەتـی خـۆی کـرد بەسـەریاندا ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ﴾ واتـە: هەمـوو کاروبـاری دروسـتکراوەکان دەگەڕێنـەوە بـۆ لای خوا ﷻ، پاشـان پاکو پیـس لە یەکتر جیـا دەکاتـەوە، وە دادوەری لـە نێـوان دروسـتکراوەکاندا دەکات بە حوکمێکـی دادوەرانە کە هیـچ سـتەمێکی تێـدا نیە.

(٤٥-٤٩): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٤٥﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٤٧﴾ وَإِذۡ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٞ لَّكُمۡۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلۡفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكُمۡ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمۡۗ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٤٩﴾﴾.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ﴾ واتـە: دەسـتەیەک لـە بێبـڕواکان دەجەنگن بەرانبەرتان ﴿فَٱثۡبُتُواْ﴾ لە جەنگو کوشـتار کردندا، لەسـەر خۆبنو جڵـەوی دەروونـی خۆتـان بکەن لـە کاتی ئـەو عیبادەتـە گەورەیـەدا کە سـەرەنجامەکەی سـەربەرزیو سـەرکەوتنە، وە یـادی خـوا ﷻ زۆر بکـەن ﴿لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾ واتـە: ئـەوەی چاوەڕوانـی دەکـەن لە سـەرکەوتن بـە دەسـتی دێنن، ئـارام گرتنو پابەنـد بوونو زۆر یـاد کردنـەوەی خوا ﷻ لـە گەورەتریـن هۆکارەکانی سـەرکەوتنە.

وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُوا۟ فَتَفْشَلُوا۟ وَتَذْهَبَ
رِيحُكُمْ ۖ وَٱصْبِرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُوا۟
كَٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ
عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٤٧﴾ وَإِذْ زَيَّنَ
لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ
ٱلنَّاسِ وَإِنِّى جَارٌ لَّكُمْ ۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلْفِئَتَانِ نَكَصَ
عَلَىٰ عَقِبَيْهِ وَقَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكُمْ إِنِّىٓ أَرَىٰ مَا لَا
تَرَوْنَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ ۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذْ يَقُولُ
ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمْ ۗ
وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٩﴾ وَلَوْ
تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۙ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ
وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ
بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٥١﴾
كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ ۙ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ
فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٥٢﴾

﴿وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ لە بەجێ هێنانی ئەوەی فەرمانی پێکراوە، وە هەنگاونان بە شوێنی ئەوەدا لە هەموو کاتەکاندا ﴿وَلَا تَنَٰزَعُوا۟﴾ جیاوازیەک بیێتە مایەی دووبەرەکیو بەش بەش بوون ﴿فَتَفْشَلُوا۟﴾ واتە: بترسن ﴿وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾ واتە: تواناتان نەمێنێو هێزتان لەتو پەت بکرێو سستو لاواز بن، بەو هۆیەوە سەرکەوتنتان لەسەر هەڵبگیرێو بەرز بکرێتەوە ﴿وَٱصْبِرُوٓا۟﴾ دەروونتان (خۆڕاگر بێ) لەسەر گوێڕایەڵی خوا ﷻ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ﴾ بە پشتیوانیو سەرکەوتنو هاوکاریو ترسان لە خوا ﷻ. لە پەروەردگارتان بترسنو بۆی ملکەچ بن ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ خَرَجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرًا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ئەمە ئامانجی دەرچوونیانە، ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی دەربچن، بە مەبەستی ڕیاییو خۆبەزل زانینە لەسەر زەویدا، لەبەر ئەوەی خەڵکی تەماشایان بکات شانازی پێوە بکەن، مەبەستی گەورەو ڕاستەقینەیان ئەوە بوو بۆ دژایەتیو ڕێگری لە بڵاو بوونەوەی ئاینی خوا ﷻ دەربچن.

﴿وَٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ﴾ بەو شێوە هەواڵی مەبەستەکانی ئەوانی پێدان، وە ئاگاداری کردنەوە کە خۆیان بەوان نە شوبهێنن، بێگومان لەسەر ئەو کردارە بە خراپترین شێوە سزایان دەدات، با لە دەرچوونتاندا تەنها مەبەستتان بۆ خوا ﷻ بێ، وە بەرزکردنەوەی ئاینی ئیسلام، وە ڕێگری کردن لە وەی کە دەبێتە مایەی تووڕەییو سزا، وە خەڵکی ڕابکێشن بۆ لای ئاینی بەهێزو پتەوی خوا ﷻ کە دەیانگەیەنێت بە بەهەشت.

﴿وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ جوانی کرد لە دڵەکانیاندا ڕازاندیەوەو فێڵی لێکردن ﴿وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلْيَوْمَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾ واتە: بێگومان ئێوە ئەمڕۆ لە خۆ ئامادەکردنو ژمارەدا لەوان بەهێز ترن، موحەممەد ﷺ هاوەڵانی ناتوانن ڕووبەڕووتان

بینــەوە ﴿ وَإِنِّي جَارٌ لَّكُمْ ﴾ لــەوەی کــە کەسـێک ڕوبەڕووتــان بێتــەوە لەوانەی کە لێیــان دەترســن، چونکــە ئیبلیــس خۆی لە ســەر شـێوەی ســوراقەی کــوڕی مالکــی کوڕی جوعشــومی مەدلەجی پێشــان دا، وە بتپەرســتانی قورەیش دەترســان لە هــۆزی بەنی مەدلەج، چونکــە کێشــەو ئاژاوەیــان هەبــوو لەگەڵیاندا، شــەیتان پێی وتــن: منیش بۆ خۆم پشــتیوانو هاوکارتانــم، بۆیــە دەروونیــان ئــارام بــوو، وە دڵنیا بــوون، هاتن وایــان دەزانی کــە دەتوانن بــێ بەشـیان بکەنو ســەرکەون بەســەریاندا ﴿ تَرَاءَتِ الْفِئَتَانِ ﴾ بــڕواداران‌و بێبڕوایان لەو کاتــەدا شــەیتان جبریلــی بینــی کــە فریشــتە دادەبەزێنــێ ترسـێکی زۆر ڕووی تێکــرد، وە ﴿ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ﴾ واتــە: پشــتی تێکــردن‌و هەڵهــات ﴿ وَقَالَ ﴾ وتیــە: ئەوانــەی کە فێڵــی لێکــردن‌و هانــی دان: ﴿ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكُمْ إِنِّي أَرَىٰ مَا لَا تَرَوْنَ ﴾واتە: لەوە دەترســم کــە لــە دنیادا ســزام بۆ پێــش بخــرێ ﴿ وَاللَّهُ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾.

وە دەگونجــێ شــەیتان ختــورەی خســتبێتە نــاو دڵیانــەوەو فریــوی دابــن، کــە ئەمــڕۆ هیچ کەسـێک نیــە لەناو خەڵکــدا بتوانێ بەســەر ئەوانــدا زاڵ بــێ، وە ئەویش هــاوکارو یارمەتی دەریانــە، بەڵام کاتێک کە هەردوو کۆمەڵەکە گەیشــتنە شــوێنی مەبەســت شــەیتان پاشــەو پــاش دزەی بــۆ کردو هەڵهات، وە خۆی لێبەری کــردن، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ كَمَثَلِ الشَّيْطَانِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَانِ اكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيءٌ مِّنكَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦﴾ فَكَانَ عَاقِبَتَهُمَا أَنَّهُمَا فِي النَّارِ خَالِدَيْنِ فِيهَا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الظَّالِمِينَ ﴿١٧﴾ ﴾الحشر.

﴿ إِذْ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ واتــە: ئەوانــەی کــە گومــان‌و دوو دڵیــان هەیــە، لەوانــەی کــە ئیمانیــان لاواز بــوو لــە بــڕواداران، کاتێــک کــە مســوڵمانان بەرێژەیەکــی کەمــەوە ڕووبــەڕووی بتپەرســتان بوونەوە کــە ڕێژەی ئەوان زۆر بــوو وتیان: ﴿ غَرَّ هَٰؤُلَاءِ دِينُهُمْ ﴾ واتــە: ئەوانــە بــە ئاینەکەیــان هەڵخەڵەتــاون‌و چەواشــە بــوون، بۆیە خۆیــان تووشــی ئــەم جەنگــە کردوە، بــە شـێوەی بە کــەم زانینەوە ئــەم قســانەیان دەکردو گاڵتەیــان بــە عەقڵیــان دەکــرد، بەڵام ئەوانــە خۆیان کەم عەقــڵ‌و گەمژەن لــە لای خوا ﷻ.

بێگومــان ئیمــان وا لــە خاوەنەکــەی دەکات ڕووبــەڕووی هەمــوو ترســناکیەک ببێتەوە کە هیــچ هێزێــک ناتوانــێ ڕووبــەڕووی ببێتــەوە، بڕواداری پشــت بەســتوو بە خــوا ﷻ دەزانێ هیــچ هــەوڵ‌و توانــاو هێزێــک لای کــەس نیــە تەنهــا لای خــوا ﷻ نەبــێ، ئەگــەر هەموو دروســتکراوەکان کــۆ ببنــەوە کــە بــە قــەد گەردیلەیــەک ســوود بــە کەسـێک بگەیەنن، بێگومــان ســوودی پێناگەیەنــن، وە ئەگــەر کــۆ ببنەوە لەســەر ئــەوەی زیانێکــی پێبگەیەنن

ئـەوە ناتوانـن مەگـەر بە شـتێک کـە خـوا ﷻ لەسـەری نوسـیبێتی، وە دەزانی ئەو لەسـەر هەقـە، بێگومـان خـوا ﷻ دانـاو میهرەبانـە لـە هەمـوو قـەزاو قەدەرێکـدا، وە بـڕوادار بـە خەیاڵیـدا نایـەت دوژمـن چەنـدە زۆرو بەهێـزە، متمانەی تـەواوی بە پەروەردگـاری هەیە، لـە دڵـەوە زۆر ئـارامو دڵنیـاو کەیـف خۆشـە، شـڵەژاوو ترسـنۆک نیـە، بۆیـە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ ﴾ هیـچ هێزێـک سـەرناکەوێ بەسـەر هێزی تر، ﴿ حَكِيمٌ ﴾ (خـوا کاربەجێیـە) لـەوەی کـە بڕیاری لەسـەری داوە.

(٥٠-٥٢): ﴿ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيكُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٥١﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٥٢﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: لە سـەرەمەرگدا بیبروایـان دەبینی ئەوانەی کـە ئایەتەکانی خوایان ﷻ بە درۆ داناوە، کاتێک کە فریشـتەکان گیانیان دەکێشـن لەو کاتەدا شـتێکی سەرسووڕهێنەر دەبینـی، کـە تووشـی دوودڵیو نارەحەتی دەبـن بە لایانەوە زۆر قـورس دەبێ ﴿ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ ﴾ (فریشـتەکان لـە پێشو پاش لێیـان دەدەنو) پێیان دەڵێن: ڕووح بـدەن بـە دەسـتەوە، لـەو کاتـەدا نەفسو ڕووحیـان بەرگـری لە خۆیـان دەکەن کە دەربچنـە دەرەوە، چونکـە دەزانێ سـزایەکی بـە ئێش چاوەڕێیـان دەکات، بۆیـە دەفەرموێ: ﴿ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴾ واتـە: بیچێژن سـزایەکی توونـدو بە ئێش.

ئـەو سـزایە بۆیان پێویسـت بـووە بەبێ هیچ زوڵمو سـتەمێک لـە لایـەن پەروەردگارتانەوە، بـە هـۆی سەرکێشـیو تاوانی خۆتانەوەیە، ئەمەش دەسـتووری خوایە لە پێشـینو ئەوانەشـی کـە دوای ئـەوان دێـن، بێگومـان دابو نەریتـی درۆزنەکانـە، واتـە: پیشـەیان ئەوەیـە، وە ئـەو سزایەشـی کە لە سـەریان پێویسـت بوو بـە هـۆی تاوانەکانیانەوە بـوو ﴿ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ لـە ئۆممەتە بە درۆخـەرەوەکان ﴿ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ ﴾ بـە سـزادانیان ﴿ بِذُنُوبِهِمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾ هیـچ کەسـی لێگیـر نابێ ئەگـەر بیـەوێ سـزای بـدات ﴿ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ﴿٥٦﴾ ﴾هـود. (واتە: هیچ ژیاندارێـک نیـە مەگەر خوا بگری پێشـە سـەریەتی).

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ
يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٣﴾ كَدَأْبِ ءَالِ
فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم
بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَكُلٌّ كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾
إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ
﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِى كُلِّ
مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِى ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم
مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوْمٍ
خِيَانَةً فَٱنۢبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَىٰ سَوَآءٍ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ
﴿٥٨﴾ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَبَقُوٓا۟ إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ
﴿٥٩﴾ وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ
تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ
لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ
ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ
فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾

**(٥٣-٥٤):** ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٣﴾ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَكُلٌّ كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾﴾

﴿ذَٰلِكَ﴾ واتە: خوا ﷻ سزای ئەو ئوممەتانەیدا کە ئایەتەکانیان بە درۆخستەوە، وە سەرجەم نیعمەتەکانی لێدارنین بە هۆی تاوانەکانیانەوە، بە هۆی ئەوەی خۆیان لە خۆیان گۆڕی، بێگومان ﴿بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ﴾واتە: لە نازو نیعمەتەکانی دینو دونیا بەڵکو خوا ﷻ بۆیان دەهێڵێتەوەو بۆیان زیاد دەکات ئەگەر سوپاس گوزاری بکەن ﴿حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ لە گوێڕایەڵیەوە بۆ سەرپێچی کردن پاشان کوفر کردن بە نیعمەتەکانی خوا، لە بەرانبەردا خوا ﷻ قاری لێگرتوون نازو نیعمەتەکانی لێوەرگرتنەوەو بۆی گۆڕین، وەک چۆن ئەوان نەفسو دەروونی خۆیانیان گۆڕی، خوا ﷻ لەمەدا حیکمەتو دادپەروەریو چاکەی بەدیهێناوە بەرانبەر بە بەندەکانی، بە هۆی ئەوە سزای نەداون تەنها بە ستەمی خۆیان نەبێت، وەک چۆن دڵی دۆستانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە، کە بەندەکان سزا دەدات ئەگەر پێچەوانەی فەرمانەکانی بجوڵێنەوە ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ گوێی لە هەموو ئەو قسانەیە کە خەڵکی دەیکات، ئەوەی کە ئاشکرای دەکەنو ئەوەی کە لە ناخیاندا دەیشارنەوە، وە دەزانێت چی لە ناخیاندایەو چیان پەنهان داوە، بۆیە بە ویستو تواناو داناییو زانستی خۆی ئەوەی بیەوێ بەسەر بەندەکانیدا بهێنێ، دەیهێنێ.

﴿كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ﴾ واتە: فیرعەونو گەلەکەی ﴿وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ﴾ کاتێک کە نیشانەکانیان بۆ هات ﴿فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ﴾ هەر کەسەو بە پێی تاوانی خۆی ﴿وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَكُلٌّ﴾ لەوانەی کە لە ناوچوونو سزا دران ﴿كَانُوا۟ ظَٰلِمِينَ﴾ بەرانبەر بە دەروونی خۆیان، هەوڵی لە ناوبردنیان دەدا، خوا ﷻ ستەمی

لێ نەکردن، وە بە بێ هۆ نەیگرتن، دەی با ئەوانەی کە ئایەتەکان لەگەڵیان دەدوێن با خۆیان بە ئەوان نەشوبهێنن لە زوڵم‌و ستەمدا، چونکە خوا ﷻ سزایان لەسەر حەڵاڵ دەکات، وەک چۆن پێش ئەوانی بەو هۆیەوە لە ناوبرد.

(٥٥-٥٧): ﴿ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٥٥ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ ٥٦ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ٥٧ ﴾:

ئەوانەی کە ئەم سێ سیفەتەیان لە خۆیاندا کۆکردەوە: بێبڕوایی، ئیمان نەهێنان، خیانەتکار، بە شێوەیەک کە پابەند نابن لەسەر بەڵێنەکانیان وە لەسەر وتەیەک کە وتبێتیان، ئەوان خراپترین‌و بەدترین گیانلەبەری خوان ﷻ، ئەوان خراپترو بێ نرخترن لە کەرو سەگ‌و هاوشێوەکانی، چونکە خێرو چاکەیان تێدانیەو چاوەڕوانی شەڕو خراپەیان لێدەکرێت، لە ناوبردنی ئەوانە شتێکی دیاریکراوو پێویستە، بۆ ئەوەی دەردو نەخۆشیەکەیان تووشی کەسێکی تر نەبێت بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ ﴾ واتە: لە کاتی جەنگدا دەیانبینی هیچ پەیمان‌و بەڵێنێکیان نیە ﴿ فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ ﴾ واتە: وە سزایەکیان بدە کە بۆ پاش خۆیان ببێتە پەند ﴿ لَعَلَّهُمۡ ﴾ واتە: بەڵکو ئەوانەی لە پشتیانەوەن ﴿ يَذَّكَّرُونَ ﴾ بیر لە سەرەنجامیان بکەنەوە، تا ئەوەی ئەوان تووشیان بوو ئەمان تووشیان نەبێ، ئەمەش سوودی سزاو یاساو ڕێساکانە کە ڕێکخراوە لەسەر سەرپێچی کردن، دەبێ ببێتە وانەیەک بۆ ئەو کەسەی کە سەرپێچی ناکات، وە ئەو کەسەیشی کردوویەتی دووبارەی ناکاتەوە. ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەرچی لەجەنگدا بەو جۆرە سزای بێ باوەڕ دەدرێ، وە ئەگەر چی خیانەتکاریش بێ ئەگەر پەیمانی پێدرا بە هیچ شێوەیەک نابێ نەخیانەتی لێبکرێ‌و نە سزا بدرێ.

(٥٨): ﴿ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةٗ فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ ٥٨ ﴾:

واتە: ئەگەر لە نێوانی ئێوەو ئەواندا پەیمان‌و بەڵێنێک هەبوو لەسەر وازهێنان لە جەنگ‌و کوشتار، ئەگەر ترسان لەوەی دوژمنانتان خیانەتتان لێبکەن بە هۆی بینینی چەند ئاماژەیەک کەوا دەریدەخست ئەوان دەیانەوێ ناپاکیتان لێبکەن، ﴿ فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ ﴾ واتە: پەیمانەکەیان فڕێبدەرەوە بۆیان بە شێوەیەکی جوان، وە پێیان ڕابگەیەنە کە لە نێوانی ئێوەوو ئەواندا هیچ پەیمانێک نەماوە ﴿ عَلَىٰ سَوَآءٍ ﴾ تا هەردوولاتان وەک یەک زانیاریتان هەبێ‌و ئاگادار بن، دروست نیە بۆ ئێوە فێڵ‌و خیانەتیان لێبکەن وەک ئەوەی شتێک بکەن کە ببێتە مایەی پێشێل کردنی پەیمانەکە تا ئاگاداریان دەکەنەوە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴾ بەڵکو ڕقی لێیان دەبێتەوە بەو پەڕی ڕق لێبوونەوە، پێویستە شتێک هەبێ کە ئێوە بەری بکات لە خیانەتو ناپاکی.

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر بە شێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا خیانەت لە دوژمن بینرا ئەوە پێویست ناکات ئاگادار بکرێنەوە بە هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە، چونکە لێیان نەترساوە، بەڵکو زانراوە، لەبەر ئەوە ئاگادارکردنەوە هیچ سوودێکی نیە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰ سَوَآءٍ ﴾ وە لێرەدا فێڵەکەیان بۆ هەمووان ئاشکرا بووە، وە بە هەمان شێوە تێگەیشتن لە دەقەکە ئەگەر لێیان نەترسان خیانەتو ناپاکی بکەن بە شێوەیەک کە هیچیان لێ نەبینرا کە ئاماژەبێ بۆ ناپاکی، ئەوە دروست نیە داوای هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەکە بکەن، بەڵکو پێویستە وەفا بە پەیمانەکەیان بکەن تا کاتەکەی تەواو دەبێ.

(٥٩): ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَبَقُوٓا۟ ۚ إِنَّهُمْ لَا يُعْجِزُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾:

واتە: با ئەو بێبڕوایانەی کە نیشانەکانی بە درۆ دەخەنەوە وا گومان نەبەن کە ئەوان پێش کەوتوونو ڕۆشتوون، چونکە خوا ﷻ دەستەوەستان نیەو لە دەستی دەرناچن، خوا ﷻ حیکمەتێکی گەورەی لەوەدا داناوە کە سزایان بۆ پێش ناخات، کە لەو چوارچێوەیەدا بڕواداران تووشی بەڵا دەکاو تاقیان دەکاتەوە، پاشان لێیان ڕازی دەبێو پلەی بەرزو بێ پایانیان پێ دەبەخشێ، وەسفیان دەکات بە سیفەتێک کە بەرزو بڵندە بۆیە بە بەندەکانی دەفەرموێ:

(٦٠): ﴿ وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعْلَمُهُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾:

کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَعِدُّوا۟ ﴾ واتە: بەرانبەر بە دوژمنەکانتان ئەوانەی کە هەوڵی لەناوبردنو بەتاڵ کردنەوەی ئاینەکەتان دەدەن ﴿ مِّن قُوَّةٍ ﴾ واتە: ئەوەی لە تواناتاندایە لە توانای عەقڵیو جەستەیی، وە جۆرەها چەکو هاوشێوەی ئەوە، کە ببێتە مایەی یارمەتیدانتان بۆ جەنگو کوشتار لەگەڵ دوژمناندا، وە خۆ ئامادە کردن بە جۆرەها پیشەسازی کە کار بکات بۆ ئەوەی چەندین جۆری چەکو تەقەمەنیو زرێپۆشو چەکی بچووکو گەورەو فڕۆکەو هاوشێوەی ئەوانە لە دەشتاییو وشکانیدا، وە جۆرەها خەندەقو چاڵی گەورە بۆ خۆ ئامادە کردنو بەرگری کردن، وە بۆچوونی جوانو سیاسەتی حەکیمانە کە ببێتە مایەی پێشخستنی مسوڵمانانو دوورخستنەوەی شەڕو پلانی دوژمنان، وە دروستکردنی فێرگەی سەربازی بۆ فێرکردنو مەشق کردنی هەموو تاکێک لە جۆرەکانی چەکو پلانی

جەنگی، (ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا بەشێک لە هێز، یان کاریگەرترین جۆری هێز لە جەنگدا بۆ ئێمە پێشان دەدات، وا پێناسەی هێزمان بۆ بکات، کە ئایەتەکە مەبەستی بووە: دەقی فەرمووده‌کە ئاوایە:) {عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: «وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ: أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ أَلاَ إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ»} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٧٤٦٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩١٧)، وَأَبُودَاوُدَ برقم: (٢٥١٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨١٣)، وَالتِّرْمِذِيُّ برقم: (٣٠٨٣))، واتە: عوقبەی کوڕی عامیر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو، لەسەر مینبەر دەیفەرموو: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٍ﴾ ئاگاداربن! هێز هاوێشتنە، ئاگاداربن! هێز هاوێشتنە، ئاگاداربن! هێز هاوێشتنە.

وە لەوانەش خۆ ئامادە کردن بە ئامێری گواستنەوە کە لە کاتی جەنگدا پێویستە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ﴾ وە ئەم هۆکارە لەو ڕۆژگاردا هەبووە بۆ ترساندنی دوژمن، چونکە حوکم بە دەوری هۆکارو عیللەتدا دەسوڕێتەوە، ئەگەر شتێکی تر لە ئارادا بوو کە زیاتر دوژمنی پێ دەترسێنرا، وەک سەیارەو هاوشێوەکانی کە ئامادە دەکرێ بۆ جەنگ، دەبێتە مایەی ئەوەی زیانی زیاتر بە دوژمن بگەیەنێ ئەوە فەرمان بە ئامادە کردنی کراوەو دەبێ هەوڵی بەدەست هێنانی بدرێ، تەنانەت ئەگەر دەست نەکەوت بە ڕێگای زانستی پیشەسازیەوە نەبێ ئەوە ئەو زانستە واجبو پێویست دەبێ، چونکە (مَا لاَ يَتِمُّ الْوَاجِبُ إِلاَّ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ) واتە: هەر شتێک فەرزێک پەکی لەسەری بکەوێ، ئەویش فەرز دەبێ.

خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ﴾ لەوەی کە دەیزانن کە ئەوان دوژمنی ئێوەن ﴿وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ﴾ لەوانەی کە جەنگتان لەگەڵ دەکەن پاش ماوەیەکی تر، کە خوا ﷻ لەو بارەیەوە لەگەڵتاندا دەدوێ ﴿ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡ﴾ بۆیە فەرمانی پێیان کردوە بە خۆئامادەکردن بۆیان.

لە گەورەترین شتێک کە جەنگیان لەگەڵدا بکەن لە خەرج کردنیماڵیانە بۆ جیهاد کردنی بێبڕواکان، بۆیە هانی بڕواداران دەداو دەفەرموێ: ﴿وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ کەم بێ، یان زۆر ﴿يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ﴾ لە ڕۆژی دوایی دا پاداشتی بە چەندین قات بەسەر یەکەوەیە، تەنانەت بەخشین لە پێناوی خوا ﷻ چەن قات دەبێتەوە بۆ حەود سەد قات یان زیاتر ﴿وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ﴾ واتە: ئەجرو پاداشتان بە هیچ شێوەیەک کەم ناکات.

(٦١-٦٤): ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾ وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٤﴾﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِن جَنَحُواْ﴾ واتە: ئەو بێبڕوایانەی کە جەنگتان لەگەڵدا دەکەن ئەگەر مەیلیان هەبوو ﴿لِلسَّلْمِ﴾ واتە: بۆ ئاشتیو وازهێنان لە شەڕ ﴿فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: وەڵامیان بدەرەوە لەسەر ئەوەی کە داوایان کردوە بە پشتیوانی خوا ﷻ، چونکە لەوەدا سوودو قازانجێکی زۆر هەیە:

لەوانە: داواکردنی ئاشتی لە هەموو کاتێکدا پێویستە، ئەگەر ئەوان دەستپێشخەر بوون لەوەدا ئەوە لە پێشترە وەڵام بدەنەوە.

لەوانە: ئەوە دەبێتە مایەی بەهێز بوونتان، وە خۆ ئامادە کردنتان بۆ جەنگ لە کاتێکی تردا، ئەگەر پێویستی کرد.

وە لەوانە: ئەگەر ئێوە ئاشتەواییتان کرد هەندێکتان لە هەندێکی ترتان ئەمین دەبن، هەر یەکەتان بانگەواز بۆ خۆی دەکات، بێگومان ئیسلام بەرزەو هیچ شتێک سەرناکەوێ بەسەریدا، هەر کەسێک خاوەن عەقڵو بینایی بێو ویژدانی هەبێ ئەوە بێگومان فەزڵی دەدا بەسەر گشت ئاینو ڕێبازەکانی تردا، لەبەر ئەوەی چاکو جوانە لە فەرمانو قەدەغەکراوەکانیدا، وە مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکیدا، وە دادپەروەری لە نێوانیاندا، هەروەها لە هیچ ڕوویێکەوە زوڵمو ستەمی تێدانیە، بۆیە خەڵکی حەزیان بۆ دەجوڵێو شوێنی دەکەون، ئەم ئاشتیەش دەبێتە مایەی پشتیوانیەک بۆ بڕواداران بەسەر بێبڕواکاندا، ترس لە ئاشتیدا نیە تەنها بە شێوەیەک نەبێ، ئەویش ئەوەیە بێبڕواکان مەبەستیان فێڵ کردن بێ لە مسوڵمانانو بە دوای هەلو فرسەتێکدا بگەڕێن، خوا ﷻ لەو بارەوە هەواڵی داوە، تەنها خوا ﷻ بەسە پشتو پەنایان بێ لە فێڵی دوژمنان، وە ئەوە دەبێتە مایەی زیان بۆ خۆیان، وە خوا دەفەرموێ ﴿وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُ﴾ واتە: ئەوە خوات بەسە پشتو پەنات بێ لەو ئازارانەی پێت دەگەیەنن، بەرژەوەندیەکانت لەبەرچاو دەگرێ، وەک پێشتر چۆن پشتیوانی کردوویتو سەری خستوویو ئارامی بە دڵت بەخشیوە.

﴿هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە: خوا ئەو زاتەیە پشتیوانی کردیت لە ئاسمانەوە، ئەویش ئەو سەرکەوتنەیە کە هیچ شتێک ناتوانی ڕێگری لێ بکات.

وَإِن يُرِيدُوٓا۟ أَن يَخْدَعُوكَ فَإِنَّ حَسْبَكَ ٱللَّهُ ۚ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَيَّدَكَ
بِنَصْرِهِۦ وَبِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ۚ لَوْ أَنفَقْتَ
مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مَّآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ
أَلَّفَ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَسْبُكَ
ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَرِّضِ
ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ
يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ٱلْـَٰٔنَ خَفَّفَ
ٱللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا ۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ
صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓا۟
أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ لِنَبِىٍّ
أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ
ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ
مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ فَكُلُوا۟
مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٩﴾

﴿ وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ﴾ لەناو یەکتردا کۆکو یەکدەنگ بوون، بەو هۆیەوە خوا ﷻ بەهێزی کردن، ئەمەش بە کۆششی هیچ کەس نەبوو، بەڵکو تەنها بە هێزو توانای خوا ﷻ بوو. ئەگەر هەرچی هەیە لە نێو زەویدا لە زێرو زیوو هاوشێوەکانی ببیەخشیت بۆ ئەوەی هۆگری بخەیتە نێوان دڵەکانیانەوەو یەکیان بخەیت، پاش ئەوەی کە ئەوان دووبەرەکی کەوتوەتە نێوانیانو لەیەکتر جیاوازن ﴿ مَآ أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ ﴾ چونکە هیچ شتێک ناتوانێ دڵەکان بگۆڕی تەنها خوا ﷻ نەبێ ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ لە گەورەیی‌و عیززەتی خوا ﷻ ئەوەیە دڵەکانیانی کۆ کردەوە پاش لەت بوون، وەک خوا ﷻ دەفەموێ: ﴿ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ﴿١٠٣﴾ ﴾ آل عمران، (واتە: وە یادی چاکەی خوا بکەن بەسەر خۆتانەوە، بیهێننەوە یاد کاتێ کە پێکەوە دوژمن بوون، کەچی خوا دڵتانی پێکەوە بەستو لە سایەی چاکەی ئەوەوە پێکەوە بوونە برا، وە لەسەر قەراغی چاڵێکی ئاگر بوون، بەڵام خوا دەربازی کردن لێی).

پاشان خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَسْبُكَ ٱللَّهُ ﴾ واتە: خوات بەسە ﴿ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ واتە: هەروەها ئەوانەش کە بڕوادارن، ئەمە پەیمانێکە لە لایەن خواوە بۆ بەندە بڕوادارەکانی، ئەوانەی شوێنی پێغەمبەرەکەی کەوتوون، بەس بوون، وە سەرکەوتن بەسەر دوژمندا، ئەگەر هۆکارەکانیان بەدەست هێنا کە بریتیە لە بڕواهێنانو شوێنکەوتن، ئەوە بۆ دنیاو دواڕۆژیان بەسە، بێگومان خوا بە بەس زانین دوادەکەوێت بە دواکەوتنی مەرجەکانی (کە لە شوێنکەوتنی خواو پێغەمبەر ﷺ بەرجەستە دەبێ).

(٦٥-٦٦): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ۚ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِا۟ئَتَيْنِ ۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّا۟ئَةٌ يَغْلِبُوٓا۟ أَلْفًا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِأَنَّهُمْ

قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ٦٥ ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ٦٦ ﴾:

خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِ ﴾ واتە: هانی بڕواداران بدە لەسەر جەنگ کردن لە دژی بێبڕواکان، بیانترسێنە بە پێچەوانەکەی، وە باسی فەزڵو چاکەو زیرەکیو خۆڕاگریان بۆ بکە، وە ئەوەیشی لەسەر ئەوە دادەمەزرێت لە چاکەی دنیاو دواڕۆژ، وە باسی زیانەکانی ترسنۆکیان بۆ بکە کە بێگومان ئەوە خورەوشتێکی ناشرینەو نیشانەی ناتەواویە لە دینو پیاوەتیدا، بێگومان زیرەکیو بە توانایی لە بڕواداراندا لە پێشترە لە هەموو کەسێکی تر، وەک دەفەرموێ: ﴿ إِن تَكُونُواْ تَأۡلَمُونَ فَإِنَّهُمۡ يَأۡلَمُونَ كَمَا تَأۡلَمُونَۖ وَتَرۡجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرۡجُونَ ١٠٤ ﴾ النساء (واتە: چونکە ئەگەر ئێوە ئێشتان پێدەگات، ئەوە بێگومان ئەوانیش وەک ئێوە ئێشیان پێدەگات، وە ئێوەش ئومێدێکتان بە خوا هەیە (وە چاوەڕوانییەکتان هەیە) کە ئەوان ئەو ئومێدەیان نیە).

﴿ إِن يَكُن مِّنكُمۡ ﴾ ئەی بڕواداران (ئەگەر لە ئێوە هەبن) ﴿ عِشۡرُونَ صَـٰبِرُونَ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾ یەک کەس لە ئێوە بەرانبەرە بە دە کەس لەوانە، بە هۆی ئەوەی بێبڕواکان ﴿ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴾ واتە: نەفامنو نازانن کە خوا ﷻ چی ئامادە کردوە بۆ ئەو کەسانەی جیهاد لە پێناویدا دەکەن، ئەوان شەڕو کوشتار دەکەن لە پێناو ئەوەی لەسەر زەویدا بەرز بینەوەو ئاشووبو خراپەکاری تێدا بکەن، ئێوە تێدەگەن لە ئامانجو مەبەستی شەڕو کوشتار، وە دەزانن تەنها لە پێناو بەرزکردنەوەی ناوی خوا ﷻ و ئاشکرا کردنی ئاینەکەیەتی، وە لابردنی خراپەکاریە لەسەر کتێبی خوا ﷻ، وە بەدەست هێنانی سەرکەوتنی گەورەیە لە دنیاو دواڕۆژدا، ئەمانە هەموویان هۆکارێکن بۆ زیرەکیو خۆڕاگریو خۆئامادەکردن بۆ جەنگو کوشتار.

پاشان خوا ﷻ ئەم حوکمەی سووک کردوە بەرانبەر بە بەندەکانی، دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗا ﴾ واتە: بۆیە میهرەبانیو حیکمەتی خوا ﷻ وای پێویست کرد کە ئاسانی بکات، ﴿ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴾ ئەم دەقە پیرۆزانە وێنای هەواڵ دەدەن دەربارەی بڕواداران بەو شێوەی کە ئەگەر گەیشتن بەو ئەندازە دیاریکراوە ئەوە سەردەکەون بەسەر ئەو ئەندازە دیاریکراوەدا لە ڕووبەڕووبونەوەی بێبڕوایاندا، خوا ﷻ فەزڵو

منەتی خۆی دەکات بەسەریاندا لەوەی کە پێیانی بەخشیوە لە بە توانایی‌و زیرەکی ئیمانی، بەڵام ماناو حەقیقەتەکەی فەرمانە، خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە بڕواداران لە سەرەتادا کە دروست نیە بۆ یەک کەس لە بەرانبەر دە کەسدا کە شوێنی خۆیان بەجێ بهێڵێن‌و ڕابکەن، وە دە کەس بەرانبەر بە سەد کەس، وە سەد کەس بەرانبەر بە هەزار کەس، پاشان خوا ﷻ ئەو فەرمانەی سووک کردوە بەسەر بڕواداراندا بە شێوەیەک کە دروست نیە مسوڵمانان سەنگەر بەجێ بهێڵن‌و ڕابکەن کە بێبڕواکان لە ڕووی ژمارەوە لە هەمان ئەندازەی ئەواندا بن، ئەگەر بێبڕواکان زیاتر بوون ئەوە ڕا کردن دروستە، بەڵام لێرەدا دوو خاڵ دێتە پێش:

یەکەم: دەقەکە بە شێوەی هەواڵ هاتوە، وە ئەسڵیش لە هەواڵدا دەبێ لەسەر شێوەی خۆی بێ، مەبەست لەمەدا سوپاس کردن‌و هەواڵدانە بە ڕاستی.

دووەم: بەستنەوەی ئەو ژمارە بەوە دەبێ کە ئارامگرو خۆڕاگر بن، بە شێوەیەک کە ڕاهێنرابن لەسەر خۆڕاگری، تێگەیشتن لەمەدا ئەوە دەگەیەنێ کە ئەگەر خۆڕاگر نەبوو ئەوە دروستە بۆیان سەنگەر بەجێ بهێڵن‌و ڕا بکەن، ئەگەرچی دوژمن لە خۆیان کەمتر بێ، ئەگەر زانیان بە دڵنیاییەوە تووشی زیان دەبن، کە بێگومان ئەمەش حیکمەتی خوایی دەیخوازێ.

وەڵامی یەکەم دەدرێتەوە بەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡـَٔـٰنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ ﴾ تا کۆتایی، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمە فەرمانێکەو پێویستەو دەبێ ببێ، پاشان خوا ﷻ ئاسانی کردوە بۆ ئەو ژمارەیە، ئەمەش وا دەردەخات کە ئەوە فەرمانە ئەگەرچی لەسەر شێوەی هەواڵ هاتوە. وە دەکرێ بوترێ هێنانی ئەم دەقە بە شێوەی هەواڵ خاڵێکی جوانەو بەدیهێنانی تیایە، ئەگەر بە شێوەی فەرمان بهاتبایە ئەو خاڵە جوانەی لە خۆنەدەگرت، کە بریتیە لە بەهێزکردنی دڵی بڕوادارانو مژدە پێدانیان کە ئەوان لە داهاتوویەکی نزیکدا سەردەکەون بەسەر بێبڕوایاندا.

وەڵامی دووەمیش دەدرێتەوە، مەبەست لە بەستنەوەی دەقەکە بە ئارامگری بۆ هاندانە لەسەر خۆڕاگری، بەو شێوەیەی پێویستە لەسەرتان هەموو ئەو هۆکارانە بەجێبهێنن بۆ ئەو ئامانجە، ئەگەر بەجێیان هێنا ئەوە هۆکارە ئیمانی‌و مادییەکان مژدە دەدەن بە دەستکەوتنی ئەوەی کە خوا ﷻ هەواڵی پێداوە لە سەرکەوتن بەو ژمارە کەمەوە.

(٦٧-٦٩): ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٦٧ لَّوۡلَا كِتَٰبٞ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمۡ فِيمَآ أَخَذۡتُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٦٨ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمۡتُمۡ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٦٩ ﴾:

ئەمە سەرزەنشت کردنی خوایە ﷻ بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺو برواداران لە جەنگی بەدردا، کاتێک کە بتپەرستانیان بە دیل گرتو هێشتیاننەوە تاکو بارمتەو فدیەیان لە جیاتی وەربگیرێ، بۆچوونی ئەمیری ئیمانداران عومەری کوری خەتتاب ئەوە بوو کە بکوژرێنو لەناو ببرێن، خوا فەرمووی: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: نابێتو ناکرێت بۆ هیچ پێغەمبەرێک کە ئەگەر کوشتاری بێبڕواکانی کرد ئەوانەی کە دەیانەوێ نووری خوا ﷻ بکوژێننەوە، وە هیچ کەس لەسەر زەویدا بەندایەتی خوا نەکات، پەلە بکەن بە ئازادکردنی ئەو دیلانە بە فدیە، بێگومان بەرژەوەندی لەوەدایە کە بکوژرێنو لەناو ببرێن، وە ئەگەر هێزو دەسەلاتیان بەدەست هێنا لەسەر زەویداو بێبڕواکان لاوازو پەرتەوازە بوون، ئەو کات ئاساییە بەدیلیان بگرنو لای خۆیان بیان هێڵنەوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ تُرِيدُونَ ﴾ بە فیدیە وەرگرتنو هێشتنەوەیان ﴿ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا ﴾ واتە: نەک بۆ بەرژەوەندیەک کە بگەڕێتەوە بۆ ئاینەکەتان، بە سەرکەوتنی ئاینەکەیو سەرخستنی دۆستەکانی، وە وشەو ئالاتان شەکاوە بێ بەسەر غەیری خۆتاندا، فەرمانتان پێ دەکات بەو ئامانجە گەورە بگەن، ﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾ واتە: خاوەنی عیزەتو شکۆی تەواوە ئەگەر بیەوێ سەرتان دەخات بەبێ جەنگو کوشتار، بەلام داناو زانایە هەندێکتان بە هەندێکی دیکەتان تاقی دەکاتەوە.

﴿ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ ﴾ بە قەزاو قەدەر، بێگومان خوا غەنیمەو دەستکەوتی بۆ حەلال کردوون، وە خوا ﷻ سزای لەسەر هەلگرتوون ﴿ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ لە فەرموودەدا هاتوە: {لَوْ نزل عَذَاب يَوْم بَدْر، مَا نَجَا مِنْهُ إِلاَّ عُمَر} واتە: ئەگەر سزا لە ڕۆژی جەنگی بەدر هاتبایە خوار، جگە لە عومەر کەس ڕزگاری نەدەبوو.

﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَٰلًا طَيِّبًا ﴾ ئەمەش لە نەرمو نیانی خوایە بەرانبەر بەم ئوممەتە، کە خوا ﷻ دەستکەوتی بۆ حەلال کردوون، بۆ هیچ ئوممەتێک پێش ئەوان حەلالی نەکردوە ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ﴾ (پارێز لە خوا بکەن) لە هەموو کاروبارەکانتاندا، وە سوپاسگوزاری خوا ﷻ بکەن لەسەر ئەو هەموو نازو نیعمەتانەی کە ڕشتویەتی بەسەرتاندا ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ ﴾ خوا لە هەموو تاوانەکانی ئەوانە خۆش دەبێ کە داوای لێخۆشبوون دەکەن، وە لە تاوانی ئەو کەسە خۆش دەبێ کە هاوەلی بۆ بڕیار نەداوە ﴿ رَّحِيمٌ ﴾ (بەخشندەیە) بۆ ئێوە، بە هۆی ئەوەی دەستکەوتی حەلال کردوە بۆتان.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٠ وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدۡ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ فَأَمۡكَنَ مِنۡهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ٧١ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ٧٢ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ ٧٣ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ٧٤ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٧٥

(٧٠-٧١): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٧٠ وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدۡ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ فَأَمۡكَنَ مِنۡهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ٧١ ﴾

ئەم دەقە دەربارەی دیلەکانی بەدر دابەزی، لە چوار چێوەی ئەوانەدا عەبباسی مامی پێغەمبەر ﷺ تێدا بوو، کاتێ کە داوای فیدیەی لێ کرد، وتی: من مسوڵمان بووم پێش ئەوە، بەڵام فیدیەیان لەسەری هەڵنەگرت، خوا ﷻ ئەو دەقەی دابەزاند کە دڵی بداتەوە، وە ئەوەشی هاوشێوەی ئەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ ﴾ واتە: لە ماڵو سامان، بەوەی کە بۆی ئاسان کردن لە فەزڵو چاکەی خۆی، خێرو پاداشتێکی زیاتر لەوەی کە لێتان وەرگیرا ﴿ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ﴾ (وە لە) تاوانەکانتان (خۆش دەبێ)، دەتانخاتە بەهەشتەوە ﴿ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ بێگومان خوا ﷻ (لێبوردەی بە بەزەییە) پەیمانەکەی خۆی بۆ عەبباسو هاوشێوەکانی بەجێهێنا، لە پاش ئەوە ماڵو سامانێکی زۆری بەدەست هێنا، تا جارێک ماڵو سامانێکی زۆریان هێنایە خزمەت پێغەمبەر، فەرمانی کرد جلەکەی رابخات چەندە دەگرێتو دەتوانێ هەڵی بگرێ بۆ خۆی بیبات، ئەوەندەی برد کە لە توانادا نەبوو هەڵبگیرێت، ﴿ وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ ﴾ (وە ئەگەر) لە هەوڵدان بۆ شەڕکردنو دژایەتی کردنت ﴿ فَقَدۡ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ فَأَمۡكَنَ مِنۡهُمۡ ﴾ با ئاگادار بن لە خیانەت لێکردنت، چونکە بێگومان خوا ﷻ دەسەڵاتدارە بەسەریانەوە، وە ئەوان لە ژێر دەستی خوا دان ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ واتە: زانایە بە هەموو شتێک، بە دانانی شتەکان لە جێگای خۆیاندا، وە لە

زانســتو دانایــی خــۆی ئەوەیــە کــە ئــەو یاســاو ڕێســا جوانانــەی بۆتــان دانــاوە، وە دۆخــی دیلــەکانو خیانەتیانــی بــۆ ڕوون کردونەتــەوە.

(٧٢): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَـٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَوا۟ وَّنَصَرُوٓا۟ أُو۟لَـٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يُهَاجِرُوا۟ مَا لَكُم مِّن وَلَـٰيَتِهِم مِّن شَىْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟ ۚ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٧٢) ﴾:

ئەمــە گرێبەســتی دۆســتایەتیو خۆشەویســتیە، کــە خــوا ﷻ گرێیــداوە لــە نێــوان ئــەو کۆچکەرانــەی کــە بڕوایــان هێنــاوەو لــە پێنــاو خــوادا کۆچیــان کــردووەو وڵاتــی خۆیــان جێهێشــتوە بــۆ جیهــاد کــردن لــە پێنــاو خــوادا، وە لــە نێوانــی ئەوانــەی کــە داڵــدەی پێغەمبــەر ﷺ و هاوەڵانیــان داوە، وە لــە وڵاتــی خۆیانــدا پشــتیوانیان لێکــردوون بــە ســەروەتو سامانو نەفسیان، ئــا ئەمانــە هەندێکیــان دۆســتی هەندێکــی تریانــن، چونکــە ئیمانیــان بــە خــوا ﷻ و بــە ڕۆژی دوایــی تــەواوەو پەیوەنــدی چاکیــان لــە نێــوان یەکتــردا هەیــە ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يُهَاجِرُوا۟ مَا لَكُم مِّن وَلَـٰيَتِهِم مِّن شَىْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا۟ ﴾ بێگومــان ئــەوان بــە هــۆی دابڕانیانــەوە دۆســتایەتی خۆیــان لــە ئێــوە پچڕانــد لــە کاتێکــدا کــە زۆر پێویســتان بــە پیــاو هەبــوو، کاتێــک کــە کۆچیــان نەکــرد ئــەوە هیــچ جــۆرە دۆســتایەتیەکیان نەمــا لەگــەڵ بڕوادارانــدا، بەڵکــو ﴿ وَإِنِ ٱسْتَنصَرُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴾ واتــە: لــە پێنــاو شــەڕ کــردن لــە دژی ئەوانــەی کــە شــەڕیان لەگەڵــدا دەکــەن لــە پێنــاو ئاینەکەیانــدا ﴿ فَعَلَيْكُمُ ٱلنَّصْرُ ﴾ وە شــەڕ کــردن لەگەڵیانــدا، بــەڵام ئەگــەر کوشــتاریان کــرد لــە پێنــاو هــەر مەبەســتێکی تــر بێجگــە لــەوە، ئــەو کات پێویســت نیــە لەســەر ئێــوە پشــتیوانیان لــێ بکــەن.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ ﴾ واتــە: پەیمــانو گرێبەســتێک بــە واز هێنــان لــە شــەڕ، ئەگــەر ئــەو بڕوادارانــەی کــە کۆچیــان نەکــردوە ویســتیان شــەڕ لەگــەڵ بێبڕوایانــدا بکــەن، ئــەوە پشــتیوانیان لێمەکــەن، لەبــەر ئــەوەی لــە نێوانــی ئێــوەو ئــەو بێبڕوایانــەدا پەیمــانو گرێبەســتێک هەیــە ﴿ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ واتــە: لــە بارودۆخــی ئێــوە دەزانــێ، بۆیــە یاســاو ڕێســایەکتان بــۆ دادەنــێ کــە لەگەڵتانــدا بگونجــێ.

(٧٣): ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ ٧٣ ﴾:

واتــە: کاتێــک کــە گرێبەســتی پشــتیوانی لــە نێــوان بڕوادارانــدا بەســت، هەواڵیــدا کــە بێبــڕواکان هەندێکیــان دۆســتو پشــتیوانی هەندێکــی تریانــن نابــێ کــەس پشــتیوانیان بــکات بێجگــە لــە بێبڕوایــەک کــە وەکو خۆیــان بــێ.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ ﴾ واتــە: (ئەگــەر) دۆســتایەتیو پشــتیوانی بــڕوادارانو دژایەتــی بێبــڕواکان (نەکــەن)، بــە شــێوەیەک کــە بــە تەواوەتــی دۆســتایەتیان بکــەن، یــان بــە تەواوەتــی دژایەتیــان بکــەن، یــان دۆســتایەتیو پشــتیوانی بێبــڕواکان بکــەنو یــان دژایەتــی بــڕواداران بکــەن ﴿ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ ﴾ بێگومــان بــەو شــێوەیە شــەڕو خراپەیەکــی زۆر بــە دەســت دێــت، لــە تێکــەڵ کردنــی هــەقو ناهــەقو بــڕوادارو بێبــڕوادا، وە لــە دەســتدانی زۆرێــک لــە عیبادەتــە گــەورەکان وەک جیهــادو کۆچکــردن، وە جگــە لەوانــەش لــە مەبەســتو یاســاو ڕێســاکانی ئیســلام، کــە لەنــاو دەچــن ئەگــەر بــڕواداران تەنهــا خۆیــان نەکــەن بــە دۆســتو پشــتیوانی یەکتــر.

(٧٤-٧٥): ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ٧٤ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ٧٥ ﴾:

دەقەکانــی پێشــوو دەدوێــن لــە پەیوەنــدی برایەتــیو دۆســتایەتی لــە نێــوان کۆچکەرانو ئەنصــاردا، ئــەم دەقانــەش بــاس لــە وەســفو پاداشــتیان دەکات، خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ واتــە: لــە بڕوادارانــی کۆچکــەرانو پشــتیوانان ﴿ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗا ﴾ لەبــەر ئــەوەی لــە بڕواهێنانــدا ڕاســتیان کــرد لــە بەجێهێنانــی هیجــرەتو سەرخســتنو دۆســتایەتی هەندێکیــان بــۆ هەندێکــی تریــان، وە جیهــاد کردنــی دوژمنەکانیــان لــە بێبــڕواو دوو ڕووەکان ﴿ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ ﴾ لەلایــەن خــوا ﷻ کــە تاوانەکانیــان پــێ دەســڕێتەوەو هەڵەکانیــان پــەرشو بــڵاو دەکات ﴿ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴾ واتــە: خێرێکــی زۆر لــە لایــەن پەروەردگــارەوە لــە بەهەشــتی پــڕ لــە نــازو نیعمــەت، وە هەنــدێ جــار پاداشــتیان بــۆ پێــش دێــت کــە چاویــان پێــی تێــر دەبــێو دڵیــان پێــی ئــارام دەبــێ، بــە هەمــان

شـێوە ئـەوەی کـە لـە دوای کۆچکـەرانو دانیشـتوانەوە دێـت لـەوەی کـە شـوێنیان دەکەوێـت بـە چاکـە، پاشـان بـڕوا دەهێنـێو کـۆچ دەکات لـە پێنـاوی خـوادا ﷻ.
﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مِنكُمۡ﴾ ئـەوەی بـۆ ئـەوان بێـت بـۆ ئێوەیشـە، وە ئـەوەی لەسـەر ئـەوان بێت لەسـەر ئێوەیشـە، ئەمـە پشـتیوانیو دۆسـتایەتی ئیمانیـە -کـە لـە سـەرەتای ئیسـلامەوە هەبـوو- ڕۆڵێکـی کاریگـەری بینـی، تەنانـەت پێغەمبـەر ﷺ برایەتـی لـە نێـوان کۆچکـەرانو پشـتیوانان دروسـت کـرد، برایەتیەکـی تایبـەتو ڕاسـتەقینە، جگـە لـە برایەتـی گشـتگیری بـڕواداران، تەنانـەت میراتیـان لـە یەکتـر دەبـرد، پاشـان خـوا ﷻ ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ کـەس میـرات نابـات تەنهـا خـزمو کـەسو کارو خـاوەن بەشـەکان نەبێـت، ئەگـەر ئەوانیـش نەبـوون ئـەوە نزیکتریـن کـەس لـە خزمـەکان، وەک چـۆن دەقـە پیرۆزەکـە بـە شـێوەیەکی گشـتی ئامـاژەی پێـدەکات.
کـە دەفەرمـوێ: ﴿فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ﴾ واتـە: لـە حوکـمو یاسـاو ڕێسـای خـوادا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ﴾ لەوانـە ئەوەیـە کـە شـارەزایە دەربـارەی بارودۆختـان کـە بـەو شـێوەیە یاسـا ئاینیەکانتـان بەسـەردا دەسـەپێنێ کـە لەگەڵتانـدا بگونجـێ.

سوورەتی (الأنفال) تەواو بوو.


سورة التوبة
بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ (١)
فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى
ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ (٢) وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ
إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ
وَرَسُولُهُۥ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟
أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ
(٣) إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا
وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ
إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ (٤) فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ
فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ
وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟
ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٥) وَإِنْ أَحَدٌ
مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَٰمَ
ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ (٦)

## تەفسیری سووڕەتی (التوبة)

## مەدەنییە (١٢٨) ئایەتە

(١-٢): ﴿ بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ (١) فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخْزِى ٱلْكَٰفِرِينَ (٢) ﴾:

ئەمە بەری بوونی خواو پێغەمبەری خوایە لە سەرجەم ئەو بت پەرستانەی کە پەیمانیان بەستبوو، تا چوار مانگ بۆیان هەیە لەسەر زەویدا بگەڕێن بە ویستی خۆیان، پاش چوار مانگە کە نە پەیمان دەمێنێ‌و نە گرێبەست، هەمووی هەڵدەوەشێتەوە، ئەمە بۆ ئەوانەیە کە پەیمانیان بەستوە بەبێ دیاری کردنی کاتەکەی، یان کاتەکەی دیاری کراوە بە چوار مانگ کەمتر، بەڵام ئەوانە کە پەیمانیان بەستوە بە زیاتر لە چوار مانگ ئەوە دەبێ پەیمانەکەیان تەواو بکەن، ئەگەر مەترسی خیانەتیان لێنەکرێ، یان دەستپێشخەری نەکەن بە شکاندنی پەیمان.

پاشان ئەوانەی ترساند کە پەیمانیان بەستوە، ئەوان ئەگەر چی لە ئەمن‌و ئاسایشدان، بێگومان لە دەستی خوا ﷻ دەرناچن، هەر کەسێکیان بەردەوام بێت لە بتپەرستی ئەوە بێگومان خوا ﷻ ڕیسوای دەکات، ئەمە بووە مایەی ئەوەی بێنە ناو ئیسلامەوە جگە لەوانەی سەرسەخت‌و کەللە ڕەق بوون، وە بێباک بوون لە پەیمان‌و بەڵێنی خوا ﷻ.

(٣): ﴿ وَأَذَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِىٓءٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ وَرَسُولُهُۥ فَإِن تُبْتُمْ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّكُمْ غَيْرُ مُعْجِزِى ٱللَّهِ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (٣) ﴾:

ئەمە پەیمانی خوایە ﷻ بە بڕواداران لەسەرخستنی ئاینەکەی‌و لە بەرز کردنەوەی وشەی

(لا إلـه إلا اللـه)و ڕیسـواکردنو سەرشـۆ ڕکردنـی دوژمنەکانـی لـەو بتپەرسـتانەی کـە پێغەمبـەرو هاوەڵانیـان لـە مەککـە وەدەرنـا، لـە ماڵی خـوا (مزگەوتـی) حەڕام، ئـەوەی لە توانایانـدا بـوو لە ئـەرزی حیجـازدا بەرانبەریـان بەکاریـان هێنا.

خوا پێغەمبەرەکەی ﷺو بڕوادرانی سەرخسـت تا ئازاد کردنی شـاری مەککە، وە بتپەرسـتانی ڕیسـواکردو دەسەڵاتی بڕواداڕانی بە شێوەیەکی گشـتی زاڵ کرد لەو ناوچەیەدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانـی بـە بانـگ بێژەکـەی کـرد کە لـە ڕۆژی حەجی گـەورەدا، کـە بریتیە لـە ڕۆژی جەژنـی قوربـان لـە کاتـی کۆبوونـەوەی خەڵکـدا لـە مسـوڵمانو بێبڕوایـان لـە هەمـوو دوورگـەی عەرەبیـدا ڕای بگەیەنێـت کـە بێگومـان خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ بەریـن لـە بتپەرسـتان، ئیتـر هیـچ ئیعتیبارێـک بـە پەیمـانو گرێبەسـت ناکرێـت، لە هەر شـوێنێک بینـران بکوژرێـن، وە پێیـان وتـرا: نزیکی مزگەوتـی حـەڕام نەکەونەوە لە پاش ئەم سـاڵ، ئـەوەش لـە سـاڵی نۆی کۆچیـدا بوو. ئەبـو بەکری صدیـق (ڕەزای خـوای لێ بـێ) حەجی بـە خەڵکـی کـرد لـە ڕۆژی قوربانیـدا، عەلی کـوڕی ئەبـی تاڵیـب ئامـۆزای پێغەمبەر ﷺ (ڕەزای خـوای لـێ بـێ)، بەریبوونەکـەی ڕاگەیاند.

پاشـان خـوا ﷻ هانـی بتپەرسـتانی داوە بـە داوای لێخۆشـبوونو ترسـاندوونی بە بـەردەوام بوون لە شـیرکو بتپەرسـتی، پێیان دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِن تُبۡتُمۡ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِۗ ﴾ واتـە: لـە دەسـتی خـوا ﷻ دەربـاز نابـن، چونکـە خوا دەتوانـێ بەنـدە بڕوادارەکانـی زاڵ بکات بەسـەرتاندا ﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ واتـە: بە ئێشـە لە دنیادا بە کوشـتنو بەدیـل گرتنو دەربـەدەر کردن، وە لـە ڕۆژی دواییدا بـە ئاگرو ناخۆشـترین جێگـاو مەئوا.

(٤): ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٤ ﴾

ئەمـە بەری بوونێکی تەواوە لە هەموو بتپەرسـتان ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ وە بـەردەوام بـوون لەسـەر پەیمانەکەیـان، هیـچ کـەمو کوڕیەکیـان لـە پەیمانەکەیـان نەکـردوە، وە پشـتیوانی کەسـیان نەکردوە لـە دژتان، پەیمـان لەگەڵ ئەوانەدا ببەنە سـەر، تا مـاوەی دیـاری کراو، زۆر بـێ یان کەم، چونکە ئیسـلام فەرمـان بە خیانەت نـاکات، بەڵکو فەرمـان بـە وەفابـوون دەکات ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ ئەوانـەی کـە فەرمانیـان پێکراوە جێبەجێـی دەکـەن، وە خۆیـان دەپارێـزن لە شـیرکو خیانەتو سـەرپێچی کردن.

(٥): ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥ ﴾

خوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ ﴾ واتـە: کـە خـوا ﷻ کوشـتاری بتپەرسـتانی خـاوەن پەیمانـی تێـدا قەدەغەکـردوە، بریتیە لـەو چوار مانگـە (ذو القعـدة، ذو الحجـة، محرم، رجـب)، وە تەواوبوونـی کاتـی گرێبەسـتەکە بـۆ کەسـێکە کـە ماوەکەی زیاتـر بـێ لەوە، ئـەوە تا گرێبەسـتەکەی تـەواو دەبێ گەردنی ئـازادە ﴿ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ ﴾ واتـە: لـە هەر کاتو شـوێنێکدا بێت ﴿ وَخُذُوهُمۡ ﴾ بـە دیلی بیانگرن ﴿ وَٱحۡصُرُوهُمۡ ﴾ واتـە: تەنگیـان پـێ هەڵچنـن، دەرفەتیـان مەدەنـێ بەسـەر زەوی خـودا بەرفـراوان بـن، کـە دایناوە بـۆ ئـەوەی بەندایەتی تێـدا بکرێ، ئەوانە شایسـتەی ئـەوە نین بنـە دانیشـتوانی سـەر زەوی تەنانـەت شایسـتەی بسـتێکی ئەو زەویـە نین، چونکـە زەوی خوایـەو، ئەوانیـش دوژمنـی خـواو پێغەمبەرەکەیـن ﷺ، هەرچـی توانایـە دەیخەنـە کار بۆ ئـەوەی سـەر زەوی خاڵـی بکـەن لـە ئاینەکەی، خـواش ئەیەوێ هـەر ئەم نوورو ڕۆشـنایی ئاینـی خۆیـە هەبـێو بە پایانـی بگەیەنێتو سـەری بخـات، ئەگەرچـی بێبڕواکانیـش پێیان ناخـۆش بێـت ﴿ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖ ﴾ واتە: لـە هەموو ئەو شـوێنانەی کە تێپەڕ دەبـن بۆیـان دابنیشـن، هەرچی تواناتان هەیـە بیخەنە کارو بەردەوام بن لەسـەر ئـەم فەرمانە تـا تەوبـەو داوای لێخۆشـبوون دەکـەن لە شـیرکو هاوەڵ دانـان، بۆیـە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَابُواْ ﴾ لـە شـیرکو بتپەرسـتی ﴿ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتە: بـە ڕێکو پێکـی ئەنجامیاندا ﴿ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ بـەو کەسـانەی کە شایسـتەن ﴿ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡ ﴾ واتـە: وازیان لێ بهێنـن بـاوەکو ئێـوە وابن، ئەوەی بۆ ئەوانە بۆ ئێوەشـە، وە ئەوەشـی لەسـەر ئەوانە لەسـەر ئێوەشـە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ بێگومـان خوا لە شـیرکو بتپەرسـتیو سـەرپێچی خۆش دەبـێ بـۆ ئەوانەی کـە داوای لێخۆشـبوون دەکەن، وە میهرەبانـی خۆی دەڕێژێ بەسـەریاندا تـا سـەرکەوتوو بن لـە تەوبە کردنـدا، پاشـان لێیـان وەردەگرێت.

ئـەم ئایەتـە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی هەر کەسـێک ڕێگری بکات لـە بەجێهێنانـی نوێژ، یان زەکات ئـەوە کوشـتاری لـە دژ دەکرێت، تـا جێبەجێـی دەکات، وەک چـۆن ئەبو بەکری صیدیـق (ڕەزای خـوای لێبـێ) ئەوەی کرد بـە بەڵگە.

(٦): ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبْلِغْهُ مَأْمَنَهُۥ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ ﴾

لە هەموو حاڵێکدا، وە لە هەموو کەسێک لە بتپەرستەکان، خوا ﷻ باسی کردوە ئەگەر بەرژەوەندی لە نزیک کردنەوەی هەندێکیاندا هەبوو دروستە، بەڵکو پێویستە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ ﴾ واتە: داوای لێکردی پەناو داڵدەی بدەیت، وە ڕێگری بکەیت لەوەی کە زیانی پێنەگات، لەبەر ئەوەی گوێی لە فەرمایشتی خوا ﷻ بێ، وە تەماشای ئاینی ئیسلام بکات ﴿ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ ﴾ پاشان ئەگەر مسوڵمان بوو ئەوە چاکە، وە ئەگەر مسوڵمان نەبوو بیگەینە بە جێگایەک کە هێمن و ئاسوودە بێ و لە هیچ نەترسێ، ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْلَمُونَ ﴾ بە هۆی ئەوەی کەسی بێبڕوا هیچ نازانێ، لەوانەیە هەندێ جار بێبڕواییان بە هۆی نەفامیەوە بێ، ئەگەر نەفامیەکەیان لا بچێت ئیسلام هەڵدەبژێرن، بۆیە خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە پێغەمبەرەکەی، بە هەمان شێوەی ئۆممەتەکەیشی شوێن پێی ئەو هەڵبگرن، ئەگەر داوایان لێکرا پەنا بدەن تا فەرمایشتی خوا ﷻ دەبیستن.

وە لەمەدا بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرا بەدی دەکرێت بۆ مەزهەبی ئەهلی سوننە و جەماعە، کە دەڵێن: قورئان فەرمایشتی خوایە و دروستکراو نیە، چونکە خوا ﷻ قسەی پێ دەکات، داویەتیە پاڵ نەفسی خۆی بە دانەپاڵێکی سیفە بۆ مەوسووفەکەی، وە ئەمە بەتاڵی و پووچی مەزهەبی موعتەزیلە دەگەیەنێ، کە وتوویانە: قورئان دروستکراوە، وە بەڵگەی زۆر هەن ئاماژە بە بەتاڵی ئەم بۆچوونە دەکەن، ئێرە شوێنی باسکردنیان نیە.

كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ
إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟
لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧﴾
كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا۟ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا
ذِمَّةً ۚ يُرْضُونَكُم بِأَفْوَٰهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ
فَٰسِقُونَ ﴿٨﴾ ٱشْتَرَوْا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا۟ عَن
سَبِيلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرْقُبُونَ
فِى مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ ﴿١٠﴾ فَإِن
تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى
ٱلدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ وَإِن
نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُم مِّنۢ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا۟ فِى دِينِكُمْ
فَقَٰتِلُوٓا۟ أَئِمَّةَ ٱلْكُفْرِ ۙ إِنَّهُمْ لَآ أَيْمَٰنَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ
يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوْمًا نَّكَثُوٓا۟ أَيْمَٰنَهُمْ
وَهَمُّوا۟ بِإِخْرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۚ
أَتَخْشَوْنَهُمْ ۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣﴾

**(٧):** ﴿ كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۖ فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٧﴾ ﴾:

ئەمە حیکمەتی ئەوە ڕووندەکاتەوە کە خواو پێغەمبەر ﷺ بەریین لە بت پەرستان، دەفەرموێ: ﴿ كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ ﴾ ئایا هەستان بە پێویستی بڕوا هێنان؟ یان وازیان لە پێغەمبەر ﷺو بڕواداران هێنا لە ئازارو ئەشکەنجەدا بن؟ ئایا دژایەتی هەقیان نەکردو بەتاڵیان سەر نەخست؟ ئایا لەسەر زەویدا فەسادو خراپەکاریان بڵاو نەکردەوە؟ دەی هەقی خۆیەتی خوا ﷻ لێیان بەری بێ، وە هیچ پەنایەکیان نەبێ لە لای خوا ﷻ و پێغەمبەرەکەی، ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمْ ﴾ (جگە لەوانەی پەیمانتان لەگەڵیان هەیە) لە بتپەرستان ﴿ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾، بەڕاستی ئەوانەی پەیمانیان بەستبوو بە تایبەت لەم شوێنە پیرۆزەدا کە پێویستە لە بەرچاو بگیرێت ﴿ فَمَا ٱسْتَقَٰمُوا۟ لَكُمْ فَٱسْتَقِيمُوا۟ لَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، بۆیە دەفەرموێ:

**(٨-١١):** ﴿ كَيْفَ وَإِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ لَا يَرْقُبُوا۟ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ يُرْضُونَكُم بِأَفْوَٰهِهِمْ وَتَأْبَىٰ قُلُوبُهُمْ وَأَكْثَرُهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨﴾ ٱشْتَرَوْا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا فَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُمْ سَآءَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرْقُبُونَ فِى مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُعْتَدُونَ ﴿١٠﴾ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ ﴾:

﴿ كَيْفَ ﴾ چۆن بتپەرستان پەیمان دەبەنە سەر ﴿ وَإِن يَظْهَرُوا۟ عَلَيْكُمْ ﴾ بە هێزو دەسەڵات، و ڕەحمتان پێناکەن ﴿ لَا يَرْقُبُوا۟ فِيكُمْ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾ واتە: هیچ خزمایەتیو پەیمانێک ڕەچاو ناکەن، وە لە خوا ﷻ ناترسن دەربارەی ئێوە، بەڵکو بە

توندترین شێوە سزاتان دەدەن، ئەمە حاڵی ئێوەیە ئەگەر زاڵ بن بەسەرتاندا، ئەوە فریوتان نەدات کە لە کاتی ترسدا چۆن مامەڵەتان لەگەڵدا دەکەن، بێگومان ئەوان ﴿ يُرۡضُونَكُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَتَأۡبَىٰ قُلُوبُهُمۡ ﴾ خۆشەویستیو دڵسۆزیتان بۆ دەردەبڕن، بەڵام ئەوان دوژمنی ڕاستەقینەی ئێوەنو ڕقیان لێتانە ﴿ وَأَكۡثَرُهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴾ لە سنوور دەرچوونو هیچ ئاینو پیاوەتیەکیان تێدا نیە ﴿ ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا ﴾ واتە: دنیایان هەڵبژارد بەسەر ئیمان هێنان بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ، وە ملکەچ بوون بە ئایەتەکانی خوا ﷻ ﴿ فَصَدُّواْ ﴾ بە نەفسی خۆیانو ڕێگری خەڵکیشیان دەکرد ﴿ عَن سَبِيلِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٩ لَا يَرۡقُبُونَ فِي مُؤۡمِنٍ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ ﴾ لەبەر دژایەتی کردنی ئیسلامو شوێنکەوتووانی، هۆکاری ئەوەی کە وای لێکردوون دژایەتیتان بکەنو ڕقتان لێ هەڵبگرن تەنها بڕوا هێنانە، بەرگری لە ئاینی خۆتان بکەنو سەری بخەن، ئەوەی دژایەتی دەکات بیکەن بە دوژمنی خۆتان، وە ئەوەشی سەری دەخات بیکەن بە دۆستو پشتیوانتان، وە حوکمو بڕیار لە دەوری ئەو بسوڕێننەوە بە بوونو نەبوون، دۆستایەتیو دۆژمنایەتی مەکەنە شتێکی سروشتی، بە ویستی حەزو ئارەزووتان، وە شوێنی دەروونی فەرمان بە خراپە نەکەون لەوانەدا، بۆیە دەفەرمووێ: ﴿ فَإِن تَابُواْ ﴾ لە شیرکو بتپەرستیەوە گەڕانەوە بۆ بڕواهێنان ﴿ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِۗ ﴾ وە وازیان لەو دوژمنایەتیە هێنا کە لە سەردەمی بتپەرستیدا دەیانکرد، تا ببن بە بەندەی دڵسۆزی خوا ﷻ، بەم شێوەیە بەندە دەبێتە بەندەیەکی ڕاستەقینە، کاتێک کە فەرمانە گەورەکانی ڕوون کردەوە، لە بڕیارو حیکمەتو پەندو ئامۆژگاریەکان، دەفەرمووێ: ﴿ وَنُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾ واتە: ڕوونی دەکەینەوەو جیای دەکەینەوە ﴿ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴾ وتەکان بۆ ئەوان هاتوە، وە بەوان ئایەتو فەرمانەکان دەناسرێت، وە بەوان دینی ئیسلام دەناسرێ. خوایە بمانگێڕە لەو کەسانەی کە دەزانن، وە کردەوە بە زانستەکەیان دەکەن بە میهرەبانیو بەخشندەییت ئەی پەروەردگاری هەموو جیهان.

(١٢-١٥): ﴿ وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَنتَهُونَ ١٢ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣ قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ١٤ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ

قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٥﴾ ﴾

پاش ئەوەی خوا ﷻ باسی ئەو بتپەرستانەی کرد کە پابەند بوون بە پەیمانەکەیانەوە، ئێوەش پابەند بن بە پەیمانەکەتانەوەو بە وەفا بن، دەفەرموێ: ﴿ وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ ﴾واتە: پەیمانەکەیان هەڵوەشاندەوەو شکاندیان جەنگیان بەرپاکرد لە دژتاندا، یان پشتیوانیان لە دوژمنەکانتان کرد ﴿ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ ﴾واتە: تانەو تەشەریان لە ئاینەکەت داو گاڵتەیان پێدەکرد.

هەموو جۆرەکانی تانەدان لە ئاینی ئیسلام یان قورئانی پیرۆز دەچێتە ئەم چوارچێوەیەوە: ﴿ فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ ﴾واتە: دەسەڵاتدارو پیاوە گەورەکانیان تانە لە دینی خوا ﷻ دەدەن، وە دینی شەیتان سەردەخەن لەبەر ئەوەی بە تایبەت باسی کردوون، چونکە پلەو پایەیان دیارو گەورەیە، هەروەها خەڵکی گوێیان بۆ دەگرن‌و شوێنیان دەکەون، وە دەبێتە بەڵگە بۆ ئەوەی کە هەر کەسێک تانە لە ئاینی ئیسلام بداتو رێگری لێبکات، ئەوە بە پێشەوای بێبڕوایان هەژمار دەکرێت ﴿ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ ﴾واتە: هیچ پەیمان‌و بەڵێنێکیان نیە کە وەفادار بن لەسەری، بەڵکو بەردەوام خائین‌و ناپاک‌و پەیمان شکێنن، هیچ متمانەیان پێناکرێت ﴿ لَعَلَّهُمۡ ﴾لە جەنگ بەرپاکردنیان لە دژتاندا ﴿ يَنتَهُونَ ﴾(واز دێنن) لە تانەو تەشەر لە ئاینەکەتان، وە دێنە ناویەوە.

پاشان هانی داون لەسەر جەنگ کردن، ئەو وەسفانەی باسکردوە کە دەبێتە مایەی هەڵگیرسانی جەنگ لە دژیان، دەفەرموێ: ﴿ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ ﴾کە پێویست بوو رێزی لێبگرن‌و بە گەورە تەماشای بکەن؟ بەڵام ئەوان نیازیان ئەوە بوو لە خاک‌و وڵاتی دەربەدەری بکەن، هەرچی لە توانایاندا بوو درێغیان نەکرد بۆ ئەو مەبەستە ﴿ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ ﴾ کاتێک کە پەیمانیان شکاندو هاوکاری دوژمنیان کرد لەسەرتان، قورەیش پشتیوانی بەنی بەکری کرد بۆ جەنگ بەرانبەر بە خوزاعە کە هاوپەیمان بوون لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کە کوشتاریان لە دژ کردن، وەک چۆن لە کتێبی ژیاننامەدا ئاماژەی پێکراوە.

﴿ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ ﴾لە واز هێنان لە کوشتار کردنیان ﴿ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾بێگومان ئەو فەرمانی پێکردوون بە کوشتار کردنیان، وە جەختی کردوەتەوە بە ئەوپەڕی جەختکردنەوە، ئەگەر ئێوەی بڕوادارن فەرمانی خوا ﷻ جێبەجێ بکەن، لێیان مەترسن بەو هۆیەوە واز لە فەرمانی خوا ﷻ بهێنن،

قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ وَيُخۡزِهِمۡ وَيَنصُرۡكُمۡ
عَلَيۡهِمۡ وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ ١٤ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ
قُلُوبِهِمۡۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ١٥
أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تُتۡرَكُواْ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ
وَلَمۡ يَتَّخِذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَلِيجَةٗۚ
وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٦ مَا كَانَ لِلۡمُشۡرِكِينَ أَن يَعۡمُرُواْ مَسَٰجِدَ
ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلۡكُفۡرِۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ
أَعۡمَٰلُهُمۡ وَفِي ٱلنَّارِ هُمۡ خَٰلِدُونَ ١٧ إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ
ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى
ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمۡ يَخۡشَ إِلَّا ٱللَّهَۖ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ
ٱلۡمُهۡتَدِينَ ١٨ ۞أَجَعَلۡتُمۡ سِقَايَةَ ٱلۡحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلۡمَسۡجِدِ
ٱلۡحَرَامِ كَمَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَجَٰهَدَ فِي سَبِيلِ
ٱللَّهِۚ لَا يَسۡتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ
١٩ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ
وَأَنفُسِهِمۡ أَعۡظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ٢٠

پاشان فەرمانی کردوە بە جەنگ کردن لە دژیان، وە باسی سوودو گرنگی ئەوەی کردوە، هەموو ئەمانە هاندانی بڕوادارانە لەسەر کوشتنیان، دەفەرموێ: ﴿قَٰتِلُوهُمۡ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ بِأَيۡدِيكُمۡ﴾ (بجەنگن لە دژیان خوا بە دەستی ئێوە سزایان دەدات) بە کوشتن ﴿وَيُخۡزِهِمۡ﴾ (وە ڕیسوایان دەکات) کە خوا ﷻ سەری خستوون بەسەریاندا، بەڕاستی ئەوان دوژمنن پێویستە ڕیسوا بکرێن ﴿وَيَنصُرۡكُمۡ عَلَيۡهِمۡ﴾ ئەمە پەیمانێکە لە لایەن خواوە، وە مژدەیەکە بەجێی هێناوە ﴿وَيَشۡفِ صُدُورَ قَوۡمٖ مُّؤۡمِنِينَ وَيُذۡهِبۡ غَيۡظَ قُلُوبِهِمۡ﴾ لە دڵە کانیاندا جۆرێ لە ڕقو کینەی تێدایە، کە جەنگ کردنیانو کوشتنیان شیفایە بۆ دڵی بڕواداران، کاتێ کە دەبینن دوژمنانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ هەوڵ دەدەن بۆ خامۆش کردنی نووری خوا ﷻ، وە نەمانی ئەو ڕقەی لە دڵیاندا هەیە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا ﷻ بڕوادارانی خۆش دەوێو گرنگی بە بارو دۆخیان دەدات، تەنانەت شیفای دڵەکانیانو نەمانی ڕقو کینەکانیانی خستوەتە چوار چێوەی مەبەستە شەرعیەکانەوە، پاشان دەفەرموێ: ﴿وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾ لەوانەی کە دژایەتی دەکەن، بەوەی سەرکەوتوویان دەکات بۆ هاتنە ناو ئیسلامەوە، وە لە دڵەکانیاندا دەیڕازێنێتەوە، وە کوفرو خراپەکاریان لە پێش چاو ناشرین دەکات ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ شتەکان لە جێگای خۆیدا دادەنێت، وە دەزانێ کێ شایستەی بڕواهێنانە هیدایەتی دەدات، وە کێش شایستە نیە لە گومڕاییو سەرلێشواویدا دەیهێڵێتەوە.

(١٦): ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تُتۡرَكُواْ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَلَمۡ يَتَّخِذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَلِيجَةٗۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٦﴾:

-پاش ئەوەی فەرمانی جیهادی پێکردن- خوا ﷻ بە بەندە بڕوادارەکانی دەفەرموێ: ﴿أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تُتۡرَكُواْ﴾ بە بێ تاقیکردنەوەو بەڵاو ناخۆشی، وە بەوە فەرمانی کردوە ڕاستگۆو درۆزن دەربکەوێ ﴿وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ﴾ واتە: زانستێ کە کاریگەری لە دەرەوە دروست بکات،

بۆ ئەوەی پاداشتو سزای لەسەر ڕێک بخرێت، تا ئاشکرا بێ ئەوانەی کە لە پێناو بەرز ڕاگرتنی وشەی خوادا ﷻ جیهاد دەکەن ﴿ وَلَمْ يَتَّخِذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ﴾ واتە: دۆستو پشتیوانی کردن لە بێبڕواکان.

خوا ﷻ جیهادی پێویست کردوە تا مەبەستی گەورەی پێ بەدی بێ، ئەویش جیا کردنەوەی ڕاستگۆکانە کە لا ناکەنەوە تەنها بۆ دینی خوا ﷻ نەبێ، لە درۆزنەکان کە گومانی ئەوە دەبەن برِوادار بن، لە کاتێکدا غەیری خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕواداران دەکەن بە دۆست ﴿ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ واتە: دەزانێ چی لە خەیاڵتاندایەو چی دەردەخەن، تاقیتان دەکاتەوە تا حەقیقەتو ڕاستیتان بۆ دەربکەوێ، وە پاداشتتان دەداتەوە لەسەر کردەوەکانتان باشو خراپ.

(١٧-١٨): ﴿ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾ ﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَا كَانَ ﴾ ناگونجێو شایستە نیە ﴿ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُواْ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ ﴾ بە پەرستشو نوێژو هەموو جۆرەکانی تری گوێڕایەڵی، لە کاتێکدا ئەوان دان بە بێبڕوایی خۆیاندا دەنێن، بە شایەتی حاڵو سروشتیانو زۆربەشیان دەزانن لەسەر بەتاڵو بێ بنەمان، جا ئەگەر ئەوان ﴿ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ﴾ وە هەبوونی ئیمان کە مەرجە بۆ وەرگرتنی کردەوەکان، دەی چۆن دەڵێن: ئێمە مزگەوتی خوا ﷻ ئاوەدان دەکەینەوە، لە کاتێکدا کە بنەڕەتو بنەما لەواندا بوونی نیەو کردەوەکانیان پووچو بەتاڵە؟!

بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ﴾ واتە: پووچ بووەوەو ونبوو ﴿ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴾ پاشان باس لەوە دەکات کە کێ ئاوەدانکەرەوەی مزگەوتی خوایە، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ ئەوەی کە واجبەو ئەوەی کە سوننەتە، بە ئاشکراو بە نهێنی بە جێی بهێنێ ﴿ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ بەوەی کە شایستەیە ﴿ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ واتە: تەنها لە خوا ﷻ دەترسێ، دەست هەڵدەگرێ لەوەی کە خوا ﷻ قەدەغەی کردوە، کەمتەرخەمی ناکات لەوانەی کە پێویستن لەسەری، خوا وەسفیان دەکات بە سوودی ئیمانی، وە بەجێ هێنانی کردەوە چاکەکان کە دایکی هەموویان نوێژو زەکاتە، وە بە ترسان لە خوا کە سەرچاوەی هەموو خێرو چاکەیەکە، لە ڕاستیدا ئەوانە ئاوەدانکەرەوەی مزگەوتەکانن، وە شایستەی ئەوەن ﴿ فَعَسَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴾ وە (عسى)

بە مانای بێگومان دێت، بەڵام ئەوەی بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی نیە، وە لە خوا ﷻ ناترسێ، ئەمە ئاوەدانکەرەوەی مزگەوتی خوا ﷻ نیە، وە لەو دەستەو کۆمەڵە نیە کە مزگەوت ئاوەدان دەکەنەوە، ئەگەر چی بانگەشەی ئەوەش بکات.

(١٩-٢٢): ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (١٩) الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ اللَّهِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ (٢٠) يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ (٢١) خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ (٢٢)﴾:

کاتێک کە هەندێ لە مسوڵمانان، یان هەندێ لە بتپەرستان جیاوازیان هەبوو لە فەزڵو چاکەی ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتی حەرامو بونیاد نانیو نوێژ کردنو خواپەرستی تیایداو ئاودانی حاجیان لەسەر بڕوا هێنان بە خواو جیهاد کردن لە پێناویدا، خوا ﷻ هەواڵیدا بە جیاوازی نێوانیان، دەفەرموێ: ﴿أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ الْحَاجِّ﴾ واتە: ئاودان لە ئاوی زەمزەم، وەک چۆن زانراوە ئەگەر (ئاودانی حاجیان) باس بکرێ مەبەست پێی ئاوی زەمزەمە، ﴿وَعِمَارَةَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ كَمَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَجَاهَدَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾، جیهادو بڕوا بوون بە خوا ﷻ چاکترە لە ئاودانی حاجیانو ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتی حەرام بە چەندین پلەو پایە، چونکە بڕوا بوون بنەمای ئایینە، بەوە کردەوە وەردەگیرێو پلەو پایە بەرز دەبێتەوە، بەڵام جیهاد لە پێناوی خوادا ئەوە چڵە پۆپەی ئاینە بەوە ئاینی ئیسلام دەپارێزرێو بەرفراوان دەبێ، وە هەقو ڕاستی سەردەکەوێو بەتاڵو پووچیش ڕیسوا دەبێ.

بەڵام ئاوەدانکردنەوەی مزگەوتی حەرامو ئاودانی حاجیان ئەگەرچی کردەوەیەکی باشە، بەڵام لەسەر ئیمانو بڕوابوون بە خوا وەستاوە، وە ئەوەندە بەرژەوەندی لە جیهادو بڕوابووندا هەیە لە ئەودا نیە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿لَا يَسْتَوُونَ عِندَ اللَّهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ﴾ واتە: ئەوانەی کە بە ستەمکار وەسف کراونو هیچ خێرو چاکەیەک وەرناگرن، بەڵکو هیچ شتێک شایستەیان نیە تەنها شەڕو خراپە نەبێت.

پاشان بە ڕوونی باسی فەزڵو چاکە دەکات دەفەرموێ: ﴿الَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ﴾ واتە: بەبەخشین بۆ جیهاد کردنو ئامادەکردنی ئەوانەی لە پێناوی خوادا غەزا دەکەن ﴿وَأَنفُسِهِمْ﴾ بە گیانو نەفسی خۆیان دەردەچن ﴿أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ اللَّهِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ﴾ واتە: ئەوەی دەیەوێ بە دەستی ناهێنێ، وە ڕزگاری نابێ لە ترسو بیم، تەنها ئەو کەسە نەبێ کە هەمان سیفەتی ئەوانی هەبێو خووڕەوشتی ئەوانی وەرگرتبێ

يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَانٍ وَجَنَّاتٍ لَّهُمْ فِيهَا
نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ
عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ
وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ
وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ إِن
كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ
وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ
كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ
وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ
بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿٢٤﴾ لَقَدْ نَصَرَكُمُ
اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ
كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ
الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ
سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا
لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ ﴿٢٦﴾

﴿ يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم ﴾ بە بەخشندەیی خوّی‌و ڕێزو چاکەی ئەوان، وە گرنگی پێدان‌و خۆشویستنی بۆیان ﴿ بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ ﴾ شەڕو خراپەی لەسەر لابردن‌و هەموو خێرو چاکەیەکی پێگەیاندن ﴿ وَرِضْوَانٍ ﴾ واتە: وە ڕەزامەندی خوا ﷻ کە گەورەترین‌و بەرزترین نیعمەتەکانی بەهەشتە، هەرگیز لێیان تووڕە نابێ، لە هەموو ئەوانەی کە نەفس‌و دەروون حەزی لێدەکات‌و چاو چێژی لێوەردەگرێ، کە هیچ کەس ناتوانی وەسفی بکات تەنها خوا نەبێ، کە لە لایەن خۆیەوە سەد پلەی دیاری کردوە بۆ ئەوانەی جیهاد دەکەن‌و تێدەکۆشن لە پێناویدا، لە نێوانی دوو پلەدا وەک نێوان زەوی‌و ئاسمان وایە، ئەگەر هەموو خەڵکی لە یەک پلەدا دابنیشن بە فراوانی جێیان دەبێتەوە ﴿ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ﴾ناگوازرێنەوە لێی‌و هەرگیز بێزار نابن‌و داوای جێ گۆڕکێ ناکەن، وە هەرگیز حەز ناکەن لێی دەربچن ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾ زۆری ئەو کردەوانە ناگاتە فەزڵ‌و چاکەی خوا، وە هیچ شتێک ئەوەندەی ئەوە سەرسووڕهێنەر نیە کە بە شتێک بڵێی ببە دەستبەجێ ببێ.

(٢٣-٢٤): ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ إِن كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّىٰ يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾:

خوا دەفەرمووێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ کار بە پێویستیەکانی ئیمان بکەن

بــە شـێوەیەک دۆسـتایەتی ئەوانــە بکــەن کــە فەرمانەکانــی خــوا بەجــێ دەهێنــن، وە دژایەتـی ئەوانـەش بکـەن کـە بەجێیـان ناهێنـن ﴿ لَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَابَآءَكُمۡ وَإِخۡوَٰنَكُمۡ ﴾ واتــە: ئەوانــەی کــە نزیکتریــن کەســن لێتانــەوە، وە بێجگــە لــەوان لــە پێشــترە، وە مەیانکــەن بــە ﴿ أَوۡلِيَآءَ إِنِ ٱسۡتَحَبُّواْ ﴾ واتــە: بــە حــەزو ئــارەزووی خۆتــان هەڵیــان مەبژێــرن‌و مەیانکــەن بــە خۆشەویســت ﴿ ٱلۡكُفۡرَ عَلَى ٱلۡإِيمَٰنِ ﴾ (ئـا بـەم کارەتان خۆشەویســتی کوفــر بەســەر خۆشەویســتی ئیمــان زاڵ دەکــەن).

﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ چونکــە بوێریــان کــرد لەســەر ســەرپێچی کردنــی خــوا، وە دوژمنانــی خوایــان کــرد بــە دۆســت‌و پشــتیوان‌و، وە بنەمــای (ولایــة): بــە واتــای خۆشویســتن‌و سەرخســتن دێــت، بــەو جــۆرە بــە دۆســت کردنیــان وا پێویســت دەکات گوێڕایەڵــی کردنیــان پێــش بخــەن بەســەر گوێڕایەڵــی خــوادا ﷻ، وە خۆشویســتنیان بەســەر خۆشویســتنی خــواو پێغەمبەرەکەیــدا ﷺ

وە لەبــەر ئەمــە هــۆکاری پێویســت بوونــی ئــەوەی باســکردوە کــە بریتیــە لــە خۆشویســتنی خــواو پێغەمبەرەکــەی ﷺ دەبــێ پێــش بخــرێ بەســەر هەمــوو خۆشەویســتیەکەوە، وە هەمــوو شــتەکان شــوێنی ئــەوان بخــات، دەفەرمــوێ: ﴿ قُلۡ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمۡ ﴾ وە هاوشــێوەی ئــەوان دایکانیــش ﴿ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ وَإِخۡوَٰنُكُمۡ ﴾ لــە ڕەچەڵەکــدا ﴿ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ وَعَشِيرَتُكُمۡ ﴾ واتــە: خێــزان‌و هەمــوو کــەس‌و کارتــان بــە گشــتی ﴿ وَأَمۡوَٰلٌ ٱقۡتَرَفۡتُمُوهَا ﴾ واتــە: پەیداتــان کــردوەو مانــدوو بــوون لــە بــە دەســت هێنانیــدا، بۆیــە بــە تایبــەت باســی کــردوە چونکــە لــە لای خاوەنەکــەی خۆشەویســتە، زۆر ســوورە لەســەری، بــە پێچەوانــەی ئــەو کەســەی کــە ســەروەت‌و سـامانی دەسـت دەکـەوێ بەبـێ مانـدوو بـوون ﴿ وَتِجَٰرَةٞ تَخۡشَوۡنَ كَسَادَهَا ﴾ واتـە: ڕەواجــی نەمێنــێ‌و کــەم بــکات، ئەمــە گشــتگیرە بــۆ هەمــوو جــۆرە بازرگانیــەکان‌و ئەوانــەی کــە لــە دەســت دێــن لــە خســتنەڕوو بەروبــووم‌و قــاپ‌و قاچــاخ‌و چــەک‌و تەقەمەنــی‌و خواردەمەنیــەکان‌و دانەوێڵــەو ئاژەڵــەکان‌و هاوشــێوەی ئەوانــە ﴿ وَمَسَٰكِنُ تَرۡضَوۡنَهَآ ﴾ لــە جوانــی‌و ڕازاوەیــی کــە لەگــەڵ هــەواو ئارەزووتانــدا دەگونجــێ، ئەگــەر ئــەم شــتانە ﴿ أَحَبَّ إِلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٖ فِي سَبِيلِهِۦ ﴾ ئــەوە ئێــوە فاســق‌و ســتەمکارن ﴿ فَتَرَبَّصُواْ ﴾ واتــە: چاوەڕوانــی ســزا بــن ﴿ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦ ﴾ کــە هیــچ گەڕانەوەیەکــی نیــە ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾

واتــە: ئەوانــەی كــە لــە فەرمانــی خــوا ﷻ دەردەچــن، ئەوانــەی كــە یەكێــك لــەو شــتانەی بــاس كــرا خۆشەویســترە لــە لایــان لــە خــوای پەروەردگــار.

ئــەم دەقــە پیــرۆزە گەورەتریــن بەڵگەیــە لــە ســەر پێویســت بوونــی خۆشویســتنی خــواو پێغەمبەرەكــەی ﷺ وە پێــش خســتنیان بەســەر هەمــوو شــتێكەوە، وە بــە هەمــان شــێوە هەڕەشــەیەكی توونــدە لەســەر ئــەو كەســەی شــتێك لەوانــەی كــە باســكرا خۆشەویســتر بێــت لــەلای لــە خــواو پێغەمبەرەكــەیو جیهادكــردن لــە پێناویــدا.

نیشــانەی ئــەو خۆشویســتنە ئەوەیــە: ئەگــەر دوو شــتی بــۆ هاتــە پێــش دانەیەكیــان خــواو پێغەمبەرەكــەی خۆشــیان دەوێ، بــەڵام بــۆ نەفــسو ئــارەزووی هیــچ ســوودێكی تێــدا نیــە، وە ئەویتریــان نەفــسو ئــارەزووی حــەزی پێــدەكات، بــەڵام خۆشەویســتی خــوا ﷻ لــە دەســت دەدات یــان لاوازو كەمــی دەكات، ئەگــەر ئــەوەی پێــش خســت كــە نەفــسو هــەواو ئــارەزووی خــۆی حــەزی پێــدەكات ئــەوە بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی كەســێكی ســتەمكارە، وە وازی لــەوە هێنــاوە كــە پێویســتە لەســەری.

(٢٥-٢٧): ﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ ۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٧﴾ ﴾:

خــوا ﷻ منــەت دەكات بەســەر بەنــدە بڕوادارەكانیــدا بەسەرخســتنیان لــە چەندیــن شــوێندا تەنانــەت لــە ڕۆژی حونەینیشــدا لــە ئــەو پــەڕی نارەحەتیــدا بــوون، زەلیلــیو ڕاكردنیــان بــە چــاوی خۆیــان بینــی، زەویــش بــەو فراوانیــەوە لــە پێــش چــاوی ئەوان تەنــگ بــوو، كاتێــك كــە پێغەمبــەر ﷺ شــاری مەككــەی ڕزگــار كــرد بیســتی كــە هــەوازن خۆیــان ئامــادە كــردوە بــۆ بەرپاكردنــی جەنــگ ئەویــش ڕووی تێكــردن لەگــەڵ ئــەو هاوەڵانــەدا كــە فەتحــی مەككەیــان كــرد وە ئەوانەیشــی كــە مســوڵمان بــوون پــاش ئازادكردنــی مەككــە لــە خەڵكــی مەككــە، ڕێژەیــان دەگەیشــتە دوازدە هــەزار كــەس، وە بتپەرســتانیش چــوار هــەزار كــەس بــوون، هەنــدێ لــە مســوڵمانان ســەریان ســوورما بــە زۆریــانو وتیــان: ئەمــڕۆ بــە هــۆی كــەم بوونمانــەوە ناشــكێین، كاتێــك كــە ڕووبــەڕووی هــەوەزان بوونــەوە هێرشــیان بــردە ســەر مســوڵمانان،

مسـولْمانان تێکشـکانو کـەس ئـاوڕی لەویتـر نەدەدایـەوە، تەنهـا سـەد پیـاو لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ مایـەوەو دەجەنگـان لـە دژی بتپەرسـتان، وە پێغەمبـەر ﷺ بـە سـەر چـوار پێکەیـەوە هێرشـی دەبـرد ڕوبـەڕووی بتپەرسـتانو دەیفەرمـوو: {أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ} (أخرجـه أحمـد برقـم: (١٨٤٩١)، والبخـاري برقـم: (٢٧٠٩)، ومسـلم برقـم: (١٧٧٦)).

واتـە: مـن پێغەمبـەرم درۆ ناکـەم مـن کـوڕی عەبـدول موتەلیبـم، کاتێـک کـە مسـولْمانانی بینـی بـەو شـێوەیە فەرمانـی کـرد بـە عەبباسـی کـوڕی عەبـدول موتەلیـب کـە لـە نـاو پشـتیواناو ئـەو مسـولْمانانەی کـە ماونەتـەوە بـە دەنگێکـی بـەرز هـاوار بـکاتو بڵێـت ئـەی هاوەڵانـی (السـمرة)! ئـەی هاوەڵانـی سـوورەتی بەقـەرە! کاتێـک کـە گوێیـان لـە دەنگـی بـوو سـۆزیان بـۆی جـوڵا ڕوویـان کـردە بتپەرسـتانو هێرشـیان بـۆ بـردن، خـوا ﷻ بتپەرسـتانی بـە خراپتریـن شـێوە تێکشـکاند، وە دەسـتیان گـرت بەسـەر سـەربازگەو ژنو منداڵەکانیانـدا، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ﴾حونەیـن: ئـەو شـوێنەیە کـە دەکەوێتـە نێـوان مەککـەو طائیفـەوە ﴿ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْئًا ﴾واتـە: کەمـیو زۆریـان هیـچ سـوودێکی نەبـوو بۆتـان ﴿ وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الْأَرْضُ ﴾ بـەوەی کـە تووشـتان بـوو لـە خـەمو خەفـەت کاتێـک کـە تێکشـکان ﴿ بِمَا رَحُبَتْ ﴾ واتـە: بـە گوشـادیو بەرفراوانیـەوە ﴿ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴾واتـە: تێکشـکان ﴿ ثُمَّ أَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ ﴾ وە (سـکینة) ئارامـیو ئۆقرەیـی، خـوا دەینێـرێ بـۆ سـەر دڵـەکان لـە کاتێکـدا کـە تووشـی نارەحەتـیو ناخۆشـی دەبـن تـا ببێتـە مایـەی ئـەوەی چەسـپاو بـنو بـکات بـە ئارامیـەک بـۆ دڵەکانیـان، وە بریتیـە لـە نیعمەتێکـی خـوا بەسـەر بەندەکانیـەوە ﴿ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ﴾ بریتـی بـوون لـە فریشـتەکان، خـوا دایگرتـن بـۆ پشـتیوانی کردنـی بـڕواداران لـە جەنگـی حونەینـدا بـۆ ئـەوەی جێگیریـان بکـەنو مـژدەی سـەرکەوتنیان پـێ بـدەن ﴿ وَعَذَّبَ الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾ بـە تێکشـکانو کوشـتنو دەسـتگرتنی مسـولْمانان بەسـەر ژنو مـاڵو منداڵیانـدا ﴿ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْكَافِرِينَ ﴾ (ئـەوە سـزای کافرانـە) لـە دنیـادا خـوا ﷻ سـزایان دەدات، پاشـان لـە ڕۆژی دوایـدا سـزایەکی سـەختو بـە ئێشـی بـۆ ئامـادە کـردوون

ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ
غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٢٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ
نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ
وَإِنۡ خِفۡتُمۡ عَيۡلَةٗ فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦٓ
إِن شَآءَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٢٨ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ
لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ
مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ
ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ
وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ
وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم
بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ
قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ٣٠ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ
وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ
مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ
لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣١

﴿ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ﴾ خـوا لـە زۆرێـک لەوانـە خۆشـبوو کـە لـە جەنگەکـەدا تێکشـکان، وە هاتـن بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ مسـوڵمان بـوونو داوای لێخۆشـبوونیان کـرد، پێغەمبـەر ﷺ ژنو منداڵەکانـی پێدانـەوە ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ واتـە: خـاوەن لێ خۆشـبوونێکی بەرفراوانـە، لـە تاوانـە هـەرە گـەورەکان خـۆش دەبـێ، وە بـە میهرەبانـی خـۆی سـەرکەوتوویان دەکات لـە تەوبـە کـردنو گوێڕایەڵـی کردنـدا، دەی بـا هیـچ کـەس بـێ هیـوا نەبـێ لـە لێخۆشـبوونو میهرەبانـی خـوا ﷻ ئەگـەر هەرچەنـدە تـاوانو گونـاەو سـەرپێچی کردبـێ.

(٢٨): ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ عَيۡلَةٗ فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦٓ إِن شَآءَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٢٨﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ﴾ ئەوانـەی کـە جگـە لـە خـوا دەپەرسـتن ﴿نَجَسٞ﴾ واتـە: بیـرو بـڕواو کردەوەیـان پیسـە، چـی لـەوە پیسـترە لەگـەڵ خـوادا شـتێکی تـر بپەرسـترێ کـە هیـچ سـوودو زیانێکـی نەبـێ؟! وە کردەوەکانیـان لـە نێـوان دژایەتـی خـوا ﷻو بەربەسـتی ڕێگـای خـواو سەرخسـتنی بەتـاڵو پـووچو ڕەتکردنـەوەی هـەق دایـە، وە فەسـادو خراپـەکاری لەسـەر زەویـدا دەنێنـەوە، پێویسـتە لەسـەرتان پیرۆزتریـن مـاڵ بـە پـاک ڕابگـرنو لێیـان پـاک بکەنـەوە ﴿فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَا﴾ ئەویـش لـە سـاڵی نـۆی کۆچیـدا بـوو، کاتـێ کـە ئەبـو بەکـری ڕاسـتگۆ حەجـی ماڵـی خـوای بـە خەڵکـی کـرد، پێغەمبـەر ﷺ عەلـی ئامـۆزای نـارد کـە بـەری بـوون ڕابگەیەنێـت لـە بتپەرسـتان لـە ڕۆژی حەجـی گـەورەدا، ئەویـش بانگـی کـرد: پـاش

ئـەم سـاڵ، هیـچ بتپەرسـتێک بـۆی نیـە حـەج بـکات، وە بـە ڕووتیـش تـەواف نـەکات بـە دەوری ماڵـی حەرامـدا.
مەبەسـت لێـرەدا پیسـی جەسـتە نیـە، بێبڕوایـش وەک کەسـێکی تـر جەسـتەی پاکـە، بـە بەڵگـەی ئـەوەی خـوا ﷻ جیماعـی لەگـەڵ ئەهلـی کتێبـدا حـەڵاڵ کـردوە، وە فەرمانـی نەکـردوە ئـەو شـوێنەی بـەر جەسـتەی دەکـەوێ بشـۆردرێ.
وە مسـوڵمانان بـەردەوام بەریـەک دەکەوتـن لەگـەڵ بێبڕواکانـدا، نەزانـراوە لێیانـەوە کـە قێزیـان لێبکەنـەوە، وەک چـۆن قێـز لـە پیسـی دەکەنـەوە، بەڵکـو مەبەسـت پیسـی مەعنەوییـە بـە شـیرکو هـاوەڵ دانـان، وەک چـۆن یەکتاپەرسـتی بـڕوا پـاکو بێگـەردە، بـە هەمـان شـێوە شـیرکو بتپەرسـتی پیسـە. وە دەفەرمـوێ: ﴿وَإِنۡ خِفۡتُمۡ﴾ ئـەی مسـوڵمانان ﴿عَيۡلَةً﴾ واتـە: هەژاریـیو نەداریـی، لـە ڕێگـری کردنـی بتپەرسـتان لـە مزگەوتـی حـەرام، بـەوەی هـۆکارەکان لـە نێـوان ئێـوەو ئەوانـدا دەپچڕێـت لـە کارو بـارە دنیایەکانـدا ﴿فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦٓ﴾ ڕزقو ڕۆزی تەنهـا یـەک سـەرچاوەی نیـە، بەڵکـو هـەر دەرگایـەک دابخـرێ چەندیـن دەرگـای تـر دەکرێتـەوە، فـەزڵو چاکـەی خـوا زۆرەو لەبـن نایـەت، بـە تایبـەت کەسـێک لەبـەر خـوا واز لـە شـتێک بهێنـێ، بێگومـان خـوا بەخشـندەی بەخشـندەکانە، خـوا ﷻ بەڵێنەکـەی خـۆی بـەدی هێنـا، بـە فـەزڵو چاکـەی خـۆی مسـوڵمانانی دەوڵەمەنـد کـرد، ئەوەنـدە ڕزقو ڕۆزی بەسـەریان دابارانـد تـا بـوون بـە گەورەتریـن دەوڵەمەنـدو دەسـەڵاتدار.
وە کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِن شَآءَ﴾ دەوڵەمەنـدی هەڵواسـیوە بـە ویسـتەوە، چونکـە دەوڵەمەنـدی لـە دنیـادا لـە پێویسـتی ئیمـان نیـە، وە بەڵگـە نیـە لەسـەر خۆشەویسـتی خـوا، بۆیـە خـوا ﷻ پەیوەسـتی کـردوە بـە ویسـتەوە، بێگومـان خـوا ﷻ دونیـا دەدات بـەوەی خۆشـی دەوێو ئەوەشـی خۆشـی نـاوێ، وە ئیمـان نابەخشـێ بـەو کەسـە نەبـێ کـە خۆشـی دەوێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ واتـە: زانسـتی بەرفراوانـە، دەزانـێ کـێ شایسـتەی دەوڵەمەندیـە، وە کـێ شایسـتە نیـە، وە شـتەکان لـە جێگـای خۆیـدا دادەنـێ، بـە پێـی پلـەو پایەیـان، دەقـە پیرۆزەکـە دەبێتـە بەڵگـە، ئەویـش ئـەم فەرمایشـتەیە: ﴿فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَا﴾ دوای ئـەوە بتپەرسـتان خـاوەن دەسـەڵات بـوون لـە ماڵـی حەرامـدا، پـاش ئـازاد کردنـی

دەســەڵات کەوتــە دەســت پێغەمبــەر ﷺو بــڕواداران، لەگــەڵ مانەوەیانــدا لــە نــاو ماڵــی حــەڕامو مەککــەی ڕێزلێگیــراو، پاشــان ئــەم دەقــە دابەزیــە خــوارەوە. لــە پــاش مردنــی پێغەمبــەر ﷺ فەرمــان کــرا حیجــاز چــۆڵ بکرێــت، دوو ئاینــی تیــادا نەمێنــی، هەمــوو ئەمانــە بــە هــۆی دوورخســتنەوەی بێبــڕواکان بــوو لــە مزگەوتــی حــەڕام، کــە ئــەم ئایەتــە دەیگرێتــەوە: ﴿ فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَـٰذَا ﴾ (واتــە: لــەم ســاڵ بــە دواوە نابــێ بتپەرســتان تووخنــی مزگەوتــی حــەڕام بکــەون).

(٢٩): ﴿ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾:

دەفەرمــوێ: ﴿ قَـٰتِلُوا۟ ﴾ ئــەم ئایەتــە فەرمــان بــە جەنــگ کــردن دەکات لــە دژی جوولەکــەو گــاورەکان، ﴿ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ﴾ کــە بروایەکــی ڕاســتەقینە لــە کردەوەکانیانــدا دەربکــەوێ، ﴿ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ﴾ شــوێنی شــەرعو ئاینەکــەی ناکــەون لــە قەدەغەکردنــی قەدەغەکراوەکانــدا ﴿ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ ﴾ واتــە: پەیــڕەوی ئاینــی هــەق نابــن، ئەگــەر چــی وا گومــان بــەن کــە ئــەوان لەســەر هەقــن، بێگومــان ئــەوان لەســەر ئاینێکــی ناڕاســتن، چونکــە لــە نێــوان ئاینێکــی دەســتکاری کــراودان کــە خــوا ﷻ نەیکــردوە بــە یاســاو ڕێســا بۆیــان، وە یــان ئاینێکــی نەســخ کــراوو هەڵوەشــێنراوە کــە خــوا شــەرعی کــردوە، پاشــان گۆڕیویەتــی بــە شــەریعەتی موحەممــەد ﷺ، ئــەو کات لــە پــاش نەسخ پابەنــد بــوون پێیــەوە دروســت نیــە، فەرمانــی کــردوە بــە کوشــتنی ئەوانــە، وە هانــی لەســەر داون، چونکــە بانگەشــە بــۆ ئــەوە دەکــەن کــە لەســەری دەڕۆن، زیانێکــی زۆر بــە خۆیــانو خەڵکــی دەگەیەنــن، بــە هــۆی ئــەوەی ئــەوان شــوێنکەوتووی کتێبــن. وە ئــەو کوشــتارەی دیــاری کــردوە ﴿ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ ﴾ واتــە: ئــەو ماڵــەی کــە لــە بــری واز هێنانــی مســوڵمانان لــە کوشــتار کردنیــان، وە پاراســتی ئەمــنو ئاسایشــی نەفــسو مــاڵو ســامانیان لەنــاو مســوڵماناندا، هەمــوو ســاڵێ لێیــان وەردەگیرێــت، هــەر کەســەو بــە پێــی بارووەدۆخــی، لــە هــەژارو دەوڵەمەنــدو ناوەنــد، وەک چــۆن پێشــەوای بــڕواداران عومــەری کــوڕی خەتتــابو غەیــری وی لــە پێشــەواکانی بــڕواداران ئــەو کارەیــان ئەنجامــداوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ عَن يَدٍ ﴾ واتـە: بـە دەسـتی خۆیـان دەیـدەن، نابـێ خزمەتـکار، یـان بێجگـە لـەو کەسـێکی تـر بنێـرن، بەڵکـو لێـان وەرناگیـرێ بـە دەسـتی خۆیـان نەبـێ ﴿ وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴾ ئەگـەر بـارووداۆخ بـەم شـێوەیە بـوو داوایـان کـرد لـە مسـوڵمانان دان بنێـن بـە سـەرانەدا، وە ئـەوان لـە ژێـر دەسـتی مسـوڵماناندا بـوون، ترسـیان نەمـا لـە شـەڕو پلانیـان، وە ڕازی بـوون بـەو مەرجانـەی بەسـەریاندا دەسـەپێنن، کـە سـەربەرزیو لـووت بەرزیـان نەمێنـێ، وە زەلیلـی بـە کـەم تەماشـا کردنیـان پێویسـت ببـێ، پێویسـتە لەسـەر پێشـەوا، یـان جێگرەکـەی گرێبەسـتیان بـۆ بـکات، ئەگـەر بـە جێیـان نەهێنـا، وە سـەرانەیان نـەدا بـە سەرشـۆڕیو ڕیسـوایی، ئـەوە دروسـت نیـە دان بـە بـاجو سـەرانەدا بنرێـت، بەڵکـو شـەڕیان لەگەڵـدا دەکـرێ تـا مسـوڵمان دەبـن.

زۆربـەی زانایـان ئـەم دەقەیـان کردوەتـە بەڵگـە کـە دەڵێـن: بـاجو سـەرانە تەنهـا لـە خـاوەن کتێـب وەردەگیـرێ، چونکـە خـوا ﷻ باسـی وەرگرتنـی بـاجو سـەرانەی نەکـردوە تەنهـا لـەوان نەبـێ، بـەڵام بێجگـە لـەوان هیـچ بـاس نەکـراوە تەنهـا کوشـتنیان نەبـێ تـا مسـوڵمان دەبـن، وە مەجـووسو ئاگـر پەرسـت هەڵواسـراوە بـە خـاوەن کتێبـەوە لـە وەرگرتنـی بـاجو سـەرانە، وە بوونیـان لـە وڵاتـی مسـوڵماناندا، پێغەمبـەر ﷺ بـاجو سـەرانەی لـە ئاگرپەرسـتی (هەجـەر) وەرگـرت، پاشـان پێشـەوای بـڕواداران عومـەر لـە فارسـەکانی وەرگـرت.

وە وتـراوە: سـەرانە لـە هەمـوو بێبڕوایـەک وەردەگیـرێ لـە خـاوەن کتێـبو غەیـری ئـەوان، چونکـە ئـەم دەقـە پـاش لێبوونـەوە لـە کوشـتاری عەرەبـە بتپەرسـتەکان دابـەزی، وە دروسـتی جەنـگ کـردن لـە دژ خـاوەن کتێـبو هاوشـێوەکانیان، ئـەم بەسـتنەوەیە دەبێتـە هـەواڵ بـۆ واقیـعو ئێسـتا نـەک بـە تێگەیشـتن لێـی.

ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئاگرپەرسـتەکان بـاجو سـەرانەیان لێوەرگیـراوە، لـە کاتێکـدا خـاوەن کتێـب نەبـوون، وە لەبـەر ئـەوەی بـە ڕێگـای (تواتـر) لـە مسـوڵمانانەوە لـە هـاوەڵان، وە پـاش ئـەوان بانگـی ئەوانەیـان دەکـرد کـە لـە دژیانـدا دەجەنگـن بـۆ سـێ شـت: یـان ئیسـلام، یـان بـاجو سـەرانە، یـان شمشـێر، بەبـێ جیـاوازی لـە نێـوان خـاوەن کتێـبو غەیـری وان.

(٣٠-٣٣): ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ يُضَـٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَـٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣١﴾ يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾:

کاتێـک کـە خـوا ﷻ فەرمـان بـە جەنـگو کوشـتار دەکات لـە دژی خـاوەن کتێبـەکان، بـاس لـە وتـە ناشـرینەکانیان دەکات کـە مسـوڵمان هانـدەدات، ئەوانـەی کـە غیرەتیـان دەجوڵـێ لەبـەر خـوا بـۆ کوشـتنیان، وە هەوڵـدانو خـەرج کردنـی تواناکانیـان لـەو بـوارەدا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ ﴾ ئـەم وتەیـە ئەگـەر چـی وتـەی هەموویـان نیـە، دەسـتەیەکیان ئەمەیـان وتـووە، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە لـە نـاو جوولەکـەدا ئەوەنـدە خراپـەو تـاوان هەبـووە بۆیـە گەیاندوونـی بـەو قۆناغـە، تـا ئـەو قسـەیان وتـووە کـە بوێریـان نوانـدوە بەسـەر خـوادا ﷻ، وە گەورەیـیو شـکۆی ئەویـان بـە کـەم تەماشـا کـردوە.

وتـراوە: هـۆکاری ئـەوەی کـە وتوویانـە: عوزەیـر کـوڕی خوایـە، کاتـێ کـە خـوا دەسـەڵاتی پاشـاکانی زاڵ کـردوە بەسـەر نەوەکانی ئیسـرائیلدا، وە بە خراپتـرین شـێوە سـزاو ئەشـکەنجەیان داون، وە هەڵگرانـی تەوراتیـان کوشـت، پـاش ئـەوە عوزەیریـان بینـی کـە تەوراتـی لەبـەرە یـان بەشـێکی زۆری، بـە لەبـەر بـۆی خوێندنـەوەو ئەوانیـش لەبەریـان گرتـەوەو کۆیـان کـرد، ئـەو بانگەشـە ناشـرینەیانە داوە پاڵـی.

﴿ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ﴾ عیسـای کـوڕی مەریـەم ﴿ ٱبْنُ ٱللَّهِ ﴾ (کـوڕی خوایـە)، خـوا ﷻ فەرمـووی: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئـەو قسـەی کـە کردیـان ﴿ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ﴾ هیـچ بەڵگەیەکیـان نەبـوو بـۆ ئـەو مەبەسـتە، وە هـەر کەسـێک بـە خەیاڵـدا نەیـە چـی دەڵـێو چـی بەدەمیـدا دێـت، هەرچـی بڵـێ سەرسـوڕهێنەر نیـە، بێگومـان ئـەوە نـە ئاییـنو نـە عەقڵـێ نیـە ڕێگـری لـێ بـکات لـە قسـە کـردن، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ يُضَـٰهِـُٔونَ ﴾ واتـە: خۆیـان دەشـوبهێنن لـەم وتەیانـدا ﴿ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ﴾ واتـە: وتـەی ئـەو بتپەرسـتانەی کـە دەیانـوت: فریشـتەکان

کچی خـوان، وتەکانیـان لـە یەکتـر دەچـوو لـە بەتاڵـیو بـێ ماناییـدا ﴿قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾ واتـە: چـۆن پشـت لـە هـەقو ڕاسـتیو ئاشـکرا دەکەن، وە ڕوو دەکەنـە وتـەی بەتـاڵو بـێ مانـا؟!

ئەمـە -جێـی سەرسـوڕمانە کـە ئۆممەتێکـی زۆرو گـەورە لەسـەر وتەیـەک یەکدەنـگ بـن- کەمتریـن بیرکردنـەوەو لاوازتریـن عەقـڵ دەزانـی کـە ئـەوە ناهەقـە، ئـەوەش دیـارە هۆکارێکـی هەبـووە، ئـەوان ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ﴾ واتـە: زاناکانیـان ﴿وَرُهْبَـٰنَهُمْ﴾ واتـە: ئەوانـەی خۆیـان یەکلاکردوەتـەوە بـۆ بەندایەتـی کـردن، کـردوون بـە ﴿أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ (چەنـد پەروەردگارێـک لـە غەیـری خـوا) واتـە: بۆیـان حـەڵاڵ دەکـردن ئەوانـەی کـە خـوا حەرامـی کـردوە، وە بۆیـان حـەرام دەکـردن ئەوانـەی کـە خـوا ﷻ حەڵاڵـی کـردوە، وە یاسـاو شـەرعیان بـۆ دادەنـان، وە وتـەی پێچەوانـە بـە دیـنو ئاینـی پێغەمبـەران، ئەوانیـش شـوێنیان دەکەوتـن، بـە هەمـان شـێوە ڕۆدەچـوون لـە پیـاو چـاکو خواناسـەکانیانداو بـە گەورەیـان ڕادەگرتـن، وە گۆڕەکانیـان دەکردنـە پەرسـتگاو دەیانپەرسـتن، قوربانیـان بـۆ سـەردەبڕینو لێیـان دەپاڕانـەوەو هاواریـان پـێ دەکـردن ﴿وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ﴾ واتـە: کردیـان بـە پەرسـتراو بێجگـە لـە خـوا، ئـەوان لەمـەدا پێچەوانـەی فەرمانـی خـوا ﷻ دەجوڵانـەوە لەسـەر زاری پێغەمبەرانـی، بـە هیـچ شـێوەیەک فەرمانیـان پـێ نەکرابـوو ﴿أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓاْ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ مەگـەر بـە دڵسـۆزیەوە بیپەرسـتنو لێـی بپاڕێنـەوەو خۆشـیان بـوێ، فەرمانـی خوایـان پشـتگوێ خسـتو هاوەڵیـان بـۆ خـوا ﷻ دانـا لـە شـتانێکدا کـە خـوا ﷻ هیـچ بەڵگـەی لەسـەری نەناردوەتـەوە خـوار، ﴿سُبْحَـٰنَهُۥ﴾ بـەرزی بـۆ تـۆ ئـەی خوایـە ﴿عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتـە: پاکـیو بێگـەردی، وە بـەرزی بـۆ تـۆ لـە هاوبـەش دانـانو درۆ بـە دەم کردنیانـەوە، بێگومـان ئـەوان لـەوەدا سـیفەتی خـوا بـە ناتـەواو لـە قەڵـەم دەدەن، بـە شـێوەیەک وەسـفی دەکـەن لەگـەڵ گەورەیـی ئـەودا ناگونجـێ، خـوا بـەرزو بڵنـدە لـە وەسـفو کردارەکانیـدا لـە هەمـوو ئەوانـەی دەدرێتـە پاڵـی کـە لەگـەڵ کەماڵـی پیـرۆزی ئـەودا ناگونجـێ، کاتێـک کـە ڕوون بوویـەوە کـە ئـەوان بەڵگەیـان بـە دەسـتەوە نیـە لـەوەی کـە وتوویانـە، وە هیـچ بنەمایەکیـان نیـە لەسـەری بـڕۆن، تەنهـا وتەیەکـە وتوویانـەو درۆیەکـە هەڵیـان بەسـتوە، هەواڵـی داوە ئـەوان

يُرِيدُونَ أَن يُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن
يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ
رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ
كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ ۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ
أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۗ وَٱلَّذِينَ
يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى
سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا
فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ
وَظُهُورُهُمْ ۖ هَـٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ
تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ
شَهْرًا فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ
أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ۚ فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ
أَنفُسَكُمْ ۚ وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا
يُقَـٰتِلُونَكُمْ كَآفَّةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾

﴿ يُرِيدُونَ ﴾ بەمە (دەیانەوێ) ﴿ أَن يُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ ﴾.

نووری خوا: ئاینە کەیەتی کە پێغەمبەرانی پێ ناردووەو کتێبەکانی پێ دابەزاندووە، خوا ﷻ ناوی ناوە بە نوور لەبەر ئەوەوە ڕووناکی پێدەبەخشێ لە تاریکی نەفامیی ئایینە پووچەکان، بەڕاستی ئەوە زانستی ڕاستو کردەوەی ڕاستە، غەیری ئەوە پێچەوانەکەیەتی، جوولەکەو گاورەکانو ئەوانەی لەوان دەچن لە بتپەرستان، دەیانەوێ نوورو ڕووناکی خوا بکوژێننەوە تەنها بە وتەکانیان، کە بە هیچ شێوەیەک بەڵگەیەکی لەسەر نیە ﴿ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ ﴾ چونکە نوورو ڕووناکیەکی ئاشکراو ڕوونە ئەگەر هەموو خەڵکی کۆ بینەوە ناتوانن بیکوژێننەوە، وە ئەوەی کە دایبەزاندووە ناوچاوانی هەموو بەندەکانی بەدەستە، خۆی بەڵێنی بە پاراستنی داوە لە هەر کەسێک کە بیەوێ زیانی پێبگەیەنێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَيَأْبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴾ وە ئەگەر هەوڵیش بدەن هەرچی لە توانایاندا هەیە بۆ بە تاڵ کردنەوەی، ئەوە هەوڵو ماندوبوونەکەیان بێ ئەنجام دەبێ.

پاشان خوا ﷻ ئەم نوورەی ڕوون کردوەتەوە کە بەڵێنی داوە تەواوی بکاتو بیپارێزێ، دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ ﴾ کە بریتیە لە زانستی بە سوود ﴿ وَدِينِ ٱلْحَقِّ ﴾ کە کردەوەی چاکە، خوای گەورە پێغەمبەر ﷺ ی ناردوە لە سەر ڕوونکردنەوەی هەقو ڕاستی لە بەتاڵو پووچ لە ناوو سیفەتو کردەوەکانی خوا ﷻ، وە لەسەرجەم فەرمانو هەواڵەکانیدا، وە فەرمانکردن بە هەموو بەرژەوەندیەک کە سوودو قازانجی هەبێت بۆ دڵو ڕووحو جەستە بە دڵسۆزی نواندن، بۆ خوای تاکو تەنهاو بەندایەتی کردنی، وە فەرمان بە ڕەوشتی بەرزو جوانو کردەوەی چاک، وە قەدەغە

کردنی هەر شتێک کە پێچەوانەی ئەوە بێتو هەڵیوەشێنێتەوە لە ڕەوشتو کردەوەی ناشرین، کە زیانی هەبێ بۆ دڵو ڕووحو جەستە لە دنیاو دواڕۆژدا، خوا ڕێنمایی کردوە بە ئاینی هەق.

﴿ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی بەسەر گشت ئاینەکانی تردا زاڵ بێ بە بەڵگەی ڕوونو ئاشکرا، ئەگەرچی موشریکو بتپەرستانیش پێیان ناخۆش بێو ڕێگری لە بەردەم دا دروست بکەنو هەموو فێڵەکانیان بەکاربهێنن، دیارە فێڵی خراپ تەنها خاوەنەکەی زەرەرمەند دەکات، خوا ﷻ پەیمانی داوە کە پەیامەکەی ئاشکرا بکات.

(٣٤-٣٥): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾:

ئەمە ئاگادار کردنەوەیەکە لە لایەن خوا ﷻ بۆ بەندە بڕوادارەکانی لە زۆرێک لە ئەحبارو ڕوهبانەکان واتە: زاناو خواناسو گۆشەگیرەکان، ئەوانەی کە ماڵی خەڵکی بە بەتاڵو هاوەنتە دەخۆن، وە ڕێی خوایان لێ دەگرن، ئەوانە ئەگەر موچەیەک وەربگرن لە ماڵو سامانی خەڵکی ئەوە تەنها بە هۆی زانستو گۆشەگیریو خواپەرستنیانەوەیە، لە بەر ئەوەیە ڕێگای ڕاستیان پێ نیشان بدەن، بەڵام ئەوان ماڵەکانیان دەبردنو ڕێگری خەڵکیان دەکرد لە ئاینی خوا ﷻ، وەرگرتنی ماڵو سامان بەم شێوەیە زوڵمو ستەمێکی گەورەیە، چونکە خەڵکی ماڵو سامانیان پێدان بۆ ئەوە ڕێنماییان بکەن بۆ ڕێگای ڕاست.

وە بردنیان لە ماڵی خەڵک بە ناهەق بۆ ئەوە بوو ماڵیان پێدان کە فتوایان بۆ بدەن، یان بڕیارێکیان بۆ بدەن لە شتێکدا کە خوا ﷻ دای نەبەزاندبێ، ئەو زاناو خواپەرستانەیان دەبێ لە دوو حاڵەت خۆیان لێ بپارێزن، وەرگرتنی ماڵی خەڵک بە ناهەق، وە ڕێگریکردنیان لە ڕێگای خوا ﷻ ﴿ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ ﴾ واتە: دەستیان پێوە دەگرن ﴿ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: لە ڕێگای چاکەدا کە دەیگەیەنێ بە خوا ﷻ، ئەمەش کۆکردنەوەو هەڵگرتنێکی حەرامە، کە بیگرێتەوە

لـەو بەخشـینەی کە پێویسـتە، وەک ئەوەی زەکاتـی ماڵەکەی دەرنەکات، یـان هەقو مافی ژنەکانـی نـەدات، یـان خزمو کەسـەکانی، یان بەخشـین لە پێنـاوی خوادا بـۆ جیهاد کردن ئەگـەر پێویسـتی کـرد، ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ پاشـان شـیکردۆتەوە بـە ئایەتی: ﴿يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا﴾ واتە: لەسـەر ماڵو سـامانەکانیان ﴿فِي نَارِ جَهَنَّمَ﴾ هەموو دینارو درەمێکیـان بـۆ سـوور دەکرێتـەوە ﴿فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ﴾ لە ڕۆژی دوایـیـدا هـەر کـە سـارد بوویـەوە جارێکـی تـر گـەرم دەبێتـەوە، لـە ڕۆژێکدا کە ئەنـدازەی پەنجـا هـەزار سـاڵە، وە بـە سەرزەنشـتو لۆمـەوە پێیـان دەوتـرێ: ﴿هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ﴾ خـوا ﷻ سـتەمی لێنەکـردوون بەڵکو ئێـوە سـتەمتان لە نەفـسو دەروونـی خۆتان کـردوە، وە سـزاتان دراوە بە هـۆی هەڵگرتنی ئـەم ماڵو سـامانەوە.

## لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا باسی لادانی مرۆڤی کردوە بە دوو شێوە:

یەکـەم: یان ئەوەیە ماڵو سـامانەکەی لە شـتێکی بێ نرخدا خـەرج دەکاتو هیچ قازانجێکی نیـە، بەڵکـو تەنهـا زیانی هەیـە، بۆ نموونـە: وەک خەرج کردنی مـاڵ لە سـەرپێچیو هەواو ئـارەزوودا کـە یارمەتیـدەر نیـە بـۆ گوێڕایەڵـی خـوا ﷻ، یـان خەرج کـردن بـۆ ڕێگری کردنـی خەڵکـی لە ڕێگـای خوا ﷻ.

دووەم: یـان ئەوەیـە ماڵەکـەی دەگرێتـەوە لەوانـەی کـە پێویسـتە لەسـەری بیبەخشـێ، وە قەدەغەکـردن لـە شـتێک کـە فەرمـان کـراوە بـە پێچەوانەکەی.

(٣٦): ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلَا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ (٣٦)﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللَّهِ﴾ واتـە: لە قەزاو قـەدەری خوادا ﷻ ﴿اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا﴾ بریتیـە لەو مانگانـەی کە ئاشـکرایە ﴿فِي كِتَابِ اللَّهِ﴾ واتە: لە حوکمـی قەدەری خـوادا ﴿يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ شـەوو ڕۆژی بۆیان داناوە، وە کاتەکانی دابەش کردوە بەسـەر ئـەو دوازدە مانگەدا ﴿فَلَا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾ دەگونجـێ ڕاناوەکە بگەڕێتـەوە بۆ دوازدە مانگ، وە خوا ڕوونـی کردۆتەوە کە کردوویەتی

بــە ئەنــدازە بــۆ بەندەکانــی تا بــە گوێڕایەڵــی خــوا ﷻ ئاوەدانــی بکەنەوەو سوپاســگوزاری فــەزڵو چاکەکانی بکــەن، وە لە بەرژەوەنــدی بەندەکانــدا بەکاریبهێنن، وە خۆتــان بپارێزن لەوەی کــە زوڵمو ســتەمی تێدانەکەن.

وە دەگونجــێ ڕاناوەکــە بگەڕێتــەوە بــۆ ئەو چوار مانگە حــەرام کراوە، ئەمــە قەدەغە کردنی زوڵــمو ســتەمە لــەو مانگانــەدا بــە تایبــەت، لەگــەڵ ئەوەی کــە لە هەمــوو کاتێکــدا زوڵمو ســتەم قەدەغــە کــراوە، وە ســتەم لــەو مانگانــەدا زیاتــر قەدەغە کــراوە، لە چــاو مانگەکانی تر دا.

لەوانــە قەدەغەکردنــی جەنــگ تیایانــدا، لەســەر بۆچوونــی ئــەوەی کــە دەڵێــت: قەدەغــە کردنــی جەنــگ لە مانگــی حەرامدا نەســخ نەکراوەتەوە کار بــە دەقە گشــتیەکان دەکەن لە قەدەغەکردنــی کوشــتار تیایدا.

هەندێکــی تــر دەڵێــن: قەدەغەکردنــی جەنــگ نەســخ کراوەتــەوە، کار بــە گشــتی دەکەن، وەک خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗ ﴾ واتــە: هەمــوو ئــەو بتپەرســتانە بکــوژن کــە کوفر بە خــوا دەکــەن، جەنگ لە دژی هەموویــان بەرپــا بکەن، کەســیان لــێ جیا مەکەنەوە هەموویان بە یەک شــێوە تەماشــا بکــەن، هەموویــان دوژمنتانــن ئەگــەر دەرفــەتو هەلیان بــۆ برەخســێ لە ناوتــان دەبەن.

وە دەگونجــێ ﴿ كَآفَّةٗ ﴾ حــاڵ بێ بۆ (الواو) ماناکەی بەم شــێوە دەبــێ: واتە: هەمووتان لــە دژی بتپەرســتان بجەنگــن، ئەمە ئــەوە دەگەیەنێ کە بە گشــتی هەمــوو بــڕواداران دەبێ بجەنگــن، ئەگــەر بــەم شــێوە بێ ئــەم دەقــە نەســخ دەبێتەوە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗ ﴿١٢٢﴾ ﴾ التوبــة، تا کۆتایــی دەقەکە.

﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ بــە پشــتیوانیو سەرخســتنی، دەی ســوور بــن لەســەر خۆپارێــزیو لــە خوا ترســان بە ئاشــکراو نهێنێ، بــە تایبەت لە کاتی جەنگ کــردن لە دژی بێبڕوایانــدا، بێگومــان لــەم حاڵەتەدا هەندێ جــار بــڕوادار واز لە کار کردن بــە خۆپارێزیو لــە خوا ترســان دەهێنێ لــە مامەڵــە کردنی لەگــەڵ ئــەو بێبڕوایانەی کــە دەجەنگن.

إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ
عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ
سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ
٣٧ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمۡ إِذَا قِيلَ لَكُمُ
ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلۡتُمۡ إِلَى ٱلۡأَرۡضِۚ أَرَضِيتُم
بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ٣٨ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبۡكُمۡ
عَذَابًا أَلِيمٗا وَيَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ وَلَا تَضُرُّوهُ
شَيۡـٔٗاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٣٩ إِلَّا تَنصُرُوهُ
فَقَدۡ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذۡ أَخۡرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ثَانِيَ ٱثۡنَيۡنِ
إِذۡ هُمَا فِي ٱلۡغَارِ إِذۡ يَقُولُ لِصَٰحِبِهِۦ لَا تَحۡزَنۡ إِنَّ ٱللَّهَ
مَعَنَاۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيۡهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٖ
لَّمۡ تَرَوۡهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلسُّفۡلَىٰۗ
وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ٤٠

**(٣٧):** ﴿ إِنَّمَا ٱلنَّسِيٓءُ زِيَادَةٞ فِي ٱلۡكُفۡرِۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامٗا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامٗا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُۚ زُيِّنَ لَهُمۡ سُوٓءُ أَعۡمَٰلِهِمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٧ ﴾

**(النسيء):** بریتیە لەوە کە نەفامەکانی ئەو سەردەمە بەکاریان دەهێنا لە مانگەکانی حەرامدا، لە چوارچێوەی ئەو داهێنانو بیدعە بێ بنەمایانەیاندا، ئەوان ئەگەر بیان ویستبایە جەنگ بکەن لە ناو هەندێ لە مانگەکانی حەرامدا، بە بۆچوونە خراپەکانیان پارێزگاری لەو چەندە مانگە حەرام کراوە بکەن، هەندێ لەو مانگانەیان دوا دەخست، یان پێشیان دەخستن، وە هەندێ جار ئەو چوار مانگە قەدەغە کراوەیان دەگۆڕی بۆ ئەو مانگەی کە جەنگی تێدا قەدەغە نەبوو، تا شەڕەکەیان حەلاڵ بکەن، ئەگەر بیان خستبایەتە جێگای، جەنگو کوشتاریان حەلاڵ دەکرد، وە مانگی حەلاڵیشان دەکرد بە حەرام، ئەمە وەک چۆن خوا ﷻ هەواڵ دەربارەیان دەدات ئەوە ڕوونە لە بێبڕوایی‌و گومڕاییدا، چونکە شتی ترسناک لە خۆ دەگرێت:

١- ئەوان لە خۆیانەوە ئەوەیان داهێنا، وە بە پلەی شەرعو ئاین مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد، خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لێی بەرین.

٢- ئەوان ئاینەکەیان هەڵگێڕایەوە، حەلاڵیان گۆڕی بە حەرامو، حەرامیشان کرد بە حەلاڵ.

٣- ئەوان بە ڕووکەش خوایان دەپەرست، وە فێڵیان بەکار دەهێنا لە بەرانبەر بەندەکانی خوا ﷻ.

٤- ئەو نەریتانەی کە پێچەوانەی شەرعو دینن بەردەوام بوون لەسەریان، ناشرینیەکەیان نامێنێ لەسەر نەفسو دەروون، وە هەندێ جار وا تەماشا دەکرێ ئەو نەریتانە چاکن، تا ئەو هەڵەو گومڕاییانە ڕوودەدەن کە ڕوویاندا!

بۆیە دەفەرموی: ﴿ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ ﴾ واتە: تا ڕێک بکەوێ لە ژمارەی ئەو چوار مانگەدا، حەڵاڵی بکەن ئەوەی کە خوا ﷻ قەدەغەی کردوە ﴿ زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَٰلِهِمْ ﴾ واتە: شەیتان کردەوە خراپەکانیان لا جوان بکات، بە هۆی ئەو بیرو باوەڕەی لە دڵیاندا جوان کراوە ﴿ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ واتە: ئەوانەی بێبڕوایی‌و درۆ لە دڵیاندا چەسپیوە، تەنانەت ئەگەر هەموو ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێ هەر بڕواناهێنن.

(٣٨-٣٩): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔا ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾:

بزانە زۆربەی ئەم سوورەتە پیرۆزە دەربارەی غەزای تەبووک دابەزیەتە خوارەوە، کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ هانی مسوڵمانانیدا بۆ غەزای تەبووک، ئەوکات زۆر گەرم بوو، وە توێشووش کەم بوو، وە ژیانیش ناڕەحەت بوو، هەندێ لە بڕواداران تەنبەڵیان نواند کە بووە هۆی ئەوەی خوا ﷻ سەرزەنشتیان بکا لەسەری‌و هانیان بدات، وەک دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ ئایا بۆ کارناکەن بە ناوەڕۆکی ئیمان‌و پێویستیەکانی دڵنیابوون، لە دەستپێشخەری کردن لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا ﷻ، وە کێبڕکێ بۆ ڕەزامەندی خوا ناکەن، وە جیهادی دوژمنەکانی‌و سەرخستنی ئاینەکەی ناکەن؟!

﴿ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: تەمبەڵیتان کرد، وە حەزتان لەوە کرد لەسەر زەویدا بمێننەوەو تێیدا جێگیر بن ﴿ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾ واتە: دۆخی ئێوە لە دۆخی ئەوانە دەچێ کە بە دونیا ڕازی بوون‌و کۆششیان بۆی دەکرد، وە دواڕۆژ بە خەیاڵیاندا نەدەهات وەک بڵێی بڕوای پێ نەهێنابێ ﴿ فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ کە وای لێکردوون پێشی بخەن بەسەر دواڕۆژدا ﴿ إِلَّا قَلِيلٌ ﴾ ئایا خوا ﷻ عەقڵی پێنەداون کە کارو بارەکانی پێ بپێون کە کامیان لە پێشترە هەوڵ‌و کۆششی بۆ بکرێ؟ ئایا دونیا لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە چاو دواڕۆژدا هیچ بەهایەکی هەیە؟ تەمەنی مرۆڤ چەندە تا بیکاتە ئامانج بۆ مەبەستەکانی، هەموو کۆشش‌و ماندووبونەکانی تەنها بۆ ئەوە بێ کە پڕە لە ناخۆشی‌و نەهامەتی‌و ترس، بە چ بۆچوونێک فەزڵ‌و چاکەی دنیاتاندا بەسەر دواڕۆژ کە پڕە لە

هەمــوو نــازو نیعمەتێک، ئەوەی نەفــسو دەروون حەزی پێــدەکات تیایدا هەیــە، وە ئەوەی چــاو تێــر دەکات، ئێوە بــۆ هەتا هەتایــی تێیدا دەمێننەوە؟! ســوێند بە خوا ﷻ کەسێک کە ئیمــان لــە دڵیــدا جێگیر بوو‌بــێ فەزڵو چاکــەی دونیا نادات بەســەر دواڕۆژدا، وە کەسێک خــاوەن بۆچــوونو عەقــڵ بێت هــەر گیز ئەمــە ناکات.

پاشــان هەڕەشــەیان لێــدەکات لەســەر دەرنەچــوون بــۆ جیهــاد کــردن دەفەرمــوێ: ﴿إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ (ئەگــەر نەچــن بــۆ جەنگ خــوا ســزاتان دەدات) لــە دنیــاو دواڕۆژدا، بێگومان بەدەمــەوە نەچوون لە حاڵەتــی داواکردنو پێویستیدا لە تاوانە گەورەکانــەو خاوەنەکــەی ڕووبــەڕوی ســزایەکی ســەخت دەبێتــەوە، چونکــە ئــەوە زیانی گــەورە بــە دوای خۆیــدا دەهێنێ. ئەو کەســەی کە دوادەکــەوێ ئەوە ســەرپێچی خوا ﷻی کــردووەو هــاوکار نەبــووە بــۆ سەرخســتنی دینــی خــوا ﷻ، وە خراپەی لە شــەرعو یاسـای خــوا ﷻ دوورنەخســتۆتەوە، وە هاوکاری برا مســوڵمانەکانی نەکردوە لــە دژی دوژمنەکانی کــە دەیانــەوێ لە بنــەڕەت دەریــان بهێننو ئاینەکەیــان بکوژێننــەوە، تەنانــەت هەندێ جار بــوون بــە مایــەی ئــەوەی درزو کەلێــن بخەنــە نێــو ئەوانــەی کــە جیهــاد لــە پێنــاو خوادا دەکــەن، هەقــی خۆیەتــی خوا هەڕەشــە لــەم کەسانە بکات کــە ئەمــە حاڵیانــە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾ پاشــان ئــەوان وەکــو ئێــوە نابــن ﴿وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔا﴾ بێگومان خوا ﷻ گرەنتی داوە بە ســەرکەوتنی ئاینەکــەیو بەرزکردنــەوەی نــاوی، جــا یەکســانە ئێــوە فەرمانی خــوا ﷻ جێبەجــێ بکەن، یــان پشــتگوێی بخەن.

(٤٠): ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَـٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾﴾:

دەفەرمــوێ: ﴿إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ﴾ ئەگــەر ئێــوە یارمەتــی پێغەمبــەر ﷺ نــەدەنو ســەری نەخــەن، ئەوە خوا ﷻ پێویســتی بە ئێوە نیــەو زیانی پێ ناگەیەنــن، بێگومان سەریخســت لە کەمترین ماوەدا، وە کافرانــی زەلیل کرد ﴿إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ لــە مەککــە کاتێک کە ویســتیان بیکوژنو هەوڵــی لەناوبردنیاندا، ســووربوون لەســەری، تا ناچاریــان کــرد دەربچــنو ئــەو شــوێنە بەجێبهێڵــن ﴿ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ﴾ ئەوو ئەبــو بەکری

صیددیـق خـوای لێـی ڕازی بـێ، ﴿إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ﴾ واتـە: کاتێک کـە ڕایانکرد لـە مەککـەو پەنایـان بردە بـەر ئەشـکەوتی (ثـور) لە خـوارووی مەککـە لەوێ مانـەوە تا قوڕەیـش سـارد بێتـەوە لـە گـەڕان بـە دوایاندا، لـە کاتێکـدا ئەوان لـەو حاڵەتـە ناخۆش‌و ناهەمـوارەدا بـوون، کـە دوژمنانـی خوا ﷻ لە هەمـوو ئەو شـوێنانەدا بلاوەیـان پێکرابوو بە گـەڕان بـە دوایاندا تـا بیانکوژن، خوا ﷻ سـەرکەوتنی بـۆ دابەزاندن کە بە خەیاڵی کەسـدا نەدەهـات ﴿إِذْ يَقُولُ﴾ کاتێـک پێغەمبـەر ﷺ وتیـە: ﴿لِصَـٰحِبِهِۦ﴾ (هاوەڵەکـەی) ئەبـو بەکـر کە خەمبـارو بێتاقـەت بـوو ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾ بە پشـتیوانی‌و سـەرکەوتن‌و یارمەتـی ﴿فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ﴾ واتـە: ئارامـی‌و هێمنـی‌و ئۆقرەیـی کـە دڵ دادەمەزرێنـێ، کاتێـک کـە هاوڕێکـەی خەمبـار دەبـێ دڵـی دەداتەوەو دەفەرمـوێ: ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا﴾ (خەمبـار مەبـە، بە دڵنیایی خـوا لەگەڵمانە). ﴿وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا﴾ ئەویـش فریشـتە بەڕێزەکانـە کـە خـوا ﷻ کردوونی بە پاسـەوانی ﴿كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ﴾ واتە: ڕیسـواو سەرشـۆڕی کـرد، بێگومـان بێبڕوایـان وا گومانیـان دەبـرد کـە دەتوانن بێ بەشـیان بکەن، لە کوشـتنی موحەممـەد ﷺو بردنـی، هەمـوو تواناکانیان لـەو بـوارەدا بەکارهێنا، خوا ڕیسـوای کردن‌و نەگەیشـتن بە مەبەسـتەکانیان بەڵکـو هیچیان دەسـت نەکەوت.

خـوای گـەورە پێغەمبەری خۆی ﷺ سەرخسـت بە دوورخسـتنەوەی بتپەرسـتان لێی، ئەمەش ئـەو سـەرکەوتنەیە کە باس کـرا لەم شـوێنەدا، چونکە:

## سەرکەوتن دوو جۆرە:

یەکـەم: سـەرکەوتنی بڕواداران ئەگەر تەماحیـان لە دوژمنەکانیان هەبـێ بەوەی کە خوا ﷻ داواکاری‌و ئامانجەکانیـان بـە دەسـت دێنێـت، کە دەسـتیان گـرت بەسـەر دوژمنەکانیان‌و سەرکەوتن بەسـەریاندا.

دووەم: سەرخسـتنی لاوازەکان کـە دوژمنەکانیـان بەهێـزو دەسـەلاتەوە چاویـان تێبڕیبوو، سـەرکەوتنی خوا ﷻ بۆ ئـەوان ئەوەیە کە دوژمنیـان لێ دووربخاتـەوەو بەرگریان لێبکات، وە دەکـرێ ئـەم سـەرکەوتنە باشـترین بێـت، خـوا ﷻ پێغەمبەرەکەی سەرخسـت کاتێک کـە بـێ بـڕواکان دەریانکرد لـە مەککە یەکێـک بوو لەو دوو کەسـە، ئەو سـەرکەوتنەش لـەم جۆرەیە.

خـوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلْعُلْيَا ﴾ واتـە: وشـەی قـەدەری‌و وشـە ئاینیـەکان، بەرزو بڵندو شـکۆدارە بەسـەر غەیری خۆیـدا، وەک خـوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٤٧ ﴾الـروم. هەروەهـا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ ٥١ ﴾غافـر. وە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ١٧٣ ﴾الصافـات.

واتـە: ئاینـی خـوا ﷻ بـەرزو بڵندە بەسـەر هەمـوو ئاینەکانەوە بـە بەڵگەی ڕوون‌و ئاشـکرا کـە هیـچ گومانێکـی تێدا نیـە ﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ﴾ هیـچ کەس سـەرناکەوێ بەسـەریدا، وە هیـچ کەسـێکیش لە دەسـتی دەرناچـێ ﴿ حَكِيمٌ ﴾ شـتەکان لە جێگـای خۆیـدا دادەنێ، هەنـدێ جار سـەرکەوتنی حیزبەکـەی دوادەخـات ئـەوەش حیکمەتێکی گـەورەی تێدایە.

ئـەم ئایەتـە پیـرۆزە بەڵگەیە لەسـەر فەزیڵـەت‌و تایبەتمەندی ئەبـو بەکـری صیددیق کە بۆ هیـچ کەسـێکی تر نیە لـەم ئوممەتەدا، ئـەوە سـەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ ئـەو هاوەڵە لەگەڵ پێغەمبـەری خـوادا، مسـوڵمانان یەکدەنگن لەسـەر ئەوەی مەبەسـت لـەم ئایەتـەدا تەنها ئەو هاوەڵـە بەڕێزەیـە، هەروەهـا دایاننـاوە هەر کەسـێ نکووڵی ئـەوە بکات کە لـەو هیجرەتەدا کـە ئەبوبەکـر هاوڕێـی پێغەمبـەر ﷺ نەبووە ئـەوە کافرو بـێ بڕوایە، چونکـە نکوڵی دەقی قوڕئانـی کـردوە کە بە ئاشـکرا ئامـاژەی پێداوە.

هەروەهـا بەڵگەیـە لەسـەر فەزیلـەت‌و چاکـەی ئارامی‌و ئۆقرەیـی، وە ئەوە لـە گەورەترینی نیعمەتەکانـی خوایـە ﷻ بەسـەر بەندەکەیـەوە لـە کاتـی ناخۆشـی‌و ترسـدا، ئـەوەش بـە پێـی ئیمـان‌و متمانـەی بەندەیە بـە بەڵێنـی ڕاسـتەقینەی پەروەردگـاری، وە بە پێـی ئیمان‌و ئازایەتیـەتـی، هەروەهـا: خەمبـاری‌و بێتاقەتـی هەنـدێ جـار تووشـی بەنـدە ڕاسـتگۆو ڕاسـتەقینەکانی خـوا دەبـێ، لەگـەڵ ئـەوەدا باشـتر وایـە ئەگەر بەنـدە تووشـی خەمباری‌و بێتاقەتـی بـوو هـەوڵ بدات لـە خـۆی دووری بخاتـەوەو بیرەوێنێتـەوە، چونکـە ئیمانی پێ لاواز دەبـێ، وە دڵنیایـش تووشـی لاوازی‌و سسـتی دەکات.

ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ
فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٌ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ
٤١ لَوۡ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ
وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ
لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ وَٱللَّهُ
يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ٤٢ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ
حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ
٤٣ لَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أَن
يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ٤٤
إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ
وَٱرۡتَابَتۡ قُلُوبُهُمۡ فَهُمۡ فِي رَيۡبِهِمۡ يَتَرَدَّدُونَ ٤٥ ۞ وَلَوۡ
أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةً وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ
فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ٤٦ لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم
مَّا زَادُوكُمۡ إِلَّا خَبَالًا وَلَأَوۡضَعُواْ خِلَٰلَكُمۡ يَبۡغُونَكُمُ
ٱلۡفِتۡنَةَ وَفِيكُمۡ سَمَّٰعُونَ لَهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ٤٧

(٤١-٤٢): ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٌ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ لَوۡ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾:

خوا ﷻ بە بەنـدە بڕوادارەکانی دەفەرموێ:- هانیـان دەدات بـۆ دەرچـوون لـە پێناویدا:- ﴿ ٱنفِرُواْ خِفَافًا وَثِقَالًا ﴾ واتـە: لـە قورسـیو ئاسـانیدا، لە خۆشـیو ناخۆشـیدا، وە لـە گەرمـاو سـەرمادا، وە لـە هەمـوو کاتەکانـدا ﴿ وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ واتـە: تواناکانـی خۆتـان بخەنـە کار لـەو بـوارەدا لـە مـاڵو گیانتـان، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی وەک چـۆن جیهاد پێویسـتە لـە نەفـسو گیاندا بە هەمان شـێوە لە ماڵو سامانیشـدا پێویسـتە، پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٌ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾ واتـە: جیهـادو تێکۆشـان بـە نەفـسو مـاڵو سـامان چاکترە لە دانیشـتنو کەنارگیـری، چونکە لـەوەدا ڕەزامەنـدی خوا ﷻو پلەی بـەرزو گەورە بەدەسـت دەهێننو دینـی خـوا سـەردەخەن، وە دەچنە چوارچێـوەی ئەوانەی کە سـەربازو حیزبـی خوان ﴿ لَوۡ كَانَ ﴾ دەرچـوون بـۆ بەدەسـت هێنانـی شـتێکی نزیـک لـە سـوودو قازانجی دونیـا کە بە ئاسـانی دەسـت بکەوێت، ﴿ وَسَفَرًا قَاصِدًا ﴾ گەشـتێکی نزیکو ئاسـان ﴿ لَّاتَّبَعُوكَ ﴾ چونکـە زۆر مانـدوو نابـن ﴿ وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُ ﴾ واتە: ڕێگاکـە دوورو دژوارو نارەحـەتو گران بوو بەسـەریانەوە، بۆیـە تەنبەڵیان تێدا کـرد، ئەمە نیشـانەی بەندایەتی نیە، بەڵکـو بەندایەتـی ڕاسـتەقینە ئەوەیـە کە لە هەمـوو بوارەکانـدا فەرمانەکانـی پەروەردگاری جێبەجـێ بکات ئاسـان بێت یان گـران، بەمە دەوترێ بەنـدەی خوا ﷻ ﴿ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ ﴾ واتـە: سـوێندتان بـۆ دەخـۆن کـە ئـەوان بیانوویـان

هەبـووەو نەیـان توانیـوە دەربچـن بۆ جیهـاد کـردن ﴿يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ﴾ بە دانیشـتن‌و درۆکـردن‌و هەواڵـی ناڕاسـت ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ ئـەم سەرزەنشـتە تەنهـا بۆ ئـەو دوو ڕووانـە بـوو کە لـە غـەزای تەبوکـدا دواکەوتـن‌و بیانـووی درۆیـان هێنایەوە، پێغەمبـەر ﷺ تەنهـا بـە هێنانـەوەی بیانوەکەیـان لێیـان خـۆش بـوو، بە بـێ ئـەوەی تاقیان بکاتـەوە تـا ڕاسـتگۆو درۆزنـی بۆ دەرکـەوێ، لەبـەر پەلـە کردنی لـە بیانـوو هێنانەوەیان خـوا ﷻ سەرزەنشـتی کـرد، وەک دەفەرموێ:

(٤٣-٤٥): ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾ لَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱرۡتَابَتۡ قُلُوبُهُمۡ فَهُمۡ فِي رَيۡبِهِمۡ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾﴾:

خوا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ﴾ خوا لێت خۆش بێ ﴿لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ﴾ (بۆ مۆڵەتت دان) لە دواکەوتن ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ تا تاقیت دەکردنەوەو بۆت دەردەکەوت کێ ڕاستگۆیەو کێ درۆزنەو دووڕوە، ئنجا مۆڵەتت دەدا بەوەی کە شایستەی مۆڵەتە، نەک ئەوەی کە شایستە نیە.

پاشـان هـەواڵ دەدات ئەوانـەی کـە بڕوایـان بە خـواو ڕۆژی دوایـی هەیە، نایـەن بۆ لات داوای مۆڵەتـت لـێ بکـەن بۆ دانیشـتن‌و نەچوون بـۆ جیهاد بە مـاڵ‌و سـامانیان، چونکە ئەو بڕوایـەی کـە هەیانـە هانیـان دەدات بـۆ جیهـاد بە بـێ ئـەوەی هاندەرێـک هانیـان بدات، ئـەوان بەبـێ بیانـوو داوای دانیشـتن ناکـەن ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ﴾ پاداشـتیان دەداتەوە لـەوەی کـە پێی هەسـتاون، وە لـە زانیاریـی دەربـارەی پارێزکاران، خـوا هەواڵـی داوە، لە نیشـانەکانی ئـەوان ئەوەیـە کـە داوای دانیشـتن ناکـەن‌و واز بێنن لە جیهـاد کردن.

﴿إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱرۡتَابَتۡ قُلُوبُهُمۡ﴾ واتـە: بڕوایەکـی تـەواوو دڵنیاییەکـی ڕاسـتەقینەیان نیـە، بۆیـە بە کەمـی حەز لە چاکـە دەکەن‌و لـە جەنگ دەترسـن، پێویسـتیان بەوەیە کە داوای دانیشـتن بکەن لە جیهـاد کردن ﴿فَهُمۡ فِي رَيۡبِهِمۡ يَتَرَدَّدُونَ﴾ واتـە: بـەردەوام لە گومـان‌و دوودڵیدان.

(٤٦-٤٨): ﴿وَلَوۡ أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةٗ وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمۡ إِلَّا خَبَالٗا وَلَأَوۡضَعُواْ خِلَٰلَكُمۡ يَبۡغُونَكُمُ ٱلۡفِتۡنَةَ وَفِيكُمۡ سَمَّٰعُونَ لَهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾

﴿لَقَدِ ٱبۡتَغَوُاْ ٱلۡفِتۡنَةَ مِن قَبۡلُ وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلۡأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَظَهَرَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَهُمۡ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: دووڕووەکان ئەوانەی کـە دواکەوتن ڕوونی دەکاتەوە مەبەسـتیان ئەوە نەبـوو جیهـاد بکـەن، وە ئـەو بیانوانـەی هێنایانـەوە هەمـووی بەتاڵو پـووچو بـێ بنەمایە، بێگومـان پاسـاوو بیانـوو خـۆی لـە خۆیدا ڕێگـرە، ئەگـەر بەندە هەمـوو تواناکانـی بەکار بهێنـێو هـەوڵ بـدات بـۆ بـە دەسـتهێنانی هۆکارەکانـی دەرچـوون، پاشـان بەربەسـتێکی شـەرعی ببێتـە ڕێگـر، ئەمـە پێـی دەوتـرێ بیانـوو، ﴿وَلَوۡ أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةً﴾ واتـە: خۆیـان ئامادە دەکـرد، وە هەمـوو هۆکارەکانیـان دەگرتە بەر، بـەڵام کاتێ هۆکارەکانیـان نەگرتـە بـەرو خۆیـان ئامادە نەکـرد، دەرکەوت مەبەسـتیان دەرچـوون نیە ﴿وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ﴾ دەرچـوون لەگەڵتاندا بۆ غـەزا کردن ﴿فَثَبَّطَهُمۡ﴾ بـە قەزاو قـەدەر، ئەگەر چـی فەرمانی پێکـردن هانیدان بـۆ دەرچوون، وای لێکـردن توانای دەرچوونیـان هەبـێ، وە بـە حیکمەتـی خۆی نەیویسـت هاوکاریان بـکات، بەڵکو ڕیسـواو سەرشـۆڕی کـردن ﴿وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ﴾(وە پێیان وترا دانیشـن) لەگەڵ ژنو منـداڵو پـەک کەوتوەکاندا.

پاشـان حیکمەتـی ئەمـە بـاس دەکاتو دەفەرمـوێ: ﴿لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمۡ إِلَّا خَبَالٗا﴾ واتـە: ناتـەواوی (یـان دەخسـتە نێوانتـان) ﴿وَلَأَوۡضَعُواْ خِلَٰلَكُمۡ﴾ واتـە: هەوڵـی فیتنەو شـەڕ دەدەن لە نێوانتانـدا، وە بەش بەشـتان دەکەن ﴿يَبۡغُونَكُمُ ٱلۡفِتۡنَةَ﴾ واتـە: ئەوان سـوورن لەسـەر ئـەوەی تووشـی فیتنەتـان بکەنو کێشـەو دووبەرەکـی بخەنە نێوانتانـەوە ﴿وَفِيكُمۡ﴾ کەسـانێکی عەقـڵ نـزمو لاواز ﴿سَمَّٰعُونَ لَهُمۡ﴾ واتـە: گوێیان بـۆ دەگرنو سەرسـامن پێیـان، ئەگەر ئەوان سـووربن لەسـەر ئـەوەی سەرشـۆڕتان بکەنو کێشـەو دووبەرەکـی بخەنە نێوانتان، وە سـتان بکـەن بەرانبەر بە دوژمنانتان، لەناو ئێوەشـدا کەسـانێک هـەن گوێیان بـۆ دەگـرن، دەی گومانی چی دەبەن ئەگـەر ئەوانە لەگـەڵ ئێوەدا دەربچـن بەو هەمـوو ناتەواویـەوە؟ حیکمەتی تـەواو بۆ خـوا ﷻ کە دوایخسـتنو ڕێگری لێکـردن لەگـەڵ بڕواداراندا دەربچـن، دیارە ئەمەش سـۆزو میهرەبانیە بەرانبەر بـە بڕواداران، کـە تووشـی شـتێک بن هیچ سـوودێکی بۆیـان نەبـێ، بەڵکو زیانـی بۆیـان هەبێ ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەندەکانـی فێر دەکات چـۆن خۆیان بپارێـزن، وە هەموو ئەو زەرەرو زیانەیـان بـۆ ڕوون دەکاتەوە لـە تێکەڵاوی کردنیـان دایە.

لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ حَتَّىٰ
جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِنْهُم
مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ
جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ إِن تُصِبْكَ
حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ ۖ وَإِن تُصِبْكَ مُصِيبَةٌ يَقُولُوا۟ قَدْ
أَخَذْنَآ أَمْرَنَا مِن قَبْلُ وَيَتَوَلَّوا۟ وَّهُمْ فَرِحُونَ ﴿٥٠﴾ قُل
لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى
ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلْ هَلْ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ
إِحْدَى ٱلْحُسْنَيَيْنِ ۖ وَنَحْنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمْ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ
بِعَذَابٍ مِّنْ عِندِهِۦٓ أَوْ بِأَيْدِينَا ۖ فَتَرَبَّصُوٓا۟ إِنَّا مَعَكُم
مُّتَرَبِّصُونَ ﴿٥٢﴾ قُلْ أَنفِقُوا۟ طَوْعًا أَوْ كَرْهًا لَّن يُتَقَبَّلَ
مِنكُمْ ۖ إِنَّكُمْ كُنتُمْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَا
مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُوا۟
بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ
كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴿٥٤﴾

پاشـان باسـی ئـەوە دەکات کـە ئـەوان پێشـینیان هەبـووە لـە شـەڕو خراپـەدا ﴿ لَقَدِ ٱبْتَغَوُا۟ ٱلْفِتْنَةَ مِن قَبْلُ ﴾ واتـە: کاتێـک کـە کۆچتـان کـرد بـۆ مەدینـە، ئـەوان هەمـوو تواناکانیـان خسـتەکار ﴿ وَقَلَّبُوا۟ لَكَ ٱلْأُمُورَ ﴾ واتـە: کاروباریـان لـێ هەڵگێڕابنـەوەو هەمـوو تواناکانیـان خسـتەکار بۆ بەتـاڵ کردنەوەی بانگەوازەکەتـانو زەلیلـی ئاینەکەتـان، کەمتەرخەمیـان لـەوەدا نەکـردوە ﴿ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَظَهَرَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَهُمْ كَٰرِهُونَ ﴾ خـوا فێڵەکانیانـی بەتال کردەوە وە بۆچـوونو هزرەکانیانی پەرش‌و بـڵاو کرد، هەقـی خۆیەتـی بـڕواداران لەم جۆرە کەسـانە ئاگـادار بکرێنـەوە، وە خەم نەخۆن بۆ ئـەوەی لە جەنگو جیهـاد دوابکەون.

(٤٩): ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ ۚ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾:

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ﴾ واتـە: لەنـاو ئەو دوو ڕووانە کەسـانێک هەبوون داوای دانیشـتنو نەچـوون بۆ جیهـادی دەکـرد، وە عـوزرو بیانوویەکـی سەرسـووڕهێنەری تـری هێنایەوە، دەڵـێ: ﴿ ٱئْذَن لِّى ﴾ (مۆڵەتم بـدە) لە دواکەوتن ﴿ وَلَا تَفْتِنِّىٓ ﴾ (تووشـی بەڵام مەکە) لـە دەرچوونـدا، بێگومان مـن ئەگەر دەربچم بـۆ جیهاد کـردن ئافرەتانی (بنی الأصفر) ببینم خـۆم ناگـرم لـە بەریاندا، ئەمـە وتەی جـەددی کوڕی قەیـس بوو، مەبەسـتی لـەوەدا ـخوا ڕوو ڕەشـی بـکات- ڕیایـیو دوو ڕوویی بوو، وە دەیوت: مەبەسـتی من مەبەسـتێکی چاکە، بێگومـان لـە دەرچوونمـدا تووشـی فیتنـەو گونـاە دەبـم، وەلـە دەرنەچوونمدا سـەلامەتمو دوورم لـە فیتنەو شـەڕ، خوا ﷻ ئـەو درۆیە ڕوون دەکاتـەوەو دەفەرموێ: ﴿ أَلَا فِى ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُوا۟ ﴾ بێگومـان ئەگـەر وا دابنـرێ ئـەم کەسـە ڕاسـتی کـردوە لـە مەبەسـتەکەیدا، ئـەوە لـە دانیشـتنو دواکەوتنـدا تێکـدانو خراپـەی گـەورەی تـووش دەبـێ، کـە بریتیە

لــە ســەرپێچی خــواو پێغەمبەرەکــەی ﷺ، وە بوێــری کــردن لەســەر تاوانی گــەورە، بەڵام دەرچــوون بــۆ جیهــاد کــردن تێکــدانو خراپــەی کەمترە لــە دانیشــتن، لەگەڵ ئــەوەدا ئەم بێــژەرە تەنهــا مەبەســتی دواکەوتنو دانیشــتن بووەو هیچــی تر نیە، بۆیە خوا ﷻ هەرەشــەی لێــان کــردوە بــەو فەرمایشــتەی: ﴿وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ﴾ بــە هیــچ شــێوەیەک دەربازبوونیــان نیەو رزگاریــان نابێت.

(٥٠-٥١): ﴿إِن تُصِبۡكَ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡۖ وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ يَقُولُواْ قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن قَبۡلُ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ ٥٠ قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٥١﴾.

خــوا ﷻ ڕوونــی دەکاتــەوە دۆخــی ئــەو دوو ڕووانــەی کــە بەڕاســتی ناحــەزو دوژمنــن، ئەوانــەی کــە بــە تــەواوی ڕقیــان لــە ئایینــە دەفەرمــوێ: ﴿إِن تُصِبۡكَ حَسَنَةٞ﴾ وەک ســەرکەوتنو تێکشــکاندنی دوژمــن ﴿تَسُؤۡهُمۡ﴾ واتــە: پێیــان ناخۆشــەو خەمبار دەبــن ﴿وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ﴾ واتــە: بەڵایەکــت لــە لایــەن دوژمنەوە تــووش ببێ ﴿يَقُولُواْ﴾ بــە شــانازیەوە خۆیــان دەردەخــەن: ﴿قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن قَبۡلُ﴾ واتە: ئێمــە پێــش ئــەوەی تووشــی ئــەو بــەڵاو موســیبەتە ببیــن ئیحتیاتــی خۆمانمــان وەرگــرت ﴿وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ﴾ دڵیــان خۆشــە بــەو موســیبەتەی کــە تووشــتان دێــت وە بــەوەی کــە بەشــدار نەبــوون لەگەڵتانــدا، خــوا ﷻ لــە وەڵامیانــدا دەفەرمــوێ: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا﴾ واتــە: بڵــێ: هەرگیــز شــتێکمان بەســەر نایــەت کــە لــە (لوح المحفوظ)دا نەنوســرابێ ﴿هُوَ مَوۡلَىٰنَا﴾ واتــە: بەڕێوەبــەری کارووبــاری ئاینیو دنیایمانــە، بۆیــە دەبــێ ڕازی بین بــە هەموو قــەزاو قەدەرەکانی، وە هیچ شــتێک لە دەســتی ئێمــەدا نیــە ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ﴾ بــە تاکو تەنهــا ﴿فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ واتە: پشــتی پــێ ببەســتن لــە بەرژەوەندیەکانــدا، وە دوورخســتنەوەی زیانــەکانو متمانەی پــێ بکەن لە بەدەســتهێنانی ئامانجەکانــدا، زیانبــار نابــێ کەســێک کە پشــت بە خوا ببەســتێ، بــەڵام هەر کەســێک پشــت بە غەیری خوا ببەســتێ بە ڕاســتی ئەوە پشــت گــوێ خراوەو ناگــا بە هیچ ئامانجێکی.

(٥٢): ﴿قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ٥٢﴾.

واتــە: بــەو دوو ڕووانــە بڵــێ: کــە چاوەڕوانــی ئــەوە دەکــەن دوژمــن بەســەرتاندا زاڵ بێ:

چاوەڕوانـی چـی لە ئێمـە دەکەن، ئێـوە چاوەڕوانی شـتێک دەکـەن کە ئەوپـەڕی قازانجی ئێمـەی تێدایـە، ئەویش بە دەسـتهێنانی یەکێک لەو دوو چاکەیە، یان سـەردەکەوین بەسـەر دوژمنـداو تێکیان دەشـکێنین، یان شـەهید دەبین کە بەرزترین پلـەو پایەیە لەلایەن خوا ﷻ، بـەڵام چاوەڕوانـی ئێمـە بـۆ ئێـوە ئـەی دوو ڕووەکان: ئەوەیـە کـە خـوا لەلایـەن خۆیەوە سـزایەکتان بـۆ بنێـرێ، ئێمـە هـۆکاری ئـەوە نەبین، یان بـە دەسـتی ئێمە دەسـەڵاتمان بدا بەسـەرتانداو بتانکـوژێو لـە ناوتـان بـەرێ، ﴿ فَتَرَبَّصُوٓاْ ﴾ (چاوەڕێـی) خێر بن لـە ئێمە ﴿ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ ﴾ (ئێمـە چاوەڕێـی) شـەرو خراپەیـن لـە ئێوە.

(٥٣-٥٤): ﴿ قُلۡ أَنفِقُواْ طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهًا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمۡۖ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ قَوۡمًا فَٰسِقِينَ ٥٣ وَمَا مَنَعَهُمۡ أَن تُقۡبَلَ مِنۡهُمۡ نَفَقَٰتُهُمۡ إِلَّآ أَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمۡ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ ٥٤ ﴾:

خـوا بەتاڵـیو پووچـی بەخشـینی دوو ڕووەکان ڕوون دەکاتـەوەو باسـی هۆکارەکەیشـی دەکاتو دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ ﴾ پێیـان بڵـێ: ﴿ أَنفِقُواْ طَوۡعًا ﴾ (ببەخشـن) لـە ناخـی خۆتانـدا ﴿ أَوۡ كَرۡهًا ﴾ یـان بەبـێ ویسـتی خۆتـان ﴿ لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمۡ ﴾ واتـە: شـتێک لـە کردەوەکانتـان (لـێ قبـوڵ ناکـرێ) ﴿ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ قَوۡمًا فَٰسِقِينَ ﴾ دەرچـوون لـە گوێڕایەڵـی خـوا ﷻ، پاشـان سـیفەتی لـە سـنوور دەرچـوونو کردەوەکانیـان ڕوون دەکاتەوەو دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا مَنَعَهُمۡ أَن تُقۡبَلَ مِنۡهُمۡ نَفَقَٰتُهُمۡ إِلَّآ أَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ ﴾ کـردەوەکان بـە گشـتی مەرجـی وەرگرتنیـان بڕواهێنانـە، ئەوانیـش بڕوایان نەهێنـاوەو کـردەوەی چاکیـان نیـە، تەنانەت نوێـژ کە چاکتریـن کردەوەکانی جەسـتەیە، ئەگـەر پێی هەسـتن بە تەنبەڵـیو تەوەزەلیـەوە بە جێـی دەهێنن، دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمۡ كُسَالَىٰ ﴾ واتـە: زۆر گرانە لەسـەر شـانیان، هـەر نوێژێکیش بکەن بـە قورسـیەوە ئەنجامـی دەدەن ﴿ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ ﴾ بەبـێ دڵفراوانیو حەزو ئـارەزووەوە، ئەمـە ئەوپـەڕی سەرزەنشـت کردنە بۆ ئەو کەسـەی وەک ئەوان هەڵسـوکەوت دەکات، بێگومـان پێویسـتە لەسـەر بەنـدە بە چاکترین شـێوەو بـە چالاکـی دڵو دەروونو جەسـتە نوێژەکانـی بەجـێ بهێنـێ، وە نەبەخشـێ تەنها بـە دڵ فراوانیـەوە نەبـێ، تەنها لەبەر خـواو بـۆ خوا بـێ، چاوەڕوانی پاداشـتی بـێ پایان بێ لـە لای خوای تاکو تەنهـا، وە خۆی نەچوێنی بـە دووڕووەکان.

**(٥٥-٥٧):** ﴿فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمۡ لَمِنكُمۡ وَمَا هُم مِّنكُمۡ وَلَٰكِنَّهُمۡ قَوۡمٞ يَفۡرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوۡ يَجِدُونَ مَلۡجَـًٔا أَوۡ مَغَٰرَٰتٍ أَوۡ مُدَّخَلٗا لَّوَلَّوۡاْ إِلَيۡهِ وَهُمۡ يَجۡمَحُونَ ﴿٥٧﴾﴾

فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾ وَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمۡ لَمِنكُمۡ وَمَا هُم مِّنكُمۡ وَلَٰكِنَّهُمۡ قَوۡمٞ يَفۡرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوۡ يَجِدُونَ مَلۡجَـًٔا أَوۡ مَغَٰرَٰتٍ أَوۡ مُدَّخَلٗا لَّوَلَّوۡاْ إِلَيۡهِ وَهُمۡ يَجۡمَحُونَ ﴿٥٧﴾ وَمِنۡهُم مَّن يَلۡمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنۡ أُعۡطُواْ مِنۡهَا رَضُواْ وَإِن لَّمۡ يُعۡطَوۡاْ مِنۡهَآ إِذَا هُمۡ يَسۡخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤۡتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ۞إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٦٠﴾ وَمِنۡهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلنَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٞۚ قُلۡ أُذُنُ خَيۡرٖ لَّكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤۡمِنُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡۚ وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٦١﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡ﴾ سەرسام مەبە بە ماڵو سامانو منداڵی دووڕووەکان، ئەوە شایستەی ئاوات بۆ خواستن نیە، بەرەکەت لەوەدایە کە لە پێناو خوادا ﷻ بەکاری بهێنن، بەڵام لە پێناویدا سەرپێچی خوایان کرد ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ مەبەست لە سزا لێرەدا، ئەوەیە کە بە ناڕەحەتی بە دەستی دێننو زۆر ماندو دەبن لە بەدەست هێنانیدا، دڵیان تووشی خەم دەبێو جەستەشیان ماندوو دەبێ، ئەگەر بەراورد بکرێت بە ماندوبوونەکانیان، ئەوە زۆر کەمەو لەو ئاستەدا نیە، کاتێ کە سەرقاڵی کردن لە یادی خوا، ئەوکات بوو بە بەڵایەک بۆیان، تەنانەت لە دنیاشدا، لە بەڵا گەورەو ترسناکەکانی، دڵەکانیان وا بەستە بووە پێیەوە، وە ویستو حەزیان لەوە دەرناچی، ئەوە دەبێتە خەوو خۆراکیانو هەموو ئاواتو ئامانجەکانیان، وە لە دڵیاندا بەشێک نامێنێ بۆ دوارۆژ، وا پێویست دەکات لە دونیا بگوازرێنەوەو ﴿وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ واتە: چ سزایەک لەم سزا سەختترە کە ناڕەحەتیو ناخۆشی لەسەر پێویست کردوون ﴿وَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمۡ لَمِنكُمۡ وَمَا هُم مِّنكُمۡ﴾ ئەوان مەبەستیان لەم سوێند خواردنەدا ﴿وَلَٰكِنَّهُمۡ قَوۡمٞ يَفۡرَقُونَ﴾ واتە: لە کوشتن دەترسن، لە دڵیاندا ئازایەتیەک نیە تا بتوانن حاڵی خۆیانتان بۆ ئاشکرا بکەن، لە خۆدەرخستنیان دەترسن، لە هەمان کاتدا لەوە دەترسن خۆیان بەری بکەن لێیان، دوژمن تیرۆریان بکات لە هەموو لایەکەوە، بەڵام حاڵی ئەوەی کە ئیمانێکی پتەو لە دڵیدا هەیە، ئەوە دەتوانێ حاڵی خۆی

ڕوون بکاتەوە باش بێ یان خراپ، بەڵام دوو ڕووەکان بەرگی ترسنۆکیان لەبەر کردوەو بەدرۆ ڕازاندوویانەتەوە.

پاشان باس لە ترسنۆکیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ لَوۡ يَجِدُونَ مَلۡجَـًٔا ﴾ کاتێک کە نارەحەتیان بەسەردا دێت پەنای بۆ ببەن ﴿أَوۡ مَغَـٰرَٰتٍ ﴾ بچنە ناویەوەو جێگیر بن تێیدا ﴿ أَوۡ مُدَّخَلٗا ﴾ واتە: یان شوێنێک، یان ژێر زەمینێک خۆیانی تێدا پەنا بدەن ﴿ لَّوَلَّوۡاْ إِلَيۡهِ وَهُمۡ يَجۡمَحُونَ ﴾ واتە: بە پەلە پەنای بۆ دەبەنو خۆیان بزر دەکەن، ئەوان هیچ توانایەکیان نیە لەسەر جێگیر بوون.

(٥٨-٥٩): ﴿ وَمِنۡهُم مَّن يَلۡمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنۡ أُعۡطُواْ مِنۡهَا رَضُواْ وَإِن لَّمۡ يُعۡطَوۡاْ مِنۡهَآ إِذَا هُمۡ يَسۡخَطُونَ ٥٨ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤۡتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ٥٩ ﴾:

دەفەرموێ: ﴿ وَمِنۡهُم مَّن يَلۡمِزُكَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ ﴾ واتە: لە ناو دوو ڕووەکاندا کەسانێک هەن لەکەدارت دەکەنو ڕەخنەت لێدەگرن لە دابەشکردنی بەخشینەکاندا، لەمەدا مەبەستو بۆچوونیان ڕاستو ڕەوا نیە، تەنها مەبەستیان ئەوەیە بەشیان بدرێت ﴿ فَإِنۡ أُعۡطُواْ مِنۡهَا رَضُواْ وَإِن لَّمۡ يُعۡطَوۡاْ مِنۡهَآ إِذَا هُمۡ يَسۡخَطُونَ ﴾ ئەمە حاڵەتێکە ناگونجێو دروست نیە بۆ بەندە ڕەزامەندیو تووڕەیی شوێنی هەواو ئارەزووی دنیایی بکەوێت، بەڵکو پێویستە هەواو ئارەزووی شوێنی ڕەزامەندی خوا بکەوێ، وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يَكُونَ هَوَاهُ تَبَعًا لِمَا جِئْتُ بِهِ} (ذكره الحكيم (١٦٤/٤)، وأخرجه الخطيب (٣٦٨/٤))، واتە: هیچ کەس لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێ تا هەواو ئارەزووی شوێنی ئەو پەیامە نەکەوێ کە هێناومە، وە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ﴾واتە: ئەوەی کە پێیان دەبەخشێت لە زۆرو کەم ﴿ وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ ﴾ واتە: خوامان بەسەو ڕازی دەبین بەو بەشەی کە پێمان دراوە، وە ئەگەر ئومێدیان بە فەزڵو چاکەی خوا ﷻ ببوایەو بیان وتبایە: ﴿ سَيُؤۡتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴾ واتە: ملکەچ دەبووین لە بە دەست هێنانی قازانجو دوورخستنەوەی زیانەکان، ئەوە ڕزگاریان دەبوو لە دوو ڕوویی، وە هیدایەت دەدران بۆ لای ئیمانو بڕواهێنان، پاشان چۆنێتی دابەش کردنی زەکات ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(٦٠): ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦٠ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ ﴾ واتـە: زەکاتـی پێویسـت، بـە بەڵگـەی ئەوەی بەخشـینی دروسـت بـۆ هەمـوو کەسـێکە تایبـەت نیـە بـە کەسـێکو کەسـێکی تـر لێی بێبـەش بێـت، واتـە: زەکات تەنهـا بۆ ئەو کەسـانەیە کە باسـکراون جگە لەوانە بە کەسـێتر ڕەوانیـە کـە بریتیـن لە هەشـت دەسـتە، یەکـەمو دووەم:- هەژارو بـێ نـەواکان، ئەمانەش لـەم شـوێنەدا دوو کۆمەڵـی جیاوازن: هـەژار زیاتر پێویسـتێتی وەک لە بـێ نەوایان، چونکە خـوا ﷻ بەوان دەسـتی پێکـردوە، وە دەسـت پێناکات تەنها بـە گرنگترینیان نەبێت، باسـی هـەژاری کـردوە بەوەی کـە هیچی نیە، یان هەندێ شـتی هەیـە پێویسـتیەکانی پڕناکاتەوە. وە بـێ نەوایـان: ئەوانـەن کە نیـوەی بژێوی یـان زیاتریان هەیـە، بەڵام بە تەواوی بەشـیان نـاکات، بۆیە زەکاتیـان پێ دەدرێـت تا نەداریـان نەمێنێ.

سـێیەم: ئەوانـەن کـە زەکات کۆدەکەنـەوە، هەموو ئەو کەسـانەی کە کاری تێـدا دەکەنو سـەرقاڵن پێیـەوە لـە پارێـزەرو لـەوەی کە کـۆی دەکاتـەوە، یان دەینووسـێت یـان هەڵی دەگرێـت، یـان هاوشـێوەی ئەوانـە، لە بری مانـدوو بونیـان زەکاتیـان پێدەدرێت.

چوارەم: ئەوانەی کە ئومێدی ئەوەیان لێدەکرێ دڵیان بە ئیسلامەوە هۆگربێ کە بریتیە لە گەورەی هۆزێک، کە هۆزەکەی گوێڕایەڵی بکەن لەوەی کە ئومێد بکرێت لە ئیسلام بوونی، یان لە شەڕی بترسێ، یان بە پێدانی بڕواو ئیمانی زیاد بکات یان مسوڵمان بوونی هاوشێوەکانی، هەموو ئەمانە بۆ بەرژەوەندیەکی ئیمانیو گشتی زەکاتیان پێ دەدرێت.

پێنجـەم: کۆیلـەکان: ئەوانـەی نووسـراویان لەگەڵ گەورەکانـی خۆیاندا کـردوە کە خۆیان بکڕنـەوە، هـەوڵ ئـەدەن بۆ ئـەوەی خۆیان ڕزگـار بکەن لـە کۆیلایەتی، ئەوانـە لە زەکات هـاوکاری دەکرێـن تـا ڕزگاریـان بـێ، وە ئـازاد کردنـی کۆیلەیەکـی مسـوڵمان کـە لە ژێـر دەسـتی بێبڕواکانـدا بێ، بێگومـان ئەمەیان لـە پێشـترە. وە دەچێتە ئـەم چوارچێوەیەوە کـە دروسـتە کۆیلە بـە پـارەی زەکات ئـازاد بکرێت بـە شـێوەیەکی گشـتی، چونکە خوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَفِي ٱلرِّقَابِ ﴾.

شەشـەم: قـەرزارەکان ئەوانەش دوو بەشـن: یەکەم: ئەوانـەی بە هـۆی نێوەندگیریەوە قەرزار بـوون، کـە لە نێوانـی دوو کۆمەڵە خەڵکیدا شـەڕو ئاژاوە هەبێ، کەسـێک بچێتـە نێوانیانەوە بـە مـاڵو سـەروەتی خـۆی، بـۆ کۆمەڵێکیـان خـەرج بـکات یـان بـۆ هەموویان، ئـەوە لە زەکاتـدا بەشـێکی بـۆ دیاری دەکـرێ تا زیاتـر بتوانێ لـەو کارەی بـەردەوام بـێ، زەکاتی پـێ دەدرێ ئەگەرچـی دەوڵەمەندیش بێ.

دووەم: کەسێک کە قەرز بۆ خۆی بکات، پاشان نەتوانێ بیداتەوە، ئەوە زەکاتی پێدەدرێ تا قەرزەکەی پێ بداتەوە.

حەوتەم: ئەو کەسەی کە غەزا دەکات لە پێناوی خوادا ﷻ، ئەوانەی کە خۆبەخشن‌و ناویان نیە لە سیستەمی موچەخۆرانی سەربازیدا، زەکاتیان پێدەدرێت تا بتوانن بەردەوام بن لەسەر جیهادکردن، لە نرخی چەک یان ئاژەڵ یان بەخشین بەسەر ماڵ‌و منداڵەکەیدا تا بتوانن ببەخشن بەسەر ماڵ‌و منداڵەکەیدا تا بتوانێ بەردەوام بێ لەسەر جیهادکردن‌و دڵنیابێ.

زۆرێک لە شارەزایانی فیقە دەڵێن: ئەگەر کەسێک یەکلا ببێتەوە بۆ فێربوونی زانست ئەوە لەزەکات بەشی دەدرێ، چونکە زانست لە چوارچێوەی جیهادکردندایە لە پێناوی خوادا ﷻ. وە هەروەها وتویانە: دروستە هەژار ئەوەندەی پێ بدرێت کە بەشی ئەوە بکات بتوانێ حەجی پێ بکات (ئەمە قسەی لەسەرە).

هەشتەم: ڕێبوار ئەو کەسەیە کە دابڕاوە لە شارەکەی خۆی زەکاتی پێ دەدرێ تا دەگاتەوە شوێنی خۆی، بە تەنها ئەم هەشت دەستەیە زەکاتیان بەر دەکەوێ.

﴿ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ﴾خوا بە زانست‌و دانایی خۆی فەرزی کردوە ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾بزانە ئەم هەشت دەستەیە دەگەڕێتەوە بۆ دوو شت، یەکەم: کەسێک پێی دەدرێ بۆ ئەوەی پێویستیەکانی دابین بکات وەک هەژارو بێ نەوا. دووەم: کەسێک پێی دەدرێ پێویستی پێیەتی ئیسلام سوودی لێوەردەگرێ، خوا ﷻ ئەم بەشەی پێویست کردوە لە ماڵی دەوڵەمەندەکاندا بۆ پڕکردنەوەی پێویستی سەرجەم ئیسلام‌و موسوڵمانان بە گشتی. ئەگەر دەوڵەمەندەکان زەکاتی ماڵەکانیان بە شێوەیەکی شەرعی دەربکەن، ئەوە هەژار لە ناو موسوڵماناندا نامێنێ، تەنانەت دەتوانن سنوورەکانی پێ قایم بکەن‌و جیهادی بێبڕوایانی پێ بکەن، وە سەرجەم بەرژەوەندیە ئاینیەکانی پێ بەجێ بهێنن.

(٦١-٦٣): ﴿ وَمِنْهُمُ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٌ ۚ قُلْ أُذُنُ خَيْرٍ لَّكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةٌ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ ۚ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦١﴾ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدًا فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْخِزْىُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ ﴾

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْهُمُ ﴾واتە: لەو دووڕووانە هەیە ﴿ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلنَّبِيَّ ﴾بە وتەی ناشرین‌و تانەو تەشەر لە خۆی‌و ئاینەکەی (ئازاری پێغەمبەر ﷺ دەدەن) ﴿ وَيَقُولُونَ هُوَ

أُذُنٌ ﴾ واتە: بە بای خەیاڵیاندا نەدەهات چی بە پێغەمبەر ﷺ بڵێن‌و چۆن ئازاری بدەن، دەیانوت: ئەگەر هەواڵیان پێیدا دەچین داوای لێبوردنی لێدەکەین، لیمان قبوول دەکات، چونکە ئەو گوێ بۆ هەموو قسەیەک دەگرێ، ڕاستی‌و درۆ لە یەک ناکاتەوە، مەبەستیان ئەوە بوو -ڕووڕەش بن- لە نێوانی خۆیاندا زۆر گرنگی پێنادەن ئەگەر پێی نەگات، وە ئەگەر پێی گەیشت تەنها بە داوای لێبوردن بڕوای پێدەکەن.

بێ ڕێزیان کرد ئەوپەڕی بێ ڕێزی لە چەند ڕوویێکەوە، گەورەترینیان ئازاردانی ئەو پێغەمبەرە بوو کە هاتبوو بۆ ڕێنماییان، دەریان بهێنێ لە گومڕایی‌و لەناوچوون بۆ هیدایەت‌و بەختەوەری.

لەوانە: گرنگی نەدانیان بە خۆی‌و پەیامەکەی ئەوەش جۆرێکە لە ئازاردان. وە لەوانە: تانەدانیان لە عەقڵی پێغەمبەر ﷺ کە گوایە ڕاستگۆو درۆزن لە یەکتر جیاناکاتەوە، بێگومان پێغەمبەر تەواوترینی دروستکراوەکانە لە ڕووی عەقڵ‌و تێگەیشتن‌و هەست پێکردنەوە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أُذُنُ خَيۡرٖ لَّكُمۡ ﴾ واتە: تەنها گوێ لە قسەی خێرو چاکە دەگرێ، بەڵام پشت تێنەکردن‌و توونـد نەبوونی لەگەڵ ئەو دووڕووانەی کە بیانووی درۆیان دەهێنایەوە، لەبەر ڕەوشت بەرزی‌و گرنگی پێنەدانیان بووە، وە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ سَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ إِذَا ٱنقَلَبۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ لِتُعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ إِنَّهُمۡ رِجۡسٞۖ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٩٥﴾ ﴾ التوبة.

بەڵام ئەوەی کە لە ناخ‌و دڵیدایە، دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤۡمِنُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ ئەوانەی کە ڕاستگۆن‌و بە ڕاستی دەزانن، ڕاستگۆو درۆزن لە یەکتر جیادەکاتەوە، وە ئەگەر چی زۆر جار ڕووی ئەوانەی کە دەزانی درۆ دەکەن‌و ڕاست ناکەن ﴿ وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡۚ ﴾ چونکە ئەوان ڕێنمایی لەو وەردەگرن‌و بە ڕەوشتی ئەو دەجوڵێنەوە، بەڵام ئەوانەی کە بڕوادار نەبوون ئەو ڕەحمەتەیان وەرنەگرت، بەڵکو ڕەتیان کردەوە، بۆیە دنیاو دواڕۆژیان لە دەست چوو ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ ﴾ بە کردار یان بە گوفتار ﴿ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ لە دنیاو دواڕۆژدا، وە لە سزای بە ئێش بە کوشتنی ئەوانەی ئازاری دەدەن‌و تانەو تەشەری لێ دەدەن.

يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ
أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا مُؤْمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّهُ مَن
يُحَادِدِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَأَنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدًا فِيهَا
ذَٰلِكَ الْخِزْيُ الْعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن
تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ قُلِ اسْتَهْزِئُوا
إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ
لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ
وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم
بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً
بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ
بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ
عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ
إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ اللَّهُ الْمُنَافِقِينَ
وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا هِيَ
حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ اللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٦٨﴾

﴿ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ ﴾ خۆیان بەری دەکەن لەو تانەو تەشەرەی کە داویانە، ئامانجیان ئەوەیە لێیان ڕازی بین ﴿ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَن يُرْضُوهُ إِن كَانُوا مُؤْمِنِينَ ﴾ چونکە بڕوادار هیچ شتێک پێش ناخات بەسەر ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەمە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ئیمانیان، کاتێک ڕەزامەندی غەیری خواو پێغەمبەری خوایان پێش خست بەسەر ڕەزامەندی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ.

لە ڕاستییدا ئەمە ململانێو دژایەتی کردنە لەگەڵ خوا ﷻ، وە بێگومان هەڕەشەی کردوە لەو کەسەی کە دژایەتی دەکات بە وتەی: ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّهُ مَن يُحَادِدِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﴾ واتە: ئەوەی لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا دژایەتیو کەللەڕەقی بکات، بە جۆرێک کەمتەرخەمی لە فەرمانەکانی خوادا بکات، وە بوێری نیشان بدات لەسەر قەدەغە کراوەکانی ﴿ فَأَنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدًا فِيهَا ذَٰلِكَ الْخِزْيُ الْعَظِيمُ ﴾ واتە: کە هیچ ڕیسوایو سەرشۆڕیەک لەوە ناشرینترو بێزراوتر نیە، کاتێک کە نازو نیعمەتی هەتا هەتایی لە دەست دەدەن، سزای توندو بە ئێش بۆ خۆیان حەڵاڵ دەکەن، پەنا بە خوا لە باروودۆخیان.

(٦٤-٦٦): ﴿ يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ قُلِ اسْتَهْزِئُوا
إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ
وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ
إِيمَانِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾

ئەم سووڕەتە پیرۆزە ناونرا بە ئابڕووبەر، چونکە نهێنی دوو ڕووەکانی ڕوونکردەوە، بەردەوام خوا ﷻ دەیفەرموو: وە لەوان، وە لەوان، باسی سیفەتەکانیانی دەکرد، بەڵام ناوی هیچ کەسێکیانی نەهێنا لەبەر دوو هۆکار:

یەکەم: خوا نهێنی پۆشە، بۆیە نهێنی بەندەکانی دەپۆشێ.

ئەم سیفەتەی کە وەسفی ئەو دوو ڕووانەی پێکراوە، وەسفە بۆ هەموو دوو ڕووەکانی تر تا ڕۆژی دوایی، وەسفەکە ئەوەندە گشتگیر بوو تا دوو ڕووەکان کەوتنە باروودۆخێکی پڕ مەترسیەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٠﴾ مَّلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوا أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلًا ﴿٦١﴾﴾ الأحزاب.

وە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ﴾ واتە: هەواڵیان پێدەداتو ڕیسوایان دەکاتو هەموو نهێنیەکانیان ئاشکرا دەکات تا لەبەر چاوی بەندەکانی ڕوونو ئاشکرا بێ، وە ببنە پەند بۆ ئەوانەی کە پەند وەردەگرن ﴿قُلِ اسْتَهْزِئُوا﴾ واتە: بەردەوام بن لەسەر ئەوەی کە لەسەری دەڕۆن لە گاڵتە پێکردنو قەشمەری کردن، ﴿إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ﴾ خوا ﷻ بەڵێنەکەی خۆی هێنایە جێ، ئەم سوورەتە پیرۆزەی داگرت کە نهێنیەکانیانی دەرخستو ئابڕوویانی برد، ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ﴾ لەو تانەو تەشەرانەی کە لە مسوڵمانانو ئاینەکەیان داویانە، دەستەیەکیان لە غەزای تەبووکدا وتیان: [مَا رأَيْنَا مِثْل قُرَّائنا هَؤلاء يعنون النَّبيّ ﷺ وَأَصْحَابه- أرغبو بطُونا وَأكذب السنا وأجبن عِنْدَ اللِّقاء] واتە: نەمانبینیوە وەک ئەم قورئان خوێنانە (مەبەستیان پێی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵەکانی بوو) زگە ڕۆو زمان لووسو درۆزن بن، وە ترسنۆک بن لە کاتی ڕووبەڕووبونەوەدا.

کاتێک کە هەواڵیان پێگەیشت کە پێغەمبەر ﷺ بە حاڵیانی زانیوە، هاتن بۆ لایو داوای لێبوردنیان لێدەکردو دەیانوت: ﴿إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ﴾ واتە: قسەیەک دەکەین هیچ مەبەستمان پێی نیە، وە مەبەستمان تانەدان نیە، خوا ﷻ درۆو بیانوەکانیان ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿قُلْ﴾ پێیان بڵێ: ﴿أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾ گاڵتە کردن بە خواو پێغەمبەر ﷺ کوفرو بێ باوەڕیە خاوەنەکەی لە دین دەردەچێ، چونکە بنەمای دین لە سەر بەگەورە ڕاگرتنی خواو پێغەمبەر ﷺو دینەکەی وەستاوە، گاڵتەکردن بە شتێ لەوانە دەرچوونە لەو بنەمایە، وە پێچەوانەیەتی بە ئەو پەڕی پێچەوانە، بۆیە کاتێ هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە داوای لێبوردنیان دەکرد، وە پێغەمبەری خواش ﷺ هیچی نەدەفەرموو تەنها وتەی: ﴿أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ﴾.

دەفەرموێ: ﴿إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ﴾ لەبەر ئەوەی داوای لێبوردنیان کردووەو پەشێمان بوونەتەوە لە تاوانەکەیان ﴿نُعَذِّبْ طَائِفَةً﴾ لە ئێوە ﴿بِأَنَّهُمْ﴾ بە هۆی ئەوەی ئەوان

﴿ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴾ بەردەوام بوون لەسەر بێبڕوایی‌و دوو ڕوویيان، وە ئەم دەقانە دەبنە بەڵگە بۆ ئەوەی هەر کەسێک نهێنیەک بشارێتەوە بە تایبەت ئەو نهێنیەی کە فێڵی تێدایە بۆ ئاینەکەی، وە گاڵتە بە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات، ئەوە بێگومان خوا ﷻ ئاشکرای دەکات‌و خاوەنەکەی ڕیسوا دەکاو بە توندترین شێوە سزای دەدات.

وە هەر کەسێک گاڵتە بە شتێک لە کتێبی خوا بکات، یان سونەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ یان لێی کەم بکات، یان گاڵتە بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات ئەوە کافرە بە خوا ﷻ، بێگومان تەوبەو داوای لێخۆشبوونیش وەردەگیرێ لە هەموو تاوانێک ئەگەرچی گەورەش بێ.

(٦٧-٦٨): ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ هِىَ حَسْبُهُمْ ۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٦٨﴾ ﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ﴾ چونکە بەشدارن لە دووڕوویدا، بۆیە هەندێکیان پشتیوانی لە هەندێکی تریان دەکەن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بە هیچ شێوەیەک نابێت بڕواداران بیانکەن بە دۆست، پاشان بە گشتی وەسفی دووڕووەکان دەکات کە بچوک‌و گەورەیان لێی دەرناچێ، دەفەرموێ: ﴿ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ ﴾ ئەویش بێبڕوایی‌و لە سنوور دەرچوون‌و سەرپێچی کردنە ﴿ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ ﴾ بریتیە لە ئیمان‌و ڕەوشتی بەرزو کردەوەی جوان ﴿ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ﴾ لە خێرو چاکەو ڕێگاکانی چاکەخوازی، لێرەدا بە ڕەزیل وەسفی کردوون ﴿ نَسُوا۟ ٱللَّهَ ﴾ یادی خوا ﷻ ناکەن زۆر بە کەمی نەبێت ﴿ فَنَسِيَهُمْ ﴾ لە میهرەبانی خۆی، سەرکەوتوویان ناکات بۆ خێرو نایان خاتە بەهەشتەوە، بەڵکو لە خواری خوارەوەی ئاگردا وازیان لێدەهێنێ بۆ هەمیشەیی بمێننەوە ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ فاسق بوونی لەواندا کۆکردوەتەوە، تاوانی ئەوان گەورەترە لە تاوانی غەیری خۆیان، بە بەڵگەی ئەوەی سزای ئەوان سەختترە لە سزای غەیری خۆیان، وە بڕواداران بەوان تاقی دەکرانەوە لە کاتێکدا لە نێوانیاندا بوون، خۆپاراستن لێیان زۆر سەخت بوو.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ هِىَ حَسْبُهُمْ ۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾ کافرو دووڕووەکانی لە ناو دۆزەخدا پێکەوە کۆکردۆتەوە، لەبەر ئەوەی لە دنیادا ئەوان کۆک بوون لەسەر بێبڕوایی‌و دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی‌و کوفر کردن بە ئایەتەکانی.

كَالَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنكُمۡ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرَ أَمۡوَٰلٗا
وَأَوۡلَٰدٗا فَٱسۡتَمۡتَعُواْ بِخَلَٰقِهِمۡ فَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِخَلَٰقِكُمۡ
كَمَا ٱسۡتَمۡتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُم بِخَلَٰقِهِمۡ وَخُضۡتُمۡ
كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا
وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٦٩ أَلَمۡ يَأۡتِهِمۡ
نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَقَوۡمِ
إِبۡرَٰهِيمَ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِۚ أَتَتۡهُمۡ رُسُلُهُم
بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ
أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٧٠ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ
أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ
وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ
٧١ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا
ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ
وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ٧٢

(٦٩-٧٠): ﴿كَالَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنكُمۡ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرَ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا فَٱسۡتَمۡتَعُواْ بِخَلَٰقِهِمۡ فَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِخَلَٰقِكُمۡ كَمَا ٱسۡتَمۡتَعَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُم بِخَلَٰقِهِمۡ وَخُضۡتُمۡ كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ٦٩ أَلَمۡ يَأۡتِهِمۡ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَقَوۡمِ إِبۡرَٰهِيمَ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِۚ أَتَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ٧٠﴾: خـوا دوو ڕووەکان ئاگـادار دەکاتـەوە لـەوەی کـە تووشـیان بێـت، وەک چـۆن نەتـەوە بـە درۆخەرەوەکانـی پێـش ئەوانیـش تووشـی بـوون، دەفەرمـوێ: ﴿قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَقَوۡمِ إِبۡرَٰهِيمَ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِ﴾ واتـە: شـارو گەلـی (لـوط)هەموویـان ﴿أَتَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾ واتـە: بـە بەڵگـەی ڕوونو ئاشـکرا، وە ئـەوان بـە درۆیـان خسـتەوە ئـەوەی کـە خـوا بۆمـان دەگێڕێتەوە بەسـەریاندا هـات، ئێـوە کردەوەکانتـان لە کـردەوەی ئەوان دەچێـت، ڕاتـان بـواردو شـادمان بـوون بەو بەشـەی لـە دنیـادا بۆتان دیـاری کرابـوو، بە شـێوەیەک بەکارتـان هێنـا تەنها بـۆ ئـارەزوو مەرامەکانی خۆتان بـوو، وە بەکارتـان هێنان بـۆ سـەرپێچی کردنـی خوا، ویسـتو ئامانجـی ئێوە تەنهـا لـەوەدا کۆبـووەوە، وەک چۆن پێشـینی ئێـوە بەو شـێوەیە ﴿وَخُضۡتُمۡ كَٱلَّذِي خَاضُوٓاْ﴾ ڕۆچـوون لە بەتاڵـیو پووچیدا وەک چـۆن ئـەوان ڕۆچـوون، بـۆ ئـەوەی هەقو ڕاسـتی پـێ لەناو بـەرن، ئەمە کـردەوەو زانسـتیانە، چێـژ وەرگرتـن لـە بەشـدارو ڕۆچـوون لە بەتاڵیـدا، بۆیە شایسـتەی سـزا بوون لەلایەنـی خـواوە ﷻ، وەک چۆن پێشـینی ئەوانیش بە هەمان شـێوە شایسـتەی ئـەوە بوون، ئەوانـەی کـە کـردەوەی ئەوانیـان کرد.

بـەڵام بـڕواداران ئـەوان ئەگـەر چـی ڕایـان بـواردو شـادمان بـوون بە بەشـی خۆیـان، وە لـە دنیـادا دەسـت کـراوە بـوون، بێگومـان پشـتیان پێی بەسـت بـۆ گوێڕایەڵی خـوا ﷻ، بـەڵام زانسـتەکەیان بریتـی بوو لـە زانسـتی پێغەمبـەران، ئەویش گەیشـتن بوو بـە دڵنیایی لـە هەمـوو داواکراوەکانـدا، وە مشـتو مڕ لەسـەر هەقو ڕاسـتی بـۆ لەناوبردنـی پووچیو ناهەقی.

کـە دەفەرموێ: ﴿ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ ﴾ کاتی تووشـی سـزا دەبنەوە ﴿ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾ بـە شـێوەیەک بوێریـان کـرد لـە تاوانکردنـدا، وە سـەرپێچی پێغەمبەرانیـان کـرد، وە شـوێنی کاری لووت بـەرزو خۆبەزلزانـان کەوتن.

(٧١-٧٢): ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٧١ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ٧٢ ﴾

کاتـێ کە باسـی ئەوەی کـرد دووڕووەکان هەندێکیان دۆسـتی ئەوی ترن، باسـی ئەوەشـی کـرد کـە بـە هەمـان شـێوە بڕوادارانیـش هەندێکیـان دۆسـتی هەندێکـی تریانن، وەسـفی کـردوون بـە پێچەوانـەی وەسـفی دووڕووەکان، دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ ﴾ واتـە: نێـرو مێیـان ﴿ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ ﴾ لـە خۆشەویسـتیو دۆسـتایەتیو سەرخسـتندا ﴿ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴾ ئـەوە ناوێکـی گشـتگیرە بـۆ شـتێک کـە چـاک بـێ لـە بیـرو بـڕوای چـاکو کـردەوەی جـوانو ڕەوشـتی بـەرز، یەکـەم کەسـێک کـە دەچێتە ئـەو چـوار چێـوەوە بـڕوادارن خۆیانـن ﴿ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴾ بریتیـە لـە هەمـوو ئەوانـەی کـە پێچەوانـەی چاکە بـێو هەڵی بوەشـێنێتەوە، لـە بیروبڕوای پـووچو کردەوەی ناشـرینو ڕەوشـتی نامـۆ ﴿ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ واتـە: نوێژەکانیـان بەجـێ دەهێنـن ﴿ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ واتـە: زەکاتـی ماڵیـان دەدەن ﴿ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ﴾ واتە: بەردەوامـن لـە گوێڕایەڵـی خـوا ﷻو پێغەمبەرەکـەی ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرۡحَمُهُمُ ٱللَّهُ ﴾ واتـە: دەیانخاتـە چـوار چێوەی ڕەحمـەتو میهرەبانی خۆیەوەو فـەزڵو چاکەی خۆی بەسـەریاندا دەڕێژێـت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾ واتـە: بەهێـزو بـە توانایـە، لەگـەڵ هێـزو توانایدا حەکیـمو دانایـە، هەموو شـتێ لـە جێگای شایسـتە بە خـۆی دادەنێت، ئەوەی کە سـوپاسو

ستایش دەکرێ لەسەر ئەوەی کە دروستی کردووەو فەرمانی پێکردوە.
پاشان باسی ئەو پاداشتە دەکات کە بۆی ئامادە کردوون، دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ﴾ هەموو نازو نیعمەتو خۆشیەک لە خۆ دەگرێت، هیچ خەمو خەفەتو ناخۆشیەکی تێدا نیە، ئاوی سازگار بە ژێر کۆشکو تەلارو دارو درەختەکانیاندا تێدەپەڕێ کە کەس بە خێرو بەرەکەتی نازانێ جگە لە خوا ﷻ نەبێ ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ هەرگیز حەز ناکەن جێ گۆڕکێیان پێبکەن ﴿وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ﴾بە جوانترین شێوە ڕازاوەتەوە بۆ بەندە بڕوادارە خواناسەکان، بینینی دڵ خۆشت دەکات، وە شوێنی نیشتەجێبوونی زۆر دڵرفێنە، هەموو تایبەتمەندیەکان لە خۆ دەگرێت کە لە پاش ئەوە ئاوات بە هیچی تر ناخوازن، تەنانەت خوا ﷻ بۆیانی ئامادە کردوە چەندین ژوور لە ئەوپەڕی پاکیو جوانیدان، لە دەرەوە ناوی دەبینرێو لە ناوەوەش دەرەوەی دەبینرێ، هەقی خۆیەتی ئەم کۆشکو تەلارە ڕازاوانە دڵ بۆی بجوڵێتو ئارەزووی بکات، چونکە بەهەشتی هەمیشەییەو ناگوازرێنەوە ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ﴾ حەلاڵی دەکات لەسەر ئەهلی بەهەشت ﴿أَكْبَرُ﴾لەو نازو نیعمەتانەی کە تیایدان، بێگومان نیعمەتەکانیان تەواو نابێ بە بینینی پەروەردگارو ڕەزامەندی ئەو نەبێ، ئەوە تاکە ئامانجی خواناسانە، ڕەزامەندی پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەوی لە گەورەترینی نیعمەتەکانی بەهەشتە.
﴿ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ کاتێک کە هەموو ئامانجەکانیان بەدەست هێناو هەموو ئەوانەی لێی دەترسان لێیان دوورخرایەوە، سەرجەم کارو کردەوەکانیان کەوتە سەر ڕێڕەوەی خۆی بە شێوەیەکی جوانو چاک، داوا لە خوای پەروەردگار دەکەین بە بەخشندەیی خۆی بمان گێرێت لە یەکێک لەوان.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ
وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٧٣ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ
وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ
بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ
مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ
ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ
مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ٧٤ ۞ وَمِنۡهُم مَّنۡ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنۡ ءَاتَىٰنَا
مِن فَضۡلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ
٧٥ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضۡلِهِۦ بَخِلُواْ بِهِۦ وَتَوَلَّواْ وَّهُم
مُّعۡرِضُونَ ٧٦ فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقٗا فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ
بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ٧٧
أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ سِرَّهُمۡ وَنَجۡوَىٰهُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ
عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ٧٨ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ
فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٧٩

**(٧٣-٧٤):** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ٧٣ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْۚ وَمَا نَقَمُوٓاْ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ٧٤ ﴾:

**خـوا ﷻ دەفەرمـوێ:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴾ واتـە: جیهـاد بکە لـە دژیـانو توونوتیـژ بـە لەگەڵیان، ئەم جیهـاد کردنـە دەچێتـە چوارچێوەیەوە: جیهـاد کـردن بـە دەسـتو جیهـاد کـردن بـە بەڵگـەو زمان، هـەر کەسێک لـە جەنگدا ڕووبەڕوویـان بوویـەوە، با بە دەسـتو بازوو زمانو شمشـێرو ڕوونکردنـەوە جیهاد بکات. وە هـەر کەسـێک لە ژێر دەسـتی ئیسـلامدا بـوو وەک ئەوانەی بەڵێـنو پەیمانیـان لەگەڵدا بەسـتراوە، ئـەوە جیهـادی لـە دژ دەکرێـت بـە بەڵگـەی ئاشـکرا، وە جوانـی ئیسـلامی بۆ ڕوون دەکرێتـەوە، وە خراپـیو قیزەونـی بتپەرسـتیو شـیرکو کوفری بۆ بـاس دەکرێت، ئەمـە لە دنیـادا، بەڵام لـە ڕۆژی دواییـدا ﴿ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ ﴾ واتـە: شـوێنو جێگەیانە ڕزگاریـان نابـێ لێـی ﴿ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴾ (وە خراپترین شـوێنو سـەرەنجامە).

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُواْ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ ٱلۡكُفۡرِ ﴾ واتـە: وتەیەکیان وت وەک وتـەی هەندێکیـان (کـە کوفـر بـوو)، وەک لـە شـوێنی دی دەفەرمـوێ: ﴿ لَيُخۡرِجَنَّ ٱلۡأَعَزُّ مِنۡهَا ٱلۡأَذَلَّۚ ٨ ﴾ المنافقون، ئـەو وتانـەی کـە یەک بـە دوای یەکدا دەیانکـرد لـە گاڵتە کردن بە ئاینو پێغەمبەر ﷺ، هەر کاتێک پێیـان بوترایە کە پێغەمبەر ﷺ بـە تانـەو تەشـەرەکانیانی زانیوە، دەهاتنـە خزمەتیو سـوێندیان بە خوا ﷻ بـۆ دەخوارد کە شـتی وایـان نەوتوە، خوا ﷻ بـە درۆیان دەخاتـەوەو پێیان دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدۡ قَالُواْ كَلِمَةَ

ﭐلۡكُفۡرِ وَكَفَرُواْ بَعۡدَ إِسۡلَٰمِهِمۡ ﴾.
مسـوڵمان بوونیـان لـە پێشـتر ئەگەرچـی دەری هێنان لـە چوارچێـوەی کوفرو بـێ ئیمانی، بـەڵام وتەکانـی ئـەم دواییەیـان ئیسـلامەتیانی هەڵوەشـاندەوەو کەوتنـەوە نێـو کوفـرو بێ ئیمانـی، ﴿ وَهَمُّواْ بِمَا لَمۡ يَنَالُواْ ﴾ کاتێـک کە ویسـتیان پێغەمبەر ﷺ لە غـەزوەی تەبوک شـەهید بکـەن، خـوا ﷻ پلانەکەیانی ئاشـکرا کرد فەرمانی کـرد ڕێگری لـە ئامانجە پیس‌و بۆگەنەکەیـان بکرێـت ﴿ وَمَا نَقَمُوٓاْ ﴾ هیـچ ڕەخنەیەکیـان لە پێغەمبـەر ﷺ نەبوو ﴿ إِلَّآ أَنۡ أَغۡنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضۡلِهِۦۚ ﴾ پـاش ئـەوەی کـە هـەژار بـوون، ئەمـە یەکێکـە لـە سەرسـوڕهێنەرترینی شـتەکان، کـە دژایەتـی‌و گاڵتـە بـە کەسـێک بکـەن هـۆکار بێ بۆ دەرهێنانیـان لـە تاریکیـەوە بـۆ ڕۆشـنایی، وە دەوڵەمەندیان بـکات پاش ئـەوەی کە هەژار بوون.
ئایـا هەقـی ئـەوە نیە بە گـەورە تەماشـای بکەن‌و بە گـەورەی دابنێـن‌و بڕوای پـێ بهێنن؟!
بێگومـان لەم کەسـەدا بانگـەوازکاری خاوەن خوڕەوشـتی بـەرزی مرۆڤایەتـی کۆبوویەوە، پاشـان تەوبەو داوای لێخۆشـبوونی بۆ پێشـنیار کردوون‌و دەفەرموێ: ﴿ فَإِن يَتُوبُواْ يَكُ خَيۡرٗا لَّهُمۡۖ ﴾ چونکە داوای لێخۆشـبوون بنەمایە بۆ خۆشـبەختی دنیـاو دوارۆژ ﴿ وَإِن يَتَوَلَّوۡاْ ﴾ لـە داوای لێخۆشـبوون‌و ملکـەچ بـوون ﴿ يُعَذِّبۡهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ ﴾ لە دنیـادا کـە خـەم‌و خەفەتیـات تـووش دەکات بـە هـۆی ئـەوەی کـە خـوا ﷻ ئاینەکەی سـەردەخات‌و پێغەمبەرەکـەی سـەربەرز دەکات، وە ئـەوان ناگەن بە ئاواتەکانـی خۆیان‌و لە دوارۆژدا سزایەکی سـەخت‌و ناخۆش چاوەڕێیان دەکات ﴿ وَمَا لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن وَلِيّٖ ﴾ کارەکانیـان بەڕێوەببـات‌و ئاواتەکانیان بـەدی بهێنێـت ﴿ وَلَا نَصِيرٖ ﴾ نارەحەتیەکانیان لە سـەر لاببـات ئەگـەر خـوا ﷻ پشـتیوانی لـێ نەکـردن، بە ڕاسـتی ئەمانـە کۆمـەڵ‌و تاقمی خراپەکارو ڕەنج بەخەسـارو ڕیسـواو بێبەشـن.
(٧٥-٧٨): ﴿ وَمِنۡهُم مَّنۡ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنۡ ءَاتَىٰنَا مِن فَضۡلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٧٥ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضۡلِهِۦ بَخِلُواْ بِهِۦ وَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ٧٦ فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقٗا فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ٧٧ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ سِرَّهُمۡ وَنَجۡوَىٰهُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ٧٨ ﴾:
واتـە: لـەو دووروانـە کەسـانێک هەبـوون بەڵێنیـان دا بـە خـوا ﷻ ﴿ لَئِنۡ ءَاتَىٰنَا مِن فَضۡلِهِۦ ﴾ لـە دنیـادا نـازو نیعمەتمـان بەسـەردا برێـژێ ﴿ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ

ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ پەیوەنـدی خزمایەتـی بەجـێ دەهێنیـنو ڕێـز لـە میـوان دەگریـنو کاری چـاک ئەنجـام دەدەیـن، ﴿ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضۡلِهِۦ ﴾ بـە وەفـا نەبـوون بەرانبـەر ئـەو پەیمانـەی کـە دابوویـان، بەڵکـو ﴿ بَخِلُواْ بِهِۦ وَتَوَلَّواْ ﴾ لـە گوێڕایەڵـیو ملکەچی ﴿ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ﴾ واتـە: ڕوویـان نەکـردە کاری خێـرو چاکـە، کاتـێ کـە بـە وەفـا نەبـوون بەرانبـەر بـەو پەیمانـەی کـە دابوویان بـە خـوا ﴿ فَأَعۡقَبَهُمۡ نِفَاقٗا فِي قُلُوبِهِمۡ ﴾ بـەردەوام ﴿ إِلَىٰ يَوۡمِ يَلۡقَوۡنَهُۥ بِمَآ أَخۡلَفُواْ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ﴾.

بـا مسـوڵمان خـۆی لەم وەسـفە ناشـرینە بپارێـزێ، پەیمان بدات بـە خوا ﷻ، ئەگـەر فلان کـەس فـلان شـتی بـۆ بـوو، ئـەوە ئـەو واو وا دەکات، دوایـش پەیمانەکـەی بەجێنەهێنێ، بێگومـان ئەوە خوا سـزای دەدات بە دووڕووی وەک چۆن سـزای ئەوانـی داوە، پێغەمبەر ﷺ لـە فەرموودەی ڕاسـتدا دەفەرمـوێ: {آيَـةُ الْمُنَافِقِ ثَـلاَثٌ: إِذَا حَـدَّثَ كَـذَبَ، وَإِذَا وَعَـدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِـنَ خَـانَ} (أخرجـه البخاري برقم: (٣٣)، ومسـلم برقم: (١٠٩) عَـنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

واتـە: دووڕوویی سـێ (شـتن): ئەگەر قسـەی کرد درۆی کـرد، ئەگەر بەڵێنی دا سـەرپێچی کرد، ئەگـەر ڕاسـپاردەی لادانرا ناپاکـی تێدا کرد.

ئـەم دوو ڕووەی کـە پەیمـانو بەڵێنـی داوە بـە خـوا، ئەگـەر خـوا ﷻ لە فـەزڵو چاکەی خـۆی پـێ ببەخشـێ، ئەوە خێـرو چاکـە دەکاتو دەبێتـە یەکێک لـە چاکەکاران، قسـەی کـردو درۆی کـرد، پەیمانـی داو نەیبردە سـەر، ئەسـپاردەی لادانـراو خیانەتی کـرد، بۆیە هەڕەشـەی کردوە لە هەر کەسـێک ئەم کارە بـکات وەک دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ سِرَّهُمۡ وَنَجۡوَىٰهُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴾ لـە داهاتوویەکـی نزیکـدا پاداشـتیان دەداتـەوە لەسـەر ئەو کردەوانـەی کە کردوویانە، ئـەم دەقانە دەربـارەی پیاوێک لـە دوو ڕووەکان دابەزیـە خـوارەوە کـە پێـی دەوتـرا: (ثعلبة) هاتـە خزمـەت پێغەمبەر ﷺ داوای لێکـرد کـە لـە خـوا ﷻ بپاڕێتـەوەو لـە فـەزڵو چاکـەی خـۆی بیبەشـی نـەکات، وە ئەگـەر پێـی بەخشـی ئـەوە کاری خێـرو چاکـەی پێـدەکاو پەیوەنـدی خزمایەتـی بـە جێدەهێنـێو هـاوکاری بـێ نەوایـان دەکات، پێغەمبەریـش دوعای بۆ کردو بـۆی پاڕایەوە، ئـەم پیـاوە بـوو بە خـاوەن مەڕوو مـاڵات بەردەوام لـە زیاد بوونـدا بوو، تا شـاری مەدینەی بەجێهێشـت، تـا وای لێهـات تەنهـا لە هەنـدێ لە نوێـژەکان ئامـادە دەبوو، پاشـان دوورتر کەوتـەوە تەنهـا لـە نوێـژی هەینیـدا ئامادە دەبـوو، پاشـان مـەڕوو ماڵاتەکـەی زیاتر بوو

تـا وای لێهـات ئامـادەی جوموعـەو جەماعەت نەدەبـوو، پێغەمبـەری خوا ﷺ بـۆ ماوەیەک نەیبینـی پرسـیاری لـە دۆخی کـرد، نێردراوی نـارد بـۆ کۆکردنـەوەی زەکات کاتێک کە تێپەڕیـن بـە لای (ثعلبـة)دا داوای زەکاتـی ماڵەکەیـان لێکـرد، ئەویـش لـە وەڵامـدا وتی: ئەمـە تەنهـا بـاجو سـەرانەیە، واتـە: ئەمـە بـاج نیە، بـەڵام بـرای بـاجو سـەرانەیە، زەکاتی پێنـەدان، گەڕانـەوە بـۆ خزمەتـی پێغەمبەر ﷺ هەواڵـی ئەوەیان پێـدا فەرموی: (یا ویـح ثعلبة یـا ویـح ثعلبـة) واتـە: دەک بەڵات لێـدا (ثعلبـة)، دەک بەڵات لێـدا (ثعلبـة). کاتێک کە ئەم ئایەتـە دابـەزی بۆ ئـەوو هاوشـێوەکانی، هەندێ لە کەسو کارەکەی ڕۆشـتن بـۆ لایو ئەم هەواڵەیـان بـە (ثعلبـة) گەیانـد، ئەویش هـاتو زەکاتی ماڵەکـەی خۆی دابـە پێغەمبەر ﷺ بـەڵام ئـەو لێـی وەرنەگرت، پـاش وەفاتی پێغەمبـەر ﷺ هێنای بـۆ ئەبو بەکـر، ئەویش لێی وەرنەگـرت، پـاش وەفاتـی ئەویش هێنای بـۆ عومەر ئەویـش لێی وەرنەگرت، وتـراوە: ئەو لـە سـەردەمی ئیمامی عوسـماندا وەفاتی کـردوە[٦].

(٧٩-٨٠): ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ أَوۡ لَا تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ إِن تَسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ سَبۡعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾

ئەمـەش بـە هەمـان شـێوە لـە ڕیسـواکردنی دووڕووەکانە -خـوا ڕوویـان ڕەش بـکات- بۆ هـەر شـتێ بانـگ بکرێـن ڕەخنـەی خۆیانـی لێدەگـرنو تانـەی لێـدەدەن، کاتێـک خواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ هانیانـدا لەسـەر چاکـەو بەخشـین، مسـوڵمانان بە دەمیـەوە هاتن ئەوەی لـە توانایانـدا بـوو هەر کەسـەو بە پێـی توانای خـۆی درێغـی نەکـرد، تیایاندا بـوو زۆری دەبەخشـی، وە تیایاندا بوو کەمی دەبەخشـی، دوو ڕووەکان تانەو تەشـەریان لەوانە دەدات کە

---

٦) چیرۆکـی (ثعلبـة) زۆرێـک لـە موفەسـیرین باسـیان کـردوە، وە زۆرێکیـش لـە زانـا گەورەکانـی فەرمودەناسـی شـارەزا لـە بـواری فەرمـودەدا بـە لاواز دایاننـاوە، لەوانـە: (إبـن حـزم، البیهقـي، القرطبـي، الهیثمـي، العراقـي، إبـن حجـر، السـیوطي، المنـاوي)، وە بێجگـە لـە ئەوانیـش ڕەحمەتـی خوایـان لێبـێ، ڕوونیـان کردۆتـەوە کـە لـە سـەنەدی فەرمودەکـەدا (علـی کـوری یزیـد) هاتـوە، وە ئـەو لاوازە وەک چـۆن لـە ڕیوایەتەکـەدا هاتـوە: مەعانـی کـوری ڕوفاعـەو قاسـمی کـوری عەبدوڕەحمـان ئەمانیـش هەردووکیـان لاوازن، وە (إبـن حـزم) لـە چەنـد ڕوویەکـی تـرەوە فەرمودەکـەی بـە لاواز باسـکردوە. بڕوانـە: (١١\٢٠٨)، والاصابـة: ترجمـة ثعلبـة، ومجمـع الزوائـد (٧\٣٢)، والجامـع لاحـكام القـران (٨\٢١٠)، وفیـض القدیـر(٤\٢٥٧)، وفتـح البـاري (٣\٨)، ولبـاب النقـول للسـیوطي (١٢١) وتخریـج الإحیـاء للعراقـي (٣\٣٣٨).

ماڵێکـی زۆریان بەخشـیوە، دەیانوت ئەم بەخشـینە تەنها بـۆ ڕیاو ناوبانگە، وە بە ئەوانەیشـی کـە کەمیان بەخشـیوە لـە هـەژارەکان دەیانوت: بێگومـان خـوا دەوڵەمەندەو پێویسـتی بەم بەخشـینە کەمـە نیە، خوا ﷻ ئـەم ئایەتەی نـاردە خـوار: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلۡمِزُونَ ﴾ واتە: ڕەخنـەو تانـەو تەشـەر ﴿ ٱلۡمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ فِي ٱلصَّدَقَٰتِ ﴾ دەیانـوت: مەبەسـتیان پێی ڕیاکردنو شـانازی کردنـە ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهۡدَهُمۡ ﴾ ئەوانەی کـە کەمیـان هەیـەو بـە پێـی توانـای خۆیـان دەیانبەخشـی، دووروووەکان دەیانـوت: خوا دەوڵەمەنـدەو پێویسـتی بەو چاکانـە نیە ﴿ فَيَسۡخَرُونَ مِنۡهُمۡ ﴾ خوا ﷻ وەڵامـی دانەوە بەوەی ﴿ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنۡهُمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ ئـەوان وتەکانیـان لـەم خاڵە ترسـناکانەدا کۆکردەوە:

لەوانە: شـوێکەوتنیان بە دوای مسوڵماناندا، وە سـوور بوون لەسەر ئەوەی وتەیەک بدۆزنەوەو بیکەنە سـەر باسـی خۆیان، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلۡفَٰحِشَةُ فِي ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ١٩ ﴾ النـور. وە لەوانـە: تانەدانیـان لە بـرواداران بە هـۆی ئیمانەکەیانـەوە، بێبڕوایـە بە خـواو ڕق لێبونەوەیە بـە دین، کـە بێگومان تانـەدان حـەڕامو قەدەغەیـە، تەنانەت یەکێکـە لە تاوانـە گەورەکان لـە دنیـادا، بەڵام تانەدان لـە کاروبـاری ئاینیدا ناشـرینترو گەورەترە.

وە لەوانـە: بڕیاردانیـان لەسـەر ئەوەی کە هەر کەسـێ ماڵێکی زۆر ببەخشـێ ئـەوە بۆ ڕیاییە، هەڵەیەکی کوشـندەو ناشـرینە، وە قسـەکردنە لـە غەیبو پەنهانیـدا، وە تانەدانـە بە گومان، دەی چـی خراپەیەک لەمـە خراپترە؟!

وە لەوانـە: قسـەکانیان دەربـارەی ئـەو کەسـەی کـە ماڵێکـی کـەم دەبەخشـێت: (خـوا دەوڵەمەنـدەو پێویسـتی بـە ئەو نیـە) وتەیەکە مەبەسـتێکی پـووچو بەتاڵی تێدایـە، بێگومان خـوا پێویسـتی بە خێـرو چاکەی کەمو زۆریـش نیە، تەنانەت پێویسـتی بـە دەوڵەمەندترینی هەمـوو ئاسـمانەکانو زەویـش نیـە، بەڵکو خـوا فەرمانی بـە بەندەکانـی کردوە کـە ئەوان پێویسـتیان بـەو هەیە، خـوا ﷻ ئەگەرچی دەوڵەمەندە بەندەکانیشـی هەژارنو پێویسـتیان بە ئـەوە ﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ٧ ﴾ الزلزلـة. لـە قسـەی دوو ڕووەکاندا خاوبونەوەیـەک بـەدی دەکرێـت لە خێرو چاکەدا بۆیە پاداشـتیان ئەوەیە خـوا ﷻ گاڵتەیان پـێ بکاتو سـزای سـەختو بـە ئێشـیان بۆ دیـاری بکات.

ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً
فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ
وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ
خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا أَن يُجَٰهِدُوا بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ
فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا لَا تَنفِرُوا فِى ٱلْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا
لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا جَزَآءً
بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ
مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا مَعِىَ أَبَدًا وَلَن
تُقَٰتِلُوا مَعِىَ عَدُوًّا إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا
مَعَ ٱلْخَٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ
عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَٰسِقُونَ
﴿٨٤﴾ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَٰدُهُمْ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم
بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَآ
أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا بِٱللَّهِ وَجَٰهِدُوا مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ
أُولُوا ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾

﴿ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً﴾ (داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکەی یان نەکەی، تەنانەت ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێبوردنیان بۆ بکەی) ئەمە بۆ موبالەغەیە ﴿فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ﴾(هەرگیز خوا لێیان خۆشنابێ) وەک چۆن لە دەقێکی تردا دەفەرموێ: ﴿سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٦﴾﴾ المنافقون.

پاشان هۆکاری ئەوەیان بۆ باس دەکات کە لێیان خۆش نابێت، دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ﴾ بێ باوەڕ داوای لێبوردن هیچ سوودێکی پێناگەیەنێ بە هەمان شێوەش کاری چاکە ﴿وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ﴾ ئەوانەی کە فاسق بوون بووەتە وەسفێک بۆیان، بە شێوەیەک کە جگە لەوە هیچی تر هەڵنابژێرنو نایشی گۆڕن، هەقو ڕاستیان بۆ دێت، بەڵام ئەوان ڕەتی دەکەنەوە، بۆیە خوا ﷻ سزایان دەداو سەرکەوتوویان ناکات.

(٨١-٨٣): ﴿فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا أَن يُجَٰهِدُوا بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا لَا تَنفِرُوا فِى ٱلْحَرِّ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا جَزَآءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَٰتِلُوا مَعِىَ عَدُوًّا إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا مَعَ ٱلْخَٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾﴾

خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە کە دوو ڕووەکان شانازیان دەکرد بە دواکەوتنیانو نەچوونیان بۆ جەنگ، وە بە بای خەیاڵیاندا نەدەهات، کە ئەوە بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ئیمانو، هەڵبژاردنی کوفر بەسەر ئیمانەوە، دەفەرموێ: ﴿فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ﴾ ئەمە ئەندازەیەکی زیاترە لەسەر دواکەوتن، چونکە ئەمە دواکەوتنێکی قەدەغە کراوە، وە شانازی کردنو ڕازیبوونە بەو تاوانە ﴿وَكَرِهُوٓا أَن يُجَٰهِدُوا بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ ئەمە بە

پێچەوانەی بڕوادارانە، ئەوانەی کاتێک کە دوادەکەون، ئەگەر بە هۆی بیانوویەکیشەوە بێت خەمبار دەبن‌و بێتاقەتیەکی زۆر ڕوویان تێدەکات، وە پڕ بە دڵ پێیان خۆشە بە ماڵو سەروەت‌و سامان‌و نەفسیان لە پێناوی خوادا ﷻ جیهاد بکەن، چونکە لە دڵەکانیاندا ئیمان چەسپیوە، وە چاوەڕوانی فەزڵو چاکەو پاداشتی خوا دەبن، ﴿ وَقَالُوا ﴾ واتە: دووڕووەکان وتیان: ﴿ لَا تَنفِرُوا فِي الْحَرِّ ﴾ واتە: دەرچوون لەم گەرمایەدا زۆر قورسە، فەزڵو چاکەی پشوویەکی کاتی تەواوبوویان دا بەسەر پشوویەکی هەمیشەیی تەواودا، خۆیان لە گەرمایەک پاراست کە لە سێبەردا خۆی لێ دەپارێزرێ، وە لە بەیانیان‌و ئێوارانداا نامێنێ، بەسەر ئەو گەرمایەدا کە کەس ناتوانێ ئەندازەی بکات کە ئەویش ئاگری بەتینی دۆزەخە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ ﴾ کاتێک کە گرنگیاندا بەوەی کە نامێنێ بەسەر ئەوەی کە هەمیشەییە، وە کاتێک کە خۆیان دزیەوە لە نارەحەتیەکی کەم‌و تەواو بوو، بۆ نارەحەتی‌و ناخۆشیەکی بەردەوام‌و دانەبڕاو ﴿ فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا ﴾ واتە: با لەم دنیایەدا کە سەرەنجام تەواو دەبێ‌و کۆتایی پێ دێ، ڕابوێرن‌و دڵیان خۆش بێ‌و لەزەتی لێوەربگرن، دڵنیا بن لە داهاتوویەکی نزیکدا لە سزای سەختدا دەبن، ﴿ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ لە بێبڕوایی‌و دووڕوویی، وە گوێنەدان بە فەرمانی پەروەردگاریان، ﴿ فَإِن رَّجَعَكَ اللَّهُ إِلَىٰ طَائِفَةٍ مِّنْهُمْ ﴾ ئەوانەن کە بەبێ بیانوو دواکەوتن، وە خەمبار نەبوون بە دواکەتنیان لە جیهاد کردن ﴿ فَاسْتَأْذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ ﴾ بۆ غەزایەکی تری غەیری ئەم غەزایە، ئەگەر بینیان ئاسانە ﴿ فَقُل ﴾ وەک سزایەک پێیان بڵێ: ﴿ لَّن تَخْرُجُوا مَعِيَ أَبَدًا وَلَن تُقَاتِلُوا مَعِيَ عَدُوًّا ﴾ خوا ﷻ بێنیازە لە ئێوە ﴿ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِالْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَاقْعُدُوا مَعَ الْخَالِفِينَ ﴾ ئەمەش وەک چۆن خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفْئِدَتَهُمْ وَأَبْصَارَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا بِهِ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾ ﴾ الأنعام.

بێگومان ئەوەی قورسی‌و تەنبەڵی کردوەو دواکەوتووە لە جیهاد کردن کە فەرمانی پێکراوە، لە کاتێکدا هەلی بۆ ڕەخساوە، دوای ئەوە سەرکەتوو نابێ‌و درز دەکەوێتە نێوان ئەوو جیهادکردنەوە. وە هەروەها بەهانەیان دەبڕێ، چونکە مسوڵمانان ئەگەر بزانن ئەوان قەدەغەیان لێکراوە بچن بۆ جیهاد بە هۆی سەرپێچی کردنیانەوە، ئەوە دەبێتە سەرزەنشت‌و سەرکۆنەکردنیان، وە دەبێتە پەندو وانەیەک بۆ ئەوەی هیچ کەس ئەو کارەی ئەوان ئەنجام نەدات.

(٨٤): ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَمَاتُوا وَهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾:

خوا ﷻ (بە پێغەمبەر ﷺ) دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا ﴾ پاش بە خاک

سپاردن دوعای بۆ بکات، بێگومان نوێژو وەستان لەسەر گۆڕەکانیان تکاو شەفاعەتی ئەوە بۆیان، وە ئەوان تکاو شەفاعەت سوودیان پێ ناگەیەنێت ﴿ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴾ هەر کەسێک بێبڕوابێ‌و لەسەر ئەوە بمرێ، تکای هیچ کەس سوودی پێ ناگەیەنێت، ئەوەش دەبێتە پەندو عیبرەت بۆ غەیری وانیش، وە ترساندن‌و سەرکۆنەکردن بۆ کەسانی تر، بەو شێوە هەر کەسێ کوفرو دووڕوویی لێ دەربکەوێ ئەوە نوێژی لەسەر ناکرێ.

ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ڕێگە پێدانی نوێژ لەسەر بڕواداران، وە وەستان لەسەر گۆڕەکانیان بۆ ئەوەی دوعایان بۆ بکرێ، وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ ئەوەی دەکرد بۆ بڕواداران، بێگومان تەنگ کردنەوەی قەدەغەکردن لە دووڕووەکان، بەڵگەیە لەسەر ڕێگە پێدان بۆ بڕواداران.

(٨٥): ﴿ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَـٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾:

(ئنجا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ): ﴿ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَـٰدُهُمْ ﴾ واتە: سەرت سوڕنەمێنێ بەو کەسانەی کە خوا ماڵ‌و سامان‌و منداڵی پێداون، ئەمە بە هۆی ئەوەوە نیە کە ڕێزی لێگرتوون، بەڵکو ئەوە بۆ سووکایەتی‌و سەرکۆنەکردنیانە ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا ﴾ ماندوو دەبن لە بەدەستهێنانیدا، وە دەترسن لە لەدەستدانی، وە پیرۆزباییشیان لێناکرێ، بەڵکو بەردەوام بە هۆیەوە تووشی ناخۆشی‌و نارەحەتی دەبن، وە لە خوا ﷻ‌و ڕۆژی دوایی دوریان دەخاتەوە، تا لە دونیا دەردەچن ﴿ وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴾ خۆشەویستی دونیا بێبەشی کردوون لە هەموو شتێ، بەردەوام دڵیان پەیوەستە پێیەوەو بیریان لە لایەتی.

(٨٦-٨٧): ﴿ وَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَجَـٰهِدُوا۟ مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُو۟لُوا۟ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا۟ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَـٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ ﴾:

خوا ﷻ بەردەوامی دووڕووەکان لەسەر تەنبەڵی‌و تەوەزەلی لە بەندایەتی کردندا ڕوون دەکاتەوە، وە ئەوانە دابەزاندنی سوورەت‌و ئایەتەکان هیچ کاریگەریەکیان لەسەر دروست ناکات، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ ﴾ فەرمانیان پێدەکرێ بە بڕواهێنان بە خواو جیهاد کردن لە پێناویدا ﴿ ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُو۟لُوا۟ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ ﴾ واتە: ئەوانەی کە دەوڵەمەند‌و هیچ بیانوویەکیان نیە، کە بێگومان خوا ﷻ ماڵ‌و منداڵ‌و سامانی پێبەخشیون، ئەی بۆ سوپاس‌و ستایشی خوا ناکەن، وە فەرمانەکانی بەجێناهێنن، بەڵام ئەوان تەنها تەنبەڵی‌و داواکردنی دانیشتنیان لە جیهاد کردن ویستوە ﴿ وَقَالُوا۟ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَـٰعِدِينَ ﴾.

رَضُوا بِأَن يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ
لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ لَٰكِنِ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا مَعَهُ
جَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ وَأُولَٰئِكَ لَهُمُ الْخَيْرَاتُ
وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي
مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٨٩﴾
وَجَاءَ الْمُعَذِّرُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ الَّذِينَ
كَذَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ سَيُصِيبُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ
أَلِيمٌ ﴿٩٠﴾ لَّيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلَا عَلَى الْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى الَّذِينَ
لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ
مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾
وَلَا عَلَى الَّذِينَ إِذَا مَا أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَا أَجِدُ
مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ
حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى
الَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَاءُ رَضُوا بِأَن يَكُونُوا
مَعَ الْخَوَالِفِ وَطَبَعَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾

خوا دەفەرموێ: ﴿رَضُوا بِأَن يَكُونُوا مَعَ الْخَوَالِفِ﴾ چۆن ڕازی بوون بەوەی کە لەگەڵ ژن‌و پەککەوتوەکاندا دابنیشن لە جیهاد کردن، ئایا ئەوانە هیچ عەقڵ‌و تێگەیشتنێکیان هەبوو ئەو ڕێگەیان پێیان نیشاندا؟؟ یان خوا مۆری داوە بەسەر دڵەکانیاندا کە هەست بە خێرو چاکە ناکەن، وە ویستی ئەوەیان تێدا نیە بزانن کە کامە خێرو چاکەی تێدایە بۆیان؟ ئەوان لە بەرژەوەندیەکانی خۆیان تێناگەن، ئەگەر بەڕاستی تێبگەن ئەوە ڕازی نابن پلەو پایەیان لە پلەی پیاوەتی بێتە خوارەوە.

(٨٨-٨٩): ﴿لَٰكِنِ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ ءَامَنُوا مَعَهُ جَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ وَأُولَٰئِكَ لَهُمُ الْخَيْرَاتُ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٨٩﴾﴾

خوا دەفەرموێ: ئەگەر ئەو دووڕووانە لە جەنگ‌و جیهاد دوابکەون، ئەوە خوا ﷻ پێ نیازە لێیان، وە فەزڵ‌و چاکەی خۆی ڕشتوە بەسەر کۆمەڵە بەندەیەکی تایبەتی خۆی لە دروستکراوەکانی کە بەم کارە هەڵدەستن، ئەوانەش ﴿الرَّسُولُ﴾ کە موحەممەدە ﷺ ﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا مَعَهُ جَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ﴾ بەبێ تەنبەڵی‌و لەش گرانیەوە، بەڵکو بە دڵی خۆش‌و مژدەدانەوە بەرەو پیری دەڕۆن ﴿وَأُولَٰئِكَ لَهُمُ الْخَيْرَاتُ﴾ چاکەیەکی زۆر لە دنیاو دوارۆژدا ﴿وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ئەوانەی کە گەیشتن بە بەرزترین ئاوات‌و حەزەکانیان ﴿أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ دەک سەری لێ بشێوێ ئەو کەسەی کە وەک ئەوان حەزی پێ ناکات، وە دین‌و دنیاو دوارۆژی بدۆڕێنێ، ئەمە هاوتای فەرمایشتی خوایە ﷻ: ﴿قُلْ ءَامِنُوا بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾﴾ الإسراء.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُوا بِهَا بِكَٰفِرِينَ

﴿٨٩﴾ ﴾ الأنعام (واتە: ئنجا ئەگەر ئەوانە (کافرەکانی ڕۆژگاری ئێوە) بڕوایان پێنەکەن، ئەوە کۆمەڵێکمان لێ ڕاسپاردوون کە پێیان بێبڕوانین).

(٩٠-٩٣): ﴿وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٠﴾ لَّيۡسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلۡمَرۡضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُواْ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦۚ مَا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ مِن سَبِيلٖۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوۡكَ لِتَحۡمِلَهُمۡ قُلۡتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحۡمِلُكُمۡ عَلَيۡهِ تَوَلَّواْ وَّأَعۡيُنُهُمۡ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمۡعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُواْ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسۡتَـٔۡذِنُونَكَ وَهُمۡ أَغۡنِيَآءُۚ رَضُواْ بِأَن يَكُونُواْ مَعَ ٱلۡخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٩٣﴾﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَجَآءَ ٱلۡمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ لِيُؤۡذَنَ لَهُمۡ﴾ واتە: ئەوانەی کە کەمتەرخەم بوون لە دەرچوون بۆ جیهاد کردن هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ تا مۆڵەتیان پێبدات واز لە جیهاد بهێنن، بە خەیاڵیاندا نەدەهات داوای لێبوردن بکەن، بە هۆی لاوازی بڕوایانەوە، بەڵام ئەوانەی خواو پێغەمبەرەکەیان بە درۆدادەنا، بە یەکجاری دانیشتنو وازیان لە بیانوو هێنانەوە هێنا، وە دەگونجێ مانای وشەی: ﴿ٱلۡمُعَذِّرُونَ﴾ واتە: ئەوانەی کە عوزرو بیانوویان هەیە، هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ تا بیانوویان قبووڵ بکات، وە ئەویش سروشتی وابوو عوزری لەو کەسە قبووڵ دەکرد، کە عوزری هەیە ﴿وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ لە بانگەشە کردنیان بۆ بڕواهێنان، کە پێویستی دەکرد دەربچن، وە کاریان پێنەکرد، پاشان هەڕەشەیان لێدەکات بەوە: ﴿سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ لە دنیاو دواڕۆژدا، کاتێک کە باسی ئەوانەی کرد کە عوزرو بیانوویان هێنایەوە، ئەوانیش دوو بەش بوون: بەشێکیان بیانوویان هەبوو لە شەرعدا، وە بەشێکی تریان بیانوویان نەبوو، بە فەرمایشتی خۆی باسی کردوە، وەک دەفەرموێ: ﴿لَّيۡسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ﴾ لە بینینو جەستەیاندا، ئەوانەی کە هیچ هێزو توانایەکیان نیە تا دەرچن بۆ جەنگو جیهاد ﴿وَلَا عَلَى ٱلۡمَرۡضَىٰ﴾ ئەمە گشتگیرە بۆ هەموو جۆرە نەخۆشیەکان، کە خاوەنەکەی ناتوانێ بە هۆیەوە دەربچێو جیهاد بکات، لە شەلی، کوێری، پەتای تا، وە کەسێک ئیفلیجو گۆج بێت، وە هاوشێوەی ئەوانە.

﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ﴾ واتە: هیچ توێشوویەکیان نیە، وە کەرەستەی گواستنەوەیان نیە لە گەشتەکەیاندا بەکاری بهێنن، ئا ئەوانە گوناهیان ناگات، بە مەرجێک دڵسۆزبن بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بە شێوەیەک کە لە ناخیاندا یەکلابووبنەوە، ئەوان ئەگەر

توانایان هەبێ کەمتەرخەمی ناکەن بۆ جیهاد کردن، وە هەموو تواناکانیان بخەنەکار لەسەر هاندان بۆ جیهاد، ﴿مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ﴾ واتە: لە هۆکارێک کە خراپە بە دوای خۆیدا نەهێنێ، بێگومان ئەوان-بە چاکەکانیان ئەو ئەرکەی کە لە سەریانە لە مافی خواو بەندەکانی بەجێیان هێناوە بە پێی توانا- بۆیە لۆمەو سەرزەنشتیان لەسەر نیە، وە ئەگەر کەسێک چاکە لە شتێکدا بکات کە توانای بەسەریدا هەیە، ئەوە لەسەری لادەچێ لەو شتەی کە توانای نیە، ئەم ئایەتە دەکرێتە بەڵگە بۆ بنەمایەک ئەویش: هەر کەسێک چاکە بکات لەگەڵ کەسێکی تردا لە نەفس، یان لە ماڵیدا بە مەرجێک چاکە لەگەڵ کراو، چاکە خوازبێ، پاشان ماڵەکە کەمو کورتی تێکەوت، یان بە یەکجاریی لەناوچوو، ئەوە لەسەری پێویست نیە بیبژێرێ، لەبەر ئەوەی چاکەخوازە، وە هیچ ڕێگایەک نیە بۆ تاوانبار کردنی چاکەخوازان، وەک چۆن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر کەسێک چاکەخواز نەبێو خراپەکاربێ، ئەوە پێویستە بیبژێرێ ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ لە لێبوردەیی‌و میهرەبانی، لەوانە خۆش دەبێ کە بێتوانان، وە بە پێی نیەتیان پاداشتیان دەداتەوە ﴿وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ﴾ کە تۆ هیچت دەست نەدەکەوت، بۆیان داببین بکەی ﴿قُلْتَ﴾ بیانووت بۆ هێنانەوەو پێت وتن: ﴿لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا مَا يُنفِقُونَ﴾ ئەوان بێ توانا بوون، هەموو تواناکانیان خستەکار، بۆیە تووشی خەمباریی‌و نارەحەتیەکی قورس بوون، کە خوا ﷻ دەربارەیان باسی کردوە، ئەوانە هیچ تاوانێکیان لەسەر نیە، وە ئەگەر نارەحەتیان لەسەر هەڵگیرا، ئەوە کار دەگەڕێتەوە بۆ ئەصڵ‌و بنەما، کە ئەویش بریتیە لە نیەتی خێرو چاکە، وە بە پێی نیەتی هەوڵ‌و کۆشش دەکات، بەڵام ئەگەر نەیتوانی ئەوە وەکو ئەو کەسە وایە کە کارەکەی کردبێ ﴿إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ﴾ تەنها ئەوانەی کە تۆمەتبار دەکرێن داوای مۆڵەت دەکەن لە دەرچوون، لە کاتێکدا دەوڵەمەندن‌و هیچ بیانوویەکیان نیە، ئەوانە ﴿رَضُوا﴾ (ڕازی بوون لەگەڵ بە جێماوەکان بن‌و لەگەڵ ئێوە نەبن) بۆ نەفس‌و ئاینەکەیان ﴿بِأَن يَكُونُوا مَعَ ٱلْخَوَالِفِ﴾ وەک ژنو منداڵ‌و هاوشێوەکانی ﴿وَ﴾ لەبەر ئەوە ڕازی بوون بەو حاڵە، چونکە خوا ﷻ مۆری نابوو بەسەر دڵیاندا‌و خێرو چاکەی وەرنەدەگرت، وە هەستیان بە بەرژەوەندیە ئاینی‌و دنیاییەکان نەدەکرد ﴿فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ﴾ وەکو سزایەک بۆ ئەو سەرپێچیەی کە کردیان.

يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا
لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ وَسَيَرَى
اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ
لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا
عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا
يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِن
تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ
﴿٩٦﴾ الْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا حُدُودَ
مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ
الْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ
الدَّوَائِرَ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ
الْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ
قُرُبَاتٍ عِندَ اللَّهِ وَصَلَوَاتِ الرَّسُولِ أَلَا إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ
سَيُدْخِلُهُمُ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٩﴾

**(٩٤-٩٦):** ﴿ يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ إِذَا انقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا عَنْهُمْ فَأَعْرِضُوا عَنْهُمْ إِنَّهُمْ رِجْسٌ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِن تَرْضَوْا عَنْهُمْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ الْقَوْمِ الْفَاسِقِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾:

کاتێک کە باسی دووڕووە دەوڵەمەندەکانی کرد کە هیچ بیانوویەکیان نەبوو، هەواڵیدا کە ئەوان ﴿ يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ﴾ لە غەزاو جەنگەکانتاندا ﴿ قُل ﴾ بە ئەوان ﴿ لَّا تَعْتَذِرُوا لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ ﴾ بڕوا بە بیانووەوە درۆینەکەتان ناکەین ﴿ قَدْ نَبَّأَنَا اللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ﴾ بێگومان ئەو ڕاستی فەرمووە لە وتەکانیدا، بیانوو هیچ سوودێکی نیە، چونکە ئەوان بیانوو دەهێننەوە بە پێچەوانەی ئەوەی کە خوا ﷻ هەواڵی پێداوە، دەی مەحاڵە ئەوان ڕاست بکەن لە کاتێکدا هەواڵەکەیان پێچەوانەی هەواڵی خوایە کە لە ڕاستیدا بەرزترین پلەو پایەی هەیە ﴿ وَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ ﴾ لە دنیادا، چونکە کردەوە تەرازووی ڕاستگۆیی و درۆیە، بەڵام تەنها وتەو قسەکردن هیچ ماناو بەڵگەیەکی تێدا نیە، ﴿ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ﴾ ئەو خوایەی کە هیچ شتێکی لێ ناشاردرێتەوە، لە خێرو شەڕو خراپە، وە پاداشتتان دەداتەوە بە دادپەروەری یان بە چاکەی خۆی، بەبێ ئەوەی بە قەد گەردیلەیەک ستەمتان لێ بکات.

بزانە: تاوانبارو گوناهبار سێ حاڵەتی هەیە: یەکەم: یان ئەوەیە وتەو بیانووی

وەردەگیرێ بە ئاشکراو نهێنی، وە چاوپۆشی لێدەکرێ بە جۆرێ وەک ئەوەی تاوانی نەکردبێ.

دووەم: یان ئەوەیە تۆڵەیان لێدەکرێتەوە بە سزادانو سەرزەنشت کردنی ڕاستەقینە لەسەر تاوانەکانیان. سێیەم: یان ڕوویان لێ وەردەگیرن، وە ڕووبەڕووی سزاو تۆڵە ناکرێنەوە لەسەر ئەو کردەوەی کە کردوویانە، ئەم حاڵەتەی سێیەمە خوا ﷻ فەرمانی پێکردەوە لە مامەڵە کردن لەگەڵ دووروەکاندا، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ سَيَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمْ إِذَا ٱنقَلَبْتُمْ إِلَيْهِمْ لِتُعْرِضُوا۟ عَنْهُمْ ﴾ واتە: سەرزەنشتیان مەکەن، وە داری حەدیان لێ مەدەنو مەیانکوژن ﴿ إِنَّهُمْ رِجْسٌ ﴾ واتە: ئەوانە پیسو بۆگەنن، شایستەی ئەوە نین گرنگیان پێبدرێو بە بای خەیاڵدا بێن، وە سەرزەنشتو سزا سوودو کەڵکی نیە بۆیان، سزای دۆزەخ بەسە بۆ ئەوان ﴿ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾ (ئەو سزایەش بە هۆی ئەوەیە کە بۆ خۆیان بە دەستیان هێناوە).

وە کە دەفەرموێ: ﴿ يَحْلِفُونَ لَكُمْ لِتَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ ﴾ واتە: بە هەمان شێوە ئەم مەبەستەی تریشیان لە ئێوە دەوێ جگە لە پشت تێکردن، بەڵکو حەز دەکەن لێیان ڕازی بن، وەک ئەوەی هەر هیچیان نەکردبێت ﴿ فَإِن تَرْضَوْا۟ عَنْهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴾ واتە: دروست نیە بۆ ئێوە ئەی بڕواداران لە کەسێ ڕازی بن، کە خوا ﷻ لێی ڕازی نەبووە، بەڵکو پێویستە لەسەرتان شوێنی پەروەردگارتان بکەون لە ڕازیبوونیو توڕەییدا، وە سەرنج بدەن چۆن دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴾ نەیفەرمووە: (**فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرْضَىٰ عَنْهُمْ**) واتە: خوا لێیان ڕازی نابێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە بێتە بەڵگە کە دەرگای تەوبەو لێخۆشبوون کراوەیە، وە ئەوان هەرکات داوای لێخۆشبوون بکەن، ئەوە خوا تەوبەیان لێوەردەگرێو لێیان خۆش دەبێت، بەڵام چونکە فاسقن خوا لێیان ڕازی نابێت، چونکە بەربەست هەیە لە ڕازیبوونی خوادا، کە ئەویش دەرچوونیانە لە فەرمانی خوا ﷻو پەنا بردنیانە بۆ ئەو شتەی کە خوا حەزی پێی نیە لە هاوبەش دانانو دوو ڕوویی و سەرپێچی کردن، وە پوختەی ئەوەی کە خوا ﷻ باسی کردوە، دەربارەی ئەو دوو ڕوانەی کە لە جەنگو جیهاد دواکەوتن بەبێ بیانوو، ئەگەر عوزرو بیانوویان بۆ بڕواداران هێنایەوە، وە وا گومانیان برد کە

ئـەوان بیانوویـان هەیـە لـە دواکەوتنیانـدا، ئـەوە دوو رووەکان بـەو رەفتـارە دەیانـەوێ وازیـان لێبهێنـن، وە ڕازی ببـنو بیانووەکەیـان قبـووڵ بکـەن، بێگومـان قبـووڵ کردنـی بیانوویـانو ڕازیبـوون لێـان لەبـەر ڕێـزو خۆشەویسـتی نەبـووە بۆیـان، بـەڵام پشـت تێکـردن لێـان، بـڕواداران پشـتیان تێدەکـەن لـەو کردەوانـەی کـە خـراپو پیسـە.
ئـەم ئایەتانـە چەسـپاندنی قسـەی خـوا ﷻی تێدایـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قَدْ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ﴾، وە چەسـپاندنی کـردەوەی ئیختیاریـە بـۆ خـوا، کـە بـە ویسـتو دەسـەڵاتی ئـەو لەمـەدا دێتەجـێ، وە لەو ڕسـتەی کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ ﴾ هەواڵـی داوە کـە ئـەو پـاش ڕوودانـی دەیبینـێ، ئەمـەش ڕەزامەنـدی خوا ﷻ بـۆ چاکەخـوازان دەچەسـپێنێ، وە خەشـمو قیـنو تووڕەیـی خـوای بـۆ سـنوور بەزێنـان تێدا یە.

(٩٧-٩٨): ﴿ ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾ ﴾:
خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلْأَعْرَابُ ﴾ واتـە: ئەوانـەی کـە دەشـتەکینو دانیشـتووانی دوور لـە شـارن ﴿ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا ﴾ لـە خەڵکـی شـار، ئەوانـەی کـە کوفـرو دوو ڕوویـان تێدایـە، ئەویـش لەبـەر چەنـد هۆکارێـک:- لەوانـە: ئـەوان دوورن لـە هەمـوو زانیاریەکـی ئاینـی، وە کـردەوەو بڕیـارە شـەرعیەکان، بێگومـان ئـەوان لـە پێشـتر ﴿ وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ﴾ لـە بنەماکانـی ئایـنو بڕیـارو فەرمـانو قەدەغەکـراوەکان بـە پێچەوانـەی خەڵکـی شـار، ئـەوان نزیکتـرن تـا شـارەزای سـنوورەکانی خـوا ببـن کـە دایبەزانـدوە بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ -بەهـۆی ئـەم زانسـتەوە- وە بـە هـۆی ئـەوەی بیرۆکەیـان چاکتـرەو ویسـتی خێـرو چاکەیـان زیاتـر تێـدا هەیـە کـە لـە خەڵکـی دەشـتەکیدا نیـە.
وە لـە سروشـتیاندا نـەرمو نیانـی زیاتـر هەیـەو زیاتـر گـوێ بـۆ بانگخـوازان دەگـرن، کـە لـە خەڵکـی دەشـتەکیدا نیـە، وە لەگـەڵ بڕوادارانـدا دادەنیشـن، تێکەڵاویـان دەبـن زیاتـر لـە خەڵکـی دەشـتەکی، بۆیـە شایسـتەترن بـە چاکـە لـە چـاو دەشـتەکیەکاندا، ئەگەرچـی لـە دەشـتەکیو شـاردا خەڵکانێکـی بـێ بـڕواو دوو ڕوو هەبـوون، بـەڵام دەشـتەکیەکان توندتـرو ڕەقتـرن لـە خەڵکـی شـار.

لەوانــە: دەشــتەکیەکان زیاتــر حەزیــان لــە ســەروەت‌و ســامانەو ڕەزیلتــرن، هەندێکیــان ﴿مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ﴾ لــە زەکات‌و بەخشــین لــە پێنــاوی خــوا ﷻ وە هاوشــێوەی ئــەوە ﴿مَغۡرَمٗا﴾ واتــە: بــە زیــان‌و ناتەواویەکــی گــەورە تەماشــای دەکات، مەبەســتی ڕەزامەنــدی خــوا ﷻ نیــە، وە زەکات نــادات بــە زۆر نەبــێ ﴿وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ﴾ واتە: لــە دژایەتــی‌و ڕق لێبوونەوەیــان لــە بــڕواداران، ئــەوان بــە درێژایــی ســاڵ چــاوەڕوان دەکــەن بەســەرهاتی خــراپ بەســەر بڕوادارانــدا بێــت، ئەمــە پێچەوانــە دەبێتــەوە، بــەڵاو تێکشــکان تووشــی خۆیــان دەبێــت. بــەڵام بــڕواداران بەســەرهاتی خــراپ بەســەر دوژمنانــدا دەهێنــن، وە داهاتــووش تەنهــا بــۆ ئەوانــە ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ﴾ بــە نیەتــی بەندەکانــی دەزانێــت، وە هــەر کردەوەیــەک کــە دەیکــەن بــە دڵســۆزی بێــت یــان بــە پێچەوانەکــەی.

(٩٩): ﴿وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٩٩﴾

لــە ڕاســتیدا هەمــوو دەشــتەکیەکان سەرزەنشــت کــراو نیــن، بەڵکــو تیایانــدا هەیە ﴿مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ بــە هــۆی بڕواهێنانــەوە ڕزگــاری دەبێــت لــە کوفــرو دوو ڕوویــی‌و کردەوەیــەک پێچەوانــەی پێویســتی بڕواهێنــان بــێ ﴿وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ﴾ واتــە: لــە بەخشــینی ماڵەکەیــدا تەنهــا مەبەســتی نزیــک بوونەوەیــە لــە خــوا، وە ﴿وَ﴾ دەیکاتــە هۆکارێــک بــۆ ﴿وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ﴾ واتــە: پاڕانــەوەی بۆیــان، خــوا ﷻ دەربــارەی ســوودی پاڕانــەوەی پێغەمبــەر ﷺ دەفەرمــوێ: ﴿أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡ﴾ لــە خــوا نزیــک دەبنــەوە، وە مــاڵ‌و ســامانیان زیــاد دەکات‌و بەرەکەتــی تێدەکــەوێ ﴿سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓ﴾ لــە کۆمەڵــەی بەنــدە چاکەکانــی، بێگومــان ئــەو ﴿غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ە، لــە تاوانــە گــەورەکان خــۆش دەبــێ لــە ئــەو کەســەی داوای لێخۆشــبوون بــکات، وە بــە میهرەبانــی خــۆی بەندەکانــی دادەپۆشــێ، وە بەنــدە بڕوادارەکانــی تایبــەت دەکات بــە ڕەحمەتــی خــۆی‌و ســەرکەوتوویان دەکات بــۆ کاری چاکــە، وە دەیانپارێــزێ لــە ســەرپێچیەکان، وە بــە جۆرەهــا شــێوە پاداشــتیان دەداتــەوە. ئــەم دەقــە پیــرۆزە دەبێتــە بەڵگــە کــە خەڵکــی دەشــتەکی وەک خەڵکــی شــار وایــە، تیایانــدا هەیــە مــەدح کــراوە، وە لەناویانــدا هەیــە سەرزەنشــت کــراوە، خــوا ﷻ

سەرزەنشتی نەکردوون تەنها لە بەر ئەوەی عەرەبو دەشتەکین، بەڵکو لەسەر ئەوە زەمی کردوون کە وازیان لە فەرمان بە چاکەو قەدەغە کردنی خراپە هێناوە، ئەوان لە جێی ئەو گومانەدا بوون.

وە لەوانە: بیروایی‌و دووڕوویی کەم دەکاو زیادیش دەکات، وە ئەستورو ڕەق دەبێ‌و سووکیش دەبێ بە پێی حاڵەتەکان.

وە لەوانە: فەزڵو چاکەی زانست، ئەوەی لە دەستی دەدات نزیکترە لە شەڕو خراپە، چونکە خوا ﷻ لۆمەو سەرکۆنەی دەشتەکیەکانی کرد، وە هەواڵیدا ئەوان بێبڕوایی‌و دووڕووییان بەهێزترە، وە هۆکاری پێویستی بۆ ئەو مەبەستە باسکردوە، ئەوان شایستەترن کە شارەزا نەبن بە سنوورەکانی خوا کە ناردوویەتیە خوارەوە.

وە لەوانە: بێگومان چاکترین‌و بە سوودترین زانست، ناسینی سنوورەکانی خوایە لە بنەماکانی ئاین‌و لق‌و پۆکانی، وەک ناسینی سنووری بڕواهێنان‌و ئیسلام‌و چاکەو خۆپارێزی‌و سەرکەوتن‌و گوێڕایەڵی‌و پەیوەندی خزمایەتی‌و کوفرو دووڕوویی‌و خراپەکاریی‌و سەرپێچی‌و زیناو خواردنەوەی مەی‌و ڕیباو هاوشێوەی ئەمانە، مسوڵمان لە شارەزابوونیدا دەتوانێ جێبەجێی بکات، ئەگەر فەرمان پێکراو بوو، یان وازی لێبهێنێ ئەگەر قەدەغەکراو بوو.

وە لەوانە: پێویستە لەسەر بڕوادار ئەوەی لەسەر شانیەتی جێبەجێی بکات بە دڵێکی فراوانەوە، وە سوور بێ لەسەر ئەوەی بە دەستکەوت تەماشای بکات، نەک بە باج‌و سەرانەی دابنێت.

وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ
اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ
لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا
ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الْأَعْرَابِ
مُنَافِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ
نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ
عَظِيمٍ ﴿١٠١﴾ وَآخَرُونَ اعْتَرَفُوا بِذُنُوبِهِمْ خَلَطُوا عَمَلًا صَالِحًا
وَآخَرَ سَيِّئًا عَسَى اللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ
﴿١٠٢﴾ خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ
إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ
اللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَأْخُذُ الصَّدَقَاتِ وَأَنَّ
اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ
وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ
فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ وَآخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ اللَّهِ
إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠٦﴾

(١٠٠): ﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٠٠)﴾:

پێشكەوتوو یەكەمەكان ئەوانەن كە پێش ئەم ئوممەتە كەوتوون، وە دەسپێشخەریان كردوە، بە بڕواهێنانو هیجرەتو جیهاد كردن، وە بەجێهێنانی دینی خوا ﴿مِنَ الْمُهَاجِرِينَ﴾، وە لە كۆچكردووان، ﴿الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ (٨)﴾ الحشر.

﴿وَ﴾ لە ﴿وَالْأَنصَارِ﴾، ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ (٩)﴾ الحشر.

كە دەفەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ﴾ بە بیروو باوەڕو وتەو كردەوەكان، ئەمانە ئەو كەسانەن كە پارێزراون لە سەرزەنشت كردن، وەسفو پیاهەڵدانیان بەدەست هێناوە، وە گەورەترین ڕێزو شكۆ لەلایەن خوا ﷻ ﴿رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ﴾ ڕەزامەندی خوا گەورەترە لە هەموو نازونیعمەتەكانی بەهەشت ﴿وَرَضُوا عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا الْأَنْهَارُ﴾ كە تێدەپەڕێ بە ژێر باخو باخاتەكانی بەهەشتدا ﴿خَالِدِينَ فِيهَا﴾ داوای گواستنەوەو جێگۆڕكێ ناكەن لە بەهەشتدا، چونكە هەر ئاواتێك دەخوازن دێتە دی، وە هەرچیان بوێ دەستیان دەكەوێ ﴿ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ﴾ هەر شتێك نەفسو ئارەزوو حەزی پێدەكا تێیدا بە دەست دێ، وە ڕووح چێژی لێوەردەگرێ، وە دڵ پێی ئارام دەبێ، هەروەها جەستە پێی تێر دەبێ، وە هەموو مەترسیەكیان لێ بە دوور دەبێت.

(١٠١): ﴿وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الْأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ لَا

تَعۡلَمُهُمۡۖ نَحۡنُ نَعۡلَمُهُمۡۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٖ ﴿١٠١﴾ ﴾.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِمَّنۡ حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مُنَٰفِقُونَۖ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ ﴾ بـە هەمـان شـێوە دوو ڕوون ﴿ مَرَدُواْ عَلَى ٱلنِّفَاقِ ﴾ واتـە: لێبـڕاون لـە سـەری ڕاهێنانیان لەسـەری كـردووەو بەردەوامن، وە سـات بە سـات زیاتـر ڕۆدەچن تیایـدا ﴿ لَا تَعۡلَمُهُمۡۖ ﴾ بە خـودی خۆیـان تا سـزایان بدەی، یـان مامەڵەیـان لەگەڵدا بكەی بـە پێی دووروییـان، دیارە لەمەشـدا حیكمەتێكـی گـەورەی تێدایـە ﴿ نَحۡنُ نَعۡلَمُهُمۡۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ ﴾ دەگونجـێ ناوهێنانـی بـە دوو لەسـەر شـێوەی خـۆی بێ، دەكـرێ لە دنیـادا سـزایەک بچێـژن، وە لە دواڕۆژیشـدا، دەكـرێ لـە دنیـادا خـەمو خەفـەتو نارەحەتیـان تـووش ببێ بە هـۆی ئەو سـەركەوتنانەی مسـوڵمانان بەدەسـتی دێنـن، وە لـە قیامەتیشـدا بـە توندترین شـێوە سـزا بچێـژن، وە دەگونجـێ مەبەسـت ئەوەبـێ كـە لـە داهاتوویەكی نزیكـدا سـزایان دەدەینو چەنـد بـارەی دەكەینـەوە بۆیان.

(١٠٢-١٠٣): ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَءَاخَرُونَ ﴾ ئەوانـەی كـە لـە شـاری مەدینـەو دەوروبەریـن لە وڵاتـە ئیسـلامییەكان ﴿ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ ﴾ واتـە: دانیـان پێدانـاو پەشـیمان بوونـەوە، وە هەوڵیانـدا خۆیـان پاک بكەنـەوە ﴿ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا ﴾ كـردەوە دانامەزرێو جێگیـر نابـێ بـە یەكتاپەرسـتی خـوا نەبـێ، كـە دەریبهێنـێ لـە كوفـرو هاوبـەش دانان، بێگومـان ئـەوە مەرجە بـۆ هەمـوو كردەوەیەكی چاک، ئەوانـە كردەوەی چـاکو خراپیان تێكـەڵ كردبـوو، كـە بە چـاو قایمی دەسـتیان بۆ هەنـدێ لە تاوانـە گـەورەكان دەبرد، وە كەمتەرخەمیـان لـە هەندێ لـە ئەركو پێویسـتیەكاندا دەكـرد، لەگەڵ ئەوەشـدا دانیان بەوە دادەنـا، وە بـە هیـوا بـوون خوا لێیان خـۆش بێ، ئـا ئەوانـە ﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ ﴾ وە لێخۆشـبوونی خـوای بـە بەزەیی لـە بەندەكـەی دوو جۆرە:

یەكـەم: سـەركەوتن بـۆ داوای لێخۆشـبوون، دووەم: وەرگرتنـی پـاش ئەوەی كـە ئەنجامی دەدەن.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾ پیاهەڵدانـی بـە لێبـوردەو میهرەبانـی، ئـەو دوانـەن كە دروسـتكراو لێـی بێبـەش نابـێ، بەڵكـو ژیانـی سـەر زەویو ئاسـمان بوونی نیـە بەبێ ئـەو دوانـە نەبێ،

ئەگــەر خەڵکــی بــە هــۆی ســتەمەکانیانەوە تۆڵەیــان لــێ بکرایەتەوە، ئــەوە لەســەر زەویدا یــەک گیانــدار نەدەما، وەک خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤١﴾ ﴾فاطر، وە لە لیخۆشــبوونی خــوا ﷻ ئەوانــەی کــە زێدەڕۆییــان کردوە لــە نەفــس و دەروونــی خۆیانــەوە، ئەوانەی کە تەمەنیــان لە گوناهــو تاواندا تەواو کردوە، ئەگەر داوای لێخۆشــبوونی لێ بکــەن و بگەڕێنەوە پێــش ئــەوەی بمــرن با بــە کەمتریــن ماوەیش بێ، ئــەوە بێگومــان لێیــان دەبــووری، وە لە تاوانەکانیــان خــۆش دەبــێ، وە ئەگەر کەســێک چاکــەو خراپــەی تێکەڵ کردبــێ و دانی بە تاوانەکەیــدا نابێ و پەشــێمان بــێ، وە تەوبــەی ڕاســتەقینەی نەکردبێ، ئەوە لــە نێوان ترس و ئومێــد دایــە، ئەو لــە ســەلامەتیەوە نزیکە.

بــەڵام ئــەوەی تێکەڵــی کــردوە دانیپێــدا نەنــاوەو پەشــێمان نەبووەتــەوە لــەوەی پێشــوو کــە کردوویەتــی، بەڵکــو بەردەوامــە لەســەر تــاوان، ئــەوە مەترســی لەســەرە، خــوا ﷻ بە پێغەمبەرەکــەی ﷺ وە ئــەوەی لــە جێگای ئەوە فەرمانــی پێکردوە بــڕواداران پاک بکاتەوەو بڕوایــان تــەواو بــکات، دەفەرمــوێ: ﴿ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ ﴾ بریتیــە لــە زەکاتــی فەڕز کــراوە ﴿ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا ﴾ واتــە: لــە تــاوان و ســەرپێچی و ڕەوشــتی نامۆو ناشــرین پاکیــان بکاتــەوە ﴿ وَتُزَكِّيهِم ﴾ واتــە: زیــادی دەکات، وە ڕەوشــتی جــوان و کــردەوەی چاکیــان پــەرە پێــدەدات، وە پاداشــتی دنیــاو دواڕۆژیــان بــۆ زیــاد دەکات، وە بەرەکــەت دەخاتــە ســەروەت و ســامانیانەوە ﴿ وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ ﴾ واتــە: دوعــاو نزا بــۆ بــڕواداران بکە بە گشــتی، وە بــە تایبــەت کاتێ کــە زەکاتــی ماڵەکانیــان دەردەکــەن و دەیهێنــن بۆت ﴿ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ ﴾ واتــە: ئارامــی و دڵنیایــی دەدات بــە دڵەکانیــان، وە مژدەیــان پێدەدات ﴿ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ ﴾ بــۆ پاڕانەوەکانــت، بیســتنێکی وەرگرتن ﴿ عَلِيمٌ ﴾بە حاڵــی بەندەکان، پاداشــتی هەموو کەســێ بە پێــی کردەوەکــەی دەداتەوەو بە گوێــرەی نیەتــی، پێغەمبەر ﷺ فەرمانــی خــوای ﷻ جێبەجــێ دەکــرد، وە فەرمانــی پێدەکردن بــە دەرکردنــی زەکات، وە نوێنەرەکانــی دەنــارد بــۆ کۆکردنــەوەی، ئەگــەر کەســێ زەکاتــی ماڵەکەی ببردایــە بۆی، ئــەوە نــزای بــۆ دەکــرد و داوای بەرەکەتی بــۆی دەکرد.

ئــەم دەقــە بەڵگەیە لەســەر پێویســتبوونی دەرکردنی زەکات لــە هەموو ماڵێکــدا، ئەمە ئەگەر بــۆ بازرگانــی بــێ، بێگومان ئــەوە ماڵێکــە زیــاد دەکات و کەســابەتی پێدەکرێ، هــەق وایە بەشــی هــەژاری لێبــدرێ، بــەوەی کە خــوا ﷻ پێویســتی کــردوە لــە زەکات، وە بێجگە لە

ماڵــی بازرگانــی، ئەگەر ماڵەکە زیادو گەشــەی کــرد، وەک دانەوێڵەو بەروبــوومو ئاژەڵی بە خێوکــردن بۆ ســوودو قازانــج، وە زێرو زیــوو گەوهەر، ئــەوە زەکاتی تێدا پێویســت دەبێ، وە ئەگــەر بەوشــێوە نەبــوو پێویســت نابێ تیایــدا، لەبەر ئەوە ئەگــەر بۆ ماڵەوە بــوو، ئەوە بە پێــی نەریــت لەو مــاڵو ســامانانە نیە کە مــرۆڤ پــەرەی پێدەدات.

ئەمــە ئەوەشــی لێوەردەگیــرێ: کــە بێگومــان بەنــدە ناتوانــێ خــۆی پــاک رابگــرێ دڵو دەرونــی خاوێــن بکاتــەوە، تــا زەکاتــی ماڵەکەی نــەدات، وە هیچ شــتێک نابێتــە کەفارەتی تەنهــا دەرکردنــی نەبــێ، چونکە پــاکو خاوێنــی دڵو دەروون لەســەر دەرکردنــی زەکات راوەستاون.

وە ئەمــەش دەگەیەنــێ: ڕەوا بوونــی پارانــەوەو دوعــای پێشــەوا یــان جێگرەکــەی، بــۆ ئەو کەســەی کــە زەکاتــی ماڵەکــەی دەهێنیو دەریــدەکات، وە ئــەوە دەبــێ بە ئاشــکرا بێ، تا ئەو کەســەی پێــی دەبەخشــرێ ئاســوودە بێت.

وە لــە واتاکــەی وەر دەگیرێــت، پێویســتە خۆشــی بخەیتە دڵی بــروادارەوە بە وتــەی نەرمو نیــان، وە هاوشــێوەی ئــەوە کــە دڵــی پێــی خــۆشو ئاســودە دەبێــت، وە بــە هەمان شــێوە پێویســتە هانــی ئــەو کەســە بدرێت کــە خێــرو چاکــە دەکاتو دەستخۆشــی لێبکرێت، وە دوعــای خێریشــی بــۆ بکرێ.

(١٠٤): ﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ ﴾:

﴿ أَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ ﴾ واتــە: ئــەی بۆ بەرفراوانــی ڕەحمەتی خواو ئەو هەموو بەخشــندەییانە نەیانزانیــوە، ئــەو بێگومــان ﴿ يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ ﴾ واتــە: لــە هەمــوو تەوبەیەک خۆش دەبــێ، بەڵکــو ئەوەنــدەی پــێ خۆشــە بەندەکــەی داوای لێخۆشــبوونی لــێ بــکات، کــە لە ئەنــدازەدا نیــە ﴿ وَيَأْخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ ﴾ لەوان، وە بە دەســتی ڕاســتی وەری دەگــرێ، لە لای خــۆی بــۆ ئێــوەی زیــاد دەکات، وەک چۆن کەســێک لــە ئێوە ماڵو ســامان زیــاد دەکات، تــا خورمایــەک ئەوەنــدەی کێوێک گــەورەو زیــاد دەکات. ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ﴾ واتە: زۆر لێبوردەیــە بەرانبــەر بەندەکانــی، هــەر کەســێک داوای تەوبــەو لێخۆشــبوونی لێبکات، وە ئەگــەر چەندیــن جاریــش دووبــارەی کردبێتــەوە، ئــەوە لێی وەردەگــرێ، بێــزار نابێ لە داوای لێخۆشــبوون، تــا ئــەوان خۆیان بێزار دەبــنو یاخیبــوون هەڵدەبژێرن، وە دۆســتایەتی دوژمنەکەیــان دەکــەن ﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ ئەوەیــە کــە بــە میهرەبانیەکــەی هەمــوو شــتێکی

داپۆشیوە، وە نووسیویەتی بۆ ئەو کەسانەی لە خوا ﷻ دەترسن‌و زەکاتی ماڵەکانیان دەدەن، بڕوایان بە ئایاتەکانی هەیەو شوێنی پێغەمبەرەکەی دەکەون.

(١٠٥): ﴿ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ١٠٥ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ﴾ بە دووڕووەکان: ﴿ ٱعۡمَلُواْ ﴾ لەوەی کە دەیکەن، وە بەردەوام بن لەسەر پووچو بەتاڵیتان، وا مەزانن ئەوە دەشاردرێتەوەو کەس پێی نازانێ ﴿ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾ واتە: پێویستە کردەوەکانتان روون بێتەوەو ئاشکرا بیێ ﴿ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ لە خێرو خراپە، ئەمە هەڕەشەیەکی توندو رەقە بۆ ئەو کەسەی کە بەردەوام دەبێ لەسەر خراپەکاریی‌و سەرپێچی، وە دەگونجێ ماناکەی بەو شێوە بێ: ئێوە ئەگەر کارێکی خێرو چاکە، یان شەڕو خراپەتان کرد، ئەوە خوا ﷻ ئاگای لێتانە، وە لە کاتێکی نزیکدا پێغەمبەرەکەی‌و بەندە بڕوادارەکانی ئاگادار دەکاتەوە لە کردەوەکانتان، ئەگەر چی لە ناختانیشدا بێت.

(١٠٦): ﴿ وَءَاخَرُونَ مُرۡجَوۡنَ لِأَمۡرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمۡ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيۡهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ١٠٦ ﴾:

دەفەرموێ: ﴿ وَءَاخَرُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی کە دانیشتن‌و دواکەوتوون ﴿ لِأَمۡرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمۡ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيۡهِمۡ ﴾ لەم دەقەدا ترساندنێکی توند بەدی دەکرێ بۆ ئەوانەی کە دواکەوتوون، وە هانیان دەدات لەسەر تەوبەو داوای لێخۆشبوون‌و پەشیمانی ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ ﴾ بە دۆخی بەندەکان‌و نیەتەکانیان ﴿ حَكِيمٞ ﴾ هەموو شتێ لە جێگای خۆیدا دادەنێت، بە پێی پلەو پایەی خۆی، جا ئەگەر حیکمەتی وا پێویست بکات لێی خۆش بێ، ئەوە بە میهرەبانی خۆی لێی خۆش دەبێ، وە ئەگەر حیکمەتی وا بخوازێ کە ریسوایان بکات‌و سەرکەوتوویان نەکات بۆ خێرو چاکە، ئەوە بەو شێوە دەکات.

(١٠٧-١١٠): ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا
ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ
وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن
قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ
يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١٠٧ لَا تَقُمۡ فِيهِ
أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ
أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ
أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ١٠٨
أَفَمَنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقۡوَىٰ مِنَ
ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٍ خَيۡرٌ أَم مَّنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ
شَفَا جُرُفٍ هَارٖ فَٱنۡهَارَ بِهِۦ فِي نَارِ جَهَنَّمَۗ وَٱللَّهُ
لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠٩ لَا يَزَالُ
بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ رِيبَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن
تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ١١٠ ﴾

وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ
ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ
وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ
لَكَٰذِبُونَ ١٠٧ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ
مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن
يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ١٠٨ أَفَمَنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ
عَلَىٰ تَقۡوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٍ خَيۡرٌ أَم مَّنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ
عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٖ فَٱنۡهَارَ بِهِۦ فِي نَارِ جَهَنَّمَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي
ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٠٩ لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ رِيبَةٗ
فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ
١١٠ ۞إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم
بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ
وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ
وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ
بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١١١

خەڵکانێک هەبوون لە دووروەکان لە خەڵکی (قباء) مزگەوتێکیان لە نزیک مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ دروست کرد، مەبەستیان ئەوە بوو زیان بە مسوڵمانان بگەیەنن، بۆ پتەو کردنی ڕیزەکانی خۆیان تا ببێتە پەناگەیەک بۆ کاتی پێویستی، خوا ﷻ نهێنی هەڵماڵین‌و ڕیسوای کردن، دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا﴾ واتە: زیانی هەیە بۆ بڕواداران‌و بۆ مزگەوتەکەیان کە تیایدا کۆدەبنەوە ﴿وَكُفۡرٗا﴾ واتە: مەبەستیان پێی بێبڕوایی بوو، بەڵام بێجگە لە ئەوان مەبەستیان ئیمان بوو ﴿وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ واتە: بۆ ئەوەی پەرتەوازەو بەش بەشیان بکەن ﴿وَإِرۡصَادٗا﴾ واتە: شوێنی پەناگەو خۆ ئامادە کردن ﴿لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُ﴾ واتە: پشتیوانی ئەوانەی کە دژایەتی خواو پێغەمبەر ﷺ دەکەن‌و هەموو تواناکانیان خستوەتە کار بۆ ئەو مەبەستە، نموونە وەک: ئەبو عامیری ڕاهیب، کە لە خەڵکی مەدینە بوو، کاتێک پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینەو لەوێ نیشتەجێ بوو، بڕوای پێی نەهێنا، وە لەسەردەمی نەفامیدا خواپەرستی دەکرد، ڕۆیشت بۆ لای بتپەرستان داوای کۆمەکی لێکردن بۆ ئەوەی جەنگ بەرپا بکات لە دژی پێغەمبەر ﷺ، کاتێ کە لای ئەوان نەگەیشت بە ویست‌و ئامانجەکەی، پەنای بردە لای قەیصەر، بە گومانی خۆی سەربخات،

بەڵام ئەو نەفرین لێکراوە لە ڕێگا تیاچوو، وە لەگەڵ دووڕووەکاندا پەیمانیان بە یەکتر دابوو، لە چوار چێوەی ئەو پەیمانەدا مزگەوتێکیان دروست کرد بۆ زیان گەیاندن بە مسوڵمانان، وەحیو نیگا لەوبارەیەوە دابەزی، پێغەمبەر ﷺ بڕیاریدا بە ڕووخاندنو سوتاندنی، پاشان دوایی بوو بە مەزبەلەو سرکەوان، پاش ئەوەی خوا ﷻ مەبەستە بۆگەنەکانیان ئاشکرا دەکات دەربارەی دروستکردنی مزگەوتەکە دەفەرموێ: ﴿ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَآ ﴾ لەو مزگەوتەی کە دروستمان کردوە ﴿ إِلَّا ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ واتە: یارمەتیو چاکە خوازی لەگەڵ لاوازو بێتواناو کوێرو پەککەوتە ﴿ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾ بێگومان شایەتی خوا ﷻ ڕاسترە لە سوێندەکانی ئەوان.

﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ﴾ واتە: هەرگیز نوێژ لەو مزگەوتەدا مەکە کە بۆ زیان دروستکراوە خوا لەوە بێ نیازت دەکات، وە تۆ ناچار نیت بەو کارە ﴿ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ ﴾ ئیسلامی تێدا ئاشکرا بووە لە (قباء) ئەویش مزگەوتی (قباء)ە لەسەر بنەمای دڵسۆزی بۆ خوا ﷻ بونیاد نراوە، بۆ بەجێ هێنانی یادی خواو دروشمەکانی، ئەم مزگەوتە پیرۆزە ﴿ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ﴾ وە بەندایەتی تێدا بکەیو یادی خوای تێدا بکەیتەوە، ئەو مزگەوتە پیرۆزەو، وە خەڵکەکەیشی بەڕێزە، بۆیە خوا ﷻ وەسفیان دەکات بە وتەی: ﴿ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ ﴾ لە تاوانو سەرپێچی، وە خۆیان پاک بکەنەوە لە پیسیو بۆگەنیو بێ دەستنوێژیو لەشگرانی.

لە ڕاستییدا ئەگەر کەسێک حەزی لە شتێک هەبێ پێویستە هەوڵو کۆششی بۆ بکات، جا ئەگەر ئەوان سوور بوون لەسەر پاکو خاوێنی لە تاوانو گوناەو پیسو پۆخڵی، دەبوو ئەوان زووتر مسوڵمان بونایە، وە بەردەوام بوونایە لە نوێژکردنو جیهادیان بکردایەت لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، وە ئاینی خوایان جێبەجێ بکردایە، وە خۆیان بپاراستایەت لە سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێکردن پاش دابەزینی ئەم دەقە کە وەسفیان دەکات بە پاکو خاوێنی، ئەوان وتیان: ئێمە بە دوای بەردداا ئاو بەکار دەهێنین بۆ خۆپاک کردنەوە، ئەویش دەستخۆشی لێکردن لەو کارەیان ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴾ خۆپاک ڕاگرتنی واتای (المعنوي)، وەک خۆپاراستن لە هاوبەش دانانو ڕەوشتی ناشرین، وە خۆپاکردنەوەی هەست پێکردن (الحسية) وەک لابردنی پیسو پۆخڵیو لەش گرانیو بێ دەستنوێژی.

پاشان باس لە فەزڵو چاکەی نێوان مزگەوتەکان دەکات بە پێی نیەتی خاوەنەکانیان، وە ڕێک بوون لەگەڵ ڕەزامەندی خوادا ﷻ، دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ

ﭐللَّهِ ﴾ واتە: لەسەر نیەتێکی چاکو بە دڵسۆزیەوە ﴿ وَرِضْوَانٍ ﴾ بە پێی فەرمانەکانی خوا ﷻ بێ، ئەو کات دڵسۆزیو شوێنکەوتنی پێکەوە کۆ کردوەتەوە ﴿ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَـٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا ﴾ واتە: لەسەر لێواری ﴿ جُرُفٍ هَارٍ ﴾ واتە: ئاودری کەندەڵانێکی فشەڵ کە بەرەو ڕووخان دەڕوات ﴿ فَٱنْهَارَ بِهِۦ فِى نَارِ جَهَنَّمَ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ ئەوەی کە بەرژەوەندی دنیاو دوا ڕۆژی تێدایە.

﴿ لَا يَزَالُ بُنْيَـٰنُهُمُ ٱلَّذِى بَنَوْا۟ رِيبَةً فِى قُلُوبِهِمْ ﴾ واتە: گومانو دوودڵی لە دڵەکانیاندا ماوەتەوە ﴿ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ ﴾ بەوەی کە پەشێمان ببنەوەو داوای لێخۆشبوون بکەن، وە لێی بترسن بە ئەوپەڕی لێترسان، بەو شێوەیە خوا ﷻ لێیان خۆش دەبێ، ئەگەرنا ئەوە بە پێی نیەتو نیازەکانیان هیچیان بۆ زیاد نابێت، تەنها گومان نەبێ بۆ سەر گومانەکانیان، وە دووڕوویی بۆ سەر دووڕوویییەکانیان ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ ﴾ بە هەموو شتەکان، ئاشکراو نهێنی، وە شاراوەو دیار، وە بەوەی کە بەندەکان پاراستویانەو ئاشکرایان کردوە ﴿ حَكِيمٌ ﴾ هەرچی لە کارو دروستکردنو فەرمانو قەدەغەکردنی هەیە، تەنها بە پێی حیکمەتو داناییەتی، سوپاس بۆ خوا ﷻ.

## ئەم ئایەتانە سوودێکی زۆریان لێوەردەگیرێت:

یەکەم: دروستکردنی مزگەوت لە نزیک یەک بۆ زیان گەیاندن بە مزگەوتێکی تر حەرامو قەدەغەکراوە، وە پێویستە مزگەوتی زیانبەخش بڕوخێنرێ لەسەر نیەتی خراپی خاوەنەکانی.

دووەم: کردەوە ئەگەر چی چاکیش بێ، ئەوە هەڵدەگەڕێتەوەو دەبێتە قەدەغەکراو، وەک چۆن خاوەنەکانی مزگەوتی زیان بەخش نیەتەکانیان هەڵگێڕایەوە لە دروستکردنی ئەو مزگەوتەدا.

سێیەم: هەر شتێک ببێتە مایەی دووبەرەکی نێوان مسوڵمانان، ئەوە سەرپێچیە، پێویستە وازی لێ بهێنرێو لاببرێ، وەک چۆن هەر شتێک ببێتە مایەی کۆکردنەوەو برایەتی مسوڵمانان پێویستە شوێنی بکەوێو کاری پێبکرێ، وە هانی لەسەر بدرێ، چونکە خوا ﷻ هۆکاری دروستکردنیان بۆ مزگەوتی زیانبەخشی، گرێداوە بەم مەبەستەوە کە پێویستە قەدەغەی لێ بکرێ، وەک چۆن ئەوە بێبڕواییو دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پێویست دەکات.

چوارەم: قەدەغەکردنی نوێژ لەو شوێنانەی کە سەرپێچی تێدا دەکرێ، وە دوورکەوتنەوە لێی، وە نزیک نەبوونەوە لێی.

پێنجەم: سەرپێچی كاریگەری لە شوێن‌و جێگا دەكات، وەك چۆن سەرپێچی دووڕووەكان كاریگەری هەبوو لەسەر مزگەوتی زیانبەخش، وە قەدغەكردنی نوێژ تیایدا، وە بە هەمان شێوە گوێڕایەڵی كاریگەری لە سەر شوێن‌و جێگاكان دەكات وەك چۆن كاریگەری لە سەر مزگەوتی (قباء) كرد، تا خوا دەربارەی دەفەرمووێ: ﴿ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ ﴾(مزگەوتێك كە لە یەكەم رۆژەوە لەسەر بناغەی پارێزكاری بینا كرابێ) واتە: ﴿ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ﴾(لە پێشترە كە عیبادەتی تێدا بكرێ) تا لەبەر ئەمەیە مزگەوتی (قباء) فەزڵێكی هەیە، وەك مزگەوتەكانی تر نیە، تەنانەت پێغەمبەر ﷺ هەموو رۆژانێكی شەممە سەردانی مزگەوتی (قباء)ی دەكردو نوێژی تیادا ئەنجامدەدا، وە هانی دەدان نوێژی تیادا بكەن.

شەشەم: بێگومان سوودی ئەم هۆكارانەی كە باس كرا لە دەقەكەدا لە چوار بنەمای گرنگدا كۆ دەبێتەوە، ئەویش بریتیە لە: هەموو كردەوەیەك زیانی هەبێ بۆ مسوڵمانان، یان سەرپێچی خوا ﷻ، بێگومان سەرپێچی كردن لە لقەكانی بێبڕواییە، یان دووبەرەكی خستنە نێو مسوڵمانان، یان هاوكاری كەسێك كە دوژمنی خواو پێغەمبەرەكەی بێ، بێگومان ئەوانە قەدغەكراون‌و بەرهەڵستیان لێدەكرێ، وە بە پێچەوانەوە.

حەوتەم: ئەو كردەوانەی هەستی پێدەكرێ كە لە سەرپێچی خواوە سەرچاوەی گرتوە، بەردەوام خاوەنەكەی لە خوا ﷻ دوور دەخاتەوە، تا لە خۆی دایدەڕنێ‌و داوای لێخۆشبوون دەكات، بە شێوەیەك دڵی دابڕێت‌و زۆر پەشێمان بێ‌و ئاخی بۆ هەڵبكێشێ.

هەشتەم: ئەگەر مزگەوتی (قباء) لەسەر بناغەی تەقواو لە خوا ترسان بونیاد نرابێ، ئەی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ كە لەسەر دەستی پیرۆزی ئەو دامەزراوەو كاری تێدا كردوەو خوا ﷻ بۆ ئەو دایناوە لە پێشترو شایستەترە.

نۆیەم: كردەوەی بونیاد نراو لەسەر دڵسۆزو شوێنكەوتن، بریتیە لە كردەوەی دامەزراو لەسەر تەقواو خواناسی كە خاوەنەكەی دەگەیەنێتە نێو بەهەشتی پڕ نازو نیعمەتەكان، وە كردەوەیەك لەسەر مەبەستی خراپ بونیاد نرابێ، وە لەسەر بیدعەو گومرایی، بریتیە لەو كردەوەی كە دامەزراوە لەسەر كەندرێكی فشەڵ، دەڕوخێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە، وە خوا ڕێنمایی گەلی ستەمكار ناكات.

(١١١): ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشْتَرَىٰ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلْجَنَّةَ

يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَ ۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِ ۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعۡتُم بِهِۦ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾ ﴾:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ ﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات بە هەواڵێکی ڕاستەقینە، وە پەیمان دەدات پەیمانێکی هەق بە کڕین‌و فرۆشتنێکی گەورەو بە نرخ، وە لە جیاتیەکی (بارمتەیەکی) چاک، ئەویش بریتیە لە ﴿ ٱشۡتَرَىٰ ﴾ بە نەفسی پیرۆزی خۆی ﴿ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم ﴾ بریتیە لە شمەک‌و فرۆشراو ﴿ بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَ ﴾ کە تیادا هەیە ئەوەی نەفس حەزی لێدەکات، وە چاو پێی تێر دەبێ، لە جۆرەها لەززەت‌و خۆشی‌و حۆری جوان‌و پاک‌و خاوێن، وە کۆشک‌و تەلاری بەرزو سەرنجڕاکێش. وە سیفەتی گرێبەست‌و کڕین‌و فرۆشتن، بەو شێوەیە کە نەفس‌و ماڵیان بۆ جیهاد کردن لە دژی دوژمنانی خوا ﷻ بەکار بهێنن، بۆ بەرز ڕاگرتنی ناوی خواو ئاشکراکردنی ئاینەکەی ﴿ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَ ﴾ ئەم گرێبەست‌و کڕین‌و فرۆشتنە لە لایەن خواوە ﷻ دەرچووەو جەختی لەسەر کراوەتەوە بە جۆرەها جەخت لەسەر کردنەوە ﴿ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقًّا فِى ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِ ﴾ بریتیە لە چاکترین‌و بەڕێزترین‌و تەواوترین کتێب لە ئاستی جیهاندا، وە کەسانێک هێناویانە خاوەن بەرزترین پلەو پایەن لەناو پێغەمبەراندا، هەموو ئەو کتێبانە یەکدەنگن لەسەر ئەم پەیمانە ڕاستەقینە ﴿ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِ ۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ ﴾ ئەی ئەو بڕوادارانەی کە پابەندن بەو پەیمانەی بە خواتان داوە، ﴿ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِى بَايَعۡتُم بِهِۦ ﴾ واتە: لەبەر ئەوەی دڵتان پێی خۆش بێ، وە هەندێکتان مژدە بدات بە هەندێکی ترتان، وە هەندێکتان هانی هەندێکی ترتان بدات ﴿ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ هیچ سەرکەوتنێک لەوە گەورەترو چاکتر نیە، چونکە خۆشبەختی‌و جێگای مانەوەی هەمیشەیی لە خۆ دەگرێ، وە ڕەزامەندی خوا کە لە هەمووی گەورەترە.

ئەگەر دەتەوێ ئەندازەی گرێبەستەکەت بزانی تەماشای کڕیار بکە بزانە کێیە؟ ئەوە خوایە، وە تەماشای لە برو لە جیاتی بکە، بریتیە لە گەورەترین لە جیاتی، بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەتە، وە تەماشای بەهاو نرخەکە بکە، بریتیە لە نەفس‌و ڕووح، وە ئەو ماڵەی کە خۆشەویسترین شتە لە لای مرۆڤ، ئەو کەسەی کە ئەم گرێبەستە لەسەر دەستی دەکرێ، بریتیە لە بەڕێزترینی پێغەمبەران، وە بە چی کتێبێ ژمارەی بۆ دیاری کراوە، بریتیە لە کتێبە گەورەکان کە بۆ بەڕێزترینی دروستکراوەکان دابەزیوە.

ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ
ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ
وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ
وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١١٢ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ
أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ
مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ١١٣ وَمَا
كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ
إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ
لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ ١١٤ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا بَعۡدَ إِذۡ
هَدَىٰهُمۡ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ
عَلِيمٌ ١١٥ إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ
وَيُمِيتُۚ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ١١٦
لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ
ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ
فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١١٧

(١١٢): ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١١٢﴾: وەک ئـەوە وایـە بوتـرێ: کێـن ئـەو بروادارانـە کە مژدەیان پێـدەدرێ بە چوونە ناو بەهەشـتەوەو بەدەسـتهێنانی پلـەو پایەی بـەرز؟ دەڵـێ: ئەوانـە ﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ﴾ واتە: پابەنـدن بە تەوبەو داوای لێخۆشـبوون لـە هەمـوو کاتەکاندا لـە هەمـوو تاوانەکان ﴿ٱلۡعَٰبِدُونَ﴾ واتـە: وەسـفکراون بـە بەندایەتـی بـۆ خـوا، وە بەردەوامـن لەسـەر گوێڕایەڵـی کردنـی لـە بەجێهێنانی پێویسـتیەکانو سـوننەتەکان لـە هەمـوو کاتێکـدا، بـەو شـێوەیە بەنـدە دەبێتـە خوانـاسو خواپەرسـت ﴿ٱلۡحَٰمِدُونَ﴾ ئەوانـەی سوپاسـگوزاری خـوا دەکـەن لـە خۆشـیو ناخۆشـیەکاندا، وە لـە بـوونو نەبووندا، ئەوانەی کـە دان بەوەدا دەنێن کە خـوا نازو نیعمەتی ئاشـکراو نهێنـی ڕشـتوە بەسـەریاندا، وە بـە درێژایـی شـەوو ڕۆژ یـادی خـوا ﷻ دەکەن ﴿ٱلسَّٰٓئِحُونَ﴾(السياحة) گەشـت لێکدراوەتـەوە بـە ڕۆژوو، یـان گەشـت کـردن بۆ فێربوونـی زانسـت، وە لێکدراوەتـەوە بـە گەشـتی دڵ بـۆ ناسـینی خـواو خۆشەویسـتیو گوێڕایەڵی کردنی بە بەردەوامی، وە لە ڕاسـتیدا مەبەسـت لە گەشـت کردن: گەشـت کردنە بـە مەبەسـتی نزیـک بوونـەوە، وەک: حـەجو عومـرەو جیهاد کـردن، وە گـەڕان بە دوای زانسـتدا، وە پەیوەندی خزمایەتیو، هاوشـێوەی ئەوانە ﴿ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ﴾ ئەوانـەی کـە زۆر نوێـژ دەکـەن، کـە کڕنووشو سـوژدە لـە خـۆ دەگرێت ﴿ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ هەموو فەرزو سـوننەتەکان دەگرێتەوە ﴿وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ هەمـوو ئەوانەیـە کە خـواو ﷺ پێغەمبەرەکـەی قەدەغەیان کـردوە ﴿وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِ﴾ بـە فێـر بوونـی سـنوورەکانی خوا ﷻ کـە دایبەزانـدوە بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ، وە

ئـەوەی دەچێتـە چـوار چێوەیـەوە لـە فەرمـانو قەدەغەکـراوو بڕیارەکانـەوە، وە ئەوەشـی ناچێتـە ئـەو چـوار چێوەیـەوە، پابەنـدن پێیەوە بـە جێبەجـێ کـردنو واز هێنان.

﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ باسـی نەکـردوە مژدەیـان بـە چـی پێبـدرێ، لەبەر ئـەوەی هەموو ئەوانـە بگرێتـەوە کـە لەسـەر برواهێنان دادەمـەزرێ لە پاداشـتی دنیـا، وە ئایـنو دوارۆژ، مژدەکـە هەمـوو بڕوادارێـک دەگرێتـەوە، بـەڵام ئەندازەو وەسـفی بـە پێـی دۆخو بڕوای بڕوادارانـە، بـە بەهێـزیو لاوازی، وە کار کـردن بـە نێوەرۆکی.

(١١٣-١١٤): ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ وَمَا كَانَ ٱسْتِغْفَارُ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوٌّ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنْهُ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٌ ﴿١١٤﴾ ﴾:

﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ واتـە: ناگونجـێو چاک نیە بۆ پێغەمبـەرو ﷺ ئەوانەی کـە بڕوایـان پێـی هێنـاوە ﴿ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ ﴾ واتـە: ئەوانـەی کـە بێبڕوایی پێدەکـەنو هاوبەشـی بـۆ دادەنێـن، ﴿ وَلَوْ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴾ داوای لێخۆشـبوون لـەم حاڵەتـەدا هەڵەیەکـە هیچ سـوودێکی نیە، بۆ پێغەمبـەرو بـڕواداران ناگونجـێ، چونکـە ئەگەر لەسـەر بتپەرسـتی بمـرن یان زانـرا ئەوان لەسـەر ئـەوە دەمـرن، ئـەوە سـزا لەسـەریان پێویسـت دەبێو بـۆ هەمیشـەیی لـە دۆزەخدا دەمێننـەوە، وە تکاو شـەفاعەتی تکاکاران نایەتـە هانایانەوە، بە هەمان شـێوە داوای لێبوردنی لێوردنکارانیـش. پێویسـتە پێغەمبـەرو بـڕواداران قایل بن لەگـەڵ خوادا ﷻ لـە ڕازیبوونو تورەییـدا، وە پشـتیوانی ئـەو کەسـە بکەن کە خـوا پشـتیوانی لـێ دەکات، وە دژایەتی ئەو کەسـە بکـەن کە دژایەتـی خـوا ﷻ دەکات، داوایی لێخۆشـبوونیان بۆ کەسـێ کـە ڕوون بوەتـەوە دۆزەخیە پێچەوانـەی ئەوەیەو دژی دەوسـتێتەوە.

وە کاتێـک بینـرا خۆشەویسـتی خـوا، پێغەمبـەر ئیبراهیـم ﵇ بـۆ باوکـی پاڕایـەوە ﴿ عَن مَّوْعِدَةٍ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ ﴾ وەک دەفەرمـوێ: ﴿ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ ﴾مريم. ئـەوە لـە کاتێکـدا بـوو پێـش ئەوە سـەرەنجامی باوکـی بزانـێ، کاتێ کـە بـۆ ئیبراهیـم ڕوون بویەوە کـە باوکـی دوژمنی خوایـە، لەسـەر بێبڕوایی دەمـرێ، وە ئامۆژگـاری یادخسـتنەوە هیچ سـوودێکی نیە بـۆی ﴿ تَبَرَّأَ مِنْهُ ﴾ لەگـەڵ پەروەردگاریدا گونجـاو ڕێـک بـوو، وە لـە ئاسـتیدا ئەدەبـی نوانـدا ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ ﴾ واتە: لـە هەموو

کاروبارەکانـدا دەگەڕایـەوە بۆ لای خوا، زۆر یـادی خوای دەکردو دەپاڕایـەوەو گوێڕایەڵی دەکـرد ﴿ حَلِيمٌ ﴾واتـە: خـاوەن بەزەیی بوو بەرانبـەر بە خەڵکـی، وە لێیان دەبـورا لەوەی بەرانبـەری ئەنجامـی دەدەن، هەڵـەی نەفامـەکان کاری تێنەدەکـرد، وە تۆڵـەی وەک خۆی لـە کەسـی بەرانبـەر نەدەکـردەوە، باوکـی پێـی وت: ﴿ لَأَرْجُمَنَّكَ ﴿٤٦﴾ ﴾مریـم (واتـە: بەردبارانـت دەکـەم)، ئەویـش پێـی فەرمـوو: ﴿ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ ﴿٤٧﴾ ﴾مریـم، (واتـە: داوای لـێ خۆشـبوونت بـۆ دەکـەم لـە پەروەردگـارم) پێویسـتە لەسـەرتان پەیـڕەوی ئەو بکـەن، وە شـوێنی میللەتـی ئیبراهیـم بکـەون لـە هەمـوو شـتێکدا ﴿ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ ﴿٤﴾ ﴾الممتحنة، وەک چـۆن خوا ئاگاداری کردونەتەوە لەسـەری، وە لەسـەر بێجگـە لـەوەش، بۆیـە دەفەرموێ:

(١١٥-١١٦): ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١١٦﴾ ﴾

خوا ﷻ ئەگەر منەت بکات بە سەر گەلێکدا بە هیدایەتو ڕێنمایی، وە فەرمانیان پێ بکات بە گرتنەبەری ڕێگای ڕاست، بێگومان خوا فەزڵو چاکەی خۆی بۆیان تەواو دەکات، وە هەموو ئەوانەی ئەوان پێویستیان پێیەتی ڕوونی دەکاتەوە بۆیان، وە ئەوەی گرنگە بۆ ژیانیان ئاگاداریان دەکاتەوە بەجێیان ناهێڵێ بە ونبوونو گومڕایی، کە هیچ دەربارەی ئاینەکەیان نەزانن، ئەمە بەڵگەیە لەسەر تەواوی میهرەبانی خوا، کە شەریعەتەکەی گشتگیرە، بە هەموو ئەوانەی بەندەکان پێویستیان پێیەتی لە بنەماو لقەکانی ئاین.

وە دەگونجـێ مەبەسـت لـەوەدا ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًۢا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰهُمْ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَ ﴾ئەوەبـێ، واتـە: ئەگـەر بۆیانی ڕوونکـردوە ئەوەی کە پێویسـتە خۆیانـی لـێ بپارێـزن، لە بەرانبەردا ئـەوان ملکەچ نەبوون، سـزایان دەدات بـە گومڕا کردن، لـە پاداشـتی ئـەوەی هـەقو ڕاسـتیان ڕەتکردەوە، بـەڵام یەکەم لـە پێشـترە ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾بـە تـەواوی زانسـتی فێـری کـردوون کە پێشـتر نەتانزانـی بـوو، وە ئەوەی سـوودی هەیە بۆتـان ڕوونـی کردوەتەوە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ ﴾ واتە: خوا ﷻ خۆی خاوەنی ئەوەیە، کاروباری بەندەکان ڕێکدەخات لە ژیاندنو مراندنو هەموو جۆرەکانی ڕێکخستن، ئەگەر کەمو کورتی لە ڕێکخستنو دروستکراوەکانیدا نەبێ، ئەی چۆن ڕێگە دەدات کەمو کورتی لە

ئاینەکەیدا هەیێ، وە واز لە بەندەکانی بهێنێ چیدەکەن بۆ خۆیان بیکەن، بە گومڕایی‌و نەفامی بژین، ئەوە گەورەترین پشتیوانیە بۆ بەندەکانی، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾ واتە: پشتیوانێک پشتیوانیتان بکات بە پێدانی ئەوەی سودی هەیە بۆتان، یان ﴿نَصِيرٍ﴾ ئەوەی خراپە لێتان بە دوور بخاتەوە.

(١١٧-١١٨): ﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوٓا۟ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾﴾:

﴿لَّقَد﴾ خوا ﷻ هەواڵ دەدات بە نەرم‌و نیانی‌و چاکەی خۆی ﴿تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ﴾ موحەممەد ﷺ ﴿وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ﴾ خوا لە کەم‌و کورتیەکانیان خۆشبوو، وە چاکەی داباراند بەسەریاندا، وە گەیاندنی بە بەرزترین پلە، ئەویش بە پێی هەستانیان بە کردەوە قورس‌و گرانەکان بوو، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ﴾ واتە: دەرچوون لەگەڵیدا بۆ کوشتاری دوژمنان لە جەنگی تەبوکدا، لە گەرمایەکی زۆر سەختدابوون لەگەڵ نەبوونی خواردن‌و خواردنەوەو هۆکارەکانی گواستنەوە، وە زۆری ڕێژەی دوژمن، هەموو ئەمانە بوونە هۆکارو مایەی دواکەوتن، پشتیان بە خوا ﷻ بەست‌و بەو کارە هەستان ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ﴾ واتە: دڵیان هەڵدەگەڕایەوە، وە ئارەزووی پشوودان‌و دانشتنیان دەکرد، بەڵام خوا جێگیری کردن، وە یارمەتیدان‌و بەهێزی کردن. (وزیغ القلب) واتە: لادانی دڵ، بریتیە لە لادان لە ڕێگای ڕاست، ئەگەر لادانەکە لە یەکێک لە بنەماکانی دین بوو، ئەوە کوفرو بێبڕواییە، وە ئەگەر لە شەریعەتەکانی بوو، ئەوە بە پێی ئەو شەریعەتەیە کە لێی لایداوە، یان کەمتەرخەمی کردوە لە ئەنجامدانیدا، یان ئەنجامی داوە بە شێوەیەکی ناشەرعی.

کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ﴾ واتە: تەوبەی لێوەرگرتن ﴿إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: لە بەزەیی‌و میهرەبانی ئەوەیە کە منەتی خۆی کردوە بەسەریاندا، بە داوای لێخۆشبوون‌و تەوبە کردن، وە لێی وەرگرتوون‌و جێگیری کردون لەسەری.

وَعَلَى الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ خُلِّفُوا حَتَّىٰ إِذَا ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ الْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ وَظَنُّوا أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ اللَّهِ إِلَّا إِلَيْهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ لِيَتُوبُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ ﴿١١٨﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ ﴿١١٩﴾ مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ الْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا عَن رَّسُولِ اللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَطَئُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾ وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا كَافَّةً ۚ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَائِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾

﴿ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ ﴾ لە دەرچوون لەگەڵ بڕواداران لەو غەزایەدا، ئەوانیش بریتی بوون لە: کەعبی کوڕی مالیک‌و دوو هاوڕێکەی، چیرۆکەکەیان بە ڕوون‌و ئاشکرایی لە کتێبی فەرمودە ڕاستەکاندا باسکراوە ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ﴾ خەم‌و بێتاقەتیەکی گەورە ڕووی تێکردن، وە ﴿ ضَاقَتْ عَلَيْهِمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ﴾ واتە: بەو فراوانیەی کە هەیەتی ﴿ وَضَاقَتْ عَلَيْهِمْ أَنفُسُهُمْ ﴾ واتە: ئەو نەفسەی کە خۆشەویسترین شتە لە لایان، ئەو بۆشاییە فراوانە لە لایان تەسک بوو، ئەمەش ڕوونادات تەنها لە شتێکی زۆر ناخۆشدا نەبێ، کە بگاتە ڕادەیەک ﴿ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلْجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيْهِ ﴾ واتە: دڵنیا بوون‌و بە حاڵی خۆیانیان زانی کە هیچ کەس ڕزگاری نابێ لە نارەحەتیەکان‌و پەنای بۆ نابرێ جگە لە خوای تاک‌و تەنها نەبێ، پەیوەندیان دابڕا لە خەڵکی، وە پەیوەندیان لەگەڵ خوادا بەست، لە خەڵکی ڕایان کرد بۆ لای خوا، بەم نارەحەتیە مانەوە بۆ ماوەی پەنجا شەو ﴿ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ﴾ واتە: ڕێگەی پێیاندا داوای لێخۆشبوون بکەن، وە سەرکەوتووی کردن بۆ ئەو مەبەستە ﴿ لِيَتُوبُوٓاْ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی تەوبە بکەن‌و خوا تەوبەکەیان لێوەربگرێ ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ﴾ واتە: لێبوردەیی زۆرە تەوبە وەردەگرێ، وە خۆش دەبێ لە تاوان‌و سەرپێچی ﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ میهرەبانی‌و بەخشندەیی خوا بەردەوام دادەبەزێ بۆ سەر بەندەکانی خوا لە هەموو کاتێکدا، وە لە هەموو چرکەیەکدا، بە هۆی ئەوەوە دەتوانن کاروباری ئاینی دنیایی بەجێ بهێنن.

ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی لێخۆشبوونی خوا ﷻ بۆ بەندەکانی بەرزترین ئامانجە، خوا بە تایبەترینی تایبەتمەندیەکانی بەندە دایناوە، منەتی خۆی بەو هۆیەوە کردوە بەسەریاندا، کاتێ ئەو کردەوانە دەکەن کە خوا پێی ڕازیەو خۆشی دەوێ.

وە لەوانە: بەزەیی خوا ﷻ بەرانبەریان چەسپاندنی بیرو بڕوایانە لە کاتی ناخۆشیو نارەحەتیدا.
وە لەوانە: بەندایەتیو خواپەرستی قورسو گران لەسەر نەفسو دەروون، فەزڵو چاکەی زۆرترەو لە پێشترە لەوانی تر، تا نارەحەتی قورسو گران بێو پاداشتیش گەورە تر دەبێت.
وە لەوانە: تەوبەو داوای لێبوردنی خوا ﷻ بەرانبەر بەندەکەی بە پێی پەشیمانیەتی، هەر کەسێک تاوانو سەرپێچی بە بای خەیاڵیدا نەیەت، بێتاقەت نابێ ئەگەر ئەنجامیشی بدات، ئەوە تەوبەی وەرنەگیراوە، ئەگەر چی وابزانێت وەرگیراوە.
وە لەوانە: نیشانەی خێرو نەمانی نارەحەتی ئەوەیە ئەگەر دڵ پەیوەست بوو بە خواوە پەیوەست بوونێکی تەواو، وە لە بەندەکان دابڕا.
وە لەوانە: لە نەرمو نیانی خوا ﷻ لەگەڵ ئەو سێ هاوەڵەدا، نارەحەتیو ناخۆشی بەسەردا هێنان، ئەوەش عەیبەیەک نیە بەسەریانەوە، دەفەرموێ: ﴿ خُلِّفُوا۟ ﴾ ئاماژەیە لەسەر ئەوەی بڕواداران بەجێیان هێشتن، وە دواخستنیان بەو مەبەستە نەبوو کە حەزیان لە خێر نیە، بۆیە نەیفەرموێ: (تخلفوا) دواکەوتن.
وە لەوانە: خوا ﷻ منەتی کرد بەسەریاندا بە ڕاستگۆیی، بۆیە فەرمانی کرد پەیڕەوییان بکرێت.
(١١٩): ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾:
﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە) بە خوا، وە بەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوە، هەستن بە جێبەجێ کردنی ئەوەی بڕواهێنان لە سەرتان پێویست دەکات، ئەویش بریتیە لە پارێزکاری، بە وازهێنان لەوەی خوا ﷻ قەدەغەی کردوەو دوورکەوتنەوە لێی ﴿ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾ لە گوفتارو کردارو بارو دۆخیاندا، ئەوانەی کە وتەکانیان ڕاستن، وە تەنها کارو کردەوەیان ڕاستە، دوورن لە تەنبەڵیو ساردبوونەوە، پارێزراون لە مەبەستی خراپ، دڵسۆزو نیەت پاکن، بێگومان ڕاستگۆیی ڕێنمایی دەکات بۆ چاکە، وە چاکەش ڕێنموویی دەکات بۆ بەهەشت، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱللَّهُ هَـٰذَا يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّـٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ﴿١١٩﴾ ﴾ المائدة.
(١٢٠-١٢١): ﴿ مَا كَانَ لِأَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُوا۟ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرْغَبُوا۟ بِأَنفُسِهِمْ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ وَلَا مَخْمَصَةٌ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ ٱلْكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَّيْلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٌ صَـٰلِحٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً

﴿وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢١﴾﴾:

خوا ﷻ هانی خەڵكی مەدینە دەدات لە كۆچكەرانو دانیشتوان، لەو كۆچكەرانەی كە بە چاكی مسوڵمان بوون، دەفەرموێ: ﴿مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُمْ مِنَ الْأَعْرَابِ أَنْ يَتَخَلَّفُوا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ﴾ واتە: دروست نیە بۆیانو گونجاو نیە ﴿وَلَا يَرْغَبُوا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ مانەوەی نەفسو دەروونیان لە پشوودانو دانیشتن ﴿عَنْ نَفْسِهِ﴾ لەو نەفسە پیرۆزو پاكە، بەڵكو پێغەمبەر لە پێشترە لە برواداران لە نەفسو دەروونیان، پێویستە لەسەر هەموو بروادارێک خۆی بەخت بكات لە پێناو پێغەمبەردا ﷺ نیشانەی بە گەورە ڕاگرتنی پێغەمبەر ﷺ، وە خۆشویستنو بڕوابوونی تەواو پێی ئەوەیە كە دوانەكەون لە كاتی جەنگو جیهاددا.

پاشان باس لە پاداشتی دەرچوون دەكات، دەفەرموێ: ﴿ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ﴾ واتە: ئەوانەی جیهاد دەكەن لە پێناوی خوادا ﴿لَا يُصِيبُهُمْ ظَمَأٌ وَلَا نَصَبٌ﴾ واتە: ماندوو بوونو ناخۆشی ﴿وَلَا مَخْمَصَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ واتە: برسێتی ﴿وَلَا يَطَئُونَ مَوْطِئًا يَغِيظُ الْكُفَّارَ﴾ واتە: لە دەستگرتن بەسەر وڵاتیاندا ﴿وَلَا يَنَالُونَ مِنْ عَدُوٍّ نَيْلًا﴾ وەكو سەركەوتنو زیان دان لە دوژمن، یان بەدەستهێنانی غەنیمەتو دەستكەوت ﴿إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ﴾ چونكە ئەمە شوێنەوارێكە كە لە كردەوەكانیانەوە سەرچاوەی گرتووە ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ﴾ ئەوانەی كە بە چاكەخوازی دەست پێشخەریان كرد بۆ فەرمانی خوا ﷻو بەجێهێنانی ئەوەی كەلە ئەستۆیان دایە، لە مافی ئەوو مافی دروستكراوەكانی، ئەم كردەوانە شوێنەواری ڕەفتارەكانیانن.

پاشان دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُنْفِقُونَ نَفَقَةً صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً وَلَا يَقْطَعُونَ وَادِيًا﴾ لە ڕۆیشتن بۆ سەر دوژمنەكانیان ﴿إِلَّا كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللَّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ وە لەوە، ئەم كردەوانە ئەگەر بە دڵسۆزیەوە بۆ خوا ﷻ ئەنجام بدرێو ئامۆژگاری پێ بكرێ، لەم دەقانەدا هاندانێكی تەواویان تێدایە بۆ جیهاد كردن لە پێناوی خوادا ﷻ، وە پاداشت دانەوەی ئەوانەی كە لەو پێناوەدا ماندوو دەبنو تووشی ناخۆشی دەبن، بێگومان ئەوە بۆ ئەوان پلەبەرزیو مایەی شانازیە، وە ئەو شوێنەوارانەی كە لە كردەوەی بەندە ڕێكدەخرێن، پاداشتی گەورەی تێدایە.

(١٢٢): ﴿وَمَا كَانَ الْمُؤْمِنُونَ لِيَنْفِرُوا كَافَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِنْ كُلِّ فِرْقَةٍ مِنْهُمْ طَائِفَةٌ لِيَتَفَقَّهُوا فِي الدِّينِ وَلِيُنْذِرُوا قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوا إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾:

خـوا ﷻ بەنـدە برواداره‌کانـی ئاگادار دەکاتـەوە، کە چی پێویسـتە لە سـەریان، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً ﴾ واتـە: بە گشـتی بـۆ کوشـتاری دوژمنەکانیان، چونکـە تووشـی ناخۆشـی دەبن، وە بـەو هۆیەوە چەندیـن بەرژەوەندی تر لە دەسـت دەدەن ﴿ فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ ﴾ واتـە: لـە ولاتو هۆزو تیـرەکان ﴿ طَآئِفَةٌ ﴾ ئەوەندە بـە دەسـت بهێنن کـە ئامانجەکانیان بـە دی بێ.

پاشـان ئاگـاداری کردونەتـەوە لـە مانـەوەی ئـەو کەسـانەی کـە دەمێننـەوەو دەرناچن بۆ جیهـاد کـردن، بەرژەوەندیەکـی گـەورەی تێدایـە، ئەگەر دەرچـوون ئـەو بەرژەوەندیەیان لـە دەسـت دەچـێ، دەفەرمـوێ: ﴿ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ ﴾ واتـە: دانیشـتوانو بەجێمـاوان، ئەوانـەی کـە دانیشـتون: ﴿ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ﴾ واتـە: تـا فێـری زانسـتی شـەرعی دەبنو لـە واتاکانـی تێدەگەن، وە شـارەزای نهێنیەکانـی دەبن، پاشـان خەڵکی فێر دەکـەنو ئاگاداریـان دەکەنـەوە، کاتێـک کە لـە جیهاد گەڕانـەوە بۆ لایان، لەمـەدا چاکەو گەورەیـی زانسـت دەردەکـەوێ، وە بـە تایبـەت تێگەیشـتن لـە دیـن، بێگومـان ئـەوە لە پێشـترینی هەمـوو کارەکانـە، وە هـەر کەسـێک زانسـتێ فێر بێ، پێویسـتە لە سـەری لەناو بەندەکانـدا بـڵاوی بکاتـەوەو ئامۆژگاریـان پێی بـکات، بێگومـان بڵاوبونەوەی زانسـت لە لایـەن زانـاوە، ئـەوە لەبەرەکەتـی ئەوەوەیە، وە پاداشـتی دەسـت دەکـەوێ، بـەڵام ئەگەر زانـا زانسـتەکەی تەنهـا بـۆ خـۆی بـوو، وە بانگەشـەی پـێ نـەکات لە پێنـاوی خـوادا، بە حیکمـەتو ئامۆژگـاری جـوان، وە وازهێنـان لـە فێرکردنی نەفامـەکان کـە نایزانن، دەی ئـەوە چ سـوودێکی گەیانـدوە بە مسـوڵمانان؟ وە چـی دەرئەنجامێک لەو زانسـتەدا هەبووە؟ لـە کۆتایـدا دەمرێتو زانسـتو بەرهەمەکەیشـی لەگەڵیدا دەمرن، بەڕاسـتی ئەمـە ئەوپەڕی بێبـەش بوونـە، بۆ کەسـێک کـە خوا زانسـتی پێدابـێو تێگەیشـتنی پێ بەخشـیبێ.

بـە هەمان شـێوە لەم دەقـەدا بەڵگـەو ڕێنماییو هاندانی جـوان هەیە، بۆ سـوودێکی گرنگ، ئەویـش ئەوەیـە کە پێویسـتە لەسـەر مسـوڵمانان ئامادەی بکەن بـۆ هـەر بەرژەوەندیەک لە بەرژەوەندیـە گشـتیەکان کەسـێک کە پێی هەسـتێ، وە کاتەکانـی بۆ ئەو مەبەسـتە دیاری بـکاو کۆششـی تێدا بـکات، ڕوونەکاتە شـتێکی تـر، تـا بەرژەوەندیەکانیان بەدەسـت بێو سـوود وەربگـرن، وە بـا ئامانجی هەموویـان تەنها یەک ئامانـج هەبێت، ئەویـش بەجێهێنانی بەرژەوەنـدی دیـنو دنیایـان بـێ، ئەگـەر چـی ڕێگاکانیشـیان جیـا بێـت، کـردەوەکان جیـاوازنو ئامانجیـش یەکە، ئەمـەش لە حیکمەتە گشـتیەکانە لـە هەمـوو کاروبارەکاندا.


يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾ أَوَلَا يَرَوۡنَ أَنَّهُمۡ يُفۡتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٖ مَّرَّةً أَوۡ مَرَّتَيۡنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ هَلۡ يَرَىٰكُم مِّنۡ أَحَدٖ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾

(١٢٣): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ (١٢٣) ﴾:
بە هەمان شێوە ئەمەش ڕێنماییەکی ترە، پاش ئەوەی ئامۆژگاری کردن بۆ خۆڕێکخستن بۆ جەنگ کردن، ڕێنمایی کردوون کە ئەوان دەست پێدەکەن لە نزیکترین کەسەوە لە بێبڕوایان، وە ڕەقو توند بن لەگەڵیاندا، وە ئازاو بە جەرگو چەسپیوو بن لە بەرانبەریاندا ﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾ واتە: با بزانن پشتیوانیو یارمەتی لە لایەن خواوە دادەبەزێ بە پێی تەقواو خۆپارێزی، دەی دەست بگرن بە خۆپارێزیەوە پشتیوانیتان دەکاو سەرتان دەخات بەسەر دوژمنەکانتاندا.

ئەمە گشتگیرە لە ئایەتی: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ ﴾ تایبەتە بەوەی ئەگەر بەرژەوەندی لەودا بوو جەنگ لەگەڵ ئەوانەدا بکرێ کە نزیک نین لێمانەوە، وە زۆر جۆر بەرژەوەندی هەن.

(١٢٤-١٢٦): ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ (١٢٤) وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ (١٢٥) أَوَلَا يَرَوۡنَ أَنَّهُمۡ يُفۡتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٖ مَّرَّةً أَوۡ مَرَّتَيۡنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمۡ يَذَّكَّرُونَ (١٢٦) ﴾:
خوا ﷻ حاڵی دووڕووەکانو حاڵی بڕواداران لە کاتی دابەزینی قورئاندا ڕوون دەکاتەوە، وە جیاوازی نێوان ئەو دوو دەستەیە دەخاتەڕوو، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ ﴾ فەرمان بە چاکەو قەدەغە کردنی خراپەی تێدا بێ، وە هەواڵ دەربارەی نەفسی پیرۆزی خۆی، لەو کاروبارە پەنهانیانە، وە هاندان لەسەر جیهاد کردن ﴿ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗا ﴾ واتە: نیشانەی پرسیاری داناوە بۆ ئەو کەسەی کە بڕوای

هێنـاوە لـە هـەردوو دەسـتەکە، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ -لـە ڕوونکردنـەوەی ئـەو باسـەدا-:
﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنًا﴾ بـە زانسـتو زانیاریـەوە پێـی، وە تێگەیشـتنو
بیرووبـڕوای، وە کار پێکردنی، وە خۆ دوورخسـتنەوە لـە کاری خراپە ﴿وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ﴾
واتـە: هەندێکیـان مـژدە بـە هەندێکـی تریـان دەدەن، بـەو منەتەی کـە خـوا کردوویەتی
بەسـەریاندا، لـە دەقەکانـیو سـەرکەوتووی کـردوون بـۆ ئـەوەی لێـی تێبگـەن، ئەمـەش
بەڵگەیـە لەسـەر کردنـەوەو سـنگ فراوانیان بـۆ ئایەتەکانـی خـواو دڵنیایـی دڵەکانیان، وە
گوێڕایەڵیـان بـۆ فەرمانەکانـی خوا ﷻ.
﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ واتـە: گومـانو دوو دڵـی ﴿فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ
رِجۡسِهِمۡ﴾ واتـە: نەخۆشـیەکی بـرد بـۆ لای نەخۆشـیەکانیان، وە گومانێکـی تـر بۆ لای
گومانەکانیـان، لـەو ڕووەی کـە ئـەوان بێبڕواییـان کـرد، وە سەرسـەختیو بەرپەرچیـان
دایـەوە، ئەمـەش بـوو بە هـۆی ئـەوەی نەخۆشـیەکانیان زیاتر بێو بـەرەو لەناوچـوون بیان
بـات ﴿وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ﴾ واتـە: مـۆر لەسـەر دڵیان درا تـا بە کافـری مردن،
ئەمـە سـزایەکە بـۆ ئـەوان، چونکە بـێ بڕواییان کـرد بەرانبەر بـە ئایەتەکانی خـوا ﷻ، وە
سـەرپێچی پێغەمبەرەکەیـان ﷺ کـرد، ئنجا خواش سـەرەنجامی ئەوانی گێڕا لـە دوو ڕوویی
لـە دڵیانـدا، تـا ئـەو ڕۆژەی دەگەن بـە دیداری.
خـوا ﷻ سەرزەنشـتیان دەکات، لەسـەر بـەردەوام بوونیـان لـە بێبڕوایـیو دوو ڕوویـی،
دەفەرمـوێ: ﴿أَوَلَا يَرَوۡنَ أَنَّهُمۡ يُفۡتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٖ مَّرَّةً أَوۡ مَرَّتَيۡنِ﴾ بـەو
بـەڵاو موصیبـەتو نەخۆشـیانەی کە تووشـیان دەبێـت، وە بەوەی کـە تاقـی دەکرێنەوە لە
لایـەن خـوای پەروەردگـارەوە ﴿ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ﴾ لـەو خراپەی کـە لە سـەری دەڕۆنو
بەردەوامـن ﴿وَلَا هُمۡ يَذَّكَّرُونَ﴾ واتـە: ئـەوەی سـوودی هەبـێ بۆیـان، ئەنجامـی
دەدەن، وە ئەوەیشـی زیانـی هەبـێ وازی لێدەهێنـن.
خـوا ﷻ تاقیـان دەکاتـەوە وەک چـۆن سـەرجەم گەلەکانـی تاقیکردۆتـەوە، بە خۆشـیو
ناخۆشـی، بـە فەرمـان بـەرداریو قەدەغـە کـردن، تـا بگەڕێنـەوە بـۆ لای، بـەڵام ئـەوان
نەدەگەڕێنـەوەو نـە پەنـد وەردەگـرن، ئـەم دەقانە بەڵگەن لەسـەر ئـەوەی کە ئیمـان زیادو
کەم دەکات، پێویسـتە لەسـەر بـڕوادار بەردەوام بـڕواو ئیمانی تازە بکاتـەوەو زیادی بکات،
تـا بـە بەردەوامـی بەرەو پێشـەوەو بـەرەو سـەرکەوتن هەنگـاو بهاوێژێ.

(١٢٧): ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ ٱنصَرَفُوا۟ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ ﴾:

دەفەرمـوێ:﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ ﴾ واتـە: ئـەو دوو ڕووانـەی کە دەترسـان لـەوەی کە سـووڕەتێکیان بەسـەردا دابەزێو ناخو دڵیان ئاشـکرا بـکات، ئەگەر سـووڕەتێک دابەزیایە بـۆ ئەوەی بـڕوای پێبکەنو کار بـە نێوەڕۆکی بکەن ﴿ نَّظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ﴾ سـوورن لەسـەر ئـەوەی کـە کاری پێنە کـەن، بـە دوای هەڵێکـدا دەگەڕێـن خۆیان لـە پێش چاوی مسـوڵمانان ون بکـەن، وە دەیانـوت: ﴿ هَلْ يَرَىٰكُم مِّنْ أَحَدٍ ثُمَّ ٱنصَرَفُوا۟ ﴾ خۆیـان دەدزیـەوەو پشـتیان تێیـان دەکـرد، خـواش ﷻ پاداشـتی دانـەوە بـە سـزایەک بـە پێـی کردەوەکانیـان، وەک چـۆن پشـتیان کرد لـە کارکـردن ﴿ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم ﴾ واتە: خـوا دڵیانـی وەرگێـڕا لـە هـەقو ڕاسـتیو سەرشـۆڕی کـردن ﴿ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَفْقَهُونَ ﴾ تێگەیشـتنێک کـە سـوودی هەبێت، ئەگەر ئـەوان تێبگەیشـتبایەن ئەوە بڕوایـان دەهێنا بەو سـووڕەتەی کە دادەبـەزێ، وە ملکەچـی فەرمانەکانیـش دەبوون.

مەبەسـت لـەم ڕوون کردنـەوەدا توونـدی دوورکەوتنـەوەو ڕاکردنیانـە لـە جیهـادو هاوشـێوەکانی، وەک چـۆن خـوا ﷻ دەربارەیان دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ﴿٢٠﴾ ﴾ محمد.

(١٢٨-١٢٩): ﴿ لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾ ﴾:

خوا ﷻ منەت دەکات بەسـەر بەنـدە بڕوادارەکانیدا، بەوەی کـە پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری لـە نەفسـی خۆیان بـۆ نـاردوون، باش دەیناسـنو حاڵـی دەزانـن، وە دەتوانن ڕاسـتەخۆ لێی وەربگـرن، بێـزار نابن لـە گوێڕایەڵی کردنیدا، ئـەو ﷺ لە لوتکەی ئامۆژگـاری کردنیاندایە، هەمـوو تواناکانی دەخاتـە کار بۆ بەرژەوەندیـان ﴿ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ ﴾ واتە: بەلایەوە قورسـە ئەوەی کە دەبێتە مایەی بارگرانـیو نارەحەتی بۆ ئێوە ﴿ حَرِيصٌ عَلَيْكُم ﴾ حـەزی بـە چاکـەی ئێوەیـە، هەمـوو تواناکانـی دەخاتـە کار، تـا پێتـان بگەیەنێ، سـوورە لەسـەر هیدایـەتو ڕێنموونیتـان بـۆ بڕواهێنـان، وە پێی ناخۆشـە تووشـی شـەڕو نەهامەتی ببـن، وە هەمـوو تواناکانـی دەخاتـە کار بـۆ ئـەوەی لێتان بـە دوور بخات ﴿ بِٱلْمُؤْمِنِينَ

﴿رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: زۆر دڵسۆزو میهرەبانە، بە ڕەحمترە لە دایکو باوکیان، لەبەر ئەمەیە مافی پێش خراوە بەسەر مافی هەموو دروستکراوەکاندا، وە پێویستە لەسەر هەموو خەڵکی بڕوای پێ بهێنن‌و بە گەورە تەماشای بکەن‌و ڕێزی لێبگرن ﴿فَإِن﴾ بڕوایان هێنا، ئەوە بەش‌و سەرکەوتنیانە، وە ئەگەر ﴿تَوَلَّوۡاْ﴾ (وە ئەگەر پشتیان هەڵکرد) لە بڕواهێنان‌و کردەوەی چاک، ئەوە تۆ بە ڕێگای خۆتدا بڕۆ، و بەردەوام بانگیان بکە، وە بڵێ: ﴿حَسۡبِيَ ٱللَّهُ﴾ واتە: خوام بەسە لە هەموو کارو کردەوەکاندا ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ واتە: هیچ پەرستراوێک نیە تەنها ئەو نەبێ ﴿عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ﴾ واتە: تەنها پشت بەو دەبەستم، لە بە دەستهێنانی هەموو قازانجەکان‌و دوورخستنەوەی زیانەکان ﴿وَهُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ کە ئەویش گەورەترینی دروستکراوەکانە، ئەگەر پەروەردگاری عەرشی گەورە کە دەوری هەموو دروستکراوەکانی داوە، بێگومان ئەو پەروەردگارە بۆ ئەوانەی کە لە خواری ئەوەوەن.

تەفسیری سوورەتی (التوبة) تەواو بوو

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ١ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا
أَنۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡۗ قَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ
إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٞ مُّبِينٌ ٢ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَۖ
مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ
أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ٣ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ إِنَّهُۥ
يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ شَرَابٞ مِّنۡ حَمِيمٖ
وَعَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ٤ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ
ضِيَآءٗ وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ
وَٱلۡحِسَابَۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ
لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٥ إِنَّ فِي ٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ
ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَّقُونَ ٦

## تەفسیری سووڕەتی (یونس)
## مەككیە (١٠٩) ئایەتە
## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٢): ﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ١ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡۗ قَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٞ مُّبِينٌ ٢ ﴾:

خــوا ﷻ دەفەرمــویْ: ﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡحَكِيمِ ﴾ ئەویــش ئــەم قورئانەیە، کــە حیکمــەتو بڕیارەکانی (شــەریعەت)ی لەخــۆ گرتــووە کــە بەڵگــەن لەســەر حەقیقەتــە ئیمانیەکان، وە فەرمانو قەدەغەکراوە شــەرعیەکان، کە پێویســتە لەســەر ئۆممەت وەری بگــرن بــە ڕەزامەندییــەوە بــۆ ملکــەچ بن.

لەگــەڵ ئەمــەدا زۆربەی خەڵکی پشــتیان تێکردوە، چونکە نایزانن، (بۆیە) ســەریان ســوڕماو ســەیریان هــات ﴿ أَنۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ رَجُلٖ مِّنۡهُمۡ أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ ﴾ (واتــە: کــە ئێمــە نیگامــان کــردوە، بــۆ پیاوێــک لــە خۆیان، کــە خەڵکــی وریــا بکاتەوە) لــە ســزاو تۆڵەی خــوا، وە نیشــانەو ئایەتەکانــی خوایان بیــر بێنێتەوە.

﴿ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ (مــژدە بــدە بــە وانــەی) بڕوایەکــی ڕاســتەقینەیان هێنــاوە، ﴿ أَنَّ لَهُمۡ قَدَمَ صِدۡقٍ عِندَ رَبِّهِمۡ ﴾ واتــە: پاداشــتێکی زۆرو فراوانیــان بــۆ هەیــە، وە پاداشــتو زەخیرەیەکــی زۆریــان بــۆ هەڵگیراوە لــە لای پەروەردگــار، بە هۆی ئەو کــردەوە چاکانەی پێشــیان خستوە.

جــا بێبڕوایــان سەرســام بــوون بــەم پیاوە مەزنــە، سەرســام بوونێک کــە بووە هــۆی ئەوەی تووشــی کوفــرو بێبڕوایــی بــوون، ﴿ قَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾ (بــەڵام بێبڕوایــان) دەربــارەی پێغەمبەر ﷺ (وتیــان): ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٞ مُّبِينٌ ﴾ واتە: (بێگومان ئەم پیاوە) جادووگەرێکی

ئاشـکرایەو شـاراوە نیە بـە لای هیچ کەسـەوە -بە بۆچوونی ئـەوان- ئەمەش لـە گەمژەییو عینادیانـەوە بـوو، بـە ڕاسـتی ئەوان سـەریان سـوڕما لە شـتێک کە شایسـتەی ئـەوە نەبوو مـرۆڤ سـەری پـێ سـووڕ بمێنـێ، بەڵکـو سەرسـوڕمانی ڕاسـتەقینە لـە نەفامـیو نەزانیو گەوجـی ئەوانـە بـە بەرژەوەندیە کانیان، چـۆن بڕوایان بـەم پێغەمبەرە بەخشـندەیە ﷺ نەهێنا کـە خـوا ﷻ لـە خۆیـان بۆی نـارد بـوون، زۆر بـاش دەیانناسـی، کەچـی بانگەوازە کەیان ڕەتکـردەوە، وە سـوور بوون لەسـەر پووچ کردنـەوەی ئاینە کەی، خـوا ﷻ بەردەوامی دەدا بـە نـوورو ئاینە کـەی ئە گەر چـی بێبڕوایانیـش پێیان ناخـۆش بێت.

(٣-٤): ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا إِنَّهُۥ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلْقِسْطِ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٤﴾ ﴾:

خـوا ﷻ -بـۆ ئـەوەی پەروەردگارێتـیو پەرسـتراوێتیو مەزنـی خـۆی ڕوون بکاتـەوە- دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی پەروەردگـاری ئێـوە ئەو زاتەیـە کە ئاسـمانە کانو زەوی دروسـتکردوە لە شـەش ڕۆژاندا) لە گـەڵ ئـەوەدا خـوا ﷻ دەتوانـی بـە سـەرنج دانێـکو چاوتروو کانێـک دروسـتی بکات. بەڵکـو لـەوەدا حیکمـەتو دانایـی پەرسـتراوێتی هەیـە، وە لەبـەر ئـەوەی نـەرمو نیانـە لە کردەوە کانیدا.

جـا لـە تێکـڕای حیکمەتە کانی لـە دروسـتکردنی ئاسـمانو زەوی، دروسـتی کـردوون بە هـەقو بۆ هەق، تا بناسـرێ بە نـاوە جوانە کانیو سـیفاتە بەرزە کانی، وە بە تەنها بپەرسـترێ. ﴿ ثُمَّ ﴾ دوای دروستکردنی ئاسمانە کانو زەوی ﴿ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴾ بەرز بوونەوەیەک شایسـتە بـێ بـە مەزنـی خـوا، ﴿ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴾ (کاروبـارە کان بەڕێـوە دەبات) لـە جیهانی سـەرەوەو خـوارەوە، لـە مراندنو زینـدوو کردنەوەو دابەزاندنـی ڕزقو ڕۆزی، وە دەسـتاو دەسـتکردنی ڕۆژ گـار لـە نێوان خەڵکیـدا، وە لابردنی زیـان لەوانەی زیانیـان لێکەوتووە، وە وەڵامدانەوەی پرسـیارو داوای داوا کەران.

بـە ڕاسـتی بەڕێوەبردنـە کان تەنها لە لایەن ئـەوەوە دادەبەزێو بۆ لای ئەو بـەرز دەبێتەوە، وە سـەرجەم بەدیهێنراوە کان ملکەچی توانای ئەون، تەسـلیمی مەزنی دەسـەڵاتو شـکۆی ئەون.

﴿ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦۚ ﴾ (واتـە: هیـچ تکاکارێـک نیـە مەگـەر دوای ڕێگەدانـی ئـەو بێت) هیـچ کەسـێکیان پێش ناکەوێ بـۆ شـەفاعەتو تکاکردن، ئەگەرچی باشـترینی بەدیهێنراوەکانیـش بێـت، هەتا خـوا ﷻ مۆڵەتی پێنـەدا، خوایش مۆڵەت نـادات تەنها بۆ ئەو کەسـە نەبـێ کە لێی ڕازیـە، ڕازیش نابـێ تەنها لەوانە نەبێ کە بە دڵسـۆزیو یەکتاپەرسـتی عیبادەتی بـۆ دەکەن.

﴿ ذَٰلِكُمُ ﴾ ئـەو زاتـەی کـە ئەمـە پلـەو پایەکەی بـێ، ﴿ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ ﴾ واتـە: ئەو خوایـە خاوەن وەسـفی پەرسـتراویە کـە ناوی پیـرۆزی (الله) هەمـوو سـیفاتەکانی تەواوی لـە خۆیـدا کۆکردوەتـەوە، وە وەسـفی پەروەردگارێتیش کـە کۆکەرەوەی هەموو سـیفەتە کرداریەکانێتی.

﴿ فَٱعۡبُدُوهُۚ ﴾ واتـە: بـە تـاکو تەنهـا بیپەرسـتن بـە هەمـوو ئـەوەی لـە تواناتاندایـە لە جۆرەکانـی بەندایەتـی کـردن، ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ (واتـە: ئاخـۆ پەنـدوو ئامۆژگـاری وەرناگـرن) ئـەو بەڵگانـەی کـە ئاماژەن لەسـەر ئـەوەی خوا بە تەنها پەرسـتراوی سـتایش کراوە.

کاتـێ باسـی حوکمی قـەدەری خۆی کرد کـە بریتیە لـە: بەڕێوەبردنی گشـتی، وە حوکمی ئاینـی: ئەویـش شـەریعەتەکەیەتی، کـە نـاوەڕۆکو مەبەسـتی ئەوەیـە بە تـاکو تەنهایی خـوا ﷻ بپەرسـترێو هـاوەڵو هاوبەشـی بۆ دانەنـرێ، ئنجا باسـی حوکمـی جەزائی کرد، ئەویـش پاداشـت دانەوەیەتـی دوای مـردن، جـا فەرموویەتـی: ﴿ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗاۖ ﴾ واتـە: کۆتـان دەکاتـەوە دوای مردنتـان بـۆ کاتو ڕۆژێکـی دیاریکـراو، ئەویـش ڕۆژی دواییە.

﴿ إِنَّهُۥ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ﴾ (واتـە: بێگومان خوا لە سـەرەتا دروسـتکراوەکان دروسـت دەکات، پاشـان دوای مردنیـان دووبـارە دروسـتیان دەکاتەوە) جا ئەو کەسـەی توانای هەبێ لەسـەر دروسـتکردنی خەڵکـی لە سـەرەتادا، بـە تواناترە لـە دووبـارە درووسـتکردنەوەی، ئەوەیشـی ببینـێ کـە خـوا چـۆن سـەرەتا خەڵکـی بەدیهێنـاوە، پاشـان نکوڵـی دووبـارە دروسـتکردنەوەی بـکات، بـە ڕاسـتی ئـەوە گێلو کـەم عەقڵـە، نکوڵـی لـە یەکێک لەو دوو لەیـەک چـووە دەکات، لەگەڵ ئەوەدا لە پێشـترینیانی چەسـپاندووە، ئـەوە بەڵگەیەکی عەقڵـی ڕوونو ئاشـکرایە لەسـەر دووبارە دروسـتکردنەوە.

پاشـان باسـی بەڵگـەی نەقڵـی کـردوە، فەرموویەتـی: ﴿ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقًّاۚ ﴾ واتـە: پەیمانـی

ڕاستە، هەر دەبێ بەجێی بهێنێ، ﴿ لِيَجْزِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ (واتە: بۆ ئەوەی پاداشتی بڕواداران بداتەوە) ئەوانەی بڕوایان هێناوە بە دڵەكانیان، بەوەی خوا فەرمانی پێكردوە بە بڕواهێنان پێی ﴿ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ بە ئەندامەكانیان، لە ئەركەكانو سوننەتەكان. ﴿ بِٱلْقِسْطِ ﴾ (بە دادگەرانە) واتە: بە ئیمانو كردەوەكانیان، پاداشتێك كە بێگومان ڕوونی كردوەتەوە بۆ بەندەكانی، وە هەواڵیداوە هیچ كەس نازانێ چی شاراوەتەوە بۆیان لە بەهەشتدا كە هۆی گەشبوونی چاوانن.

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ (واتە: ئەوانەی كوفر دەكەن بە) ئایەتەكانی خواو، نێردراوانی خوا بە درۆ دادەنێن ﴿ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴾ (واتە: ئاوی گەرم)، ڕوخسارەكان دەبرژێنێ، وە ڕیخۆڵەكان دەبڕێ، ﴿ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ ﴾ (واتە: سزایەكی بە ئێش) لە هەموو جۆرەكانی سزا ﴿ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴾ واتە: بە هۆی كوفرو ستەمكردنیان، خوا ستەمی لێ نەكردوون، بەڵكو خۆیان ستەم لە خۆیان دەكەن.

(٥-٦): ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ إِنَّ فِى ٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾ ﴾:

﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ ﴾ كاتێ كە خوا ﷻ بڕیاری پەروەردگارێتیو پەرستراوی خۆی داو جێگیری كرد، باسی بەڵگە گەردوونیەكانی كرد كە ئاماژەن لەسەر ئەوەو، لەسەر تەواوی لە ناوو سیفەتە جوانەكانیدا لە خۆرو مانگو ئاسمانەكانو زەوی، وە هەموو ئەوانەی دروستی كردوون لەناویاندا، لە هەموو جۆرە دروستكراوەكان، وە هەواڵیداوە ئەوانە بەڵگەو نیشانەیەكن: ﴿ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ (بۆ گەلێك بە دەسەڵاتی ئەو بزانێ)، وە ﴿ لِقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴾ (بۆ كۆمەڵێك پارێز لە خوا بكەن).

بێگومان زانست ڕێ پیشاندەرە بۆ ناسینی بەڵگەكان تیایاندا، وە چۆنیەتی دەرهێنانی بەڵگە لە نزیكترین ڕووەوە، تەقواو لە خوا ترسان لە دڵدا هاندانێك دروست دەكات بۆ خێرو ترسانێك دروست دەكات لە ئەنجامدانی شەڕ، كە ئەو دووانە لە بەڵگەو سەلماندنەكانەوە سەرچاوەیان گرتووە، وە لە زانستو دڵنیایی.

پوختەی ئەمە تەنها دروستكردنی ئەم بەدیهێنراوانە بەم شێوەیە بەڵگەیە لەسەر تەواوی

قـودرەتو دەسـەڵاتی خـوای مـەزن، وە لەسـەر زانسـتو ژیانو ڕاگـری ئەو. ئەوانەیشـی تیایدایـە لـە پتەوکـردنو وردەکاریو داهێنانو جوانی، ئاماژەن لەسـەر تـەواوی حیکمەتی خـوا ﷻو جوانـی بەدیهێنانـیو فراوانـی زانسـتی، هەروەهـا ئەوەیشـی تیایدایە لـە جۆرەها سـوودو بەرژەوەنـدی وەک خـۆری کردوەتە مایەی تیشـکو ڕووناکیو مانگیشـی کردوە مایـەی ڕۆشـنایی، بـە هۆیانـەوە سـوودو قازانجـی پێویسـت بەدەسـت دەهێنـن، وە جگـە لەوانـەش بە دەسـت دێن، هەمـوو ئەوانە بەڵگەن لەسـەر میهرەبانیو گرنگـی پێدانی خوا ﷻ بە بەندەکانی، وە لەسەر بەرفراوانی چاکەکانی.

هەروەهـا ئەوەیشـی تیایاندایـە لـەو تایبەتمەندیانەی بەڵگەن لەسـەر ویسـتی خـواو ئیرادەی جێبەجێکـراوی، ئەوانـەش بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی خـوا ﷻ تـاکو تەنهایە لە پەرسـتندا، خۆشەویسـتو ستایشـکراوە خـاوەن شـکۆو ڕێـزو سـەرجەم وەسـفە مەزنەکانە، کـە نابێ هیـچ حـەزوو ئارەزوو ترسـێک هەبـێ تەنها بـۆ ئەو نەبـێ، وە پاڕانـەوەی پاڵفتـەو پاکیش تەنهـا بـۆ ئـەو بێ، کە بـۆ هیچ یەکێـک لـە بەدیهێنراوەکانـی نابـێ ئەوانەی پێویسـتیان بە خـوا ﷻ هەیـە لـە کاروبارەکاندا.

لـەم ئایەتانـەدا هاندانو پێداگـری تێدایە لەسـەر بیرکردنـەوە لـە بەدیهێنراوەکانی خوا ﷻ، وە تەماشـاکردنیان بـە هەنـد وەربگـرێ، بـە ڕاسـتی بەوە چـاوو دڵ کـراوە دەبـێ، ئیمانو عەقڵیـش زیـاد دەکەن، خواپەرسـتی لە ناخی ئینسـان زیاد دەکات، وە لە پشـتگوێ خسـتنی ئەوانـەدا تەنبەڵـیو تەوەزلی بـەدی دێ لە جێبەجێ کردنـی فەرمانەکانی خـوادا، وە دەرگای زیـاد کردنی ئیمـان دادەخرێ مێشـکو بیرکردنەوە دەوەسـتێو تەقوای خوای تێـدا نامێنێ.

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ
بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ٧ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ
ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٨ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ
ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ٩ دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ
ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞۚ وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ
لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٠ ۞ وَلَوۡ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ
ٱسۡتِعۡجَالَهُم بِٱلۡخَيۡرِ لَقُضِيَ إِلَيۡهِمۡ أَجَلُهُمۡۖ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ
لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ١١ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ
ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمٗا فَلَمَّا كَشَفۡنَا
عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ
لِلۡمُسۡرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ
مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُواْ
لِيُؤۡمِنُواْ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ١٣ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكُمۡ
خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لِنَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ١٤

(٧-٨): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ٧ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ٨ ﴾ :

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا ﴾ واتـە: ئومێـدوو بڕوایان نیـە بـە دیـدارو لیقـای خـوا ﷻ، کـە ئـەوە گەورەتریـن حـەزوو ئـارەزووە بـۆ ئەوانـەی ئـارەزووی دەکـەن، بەرزتریـن ئـەو هیوایانەیـە کە هیـوای بـۆ هەڵدەچنن، بەڵکـو پشـتیان لـەو ئاینـە کـردوە، وە هەنـدێ جاریـش بـە درۆیـان دانـاوە، ﴿ وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾ (وە بـە ژیانـی دونیـا ڕازی بـوون) لـە جیاتـی ڕۆژی دوایـی ﴿ وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا ﴾ واتـە: پێـی دڵنیابـوونو کردیـان بـە مـەرامو ئامانجی سـەرەکیو کۆتـا مەبەسـتیان، جا هەوڵیـان بـۆ داو ڕۆچوون لـە چێـژ وەرگرتـنو ئارەزووبـازی تیایدا، بە هـەر ڕێگایـەک بـە دسـتیبهێنن وەریدەگرن، لـە چ سـەرچاوەیەک ڕووبـدات بـۆی دەچنـە پێشـەوە، بـە ڕاسـتی هەمـوو توانـاو ئیرادەو نیـەتو بیـروو کردەوەکانیـان بـۆ ئـەو مەبەسـتە بەکارهێنـا، وەکو ئـەوە وابوو کـە ئەوان بـۆ ئـەو مەبەسـتە دروسـت کرابێتن کە بـە هەمیشـەیی تیایـدا بمێننـەوە، هەرگیـز بیریان لـەوە نەدەکـردەوە ئەمـە ماڵـی تێپەڕبوونـە، دەبـێ ڕێبـواران توێشـووی بۆ ئامـادە بکەن بۆ ماڵـی مانـەوە کـە پێشـینو دواییني ئـەوان تەنها بـۆ ئـەو شـوێنە گەڕانـەوەو دەگەڕێنەوە، وە بـۆ نـازوو نیعمەتو لـەززەتو خۆشـیەکانی، سـەرکەوتووان کێبڕکێیان لەسـەر کردوە، ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴾ (واتـە: ئەوانـەش لە ئایەتو نیشـانەکانی ئێمە غافڵو بێئاگـان) سـوود وەرناگرن لـە دەقە قورئانیـەکان، وە لەو ئایەتـە گەردوونیانـەو ئەوانەی لە نەفسـی خۆیان بـەدی دەکرێ، وە پشـت کردن لە بەڵگە، پشـتێکردن پێویسـت دەکات، وە بـێ ئاگابوونیـش لـە ناوەڕۆکـی مەبەسـت.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانـەی ئەمـە حاڵیانـە ﴿ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ﴾ واتـە: دۆزەخ شـوێنو جێگایانە کـە لێـی کـۆچ ناکـەن ﴿ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾ (واتە: لەبـەر ئـەو کردەوانەی لە دنیـادا دەیانکـرد) لە کوفرو شـیرکو جۆرەها سـەرپێچیو گوناه، کاتێ باسـی سـزا دانیانی کرد باسـی پاداشـتی گوێڕایەڵانیشـی کـرد، فەرمووی:

(٩-١٠): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾

خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتـە: ئەوانەی ئیمانو ئەنجامدانـی کـردەوە چاکەکانیـان پێکـەوە کۆکردەوە، کـە کردەوەکانـی دڵو ئەندامەکان دەگرێتـەوە، لـە ڕووی دڵسـۆزیو شـوێنکەوتنەوە ﴿ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمْ ﴾ واتـە: بە هـۆی بـاوەڕە ڕاسـتەکانیانەوە خـوا ﷻ مەزنتریـن پاداشـتیان دەداتەوە، ئەویـش هیدایەتو ڕێنماییـە، ئـەوەی سـوودی هەیـە بۆیان فێریـان دەکات، وە منـەت دەکات بەسـەریاندا بەو کردەوانـەی کـە لـە هیدایەتـەوە سـەرچاوە دەگـرن، وە هیدایەتیـان دەدات بـۆ ڕامـان لـە نیشـانەکانی، لـە ژیانـی دنیـادا ڕێنماییان دەکات بۆ سـەر ڕێگای ڕاسـت کـە دەیانگەیەنێتە بەهەشـتە پـڕ لـە نـازوو نیعمەتەکانـی، لەبـەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾ بـە بـەردەوام ڕێ دەکات ﴿ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ خـوا داویەتیـە پـاڵ نـازو نیعمـەت، چونکـە هەمـوو نـازو نیعمەتـەکان دەگرێتەوە.

نیعمەتـی دڵ بـە خۆشـیو بەهرەمەندیو ئاسـودەیی، وە بینینی خواو بیسـتنی قسـەکانی، وە سەرسـام بـوون بـە ڕەزامەنـدی ئەوو نزیـک بوونـەوە لێی، وە گەیشـتن بە خۆشەویسـتانو بـراو دۆسـتان، وە چێژوەرگرتـن بـە کۆبوونـەوە لەگەڵیـانو تەماشـاکردنی ئـەو دیمەنـە جوانو سـەرنج ڕاکێشـانە.

وە نازونیعمەتەکانـی جەسـتە لـە جۆرەهـا خـواردنو خواردنـەوەو ژنو ژنخـوازیو وێنەی ئەوانـە، کـە نەفسـی مرۆڤ پـەی پێ نابـەنو نایزانـن، وە بە ختـورەش بە دڵی هیچ کەسـدا نەهاتـووە، وە هیـچ وەسـفکارێک نەیتوانیوە وەسـفی بکات.

(١٠): ﴿ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾:

﴿ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ ﴾ واتـە: بەندایەتـی کردنیـان تیایـدا بـۆ خوایـە، سـەرەتای

تەسبیحو پاکو بێگەردیە بۆ خوا ﷻ لە هەموو ناتەواویەک، وە دوایین دوعایشیان ستایشکردنی خوایە، ئەرکەکان لەسەر شانیان هەڵگیراوە لەو ڕۆژەدا، بەڵام ئەوەی بۆیان ماوەتەوە تەواوترینی لەزەتەکانە، کە لە خواردنو خواردنەوە خۆشترو بەتامترە، ئەویش یادی خوای گەورەیە کە دڵەکانی پێ ئاسوودە دەبێو ڕووحەکانی پێ شادوخۆش دەبێ.

جا ئەو یاد کردنە بۆ ئەوان وەکو هەناسەدان وایە بەبێ هیچ ماندووبوونێک، ﴿ وَتَحِيَّتُهُمْ ﴾ (واتە: سڵاو کردنیان لە نێوان یەکتردا کاتێ بەیەک دەگەنو سەردانی کردنی یەکتر دەکەن تەنها سەلامە، واتە: قسەیەکی ساغ دوور بێ لە هەموو گاڵتەو گەپو گوناهێک، وەسفکراوە بەوەی ﴿ سَلَامٌ ﴾ وە وتراوە لە تەفسیری وتەی خوادا: ﴿ دَعْوَاهُمْ فِيهَا سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ ﴾ تا کۆتایی ئایەتەکە، ئەوەیە خەڵکی ناو بەهەشت ئەگەر پێویستیەکان بە خواردنو خواردنەوەو وێنەی ئەوانەش هەبێ، دەڵێن: پاکیو بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان! ڕاستەوخۆ خواردنەکەیان بۆ ئامادە دەبێ، ئەگەر لێبوونەوە دەڵێن: ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ (واتە: سوپاسو ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانییان).

(١١): ﴿ وَلَوْ يُعَجِّلُ اللَّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ فَنَذَرُ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١﴾ ﴾:

دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُعَجِّلُ اللَّهُ لِلنَّاسِ الشَّرَّ اسْتِعْجَالَهُم بِالْخَيْرِ ﴾ ئەمەش لە سۆزو بەزەیيو چاکەکانی خوایە بۆ بەندەکانی، کە ئەگەر پەلەی بکردایە لە وەرگرتنی دوعای شەڕو خراپە لەسەر خەڵکی کاتێ بە هۆکارەکانیانی هەستان، وە سزایانی بدایە لەسەر پەلەکردنیان لە دوعای شەڕوو خراپەدا، هەروەکو چۆن خێرو چاکەیان بۆ پێش دەخات ئەگەر بە هۆکارەکانی هەستان ﴿ لَقُضِيَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ ﴾ واتە: بەسزا لە ناوی دەبردن، بەڵام خوا ﷻ مۆڵەتیان پێ دەداو فەرامۆشیان ناکات، وە لە زۆرێ لە مافەکانی خۆش دەبێ، جا ئەگەر خوای مەزن خەڵکی سزا بدایە بە هۆی ستەم کردنیانەوە، ئەوە هیچ گیان لەبەرێک لەسەر زەویدا نەدەما.

ئەمە ئەوە دەگرێتەوە ئەگەر بەندە تووڕە بێت لە منداڵەکانی، یان خێزانەکەی، یان ماڵەکەی، ڕەنگە دوعایەکیان لێ بکات، ئەگەر خوا وەریبگرێ، ئەوە تووشی خراپترین زیان دەبێ، بەڵام خوای مەزن لەسەرخۆو کارلەجێیە، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَنَذَرُ

﴿ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا﴾ واتـە: بڕوایـان بە دوارۆژ نیـەو کار ناکەن بۆ ئـەوەی ڕزگاریان بـێ لـە سـزای خـوا، ﴿فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ﴾ واتـە: لـە پووچیانـدا، کـە سـنووریان تێپەڕانـد، ﴿يَعۡمَهُونَ﴾ واتـە: لـە گومانو دوو دڵیدا سەرسـام دەبن، هیدایـەت نادرێن بۆ ڕێگای ڕاسـت، ئەویـش سـزایە کە بۆ ئـەوان بە هۆی سـتەم کـردنو بێبڕواییان بـە ئایەتەکانی خوا.

(١٢): ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمٗا فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡمُسۡرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٢﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمٗا﴾ (واتـە: کاتـێ ئادەمـی زیانێکـی لـێ بکـەوێ بـە ڕاکشـان، یـان بـە دانیشـتن، یاخـود بـە پێـوە لێمـان دەپاڕێتـەوە)، ئەمـە هەواڵدانـە لـە حەقیقەتو سروشـتی ئادەمیـزاد هەر وەکو خـۆی ڕێکاو ڕێک، ئەگەر تووشـی ناخۆشـیەک ببێ، لە نەخۆشـی یان بەڵاو موسـیبەت، زۆر دەپاڕێتەوەو دوعـا دەکات، وە داوا لـە خـوا دەکات لـە هەمـوو بارودۆخەکانیـدا بـە پێـوە بـێ، یـان بە دانیشـتنو پاڵدانـەوە، وە زۆر پێداگـری دەکات لـە نـزاو پاڕانـەوەدا، بـۆ ئـەوەی خـوا ﷻ زیانەکەی لەسەر لاببات.

﴿فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥ﴾ (واتـە: ئنجـا کاتـێ زەرەرو زیانەکەمـان لەسـەر لابـردو نەمـان هێشـت، دەڕوات وەک دوعـای نەکردبـێ لێمـان بـۆ لابردنـی زیانێـک کـە دووچـاری بـووە)، واتـە: بـەردەوام دەبـێ لـە بـێ ئاگایـی خـۆی، پشـت هەڵـدەکات لـە پەروەردگـاری، وەکـو ئـەوەی تووشـی زیـان نەهاتبـێ، جـا چ سـتەمێک لـەم سـتەمە مەزنتـرە؟! داوا لـە خـوا دەکات ئـەوەی مەبەسـتێتی بـۆی جێبەجـێ بـکات، جـا ئەگـەر بـە دەسـتی هێنـا، تەماشـای مافـی پەروەردگـاری نـاکات، وەکـو ئـەوەی مافـی پەروەردگـاری بەسـەرەوە نەبـێ، ئەمـەش ڕازاندنـەوەو جوانکاریـە لـە لایـەن شـەیتانەوە، بـۆی جـوانو ڕازاوە کـردوە ئـەوەی پیـسو بۆگەنـە لـە عەقـڵو سروشـتدا.

﴿كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡمُسۡرِفِينَ﴾ واتـە: (بـەو جـۆرە ڕازێنراوەتـەوە بـۆ) ئەوانـەی سـنووریان بەزانـدوە ﴿مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾ (واتـە: ئـەو کردەوانـەی کـە کردوویانـە).

(١٣-١٤): ﴿وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ١٣ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لِنَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ١٤﴾:

﴿ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات کە بە ڕاسـتی گەلەکانی پێشـووی لـە نـاو بـردووە بـە هـۆی سـتەمو کوفریانـەوە، پـاش ئـەوەی بەڵگـەی ڕوونو ئاشـکرایان بـۆ دابـەزی لەسـەر دەسـتی پێغەمبـەران، وە هەقو ڕاسـتیش دەرکـەوت، بەڵام ئـەوان ملکەچـی نەبـوونو بڕوایـان پێنەهێنـا، بۆیـە خوا ﷻ سـزای خـۆی لەسـەر حەڵاڵ کـردن، کـە ئـەو سـزایە بـۆ هەمـوو تاوانبارێکـی چاوقایمـە بـە بێباکـیو گـوێ پێنەدان سـنوورەکانی خـوا ﷻ دەبەزێنـێ.

﴿ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكُمۡ ﴾ (واتە: پاشـان ئێوەمان کرد) ئەی ئەوانەی قسـەتان بۆ ئاراسـتە دەکرێت ﴿ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لِنَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴾ (واتـە: بـە جێگرو جێ نشـین لە زەویـدا لـە پاش ئـەوان، بـۆ ئەوەی سـەرنج بدەیـن ئێوە چـۆن ڕەفتـار دەکەن) جـا ئەگەر ئێـوە پەنـدو ئامۆژگاریتان وەرگرتووە لە پێشـنی خۆتانو شـوێنی ئایەتو نیشـانەکانی خوا کەتـوون، وە پێغەمبەرانتـان بـە ڕاسـت زانیـوە، ئەوە لـە دنیـاو دوا ڕۆژدا ڕزگارتـان بووە، بـەڵام ئەگـەر وەکو سـتەمکارانی پێـش خۆتان هەڵسـوکەوتتان کـرد، چۆن ئەوانی سـزا دا بەهەمـان شـێوە ئێوەش سـزا دەدات، وە هەر کەسـێک ئاگـادار بکاتەوە ئەوە پاسـاوی هەیە.

وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ
لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ
لِيٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآيِٕ نَفْسِيٓ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ
إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ قُل
لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ
فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾
فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ
إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٧﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ
مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا
عِندَ ٱللَّهِ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا
فِي ٱلْأَرْضِ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾ وَمَا
كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ
سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ
﴿١٩﴾ وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَقُلْ إِنَّمَا
ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾

(١٥-١٧): ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآيِٕ نَفْسِيٓ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥﴾ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا مِّن قَبْلِهِۦٓ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦﴾ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿١٧﴾﴾:

﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا﴾ (واتە: کاتێ ئایەتە ڕوونەکانی ئێمە بخوێنرێتەوە بەسەریاندا ئەوانە بە تەمای دیداری ئێمە نین لە ڕۆژی دواییدا) خوا ﷻ باس لە ئینکاری‌و کەللەڕەقی بە درۆدانەرانی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ دەکات، ئەوان کاتێ دەقە قورئانیەکانی خوا ﷻ بخوێنرایەتەوە بەسەریاندا کە پڕن لە هەق‌و ڕاستی خۆیان لێ دەپاراست‌و پشتیان تێدەکرد، وە بە چەندین جۆر عینادی‌و ستەمیان دەکردو دەیانوت: ﴿ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ﴾ (واتە: قورئانێکی تر جگە لەم قورئانە بێنە یان بیگۆڕە) دەک خوا ڕوویان ڕەش بکا بۆ خۆیان‌و ئەو قسەیان کە چەندە بوێرو ستەمکارن بەرانبەر بە خواو ڕەتکردنەوەی ئایەتەکانی، جا ئەگەر ئەو پێغەمبەرە مەزنە خوا ﷻ فەرمانی پێکردبێ، پێیان بڵێ: ﴿قُلْ مَا يَكُونُ لِيٓ﴾ واتە: بۆ من نابێ‌و شایستەی من نیە ﴿أَنْ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلْقَآيِٕ نَفْسِيٓ﴾ (واتە: کە لەلایەن خۆمەوە بیگۆڕم) بە ڕاستی من پێغەمبەری خوام هیچ شتێکم لەو کاروبارەدا نیە، ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾ واتە: من جگە لەوە هیچی ترم نیە، من تەنها بەندەیەکی فەرمان پێکراوم، ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (واتە: بە ڕاستی من دەترسم ئەگەر سەرپێچی پەروەردگارم بکەم لە سزای ڕۆژی دوایی) ئەمە وتەی باشترینی دروستکراوەکانە، وە ئەدەبی قسەکردنێتی لەگەڵ فەرمانەکانی پەروەردگاریدا، چ جای

لەگەڵ ئەو گەمژەو گومڕایانەی کە کۆیان کردۆتەوە لە نێوان نەفامیو گومڕایی، وە ستەمو کەللەڕەقیان دەکرد بەرانبەر پەروەردگاری جیهانیان، ئایا ئەوانە لە سزای ڕۆژی زۆر مەزن ناترسن؟! ئەگەر گومانیان برد مەبەستیان ئەوەیە هەقو ڕاستیان بۆ ڕوون ببێتەوە بەو ئایەتو نیشانانەی داوایان دەکرد، ئەوە ئەوان لەو گومانەیاندا درۆیان کرد، چونکە بێگومان خوا ﷻ ئایەتو نیشانەکانی وا ڕوونکردۆتەوە کە هاوشێوەی ئەوان وەکو مرۆڤەکان لێی تێبگەن، وە هەر ئەو بەرێوەی دەبات چۆن بیەوێ بە پێی حیکمەتو بەزەیی خۆی بۆ بەندەکانی، ﴿ قُل لَّوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوْتُهُۥ عَلَيْكُمْ وَلَآ أَدْرَىٰكُم بِهِۦ ۖ فَقَدْ لَبِثْتُ فِيكُمْ عُمُرًا ﴾، (واتە: پێیان بڵێ: ئەگەر خوا بیویستایە ئەم قورئانەم نەدەخوێندەوە بۆتان، وە لەوە ئاگادارم نەدەکردن، چونکە بێگومان من مامەوە لە ناوتاندا) بۆ ماوەیەکی زۆر ﴿ مِّن قَبْلِهِۦٓ ﴾ واتە: پێش هاتنی ئەم قورئانە، پێش ئەوەی بیناسن، منیش بە خەیاڵمدا نەهاتوە، نەکەوتۆتە نەفسو دڵو دەروونم، ﴿ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ (واتە: ئایا ئێوە نافامن) من لە ماوەی تەمەنمدا شتی لەو جۆرەم هەڵنەواسیوە، وە شتێکیش لەمنەوە دەرنەچووە کە بەڵگەبێ لەسەر ئەوە، جا چۆن دوای ئەوە شتی لەو جۆرە هەڵدەبەستم، بێگومان من مامەوە لە نێوانتاندا، ماوەو تەمەنێکی دوورو درێژ پێش هاتنی ئەم قورئانە، وە حەقیقەتی حاڵی من دەزانن، کە من نەخوێندەوارمو نە دەزانم بنووسم، وە نەدەزانم بخوێنم، دەرسو وانەم لای هیچ کەسێک نەخوێندووە؟!

جا کتێبێکی مەزنم بۆ هێناون کە زمان پاراوو ڕەوانبێژان لە بەردەستیدا سەرسام بوون، ئایە لەگەڵ ئەمەدا دەگونجێ من لەلایەن خۆمەوە هێنابێتم، یان بەڵگەیەکی ڕوونو یەکلاکەرەوەیە کە ئەو قورئانە دابەزێنراوە لە لایەن کارلەجێی ستایش کراوەوە؟

جا ئەگەر عەقڵو بیرو هۆشتان بخەنە کارو سەرنج بدەن لە ژیانی منو حاڵی ئەم کتێبە پیرۆزە، ئەوە دانتان بەوەدا دەنا کە ئەم قورئانە کەمترین گومانی تێدا نیە، وە ئەو هەقەیە کە لە دوای ئەو هیچی دیکە نایە جگە لە گومڕایی نەبێ، بەڵام ئێوە پشتتان تێکردوو تەنها بە درۆدانانو کەللەڕەقیتان هەڵبژارد، ئەوە بە ڕاستی هیچ گومانێکی تێدا نیە ئێوە ستەمکارن.

﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِـَٔايَـٰتِهِۦٓ ﴾ (واتە: کێ ستەمکارترە لەو کەسەی درۆ بەدەم خواوە هەڵبەستێ، یان ئایەتەکانی قورئان بە درۆ دابنێ)؟!

جا ئەگەر من قسە هەڵبەستمو درۆ بە دەم خواوە بکەم، ئەوە دەبمە ستەمکارترینی ناو خەڵکی، وە سەرفرازیو سەرکەوتن لە دەست دەدەم، حاڵی من لای ئێوە شتێکی شاراوە نیە، بەڵکو من بە نیشانەو ئایەتەکانی خوا ﷻ هاتووم بۆ ناوتان، ئێوەش بە درۆمتان دانا، ئەو کات ئێوە بوون

بە ستەمکارترین کەس، هەر دەبێ کاروبارەکانتان پەرش‌و بڵاو ببێتەوە، هەرگیز سەرکەوتن‌و سەرفرازی بەدەست ناهێنن تا بەو شێوەیە بن.

وتەی خوا دەبێتە بەڵگە: ﴿قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا﴾ بە ڕاستی ئەوەی وای لێکردن بەردەوام عینادی‌و ئینکاری بکەن، تەنها بڕوانەبوونیان بوو بە دیداری خوا ﷻ، وە بێ ئومێدو بێ هیوا بوون لێی، چونکە هەر کەسێک بڕوای بە دیداری خوا ﷻ هەبێت، ئەوە پێویستە لەسەری ملکەچ بێ بۆ ئەم کتێبەو بڕوایشی پێی هەبێ.

(١٨): ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١٨﴾﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَيَعْبُدُونَ﴾ واتە: ئەو بتپەرستانەی کەوا درۆیان بەدەم پێغەمبەری خواوە دەکرد، ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ﴾ واتە: تەنانەت بە قەد مسقاڵە زەڕرەیەک سوودیان پێناگەیەنن، وە زیانیشیان لێ دوور ناخەنەوە، ﴿وَيَقُولُونَ﴾ قسەیەکی پووچ‌و بەتاڵ دەکەن بەبێ سەلماندن‌و دەڵێن: ﴿هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ﴾ (واتە: ئەو بتانە تکاکارمانن لە لای خوا) واتە، دەیانپەرستن تا لە خوا ﷻ نزیکیان بکەنەوە، وە شەفاعەتیان بۆ بکەن لای خوا ﷻ، ئا ئەمەش قسەیەک بوو لە خۆیانەوە وتبوویان، لەبەر ئەمەیە خوا ﷻ بۆ بەتاڵ کردنەوەی ئەم بۆچوونە فەرموویەتی: ﴿قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾ (واتە: خوای بەرز زانایەو بە زانستی خۆی دەوری هەموو ئاسمانەکان‌و زەوی داوە، بێگومان هەواڵی پێداون نە هیچ شەریک‌و هاوبەشێکی هەیە، وە نەپەرستراوێکی دیکەش لەگەڵیدا، ئا ئێوە ئەی موشریک‌و بتپەرستەکان پێتان وایە کەسێک لە ئاسمانەکان‌و زەویدا شەریکی خوا ﷻ بێت؟ ئایا ئێوە هەواڵی دەدەنێ بە شتێک کە لای ئەو شاراوەبێ‌و لای ئێوەش زانراو؟ ئایا ئێوە زاناترن یان خوا ﷻ؟ ئایا قسەیەک لەم قسە پووچتر هەیە؟ ئەوە لە خۆ دەگرێ کە ئەو گومڕاو نەفام‌و بتپەرستانە لە خوای پەروەردگاری جیهانیان زاناتربن؟! ئەوەندە بەسە بۆ کەسێکی عاقڵ بیر لەم قسەیە بکاتەوە، بە ڕاستی پووچی‌و بەتاڵی ئەم قسەیە دەچەسپێنێ: ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ واتە: پاکی‌و بێگەردی‌و بڵندی لەوەی کە دەیکەنە شەریک‌و هاوبەش بۆ خوا ﷻ، بەڵکو خوا ﷻ تاک‌و تەنهاو بێ نیازە، هیچ پەرستراوێک لە ئاسمانەکان‌و زەویدا نیە جگە لەو نەبێ، وە هەموو پەرستراوێک لە جیهانی سەروو خوارەوە جگە لەو پووچ‌و بەتاڵە، بەپێی عەقڵ‌و شەرع‌و سروشت ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ

مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾ ﴾ (واتە: ئەوە ئەوەیەو لەبەر ئەوەیە کە خوا هەر خۆی ڕاستەو ئەوەی هاوارو بانگی دەکەن، جگە لە خوا ناهەقەو بێگومان خوا هەر خۆی زۆر بەرزو گەورەیە).

(١٩-٢٠): ﴿ وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٩﴾ وَيَقُولُونَ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ فَقُلْ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾:

﴿ وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَٱخْتَلَفُوا۟ ﴾ (واتە: خەڵکی لە ڕابردوودا هەریەک ئوممەت بوون) یەک دەنگ بوون لەسەر ئاینی ڕاست، ئنجا جیاوازی کەوتە نێوانیان، خوا ﷻ پێغەمبەرانی نارد وەک مژدەدەرو ترسێنەر، وە کتێبی لەگەڵ دابەزاندن بۆ ئەوەی حوکمو دادوەری لە نێوانی خەڵکیدا بکەن لەوەی کە تیایدا ناکۆک بوون، ﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ ﴾: (واتە: ئەگەر بڕیاری پێشتر نەدرایە لە لایەن پەروەردگارتەوە) بە مۆڵەت دانی سەرپێچیکاران وە پێش نەخستنی سزا بۆیان ﴿ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ﴾ (واتە: ئەوە بڕیار دەدرا لە نێوانیاندا) بەوەی بڕوادارانمان ڕزگار دەکردو کافرو بە درۆدانەرانمان لەناو دەبرد، ئەمەش دەبووە جیاکاریەک لە نێوانیاندا ﴿ فِيمَا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾، (واتە: لەوەی کە تیایدا جیاوازن) بەڵکو خوا ﷻ ویستی وابوو تاقیان بکاتەوە، هەندێکیان بە هەندێکی دیکەیان، بۆ ئەوەی ڕاستگۆ لە درۆزن دەربکەوێ، ﴿ وَيَقُولُونَ ﴾ واتە: بە درۆدانەرانو کەللەڕەقان دەیانوت: ﴿ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾ واتە: مەبەستیان پێی ئایەتو نیشانەکانی پێشنیار کردن بوو، وەکو دەیانوت: ﴿ لَوْلَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ ﴾الفرقان. (واتە: بۆچی فریشتەیەک نەنێردراوەتە خوارەوە بۆ لای بۆ ئەوەی لەگەڵیدا ترسێنەر بێ) وە وەک دەیانوت: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ ﴾ (واتە: ئەوان وتیان بڕوات پێ ناهێنین تاوەکو کانیاوێکمان بۆ نەتەقێنێت لە زەوییەوە).

﴿ فَقُلْ ﴾ پێیان بڵێ: ئەگەر پێشنیاری ئایەتێکیان کرد ﴿ إِنَّمَا ٱلْغَيْبُ لِلَّهِ ﴾ (واتە: تەنها نهێنیو پەنهان تایبەتە بە خوا ﷻ) ئەو بە زانست دەوری بەندەکانی داوە، کاروباریان ڕێکدەخات بەوەی کە زانستو حیکمەتی خۆی دەیخوازێ، بۆ هیچ کەسێکیش نیە لێکدانەوەو بۆچوونی خۆی بەکاربهێنێت نە لە حوکمو نە لە بەڵگەو نە لە ئامانجو نە لە هۆکار. ﴿ فَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾ واتە: هەموو کەس با چاوەڕێی هاوەڵەکەی بکات کە شایستەیە بە ئەو، تەماشا بکەن بزانن سەرەنجامی باش بۆ کێیە؟

وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ
فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ
(٢١) هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ
وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ
وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ
دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ
مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ (٢٢) فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ
ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٢٣)
إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ
بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ
أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ
عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ
بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ (٢٤) وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ
إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ (٢٥)

(٢١): ﴿ وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ (٢١) ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ ﴾ (واتـە: کاتێ ئێمـە دەیچێژیـن چاکـەو بەهرەیـەک بـە خەڵکـی لـە پـاش زیـانو ناخۆشـیەک تووشـیان بـووە) وەک لـەش سـاغی دوای نەخۆشـی، وە دەوڵەمەنـدی دوای هـەژاری، وە ئاسـایش دوای تـرس، ئـەو ناخۆشـیانەیان بیـر دەچـێ کـە تووشـیان بـوون، سوپاسـگوزاری خـوا ناکـەن لەسـەر خۆشـگوزەرانیو ڕەحمەتـی خـوا ﷻ، بەڵکـو بـەردەوام دەبـن لەسـەر گومڕایـیو فـروو فێڵیـان، بۆیـە خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ ﴾ واتـە: هـەوڵو کۆشـش دەکـەن بـۆ بەتـاڵو پـووچ، بـۆ ئـەوەی هـەق پـووچ بکەنـەوە.

﴿ قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ ﴾ (واتـە: پێیـان بڵـێ: خـوا خێراتـرە لـە پیـلان هەڵوەشـاندنەوەتان) بـە ڕاسـتی پیلانی خـراپ تەنهـا ملـی خاوەنەکـەی دەگـرێ، مەبەسـتەکانیان بـە پێچەوانە دەشـکێتەوە بەسـەریاندا، بەڵکـو فریشـتەکان تۆمـاری کردەوەکانیـان دەکـەن، خوایـش بۆیـان دەژمێرێـت، پاشـان پاداشـتیان دەداتـەوە لەسـەری بـە چاکتریـن پاداشـت.

(٢٢-٢٣): ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ (٢٢) فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٢٣) ﴾:

کاتـێ خوا ﷻ باسـی یاسـای گشـتی کـرد دەربـارەی دۆخـی خەڵکـی، کاتـێ ڕەحمەتی

خـۆی بەسـەریاندا دادەبارێنـی دوای هەمـوو ناخۆشـیو نەخۆشـیەکان، وە هەرزانـی دوای گرانـی، باسـی حاڵەتێکـی دیکـە دەکاتو پشـتیوانی لـەو حاڵەتـە دەکات، ئەویـش حاڵیانـە لەنـاو دەریـادا لەکاتـی نارەحەتـیو ناخۆشـیدا، وە ترسـان لـە دەرنجامەکانـی، جـا فەرموویەتـی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴾ (واتـە: خـوا ﷻ زاتێکـە هاتـوو چۆتـان پێـدەکات لـە وشـکانیو لـە دەریـادا) بـەوەی بۆتانـی ئاسـان کـردوە لـەو هۆکارانـەی ئاسـانکراون بۆتـان تیایـدا، وە هیدایەتـی دان بـۆ لای ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ﴾واتـە: کەشـتی دەریایـی ﴿ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ ﴾(واتـە: کەشـتیەکان دەیانگێرێـت بـە هـۆی بایەکـی چـاکو خۆشـەوە) بـە پێـی حـەزو ئـارەزووی خۆیـان، بەبـێ بێزاربـوونو مانـدوو بـوون ﴿ وَفَرِحُواْ بِهَا ﴾(واتـە: خـۆش حـاڵ دەبـن)و پێـی ئـارام دەگـرن، لـە کاتێکـدا ئـەوان بـەو شـێوەن، لەپـڕ ﴿ جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ ﴾ واتـە: بایەکـی زۆر توونـد (لـەو کەشـتیەیان هەڵـدەکات) ﴿ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ ﴾(واتـە: شـەپۆلیان بـۆ بێـت لـە هەمـوو لایەکـەوە) ئیتـر وا گومـان دەبـەن لەنـاو دەچـن، ئەوجـا بۆیـان ڕوون دەبێتـەوە کـە پەیوەندیـان پچـڕاوە بـە دروسـتکراوەکانەوە، وە بۆیـان دەردەکـەوێ کـەس ڕزگاریـان نـاکات تەنهـا خـوای تـاکو تەنهـا نەبـێ، زۆر بـە دڵسـۆزیەوە لێـی دەپاڕێنـەوەو پەیمـان بـە خۆیـان دەدەن بـە شـێوەیەکی تـەواو دەڵێـن: ﴿ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ ﴾ واتـە: ئـەو هەمـوو تەنگانـەو نارەحەتیانـەی بیـر چوویـەوە، ئەویـش ئـەو نـزاو پاڕانـەوە بـوو کـە کردبوویـان، وە ئەوەشـی کـە نەفسـی خۆیانیـان پەیوەسـت کردبـوو پێیـەوە، شـیرکو هاوەڵیـان بـۆ خـوا دانـاو دەیانزانـی ئـەو پەرسـتراوانە ناتوانـن لـە نارەحەتـی ڕزگاریـان بکـەن، هیـچ ناخۆشـیەکیان لەسـەر لاببـەن، جـا بۆچـی لـە کاتـێ لـە خۆشـیدا بـوون بـە دڵسـۆزی خوایـان نـە دەپەرسـت، وەک چـۆن لـە ناخۆشـیدا زۆر بـە دڵسـۆزی دەیانپەرسـت؟! بەڵکـو دەرەنجامـی ئـەم گومڕایـیو خراپەیـان زیانەکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـەر خۆیـان، لەبـەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾واتـە: ئەوپـەڕی ئـەوەی ئومێـدی پێدەکـەن لـە سـتەمو ناحەقیەکانتـان، وە لادانتـان لـە دڵسـۆزی بـۆ خـوا، تەنهـا بـۆ ئەوەیـە شـتێکی کـەم لـە ژیـانو لەزەتـی بـێ نرخـی دونیـا دەسـتبەر بکـەن، کـە بێگومـان لـە داهاتوویەکـی

نزیکـدا نامێنـێ‌و هەمـووی دەڕوات، پاشـان لێـی دەگوازرێنـەوە ﴿ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ ﴾ (واتـە: پاشـان گەڕانەوەتـان هـەر بـۆ لای خوایـە) لـە ڕۆژی دوایيـدا ﴿ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴾ (واتـە: ئنجـا هەواڵتـان پـێ دەدەیـن بـەوەی کـە لـە دونیـادا دەتـان کـرد)، لەمـەدا ئەوپـەڕی ئاگـادار کردنـەوە بـەدی دەکـرێ لـە بـەردەوام بـوون لەسـەر کردەوەکانیـان.

(٢٤): ﴿ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ٢٤ ﴾:

ئـەم نموونەیـە لـە چاکترینـی نموونەکانـە، گونجـاوە لەگـەڵ دۆخـی دونیـادا، بە ڕاسـتی لـەزەت‌و خۆشـی‌و ئـارەزوو پلـەو پایـەی‌و هاوشـێوەی ئەوانـەش، دەگەڕێتـەوە بـۆ خاوەنەکـەی ئەگـەر چـی ماوەیەکـی کەمـە، ئەگـەر تـەواو بـوو پـەرش‌و بڵاودەبێتـەوە، وە لـە خاوەنەکـەی دەبڕێتـەوە، یاخـود خاوەنەکـەی لـەو جیـا دەبێتـەوە، لـە داهاتـوودا دەسـت بەتـاڵ دەردەچێـت‌و هیچـی بەدەسـتەوە نامێنـێ لـەو سـەروەت‌و سـامانە، دڵـی پـڕ دەبـێ لـە خەفـەت‌و حەسـرەت‌و بێتاقەتـی.

لەبـەر ئـەوە فەرموویەتـی: ﴿ كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتـە: سـەوز دەبـی لەسـەر زەویـدا لـە هەمـوو جـۆرە ڕووەکێـک‌و هەمـوو جووتێکـی پرشـنگدار ﴿ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ ﴾ (لـەوەی خەڵکـی لێـی دەخـوا) وەکـو دانەوێڵـەو بەروبوومـەکان، ﴿ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ ﴾ لەوانـەی کـە (ئاژەڵـەکان) دەیخـۆن لـە جۆرەهـا گـژو گیـاو دەغـڵ‌و دان ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ ﴾ واتـە: زەوی ڕەونەقـی خۆی وەردەگـرێ‌و خـۆی دەڕازێنێتـەوە، تـا دەبێتـە مایـەی دڵخۆشـی‌و سـەرنج ڕاکێشـی بـۆ بینـەران، وە سـەیرانێک بـۆ گەشـتیاران‌و بەڵگەیـەک بـۆ ژیـرو عاقڵـەکان، جـا تـۆ سروشـتێکی جـوان‌و سەرسـوڕهێنەر دەبینـی لـە نێـوان سـەوزی‌و زەردایـی‌و سـپیایەتی‌و جگـە لەوانەیـش.

﴿ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ ﴾ واتـە: ئـەوان وایـان زانـی ئـەوە بـەردەوام دەبـێ‌و توانـاو دەسـەڵاتیان هەیـە بەسـەریدا، لەبـەر ڕاوەسـتانی تواناکانیـان لـەو ئاسـتەدا، وە کۆتایـی داواکاریەکانیـان لـەوێ دایـە.

جـا لەوکاتـەی ئـەوان لـەم حاڵەتـە دان ﴿ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارًا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِ ﴾ واتـە: وەک ئـەوەی هـەر نەبـوو بـێ، ئەمـە حاڵەتـی دونیایـە، یـەک بـە یـەک (لای نـەداوە)، ﴿ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾ واتـە: ڕوونـی دەکەینـەوەو ئاشـکرای دەکەیـن، بـە نزیـک کردنـەوەی مانـاکان بـۆ لای بیـرو هۆشـەکان، ﴿ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ واتـە: بیـرو هۆشـیان لـەوەدا بـەکار دەهێنـن کـە سـوودی هەیـە بۆیـان، بـەڵام ئـەو کەسـەی غافـڵو بێئاگایـەو پشـتگوێی دەخـات، ئـەوە بێگومـان ئایـەتو نیشـانەکان سـوودیان بـۆی نیـە، هیـچ ڕوونکردنەوەیەکیـش گومـانو دوو دڵیـان لانابـات، کاتـێ خـوا ﷻ باسـی حاڵەتـی دونیـاو خۆشـیەکانی کـرد، تیشـکی خسـتە سـەر ماڵـی مانـەوە کـە بەهەشـتەو، فەرمـووی:

(٢٥-٢٦): ﴿ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٢٥ لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ وَلَا يَرۡهَقُ وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ وَلَا ذِلَّةٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٦ ﴾: خـوا ﷻ بـە گشـتی بانگـی بەندەکانـی دەکاتو هانیـان دەدات بـۆ ماڵـی ئاشـتی کـە بەهەشـتە، وە تایبەتـی کـردوە بـە هیدایـەتو ڕێنمایـی بـۆ هـەر کەسـێ خـۆی بیـەوێ پـاکو پاڵفتـەی بکاتـەوەو هەڵیبژێـرێ، ئەمـە فـەزڵو چاکەی خوایـە، خـواش ڕەحمەتی خـۆی تایبـەت دەکات بـۆ هـەر کەسـێ کـە بیـەوێ، ئەویـش بـە دادپـەروەریو حیکمـەتو دانایـی خـۆی دەبـێ، هیـچ کەسـێ بەڵگـەی لەسـەر خـوا ﷻ نیـە، لـە پـاش ئاشـکرا کـردنو هاتنـی پێغەمبـەران. وە خـوا ﷻ نـاوی بەهەشـتی نـاوە بـە ماڵی ئاشـتی (دار السـلام) چونکـە سـەلامەتە لـە هەمـوو ئافـەتو ناتەواویـەک، ئەویـش بـە هـۆی تـەواوی نـازو نیعمەتەکانیـەوەو مانـەوەی بـۆ هەتـا هەتایـی، وە چاکـی لـە هەمـوو ڕوویەکـەوە.

لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ
وَلَا ذِلَّةٌ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٦﴾ وَالَّذِينَ
كَسَبُوا السَّيِّئَاتِ جَزَاءُ سَيِّئَةٍ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ مَّا لَهُم
مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ اللَّيْلِ
مُظْلِمًا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ
جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُوا مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَاؤُكُمْ فَزَيَّلْنَا
بَيْنَهُمْ وَقَالَ شُرَكَاؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِاللَّهِ
شَهِيدًا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَافِلِينَ ﴿٢٩﴾
هُنَالِكَ تَبْلُو كُلُّ نَفْسٍ مَّا أَسْلَفَتْ وَرُدُّوا إِلَى اللَّهِ مَوْلَاهُمُ
الْحَقِّ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٣٠﴾ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ
السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ
الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ
فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمُ
الْحَقُّ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ
حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ فَسَقُوا أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾

کاتێ خوا ﷻ بانگ دەکات بۆ ماڵی ئاشتی، وەکو ئەوە وایە نەفس‌و دەروونەکان حەزوو ئارەزوویان بۆ ئەو کردەوانە بجوڵێت کە دەبنە مایەی ئەوەی بیانگەیەنێت بەو ماڵە، خوا هەواڵی داوە دەربارەی فەرموویەتی: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾ واتە: ئەوانەی چاکەیان کردوە لە بەندایەتی کردنی پەروەردگاردا، بەوەی بەندایەتی بۆ بکەن‌و وا هەست بکەن چاودێرە بەسەریانەوە، وە هەستن بەوەی کە لە توانایاندا هەیە، چاکەخواز بن بۆ بەندەکانی خوا ﷻ بە پێی توانایان لە چاکەی گوفتاریی‌و کرداریی، وە لە چاکە کردن بە بەخشینی ماڵ‌و دارایی، وە چاکە بە ئەندامەکانی جەستەو فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپەو فێر کردنی نەفامەکان‌و ئامۆژگاری پشت هەڵکەران، غەیری ئەوانیش لە شێوەکانی چاکەخوازی.

ئا ئەوانەی چاکەخواز بوون، بۆیان هەیە ﴿الْحُسْنَىٰ﴾ ئەویش بەهەشتە کە لە جوانیدا زۆر کامڵ‌و تەواوە ﴿وَزِيَادَةٌ﴾ ئەویش تەماشا کردنی ڕووخساری خوایە ﷻ، وە گوێگرتن لە قسەکانی‌و سەرکەوتنە بە ڕەزامەندیی‌و ڕووناکی‌و دڵخۆشیە بە نزیک بوون لێیەوە، ئا بەمە بۆیان دەستەبەر دەبێ بەرزترینی ئەو شتانەی کە ئاواتی بۆ دەخوازن ئاواتی پێدەخوازن‌و پرسیار کارانیش پرسیاری دەکەن.

پاشان باسی دوورخستنەوەی ئەو شتانەی کرد کە هەڕەشەیان لەسەرە، فەرمووی: ﴿وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌ﴾ (واتە: هیچ ڕەشی‌و تەپ‌و تۆزێکی ڕیسوایی دەم‌و چاویان داناگرێ) تووشی هیچ ناخۆشیەک نابن بە جۆرێ لە جۆرەکان، چونکە ناخۆشی ئەگەر ڕوو بکاتە مرۆڤ لە ڕوومەتیدا دەردەکەوێ‌و ڕووخساری دەگۆڕێ.

بەڵام ئەوانە وەک خوا دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿تَعْرِفُ فِي وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ النَّعِيمِ ﴿٢٤﴾﴾ المطففين. (واتە: لە ڕووخساریاندا جوانی‌و گەشاوەیی‌و خۆشگوزرانی دەبینیت).

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ ﴾ کـە بە هەمیشـەیی تێیدانو پێیەوە پەیوەسـتن ﴿ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ نـە دەگوازرێنـەوەو نە لـە ناویش دەچنو نـە دەگۆڕێن.

(٢٧): ﴿ وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثۡلِهَا وَتَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۖ كَأَنَّمَآ أُغۡشِيَتۡ وُجُوهُهُمۡ قِطَعٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مُظۡلِمًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٧ ﴾:

﴿ وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾ خـوا ﷻ کاتێ باسـی خەڵکی ناو بەهەشـتی کرد، باسـی خەڵکی نـاو دۆزەخیشـی کرد، باسـی ئـەوەی کرد ئـەو دەسـتکەوتانەی لە دونیـادا بە دەسـتیان هێناوە بریتیـە لـەو کـردەوە خراپانـەی کـە مایـەی توورەیـی خـوا بـوون، لـە جۆرەهـا کوفـرو بە درۆدانانو جۆرەها سـەرپێچی کـردن، ﴿ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثۡلِهَا ﴾، (واتە: سـزای هەر خراپەیەک، خراپەیەکـی وەک خۆیەتـی)، واتـە: سـزایەکی زیانبەخشـیان بـۆ هەیـە بەپێـی ئـەو کردەوە خراپەیـان ئەنجامیـان داوە، هـەر کەس بـە پێی بارودۆخـی خۆی ﴿ وَتَرۡهَقُهُمۡ ﴾، واتـە: دایان دەپۆشـێ ﴿ ذِلَّةٞ ﴾ ڕیسـوایی لـە دڵەکانیانو ترسـان لە سـزای خـوا ﷻ، هیچ کـەس ناتوانێ ڕێگـری لەو سـزایە بـکات، وە هیـچ پارێزەرێکیان نیـە بیانپارێزێ، ئـەو ڕیسـواییو زەلیلیەی لـە ناخیاندایە کاریگەری دەکاتە سـەر ڕووخسـارو جەسـتەیان بە ئاشـکرا تـا ڕوومەتیان ڕەش دەبێتەوە.

﴿ كَأَنَّمَآ أُغۡشِيَتۡ وُجُوهُهُمۡ قِطَعٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مُظۡلِمًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ (واتـە: بـە ڕادەیـەک ڕوویـان ڕەش بـووە دەڵێـی دەمووچاویـان داپۆشـراوە بە شـەوە زەنـگ، ئەوانە هاوڕێـی دۆزەخـن، تیایـدا دەمێننـەوە بە هەمیشـەیی) چەنـد جیـاوازی هەیە لە نێـوان ئەو دوو کۆمەڵـەدا، ئـای چەنـدە دوورە نێوانی ئـەو دوو کۆمەڵە؟!

خـوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ٢٣ وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذِۭ بَاسِرَةٞ ٢٤ تَظُنُّ أَن يُفۡعَلَ بِهَا فَاقِرَةٞ ٢٥ ﴾ القیامـة، (واتـە: زۆر ڕووخسـار لـەو ڕۆژەدا گەشـاوەن * تەماشـای پەروەردگاریـان دەکـەن * زۆر ڕووخسـاریش لـەو ڕۆژەدا گـرژوو تاڵن * دەزانن کە سـزای پشـت شـکێن دەدرێـن)، (وە دەفەرمـوێ:) ﴿ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ ٣٨ ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ ٣٩ وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ ٤٠ تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ ٤١ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ ٤٢ ﴾ عبس. (واتە: زۆر ڕووخسـار لەو ڕۆژەدا گـەشو جوانـن * دەم بـە پێکەنیـنو شـادمانن * وە زۆر ڕووخسـاریش لـەو ڕۆژەدا تـەپو تۆزیـان بـە سـەرەوەیە * لـە داماویـدا ڕەش داگیرسـاون * ئەوانەن کـە بێبـڕواو گوناهکارو تاوانبارن).

(٢٨-٣٠): ﴿ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ مَكَانَكُمۡ أَنتُمۡ وَشُرَكَآؤُكُمۡۚ فَزَيَّلۡنَا بَيۡنَهُمۡۖ

وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ
لَغَٰفِلِينَ ﴿٢٩﴾ هُنَالِكَ تَبْلُواْ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ وَرُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا
كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ﴾ (واتە: هەموو دروستکراوەکان کۆدەکرێنەوە بۆ کاتو ساتو ڕۆژێکی دیاری کراو)، وە بتپەرستانیش ئامادە دەکەین، وە ئەوانەشی پەرستوویانە لە غەیری خوا ﷻ، ﴿ ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُواْ مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْ ﴾ (واتە: ئنجا بەوانە دەڵێین کە هاوبەشیان بۆ خوا ﷻ بڕیار داوە) پابەند بن بە شوێنی خۆتانەوە هەتا دادوەری لە نێوانتاندا بکرێ، ﴿ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْ ﴾ واتە: لە یەکدیان جیادەکەینەوە بە دوورخستنەوەی جەستەو دڵ، دژمنایەتیەکی توند لە نێوانیاندا بەرپا دەبێ، پاش ئەوەی لە دنیادا دڵسۆزیو خۆشەویستیو دۆستایەتیان بۆ یەکتر دەربڕیوە، جا ئەو هەموو خۆشەویستیو پشتیوانیە هەڵدەگەڕێتەوەو دەبێتە ڕقو کینەو دوژمنایەتی، وە پەرستراوەکانیان خۆیان بەری دەکەن لێیانو دەڵێن: ﴿ مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴾ ئێمە خوا بە پاکو بێگەرد دادەنێین، دوور لە هەموو شەریک یان بتێک ﴿ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَٰفِلِينَ ﴾ (واتە: خوا ﷻ بەسە بە شایەت لە نێوانی ئێمەو ئێوەدا، بێگومان ئێمە بێئاگا بووین لە بەندایەتی کردنتان بۆ ئێمە)، ئێمە فەرمانمان بە ئێوە نەکردوە، وە بانگیشمان نەکردوون، بەڵکو ئێوە بەندایەتی ئەو کەسەتان کرد کە بانگی کردن بۆ لای، ئەویش شەیتان بوو، هەروەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُواْ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ ﴾ (واتە: ئایا من پەیمانم لێ وەرنەگرتن ئەی نەوەکانی ئادەم! کەوا شەیتان نەپەرستن بێگومان ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی دیارو ئاشکرایە).

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ يَقُولُ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمْ كَانُواْ يَعْبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُواْ سُبْحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِم بَلْ كَانُواْ يَعْبُدُونَ ٱلْجِنَّ أَكْثَرُهُم بِهِم مُّؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ (واتە: وە ڕۆژێ خوا ﷻ هەموویان کۆدەکاتەوە پاشان بە فریشتەکان دەفەرموێ: ئایا ئەوانە لە دونیا ئێوەیان دەپەرست * فریشتەکان دەڵێن پاکو بێگەردی بۆ تۆ تەنها تۆ گەورەی ئێمەی نەک ئەوان، بەڵکو ئەوان جنۆکەیان دەپەرست زۆربەیان بڕوایان بە جنۆکە هەبوو)، بێگومان فریشتە بەڕێزەکانو پێغەمبەرانو دۆستو ئەولیاو هاوشێوەکانیان، لە ڕۆژی قیامەتدا خۆیان بەری دەکەن لەوانەی کە پەرستوویانن، خۆیان حاشا لەوە دەکەن کە ئەوان داوایان لێ کردبووبێت بیانپەرستن، وە ئەوان ڕاستگۆن لە وتەکانیاندا.

لـەو کاتەدا موشـریکەکان تووشـی پەشـێمانیو حەسـرەتێک دەبن کـەوا ناکرێت وەسـفو بـاس بکرێـت، هەروەهـا دەزانـن چیـان پێشخسـتووە لە کـردەوە خـراپو ناشـرینەکان، ئەو ڕۆژە بۆیـان دەردەکـەوێ کـە ئەوان درۆزنـن، بەڵکو ئـەوان درۆیان بە دەم خواوە هەڵبەسـتوە، هەمـوو ئـەو عیبادەتەی کـە کردیان وێـڵو ون بوون، پەرستراوەکانیشـیان پـەرشو بڵاو بوو، وە سـەرجەم هـۆکارو ئامرازەکانیـان لەتو پـەت بوون.

لـە بـەر ئەمـە فەرموویەتـی: ﴿ هُنَالِكَ ﴾ واتـە: لـەو ڕۆژەدا ﴿ تَبْلُوا۟ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ ﴾ (واتـە: هەمـوو کەسـێک چی پێش خستبێ بـۆی دەردەکەوێ) واتـە: بە دوای ئـەو کردەوەو دەسـتکەوتانە دەگـەڕێ کـە لـە دەسـتی چـووەو لێـی ون بـووە، بـە پێـی ئەوانەش پاداشـت وەردەگـرێ، جـا ئەگـەر چاکە بێ ئـەوە چاکە، وە ئەگـەر خراپەش بـێ خراپە، ﴿ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾ (واتـە: ئـەو پەرسـتراوانەی بۆ خۆیـان هەڵیان بەسـتووە لێیـان ون دەبێ)، لە قسـەکانیان کە دەیانوت: ئەوان لەسـەر هەقن، وە ئەوەیشـی دەیپەرسـتن لـە غەیری خوا ﷻ سـوودی هەیە بۆیـانو ڕێگریـان لێدەکات لە سـزا.

(٣١-٣٣): ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّ ۖ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓا۟ أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾:

﴿ قُلْ ﴾ واتـە: بەوانـە بڵـی: کـە هـاوەڵ بـۆ خـوا ﷻ دادەنێـن، شـتانێک کە خـوا بەڵگەی لەسـەر نەناردوونـە خـوار بـۆ ئەوەی بیکـەن بـە حوججـە بەسـەریانەوە، وە بـە دانپێدانانیان بە یەکتاپەرسـتی پەروەردگاریتیو نکوڵیکردنیان لە یەکتاپەرسـتی پەرسـتراوێتی: ﴿ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بـە دابەزینـی ڕزقو ڕۆزییـەکان لـە ئاسـمانەوە، وە دەرهێنانـی هەموو جۆرەکانـی لـە ناو زەوییـەوە، بە ئاسـان کردنـی هۆکارەکانـی تیایـدا؟ ﴿ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ ﴾، واتـە: ئـەو کەسـەی دروسـتی کـردوە تەنها ئـەو خاوەنێتـی؟ بە تایبەتی باسـی لـەو دووانـە کـردوە، وە بە تایبەت باسـی گـوێو چاوی کـردوە، لەبـەر ئاگـادار کردنەوەی فەزڵـی خـوا ﷻ بەسـەر مرۆڤەکانەوە، وە لەبەر شـەرەفو ڕێزو سـوودی ئـەو دووانە، ﴿ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ ﴾، وەک دەرهێنانـی جۆرەهـا دارو درەخـت لـە تـۆو، وە بـڕوادار لـە بێبـڕوا، وە باڵندە لـە هێلکـە، وە نموونەی ئەوانـە، ﴿ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ﴾ پێچەوانـەی ئەوانـەی باسـکرا، ﴿ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴾ (واتـە: کـێ کارەکان هەڵدەسـووڕێنێ) لە

جیهانـی سـەروو خواروو، ئەمـە هەموو جۆرەکانـی بەڕێوەبردنـی پەرسـتراوێتی دەگرێتەوە، بە ڕاسـتی تـۆ ئەگەر پرسـیاریان لێ بکـەی دەربارەی ئـەوەی کـێ پەروەردگارتانە، ﴿ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ﴾(یەکسـەر دەڵێـن: خـوا) چونکـە ئـەوان دان بـە هەمـوو ئەوانـەدا دەنێن، کـە بێگومان خـوا شـەریک‌و هاوەڵـی نیە لـە هیچ شـتێک لەوانـەدا، ﴿ فَقُلْ ﴾واتە: پێیـان بڵـێ‌و بەڵگەیان لەسـەر پێویسـت بکە، ﴿ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾(ئایـا پارێز ناکەن) بـۆ ئەوەی بە دڵسـۆزی بەندایەتی خـوا بکـەن‌و هاوەڵـی بـۆ دانەنێـن، وە خۆتـان دابڕنـن لە هەمـوو ئەو بـت‌و شـەریکانەی کە پەرسـتوتانن، ﴿ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ﴾هـەر ئەو خوایەی وەسـفی خۆی کردوە، ئەو پەرسـتراوی سـتایش کـراوە، پەروەردەکـەری هەمـوو بەدیهێنراوەکانـە بـە هەموو نـازو نیعمەتـەکان، وە هـەر ئـەو: ﴿ ٱلْحَقُّ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ﴾(واتـە: ڕاسـتە، دەی لە پاش ڕاسـتی جگە لە گومڕایـی هیچی دیکـە هەیە)؟!

بێگومـان خـوا ﷻ تـاک‌و تەنهایـە لـە دروسـتکردن‌و هەڵسـووڕانی هەمـوو شـتەکاندا، هەر نازونیعمەتێـک لـەلای بەنـدەکان هەبـێ تەنها لەلایەن خـواوە (پێیانـدراوە)، وە کـەس ناتوانێ چاکـە بهێنـێ جگـە لـەو، وە کەسـیش ناتوانـێ ڕێگـری لـە خراپـە بـکات تەنها ئـەو نەبێ، خاوەنـی نـاوە جـوان‌و سـیفاتە بەرزەکانە.

﴿ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴾(واتـە: دەی چـۆن لـە ڕێگەی ڕاسـت لادەدرێـن)، لـە بەندایەتی کردنی ئـەو خوایـەی ئەمە وەسـفێتی، بـۆ لای بەندایەتـی کردنی کەسـێ جگە لە بوونـی خۆی هیچی تـر نیـە، وە دەسـەڵاتی بەسـەر نەفـس‌و دەروونـی خۆیدا نیە نـە بە چاکـەو نە بە زیـان‌و نە بە مـردن‌و ژیـان‌و زیندووکردنـەوە، تەنانەت بە قـەد مسـقاڵە زەرەکیش موڵک‌و دەسـەڵاتی نیە، هـاوەڵ‌و هاوبەشـی نیە لـە هیچ ڕووێک لـە ڕووەکانەوە، کەس شـەفاعەت نـاکات لە لای خوا تەنها بـە مۆڵەتی ئـەو نەبێ.

تووڕەیی‌و شەرمەزاری بۆ ئەو کەسەی هاوەڵی بۆ دادەنێ، قوڕ بەسەر ئەو کەسەی کوفری پێدەکات، بە ڕاستی عەقڵیان لە دەستدا پاش ئەوەی دینەکانیشیان لە دەستدا، بەڵکو دنیاو دوارۆژیشیان لە دەست چوو، بۆیە خوا ﷻ دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓاْ أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ (واتە: بەو جۆرە چەسپاوە بڕیاری پەروەردگارت لەسەر ئەوانەی لە سنوور لایانداوە کە بێگومان ئەوانە بڕوا ناهێنن)، دوای ئەوەی خوا ﷻ ئایەتی ڕوون‌و بەڵگە ئاشکراکانیان نیشان دەدات، کە پەندی تێدایە بۆ ئەوانەی کە خاوەن ژیری‌و عەقڵ‌و هۆشن، وە ئامۆژگاریشە بۆ ئەوانەی لە خوا دەترسن، وە ڕێنماییە بۆ جیهانییان.


قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟
ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ
إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن
يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾
وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ
إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ
مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ
لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟
بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ
﴿٣٨﴾ بَلْ كَذَّبُوا۟ بِمَا لَمْ يُحِيطُوا۟ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ
كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾
وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ
بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّى عَمَلِى وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ ۖ أَنتُم
بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾ وَمِنْهُم مَّن
يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾

(٣٤-٣٦): ﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾﴾:
خوا ﷻ دەفەرمووێ: بۆ ئەوەی بێتوانایی پەرستراوەکانی بتپەرستان ڕوون بکاتەوە، ئەوانە هەڵگری ئەو سیفەتانە نین کە پێویست بکرێن بە پەرستراو لەگەڵ خوادا: ﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ﴾ واتە: بێ بناغە دروستی بکاتو بەدیبهێنێ ﴿ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ (واتە: پاشان دوای تیاچوونی وەکو خۆی لێ بکاتەوە).
ئەمەش شێوازی پرسیارە (إستفهام) بە مانای (النفي والتقرير) دێت، واتە: هیچ یەکێک نیە لەو پەرستراوانە لە نەبوونەوە شت دروست بکات بەدی بهێنێو، پاشان دوای تیاچوونی وەکو خۆی دروستی بکاتەوە، بە ڕاستی ئەوانە زۆر لەو لاوازترو بێتواناترن.
﴿قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ﴾ بێ هاوەڵو هاوبەشو یاریدەدەرێک بۆ ئەو مەبەستە، ﴿فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾ واتە: (دەسا چۆن لە خوا پەرستی بەرێوە دەبرێن لا دەدرێن لە پەرستشی خوای تاک تەنها کە لە سەرەتاوە بەدیهێناونو دووبارەش دروستتان دەکاتەوە، بۆ لای پەرستنی ئەوەی هیچ شتێکی دروست نەکردووەو خۆشی دروستکراوە، ﴿قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ﴾ (واتە: بڵێ: ئایا لە ناو پەرستراوەکانتاندا کەسێ هەیە ڕێنمایی بکات)، بە ڕوونکردنەوەو ڕێنیشاندانی، یاخود بە خورپەی دڵو سەرخستنی.
﴿قُلِ ٱللَّهُ﴾ (بڵێ:) بە تەنها خوا، ﴿يَهْدِى لِلْحَقِّ﴾ (هیدایەت دەدات بۆ هەق) بە دەلیلو بەڵگەکانو بە خورپەی دڵو سەرخستن، وە یارمەتیدان بۆ گرتنە بەری چاکترین ڕێگا.
﴿أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ﴾ (واتە: جا ئایا کەسێ کە ڕێنمایی دەکات بۆ ڕاستە

ڕێ شایەنترە بەوەی پەیڕەو بکرێ)، ﴿ أَمَّن لَّا يَهِدِّيٓ ﴾ واتە: (یان کەسێ ڕێبازی ڕاست شارەزا نەبێ) ڕێگای ڕاست نادۆزێتەوە، ﴿ إِلَّآ أَن يُهۡدَىٰ ﴾ (واتە: مەگەر ڕێی پێنیشان بدرێ) بە هۆی نەبوونی زانستو بە هۆی گومڕاییەوە، ئەمانەش موشریکو هاوەڵەکانیانن، کەوا نە هیدایەت ئەدەنو نە هیدایەتیش وەردەگرن، مەگەر شارەزا بکرێن.

﴿ فَمَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ ﴾ واتە: چ شتێک وای لێ کردن ئەم حوکمو بڕیارە ناپەسندە بدەن، پاش دەرکەوتنی بەڵگەو حوججەو سەلماندن، بێگومان ئەو بتانە ئەو شایستەی پەرستش نین، تەنها خوای تاکو تەنها نەبێ؟! جا ئەگەر ڕوون بوویەوەو دەرکەوت ئەو پەرستراوانەی ئەوان هیچ وەسفێکی پەرستراوی لەخۆ ناگرن، نە لە ڕووی مەعنەوییەوەو نە لە ڕووی کرداریشەوە، شایستەی ئەوە بن بپەرسترێن لەگەڵ خوادا، بەڵکو وەسفکراون بە ناتەواوی، کە بەتاڵیو پووچی پەرستراویان پێویست دەکات، جا لەبەر چی لەگەڵ خوادا کراون بە پەرستراو؟

وەلاّم: بە ڕاستی ئەمە لە جوانکاریەکانی شەیتانە بۆ مرۆڤو خراپترین بوختانو گومڕاترینی گومڕاییەکانە، هەتا وای لێکردوە ئالوودە بووە پێیەوەو واگومانی بردووە ئەوە هەقو ڕاستەو لەگەڵ ئەوەشدا هیچ نیە، بۆیە فەرموویەتی:

﴿ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ ﴿٦٦﴾ ﴾یونس. (واتە: پەیڕەویان نەکردوە ئەوانەی جگە لە خوا دەپەرستن هاوبەشانێ بۆ خوا) ئەوەی شوێنی کەوتوون لە ڕاستیدا هاوەڵ دانانە بۆ خوا، بە ڕاستی خوا شەریکی نیە، نە بە عەقڵو، نە بە نەقڵ، بەڵکو ئەوان شوێنی گومان کەوتوون، وە ﴿ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغۡنِي مِنَ ٱلۡحَقِّ شَيۡـًٔا ﴾ (واتە: بە ڕاستی گومانیش لە ئاستی هەقدا هیچ سوودێک بە خاوەنەکەی ناگەیەنێ)، جا ناویان لێنان بە پەرستراو لەگەڵ خوادا دەیانپەرستن.

(لە شوێنی دیکەدا) خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنۡ هِيَ إِلَّآ أَسۡمَآءٞ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍ ﴿٢٣﴾ ﴾النجم. (واتە: ئەم بتانە هەر ناوانێکی ڕووتن کە ئێوەو باوکو باپیرانتان لێتان ناون، خوا هیچ بەڵگەیەکی لەسەر پەرستراوێتی ئەوان نەناردوەتە خوارەوە).

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَفۡعَلُونَ ﴾ (واتە: خوا زانایە بەو کردەوانەی کە دەیکەن) وە پاداشتیان دەداتەوە لەسەر ئەو بتپەرستیو هاوەڵدانانەیان بە سزایەکی توندوو بە ئێش.

(٣٧-٤١): ﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ أَن يُفۡتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَتَفۡصِيلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ

وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ بَلۡ كَذَّبُواْ بِمَا لَمۡ يُحِيطُواْ بِعِلۡمِهِۦ وَلَمَّا يَأۡتِهِمۡ
تَأۡوِيلُهُۥۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾ وَمِنۡهُم مَّن
يُؤۡمِنُ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن لَّا يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَرَبُّكَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٤٠﴾ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّي عَمَلِي
وَلَكُمۡ عَمَلُكُمۡۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعۡمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٤١﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ أَن يُفۡتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ واتە: ناگونجێو نابێ، ئەم قورئانە هەڵبەسترابێ لە لایەن کەسێکەوە لە غەیری خوا، چونکە کتێبێکی مەزنە کە: ﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴿٤٢﴾ ﴾فصلت. (واتە: بەتاڵ ڕووی لێ ناکات نە لە ئێستاو نە لە دوارۆژدا، چونکە نێردراوەتە خوارەوە لە لایەن خوای کاردروستی ستایش کراوەوە).

قورئان ئەو کتێبەیە کە هەموو ئادەمیزادو جنۆکەکان کۆببنەوە بۆ ئەوەی وێنەی بێنن ناتوانن وێنەی ئەو بێنن، ئەگەر چی هەندێکیان پشتیوانی یەکتریش بن.

ئەوە کتێبی خوایە کە قسەی خۆی پێکردوە، چۆن یەکێک لە بەدیهێنراوەکان دەتوانی وێنەی ئەو قسە بکات، یان هەر نزیکیشی بکاتەوە، قسە کردن شوێنی مەزنیو وەسفی قسەکەر دەکەوێ.

جا ئەگەر هەر کەسێک لە خوا بچێت لە مەزنیو وەسفو تەواوێتیدا، دەگونجێ هاوشێوەی ئەم قورئانە بهێنێتەوە، ئەگەر گریمانە بکەینو وایدابنێین کەسێ لە خودی خۆیەوە هەڵیبەستبێ لەسەر خوا، ئەوە بێگومان سزای بۆ پێش دەخاتو تۆڵەی لێدەکاتەوە ﴿ وَلَٰكِن ﴾ بەڵکو خوا ئەم کتێبەی دابەزاندووە وەکو بەزەییەک بۆ جیهانیانو بەڵگەو حوجەیەک لەسەر بەندەکانی بە گشتی، دایبەزاندوە، ﴿ تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ ﴾ (بە ڕاست دانەری) کتێبە ئاسمانیەکانە، بەوەی ڕێکی ئەو کتێبانەیەو شایەتیان بۆ دەدات، وە مژدە دەدات بە دابەزینی، چۆن هەواڵی داوە هەر بەو جۆرە دەبێ.

﴿ وَتَفۡصِيلَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ (واتە: ڕوونکردنەوەی هەموو کتێبە ئاسمانیەکانە) بۆ حەڵاڵو حەرام، وە بریارو ئەحکامی دینیو قەدەرىو هەواڵە ڕاستو دروستەکان، ﴿ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ هیچ گومانو دوو دڵیەکی تێدانیە لە هیچ ڕوویەکەوە، بەڵکو ئەو قورئانە هەقەو سەلمێنراوە: لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە دابەزێنراوە کە بە نازو نیعمەتەکانی هەموو دروست کراوەکانی پەروەردە کردوە.

لە مەزنترینی جۆرەکانی پەروەردە کردنی ئەوەیە کە ئەم کتێبە مەزنەی دابەزاندووەو بەرژەوەندی دینو دونیایانی تێدایە، هەموو ڕەوشتە بەرزو کردەوە چاکەکان لەخۆ دەگرێ.

﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ﴾ واتــە: بــە درۆ دانەران بە هۆی عینــادیو گومڕاییانــەوە دەڵێن: ﴿ ٱفۡتَرَىٰهُ ﴾ موحەممــەد ﷺ هەڵیبەســتووە لەســەر خــوا، وە خــۆی دروســتی کــردوە، ﴿ قُلۡ ﴾ پێیــان بڵــێ: -بەیوەســتیان بکــە بــە شــتێکەوە ئەگەر ئــەوان توانایــان بوو لەســەری، ئــەوە دەکرێ بانگەشــەی ئــەوەش بکــەن، ئەگەرنــا قســەکەیان پــووچو بەتاڵــە-: ﴿ فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، (واتــە: ســوورەتێک بهێنــن، وەکــو ئــەو قورئانــە هــەر کەســێک کە دەتوانــن بانگــی بکەن، جگــە لە خــوا ئەگەر ئێوە ڕاســت دەکــەن)، یارمەتیتــان بــدات بۆ هێنانــی ســوورەتێک، ئەمەش مەحاڵــە، ئەگــەر ببووایە ئەوە تواناکانیــان لەســەر هێنانــی دەخســتە کارو وێنەی ئــەو قورئانەیــان دەهێنا.

بــەڵام کاتــێ بێتوانایــی خۆیان بۆ دەرکــەوت، ڕوون بوویەوە ئــەوەی کە دەیڵێــن باتڵەو هەر قســەیە، هیــچ بەڵگەیەکــی لەســەر نیــە، ئەوەیشــی وای لێکــردن قورئــان بــە درۆ دابنێن کە هــەقو ڕاســتی لــە خۆ گرتووەو هیــچ هەقێک نیە لە ســەرووی ئــەوەوە بێ، بێگومــان ئەوان زانیاریــان نەبــووە دەربــارەی قورئــانو لێــی تــێ نەگەیشــتوون، ئەگــەر زانســتو زانیاریان هەبووایــە دەربــارەیو بــە جوانی لێــی تێبگەیشــتبان، ملکەچی دەبــوونو بە ڕاســتیان دادەنا.

بــە هەمان شــێوە تا ئێســتا ئەنجامــی هەڕەشــەکانی قورئانیان بۆ نەهاتــووە کە بەڵێنــی پێداون ســزایان بــۆ حەڵاڵ بــکات، ئەم بــە درۆ دانانەی کــە لەلایەن ئەوانــەوە دەرچــووە، لە هەمان جــۆری بــە درۆدانانی پێشــینی خۆیان بــووە، لەبــەر ئەمە فەرموویەتــی: ﴿ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ئەویــش ئــەو لــە ناوچوونە بــوو کە هیچ کەســێکیان لێ بەجــێ نەما.

جــا بــا ئاگــادار بــن ئەوانــەی بەردەوامــن لەســەر بــە درۆدانانەکانیان، خــوا ســزایان بدات، وەکــو چــۆن ســزای گەلەکانــی پێــش وانــی داوە، وە ئــەو سەدانەشــی کــە لــە ناوچوون.

ئــەم دەقــەش بەڵگەیــە لەســەر جێگیــر بــوون لــە کاروکردەوەکانــدا، کــە بــە ڕاســتی نابێ مــرۆڤ شــتێک وەربگــرێ، یــان ڕەتــی بکاتــەوە پێش ئــەوەی زانیــاری دەربــارەی هەبێ، ﴿ وَمِنۡهُم مَّن يُؤۡمِنُ بِهِۦ ﴾ واتــە: (لــەو خەڵکــەدا هــی وا هەیــە) بــڕوا بــە قورئــان دێنــێ، ﴿ وَمِنۡهُم مَّن لَّا يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَرَبُّكَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾ واتە: (هەیشــیانە بــڕوای پێناهێنێو لەســەر کوفــری خــۆی ســوور دەبــێ، وە پەروەردگــارت لــە هەمــوو کــەس باشــتر حاڵی خراپــەکاران دەزانێــت)، خراپــەکاران ئەو کەســانەن کە بڕوا بــە قورئان ناهێنن، بە شــێوەی عینــادیو ســتەمو خراپەکاریی، خــوای گەورەش ســزایان دەدا لەســەر ئــەو خراپەکاریەیان

بـە توونڎترین شـێوە، ﴿ وَإِن كَذَّبُوكَ ﴾ (واتـە: ئەگەر بڕوایـان پێنەکردی) تـۆ بەردەوامبە لەسـەر بانگەوازەکـەت، حیسـابو لێپرسـینەوەی ئـەوان لەسـەر تـۆ نیـە، بـە هەمان شـێوە حیسـابو لێپرسـینەوەی تـۆش لەسـەر ئـەوان نیـە، هەریەکەو بـە پێی کـردەوەی خۆی.
﴿ فَقُل لِّي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ (واتـە: ئەوە پێیـان بڵـێ: پاداشـتی کـردەوەی خۆم بۆ خـۆم، وە پاداشـتی کـردەوەی خۆتان بـۆ خۆتان، ئێـوە بەریـن لەوەی مـن دەیکەم، منیـش بەریم لەوەی ئێـوە دەیکـەن). وەک چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ﴾ (واتـە: هـەر کەسـێک کـرداری چاکـە بـکات ئـەوە بـۆ خۆیەتیو هـەر کەسـێک خراپە بکات ئـەوە لەسـەر خۆیەتی).
(٤٢-٤٤): ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾ وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ ٱلنَّاسَ شَيْـًٔا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾:
خـوای بـەرزو مـەزن هـەواڵ دەدات دەربـارەی هەنـدێ لـە بـە درۆدانەرانـی پێغەمبـەر کاتـێ پەیامـی پیرۆزی بـۆ دابـەزی، ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ ﴾ (واتـە: هەندێکیـان گوێیان) بـۆ پێغەمبـەر ﷺ دەگـرت لە کاتـی خوێندنـی قورئانـدا، نەک بـۆ ئامۆژگـاری وەرگرتن، بەڵکـو بـۆ ئـەوەی بـە درۆی دابنێـنو هەڵەو پەڵـەی بدەنە پـاڵ، ئەمـە گـوێ گرتنێکی بێ سـوودە، خاوەنەکەشـی خێری لـێ نابینێ، بە ڕاسـتی ئەمانە دەرگای سـەرکەوتنیان بەسـەردا داخـراوەو، بـێ بەش بوون لە سـوودی گوێگرتـن، بۆیـە فەرموویەتی: ﴿ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ ئـەم پرسـیارە (إسـتفهام) بـە مانـای نەبوونـی بڕیـار لەسـەر دراوە (النفي المتقـرر) واتـە: تـۆ ناتوانـی خەڵکی کـەڕ ببیسـتێنی، ئەگەر چـی پڕ بـە دەم هاوار بکەیـت، بـە تایبـەت ئەگەر بـێ عەقـڵ بوون.
جـا ئەگەر ئەسـتەم بێ کـەڕو لاڵ ببیسـتێنیت، ئەوە ئەو بـە درۆدانەرانیش هـەر وەکو ئەوان وان، بیسـتنێک نابیستن سـوودی هەبێ بۆیان.
بـەڵام بیسـتنی بیانوو بڕیـنو پێویسـت کردنی بەڵگـەو حوججە لەسـەریان، ئـەوە بێگومان بیسـتنیانو بیانوویـان بڕاو بەڵگەو حوججەی خوایان لەسـەر پێویسـت بوو، ئەمـە ڕێگایەکی مەزنـە لـە ڕێگاکانـی زانسـت، بەحیقـەت لەسـەریان داخـرا، ئەوەیـش ڕێگاکانـی بیسـتنە پەیوەنـدی بـە هەواڵی خـواوە هەیە.

وَمِنۡهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيۡكَۚ أَفَأَنتَ تَهۡدِي ٱلۡعُمۡيَ وَلَوۡ كَانُواْ لَا يُبۡصِرُونَ
٤٣ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ ٱلنَّاسَ شَيۡـٔٗا وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمۡ
يَظۡلِمُونَ ٤٤ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ كَأَن لَّمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ مِّنَ ٱلنَّهَارِ
يَتَعَارَفُونَ بَيۡنَهُمۡۚ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ
مُهۡتَدِينَ ٤٥ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ
فَإِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ ٤٦ وَلِكُلِّ
أُمَّةٖ رَّسُولٞۖ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمۡ قُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِ وَهُمۡ
لَا يُظۡلَمُونَ ٤٧ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ
٤٨ قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي ضَرّٗا وَلَا نَفۡعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ لِكُلِّ أُمَّةٍ
أَجَلٌۚ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَلَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ٤٩
قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا أَوۡ نَهَارٗا مَّاذَا يَسۡتَعۡجِلُ مِنۡهُ
ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٥٠ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓۚ ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ كُنتُم بِهِۦ
تَسۡتَعۡجِلُونَ ٥١ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡخُلۡدِ
هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ٥٢ ۞وَيَسۡتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ
هُوَۖ قُلۡ إِي وَرَبِّيٓ إِنَّهُۥ لَحَقّٞۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ٥٣

بەڵام ڕێگای دووەم ئەویش ڕێگای بینینە، جا فەرموویەتی: ﴿ وَمِنۡهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيۡكَۚ ﴾ (واتە: تیایاندا هەیە تەنها تەماشای تۆ دەکات)، تەماشا کردنی هیچ سوودێکی نیە بۆی، وە لە حاڵەت ڕانامێنیو بیر ناکاتەوە، جا هەر وەکو چۆن تۆ ناتوانیێ ڕێنمایی کوێرەکان بکەیت، ئەگەر نابیناش بن، بە هەمان شێوە ناتوانی هیدایەتی ئەوانیش بدەیت. جا ئەگەر عەقڵو بیستنو بینینیان تێک چوو، کە ئەوە ڕێگایەکە بۆ گەیاندنی زانستو زانینی حەقیقەتەکان، جا ئیتر چ ڕێگایەک دەمێنێ بیانگەیەنێتە هەقو ڕاستی؟

وە وتەی خوا ﷻ: ﴿ وَمِنۡهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيۡكَۚ ﴾ بە تەماشا کردنی حاڵی پێغەمبەر ﷺو ڕێنمایيو ڕەوشتو کردەوەکانی، وە ئەوەیشی بانگەشەی بۆ دەکات لە مەزنترینی بەڵگەکانە لەسەر ڕاستگۆیی خۆیو ڕاستی ئەو پەیامەی هێناویەتی، مرۆڤی ژیرو عاقڵ ئەوەندەی بەسەو پێویستی بە بەڵگەی دیکە نیە.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ ٱلنَّاسَ شَيۡـٔٗا ﴾ خوا ﷻ تاوانەکانیان بۆ زیاد ناکات، چاکەکانیشیان بۆ کەم ناکاتەوە، ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلنَّاسَ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾ (واتە: بەڵکو خەڵکی خۆیان ستەم لە خۆیان دەکەن)، هەقو ڕاستیان بۆ دێت وەرناگرن، خوا ﷻ سزایان دەدات بەوەی مۆر دەدات بەسەر دڵو گوێو چاوەکانیاندا.

(٤٥): ﴿ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ كَأَن لَّمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ مِّنَ ٱلنَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيۡنَهُمۡۚ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ٤٥ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی خێرا بەسەرچوونی ژیانی دنیا، کاتێ خەڵکی کۆ دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا کە هیچ گومانێکی تێدا نیە، وەکو ئەوە وایە تەنها ساتێکی کەم لە ژیانی دنیادا مابێتنەوە، هەر ئەڵێ خۆشيو ناخۆشیان بەسەردا تێنەپەڕیوە، لە ناو

یەکتــردا یــەک دەناســنەوە وەکو چــۆن لە دنیــادا یەکتریان ناســیوە.
ئـا لـەم ڕۆژەدا پارێزکاران سـەرفراز دەبـن، ئەوانەی بڕوایـان نەهێناوە بە زینـدوو بوونەوەو دیـداری خـوا زەرەرمەنـد دەبـن، وە ڕێنماییشـیان وەرنەگرتووە بـۆ ڕێگای ڕاسـتو ئاینی بەهێـز، کاتـێ نـازو نیعمەتەکانیـان لە دەسـتداو شایسـتەی چوونە ناو ئاگـر بوون.
(٤٦): ﴿ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾ ﴾.
واتـە: خەمبـارو دڵگـران مەبە ئـەی پێغەمبەر ﷺ لەسـەر ئەو بـە درۆدانەرانـە، وە پەلەیان لێ مەکـە، ئـەوان هەر دەبێ تووشـیان بێ لەو سـزایەی کـە بەڵێنمـان پێداون.
جـا یـان لە دنیـادا بە چاوی خـۆت دەیبینیـتو دڵت پێـی ئۆقرە دەگـرێو ئاسـوودە دەبێ، یـان لـە دوارۆژدا پاش کۆچ کردنـت، بێگومـان گەڕانەوەیان تەنها بۆ لای خوایـە، هەواڵیان دەداتـێ لـەو کردەوانـەی کردوویانـە، خـوا نووسـیویەتیو ژماردوویەتـی ئـەوان بیریـان چـووە، خوایـش شـایەتە بەسـەر هەموو شـتێکدا، ئەم دەقـە هەڕەشـەی تێدایە بۆ ئـەوان، وە دڵدانەوەیشـی تێدایـە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ کـە گەلەکەی بـە درۆیـان دانـاو کەللەڕەقیان کرد (بەرانبەری).
(٤٧-٤٩): ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ قُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.
خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ ﴾ لـە ئوممـەتو گەلەکانـی پێشـوو، ﴿ رَّسُولٌ ﴾ (پێغەمبەرێـک هەبـووە) بانگـەوازی کردوون بـۆ یەکتاپەرسـتی خـواو ئاینەکەی، ﴿ فَإِذَا جَآءَ رَسُولُهُمْ ﴾ (واتـە: جـا ئەگـەر پێغەمبەرێکیـان بـۆ بهاتایە) بـە ئایـەتو بەڵگەکان، هەندێکیـان بـە ڕاسـتیان دەزانـیو هەندێکیشـیان بـە درۆی دەزانـی، خـوا ﷻ دادوەری لە نێوانیانـدا دەکـرد بـە ڕزگـار کردنـی بـڕواداران‌و لە نـاو بردنی بـە درۆ دانـەران، ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ (واتە: ئەوان سـتەمیان لێ نەدەکرا) بەوەی سـزا بدرێن پێش ناردنی پێغەمبەر ﷺ و ڕوونکردنـەوەی بەڵگـەو حوججـە، یـان سـزا بدرێـن بـە هـۆی گوناهـو تاوانـی غەیری خۆیـان، جا بـا ئاگاداربن ئەوانـەی بە درۆت دادەنێن لـەوەی خۆیان بشـوبهێنن بەو گەلانەی لـە ناوچـوون، چونکە تووشـیان دەبـێ وەکو چۆن تووشـی ئـەوان بوو.
بـا سـزاو تۆڵـەی خـوا ﷻ بـە دوورو نەزانـن‌و بڵێـن: ﴿ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾

(واتــە: باشــە ئەگــەر ئێــوە ڕاســت ئەکــەن قیامــەت دێــت، ئــەم بەڵێنــی هەڕەشــەیە کــەی جێبەجــێ دەبــێ) بە ڕاسـتی ئەمە زوڵمو سـتەمە لــە لایەن ئەوانــەوە، بەوەی داوای شـتێکیان لــە پێغەمبــەر ﷺ کــرد، ئــەو هیچی لــەو کاروبــارەدا نیــە، بەڵکو تەنهــا گەیاندنی ئاشــکراو ڕوونــی لەســەرە بــۆ خەڵکی.

بــەڵام حیســابو لێپرســینەوەیانو دابەزاندنــی ســزا بــۆ ســەریان، ئەوە لــە لایــەن خواوەیە، ســزایان بــۆ دادەبەزێنــێ ئەگەر ئەجــەلو ئاکامیان هــات، وە ئەو کاتەی دەستنیشــانی کردوە بۆیان، کــە گونجــاوە لەگەڵ حیکمەتــی پەرســتراوێتی خۆیدا.

جــا کە ئەجــەلو ئاکامیان هات ئیتــر ناتوانن تەنها ســاتێک دوا بکەون، وە پێشــیش ناکەون لــەو ماوەیــەی بۆیــان دیــاری کــراوە، بێگومــان ئــەوان پەلــە دەکــەن لە ســزای خــوا، کە ئەگــەر دابــەزێ، بۆ ســەر تاوانباران کەس نیــە بتوانــێ بیگێڕێتەوە، لەبەر ئەمــە فەرموویەتی:

(٥٠-٥٢): ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓ ۚ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾ ﴾.

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُهُۥ بَيَٰتًا ﴾ (واتــە: تــۆ بڵــێ (بەوانــە) پێم بڵێــن: ئەگــەر ســزای خواتان بــۆ هــات) (بیاتاً) کاتــی خەوتنتــان لە شــەودا ﴿ أَوْ نَهَارًا ﴾ (لــە ڕۆژدا) لــە کاتــی بێئاگایــیو غافــڵ بوونتــان ﴿ مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴾ واتە: ئایــا تاوانبــاران بــۆ چ مژدەیەکە پەلە دەکــەن، وە بۆ چ ســزایەک دەستپێشــخەری دەکەن؟!

﴿ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓ ﴾ (واتــە: ئایــا پاش ئــەوەی ڕووی داوە ئێوە بــڕوای پێدەهێنن) بــە ڕاســتی بڕواهێنــان ســوودی نابــێ کاتێ دادەبــەزێ، لــەو کاتی کــە وایانزانیــوە بڕوایان هێنــاوە بــە سەرزەنشــتەوە پێیــان دەوتــرێ: ﴿ ءَآلْـَٰٔنَ ﴾ (ئێســتا) بڕوادەهێنــن لــە حاڵەتــی تەنگانــەو لە نــاو چوونــدا؟ ﴿ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴾.

چونکــە نەریتو یاســای خــوا ﷻ بــەو جۆرەیە گلەیــی بەندەکانــی قبــووڵ دەکات، ئەگەر پێــش دابەزینــی ســزا گلەیــی لێبکــەن، بەڵام ئەگــەر ســزا دابــەزی بڕواهێنان ســوودی نابێ بــۆ خاوەنەکــەی، وەکــو چــۆن خــوا ﷻ فەرموویەتی دەربــارەی فیرعــەون کاتێ تووشــی خنــکان بــوو: ﴿ وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾یونس. (واتــە: ئنجــا نــەوەی ئیســرائیلمان لــە دەریاکــە (نیــل) پەڕانــدەوە، دوایــی

فیرعــەونو لەشــکرەکەی شــوێنیان کەوتن بۆ ســتەمو دەســتدرێژی کردن هەتــا ئەو کاتەی خەریــک بــوو فیرعەون بخنکێ ئەوســا وتی بــڕوام هێنا کە پەرســتراوێک نیــە جگە لەوەی کــە بڕوایــان پێ هێنــاوە نــەوەی ئیســرائیل، وە منیش لــە مســوڵمانانم)، ئنجا پێــی دەوترێ: ﴿ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ (واتــە: ئێســتا بــڕوا دێنیت کە بێگومــان لــەوەو پێش ســەرپێچیت کــرد، وە تۆ لــە خراپــەکاران و تێکــدەران بوویت).

خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾ (واتــە: جــا بڕواهێنانەکەیــان هیــچ ســوودی نەبوو بۆیــان لە کاتێکدا ســزای ئێمەیان دی ســوننەتی خوا هەروا بووە پێشــتر لەگــەڵ بەندەکانیدا).

وە لێــرەدا فەرموویەتــی: ﴿ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ ءَامَنتُم بِهِۦٓ ﴾ (واتــە: ئایــا پــاش ئــەوەی روویداو بەدیهــات ئێــوە بــڕوای پێدێنــن)، کــە بانگەشــەی بڕواهێنــان دەکــەن، ﴿ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴾؟! ئەمــە بەرهەمــی کردەوەکانــی خۆتانــە، وە ئەمــە ئەوەیــە کە پەلەتــان تێدا دەکرد.

﴿ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ﴾ کاتــێ پاداشــتی کردەوەکانیــان پــێ دەدرێ لــە ڕۆژی دواییدا، ﴿ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ ﴾ واتە: ئەو ســزایەی بۆ هەمیشــەیی تێــدا دەمێننەوە، بۆ ســاتێکیش لە ســەرتان هەڵناگیــرێ، ﴿ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴾ بە بێبڕوایــیو بە درۆدانانو ســەرپێچی کردن.

وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ وَأَسَرُّوا۟
ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ وَهُمْ
لَا يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِنَّ
وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ
وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٥٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ
مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ
﴿٥٧﴾ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا
يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ
فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ۖ أَمْ عَلَى
ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ
يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ
لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦٠﴾ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ
وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ
فِيهِ ۚ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَا فِي
ٱلسَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾

(٥٤-٥٦): ﴿ وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ
إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ
﴿٥٣﴾ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي ٱلْأَرْضِ
لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟
ٱلْعَذَابَ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا
يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ
لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ
تُرْجَعُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾:

خـوا ﷻ بـه پێغەمبەرەکـەی دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَسْتَنۢبِـُٔونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ﴾ واتـە: بـە درۆدانـەران لێـت دەپرسـن بـە شـێوەی نکوڵـیو عینـادی کـردن، نـەک بـەو جـۆرەی بیانـەوێ ئامۆژگـاری لێوەربگرنو ڕێیـان پێ نیشـان بدات ﴿ أَحَقٌّ هُوَ ﴾ واتە: ئایا ڕاسـتە حەشـرو کۆکردنـەوەی بەندەکان،وە زیندوکردنەوەیـان دوای مردنیان، وە پاداشـت دانەوەی بەنـدەکان بەگوێرەی کردەوەکانیان، ئەگـەر خێربـێ بەخێـر، وە ئەگـەر شـەڕبێ بەشـەڕ.

﴿ قُلْ ﴾ پێیان بڵێ بە شـێوەی سـوێند خواردن لەسـەر ئەو ڕاسـتی کۆکردنـەوەی بەندەکان لـە ڕۆژی دواییدا، پشتبەسـت بە بەڵگـەی ڕوونو ئاشـکرا: ﴿ إِى وَرَبِّىٓ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ ﴾ (واتە: بەڵـێ سـوێند بـە پەروەردگـارم بێگومان ئەوە ڕاسـتە هیـچ گومـانو دوودڵیەکی تێـدا نیە) ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴾ (واتـە: ئێـوە ناتوانـن خۆتـان) لـە خـوا ڕزگـار بکـەن کـەوا زیندووتـان بکاتـەوە، هەروەکـو چـۆن سـەرەتا بەدیهێنـانو هیچ نەبـوون، بەهەمان شـێوە جارێکـی تر دروسـتان دەکاتـەوە بۆ ئـەوەی پاداشـتی کردەوەکانتـان بداتەوە.

﴿ وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ ﴾ (واتـە: لـە ڕۆژی دواییـدا ئەگەر هی هەرکەسـێک بێت کە سـتەمی کـردوە لە دنیـادا) بە کوفـرو سـەرپێچیو هەمـوو ﴿ مَا فِي ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ﴾ هەمـوو ئەوانـەی لەنـاو زەویدایـە لـە زێـڕو زیوو جگـە لەوانـەش، لـە بـری ڕزگاربوونی خـۆی بیبەخشـێ لـە سـزای خوا ﷻ هیـچ سـوودێکی بـۆی نابێـت، بەڵکو سـوودو زیانو

پاداشــتو ســزادانان لەســەر کــردەوە چــاکو خراپەکانــە، ﴿ وَأَسَرُّواْ ﴾ واتــە: ئەوانــەی ســتەمکارن ﴿ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلْعَذَابَ ﴾ پەشــیمان بوونەوە لەوەی پێشــیان خستبوو، ئنجا هاواریــان کرد لە حاڵێکــدا کاتی ڕزگاربوون نەمابــوو ﴿ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ﴾ واتە: دادپەروەریەکــی تــەواو و ڕاســتەقینە کــە هیــچ ســتەمێکی تێدا نیــە بەجۆرێ لــە جۆرەکان ﴿ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ دادوەریــان لــە نێوانــدا دەکات بــە دادپەروەریەکی ئاینــیو قــەدەری، وە لە داهاتوویەکی نزیکــدا دادوەریان لە نێواندا دەکا بە دادوەری پاداشــت دانەوە، لەبەرئەمە فەرموویەتــی: ﴿ أَلَآ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ هەر بەهۆی نەفامیانــەوە خۆیــان ئامــادە ناکەن بــۆ لیقاو دیــداری خوا ﷻ، بەڵکــو هەندێ جار بڕوایشــی پێناهێنــن، بێگومــان لەســەر ئەمە بەڵگــە گەلێکی یەک لــەدوای یەکی یەکلاکــەرەوەی زۆر هاتــووە بە نەقڵــیو بە عەقڵــی. ﴿ هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ﴾ واتە: خــوا کاربەڕێوەبەرە بــە ژیاندنو مرانــدن، بەهەمــوو جۆرەکانــی بەڕێوەبــردن، هیــچ شــەریکو هاوەڵی نیە لــەوەدا.﴿ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ (واتــە: بــۆلای ئــەو دەگەڕێنــەوە) لــە ڕۆژی دواییــدا، پاداشــتان دەداتەوە بە پێــی کردەوەکانتــان چاکەبێ یــان خراپە.

(٥٧-٥٨): ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ ﴾: خوا ﷻ بۆ ئەوەی هانی خەڵکی بدا لە ڕووکردنە ئەم کتێبە پیرۆزە بەباسکردنی وەسفە جوانو گرنگەکانی بۆ بەندەکان دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ واتە: ئامۆژگاریتان دەکاتو دەتانترسێنێ لەو کردەوانەی کە تووڕەیی خوا پێویست دەکاو دەبێتە مایەی سزاو تۆڵەی بۆتان، وە ئاگادارتان دەکاتەوە لێی بە ڕوونکردنەوەی شوێنەوارو خراپەکانی. ﴿ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ ﴾ ئەویش ئەو قورئانەیە، شیفای دڵەکان لە نەخۆشیەکانی ئارەزوو بازی کە ڕێگرن لە ملکەچی بۆ شەریعەت، وە نەخۆشیەکانی شوبهەو دوو دڵی کە زانستو دڵنیایی لەکەدار دەکەن، بەڕاستی ئەو قورئانە گەلێ ئامۆژگاری تێدایە، بێگومان ئەو قورئانە ئەوەندە ئامۆژگاریو هاندانو ترساندنو پەیمانو هەڕەشەکردنی تێدایە، کە ببێتە مایەی ئەوەی بەندە ئارەزوو ترس بەدەست بهێنێ، جا ئەگەر هاتوو ئارەزووی خێری تێدا هەبوو، وە ترسی لە شەڕوو خراپە هەبوو، بەهۆی دووبارەبوونەوەی لە قورئاندا ئارەزوو ترس گەشە دەکات، تاوای لێدێ داواکاریەکانی خوا ﷻ پێش دەخات بەسەر ویستو ئارەزووی نەفسدا، تاوای لێ دێ ئەوەی خوا ﷻ پێ خۆشەو پێی ڕازیە خۆشەویستتر دەبێ لە لای لە ئارەزوو شەهوەتی نەفسی.

وە بـە هەمان شـێوە ئەوەی تیایدایـە لە بەڵگەو سـەلماندنەکان کە خـوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە بـۆ بەندەکانـی بە چاکترین شـێوە کـە دەبێتە هـۆی لابردنی هەمـوو ئەو گومانـە خراپانەی کـە لادەرن لـە هـەقو ڕاسـتی، وە دڵ پێی دەگات بـە بەرزترین پلەی یەقیـنو دڵنیایی.

ئەگـەر چـاک بوویـەوە لـە نەخۆشـیەکەی،وە جۆرەهـا جـلو بەرگی سـەلامەتی پۆشـی، ئـەوە هەمـوو ئەندامانی جەسـتە شـوێنی دەکـەون، چونکـە بێگومـان چاک بوونی جەسـتە بـە چـاک بوونی دڵـە، وە خـراپ بوونیشـی بـە خراپیەتـی، ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ چونکـە ﴿وَهُدًى﴾ بریتیـە: لـە زانسـتی ڕاسـتەقینەو کردەوەپێکردنی.

﴿وَرَحْمَةٌ﴾بریتیـە: لـە بەدەسـتهێنانی خێرو چاکەو پاداشـتی بەپەلـەو لە داهاتـوودا، بۆئەو کەسـەی کە شـوێنی هیدایەت دەکـەوێ، جا (الهـدی) گەورەترین ئامرازوو کەرەسـتەیە،وە (رحمـة) تەواوترینـی مەبەسـتو حەزەکانـە، بـەڵام هیدایەتـی پـێ وەرناگـرێ وە نابێت بە ڕەحمـەت تەنهـا بۆ بـڕوادار نەبێ.

جـا ئەگـەر هیدایـەت بەدەسـت هاتـوو ڕەحمەتیـش لـە ئـەوەوە دروسـت بـوو ئـەوە خۆشـبەختیو سـەرفرازیو خۆشـیو سـەرکەوتن بەدەسـت دێت، لە بەرئەمەیە خوا فەرمانی کـردوە دڵخۆش بن بـەوە، وەکو فەرموویەتـی: ﴿قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ﴾ کە قورئانـی پیرۆزە، کە مەزنتریـنو نیعمـەتو منەتـە، وە فـەزڵو چاکەیەکـە خـوا ﷻ داویەتی بەسـەر بەندەکانیدا ﴿وَبِرَحْمَتِهِ﴾ئەویـش ئاینی ئیسـلامو ئیمانە، وە پەرستشـی خواو خۆشویسـتنێتی ﴿فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾لـە کـەلو پەلـی دونیـاو لـە زەتەکانی.

جا نیعمەتی ئاین کە پەیوەستە بە خۆشبەختی دنیاو دواڕۆژ، هیچ بەراورد کردنێکی لە نێوانیاندا نیە، چونکە هەموو ئەوانەی لە دنیادایە لە ماوەیەکی کەمو کورتدا دەڕواو نامێنێ.

بۆیـە خـوا ﷻ فەرمانـی کـردوە بە دڵخۆشـبوون بـە فـەزڵو میهرەبانی خـۆی، چونکە ئەوە وادەکات نەفـسو دەروون فـراوانو چـالاک بنو سـوپاسو ستایشـی خوای بـەرز بکەنو بەهێـز بـن، وە ببێتـە مایـەی هاندان بـەدوای زانسـتو ئیماندا، ئەم دڵخۆشـیە ستایشـکراوە، بـە پێچەوانـەی دڵخۆشـبوون بە حـەزوو ئارەزووەکانـی دنیا، یان بەشـتی پووچو بـێ بنەما، بێگومـان ئەمـە سـەرکۆنە کراوە، هەر وەکـو خـوا ﷻ فەرموویەتی دەربـارەی گەلی قارون کـە بـە قارونیـان ووت: ﴿لَا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾﴾القصص،(واتـە: دڵخۆش مەبـە بـەو مـاڵو سـامانە بێگومـان خـوا ئـەو کەسـانەی خـۆش نـاوێ دڵخۆشـن)، وە هەر وەکـو خـوای بـەرز فەرموویەتـی دەربارەی ئەوانـەی دڵیان خـۆش بوو بەوەی کـە لە لایانە

لــە بەتاڵو پــووچ کــە پێچەوانەی ئەوەیــە پێغەمبــەران هێناویانــە: ﴿ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٨٣ ﴾ غافــر، (واتــە: جــا کاتــێ پێغەمبەرانیــان بــە بەڵگــە ڕوونەکانــەوە هاتنە لایــان دڵخۆش بــوون بەو زانینــەی هەیانبوو).

(٥٩-٦٠): ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزۡقٖ فَجَعَلۡتُم مِّنۡهُ حَرَامٗا وَحَلَٰلٗا قُلۡ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمۡۖ أَمۡ عَلَى ٱللَّهِ تَفۡتَرُونَ ٥٩ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَشۡكُرُونَ ٦٠ ﴾:

خــوا ﷻ بەرهەڵســتی ئــەو بتپەرســتانە دەکات کــە بــە ئــارەزووی خۆیــان حــەڵاڵ حــەرام دەکــەنو حەرام حــەڵاڵ دەکەن، وەک دەفەرمــوێ: ﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزۡقٖ ﴾، (واتــە، جۆرەهــا گیانداری حەڵاڵ کــراو کە خوا ﷻ کردوونی بــە ڕزقو ڕۆزیی‌و ڕەحمەتێک بۆیــان ﴿ فَجَعَلۡتُم مِّنۡهُ حَرَامٗا وَحَلَٰلٗا ﴾.

پێیــان بڵــێ -وەک سەرزەنشــتێک بــۆ ئەو قســە بــێ بنەمایەیــان-: ﴿ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمۡۖ أَمۡ عَلَى ٱللَّهِ تَفۡتَرُونَ ﴾؟ ئــەوەی زانــراوە خــوا ﷻ مۆڵەتــی پێیان نــەداوە، بێگومان ئــەوان درۆ دەکەنو قســە هەڵدەبەســتن.

﴿ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾ کــە خــوا چۆنیــان بەســەر بێنــێ لە ســزاو تۆڵەکردنەوەدا ﴿ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسۡوَدَّةٌۚ ﴾ (واتــە: ڕۆژی قیامــەت دەیانبینیــت ئەوانەی درۆیان بــە دەم خواوە دەکــرد دەمو چاوەکانیان ڕەش هەڵگەڕاوەتەوە).

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ (واتــە: بێگومــان خــوا ﷻ خــاوەن فــەزڵو چاکەیــە بەســەر مرۆڤەکانــەوە) فــەزڵو چاکەیەکــی زۆرو بــێ پایــان، بــەڵام زۆربــەی خەڵکــی سوپاســگوزاری نابــنو پێــی نازانــن، یــان ئەوەیــە شــوکرانە بژێــری ناکــەن، یــان ئەوەیە نازوونیعمەتەکانــی خــوا ﷻ لــە کاری خراپــدا بەکاردەهێنن، وە ڕەتی ئەو فــەزڵو نیعمەتەی خــوا ﷻ دەکەنــەوە کــە خــوا ﷻ دایبارانــدووە بەســەریاندا، خەڵکێکــی کــەم لــە ئــەوان شــوکرانە بژێــرەو دان بــە نــازو نیعمەتەکانیــدا دەنــێو وەســفو ستایشــی خــوای پێدەکاو بــۆ کاری چاکــە بەکاریــان دەهێنێ.

ئــەم دەقــە دەکــرێ بــە بەڵگە کە ئەصــڵو بنەمــا لــە هەمــوو خواردەمەنییەکانــدا ئەوەیە کە حەڵاڵــە، جگــە لەوانــەی کــە شــەریعەت حەرامــی کــردوە، چونکە خــوا ﷻ سەرزەنشــتی

ئەوانـەی کـردوە کـە رزق‌و رۆزی ئـەو حـەرام دەکـەن لەسـەر بەندەکانی.
(٦١): ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾ ﴾.

خـوا ﷻ هـەواڵ دەدات کـە چاودێـرە بەسـەر هەمـوو شـتەکانەوە، وە ئاگـادارە بـە دۆخی هەمـوو بەنـدەکان لە وەسـتان‌و جموجوڵیانـدا، وە لە نێو ئەمـەدا کـەوا بانگەوازیان دەکات بـۆ ئـەوەی چاودێـری خوایان بە بەردوامـی لەبیر بێـت بۆیە فەرموویەتـی: ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ ﴾ واتـە: تـۆ (ئـەی موحەممـەدﷺ) لـە هیـچ دۆخێ لـە دۆخەکانـی ئاینـی‌و دنیاییدا نابـی، ﴿ وَمَا تَتْلُوا مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ ﴾ واتـە: وە هیـچ شـتێ لـە قورئانیـان بەسـەردا ناخوێنیتەوە کـە خـوا بـۆی دابەزانـدووی ﴿ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ ﴾ (واتە: ئێـوەش ئەی مـرۆڤ هیچ کارێـک ئەنجـام نـادەن) بچـووک بێ یـان گـەورە ﴿ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ﴾ (واتـە: بێگومـان ئێمـە بەسـەرتانەوە شـایەت‌و ئاگادارین) کاتێ دەسـت بـەو کارە دەکەن‌و بـەردەوام دەبن لەسـەری.

ئـەوە بزانن کە خوا ﷻ چاودێرە بەسـەر کردەوەکانتانەوە، بە چاکترین شـێوە کردەوەکانتان ئەنجـام بـدەن، دەخیلـە کارێ نەکـەن خـوا ﷻ پێـی ناخـۆش بـێ، چونکـە خـوا ﷻ ئاگادارە بەسـەرتانەوە، زانایـە بە ئاشـکراو پەنهانەکانتـان، ﴿ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ ﴾ (واتە: هیچ شـتێک شـاراوە نیە لە زانسـت‌و بیسـتن‌و بینینی پەروەردگارت) ﴿ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَلَا أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴾ (واتـە: بـە ئەنـدازەی گەردیلەیـەک نەلـە زەوی‌و نەلە ئاسـمانەکاندا وە نەبچوکتـر لەو گەردیلەیـە وە نە گەورەتر لـەو مەگـەر ئەوەتـا لەنـاو کتێبـی ئاشـکرادا) بێگومـان زانسـتی خـوا ﷻ دەوری هەمـوو ئەوانـەی داوە، وە بە پێنوسـەکەی نوسـیویەتی.

ئـەم دوو پلـەو پایـە لە پلـەو پایەکانی قـەزاو قـەدەرن، زۆر جار خـوا ﷻ پێکـەوە گرێیان دەدات، وە ئەو دوانەش: زانسـتی خوا ﷻ بە هەموو شـتەکان، وە نوسینی هەموو رووداوەکان، هەروەکـو خـۆی فەرموویەتـی: ﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾ ﴾الحـج. (واتـە: ئایـا نازانـی بەراسـتی خـوا دەزانێـت بەهەمـوو ئـەو شـتانەی لـە ئاسـمان‌و زەویدایـە بێگومـان ئـەوەی باسـکرا لە کتێبـی (لوح المحفـوظ) دایە).


أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ
فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ
ٱللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾ وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ
ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦٥﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ
مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ
يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ
وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ
ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ فِى ذَٰلِكَ
لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا
سُبْحَٰنَهُۥ هُوَ ٱلْغَنِىُّ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ
إِنْ عِندَكُم مِّن سُلْطَٰنٍ بِهَٰذَآ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ
مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ قُلْ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ
لَا يُفْلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٌ فِى ٱلدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ
نُذِيقُهُمُ ٱلْعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾

(٦٢-٦٤): ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی دۆستو ئەولیاو خۆشەویستانی، وە باس لە کردەوەو وەسفو پاداشتیانی کردوە فەرموویەتی: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ﴾ لەوانەی ڕووبەڕوویان دەبێتەوە لەو مەترسیو ناخۆشیانە ﴿وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾ (واتە: دڵ زویرو خەفەتباریش نابن) لەسەر ئەوەی لەدونیا پێشکەشیان کردوە، چونکە هیچ شتێکیان پێشکەش نەکردوە تەنها کردەوەی چاک نەبێت، جا ئەگەر نە ترسیان لەسەربێو نەخەمباریش بین، ئەوە ئاسایشو خۆشبەختیو خێرێکی زۆریان بۆدەستەبەر دەبێ، کەکەس نایزانێ جگە لە خوا ﷻ نەبێ.

پاشان باسی وەسفەکانیان دەکات، فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ئەوانەی بڕوایان هێناوە بەخواو فریشتەکانو بەکتێبەکانو پێغەمبەرانو ڕۆژی دواییو بەقەزاو قەدەر بەخێرو شەڕیەوە، وە ڕاستی ئیمانەکەیان سەلماندووە بە تەقوای خواو خۆپارێزی بەجێبەجێکردنی فەرمانەکانو دوورکەوتنەوە لە خراپەکاریەکان.

جا هەر کەسێک بڕوادارێکی بەتەقواو لە خواترس بێ ئەوە وەلیو دۆستی خوایە، ﴿لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ﴾. (واتە: هەر بۆ ئەوانە مزگێنی هەیە لە ژیانی دنیاداو لە ژیانی دواڕۆژیشدا).

بەلام موژدە لە دونیادا بریتیە لە وەسفی چاکو خۆشویستنی بڕواداران لەناو دڵدا، وە خەونی چاکو خۆش ، وە ئەوەی کە بەندە دەیبینێ لەنەرمو نیانی خوا ﷻ بەرانبەری بە ئاسانکردنی کارە چاکەکانو خوڕەوشتە بەرزەکان، وە دوورخستنەوەی

لـە ئـاکارە پیـسو بۆگەنەکان. بـەڵام مـوژدە لـە دوارۆژدا: یەکەم مـوژدە لەکاتـی رووح کێشـانیاندایە، هەروەکـو چـۆن خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُوا۟ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَبْشِرُوا۟ بِٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾﴾ (واتـە: بێگومـان ئەوانـەی وتیـان: پەروەردگارمـان خوایـەو پاشـان ئیـستیقامەو بەردەوامیـان هەبوو لەسـەر ئەوە ئـەوا لەسـەریان دادەبەزێت فریشـتەکان بەپۆل پـۆل کەوا نەترسـن لـەوەی لەپێشـتانەو دڵ تەنـگ مەبن لە رابـردوو موژدەبێـت بۆتان ئەو بەهەشـتەی کـە بەڵێنتـان پێـی درابوو).

وە لەنـاو گۆڕدا: مـژدەی ڕەزامەندی خـواو نازوونیعمەتی بەردەوامی پێـدەدرێ، وە لە ڕۆژی دواییشـدا مژدەکـەی بـۆ تەواودەکـرێ بـە چوونـە ناو بەهەشـتو ڕزگـار بوون لە سـزای بەئێـش. ﴿لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ بەڵکـو ئـەوەی خـوا پەیمانی پێـداوە هەقو ڕاسـتە، گـۆڕانو جێگۆڕکێـی بەسـەردا نایە، چونکـە خوا ﷻ ڕاسـتگۆیە لە قسـەکانیدا، هیچ کەس ناتوانـێ پێچەوانـەی قـەزاو قـەدەری ئـەو بجوولێتـەوە، ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ﴾ چونکـە ڕزگاربـوون دەگرێتـەوە لەهەمـوو تـرسو ناخۆشـیەک، وە بەدەسـتهێنانی هەموو داواکاریەکـی خۆشویسـتراو، سـەرکەوتنی کورتهەڵهێنـاوە تیایـدا، چونکـە سـەرکەوتن بۆ هیـچ کەس نیـە جگـە لەخاوەنی ئیمـانو تەقـوا نەبێ.

وە پوختـەی ئەمـە بەڕاسـتی موژدە گشـتگیرە بۆ هەمـوو خێرو پاداشـتێک کە خـوا ﷻ لە دنیـاو دوارۆژدا ڕێکـی خسـتووە بەپێ ئیمانو تەقـواو خۆپارێـزی، لەبەرئەمەیە بـە ڕەهایی هێنایەتیو نەیبەسـتۆتەوە.

(٦٥): ﴿وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦٥﴾﴾ واتـە: (ئـەی موحەممـەد ﷺ) بـا قسـەی بـە درۆدانـەران خەمبـارت نـەکا ئـەوەی دەربـارەی تۆ دەیڵێـنو دەیانـەوێ لەکـەدارت بکـەنو ئاینەکـەت ناشـرین بکـەنو بیشـێوێنن، بێگومان قسـەکانیان عیـزەتو سـەربەرزیان پـێ نابەخشـێو زیانیش بەتـۆ ناگەیەنـێ. ﴿إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾ (واتـە: بەڕاسـتی عیـزەت هەمـووی لـەلای خوایـە) بـۆ هەرکەسـێ بیەوێ دەیبەخشـێت، بۆهەرکەسـێکیش بیـەوێ ڕێگـری دەکات.

خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا﴾ واتـە: (هەرکەسـێ عیزەتو سـەربەرزی دەوێ) بـا بـە گوێڕایەڵـی کردنـی داوا لـە خـوا بـکات، بـە بەڵگـەی وتـەی خـوا ﷻ کـە دوای ئـەوە فەرموویەتـی: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ

یَرۡفَعُهُۥ ﴿١٠﴾ فاطر. (واتــە: وتــەی پــاکو چــاک تەنهــا بــۆلای خــوا ســەردەکەوێ).
بێگومــان ئــەوەی زانــراوە تــۆ لەســەر گوێرایەڵــیو فەرمانــی خــوای، عیزەتو ســەربەرزی تەنهــا بــۆ تــۆو شــوێنکەوتوانتە ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ المنافقــون. (عیــززەت تەنهــا بــۆ خــواو پێغەمبــەرو بروادارانە).
وە وتــەی خوا: ﴿هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾ واتە: بیســتنی خــوا ﷻ دەوری هەموو دەنگەکانی داوە، هیــچ شــتێک لەئەوانە لەو شــاراوە نیە.
وە زانســتی دەوری هەمــوو ئاشــکراو پەنهانەکانــی داوە، تەنانــەت بە قەد مســقاڵە زەرەیەک ئــەوەی لــە ئاســمانەکانو زەویــدان لێــی ون نابــێو شــاراوە نیــە، وە نەبچووکتر لــەوانو نە گەورەتریــش. خــوای بــەرزو مــەزن قســەی تــۆو دوژمنانی تــۆ دەبیســتێ، کە چــی دەڵێن دەربــارەت، وە بــە ووردو درشــتی هەمــوو ئەوانــە دەزانێــت، تــۆش تەنها زانســتی خواو ﷻ پاراســتنی ئــەوت بەســە، جا هەرکەســێ لەخوا بترســێو خــۆی بپارێــزێ ئەوە خوای بەســە.
(٦٦-٦٧): ﴿أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٦٧﴾﴾:
خــوا ﷻ هــەواڵ دەدات کە بێگومــان هەرچی لە ئاســمانەکانو زەویدایە هــەر بۆخوایەو ئەو دروســتی کــردوەو خاوەنێتــی، چۆن بیــەوێ هەڵیدەســوورێنێ، وە بە ویســتی خــۆی بڕیاری لەســەر دەدات، هەمــووان کۆیلەی ژێردەســتی خــوان لە ژێر بــاری ئەودان، شایســتەی هیچ جــۆرێ لــە بەندایەتیکــردن نیــن، وە شــەریکو هاوبەشــی خــوا ﷻ نیــن بەهیچ جــۆرێ لە جــۆرەکان، لەبەرئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ﴾ (واتــە: ئەوانــەی بێجگــە لەخــوا ﷻ دەپەرســتن لــە حەقیقەتــدا پەیــڕەوی هیــچ پەرســتراوێکی دیکەیــان نەکــردوە ئەوانــە شــوێنی گومان کەوتــوون) کــە هیچ لەهــەق دەوڵەمەنــدو بێنیــاز نــاکات ﴿وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ﴾ واتــە: ئەوانــە درۆو بوختانو قســە هەڵدەبەســتن.
جا ئەگەر ئەوان ڕاســت دەکەن لەوەی ئەو پەرســتراوانە هاوبەشــی خوان، با ئەو وەســفانەیان دەربخەن کە شــایەنی پەرســتنە ئەگەر چی بەقەد مســقاڵە زەرەکیش بــێ، بێگومان ناتوانن.
ئایــا یەکێــک لــە ئــەوان دەتوانــێ شــتێک دروســت بــکا یــان ڕزقو ڕۆزی بــدات، یــان

دەسـەڵاتێکی هەبێ بەسـەر دروسـتکراوەکاندا، یان توانـای بەڕێوەبردنی شـەوو ڕۆژی هەبێ کـە ژیانـی خەڵکی لەسـەر وەسـتاوە؟

﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ ﴾ لـە خـەو و حەوانـەوەدا، بەهـۆی ئـەو تاریکیـەی بـاڵ دەکێشـێ بەسـەر زەویدا، جـا ئەگەر ڕۆشـنایی بـەردەوام بووایـە ئۆقرەیان نەدەگـرتو پشـوویان نـەدەداو ئارامیـان نەدەبوو.

﴿ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًا ﴾ واتـە: خـوا ڕۆژی ڕوونـاکو ڕۆشـن کردوەتەوە تـا خەڵکی پێی ببینـنو بتوانـن کاروبـارەکانو بەرژەوەندیەکانـی دینو دنیایـان پێ هەڵبسـوڕێنن ﴿ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴾ (واتـە: بەڕاسـتی ئەوانـە نیشـانەیەکن بـۆ گەلێک ببیسـتن) لـە خواوە، بـە بیسـتنێکی تێگەیشـتنو وەرگرتـنو ڕێنیشـاندان، نەک بیسـتنێک ئینـکاریو کەللەڕەقـی، بەڕاسـتی ئەوانـە کۆمەڵە ئایـەتو نیشـانەیەکن بۆگەلێکە ببیسـتێ، بیکـەن بـە بەڵگـە بۆ تـاکو تەنهایی خـوا، کە ئەو پەرسـتراوی هـەقو ڕاسـتەقینەیە، جگە لەئـەو پـووچو بەتاڵـە، بێگومـان خوا ﷻ بـە بەزەیـیو میهرەبانو زانـاو دانایە.

(٦٨-٧٠): ﴿ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱلۡغَنِيُّۖ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلۡأَرۡضِۚ إِنۡ عِندَكُم مِّن سُلۡطَٰنِۢ بِهَٰذَآۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٨﴾ قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٞ فِى ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ -بۆئـەوەی هـەواڵ بـدا دەربـارەی بوختانـی موشـریکو بتپەرسـتان بـۆ پەروەردگـاری جیهانیـان-: ﴿ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا ﴾ خـوای گـەورە خـۆی بـە پـاکو خاوێـن ڕاگرتووە، لـەم بوختانە ناشـرینەی کە داویانەتـە پاڵـی، وەک فەرموویەتی: ﴿ سُبۡحَٰنَهُۥ ﴾ واتـە: خـوا پـاکو خاوێنـە لـەوەی کـە سـتەمکاران دەیڵێـن، وە لـەو ناتەواویانـەی دەیدەنـە پاڵـی، بـەرزیو مەزنـی بـۆ ئەو.

پاشان پاکیو بێگەردی خۆی سەلماندووە بە کۆمەڵە بەڵگەیەکی دیارو ئاشکرا:

یەکەمینیـان: خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ﴾ (واتـە: ئـەو بێنیـازە) دەوڵەمەنـدیو بێنیـازی تەنهـا لەئـەودا کۆکراوەتـەوە، وە هەمـوو جۆرەکانـی دەوڵەمەنـدی هەر بـۆ ئەوە، ئـەو دەوڵەمەنـدو بێنیـازە دەوڵەمەندیەکـی تـەواو بەهەمـوو مانـای دەوڵەمەنـدی لەهەمـوو ڕووەکانـەوە، جـا ئەگـەر دەوڵەمەندوو بێنیاز بـوو لە هەمـوو ڕووەکانەوە ئیتـر بۆچی منداڵ بۆخـۆی دادەنا؟ ئایا پێویسـتی بـە منداڵە، ئەمەش پێچەوانـەی بێنیـازیو دەوڵەمەندیەتی، هیچ

کەسێک منداڵ بۆ خۆی دانانێ، مەگەر ناتەواویەک هەبێ لە دەوڵەمەندیو بێنیازیدا.
سەلماندنی دووەم: خوا فەرموویەتی: ﴿ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ (هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە موڵکی ئەون) ئەم وشەیە کۆکەرەوەو گشتگیرە هیچ بەدیهێنراوێک لە ئاسمانەکانو زەویدا لە دەرەوەی موڵکی خوا نیە، هەموویان دروستکراوو کۆیلەی ژێر دەستی خوان.
بێگومان زانراوە ئەو وەسفە گشتگیرە، ڕەتی دەکاتەوە کە منداڵی لە ئەوان هەبێ، چونکە منداڵ لە ڕەگەزی باوکێتی، نەدەبێ دروستکراوبێو نەدەبێ کۆیلە بێ، خاوەنداریێتی خوا ﷻ بۆ هەموو ئەوانەی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە بە گشتی، هەبوونی منداڵ ڕەت دەکاتەوە.
سەلماندنی سێیەم: خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنۡ عِندَكُم مِّن سُلۡطَٰنِۭ بِهَٰذَآ ﴾ واتە: ئایە ئێوە بەڵگەو سەلماندنێکتان هەیە کە خوا ﷻ منداڵی هەبێ؟ جا ئەگەر بەڵگەیان هەبووایە دەریاندەخست، کاتێ کە تەحەداو بەربەرەکانی کردن لە هێنانەوەی بەڵگەدا، دەرکەوت قسەکانیان بەتاڵو پووچە، وە لە نەفامیو نەزانیەوە سەرچاوەی گرتووە، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی:﴿ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ بە ڕاستی ئەمە لە مەزنترینی قەدەغەکراوەکانە.
﴿ قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴾ (واتە: ئەوکەسانەی کە درۆ بۆ خوا ﷻ هەڵدەبەستن ئەڵێن منداڵی هەیە قەت ڕزگارو بەختیار نابن)، ناگەن بە ئامانجەکانیانو مەبەستەکانیان بەدەست ناهێنن، بەڵکو لە دنیادا بۆ ماوەیەکی کەم چێژ لە کوفرو بەدرۆدانانیان وەردەگرن، پاشان دەگوازرێنەوە بۆلای خوا ﷻ سزای بە ئێشیان پێ دەچێژێ، بەهۆی ئەو بێبڕواییەی کە کردوویانە: ﴿ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١١٧ ﴾آل عمران. (واتە: خوا ستەمی لێنەکردوون بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردوە).

وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ (٧١) فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ (٧٢) فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ (٧٣) ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوۡمِهِمۡ فَجَآءُوهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۚ كَذَٰلِكَ نَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡمُعۡتَدِينَ (٧٤) ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ (٧٥) فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ (٧٦) قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمۡۖ أَسِحۡرٌ هَٰذَا وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ (٧٧) قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَلۡفِتَنَا عَمَّا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا بِمُؤۡمِنِينَ (٧٨)

(٧١-٧٣): ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ (٧١) فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ (٧٢) فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ (٧٣)﴾:

خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ﴾ هـەواڵو بەسـەرهاتی نـووح بـۆ گەلەکـەت بـاس بکــە لــە بانگەوازکردنــی گەلەکەیـدا، ئـەو بۆماوەیەکـی زۆر بانگـەوازی گەلەکەی خۆی کـردو لەناویانـدا مایـەوە، هەزار سـاڵ جگـە لە پەنجا سـاڵ، بانگـەواز کردنەکـە هیچی لێ زیـاد نەکـردن جگە لـە خۆ بە گـەورە زانینو سەرکەشـی نەبـێ، لێـی بێزار بـوونو تەواو پڕبـوون، لەگەڵ ئەوەشـدا نـووح ﷺ کۆڵی نەداو هەر بانگـەوازی دەکرد، پێـی فەرموون: ﴿يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ واتـە: ئـەی هۆزەکـەم ئەگـەر مانــەوەم لەناوتانــداو ئامۆژگاریەکانــی من تەنها بۆ ســوودی ئێوەیــە ﴿بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ واتە: بــە بەڵگەی ڕوونو ئاشـکرا، ئەگـەر ئامۆژگاریەکانم قورسو گرانە لەسـەرتان، وە دەتانەوێ زیانـم پێبگەیەنـن، یـان هـەقو ڕاسـتی ڕەت بکەنـەوە ﴿فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ﴾ واتە: من تەنهـا پشـت بـە خوا دەبەسـتم، لـە دوور خسـتنەوەی هەمـوو خراپەیـەک کە ڕووبـەڕووم دەبێتــەوە، وە بەوەیشــی کــە بانگەوازی بۆدەکـەم، ئەمە سـەربازوو خۆئامادەکردنـی منە. وە ئێوەیــش هەرچیتــان لــە تواناتانــدا هەیــە خۆتــان ئامادە بکــەن لــە ڕووی ژمــارەو خۆئامادە کردنـەوە ﴿فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ﴾ واتـە: ئێـوەش کاروبـاروو بڕیـاری خۆتـان کۆبکەنـەوە، بـە شـێوەیەک هیـچ کەسـتان لـێ دوا نەکەوێـت، وە هیچ لـە هێـزو هیمەتتان مەشـارنەوە

﴿ وَشُرَكَآءَكُمْ ﴾ وە هاوبەشــەکانتانیش ئامــادە بکەن، ئەوانەی کە دەیانپەرســتن‌و پشــتیان پێ دەبەســتن لــە غەیری خــوا ﷻ.
﴿ ثُمَّ لَا يَكُنْ أَمْرُكُمْ عَلَيْكُمْ غُمَّةً ﴾ (واتــە: پاشــان بــا کارو بریارتــان) با نارِوون‌و شــاراوە نەبــێ بەڵکــو ئاشــکرابێ ﴿ ثُمَّ ٱقْضُوٓاْ إِلَىَّ ﴾ واتــە: هەمووتــان پەلامــارم بــدەن ئــەوەی لــە تواناتاندایــە ﴿ وَلَا تُنظِرُونِ ﴾ (واتــە: بــۆ ســاتێکیش لــە ڕۆژ مۆڵەتم پــێ مەدەن).
بــە ڕاســتی ئەمــە ســەلماندنێکی یەکلاکــەرەوەو نیشــانەیەکی مەزنــە لەســەر ڕاســتی پێغەمبەرایەتیەکــەی‌و ڕاســتی ئــەو پەیامــەی هێناویەتی، چونکە ئــەو تەنها بوو نــە هۆزێکی هەبــوو پشــتیوانی لــێ بــکا، وە نــە سەربازیشــی هەبــوو بیپارێــزێ.
بــە ڕاســتی نــووح ؈ دەستپێشــخەر بــوو لــە بەکــەم زانیــن‌و بەگەمژەدانانــی گەلەکەی‌و خراپــی ئاینەکەیــان‌و ناتــەواوی پەرســتراوەکانیان، ئەوانیــش لەبەرانبــەردا ئەوەنــدە ڕق‌و کینەیــان لێهەڵگــرت‌و دژایەتیــان دەکرد کــە مەزنتر بــوو لە کێــوە داکوتــراوەکان، ئەوان خەڵکانێکــی خــاوەن هێــزو توانــا بوون، ئەویــش پێیانــی دەووت: ئێــوەو پەرســتراوەکانتان کۆببنــەوە، وە ئەوەیشــی لــە تواناتاندایــە لە پیلان‌و فرو فێــڵ درێغی مەکەن، چیتان لەدەســت دێ بەرانبــەری مــن بیکــەن، بێگومــان ئەوان هیچیــان لەتوانــادا نەبــوو بەرانبەری.
بۆیــە دەرکــەوت ئــەو ڕاســتگۆیەو ئەوانیــش درۆزنــن لــەو بانگەشــەیەی کــە دەیکــەن، لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ ﴾ (ئەگــەر پشــت هەڵبکــەن) لــە بانگــەوازو ئامۆژگاریەکانــم، کــە پێویســت ناکا پشــتی تێبکــەن، چونکــە ڕوون بووەتەوە ئێــوە دەزانن شــوێنی باتــڵ‌و پــووچ کەوتوون، لەبەر ئــەوەی ئێوە لا دەدەن بۆ هەقێ کە پشــت ئەســتوورە بــە بەڵگــە، بــۆ ناهەقێک کە پشــت ئەســتوورە بــە بەتاڵ‌و پــووچ‌و بــێ بنەما، لەگــەڵ ئەمەدا ﴿ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ ﴾ (مــن داوای پاداشــتم لــە ئێــوە نەکــردوە) لەســەر بانگەوازەکەم وە لەســەر وەڵامدانەوەتــان، تاکــو نەڵێــن: ئەمــە هاتــوە مــاڵ‌و موڵکەکانمان لــێ وەربگرێ، لەبەرئــەوە ڕێگریــم لــێ بکــەن ﴿ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ﴾ واتــە: چاکــەو پاداشــتم نــاوێ تەنهــا لــە خــوا نەبــێ ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ مــن یەکــەم کەســم بچمە ناو ئیســلامەوە، وە یەکــەم کەسیشــم کاری پێدەکــەم‌و فەرمانتــان پــێ بکەم.
﴿ فَكَذَّبُوهُ ﴾ جــا بەدرۆیــان دانا دوای ئەوەی بانگــەوازی کردن بە درێژایی شــەوو ڕۆژوو بــە ئاشــکراو نهێنــی، بانگەوازەکــەی هیچــی بــۆ زیــاد نەکــردن، تەنها ئــەوە نەبێ پشــتیان تێکــردوو لێــی هەڵهاتــن، ﴿ فَنَجَّيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ﴾ ئــەو کەشــتیەی فەرمانمــان

پێکردبــوو لــە پێــش چــاوی ئێمە دروســتی بــکات، وە پێمــان فەرمــوو: دوای ئــەوەی ئاگر لــە تەنوورەکانەوە هەڵقــوڵا ﴿ ٱحۡمِلۡ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ وَمَنۡ ءَامَنَ ﴿٤٠﴾ ﴾ (واتــە: لــە هــەردوو جووت دووانی ســوار بکە، لە هــەر گیاندارێک نێــرو مێیــەک هەروەهــا ژنو منداڵەکانیشــت جگە لەوەی پێشــتر قســەی لە بــارەوە کراوە کــە نابــێ دەربازی بــێ، هەروەها هەر کەسێک کــە بڕوای هێنــاوە وە جگە لــە کەمێکیش بڕوایــان لەگەڵــی نەهێنا) ئەویــش ئــەو کارەی ئەنجام دا.

پاشــان خــوا ﷻ فەرمانی کــرد بە ئاســمان کە ئاوێکی بــە خــووڕ ببارێنــێ، وە کانیاوەکانی لــە زەویــدا هەڵقوڵانــد، جــا ئــاوی ئاســمانو ئــاوی زەوی بەیەکگەیشــتن بــەو ئەنــدازەی بڕیــاری لەســەر درابــوو، ﴿ وَحَمَلۡنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلۡوَٰحٖ وَدُسُرٖ ﴿١٣﴾ ﴾القمــر. (واتــە: نووحمــان لەگەڵ شــوێنکەوتووانی هەڵگرد لەســەر کەشــتیەک بــە چەند پارچە تەختەو بزمار دروســت کرابــوو) بــە پێــش چــاوو چاودێــری ئێمــە دەڕۆیشــت، ﴿ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ ﴾ (واتە: کردمانــن بــە جێنشــین) لەســەر زەویدا پــاش لەناوبردنــی بــە درۆدانەران.

پاشــان خــوا ﷻ فــەڕو بەرەکەتــی خســتە نــەوەو وەچەکانیــەوە، لــە ســەر زەویــدا بڵاوی کردنــەوەو جێگیــری کــردن ﴿ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ ﴾ (واتــە: ئەوانــەی درۆیان بە ئایەتەکانــی ئێمــە کــرد ژێــر ئاومــان خســتن) دوای ئــەو ڕوون کردنــەوەو بیانــوو بڕینــە، دەفەرمــوێ: ﴿ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴾ ئەویــش لــە ناوچوونێکــی ئابڕووبەرانەیە، وە نەفرینێکــی بــە دوایــەک داهاتــووە، ســەدە لە دوای ســەدە هیــچ دەربارەیــان نابیســتی تەنها لۆمــەو ســەرکۆنەکردن نەبــێ، وە هیچ نابینــی لە ئەوان تەنهــا خراپەکاریو زەمکــردن نەبێ، جابــا بەدرۆدانــەران ئاگــادار بن لەوەی تووشــی ســزا نەبن وەکو ئــەو گەلانــەی پێش ئەوان کە بەهــۆی بەدرۆدانانــەوە ســزادرانو ڕیســواکرانو لەناوچوون.

(٧٤): ﴿ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوۡمِهِمۡ فَجَآءُوهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۚ كَذَٰلِكَ نَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾:

﴿ ثُمَّ بَعَثۡنَا ﴾ واتــە: پاشــان لــە دوای نــووح عليه السلام ناردمــان ﴿ رُسُلًا إِلَىٰ قَوۡمِهِمۡ ﴾ (پێغەمبەرانێــک بــۆ لای گەلەکانیــان) کــە بــە درۆیــان دادەنــان، بانگیان دەکــردن بۆ لای هیدایــەت، وە ئاگاداریــان دەکردنەوە لــە هۆکارەکانی لەناوچــوون. ﴿ فَجَآءُوهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾ واتــە: هەمــوو پێغەمبەرێــک پاڵپشــتی پەیامەکــەی کــردوە بەو ئایــەتو نیشــانانەی بەڵگەن لەســەر ڕاســتی ئــەو پەیامــەی هێناویەتــی ﴿ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُ ﴾ مانای

ئەوەیـە: خـوا ﷻ سـزای دان کاتـێ پێغەمبەرانیان بۆ هـات، ئەوانیش دەستپێشـخەریان کرد لـە بەدرۆدانانیـدا، لـە بەرانبـەردا خـوا مـۆری دا بەسـەر دڵەکانیانـدا، نێـوان ئـەوانو ئیمانی لەیەکتـر جیاکـردەوە، دوای ئـەوەی تواناییـان هەبوو ئیمـان بهێنن، هەروەکـو چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: واتـە: ﴿ وَنُقَلِّبُ أَفۡـِٔدَتَهُمۡ وَأَبۡصَـٰرَهُمۡ كَمَا لَمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٖ ﴿١١٠﴾ ﴾ الأنعام. (واتـە: دڵو چاویـان وەردەگێڕینو لادەدەین لـە باوەڕهێنان) هەروەک لەسـەرەتاوە بڕوایان بـە قورئـان نەهێنـا، لەبەرئەمـە لێـرەدا فەرموویەتـی: ﴿ كَذَٰلِكَ نَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴾ واتـە: مـۆر دەدەین بەسـەر دڵەکانیانـدا، خێرو چاکـە ناچێتـە ناویانەوە، خوا ﷻ سـتەمی لێ نەکـردوون، بەڵکـو ئـەوان سـتەمیان لە نەفسـی خۆیـان کـردوە، بەرەتکردنـەوەی هەق کە بۆیـان هاتـووەو، وە بـە درۆدانانی یەکـەم جاریان.

(٧٥): ﴿ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾:

﴿ ثُمَّ بَعَثۡنَا ﴾ لـە دوای ئـەو پێغەمبەرانـەی کـە خوا ناردنی بـۆ لای ئەو گەلە بـە درۆدانەرە لـە ناوچووانـە، ﴿ مُّوسَىٰ ﴾ کـوڕی عیمـران یەکێکـە لـە پێغەمبەرانـی خـاوەن عـەزم، وە یەکێکـە لـەو پێغەمبـەرە گەورانـەی پەیـڕەو کراون، کـە شـەریعەتی مـەزنو فراوانیان بۆ دابەزیـوە ﴿ وَهَٰرُونَ ﴾ هاروونمـان کرد بە وەزیـر، هەردووکیانمـان نارد ﴿ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ ﴾ واتـە: بۆلای گـەورەو دەسـەڵاتدارانی دەوڵەتەکـەی فیرعـەون، چونکە خەڵکی بەگشـتی شـوێنکەوتووی دەسـەڵاتدارانیانن ﴿ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾ بەو ئایەتانەی بەڵگەن لەسەر ڕاستی ئـەو پەیامـەی بـۆی هاتووە، لە یەکتاناسـی خـواو قەدەغەکردنـی بەندایەتی بـۆ غەیری ئەو، ﴿ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ ﴾ (لـووت بەرزیـان نواندا بەرانبـەری) بەهۆی ئەوەی سـتەمکار بوون خۆیان بـە گـەورە دەزانی، پـاش ئەوەی دڵنیابـوون ئەوە لە لایـەن خواوەیە ﴿ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴾ واتـە: خوا ﷻ وەسـفی کردوون بـە خراپـەکارو بەدرۆدانەر.

(٧٦): ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧٦﴾ ﴾: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا ﴾ کـە ئـەوە گەورەتریـن جۆرەکانـی هـەقو مەزنترینیانە، ئـەوە لەلایـەن خواوەیـە کـە هەمـوو گەردنەکان بـۆ گەورەییو مەزنـی ئەو ملکـەچ بوون، ئـەو پەروەردگاری جیهانیانـە، پەروەردەکەری هەموو بەدیهێنراوەکانە بـە نازوونیعمەتەکانی. کاتـێ کـە هەقیان بۆ دابەزی لەلایەن خواوە لەسـەر دەسـتی مووسـا ؑ ڕەتیـان کردەوەو وەریـان نەگـرت، وە ﴿ قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴾ بـە پشـت تێکـردنو ڕەتکردنـەوەی

نەوەستان، هەتا خراپترینی پووچەکانیان داوە پاڵی، ئەویش سیحرو جادووە، کە حەقیقەتەکەی شاردنەوەی ڕاستیەکانە، بەڵکو کردیان بە جادوویەکی ڕوونو ئاشکرا لە کاتێکدا ئەو هەقێکی ئاشکراکەر بوو.

(٧٧): ﴿قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمْ ۖ أَسِحْرٌ هَٰذَا وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ﴿٧٧﴾﴾:

لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿قَالَ مُوسَىٰٓ﴾: مووسا ﷺ پێی فەرموون: -بە لۆمەو سەرزەنشت کردنەوە لە ڕەتکردنەوەی هەقو ڕاستی، کە تەنها ستەمکارترینی خەڵک ڕەتی دەکاتەوە-: ﴿أَتَقُولُونَ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمْ﴾ واتە: ئایا ئێوە دەڵێن: ئەوە سحرێکی ڕوونە؟ ﴿أَسِحْرٌ هَٰذَا﴾ واتە: تەماشای وەسفەکەی بکەنو ئەوەیشی لە خۆی گرتووە، تەنها بەوە بۆتان دەردەکەوێ کە ئەوە هەقە ﴿وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ﴾ (جادووگەران سەرکەوتوو نابن) نە لە دنیاو نە لە دوارۆژدا، بۆیە تەماشا بکەن سەرئەنجام بۆ کێیەو کێ سەردەکەوێ، بێگومان دوای ئەوە زانیانو بۆ هەموو کەس دەرکەوت کە مووسا ﷺ سەرکەوتوو سەرفرازە لە دنیاو دوارۆژدا.

(٧٨): ﴿قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴿٧٨﴾﴾:

﴿قَالُوٓا۟﴾ بە مووسایان ووت: قسەکانیان ڕەت کردەوە بەوەی کە ڕەت ناکرێتەوە: ﴿أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا﴾ واتە: هاتوویت ڕێگریمان لێدەکەی لەو ئاینەی باووباپیرانمان لەسەری بوون، لە شیرکو هاوەڵدانانو بەندایەتیکردنی غەیری خوا ﷻ، وە فەرمانمان پێدەکەی بەندایەتی خوای تاکو تەنها بکەین؟ وتەی باوو باپیرە گومرایانەیان کردە بەڵگە بۆ خۆیان، ئەو هەقەیان پێ ڕەتدەکردەوە کە مووسا ﷺ بۆی هێنابوون، وە قسەکانیان: ﴿وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: ئێوە بۆیە هاتوون تا ببنە سەرۆکو دەسەڵاتدار بەسەرمانەوەو لە وڵاتی خۆمان بەدەرمان بکەن؟ ئەمەش فێڵێکە لەلایەن ئەوانەوە دەیکەن، ئەمە ساختەکردنو شاردنەوەی ڕاستیەکان بوو لە لای خەڵکە نەفامەکانیان، بۆ دژایەتیکردنی مووساو بڕوا پێ نەهێنانی.

ئەمە ناکرێ بە بەڵگە بۆ کەسێ کە ڕاستیەکان بناسێو شتەکان لە یەکتر جیابکاتەوە، چونکە بەڵگە ڕەت ناکرێتەوە بە پاساو بەڵگەی (بەهێزتر) نەبێ.

بەڵام ئەو کەسەی بە هەقو ڕاستی هاتووە قسەکانی ڕەت دەکرێنەوە بە هاوشێوەی ئەمانە، ئەوە بەڵگەیە لەسەر بێتواناییو ئەو کەسانەی ڕەتی دەکەنەوە، چونکە ئەوانە

ئەگەر بەڵگەیان هەبووایە، پەنایان نەدەبرد بۆئەوەی کە بڵێن مەبەستت ئەوەیە، یا مەبەستت ئەمەیە، جا یەکسانە ئەگەر راست بکا لە قسەو هەواڵەکەیدا دەربارەی مەبەستی دژەکەی یان درۆ، لەگەڵ ئەوەدا مووسا ﷺ هەرکەسێک لە حاڵی بزانیایە، وە ئەو پەیامەیشی هێناویەتی دەیزانی مەبەستی ئەوە نیە لەسەر زەویدا خۆی بەگەورە بزانێو ببێ بە دەسەڵاتدار، بەڵکو مەبەستی هەمان مەبەستی برا پێغەمبەرەکانی بوو: لە هیدایەتدانی خەڵکیو رێنیشاندانیان بۆ ئەو شتەی سوودی هەیە بۆیان.
بەڵام حەقیقەتی بابەتەکە هەروەکو بۆ خۆیان دانیان پێدانـاو درکاندیان بەوە وتیان: ﴿وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا بِمُؤۡمِنِينَ﴾ واتە: (ئیمان ناهێنین) بە هۆی کەللەرەقیو عینادیو خۆ بە گەورە زانین، نەک لەبەر بەتاڵی پووچی ئەوەی کە مووساو هاروون هێناویانە، یان هەبوونی گومان تێیدا، یان لەبەر هۆکارێکی دیکە، ئنجا بە مەبەستی ستەمو دژایەتیو دەستدرێژیی، هەروەها بە مەبەستی ئەوەش کە مووساو هاروونیان پێ تۆمەتبار دەکرد کە بریتی بوو لە بەرزیو بڵندیو حەز کردن لە لووت بەرزی.

وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ
قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ قَالَ
مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ
عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ
ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨٢﴾ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٌ مِّن قَوْمِهِۦ عَلَىٰ
خَوْفٍ مِّن فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِمْ أَن يَفْتِنَهُمْ ۚ وَإِنَّ فِرْعَوْنَ لَعَالٍ
فِى ٱلْأَرْضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوْمِ إِن
كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾
فَقَالُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلْنَا رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ
﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ
وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا وَٱجْعَلُوا۟ بُيُوتَكُمْ
قِبْلَةً وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ
رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ۖ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ
وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾

**(٧٩):** ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨١﴾﴾:

﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ﴾ فیرعەون ڕووبەڕووی هەقو ڕاستی وەستایەوە کە مووسا ﷺ هیناویەتی، وە هەروەها بۆ ئەوەی سەربکەوێ بەسەر مووساو گەلەکەیشی چەواشە بکات: ﴿ٱئْتُونِى بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٍ﴾ واتە: هەموو جادووگەرێکی زۆر شارەزاو لێزانم بۆ بهێنن، ئنجا نێردراوی خۆی نارد بۆ دەورو بەری میسر کە هەموو جادوگەرە بەتواناو بلیمەتەکان کۆ بکاتەوە بە هەموو ڕەگەزو پلەو پایەکانیانەوە.

﴿فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ﴾ بۆ ئەوەی کێبڕکێی سەرکەوتن بکەن لەگەڵ مووسادا ﴿قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُوا۟ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ﴾ واتە: چیتان دەوێ من هیچتان بۆ دەستنیشان ناکەم، چونکە مووسا ﷺ دەیزانی سەردەکەوێ، بۆیە زۆر بێباک بوو لێیان، وە بەوەیشی کە هێناویانە.

﴿فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟﴾ (کاتێک) پەتو دارەکانیان (فڕێدا) کە لە شێوەی مار دەچوونو دەڕۆیشتن، بۆیە ﴿قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئْتُم بِهِ ٱلسِّحْرُ﴾ (مووسا وتی:) ئەم جادوویە کێ حەقیقی مەزنە، بەڵام لەگەڵ مەزنیدا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبْطِلُهُۥٓ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾ (خوا بەزوویی بەتاڵی دەکاتەوە) ئەوان دەیانەوێ بەو کارە پووچو بەتاڵ سەربخەن بەسەر هەقدا، جا چی خراپەو لەسنوور دەرچوونێک لەمە مەزنتر هەیە؟!

بەهەمان شێوە هەر خراپەکارێ کردەوەیەک بکات فرو فێڵی تێدا بەکار بهێنێ، بێگومان کردەوەکەی بەزووی بەتاڵو پووچ دەبێتەوە، ئەگەر چی ڕەواجی پێبدرێ لە کاتێ لە کاتەکاندا، بێگومان سەرەنجامی پەرشو بڵاویو لەناوچوونە.

بـەڵام چاکەخـوازان کە مەبەسـتیان بـە کردەوەکانیان لەبەر خـوا بوونە، ئەویـش کردەوەو ئامـرازی بەسـوودو فەرمـان پێکـراوە، بێگومـان خـوا ﷻ کردەوەکانیـان چـاک دەکاتو بـەرزی دەکاتـەوە، بـە بەردەوامیـش بۆیـان زیـاد دەکات، جـا مووسـا ؑ گۆچانەکەی هەڵـدا، هەمـوو ئەوانەی جادووگـەرەکان هەڵیاندابوو قوتـی دا، سـیحرو جادووەکانیان بەتاڵ بوویەوە.

(٨٢-٨٣): ﴿ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٨٢ ﴾:

جادوو گەرەکان یەکسـەر سـوژدەیان بـرد، کاتێ حەقیقەتیان بۆ ئاشـکرا بـوو، فیرعەونیش هەڕەشـەی لێیـان کرد بە هەڵواسـینو دەسـتو پێ بڕینیـان، ئەوانیش بێباک بـوون لەوەداو چەسـپاو بوون لەسـەر ئیمانو بڕواهێنانیان.

بەڵام فیرعەونو داروو دەسـتەکەیو شـوێنکەوتوانی هیـچ یەکێکیان بڕوایـان نەهێنا، بەڵکو بـەردەوام بوون لە سەرکێشـیو لەسـنوور دەرچوونیان، لەبەر ئەمـە فەرموویەتی:

(٨٣): ﴿ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٞ مِّن قَوۡمِهِۦ ﴾ واتـە: (کەس بڕوای بە مووسـا ؑ نەهێنا تەنهـا) گەنجانێـک نەبـێ لـە نەوەکانـی ئیسـرائیل، ئارامیان گرت لەسـەر ترسـاندن، کاتێ کـە ئیمـان جێگیـر بـوو لـە دڵەکانیانـدا ﴿ عَلَىٰ خَوۡفٖ مِّن فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ أَن يَفۡتِنَهُمۡ ﴾ (واتـە: بەهـۆی ترسـیان لە فیرعـەونو پیاو ماقـوڵانو گەورەکانیـان نـەوەک بیانگێڕێتەوە بـۆ بـێ دینـی) لەسـەر دینەکەیـان ﴿ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾ واتـە: (فیرعـەون لـەو وڵاتـەدا) پیاوێکی خـۆ بـەزل زانو دەسـەڵاتدار بوو، هەقـی خۆیانە لەسـتەمو دەسـت درێژی بترسـن. ﴿ وَإِنَّهُۥ ﴾ وا بـوو ﴿ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴾ واتـە: لەوانە بوو کە سـنووریان بەزانـدووە لـە گومڕایـیو دوژمنکاریدا.

حیکمەتیـش لەمـەدا -خـوا زاناتـرە- لـەوەی کـە بڕوایـان نەهێنـا بـە مووسـا ؑ تەنهـا گەنجانێـک نەبـێ لـە گەلەکـەی، بێگومـان نەوەی گەنـج زووتر بـەرەو پیری هـەق دێنو پێشـوازی لێدەکـەن، وە خێراتـر ملکەچ دەبن، بـە پێچەوانـەی پیاوی بەتەمەنو بەسـاڵاچوو وێنـەی ئەوانیـش، لەوانە لەسـەر کوفرو بـێ بڕوایی پـەروەردە بوون، ئـەوان بەهۆی ئەوەی عەقیـدەو بیـرو بـاوەڕی پیسو بۆگـەن هێلانـەی کردبـوو لەنـاو دڵەکانیانـدا، دوورترن لە وەرگرتنـی هەقو ڕاسـتی.

(٨٤): ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ٨٤ ﴾:

﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ ﴾ مووسـا ؑ وەسـیەتو ئامۆژگـاری گەلەکـەی کـرد کە ئـارام بگرنو

خۆڕاگربـن، وە یـادی دەهێنانـەوە کە دەبێ پشـتو پەنا بە خوا ببەسـتن لەسـەر ئـەوە، بۆیە فەرمـووی: ﴿ يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ ﴾(واتـە: ئەگەر ئێـوە بڕواتان بەخوا هێناوە) هەسـتن بـە جێبەجێکردنـی ئەرکەکانی بڕواهێنـان ﴿ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ﴾واتە: پشـت بە ئـەو ببەسـتنو پەناتان هـەر ئەو بـێو داوای سـەرکەوتن هەر لە ئـەو بکەن.

(٨٥): ﴿ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٥ ﴾

﴿ فَقَالُواْ ﴾ئەوانیـش بـەو پـەڕی گوێڕایەڵیـەوە بۆی وتیـان: ﴿ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾واتـە: (تەنها پشـت بـە خوا دەبەسـتین)، خوایە زاڵیـان نەکەی بەسـەرمانداو تووشـی فیتنـەو بەڵامـان بکـەن، وە بڵێـن: ئەگـەر لەسـەر هـەق بوایـەن نـە ئەدۆڕان.

(٨٦): ﴿ وَنَجِّنَا بِرَحۡمَتِكَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٨٦ ﴾

(واتـە: بەڕەحمەتـی خـۆت ڕزگارمـان بکە لە گەلی بـێ بڕوایـان)، بۆ ئەوەی پارێـزراو بین لەشـەڕو خراپەکاریـان، وە بەردەوامیـش بیـن لەسـەر ئاینەکەمـان بەجۆرێ بتوانیـن پەرە بە ئایـنو شـەریعەتەکەمان بدەیـن، وە ئاشکرایشـی بکەیـن بـە بـێ دژایەتی کردن لـە لایەن هیچ کەسێکەوە.

(٨٧): ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا بِمِصۡرَ بُيُوتٗا وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٧ ﴾

﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ ﴾(واتـە: سروشـمان نـارد بـۆ مووسـاو هـارون) کاتێـک فشـارێکی زۆر خرایـە سـەر گەلەکەیـان لـە لایـەن فیرعـەونو داروودەسـتەکەیەوە، وە سـووربوون لەسـەر ئەوەی لـە ئاینەکەیان دوریـان بخەنەوەو تووشـی فیتنـەو بەڵایان بکەن.

﴿ أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا بِمِصۡرَ بُيُوتٗا ﴾واتـە: فەرمانیـان پێبکـەنماڵو خانوو بۆخۆیان دروسـت بکـەن، بـۆ ئـەوەی بتوانـن خۆیـان بشـارنەوە ﴿ وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ ﴾واتـە: ماڵەکانتـان بکەنـە جێگـای نوێـژ کـردن، کاتێ کـە ڕێگریتـان لێدەکـرێ لـە بەجێهێنانی نوێـژ لە کەنیسـەو پەرسـتگا گشـتیەکاندا.

﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾(نوێژەکانتـان بەجێبهێنـن) چونکە بەڕاسـتی یارمەتیـدەرە بۆ هەموو کاروبارەکانتـان ﴿ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾بەسـەرکەوتنو پشـتیوانیکردنی ئاینەکەیـان، بێگومـان دوای هەموو ناخۆشـیەک خۆشـی دێ، کاتـێ باروودۆخەکەیان لەسـەر توندکرا، خـوا دەرووی خێـری لێکردنـەوە، جـا کاتێ کـە مووسـا عليه السلام، دڵ ڕەقیو پشـت تێکردنی

فیرعـەونو داروودەسـتەکەی بینی، دووعای لێکـردن، هاروونیش (ئامیـن)ی بۆ دووعاکەی کرد، جـا فەرمووی:

(٨٨): ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ ﴾:

﴿ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً ﴾ (واتـە: ئـەی پەروەردگارمـان بەڕاسـتی تـۆ بەخشـیوتە بە فیرعـەونو کۆمەڵەکەی هـۆکاری ڕازاندنـەوە) لەجۆرەها زێڕو خشـڵوماڵو خانووی جوانو سـواری گرانبەهـاو خزمەتکاران﴿ وَأَمْوَٰلًا ﴾ ماڵو سـامانێکی مەزن﴿ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ﴾ (واتـە: لـە ژیانی دنیـادا) ئـەی پەروەردگارمان بۆ ئـەوەی خەڵکـی گومڕابکەنو لـە ڕێگای تـۆ لایانبەن، جا خۆیـان گومڕا دەبـنو خەڵکیش بـەدوای خۆیاندا گومـڕا دەکەن﴿ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ ﴾ واتە: (ئـەی پەروەردگارمان) مـاڵو سـەروەتو سـامانیان لەنـاو بـەرە، یان بیکە بـە بەردێکـی بێ کەڵـک،﴿ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾ واتە: دڵەکانیان وشـکو ڕەق بکـە﴿ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴾ (واتە: چونکـە بڕواناهێنـن هەتا سـزای سـەختی خوا نەبینـن) لەکاتێکدا ئەم قسـەیەی کرد کە زۆر لێـان تـووڕە بـوو، چونکە ئـەوان بوێـر بـوون لەسـەر قەدەغەکراوەکانی خـواو بەندەکانی خوایـان تێکـداو تووشـی خراپەکاریـان کـردن، وە ڕێگریان لـە ڕێگای خـوا ﷻ کرد، وە لەبەرئـەوەی زانیـاری تـەواوی هەبـوو بـە پەروەردگاری کـە بەزوویـی تۆڵەیان لێدەسـێنێ لەسـەر ئـەوەی کردوویانە، بە داخسـتنی دەرگـای بڕواهێنان بەسـەریاندا.

قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ
ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ وَجَٰوَزْنَا بِبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ
فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ
قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ
وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ
مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ
خَلْفَكَ ءَايَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ
﴿٩٢﴾ وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ
ٱلطَّيِّبَٰتِ فَمَا ٱخْتَلَفُواْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي
بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ
مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن
قَبْلِكَ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾
وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ
﴿٩٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾
وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾

(٨٩): ﴿قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾﴾

﴿قَالَ﴾ خوا ﷻ فەرمووی: ﴿قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا﴾ ئەمە بەڵگەیە لەسەرئەوەی مووسا عليه السلام پاڕاوەتەوەو هاڕوونیش ئامینی بۆ کردوە، ئەو کەسەی کە ئامین دەکات بەشدارە لە دوعاو پاڕانەوەی ئەو کەسەدا ﴿فَٱسْتَقِيمَا﴾ خۆڕاگربن لەسەرئاینەکەتان، وە بەردەوام بن لەسەر بانگەوازەکەتان ﴿وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ شوێن ڕێگای نەزانو گومرایان مەکەون، ئەوانەی لایانداوە لە ڕێگای ڕاستو شوێن ڕێگاکانی دۆزەخ کەوتوون، خوا ﷻ فەرمانی بە مووسا عليه السلام کرد کە لەشەودا شەوڕەوی بە نەوەکانی ئیسرائیل بکات، وە هەواڵیشی پێدا کە ئەوان بە دڵنیایی شوێنی دەکەون، فیرعەونیش خەڵکانێکی کۆکردەوە ناردی بۆ شارو دێهاتەکان، دەیانوت: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ (واتە: مووساو گەلەکەی)، ﴿لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾﴾ الشعراء (واتە: کۆمەڵێکی کەمی بێ نرخن * وە بە ڕاستی ئەوانە ڕقی ئێمە هەڵدەسێنن * وە بێگومان ئێمە کۆمەڵێکین ئاگادارین بە پیلانەکانیان).

سەرجەم ساربازەکانی کۆکردەوە، هەموویان پێکەوە بە کەللەڕەقیو دوژمنکاریو خۆبەزل زانینەوە شوێنی مووساو گەلەکەی کەوتن، ئەمانە ستەمیان لەسەر زەویدا دەکردو تاوانەکانیان زۆر بوو، بۆیە دەبێ چاوەڕوانی سزا بکەن.

(٩٠): ﴿وَجَٰوَزْنَا بِبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾﴾

﴿وَجَٰوَزْنَا بِبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ﴾ بەو شێوەیە خوا ﷻ وەحیو نیگای کرد بۆ مووسا

کاتێ کە لە لێواری دەریاکە بوو، فەرمانی پێکرد کە بە دار گۆچانەکەی لە ئاوی دەریاکە بدات، ئەویش لێیدا، ئنجا دوازدە ڕێڕەوی لێ پەیدا بوو، کە نەوەکانی ئیسرائیل پێیدا پەڕینەوە، فیرعەون‌و سەربازەکانیشی شوێنیان کەوتن‌و بەدوای ئەواندا ڕۆشتنە ناو دەریاکەوە، هەتا ئەو کاتەی خەریک بوو فیرعەون بخنکێ ﴿قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتۡ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ (واتە: ئەوسا ووتی بڕوام هێنا، کە هیچ پەرستراوێکی ڕاست نیە جگە لە ئەو خوایە نەبێت کە نەوەکانی ئیسرائیل بڕوایان پێ هێناوە) ئەویش خوای تاک‌و تەنهاو پەرستراوی هەق‌و ڕاستەقینەیە، کە هیچ کەس شایستەی پەرستن نیە تەنها ئەو نەبێ ﴿وَأَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾ واتە: منیش لەوانەم کە ملکەچن بۆ فەرمانی خواو ئەوەی مووسا هێناویەتی.

(٩١): ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٩١﴾:

خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو بڕواهێنانە لەم حاڵەتەدا هیچ سوودێکی نیە بۆی، وە فەرموویەتی: ﴿ءَآلۡـَٰٔنَ﴾ ئێستا بڕوادێنیت‌و دان دەنێیت بە پێغەمبەری خوا ﷺ ﴿وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ﴾ واتە: بە ئاشکرا سەرپێچی‌و کوفرت کردووەو پێغەمبەرانت بەدرۆداناوە ﴿وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾ (واتە: تۆ لە خراپەکاران‌و تێکدەران بوویت)؟! بۆیە ئیمان هێنان هیچ سوودێکی بۆ تۆ نیە، هەروەکو چۆن عادەت‌و نەریتی خوا ﷻ وایە، بێگومان بێبڕوایان ئەگەر گەیشتنە حاڵەتی ناچاری ئەوە ئیمان هێنانیان سوودی نابێ بۆیان، چونکە ئەو بڕواهێنانە بووەتە بڕواهێنانێکی بینراو، وەکو بڕواهێنانی کەسێک وایە کە قیامەت ببینێ، ئەو ئیمانەی سوودی هەیە، تەنها ئەوەیە کە بڕوای هێنابێ بە پەنهان‌و شاراوە.

(٩٢): ﴿فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ٩٢﴾:

ڕاڤەکارانی قورئان دەڵێن: بێگومان نەوەکانی ئیسرائیل ترسێکی ئێجگار گەورەیان لێ نیشتبوو لە فیرعەون، وەکو ئەوەی بڵێ بڕوایان نەدەکرد بە خنکانی، وە گومانیان هەبوو لەوەدا، خوا ﷻ فەرمانی بە دەریا کرد لاشەکەی ڕزگار بکات‌و بیخاتە سەر ئاو لە شوێنێکی بەرز، تا ببێتە پەندو عیبرەت ﴿وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ﴾ (واتە: بەڕاستی زۆری لە خەڵکی لە نیشانەکانی ئێمە بێئاگان) بۆیە بەسەریاندا تێدەپەڕی‌و دووبارە دەبێتەوە کەچی سوودی لێوەرناگرن، چونکە نایانەوەی بەدەمیەوە بچن.

بـه‌ڵام ئه‌و كه‌سـه‌ی خـاوه‌ن عه‌قڵێكـی دامه‌زراوه‌، ئـه‌و نیشـانه‌و ئایه‌ته‌كانی خـوا ﷻ ده‌بینێ كـه‌ گه‌وره‌ترین به‌ڵگه‌ن له‌سـه‌ر راسـتی په‌یامـی پێغه‌مبه‌ران.

(٩٣): ﴿ وَلَقَدۡ بَوَّأۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدۡقٖ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ فَمَا ٱخۡتَلَفُواْ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقۡضِي بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾ ﴾

(خـوا ﷻ ده‌فه‌رمـوێ:) ﴿ وَلَقَدۡ بَوَّأۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدۡقٖ ﴾واتـه‌: خـوا ﷻ نه‌وه‌كانـی لـه‌ جێگاو شـوێنی گه‌له‌كـه‌ی فیرعه‌ون نیشـته‌جێ كـرد، وه‌ خاك‌و وڵاتیانی كـرده‌ میرات بۆیـان ﴿ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ لـه‌ خـواردنـو خواردنـه‌وه‌و جگـه‌ له‌وانـه‌ش ﴿ فَمَا ٱخۡتَلَفُواْ ﴾(واتـه‌: ڕای جیـاوازو دووبه‌ره‌كه‌یان تێدا نه‌بـوو) له‌ هه‌ق ﴿ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُۚ ﴾ (واتـه‌: هه‌تـا زانین‌و شـاره‌زایی ته‌وراتیان بۆ هات) كه‌ پێویسـت بوو له‌سـه‌ری كـۆ ببنه‌وه‌و یه‌كده‌نـگ بـن، بـه‌ڵام هه‌ندێكیان سـته‌میان لـه‌ هه‌ندێكی دیكه‌یـان كرد، هه‌ر ده‌سـته‌یه‌ك مه‌به‌سـت‌و ئامانجێكـی هه‌بـوو پێچه‌وانـه‌ی ده‌سـته‌كه‌ی دیكـه‌، بۆیـه‌ جیاوازییه‌كـی زۆر له‌ نێوانیانـدا دروسـت بوو.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقۡضِي بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴾ (بێگومـان خـوا دادوه‌ری ده‌كات لـه‌ نێوانیانـدا لـه‌ ڕۆژی دواییـدا) بـه‌ حوكـم‌و بڕیـاری دادوه‌رانـه‌ی خـۆی كه‌ له‌ زانسـتی تـه‌واوو هێـزو توانایـیـه‌وه‌ سـه‌رچاوه‌ی گرتـووه‌، ئه‌مـه‌ش ئه‌و نه‌خۆشـیه‌یه‌ كه‌ خـاوه‌ن ئاینه‌ ڕاسـته‌قینه‌كان تووشـی ده‌بـن، ئه‌ویـش: شـه‌یتان ئه‌گه‌ر بـێ ئومێد بكـرێ لـه‌وه‌ی به‌گوێی بكـه‌ن لـه‌ وازهێنان له‌ ئاین به‌گشـتی، هه‌وڵ ده‌دات لـه‌ نێو خۆیاندا یه‌كتر ناشـرین بكه‌ن، وه‌ ڕق‌و كینـه‌و دژایه‌تـی ده‌خاته‌ نێوانیـان، جا له‌و جیاوازیه‌دا مه‌به‌سـته‌كه‌ی شـه‌یتان دێته‌ جێ، پاشـان به‌گومـڕا كردنـی هه‌ندێكیـان بـۆ هه‌ندێكی دیكه‌ دروسـت ده‌بـێ، له‌گـه‌ڵ دژایه‌تی هه‌ندێكیـان بـۆ هه‌ندێكـی دیكه‌، دیـاره‌ ئه‌مـه‌ش ده‌بێته‌ مایـه‌ دڵخۆش بوونی شـه‌یتان.

ئه‌گه‌رنـا ئه‌گـه‌ر په‌روه‌ردگاریان یه‌ك بـێ‌و، پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یان یه‌ك بـێ‌و، ئاینه‌كه‌یان یه‌ك بـی‌و، له‌سـه‌ر به‌رژه‌وه‌نـدی گشـتی یه‌كده‌نـگ بن، ئـه‌ی ئیتر لـه‌ پێنـاو چیـدا دووبه‌ره‌كی دروسـت ده‌كـه‌ن تا ببێتـه‌ مایه‌ی له‌تكردنی شـكۆیان‌و په‌رتـه‌وازه‌ بوونـی فه‌رمانه‌كانیان، وه‌ یاسـاو ڕێسـایان تێك بچێـت، كـه‌ سـه‌رەنجام به‌رژه‌وه‌ندیه‌ ئاینـی‌و دنیاییه‌كانیـان بكه‌وێته‌ مه‌ترسـیه‌وه‌و له‌نـاو بچێـت، وه‌ به‌و هۆیـه‌وه‌ ئاینه‌كه‌یان له‌نـاو بچێت؟

ئـه‌ی په‌روه‌ردگـار به‌زه‌یی‌و میهره‌بانیت ببارێنه‌ به‌سـه‌ر به‌نـده‌ برواداره‌كانتـدا، تا یه‌كبگرن‌و ناته‌واویه‌كانیـان پـڕ بكه‌نه‌وه‌، وه‌ دووره‌كانیـان بگه‌ڕێته‌وه‌ بـۆ لای نزیكه‌كانیان، ئه‌ی خاوه‌ن

مەزنیو بەخشندەیی.

(٩٤): ﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ فَسۡـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقۡرَءُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكَۚ لَقَدۡ جَآءَكَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ٩٤ ﴾:

خـوا ﷻ بە پێغەمبەرەکـەی موحەممەد ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ﴾ (واتـە: جـا ئەگـەر تۆ لـە گوماندای لـەوەی کـە ناردوومانەتـە خـوارەوە بۆت) ئایا ڕاسـتە یـان ڕاسـت نیـە؟ ﴿ فَسۡـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقۡرَءُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكَ ﴾ واتـە: پرسـیار لـە خـاوەن کتێبـەکان بکـە ئەوانـە بـە ویژدانـن، وە لـە زانـاو داناکانیـان ئەوانـەی ڕۆچوون لـە زانسـتدا، بێگومـان ئـەوان بەڕاسـتی دان بەوەدا دەنێـن کە هەواڵـت پێـی داوە، وە ڕێک دێتـەوەو گونجـاوە لەگـەڵ ئـەوەی تۆدا.

ئەگـەر بوتـرێ: زۆربەی خـاوەن کتێبـەکان لە جولەکـەو گـاورەکان، پێغەمبـەری خوایان بەدرۆ دانـاو دژایەتیشـیان دەکـرد، وە بانگەوازەکەیشـیان ڕەتدەکردەوە.

لـە کاتێکـدا خـوا ﷻ فەرمانـی بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ کـرد، ئـەوان بـکات بە شـایەتو شایەتیشـیان بکاتـە بەڵگـەو سـەلماندن لەسـەر ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی هێناویەتی، جـا ئەوە چـۆن دەبێ؟

وەڵامی ئەمە لە چەند ڕوویەکەوەیە:

یەکـەم: شـایەتی ئەگـەر دراوە پـاڵ دەسـتەیەک، یـان مەزهەبێک، یـان شـارێکو وێنەی ئەوانـە، ئـەوە تەنها مەبەسـت پێـی کەسـە دادگەرەکانە لـە نێوانیانـدا، بەڵام جگە لـە ئەوان ئەگـەر زیاتریـش بـن لە غەیـری خۆیان هیـچ پەندێکـی لێوەرناگیرێ، چونکە شـایەتی دان لەسـەر ڕاسـتیو دادگەری بونیـاد دەنرێت، ئەمەیـش ڕوویدا لـە کاتی بڕواهێنانـی زۆرێک لـە خواناسـەکانی (جولەکەو گـاورەکان) وەکو (عبـد الله)ی کوڕی (سـلام)و هاوەڵەکانی، وە زۆرێـک لەوانـەی کـە مسـوڵمان بوون لەسـەردەمی پێغەمبـەرو ﷺ و جێنشـینەکانی، وە لـەدوای ئەوانیش.

دووەم: شـایەتی دانـی خـاوەن کتێبـەکان بـۆ پێغەمبـەر ﷺ لەسـەر تـەورات بونیـاد نراوە، کـە دەدرێتـە پاڵـی، جـا ئەگـەر ئـەوەی لـە تەوراتدا هەیـە گونجـاو بـوو لەگـەڵ قورئاندا بەڕاسـتی دادەنـاو شـایەتی ڕاسـتی بۆ دەدا، ئـەوە ئەگەر هەموو خـاوەن کتێبەکان لەسـەرەتا بـۆ کۆتاییـان نکوڵـی ئەوەیـان کـرد، هیـچ زیانێکـی نابێ بـۆ ئەو پەیامـەی بـۆ پێغەمبەر هاتوە.

سـێیەم: خـوای بەرزو مـەزن فەرمانی بەپێغەمبەرەکـەی ﷺ کردوە، خـاوەن کتێبەکان بکات بە شـایەت لەسـەر ڕاسـتی ئەو پەیامـەی هێناویەتـی، ئەوەی ئاشـکرا کردوەو دەریخسـتووە لەپێـش چاوی هەمـوو خەڵکدا.

بێگومـان زانـراوە زۆربـەی خـاوەن کتێبـەکان زۆر سـووربوون لـە پـووچ کردنـەوەی بانگەشـەی پێغەمبـەر موحەممەد ﷺ، ئەگـەر ئەوان شـتێکیان لەلا هەبوایە بـۆ ڕەتکردنەوەی ئـەو پەیامـەی خـوا ﷻ دایبەزانـدووە، بێگومـان ئاشـکرایان دەکـردو دەریان دەخسـت.

کاتـێ هیچیـان بەدەسـتەوە نەبـوو بۆ دژایەتـی کردنـی بێدەنگیان هەڵبـژارد لـە بەرانبەری، ئـەوە لـە گەورەترینـی بەڵگەکانە لەسـەر ڕاسـتی قورئان.

چـوارەم: بێگومـان زۆربەی خـاوەن کتێبەکان ڕەتی پەیـامو بانگەوازی پێغەمبەریـان نەکردوە، بەڵکـو زۆربەیـان بەدەمیـەوە هاتـنو ملکەچـی بـوون بەویسـتو ئـارەزووی خۆیـان، کاتێ پێغەمبەر ﷺ نێردرا زۆربەی دانیشـتوانی سـەر زەوی شـوێنی ئاینی خاوەن کتێبەکان کەوتبوون. ئاینەکـەی زۆری نەخایانـد هەتا زۆربەی خەڵکی شـامو میسـرو عیراق هاتنە ناو ئیسـلامەوە، وە ئەوەیشـی لـە دەوروبـەری ئـەو وڵاتانـە بوو کـە مەڵبەندو بارەگـای خـاوەن کتێبەکان بـوو، کـەس نەمایەوە تەنهـا ئەو دەسـەڵاتدارانە نەبێ کە شـوێنی دونیا کەوتبوون، بەشـێکی کەمیـش لـە عەموامو نەفـامو گێلو گەمـژەکان، ئەوەیشـی شـوێنیان کەوتبوو تەنهـا بەناو بـوو نـەک بەمانا: وەکـو ئەفرەنـج کە لـە حەقیقەتدا (دەهـری) بـوون، لایاندابوو لـە ئاینی هەمـوو پێغەمبـەران، تەنهـا لەبـەر ئـەوە خۆیـان دابـووە پـاڵ ئاینـی مەسـیحی بۆ بـرەودان بـە موڵکـو دەسـەڵاتەکەیانو پەردەپۆشـکردنی ناهەقیەکانیان، وەک چۆن شـتێکی ڕوونو ئاشـکرایە بۆ هەرکەسـێ شـارەزای بارووودۆخیـان بێت.

وە خـوا فەرموویەتـی: ﴿ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ ﴾ واتـە: ئـەو ڕاسـتیەی کـە هیـچ گومانێکـی تێـدا نیـە بـە جـۆرێ لـە جـۆرەکان، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴾ وەک فەرمـوودەی خـوای بـەرز: ﴿ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيْكَ فَلَا يَكُن فِى صَدْرِكَ حَرَجٌ مِّنْهُ ﴿٢﴾ ﴾الأعـراف، (واتـە: ئەمـە کتێبێکـە بۆ تـۆ هاتووەتە خـوارەوە کەواتە با سـەغڵەتی لـە دڵو دەرونتـدا نەبێ).

(٩٥): ﴿ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾:

پوختـەی ئـەم دەقـە خوا ﷻ دوو شـتی قەدەغە کـردوە: گومان لـەم قورئانـەدا، وە دوو دڵی تیایدا.

لـەو دووانــە توونـد تــرو خراپتر بــەدرۆ دانانــی قورئانــە، بێگومان ئەوانــە کۆمەڵــە ئایەتێکی خــوای مەزنــن، ڕوونو ئاشــکران هەرگیــز درۆ هەڵناگرن، هەرکەســی بۆچوونــی بەو جۆرە بــێ ئــەوە زەرەرمەنــدەو هەرگیــز قازانــج نــاکات، ئەویــش لەدەســتدانی پاداشــتە لــە دنیاو دوارۆژدا، وە بەدەســت هێنانــی ســزایە لــە دنیاو دوارۆژدا، جــا قەدەغە کردنی شــتێ بەڵگەیە لەســەر فەرمــان کــردن بــە پێچەوانەکــەی، ئــەوە دەبێتە فەرمــان کردن بــە بەڕاســتدانانێکی تــەواو بــە قورئــان، وە ئارامــی دڵ بــۆ لای، وە ڕوو تێکردنــی بە زانســتو بــە کردەوە.

جــا بــەو شــێوەیە بەنــدە دەبێتــە یەکێــک لەو کەســانەی کــە ســەرکەوتوو بــوون، ئەوانەی کە گەیشــتن بــە بەرزترینــی داواکاریــەکانو چاکترینــی حەزو ویســتەکانو تــەواو ترین سەرگوزەنشــتە، وە هەمــوو زیــانو زەرەرێکیــان لــێ بەدوورخرایەوە.

(٩٦-٩٧): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوۡ جَآءَتۡهُمۡ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴿٩٧﴾ ﴾:

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتۡ عَلَيۡهِمۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ﴾ واتــە: (بــە ڕاســتی ئەوانــەی دەرچــووەو چەســپاوە بۆیــان بڕیــاری پەروەردگــارت) ئەوانــە لــە گومــڕاو سەرلێشــواوەکانی ئەهلــی ئاگــرن، هەر دەبــێ بگەن بە قەزاو قــەدەری خوا ﷻ، بــڕوا ناهێنن ئەگــەر هــەر بەڵگــەو نیشــانەیەکیان بــۆ بێــت ، ئەوانــە ئایــەتو نیشــانە هیچیــان لــی زیاد نــاکات تەنهــا گومڕاییو لە ســنوور دەرچــوون نەبێ، خــوا ﷻ زوڵمی لێنەکــردوون، بەڵکو خۆیــان زوڵمیــان لــە نەفســی خۆیــان کــردوە، بــە ڕەتکردنــەوەی هــەق کاتێ یەکــەم جار بۆیــان هاتــووە، خوا ســزای داون بــەوەی مۆری هێناوە بەســەر دڵو گــوێو بینینیانــدا، بڕوا ناهێنــن هەتــا ســزای ســەختی خــوا ﷻ بەچاوی خۆیــان نەبینــن کــە پەیمانیان پێــدراوە.

ئــەوکات بەتەواوەتــی بۆیــان دەردەکــەوێو دڵنیــا دەبــن، ئــەوەی ئــەوان لەســەری دەڕۆن بریتیــە لــە گومڕایــی تــەواو، ئەوەیشــی پێغەمبــەران بۆیانــی هێنــا بوو هــەقو ڕاســت بوو، بــەڵام لەکاتێکــدا ئیمانو بڕوا هیــچ ســوودێکیان پێناگەیەنێت، لەو ڕۆژەدا ســتەمکاران هیچ بــڕوو بیانوویەکیــان نامێنــێ، وە داوایــان لێناکــرێ خوا ﷻ لــە خۆیان ڕازی بکــەن، بەڵگەو نیشــانەکان تەنهــا بــۆ ئەو کەســە ســوودی هەیە خــاوەن دڵێکــی زینــدوو بێت، یــان گوێ بگــرێ بــۆ قورئانو بیریشــی لــە لای بێت.

فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ
لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا
وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِي ٱلْأَرْضِ
كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ
﴿٩٩﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ
عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي ٱلْأَيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ
﴿١٠١﴾ فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْ
قُلْ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّي
رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾
قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي شَكٍّ مِّن دِينِي فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ
تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُمْ وَأُمِرْتُ
أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا
وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا
يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾

(٩٨): ﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ﴾ (شارێ) لەو شارانەی کە (پێغەمبەرانیان) بە درۆ دادەنا ﴿ ءَامَنَتْ ﴾ (بروایان بهێنایە) کاتێک سزایان بینی ﴿ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ ﴾ واتە: هیچ یەکێک لەو گەلانە ئیمانەکەیان سوودی پێنەگەیاندن کاتێ کە سزایان بینی، هەروەکو خوا ﷻ دەربارەی فیرعەون فەرمووی وەک پێش ئێستا باسکرا، کاتێ فیرعەون (لە کاتی خنکانی دا) وتی: ﴿ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِيٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾ یونس.

جا پێی وترا: ﴿ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ ﴾ یونس. هەروەک لە شوێنێکی دیکەدا فەرموویەتی: ﴿ فَلَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِۦ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ ﴾ غافر. (واتە: ئنجا کاتێ سزای بەتینی ئێمەیان بینی ووتیان: باوەڕمان بەخوای تاکو تەنها هێنا وە بێباوەڕین بەو شتانەی کردوومانە هاوبەشی خوا* جا باوەڕهێنانەکەیان هیچ سوودی نەبوو بۆیان لەکاتێکدا سزای ئێمەیان دی سوونەتو نەریتی خوا هەروابووە پێشتر لەگەڵ بەندەکانیدا وە لەوێدا بێبڕوایان زەرەرمەند بوون).

وە هەروەها دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّآ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ المؤمنون، (واتە: هەتا کاتێک مردن هاتو ڕووی لە یەکێکیان کرد، (ئەویش) وتی: پەروەردگارم بمگەڕێنەوە. بەڵکو کردەوەیەکی چاک ئەنجام بدەم لەوەی بەجێمهێشت (خوا پێی دەفەرموێ:) نەخێر).

حیکمەت لەمەدا ڕوونو ئاشکرایە، بەڕاستی ئیمانی ناچاری پێی ناوترێ ئیمان هێنان چونکە ئەگەر سزاکەی لەسەر لابراو ئەو کارەیشی ناچاری کردوە بۆ برواهێنان ئەوە جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ کوفرو بێبڕوایی، خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُوا ﴾ دوای ئەوەی کە سزایان بینی ﴿ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْيِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴾ ئەوان جیاکراونەوە لە گشتاندنەکەی پێشوو، هەردەبێ ئەمە حیکمەتێکی تێدا بێت کە خوای زانا بە پەنهانو ئاشکرا دەیزانێتو بە ئێمە نەگەیشتووە، وە بیرو تێگەیشتنمان دەرکی پێناکا، خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ ﴾ تا دەگاتە: ﴿ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُوا فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾ ﴾ الصافات، (واتە: وە بێگومان یونس لە ڕەوانە کراوان بوو, وە ناردمان بۆ لای سەد هەزار کەس بەڵکو زیاتریش . وە بڕوایان هێناو ئێمەش تا کاتێکی دیاریکراو, هێشتماننەوە).

دەگونجێ حیکمەت لەمەدا ئەوەبێ، جگە لە گەلەکەی یونس ﵇، ئەوانەی لەناوچوون ئەگەر بگەڕێنرێنەوە بۆ دونیا، بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو کارانەی کە لێیان قەدەغەکرابوو. بەڵام خوا ﷻ زانی گەلەکەی یونس ﵇ ئیمانو برواهێنانەکەیان بەردەوام دەبێ، بەڵکو بەردەوام بوو وە پابەندیش بوون لەسەری، وە خوا زاناترە.

(٩٩-١٠٠): ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾:

خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ﴾ (واتە: ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە هەموو خەڵکی سەر ئەم زەمینە بڕوایان دەهێنا) بەوەی ئیمانی بۆ ئیلهام دەکردن، وە دڵیشی جێگیر دەکردن بە تەقواو خۆپارێزی، توانای خوا ﷻ گونجاوە بۆئەوە، بەڵام حیکمەتی خوا ﷻ وای پێویست کردوە کە هەندێکیان بڕواداربنو هەندێکی تر بێبڕوا. ﴿ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ﴾ واتە: تۆ توانات نیە بەسەر ئەوەی خەڵکی ناچار بکەی بە زۆر بڕوا بهێنن، وە هیچ کەس ئەو هێزوو توانایەی نیە ئەو کارە بکات ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: بۆ هیچ نەفسێک نیە کە بڕوا بهێنێ ئیلا بە مۆڵەتی خوا نەبێ) واتە: بە ویستو ئیرادەو مۆڵەتی قەدەریو شەرعی خۆی نەبێ، جا هەرکەسێ لە بەدیهێنراوەکان شایستەی ئەو برواهێنانە بێ، وە لای خوا ﷻ پاکو پاڵفتەبێ، خوا ﷻ سەرکەوتووی دەکات بۆ هیدایەتو ڕێنمایی.

﴿ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ ﴾ واتە: شەڕو گومڕایی ﴿ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ ئەوانەی تێنافکرێن‌و گوێ بە فەرمان‌و قەدەغە کراوەکانی خوا ﷻ نادەن، ئامۆژگاریەکانی خوایان هەر بە خەیاڵدا نایە.

(١٠١-١٠٣): ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِي ٱلْآيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْ ۚ قُلْ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾:

خوا ﷻ بەندەکانی بانگ دەکات کە بە ووردی تەماشای ئاسمانەکان‌و زەوی بکەن، مەبەستیش لەوەدا: ئەوەیە تێبفکرێن‌و بیری لێبکەنەوەو لە مەزنیان ڕابمێنن، لەوەی کە تیایدایەو بیرکردنەوەی قوڵ لەخۆدەگرێ، بەڕاستی لەوەدا بەڵگەو نیشانە هەیە، بۆ گەلێ کە بڕوابهێنێ، وە پەندوو ئامۆژگاریە بۆ گەلێ کە دڵنیاییان تێدا هەبێ، بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە خوا پەرستراوی ستایشکراوە، خاوەن گەورەیی‌و بەخشندەییە، وە خاوەن ناوە بەرزوو مەزنەکانە ﴿ وَمَا تُغْنِي ٱلْآيَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴾ بێگومان ئەوانە سوودوو کەڵک لە نیشانەو ئایەتەکان وەرناگرن، بە هۆی پشت تێکردن‌و عینادی‌و کەللەڕەقیانەوە ﴿ فَهَلْ يَنتَظِرُونَ ﴾ واتە: ئەوانەی بڕوا ناهێنن بە ئایەتەکانی خوا دوای ڕوون بوونەوەشی چاوەڕێی چی دەکەن؟! ﴿ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْ ﴾ واتە: بێجگە لە ڕووداوێک وەک ڕووداوەکانی ئەوانەی کە لەپێشیانەوە ڕابورد، لە ناوچوون‌و سزادان، چونکە هەمان کاری گەلەکانی پێش خۆیانیان دەکرد، وە سونەت‌و نەریتی خواش ڕێرەوەی خۆی دەگرێ بۆ گەلەکانی پێشین‌و دوای ئەوانیش ﴿ قُلْ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴾ بە زوویی دەزانن سەرەنجامی چاک بۆ کێیەو کێ ڕزگاری دەبێت لە دنیاو دواڕۆژ، بێگومان کەس ڕزگاری نابێ جگە لە پێغەمبەران‌و شوێنکەوتوانی نەبێ، لەبەرئەمەیە فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ لە ناخۆشی‌و سەغڵەتیەکانی دنیاو دواڕۆژ ڕزگاریان دەکەین ﴿ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا ﴾ ئابەو شێوەیە پێویستمان کرد لەسەر خۆمان ﴿ نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ (ئیمانداران ڕزگار بکەین) ئەمە لە بەرگری کردنی خوایە لە بڕواداران، بێگومان خوا بەرگری دەکات لە بڕواداران، ئەویش بە پێی ئیمانی بەندەیە ڕزگار بوونی بۆ دەبێت لە ناخۆشی‌و نارەحەتیەکان.

(١٠٤-١٠٥): ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي شَكٍّ مِّن دِينِي فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ ﴾:

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ گەورەی پێغەمبەرانو پێشەوای خواناسانو چاکترینی دڵنیابووان دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى ﴾ واتە: (ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە) لە گومانو دوو دڵیدان، ئەوە من لەگومانو دوو دڵیدا نیم لە ئاینەکەم، بەڵکو زانستی دڵنیاکەرەوەم هەیە کەئەوە هەقو ڕاستە، وە ئەوەیشی بانگەشەی بۆ دەکەن پوچو بێ مانایە، وە من بەڵگەی نیشانەی ڕوونو ئاشکراو سەلماندنی یەکلاکەرەوەم هەیە بۆ ئەو مەبەستە.

لەبەر ئەمە فەرموویەتی: ﴿ فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ (واتە: دڵنیا بن جگە لە خوا ئەوانەی ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم) لە بتو هاوشێوەکانی، چونکە ئەوانە ناتوانن هیچ دروست بکەنو ڕزقو ڕۆزی بدەن، وە ناتوانن هیچ کاروبارێکیش بەڕێوە ببەن، بەڵکو ئەوانە دروستکراوی ژێربار خراون، هیچ شتێکیان تێدا نیە کە وابخوازێ بەندایەتیان بۆ بکرێ.

﴿ وَلَـٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ﴾ واتە: ئەویش ئەو خوایەیە کە دروستی کردوون وە هەر ئەویشە دەتانمرێنێو پاشان زیندووتان دەکاتەوە، بۆ ئەوەی پاداشتی کردەوەکانتان بداتەوە، بەڕاستی تەنها ئەو شایستەی ئەوەیە بپەرسترێ، وە نوێژی بۆ بکرێ، ملکەچی بۆ بنوێنرێو سوژدەی بۆببرێ. ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ﴾ واتە: کردەوە ئاشکراو پەنهانەکانت با تەنها بۆ خوابێ، بەڕاستو ڕەوانی شەریعەتی خوا ﷻ بەجێبێنە، واتە: ڕووبکە خواو پشت بکە لە جگە لەئەو ﴿ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾ (واتە: وە بەهیچ جۆرێ لە هاوبەش دانەران مەبە) نە لە حاڵو باریاندا، وە لەگەڵیشیاندا مەبە.

(١٠٦): ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾ ﴾:
ئەمە وەسفێکە بۆ گشت دروستکراوێک، کە هیچ سوودو زیانێکی بەدەست نیە، بەڵکو سوودبەخشو زیان بەخش تەنها خوای باڵادەستە. ﴿ فَإِن فَعَلْتَ ﴾ واتە: داوات کرد لە غەیری خوا ﷻ، کەهیچ سوودوو زیانێکی بۆت نیە ﴿ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾ (واتە: ئەوە تۆ لەو کەسانەی) کە زیانیان بە نەفسی خۆیان گەیاندووە بە لەناوچوونی، وە ئەم زوڵمو ستەمەش بریتیە لە شیرکو هاوەڵدانان، هەروەکو چۆن خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾لقمان، (واتە: بێگومان هاوبەش دانان ستەمێکی مەزنە) جا ئەگەر باشترینی بەدیهێنراوەکان هاواروو داوا لە غەیری خوا ﷻ بکات، ئەوە یەکێکە لە ستەمکارانو بتپەرستان، دەبێ حاڵی کەسێکی تر چۆن بێ؟!

وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ ۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾

(١٠٧): ﴿ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ۖ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ ﴾:

ئەمــە لــە مەزنترینــی ئــەو بەڵگانەیــە کــە بەڕاســتی خوا ﷻ بەتاک‌و تەنها شایستەی پەرستنە، بێگومـان ئـەو سـوود بەخـش‌و زیـان گەیەنەرە، دەبەخشـێت‌و دەیگرێتەوە، هەر زیانێــک بگەیەنێــت وەک: هەژاریی‌و نەخۆشــی وە وێنــەی ئەوانــە: ﴿ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ ﴾ (واتــە: هیــچ لادەرێــک نیــە بــۆ ئــەو زیانە جگە لــە خوا نەبــێ) چونکــە بەدیهێنــراوەکان ئەگــەر هەموویــان کۆببنــەوە بــۆ ئــەوەی ســوود بگەیەنــن بــە شــتێک، ســوودی پــێ ناگەیەنــن، مەگــەر بــەوە نەبــێ خــوا ﷻ نووســیبێتی، وەئەگــەر کــۆ ببنــەوە بۆ ئــەوەی زیــان بــە کەســێ بگەیەنــن، ناتوانــن زیانــی پێبگەیەنن، ئەگــەر خــوا ﷻ نیــازی نەکردبــێ.

لەبــەر ئەمەیــە فەرموویەتــی: ﴿ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ﴾ هیــچ یەکێــک لــە دروســتکراوەکان ناتوانێــت ڕێگــری لــە فــەزڵ‌و چاکەیەیــەک بــکات کە خــوا ﷻ نیازی کردبــێ، هەروەکو چــۆن خــوا ﷻ فەرموویەتــی: ﴿ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ ﴾ فاطر. (واتــە: هەرکاتــێ خــوا دەروازەی ڕەحمــەت‌و بەخششــی خــۆی لە خەڵکی بکاتــەوە، ئەوە هیچ کەس‌و هیچ شــتێک ناتوانێــت بــەری بگرێت، هەرکاتێکیــش دەروازەی ڕەحمەتی بگرێتــەوەو دای بخات، کەس ناتوانێــت دوای گرتنەوەکــەی خــوا بێجگــە لــە خــۆی بیکاتــەوە، ئــەو زاتــە هەر خۆیشــی باڵادەســت‌و دانایە).

﴿ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾ واتــە: ڕەحمەتــی خــۆی تایبەت دەکات بۆ هەرکەســێ کــە بیەوێــت لە دروســتکراوەکانی، خوا ﷻ خــاوەن فەزڵ‌و مەزنیــە ﴿ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ﴾ (خوا

لێبوردەیە) بۆ هەموو هەڵەو هەڵخلیسكانەكان، كەوا بەندەی خۆی سەركەوتوو دەكات‌و ئاراستەی دەكات بۆ گرتنەبەری هۆكارەكانی لێ خۆشبوون، جا ئەگەر ئەنجامی دا، خوا لە گوناهەكانی خۆش دەبێ بە گەورەو بچووك.

﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ (بە بەزەییە) كە ڕەحمەت‌و بەزەیی هەموو شتێكی گرتوەتەوە، وە بەخشندەیشی گەیشتووە بە هەموو بوونەوەرەكان، بەجۆرێ بێنیاز نین لە چاكەی خوا تەنانەت بەقەد چاوترووكانێكیش.

جا ئەگەر بەندە بە بەڵگەی یەكلاكەرەوە زانی‌و بۆی دەركەوت كە خوا تاكو تەنهایە بە پێدانی نازوو نیعمەتەكان‌و بەخشینی چاكەكان‌و لابردن‌و لادانی ناخۆشی‌و تەنگانەو بەڵاو ناڕەحەتیەكان، وە هیچ یەكێك لە دروستكراوەكان ئەمەی بەدەست نیە، مەگەر خوا ﷻ لەسەر دەستی ئەو بیهێنێتە پێش‌و ڕووبدات، یەكلابێتەوە كە تەنها خوا هەق‌و ڕاستە، وە هەر شتێ لەوانەی كە هاواری پێدەكەن هانای بۆ دەبەن پووچ‌و بێ بنەمایە. بۆیە كاتێ بەڵگەی ڕوونی دەرخست، دوای ئەوە فەرمووی:

(١٠٨-١٠٩): ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾ وَٱتَّبِعْ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَٱصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾

﴿ قُلْ ﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ كاتێك بەڵگەو سەلماندن ڕوون بووەوە بڵێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ﴾ واتە:(ئەی خەڵكینە) هەواڵی ڕاست‌و دروست كە پشت بەستە بە بەڵگەو سەلماندن (بۆتان هاتووە لە لایەن پەروەردگارتانەوە)، كە هیچ گومانێكی تێدا نیە بەجۆرێ لە جۆرەكان، پێتان گەیشتووە لە لایەن پەروەردگارتانەوە، كە لە مەنترینی پەروەردەكانی بۆتان دابەزاندنی ئەم قورئانەیە، كە ڕوون كەرەوەیە بۆ هەموو شتێ، وە جۆرەها حوكم‌و بڕیارو داواكاریەكانی پەرستراوێتی‌و ڕەوشتە بەرزەكانی تێدایە، لەوەدا مەزنترین پەروەردەو چاكەی تێدایە بۆئێوە، بەڕاستی لەیەك جیابوویەوە ڕێنمایی‌و شارەزایی لە گومڕایی‌و سەرلێشێواوی، وە بۆ هیچ كەس گومان‌و دوو دڵی نەما. ﴿ فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴾ (واتە: هەركەسێ ڕێنمایی وەربگرێ) بە ڕێنمایی خوا: بەوەی هەقی زانیی‌و لێی تێگەیشتبێ، وە پێشی خستبێ بەسەر غەیری خۆیدا، ئەوە ﴿ لِنَفْسِهِۦ ﴾ (ئەوە بۆ قازانجی خۆیەتی) وە خوای گەورە بێ نیازە لە بەندەكانی، بەرهەمی كاروو كردەوەكانیان تەنها بۆخۆیانە ﴿ وَمَن ضَلَّ ﴾ ( وە هەركەسێ گومڕابێ)

لـە هیدایـەتو ڕێنمایـی، بـەوەی پشـت بـکات لە زانسـتی ڕاسـتەقینە یـان کـردەوەی پێ نـەکات، ﴿ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ﴾ خـوا ﷻ هیـچ زیانـی پـێ ناگـات، زیـان ناگەیەنـێ تەنها بەنەفسـی خـۆی نەبـێ ﴿ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴾ (واتـە: مـن بەرپرسـیاری ئێـوە نیم) تـا کردەوەکانتـان بـۆ تـۆکار بکـەمو لێپرسـینەوەتان بکـەم لەسـەری، بەڵکـو من بـۆ ئێوە ترسـێنەرێکی ئاشـکرام، وە خوا ﷻ بەسـەرتانەوە وەکیلە، دەی تەماشـای نەفـسو دەروونی خۆتـان بکەن مـادام ئێـوە لە مـاوەی مۆڵـەت پێدانان.

﴿ وَٱتَّبِعْ ﴾ ئـەی پێغەمبەر ﷺ (شـوێن ئـەوە بکەوە) ﴿ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ ﴾ (واتە: سروشـت بۆ کـراوە) بەزانسـتو کـردەوەو حاڵو بانگـەواز بۆکردنـی ﴿ وَٱصْبِرْ ﴾ (ئارام بگرە لەسـەر ئەوە)بەڕاسـتی ئەمـە لـە بەرزتریـن جۆرەکانی ئـارام گرتنـە، بێگومان داهاتووی گەشـبینو سـتایش کـراوە، دەی کەواتـە کەمتەرخەمـی مەکـەو سـاردمەبەرەوە، بەڵکـو بـەردەوام بە لەسـەر ئـەوەو جێگیـر بـە لەسـەری ﴿ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ ﴾ (هەتا خـوا ﷻ بڕیـار دەدات) لە نێـوان تـۆو ئەوانـەی بەدرۆتیان دادەنـا ﴿ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾ (وە ئەو خـوا ﷻ چاکترینی هەمـوو دادوەرو بڕیاردەرانـە) چونکـە بڕیـارو دادوەری خـوا ﷻ ئەوپـەڕی دادپـەروەری تێدایـە کە لەسـەری ستایشـکراوە. بێگومـان پێغەمبـەر ﷺ فەرمانی پەروەردگـاری جێبەجێ کـردو بـەردەوام بـوو لەسـەر ڕێگـای ڕاسـت، تا خـوا ﷻ ئاینەکەی ئاشـکرا کرد بەسـەر هەمـوو ئاینەکانـدا، وە سەریخسـت بەسـەر دوژمنەکانیدا بـە شمشـێرو ڕم دوای ئەوەی خوا سـەری خسـت بەسـەریاندا بە بەڵگـەو حوججەو سـەلماندن، سـتایش تەنها بۆ خـوا ﷻ، وە وەسـفی جـوانو چاک بـۆ گەورەییو مەزنـیو تـەواویو فراوانـی چاکەکانی.

تەفسیری سووڕەتی (یونس) تەواو بوو


سُورَةُ هُودٍ
بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
الٓرۚ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ١
أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَۚ إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ٢ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟
رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ
كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥۖ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ
كَبِيرٍ ٣ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ٤ أَلَآ إِنَّهُمْ
يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا۟ مِنْهُۚ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ
يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٥

## تەفسیری سوورەتی (هود)

## مەککیە (١٢٣) ئایەتە

## بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٤): ﴿ الٓرۚ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَۚ إِنَّنِى لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ ﴿٢﴾ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥۖ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴿٣﴾ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەمە ﴿ كِتَٰبٌ ﴾ کتێبێکی مەزنەو پلەیەکی گەورەی هەیە ﴿ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ﴾ واتە: ئایەتەکانی پتەوو جوان داڕێژراوە، هەواڵەکانی ڕاستە، فەرمانو قەدەغەکراوەکانی پڕە لە دادپەروەری، وشەکانی پاراوەو پڕ ماناو سەنگینە، ﴿ ثُمَّ فُصِّلَتْ ﴾ واتە: جیاکراوەتەوەو ڕوونکراوەتەوە بە بەرزترین جۆرەکانی ڕوونکردنەوە، ﴿ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ ﴾ شتەکان لە جێگای خۆیاندا دادەنێ، بە پێی پلەو پایەکانیان، هیچ فەرمانێک ناکاتو هیچ قەدەغەیەک ناکات تەنها بە پێی داخوازی حیکمەتێک نەبێ ﴿ خَبِيرٍ ﴾ زانایە بە ئاشکراو نهێنیەکاندا، جا ئەگەر داڕشتنو ڕوونکردنەوەی لە لایەن خوای کاربەجێو زاناوە بێت، ئیتر لە دوای ئەمە پرسیار لە مەزنیو گەورەیی (ئەم کتێبە) مەکە، چونکە تەواویو دانایىو میهرەبانیو بەرفراوانی لە خۆدەگرێ، خوا ﷻ کتێبەکەی دابەزاندوە ﴿ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ واتە: بۆ ئەوەی ئاینی خوا ﷻ بە دڵسۆزیەوە ئەنجام بدەن، وە هیچ یەکێک لە دروستکراوەکانی نەکەن بە هاوەڵو هاوبەشی ﴿ إِنَّنِى لَكُم ﴾ ئەی خەڵکینە! ﴿ مِّنْهُ ﴾ واتە: لە لایەن خوای پەروەردگارتانەوە ﴿ نَذِيرٌ ﴾ (ترسێنەرم) بە سزای دنیاو دوا ڕۆژ بۆ ئەو کەسەی بە بوێریو سەرکەشیەوە سەرپێچیو گوناە دەکات ﴿ وَبَشِيرٌ ﴾ (وە مژدەدەرم) بۆ ئەوانەی کە گوێڕایەڵی خوا ﷻ

دەکەن، بە پاداشتی دونیاو دوارۆژ، ﴿ وَأَنِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ﴾ لەو تاوانانەی ئەنجامتان داوە، ﴿ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾ لەوەی کە رووی تێبکەن لە کاروبارەکانتاندا بە گەڕانەوە بۆ لای، وە ملکەچ بوونی خوا ﷻ لەوەی کە پێی ناخۆشە بۆ لای ئەوەی کە پێی خۆشە.

پاشان باسی ئەوە دەکات کە دادەمەزرێ و بە دەست دێ لەسەر داوای لێبووردن کردنو تەوبە کردن، فەرموویەتی: ﴿ يُمَتِّعۡكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا ﴾ واتە: پێتان دەبەخشێ لە رزقو رۆزیەک پێی بەهرەمەند بنو سوودو کەڵکی لێوەربگرن، ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ﴾ واتە: هەتا ئەو کاتەی کە دەمرن ﴿ وَيُؤۡتِ ﴾ بە ئێوە ﴿ كُلَّ ذِي فَضۡلٖ فَضۡلَهُۥۖ ﴾ واتە: بە چاکە خوازان دەبەخشێ لە فەزڵو چاکەی خۆی، ئەوە پاداشتی چاکەکانیانە لە بەدەستهێنانی ئەوەی پێیان خۆشە، وە رێگری کردن لەوەی پێیان ناخۆشە ﴿ وَإِن تَوَلَّوۡاْ ﴾ (ئەگەر رووی لێوەرگێرن) لەوەی کە بانگم کردوون بۆ لای، وە پشتی تێبکەنو بە درۆی بخەنەوە ﴿ فَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ كَبِيرٍ ﴾ ئەویش رۆژی قیامەتە، کە خوا ﷻ یەکەمینو کۆتا کەستان کۆدەکاتەوە، جا پاداشتان دەداتەوە بە پێی کردەوەکانتان، ئەگەر خێر بێ بەخێر، وە ئەگەر شەر بێ بە شەر.

وە کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴾ وەک بەڵگەیەک وایە لەسەر زیندوو کردنەوەی مردووەکان، بێگومان ئەو بە تواناو دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا، وە لە کۆی ئەو شتانە زیندوو کردنەوەی مردووەکانە، بە راستی هەواڵی بەوە داوە لە کاتێکدا ئەو راستگۆترینی بێژەرانە، جا دەبێ ئەوە روو بدات بە عەقڵو بە نەقڵ.

(٥): ﴿ أَلَآ إِنَّهُمۡ يَثۡنُونَ صُدُورَهُمۡ لِيَسۡتَخۡفُواْ مِنۡهُۚ أَلَا حِينَ يَسۡتَغۡشُونَ ثِيَابَهُمۡ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ۝٥ ﴾

خوا ﷻ هەواڵ دەدات دەربارەی نەفامی بتپەرستەکانو توندی گومراییان، دەفەرموێ: ئەوان ﴿ يَثۡنُونَ صُدُورَهُمۡ ﴾ واتە: لایان دەدا ﴿ لِيَسۡتَخۡفُواْ ﴾ (بۆ ئەوە خۆیان بشارنەوە) لە خوا ﷻ، جا دڵەکانیان بووە بەربەست دەربارەی زانستی خوا بە حاڵیان، وە بینینی بە کاروباریان، خوا ﷻ هەڵەکانیان روون دەکاتەوە لەم گومانەداو دەفەرموێ: ﴿ أَلَا حِينَ يَسۡتَغۡشُونَ ثِيَابَهُمۡ ﴾ واتە: خۆیان بە پۆشاکەکانیان دادەپۆشن، خوا لەو کاتەدا پێیان دەزانێ کە نهێنیترین کاتە، بەڵکو ﴿ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ ﴾ لە قسەو کردەوەکاندا، ﴿ وَمَا يُعۡلِنُونَ ﴾ ئەوەی ئاشکرای دەکەن، بەڵکو زۆر لەوەش زیاتر، وە خوا (زانایە): ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾ واتە: بەوەی کە لە دڵەکاندایە لە ویستو خورەو ئەو هەموو

ڕازو نیــازەی کــە بە زمانیــان دەری نابــڕن، ئەوانەی کە نهێنیــن و ئەوانەی کە ئاشــکران، جا ئیتــر چــۆن حاڵــی ئێوەی لە لا دەشــاردرێتەوە، ئەگــەر ســنگتان بپێچنەوە لە کینــەو دژایەتی بــۆ ئەوەی لــە خوای بشــارنەوە؟!

وە دەگونجــێ ماناکــەی لێرەدا بەم شــێوە بێ، خوا ﷻ باســی پشــت تێکردنی بــە درۆدانەرانی پێغەمبــەر ﷺ دەکات، ئەوانــەی بێئاگان لــە بانگەوازەکەی، ئەوانە لە توندی خۆپاراســتنیاندا ﴿ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ ﴾ خۆیــان دەشــاردەوە کاتــێ پێغەمبەریــان دەبینی، بۆ ئــەوەی پێغەمبەری خــوا ﷺ نەیانبینــێ، ئەوانیــش بانگەوازەکەی نەبیســتن، نــەوەک ئامۆژگاریان بــکات بەوەی کــە ســوودی هەیە بۆیــان، ئایا لە ســەرووی ئەم پشــت تێکردنەوە شــتێکی دیکــە هەیە؟!

پاشــان خوا ﷻ بەڵێنی پێداون بــەوەی کە زانیاری هەیە دەربارەی هەمــوو باروودۆخەکانیان، بێگومــان ئەوان لە خوا ﷻ ون نابن، وە پاداشــتیان دەداتەوە لەســەر ئەوەی کردوویانە.

﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ
مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٦ وَهُوَ
ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ
عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ وَلَئِن
قُلۡتَ إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ
إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ٧ وَلَئِنۡ أَخَّرۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ إِلَىٰٓ
أُمَّةٖ مَّعۡدُودَةٖ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحۡبِسُهُۥٓۗ أَلَا يَوۡمَ يَأۡتِيهِمۡ لَيۡسَ
مَصۡرُوفًا عَنۡهُمۡ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ
٨ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ ثُمَّ نَزَعۡنَٰهَا مِنۡهُ إِنَّهُۥ
لَيَـُٔوسٞ كَفُورٞ ٩ وَلَئِنۡ أَذَقۡنَٰهُ نَعۡمَآءَ بَعۡدَ ضَرَّآءَ
مَسَّتۡهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّيٓۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٞ فَخُورٌ
١٠ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم
مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ١١ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ
وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ جَآءَ
مَعَهُۥ مَلَكٌۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٞۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٌ ١٢ ﴾

(٦): ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَاۚ كُلّٞ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٦ ﴾

ده‌فه‌رمـوێ: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا ﴾ واتـه‌: هه‌مـوو گیـان له‌به‌رێـك له‌سـه‌ر ڕووی زه‌وی، لـه‌ مرۆڤ، یـان ئاژه‌ڵـی ده‌شـته‌كی، یـان ده‌ریایـی، خـوا ﷻ گره‌نتـی داوه‌ بـه‌ ڕزقو ڕۆزیو بژێویـان، ڕزقو ڕۆزیـان له‌سـه‌ر خوایـه‌، ﴿ وَيَعۡلَمُ مُسۡتَقَرَّهَا وَمُسۡتَوۡدَعَهَا ﴾ واتـه‌: ده‌زانـێ به‌ شـوێنی مانه‌وه‌ی ئـه‌م گیاندارانه‌، ئه‌ویش ئه‌و شـوێنه‌یه‌ كه‌ تیایـدا ده‌مێننه‌وه‌و ده‌حه‌سـێنه‌وه‌، وه‌ شـوێنی ده‌رچوونیـان، ئه‌و شـوێنه‌یه‌ كه‌ بـۆی ده‌چـن‌و ده‌گوازرێنه‌وه‌، وه‌ ئه‌وانه‌یشـی دێت به‌سـه‌ریاندا ﴿ كُلّٞ ﴾ له‌ هه‌موو بـارووده‌وخ‌و حاڵێكیاندا ﴿ فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴾ واتـه‌: لـه‌ (لـوح المحفـوظ)ه‌، كـه‌ هه‌مـوو ڕووداوه‌كانـی تێدایـه‌، واتـه‌: هه‌رچی له‌ ئاسـمانه‌كان‌و زه‌وی ڕووده‌ده‌ن، هه‌مـوو ئه‌وانـه‌ زانسـتی خـوا ﷻ ده‌وری داوه‌و قه‌ڵه‌مـی به‌سـه‌ردا هێناوه‌، ویسـتی جێبه‌جـێ بـووه‌، وه‌ ڕزقو ڕۆزی به‌رفراوان كردوه‌، جـا با دڵه‌كان ئـارام بـن له‌ بـه‌س بوونی ئـه‌و خوایه‌ی كه‌ گره‌نتـی ڕزقو ڕۆزیانـی كردوه‌، وه‌ به‌ زانسـتی ده‌وری زات‌و سـیفه‌ته‌كانیانی داوه‌.

(٧-٨): ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۗ وَلَئِن قُلۡتَ إِنَّكُم مَّبۡعُوثُونَ مِنۢ بَعۡدِ ٱلۡمَوۡتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ٧ وَلَئِنۡ أَخَّرۡنَا عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٖ مَّعۡدُودَةٖ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحۡبِسُهُۥٓۗ أَلَا يَوۡمَ يَأۡتِيهِمۡ لَيۡسَ مَصۡرُوفًا عَنۡهُمۡ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٨ ﴾

خـوا ﷻ هـه‌واڵ ده‌دات به‌ڕاسـتی ئـه‌و ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ﴾ (ئاسـمانه‌كان‌و زه‌وی لـه‌ شـه‌ش قۆناغ دروسـت كـردوه‌) یه‌كه‌مینـی ڕۆژی یه‌ك شـه‌ممه‌

بــوو، کۆتاییەکــەی ڕۆژی هەینــی بــوو، ﴿ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴾ کاتێــک کە زەویو ئاســمانی دروســت کــرد (عەرشــەکەی لەســەر ئــاو بــوو) لــە ســەرووی ئاســمانی حەوتــەم، جــا پــاش ئــەوەی ئاســمانەکانو زەوی بەدیهێنا، پاشــان بــەرز بووەوەو لەســەری عــەرش قــەراری گرت، کاروبــارەکان هەڵدەســوڕێنێ، چۆنــی بیەوێ لە فەرمانــە قەدەرییو فەرمانە شــەرعیەکان.

جــا فەرموویەتــی: ﴿ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴾ واتە: بــۆ ئەوەی تاقیتــان بکاتەوە، کاتــێ کــە بۆتانــی بەدیهێناوە ئــەوەی لە نــاو ئاســمانەکانو زەویدایــە بە فەرمــان کردنیو قەدەغەکردنــی، تا تەماشــا بــکات کامتان کــردەوەی چاکتــر دەکەن.

(فُضَیــل)ی کــوڕی (عیــاض) دەڵــێ: (أخلصــه وأصوبــه) بە دڵســۆزیو تەواویــەوە. وترا: ئەی باوکــی عەلــی: بــە دڵســۆزیو تەواویەوە چۆنــە؟ فەرمــووی: بە ڕاســتی کــردەوە ئەگەر بە دڵســۆزیەوە بێــت، بــەڵام نەیپێکــێو تــەواو نەبێت، ئــەوە وەرناگیــرێ، وە ئەگــەر بیپێکێو تــەواو بێــت، بــەڵام بــە دڵســۆزیەوە نەبێــت، ئــەوە وەرناگیــرێ (واتــە: هەتا بە دڵســۆزیو تەواوەیــەوە نەبێــت وەرناگیرێت).

(الإخلاص): ئەوەیە لەبەر خوا ﷻ بێت.

(الصواب) تەواویو پێکان: دەبێت بە پێی قورئانو سوننەت بێ.

ئەمــەش وەک خــوای بــەرز فەرموویەتــی: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاریــات. (واتــە: جنۆکــەو ئینســانم تەنها بۆ ئــەوە دروســتکردوە بەندایەتیم بکەن).

وە خــوای بــەرز فەرموویەتــی: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾ ﴾ الطـلاق.

بێگومــان خوا بەدیهێنراوەکانی دروســتکردوە بۆ ئەوەی بەندایەتی بکــەن، وە ناوە جوانەکانو ســیفەتە بەرزەکانــی بناســنەوە، وە فەرمانــی پێکــردوون بەوە، هەر کەســێک ملکــەچ بێتو ئــەوەی پێــی ســپێردراوە جێبەجێــی بــکات، ئــەوە لــە ڕزگــار بووانــە، وە هەر کەســێکیش پشــتی تێبــکات، ئــەوە لە خەســارەتمەندانە، هەر دەبــێ خوا ﷻ کۆیــان بکاتەوە لــە حاڵێکدا پاداشــتیان بداتەوە تیایدا لەســەر ئــەوەی فەرمانی پێکــردوونو قەدەغــەی لێکردوون.

لەبــەر ئەمــە خوا ﷻ باســی بــە درۆدانانی بتپەرســتان دەکات بە پاداشــت، جــا فەرموویەتی: ﴿ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ واتــە: ئەگــەر بــە ئەوانــە بڵێــیو هەواڵیــان پــێ بدەیت بــە زیندووکردنــەوە پاش

مـردن، هەرگیز بـڕوات پێناکەن بەڕاسـتت دانانێن، بەڵکـو بە درۆزنت دەزانـن بە توندترین بـە درۆ زانیـن، وە تانە ئەدەن لـەوەی هێناوتـەو دەڵێـن: ﴿ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ بێدار بـن ئـەوە هـەقو ڕاسـتی ڕوونکراوەیـە ﴿ وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ ﴾ واتـە: بـۆ ماوەیەکـی دیاریکـراوە، لـە نەفامـی گەمژەیـیو سـتەمکاریانەوە دەیانوت: ﴿ مَا يَحْبِسُهُۥٓ ﴾(چیـە وا سـزای ڕاگرتـوە)؟ بێگومان ئەمە بـەدرۆ دەزانن، چونکە ئـەوان بەڵگە دەهێننـەوە بـەوەی سـزایان بـۆ پێـش نەهاتـوە بە پەلـە لەسـەر بـە درۆدانانـی پێغەمبەر کە هەواڵـی دابوو تووشـی سـزا دەبـن، جا ئەمە لـە پێشـترە بـە درۆی دابنێن!!

﴿ أَلَا يَوْمَ يَأْتِيهِمْ ﴾(ئاگاداربـن ئەو ڕۆژەی) سـزا (یـان بۆ دێ) ﴿ لَيْسَ مَصْرُوفًا عَنْهُمْ ﴾ جـا ئـەو کات دەتوانـن تەماشـای کاروباریـان بکـەن ﴿ وَحَاقَ بِهِم ﴾ دادەبـەزێ ﴿ مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾ لـە سـزاو تۆڵـە کاتێ کـە گاڵتەیـان پێکـرد، هەتا بە درۆیـان دانا ئەو پەیامـەی کـە هێناویەتی.

(٩-١١): ﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾

﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ﴾ خـوا ﷻ هـەواڵ ئـەدات دەربـارەی سروشـتی مـرۆڤ، بـە ڕاسـتی نەفـامو سـتەمکارە، بەوەی خـوا ﷻ ئەگەر لـە فـەزڵو میهرەبانی خۆی خۆشـیو ئاسـوودەیی بە ئادەمیزاد چەشـتبا، وەک لەش سـاغیو ڕزقو ڕۆزیو ماڵو منداڵ، وە هـاو وێنەی ئەوەش، پاشـان لێی بسـێنێتەوە، بێگومان ئەو تووشـی بـێ ئومێدیو ملکەچی دەبـێ، هیـوای بە پاداشـتی خـوا ﷻ نامێنێ، هەرگیـز بە خەیاڵیـدا نایەت کە خـوا ﷻ بۆی دەگێڕێتـەوە هاوشـێوەی ئـەوەی لێی سـەندۆتەوە، یان باشـتر لەوە.

وە ئـەو ئەگـەر دوای ئـەو تەنگانەیـەی کە تووشـی بوو، خۆشـیو لەش سـاغی پێبەخشـی، دڵـی خـۆش دەبێو لووت بـەرزی دەنوێنـێ، وا دەزانـێ ئەو خێرو خۆشـیە بـەردەوام دەبێ، دەڵـێ: ﴿ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴾ واتـە: دڵخـۆش دەبێ بـەوەی پێیدراوە کە لەگـەڵ هەواو نەفسـیدا دەگونجێ، خۆبـەزل زانە بـە نیعمەتەکانی خوا ﷻ لەسـەر بەندەکانی خـوا، ئـەوە تووشـی خراپـەو لـووت بـەرزیو سەرسـام بـوون بـە خـۆی دەکات، وە فیزو فشـەکردن بەسـەر خەڵکـداو بە کـەم زانینیـان، چ عەیـبو ناتەواویەک لەمە ناشـرینترە؟!

ئەمە سروشتی مرۆڤە لەو ڕووەی کە هەیە، جگە لەو کەسە نەبێ کە خوا ﷻ سەرکەوتووی کردبێ‌و لەو ڕەوشتە ناشرینە دەریهێنابێ بۆ پێچەوانەکەی، ئەویش ئەوانەن کە ئارامگرو خۆڕاگرن، لە کاتی بەڵاو نارەحەتی تووشی بێ ئومێد بوون نابن، وە لە کاتی خۆشیدا لووت بەرزو خۆبەزلزان نابن، کردەوەی چاک ئەنجام ئەدەن لە پێویست‌و سوننەتەکان ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ ﴾ (لێخۆشبوون) لە تاوانەکانیان، بەو لێبوردنە هەموو ناخۆشیەکیان لێ بە دوور دەبێ ﴿ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴾ ئەویش سەرکەوتنە بە بەهەشتە پڕ لە نازو نیعمەتەکان، کە تیایدایە ئەوەی نەفس ئارەزووی دەکات‌و چاو چێژی لێوەردەگرێت.

(١٢-١٤): ﴿ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٞۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٌ ١٢ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٣ فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٤ ﴾:

خوا ﷻ دڵی پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ دەداتەوە دەربارەی بەدرۆ دانانی بەدرۆ کاران، دەفەرموێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ تَارِكُۢ بَعۡضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَضَآئِقُۢ بِهِۦ صَدۡرُكَ أَن يَقُولُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ ﴾ واتە: ئەمە لە تۆ ناوەشێتەوە، کە وتەی ئەوان کاریگەریت لێ بکات‌و بەرانبەری ئەوە بوەستیتەوە کە بۆت دابەزیوە، واز لە هەندێ نیگا بهێنی کە بۆت دابەزیوە، وە دڵتەنگ بیی پێی لەبەر ئەوەی ئەوان ڕکابەری‌و کەللەڕەقیت لەگەڵدا دەکەن بەوە کە دەڵێن: ﴿ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌۚ ﴾ بێگومان ئەم قسەیە لە کەسێکەوە دەردەچێت کە کەللەڕەق‌و عینادو گومڕاو نەفام بێ، بە بەڵگە هێنانەوە، تۆ لەسەر کاری خۆت بەردەوامبە، با کاریگەریت لەسەر دروست نەکات ئەم وتە لاوازو بێ بەڵگانە، کە تەنها لە خەڵکی گەمژەو کەم عەقڵەوە دەردەچێت، وە با دڵت بەوە تەنگ نەبێت.

ئایا ئەوان بەڵگەیەکیان هێناوەتەوە کە چارەسەری نەبێ؟ یان بە لەکەدار کردنی ئەو پەیامە کاریگەریەکیان دروستکردووەو کە لە ڕێزی کەم بکەنەوە، تا تۆ دڵت بەو هۆیەوە تەنگ بێ؟ یان لێپرسینەوەیان لە لای تۆیەو داوات لێکراوە بەزۆر بڕوایان پێبهێنی؟

﴿ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٞۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٌ ﴾ (تۆ تەنیا ترسێنەری‌و) ئەو وەکیلە بەسەریانەوە، کردەوەکانیان دەپارێزێ‌و پاداشتیان دەداتەوە بە تەواوترین شێوە،

أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ
وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾
فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ وَأَن
لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا
لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا
ٱلنَّارُ ۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُوا۟ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾
أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِّنْهُ وَمِن قَبْلِهِۦ
كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۚ وَمَن يَكْفُرْ
بِهِۦ مِنَ ٱلْأَحْزَابِ فَٱلنَّارُ مَوْعِدُهُۥ ۚ فَلَا تَكُ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ ۚ إِنَّهُ
ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٧﴾ وَمَنْ
أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ
رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ
أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ
ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٩﴾

﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾ واتە: (یان دەڵێن:) موحەممەد ئەو قورئانەی هەڵبەستوە؟ خوا وەڵامی دانەوە بە ڕستەی: ﴿ قُلْ ﴾ پێیان بڵێ: ﴿ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ ئەو هەڵبەستووە، کەواتە: هیچ جیاوازیەک لە نێوان ئێوەو ئەودا نیە لە ڕووی زمان پاراویو ڕەوانبێژیەوە، ئێوە دوژمنی ڕاستەقینەی ئەون، سوورن لەسەر ئەوەی بانگەوازەکەی بەتاڵ بکەنەوە بە بەکارهێنانی ئەوەی لە تواناتاندایە، جا ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن دەی دە سوورەتی وەک ئەو قورئانە بێنن‌و هەڵبەستراو بن، ﴿ فَإِلَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ ﴾ (جا ئەگەر وەڵامیان نەدایەوە) لەسەر شتێک لەوانە: ﴿ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلْمِ ٱللَّهِ ﴾ لە لایەن خوا ﷻ بۆ بەڵگە هێنانەوە، وە نەهێشتنی دژوو پێچەوانەکان، ﴿ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ وە هەروەها بزانن هیچ پەرستراوێک ڕاست نیە غەیری خوا، ئەو بە تاک‌و تەنها شایستەی بەندایەتی بۆ کردنە ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ ملکەچی پەرستراوێتی دەبن‌و تەسلیمی بەندایەتی کردنیشی.

وە لەم ئایەتانەدا ڕێنمایی هەیە کە نابێ بیانوو هێنانەوەی بەهانە کارانو، تانەدار کردنی تانەداران ڕێگری لە بانگخوازی بۆ لای خوا ﷻ بکات، بە تایبەت ئەگەر لەکەدار کردنەکە هیچ بەڵگەیەکی بەهێزی لە پشتەوە نەبێ، وە کاریگەری دروست نەکات لەسەر ئەو بانگەوازەی کە دەیکات، بێگومان ئەو دڵتەنگ نابێ، بەڵکو بەوە ئارام دەبێتەوە، بەردەوام دەبێ لەسەر کاروبارەکانی، وە بێگومان پێویست ناکات وەڵامی پێشنیازی پێشنیازکاران بداتەوە بەو بەڵگانەی کە ئەوان هەڵیدەبژێرن، بەڵکو ئەوەندە بەسە کە بەڵگەیەکی ڕوون‌و ئاشکرایان بۆ بهێنێتەوە لەسەر سەرجەم بابەت‌و داواکاریەکان.

بە هەمان شێوە تیایدایە کە ئەم قورئانە پیرۆزە موعجیزەیە بە خودی خۆی، هیچ یەکێک لە مرۆڤەکان ناتوانێ هاوشێوەی بهێنێتەوە، تەنانەت دە سوورەتیش وەکو ئەو بهێنێتەوە، بەڵکو تەنها

سوورەتێکیش، لەبەر ئەوەی خوا ﷻ بەرەنگاری دوژمنانی ڕەوانبێژو زمان پاراوی پێکردوە، ئەوان نەیانتوانیوە بەرپەرچی بدەنەوە، چونکە دەزانن کە ئەوان توانایان نیە بەسەریەوە.

وە تێیدایە ئەوەی لە زانستدا داوا دەکرێ بەس نیە لەسەر زۆری گومان، زانستی قورئانو زانستی یەکتاپەرستی، ئەوەی لە زانستدا داوای دەکات نابێ لەسەر گومان دابرێژرێ لە زانستی قورئانو زانستی یەکتاپەرستی، چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ ﴾. (واتە: بزانن کە ئەوە بە زانیاریی خوا نێردراوەتە خوار).

(١٥-١٦): ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٦﴾ ﴾:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا ﴾ واتە: هەموو حەزوو ویستو ئامانجەکانی کورت کردۆتەوە لەسەر ژیانی دونیا، وە لەسەر جوانیەکانی لە ئافرەتانو منداڵان سەروەتو سامانی زۆرو کەڵەکە کراو لە ئاڵتونو زێرو زیو، وە ئەسپو ماینی نیشانەدر، هەروەها ئاژەڵی چوار پێو کشتوکاڵ، هەموو تواناو کۆششی خەرج کردوە لەم شتانەدا، وە هیچ شتێکی ئامادە نەکردوە بۆ شوێنی مانەوەی، ئەمە کافرە، چونکە ئەگەر بڕواداربێ ئەوە دەبوو ئەو بڕوایەی کە هەیەتی ڕێگری لێبکات کە هەمو حەزوو ویستەکانی بۆ دونیا نەبێ، بەڵکو خودی بڕواهێنانی وە ئەوەی بۆی ئاسان کراوە لەو کاروکردەوانە، شوێنەوارێکە لە شوێنەوارەکانی ویستو ئیرادە کردنی ڕۆژی دوایی.

بەڵکو ئەم سەر لێشێواوە، وەک ئەوە وایە تەنها بۆ دونیا دروستکرابێ ﴿ نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا ﴾ واتە: پێیان دەدەین ئەوەی بەشکراوە بۆیان لە (أم الكتاب) لە پاداشتی دونیا ﴿ وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ ﴾ واتە: هیچ کەمو کوریەکیان لەگەڵدا ناکرێ، لەوەی کە بۆیان دیاریکراوە، بەڵام ئەمە کۆتا خۆشیانە ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ ﴾ بۆ هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، سزایان لەسەر هەڵناگیرێ، بێبەش بوون لە پاداشتی بێ پایان ﴿ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا ﴾ واتە: لە دونیادا بەتاڵو پەرشو بڵاو بوویەوە، لەو کارو کردەوە خراپانەی کە ئەنجامیاندا بەرانبەر بە هەقو شوێنکەوتووانی، وە ئەو کاروکردەوە چاکانەیشی کردوویانە هیچ بنەماو مەرجێکی تێدانیە کە بریتیە لە بڕواهێنان.

(١٧): ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتۡلُوهُ شَاهِدٞ مِّنۡهُ وَمِن قَبۡلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامٗا وَرَحۡمَةًۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۚ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ مِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥۚ فَلَا تَكُ فِي مِرۡيَةٖ

مِنۡهُۚ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٧﴾ ﴾:
خوا ﷻ باسی دۆخی پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ دەکات، وە ئەوەی هەستاوە لە جێگای ئەو لە میراتگرەکانی ئەوانەی پابەندن بە ئاینەکەیەوە، وە بە بەڵگەکانی دڵنیان، بێگومان هیچ کەس وەسف ناکرێ بەوان، وە هیچ کەس وەکو ئەوان نیە، جا فەرموویەتی: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾ (واتە: ئایا کەسێک بەڵگەیەکی ئاشکرای بێ لە لایەن پەروەردگاریەوە) بەو نیگایەی کە خوا ﷻ ئەو بابەتە گرنگانەی دابەزاندوە تیایدا، وە ڕێنماییە ئاشکراکانی، جا ئەو بەڵگانە دڵنیایی دەدەن ﴿ وَيَتۡلُوهُ ﴾ واتە: ئەم بەڵگە ئاشکرایە بخوێنێتەوە بەڵگەیەکی تر ﴿ شَاهِدٞ مِّنۡهُ ﴾ ئەویش شایەتی فیطرەتو پاکی خودی مرۆڤە، لەگەڵ عەقڵی تەواودا، کاتێ کە شایەتی حەقیقەتی ئەوەی داوە کە خوا نیگای کردوەو دایناوە بە شەریعەت، وە بە چاکێتی عەقڵی زانیوە، بەو هۆیە ئیمانی پێ زیادی کردوە.
پاشان شایەتی سێیەم ئەویش: ﴿ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ ﴾ ئەویش تەوراتە کە خوا ﷻ دایناو کردی ﴿ إِمَامٗا ﴾ بە پێشەواو بۆ خەڵکی ﴿ وَرَحۡمَةً ﴾ میهرەبانیەک بۆیان، شایەتی بۆ قورئان داوەو بە ڕاستەی داناوە، وە لەگەڵیدا هاوتایە لەو هەقو ڕاستیەی کە هێناویەتی.
واتە: ئایا کەسێک ئەمە وەسفی بێت، کە بەڵگەیەکی زۆر لەسەر شایەتی دانی ئیمانی هاتبێ، وە بەڵگەی یەکلاکەرەوەی لەلا بێت، وەکو ئەوە وایە لە تاریکی نەفامیدا بژی هیچ دەرچەیەکی نەبێت بۆ ڕزگار بوون؟!
بێگومان لە لای خوا ﷻ یەکسان نین، بە هەمان شێوە لە لای بەندەکانی خواش یەکسان نین، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ واتە: ئەوانەی سەرکەوتوو بوون، لە بەجێ هێنانی ئەو بەڵگانەی لە لایانە ﴿ يُؤۡمِنُونَ ﴾ بە حەقیقەتی قورئان، جا بڕواهێنانیان هەموو خێرێکیان بۆ بەرهەم دەهێنێ لە دونیاو دوارۆژدا ﴿ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ ﴾ واتە: قورئان ﴿ مِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴾ واتە: سەرجەم دارو دەستەکانی سەر زەوی، کە یەکیان گرتوە بۆ دژایەتی کردنی هەقو ڕاستی ﴿ فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥۚ ﴾ دەبێ هەر بەسەریدا بێ ﴿ فَلَا تَكُ فِي مِرۡيَةٖ ﴾ واتە: هیچ گومانو دوو دڵیەکت نەبێ (لەو قورئانە) ﴿ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾ (بە ڕاستی ئەو قورئانە ڕاستە لەلایەن پەروەردگارتەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی بڕواناهێنن)، یان بە هۆی نەفامیو گومڕاییان، یان بە هۆی ستەمو عینادیو لە سنوور دەرچوونیان، ئەگەرنا هەر کەسێک نیەتو مەبەستی چاک بێو تێگەیشتنی ڕاستو دروست بێ، هەر دەبێ بڕوای پێ بهێنێ، چونکە دەبینێ لە هەموو ڕوویەکەوە بانگەواز دەکات بۆ بڕواهێنان.

(١٨-٢٢): ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أُولَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٩﴾ أُولَٰٓئِكَ لَمْ يَكُونُوا۟ مُعْجِزِينَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ۘ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۚ مَا كَانُوا۟ يَسْتَطِيعُونَ ٱلسَّمْعَ وَمَا كَانُوا۟ يُبْصِرُونَ ﴿٢٠﴾ أُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢١﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ هُمُ ٱلْأَخْسَرُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾:

خوا ﷻ هەواڵ دەدات بە ڕاستی هیچ کەسێک نیە لەو کەسە ﴿ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴾ وە دەچێتە ئەم چوارچێوەیەوە هەموو ئەوانەی درۆ بە ناوی خواوە دەکەن، بە هاوبەشدانان بۆی، یان سیفەتێک دەدەنە پاڵی کە شیاوی گەورەیی ئەو نیە، یان هەواڵ دەربارەی ئەو دەدەن، لە کاتێکدا ئەو نەیفەرمووە، یان بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکەن، یان هاوشێوەی ئەوانە لە درۆ هەڵبەستن بە دەم خواوە، جا ئەوانە ستەمکارترینی مرۆڤەکانن، ﴿ أُولَٰٓئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ﴾ تا بە هۆی ستەمەکانیانەوە پاداشتیان بدرێتەوە، کاتێ کە بڕیار دەدرێ بەسەریاندا بە سزایەکی زۆر توند ﴿ وَيَقُولُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴾ (شایەتەکان لە پێغەمبەرانو فریشتەکان) ئەوانە شایەتیان لەسەر داون بە درۆ هەڵبەستنو بە درۆ دانانیان، ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ أَلَا لَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ واتە: نەفرینێک کە نابڕێتەوە، چونکە ستەمکردنیان بوو بە وەسفێکی پەیوەستو دانەبراو لێیان.

پاشان وەسفی ستەمەکانیانی کردوە، جا فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ جا بە نەفسی خۆیان بەرهەڵستیان لە ڕێگای خوا دەکرد، ئەویش ڕێگای پێغەمبەرانە کە خەڵکیان بانگ کردوە بۆ لای خوا، وە بەرهەڵستیان لە خەڵکی تر دەکرد، لە بڕواهێنان، هەتا بوون بە سەرمەشقی ئەوانەی بانگی خەڵکی دەکەن بۆ دۆزەخ ﴿ وَيَبْغُونَهَا ﴾ واتە: دەیانەوێ ڕێگای خوا ﴿ عِوَجًا ﴾ واتە: هەمیشە هەوڵ دەدەن ڕێگای خوا ﷻ لەلای خەڵکی بە لاریو چەوتی پیشان بدەن، بۆ ئەوەی لە پێش چاو خەڵکی بەڕاست دانەنرێ، جا بەتاڵو پووچ چاک پیشان دەدەنو هەقو ڕاستیش بە ناشرین، دەک خوا ڕوویان ڕەش بکات. ﴿ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴾ (ئەوانە بە ڕۆژی دوایی بێبڕوان)

أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَۘ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ مَا كَانُواْ يَسۡتَطِيعُونَ
ٱلسَّمۡعَ وَمَا كَانُواْ يُبۡصِرُونَ ٢٠ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ
أَنفُسَهُمۡ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ٢١ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ
فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ٢٢ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ
ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ
هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٣ ۞ مَثَلُ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ كَٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡأَصَمِّ
وَٱلۡبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ
٢٤ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ٢٥
أَن لَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ أَلِيمٖ ٢٦
فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا
وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ
وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ ٢٧
قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ
عِندِهِۦ فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ أَنُلۡزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ ٢٨

﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ واتە: لە دەستی خوا ﷻ قوتار نابن، چونکە لە ژێر دەستو دەسەڵاتی ئەودان ﴿وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ﴾ تا بەرگریان لێبکەن لە نارەحەتی، یان بۆیان دەستەبەر بکەن ئەوەی حەزی پێدەکەن، هەموو هۆکارەکانیان لێدادەبڕێ ﴿يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُ﴾ واتە: سزایان بۆ دوو قات دەبێتەوە، چونکە خۆیان گومرابوونو خەڵکیشیان گومڕا کرد، ﴿مَا كَانُواْ يَسۡتَطِيعُونَ ٱلسَّمۡعَ﴾ (واتە: توانای بیستنی ئەو قورئانەیان نەبوو)، چونکە زۆر ڕقیان لە هەق بوو، وە ڕایان دەکرد لە هەق بیستن، ئەوانە ناتوانن ئایەتو نیشانەی خوا ﷻ ببیستن بە بیستنێک سوودی لێوەربگرن، ﴿فَمَا لَهُمۡ عَنِ ٱلتَّذۡكِرَةِ مُعۡرِضِينَ ٤٩ كَأَنَّهُمۡ حُمُرٞ مُّسۡتَنفِرَةٞ ٥٠ فَرَّتۡ مِن قَسۡوَرَةِۭ ٥١﴾ المدثر. (واتە: ئەوە چیانە ڕوو وەردەگێڕن لە ئامۆژگاری قورئان. ئەڵێی کەرە کێوین سڵ دەکەن. لە شێر (یان لە دەست کۆمەڵی تیر هاوێژ) هەڵاتوون، ﴿وَمَا كَانُواْ يُبۡصِرُونَ﴾ واتە: تەماشایان نەئەکرد بە شێوەیەک بیری لێ بکەنەوەو پەندی لێوەربگرن لەوەی کە سوودی هەیە بۆیان، بەڵکو ئەوان وەک کەڕوو لاڵ بوون ئەوانەی کە عاقڵ نابن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ کاتێ کە مەزنترین پاداشتیان لە دەستدا، وە شایستەی توندترین سزا بوون ﴿وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾ واتە: ئەو ئاینەی بانگەشەیان بۆ دەکردو بە چاک پێشانیان دەدا پەرشو بڵاوو خامۆش بوویەوە، وە پەرستراوەکانیان کە جگە لە خوا پەرستبوویان هیچ سوودێکیان پێ نەگەیاندبوو، کاتێ کە فەرمانی خوا ﷻ هات ﴿لَا جَرَمَ﴾ بە ڕاستیو بێگومان ﴿أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ﴾ خەسارەتو زەرەرمەندی کورتهەڵهێناوە لەواندا، بەڵکو توندترینی خەسارەتمەندی بۆ ئەوان داناوە، ئەویش بە هۆی توندی حەسرەتو بێبەش بوونو ئاخ

هەڵکێشـانیانەوە، وە ئـەوەی دەیچێژن لە ناخۆشـیو سـزاو ئازاری سـەخت، پەنـا دەگرین بە خـوا ﷻ لـە بارودۆخیان.

کاتـێ کە باسـی حاڵـی خراپەکارانـی کرد، باسـی وەسـفو پیاهەڵدانی خۆشـبەختانی کرد، وە ئـەوەی کە پێیـان دەدرێ لە پاداشـت، جـا فەرموویەتی:

(٢٣-٢٤): ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ۝٢٣ ۞ مَثَلُ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ كَٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡأَصَمِّ وَٱلۡبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ۝٢٤ ﴾

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ (بێگومـان ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە) لە دڵیانـەوە، واتە: بە ڕاسـتیان زانیـوەو دانیـان پێـدا نـاوە، کاتـێ خـوا ﷻ فەرمانـی کـردوە بـە بڕواهێنـان بەکێکـە لـە بنەماکانـی ئایـن ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾ واتە: کـە کردەوەکانـی دڵو جەسـتەو وتەکانی زمـان دەگرێتـەوە ﴿ وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ ﴾ واتـە: ملکەچـی دەبـنو سـەر بـۆ مەزنـی دادەنوێنـنو زەلیـل دەبـن بـۆ دەسـەڵاتیو دەگەڕێنـەوە بۆ لای بە خۆشویسـتنو ترسـانو ئومێـد بوونـەوە ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾ ئەوانـەی کـە ئـەو سـیفەتانەیان لـە خـۆدا کۆکردوەتـەوە ﴿ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾ چونکـە هیـچ خێـرو چاکەیەکیـان بەجـێ نەهێـڵاوە مەگـەر ئەنجامیانـداوە، وە هیـچ خێرێـک نەبـووە تەنها ئـەوان پێشـی کەوتوون، ﴿ مَثَلُ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ ﴾ دەسـتەی بەدبەختـانو دەسـتەی خۆشـبەختان ﴿ كَٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡأَصَمِّ ﴾ ئەوانـە بەدبەختەکانـن ﴿ وَٱلۡبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِ ﴾ وەکـو خۆشـبەختان ﴿ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًا ﴾ ئـەو دوو دەسـتەیە یەکسـان نیـن، بەڵکـو ئەوەنـدە جیـاوازی هەیـە لـە نێوانیانـدا وەسـف ناکـرێ، ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ (دەی بـۆ بیـر ناکەنـەوە) لـەو کردەوانەی کە سـوودی هەیـە بۆتـان ئەنجامـی بـدەن، وە ئـەو کردەوانەی کـە زیانـی هەیە بۆتـان وازی لێبهێنن .

(٢٥-٢٦): ﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ۝٢٥ أَن لَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ أَلِيمٖ ۝٢٦ ﴾

﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴾ تـا کۆتایـی چیرۆکەکـە، واتـە: بێگومـان پێغەمبەرمـان نووح ﷺ یەکەمینـی پێغەمبەران نـارد، ﴿ نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ ﴾ بانگی کـردن بـۆ لای خوا ﷻ، وە شـیرکو هاوبەش دانانی لـێ قەدەغە کردن، جـا پێی فەرموون: ﴿ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴾ واتـە: ڕوونـم کـردەوە بۆتـان لـەوەی ئاگادارتانـم کـردەوە، بە

ئاگادارکردنەوەیـەک ئاڵۆزیەکانـی لابـرد ﴿ أَن لَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾ واتـە: بە دڵسـۆزیەوە بەندایەتـی بـۆ خـوای تـاکو تەنها بکـەنو واز لـە هەمـوو ئەوانە بهێنـن کـە بەندایەتی بۆ دەکـرێ لـە غەیری خـوا، ﴿ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ أَلِيمٖ ﴾ ئەگەر یەکتاپەرسـتی خـوا ﷻ بەجێ نەهێنـنو گوێڕایەڵیـم نەکەن.

(٢٧): ﴿ فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ ٢٧ ﴾.

دەفەرمـوێ: ﴿ فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ ﴾ واتـە: پیـاو ماقـوڵانو دەسـەڵاتداران بانگـەوازی نووحیـان ﷺ ڕەتکـردەوە، هەروەکـو هاوشـێوەکانی خۆیان، بەڕاسـتی ئەوان یەکەمیـن گـەل بـوون کـە بەرپەرچـی بانگـەوازی پێغەمبەرانیـان دایـەوە، ﴿ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا ﴾ بـە بۆچوونـی خۆیـان ئەمـە بەربەسـت بـوو لـە شـوێنکەوتنی، لەگـەڵ ئـەوەدا ئـەوە هـەقو ڕاسـتی بـوو دەبـوو شـوێنی بکەوتنایـە، چونکە مـرۆڤ دەتوانـێ لە مرۆڤـەوە شـت وەربگـرێو لـە هەمـوو کاروبارێکـدا بگەڕێتـەوە بـۆ لای بـە پێچەوانـەی فریشـتە ﴿ وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا ﴾ واتـە: نابینیـن هیـچ کـەس شـوێنی تـۆ بکەوێ جگـە لە خەڵکـی هـەژارو بێدەرەتان نەبێ، بـە بۆچوونی خۆیـان، بەڵام لـە ڕاسـتیدا ئەوانـە خەڵکـی تێگەیشـتوو و ژیـر بوون کـە ملکەچـی ڕاسـتیەکان دەبوون، وەکـو ئـەو گەمژانـە نەبـوون کە پێیـان دەوتـرا: پیاو ماقـوڵ! ئەوانـەی کە شـوێنی هەموو شـەیتانێکی لە سـنوور دەرچـوو کەوتبـوون، وە پەرسـتراویان دادەنا لە داروو بـەرد، خۆیان لێیـان نزیـک دەکـردەوەو سـوژدەیان بـۆ دەبـردن، ئایـا لەوانـە گەمـژەو گێلتـر دەبینی؟ کـە دەڵێـن: ﴿ بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ ﴾ واتـە: ئەوانـەی شـوێنی تـۆ کەوتوون بـە بـێ بیرکەوتنەوە شـوێنت کەوتـوونو ڕووکـەش بینیـن، بۆیە تەنها بـە بانگـەواز کردنت بە دەمتـەوە هاتن، ئەویـش لەبـەر سـاویلکەییان، مەبەسـتیان لـەوەدا ئـەوە بـوو کـە ئـەوان شـوێنی ژیـریو بینایـی نەکەوتبـوون لـە کاروبارەکانیانـدا، بێبڕوایـان نەیانزانی هـەقو ڕاسـتی ڕوونکراوە عەقڵـی مـرۆڤ داوای دەکات، تەنهـا بە بانگەشـە کردنی ئەوانـەی خاوەن بەرچـاو ڕوونین دەیناسـنەوەو جەختی لەسـەر دەکەنەوە، بـە پێچەوانەی کاروبارە شـاراوەکان، کە پێویسـتی بـە بیرکردنەوەیەکی قـووڵو درێـژ خایـەن دەکات، ﴿ وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ ﴾ واتـە: ئێـوە لە ئێمە باشـتر نین تـا گوێڕایـەڵو ملکەچ بیـن، ﴿ بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ ﴾ لەم

قسـەیاندا درۆیـان دەكـرد، چونكـە بێگومان ئـەوان ئایەتو نیشـانەیان بینی لـە نووح ﷺ كە پێویسـت بـوو شـوێنی بكـەونو بەڕاسـتی بزانن (كەچـی شـوێنی نەكەوتن).

(٢٨): ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ أَنُلۡزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ ٢٨ ﴾.

﴿ قَالَ ﴾ نـووح ﷺ لـە وەڵامدا پێـی وتـن: ﴿ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي ﴾ واتـە: بەڵگـەی دڵنیاكـەرەوەو ئاشـكرا مانای ئەوەیـە ئـەو پێغەمبەرێكی تەواوو سەرمەشـقە، ئەوانـەی خـاوەن عەقـڵو ژیریـن ملكەچـی دەبـن، وە لـە تەنیشـتی عەقڵـی ئـەودا عەقڵی پیـاوە گـەورەكان پـەرشو بڵاو دەبێ، بەڕاسـتی ئـەو ڕاسـتگۆیە، جا ئەگـەر فەرمووی: من لەسـەر بەڵگـەی ئاشـكرام لە لایـەن پەروەردگارمـەوە تەنها ئەم وتەیەت بەسـە كە شـایەتی بـۆ بدەیـتو بـە ڕاسـتی بزانـی، ﴿ وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِهِۦ ﴾ واتـە: نیگـای بۆ كـردوومو ناردوومـی، وە منەتـی كـردوە بەسـەرمدا بە هیدایەتـدان، ﴿ فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ ﴾ واتـە: لە ئێوە شـاردرابێتەوە ﴿ أَنُلۡزِمُكُمُوهَا ﴾ واتـە: بـە زۆر پابەندتـان بكەیـن پێیـەوە لـە كاتێكـدا ئێوە گومانتـان لێـی هەیـە، ﴿ وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ ﴾ هەتـا سـوور بن لەسـەر ڕەتكردنـەوەی ئەو پەیامـەی بـۆم هاتووە، ئـەوە زیان بـە ئێمە ناگەیەنـێ، وە هیچ لەكـەو پەڵەیەک لـە دڵنیایی ئێمـەدا دروسـت نـاكات، وە نەک هەر قسـەو درۆ هەڵبەسـتنتان ڕێگریمان لێناكات لەسـەر ئـەوەی كـە لەسـەری دەڕۆین، بەڵكـو تەنها مەبەسـتی ئەوەیـە ڕێگـری لە ئێوە بـكات، وە ملكـەچ نەبوونتـان بـۆ هـەقو ڕاسـتی پێویسـت بكات، ئـەو ڕاسـتیەی كـە ئێوە بـە بەتاڵ دەیبینـن، جـا ئەگـەر حاڵ گەیشـتە ئـەم سـنوورە، ئـەوە ئێمـە ناتوانیـن زۆرتـان لێبكەین لەسـەر ئـەوەی كـە فەرمانـی پێكـردوە، وە ناچارتان بكەیـن كە ئێـوە لێی ڕادەكـەن، لەبەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿ أَنُلۡزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ ﴾ (واتـە: ئایـا بـە زۆر پابەندتـان بكەیـن پێیـەوە لـە كاتێكدا ئێـوە حـەزی لێناكەن).

وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠
بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا
تَجۡهَلُونَ ٢٩ وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ أَفَلَا
تَذَكَّرُونَ ٣٠ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ
أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٞ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزۡدَرِيٓ
أَعۡيُنُكُمۡ لَن يُؤۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيۡرًاۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمۡ إِنِّيٓ
إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣١ قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدۡ جَٰدَلۡتَنَا فَأَكۡثَرۡتَ جِدَٰلَنَا
فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٣٢ قَالَ إِنَّمَا
يَأۡتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ٣٣ وَلَا يَنفَعُكُمۡ
نُصۡحِيٓ إِنۡ أَرَدتُّ أَنۡ أَنصَحَ لَكُمۡ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن
يُغۡوِيَكُمۡۚ هُوَ رَبُّكُمۡ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٣٤ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ
قُلۡ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجۡرَامِي وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُجۡرِمُونَ
٣٥ وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤۡمِنَ مِن قَوۡمِكَ إِلَّا مَن قَدۡ ءَامَنَ
فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٣٦ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا
وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ٣٧

(٢٩): ﴿ وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾:

﴿ وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ ﴾ واتە: لەسەر ئەم بانگەوازەم کە بانگتان دەکەم ﴿ مَالًاۖ ﴾ چونکە بار گران دەبێ بەسەرتانەوە (کە پارە بدەن)، ﴿ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ ﴾ وەک ئەوەی داوایان لێکردبێ ئەو بڕوادارە لاوازانە دەربکاتو دووریان بخاتەوە، جا پێی فەرموون: ﴿ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ ﴾ واتە: بۆ من دروست نیەو ناگونجێ بڕواداران لە خۆم دوور بخەمەوە، بەڵکو پێشوازیان لێدەکەم بە ڕێزو خۆشەویستیو گەورە دانانەوە، ﴿ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ ﴾ (پەروەردگاریان) پاداشتیان دەداتەوە بە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت لەسەر بڕواهێنانو خۆپارێزیان، ﴿ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴾ لە کاتێکدا فەرمانم پێدەکەن بە وازهێنان لە دۆستانی خوای گەورەو دوورخستنەوەیان لێم، وە کاتێ کە هەقتان ڕەتکردەوە لەبەر ئەوەی ئەوان شوێنی کەوتوون، وە کاتێ کە بەڵگەتان هێنایەوە بۆ پووچەڵ کردنەوەی هەقو ڕاستی بە وتەکانتان کە من مرۆڤێکم وەکو ئێوە، بێگومان ئێمە هیچ فەزڵو چاکەیەکمان بەسەر ئێوەوە نیە.

(٣٠): ﴿ وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾:

﴿ وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ ﴾ واتە: کێ بەرگریم لێدەکات لە سزای خوا، چونکە دوورخستنەوەو دەرکردنیان دەبێتە مایەی سزاو تۆڵە، کە هیچ کەس ناتوانێ بەرگری لێبکات جگە لە خوا ﷻ، ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ (واتە: دەی بۆ بیر ناکەنەوە) چی بۆ ئێوە باشەو گونجاوەو کاروبارەکانتان بە ڕێ دەخات.

(٣١): ﴿ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٞ وَلَآ أَقُولُ

﴿لِلَّذِينَ تَزْدَرِيٓ أَعْيُنُكُمْ لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًاۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمْۖ إِنِّيٓ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٣١﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿وَلَآ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ﴾ واتـە: مـن تەنهـا نێـردراوی خـوام بـۆ لاتـان، مژدەتـان دەدەمـێو دەتانترسـێنم، بـەڵام جگە لەمـە هیچ شـتێک لـە کاروبارەکاندا بـە دەسـتی مـن نیـە، گەنجینـەی خـوا ﷻ لـەلای من نیـە بەڕێـوەی ببـەم، هەر کەسـێک بمەوێـت پێـی ببەخشـمو قەدەغـەی بکـەم لە هەر کەسـێک کـە نەمـەوێ پێی نەبەخشـم، ﴿وَلَآ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ﴾ تـا هەواڵـدەم بـە نهێنـیو شـاراوەکانتان، ﴿وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٌ﴾ واتـە: مـن بانگەشـەی پلەو پایەیـەک ناکەم بەرزتـر لە پلەو پایـەی خۆم، وە نـە پێگەیەک جگـە لـەو پێگەیـەی کە خـوا ﷻ پێی بەخشـیوم، وە بـە گومانی خـۆم بڕیار نادەم بەسـەر خەڵکیـدا، ﴿وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزْدَرِيٓ أَعْيُنُكُمْ﴾ واتـە: بـڕوادارە لاوازەکان ئەوانـەی کـە پیـاو ماقوڵو دەسـەڵاتدارە بێبـڕواکان بە کەمیان دەزانـن: ﴿لَن يُؤْتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيْرًاۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمْ﴾ جـا ئەگەر ڕاسـت بکەن لـە بڕواهێنانیاندا ئەوە پاداشـتێکی مەزنیـان بۆ هەیە، وە ئەگـەر وانەبـێ، ئەوە لێپرسـینەوەیان لە لای خوایـە ﴿إِنِّيٓ إِذًا﴾ ئەگەر شـتێکتان پێ بڵێم لـەوەی کە پێشـکەوتووە ﴿لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەمە ئـەوە دەگەیەنێ پێغەمبـەر ﷺ گەلەکەی بـێ ئومێـد دەکات لـەوەی واز لـە هـەژارەکان بهێنـێو دەریان بـکات، یان خەشـمو قینی بەسـەریاندا ببارێنـێ، وە قایـل کردنـی گەلەکەیەتی بـەو ڕێگایانەی دروسـتو ڕەوایە.

(٣٢): ﴿قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٣٢﴾:

کاتـێ کـە بینیـان دەسـت هەڵناگـرێ لەوەی کـە لەسـەری دەڕوا لـە بانگەواز کـردن، وە ئامانجەکانیشـیان بە دەسـت نەهێنـا ﴿قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ﴾ (وتیـان: ئـەی نـووح موناقەشـەی زۆرت لەگـەڵ کردیـن، ئـەوەی هەڕەشـت پێ دەکـرد لێمـان بۆمـان بێنـە) لـە سـزاو تۆڵـە، ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ ئـای چەندە گومـڕاو نەفامـن، کاتـێ کە ئەم وتـارو قسـەیان وت بەرانبەر بـە پێغەمبەرە دڵسـۆزەکەیان، جـا ئەگـەر ڕاسـتیان دەکرد بـۆ نەیانوت: ئەی نـوح ﵇ بەڕاسـتی ئامۆژگاریـت کردینو لەگەڵمانـدا میهرەبـانو دڵسـۆز بووی، بانگـت کردین بـۆ کارێک بۆمـان ڕوون نەبوویەوە، جـا دەمانەوێـت بۆمـان ڕوون بکەیتەوە بۆ ئـەوەی ملکەچت بین، ئەگەر نا تۆ سوپاسـکراوی لـە ئامۆژگاریەکـەت، ئـەم وەڵامە وەڵامێکی بـە ویژدانانەیـە، کە بانگ کـراوە بۆ کارێک

شـاراوەیە لـە لای، بـەڵام ئـەوان لـە قسـەکانیاندا درۆزن بـوون، وە لەسـەر پێغەمبەرەکەیان چاونەتـرس و بوێـر بوون، تەنانـەت بچوکتریـن گومانو دوودڵیـان نەبوو لەسـەر وتەکانی، ئیتـر چـۆن دەتوانـن بەڵگـەی لـە دژ بهێننـەوە؟! بۆیـە بە هـۆی نەفامـیو سـتەمکاریانەوە لایانـداو داوای پێشخسـتنی سـزایان کردو خۆیـان بەبێ تـاوان دانا.

(٣٣): ﴿ قَالَ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٣٣﴾ ﴾

بۆیـە نـووح ﷺ وەڵامـی دانـەوەو وتـی: ﴿ إِنَّمَا يَأْتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ ﴾ واتـە: ئەگـەر ویسـتو حیکمەتی وا بخوازێ سـزاتان بـۆ دادەبەزێنـێ ﴿ وَمَآ أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴾ (ئێوە ناتوانن لـە سـزای خـوا ﷻ رزگـار بن) مـن هیچ شـتێکم لـەو کاروبـارەدا بە دەسـت نیە.

(٣٤): ﴿ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾

دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِىٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ﴾ واتـە: ویسـتو ئیـرادەی خـوا ﷻ زاڵـە، بە ڕاسـتی خـوا ئەگـەر بیـەوێ گومراتان بـکات واتان لێـدەکات هـەق ڕەت بکەنەوە، ئەگەر من ئەوپەڕی توانایشـم بەکاربێنـم لەگەڵتاندا -بێگومان بـەکاری هێنـا لەگەڵیانـدا- هیـچ سـوودێکی بۆتان نابـێ، ﴿ هُوَ رَبُّكُمْ ﴾ چی بوێـت پێتان دەکات؟ وە چـۆن بیەوێت بڕیارتان بەسـەردا ئـەدات؟ ﴿ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ (وە بۆ لای ئـەو دەگەڕێنەوەو) پاداشـتتان دەداتەوە بـە کردەوەکانتان.

(٣٥): ﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَىَّ إِجْرَامِى وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾

﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾ ئـەم ڕانـاو (ضمیر)ە ﴿ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾ دەگونجێـت بگەڕێتـەوە بۆ نـووح ﷺ وەکـو چۆن لـە میانـەی چیرۆکەکەیدا هاتـووە لەگـەڵ گەلەکەیـدا، ماناکەی بـەم شـێوە دەبـێ گەلەکـەی دەیانـوت: درۆی بـە دەم خـواوە هەڵبەسـتووە، وە درۆی بـە وەحیـەوە کـردوە کـە وادەزانێـت ئـەوە لـە لایـەن خواوەیـە، خـوا ﷻ فەرمانـی پێکردوە بڵـێ: ﴿ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَعَلَىَّ إِجْرَامِى وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُجْرِمُونَ ﴾ واتـە: هەمـوو کەسـێک تاوانەکـەی لـە ئەسـتۆی خۆیەتـی، ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٦٤﴾ ﴾الأنعام. (واتـە: هیـچ کەسـێکی گوناهـکار گوناهـی کەسـێکی تـر هەڵناگرێ).

وە دەگونجـێ ڕاناوەکـە بگەڕێتـەوە بـۆ موحەممەد ﷺ، وە ئـەم دەقە خراوەتـە ڕوو لە کاتی باسـکردنی چیرۆکـی نـووح دا ﷺ، چونکـە لـەو کاروبارانەیـە کـەس نایزانـێ جگـە لە پێغەمبـەران نەبـێ، کاتـێ کە خوا باسـی کـردوە لـە گێڕانەوەیدا بـۆ پێغەمبەرەکـەی، وە لە

کـۆی ئایـەتو نیشـانەکان کـە بەڵگەن لەسـەر ڕاسـتی پێغەمبـەر ﷺ و پەیامەکەی، باسـی بـە درۆ خسـتنەوەی گەلەکەی کـردوە، لەگەڵ ڕوون کردنـەوەی تەواودا، ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُ ﴾ واتـە: ئـەم قورئانـە موحەممـەد ﷺ لـە نەفسـی خۆیـەوە هەڵبیەسـتووە، واتە: بە ڕاسـتی ئەمە لەسـەر سـوور هێنەرتریـن وتەکانو بەتـاڵ ترینیانـە، ئەوان چـاک دەزانن ئەو نەخوێندنـەوە دەزانـیو نـە نووسـین، وە گەشتیشـی نەکردوە بـۆ خوێندنو فێربـوون لە لای خـاوەن کتێبـەکان، جا ئـەم قورئانە پیـرۆزەی هێناوە کـە تەحەدایان دەکات بـە هێنانەوەی سـوورەتێکی وەکـو ئـەو، جا ئەگـەر زانیان ئـەو هەڵیبەسـتووە دەردەکەوێ ئـەوان دژایەتی دەکـەن، وە سـوودێک نامێنـێ لـە بەڵگـە هێنانەوەیاندا، بەڵکو لـەم کاتەدا واباشـترە ڕوویان لێوەربگێـڕێو خۆی لێیـان بپارێـزێ، بۆیە لێـرەدا فەرموویەتی:

﴿ قُلۡ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجۡرَامِي ﴾ واتـە: تـاوانو درۆم (لەسـەر خۆمـە) ﴿ وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُجۡرِمُونَ ﴾ واتـە: ئـەی بۆچـی ژاوەژاو دەکـەن لـە بـە درۆ دانانمـدا؟!

(٣٦): ﴿ وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤۡمِنَ مِن قَوۡمِكَ إِلَّا مَن قَدۡ ءَامَنَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٣٦ ﴾:

﴿ وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤۡمِنَ مِن قَوۡمِكَ إِلَّا مَن قَدۡ ءَامَنَ ﴾ واتـە: دڵیـان ڕەق بـووە ﴿ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴾ واتـە: بێـزارو بێتاقـەت مەبـە، وە گوێیان پـێ مەدە، بەو کردارانـەی کـە ئەنجامـی دەدەن، بە ڕاسـتی خـوا ﷻ ڕقی لێهەڵگرتوون، وە سـزای لەسـەر پێویسـت کـردوون کە هیـچ گەڕانەوەیەکـی نیە.

(٣٧): ﴿ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ٣٧ ﴾:

﴿ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا ﴾ واتـە: بـە پاراسـتنی ئێمـە، وە لـە پێـش چـاوی ئێمەو لەسـەر ڕەزامەندیمـان ﴿ وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ ﴾ واتـە: لەگەڵمـدا مـەدوێ دەبارەی لـە ناوبردنـی (ئەوانـەی سـتەمکارن) ﴿ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴾ واتە: بڕیاری سـزادانیان بەسـەردا چەسـپاوەو چارەنووسـیان لەسـەر جێبەجێ کراوە.

وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُوا۟ مِنْهُ ۚ
قَالَ إِن تَسْخَرُوا۟ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ
﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ
مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا
مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ
وَمَنْ ءَامَنَ ۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾ ۞ وَقَالَ ٱرْكَبُوا۟
فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ
﴿٤١﴾ وَهِىَ تَجْرِى بِهِمْ فِى مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ
وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ يَٰبُنَىَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾
قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ
مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ
ٱلْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى
وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ ۖ وَقِيلَ
بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى
مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾

(٣٨-٣٩): ﴿ وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُوا۟ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُوا۟ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ فەرمانی پەروەردگاری جێبەجێ کرد، دەستی کرد بە دروستکردنی کەشتیەکە ﴿ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ ﴾ (هەر کاتێ تێپەڕی بوونایە بە لایدا کۆمەڵی لە گەلەکەی) بیان بینیایە ئەو کەشتیە دروست دەکات ﴿ سَخِرُوا۟ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُوا۟ مِنَّا ﴾ (گاڵتەیان پێ دەکرد)، ئێستا ﴿ فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾ ئێمە یان ئێوە، بێگومان ئەوەیان زانی کاتێ سزایان لەسەر پێویست بوو.

(٤٠): ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَ ۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾ ﴾

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا ﴾ فەرمانمان کرد بە کاتی دابەزینی سزادانیان ﴿ وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ﴾ واتە: خوا ﷻ لە ئاسمانەوە بارانی بە خوڕی بەسەردا باراندن، کانیاوەکانی سەر زەویشی تەقاندەوە، تەنانەت تەنورەکانیش ئاویان لێ هەڵدەقوڵا کە جێگای ئاگر کردنەوەن لە نەریتدا، وە دوورترە لەوەی ئاو لەوێوە هەڵبقوڵێت، ئیتر ئاوی زەوی‌و ئاسمان پێکەوە یەکیان گرت بە فەرمانێک لە لایەن خواوە بریار درابوو.

﴿ قُلْنَا ﴾ بە نووح ﷺ مان فەرموو: ﴿ ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ﴾ لە هەموو نێرو مێیەک لە بەدیهێنراوەکان، تا توخمی ئەو ڕەگەزانە بمێننەوە، بەڵام ئەو بەشانەی کە زیاتر بوون لە نێرو مێیەک، چونکە کەشتیەکە لە توانایدا نەبوو هەموویان هەڵبگرێ، ﴿ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ ﴾ ئەوەی بڕیارا بوو، وەکو کوڕەکەی کە

خنـــکا، ﴿ وَمَنْ ءَامَنَ ﴾ لـه کاتێکـدا ﴿ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴾ (واتـه: خەڵکـێ کـەم نەبێ بڕوایـان نەهێنـا لەگەڵی).

(٤١): ﴿ وَقَالَ ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٤١﴾ ﴾:

﴿ وَقَالَ ﴾ نـووح عليه السلام فەرمـووی: لەوەی خـوا جل جلاله فەرمانـی پێکرد بوو کـە هەڵیان بگرێ ﴿ ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ﴾ واتـە: بـە نـاوی خـوا جل جلاله لەکاتی ڕۆیشـتنیو وەسـتانیدا، وە بـە ڕێبکـەوێو بڕوا بە فەرمانـی خوا ﴿ إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ کاتـێ کە لێمان خـۆش بـوو ڕەحمی پـێ کردیـن، وە ڕزگاری کردیـن لە گەلی سـتەمکار.

(٤٢): ﴿ وَهِىَ تَجْرِى بِهِمْ فِى مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ يَـٰبُنَىَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾:

پاشـان وەسـفی ڕۆیشـتنی کەشـتیەکە دەکات، وەکو ئـەوەی ئێمە بە چاوی خۆمـان بیبینین، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَهِىَ تَجْرِى بِهِمْ ﴾ واتـە: نـووحو ئەوانـەی لەگەڵیـدا سـوار بـوون، ﴿ فِى مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ ﴾ خـوا جل جلاله پارێزەری بوو، وە خەڵکەکەشـی پاراسـت ﴿ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ ﴾ (نـووح بانگـی کوڕەکەی کرد) کاتێ کە سـوار بـوو بۆ ئەوەی ئەویـش لەگەڵیاندا سـواربێ، ﴿ وَكَانَ ﴾ کوڕەکـەی ﴿ فِى مَعْزِلٍ ﴾ (لە شـوێنێکی کەناردا بـوون) کاتێ کـە ئەوان سـوار بـوون، واتە: کوڕەکـەی دوور بووە نووحیش ویسـتوویەتی نزیـک بێتەوە تا سـواری کەشـتیەکە بێ، پێـی وت: ﴿ يَـٰبُنَىَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾ (واتە: ئـەی کـوڕی خۆشەویسـتم لەگەڵمانـدا سـواربەو لەگـەڵ بێبڕوایـان مەبە) چونکـە هەرچی بەسـەر ئەواندا بێت، بەسـەر تـۆش دێت.

(٤٣): ﴿ قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾:

جـا ﴿ قَالَ ﴾ کوڕەکـەی قسـەی باوکـی بـە درۆ دانا، کـە بێگومـان کەس ڕزگـاری نابێ تەنهـا ئـەوە نەبێ کە سـواری کەشـتیەکە بووە لەگـەڵ نووحدا، وتـی: ﴿ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ﴾ واتـە: سـەردەکەوم بەسـەر شـاخێکدا بـۆ ئـەوەی لـە لافاوەکـە ڕزگـارم بـێ، جـا ﴿ قَالَ ﴾ نـووح عليه السلام فەرمـووی: ﴿ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ﴾ واتـە: هیـچ پارێزەرێـک نیـە کـەس ڕزگـار بکات شـاخ بـێ، یان هەر شـتێکی تـر، ئەگـەر پەنا بیـات بۆ هـەر هۆکارێک لە هـۆکارەکان ڕزگـاری نابێ، ئەگـەر خوا جل جلاله ویسـتی لەسـەر نەبـێ، ﴿ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ ﴾ (واتـە: لـەو کاتـەدا شـەپۆلی لافاو

کەوتــە نێوانیــان، جــا ئــەو) کــوڕەی ﴿مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ﴾(واتــە: لە خنــکاوان بوو).

(٤٤): ﴿وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾

کاتــێ کە خــوا ﷻ خنکاندنی‌و نــووح‌و ئەوانــەی لەگەڵیدا بوون ڕزگــاری کردن ﴿وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ﴾(وتــرا: ئــەی زەوی) ئــەو ئــاوەی لێــت دەرچــووە، وە ئــەو ئاوەیشــی کــە داباریوە بەســەرتدا، واتــە: ئەو هەمــوو ئاوەی کــە بەســەرتەوەیە هەڵیمژە، ﴿وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى﴾هەردوو کیــان فەرمانی خوایان جێبەجێ کرد، زەوی ئاوەکەی هەڵمژی‌و ئاســمانیش بارانەکــەی گرتــەوە، ﴿وَغِيضَ ٱلْمَآءُ﴾واتــە: لافاوەکە ڕۆچوو بە ناخــی زەویدا، ﴿وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ﴾ بــە لــە نــاو بردنــی بــە درۆدانــەرانو ڕزگاربوونــی بــڕواداران ﴿وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ﴾واتە: کەشــتیەکە وەســتا لەســەر ئــەو کێوەی کە ناســراوە (بە جــودی) لە زەوی موصــل، ﴿وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾واتــە: دوای لــە نــاو چوونیــان نەفرینیــان بــەدوادا ڕۆیشــت، وە دووربــوونو توورەیــی بەردەوامی (خوایــان) لەگەڵیاندایە.

(٤٥): ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾﴾

دەفەرمــوێ: ﴿وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ﴾ واتــە: بێگومــان (خوایــە) پێمــت وت: جــا ﴿ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ﴾ ئــەو پەیمانــەی کە پێــت دام دوانەکــەوت، دەگونجــێ نــووح عليه السلام بەزەیــی وای لێکردبی، بێگومــان خــوا ﷻ پەیمانی پێــداوە بــە ڕزگارکردنــی ژنو منداڵەکانی، ئــەو وا گومانی برد ئــەم پەیمانە بــۆ هەموویانــە، ئەوانــەی بڕوایــان هێنــاوەو ئەوانەشــی بڕوایان نەهێنــاوە، هەر بۆیــە بەم شــێوە داوای لــە پەروەردگاری کردو لێــی پاڕایەوە، وە لەگەڵ ئەمــەدا فەرمانەکەی گەڕانــدەوە بۆ دانایــی‌و کاردروســتی خــوای کاربەجێ.


قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ فَلَا تَسْـَٔلْنِ
مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ
﴿٤٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ وَإِلَّا
تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ قِيلَ يَٰنُوحُ
ٱهْبِطْ بِسَلَٰمٍ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيْكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ
وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٨﴾ تِلْكَ
مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهَآ إِلَيْكَ مَا كُنتَ تَعْلَمُهَآ أَنتَ
وَلَا قَوْمُكَ مِن قَبْلِ هَٰذَا فَٱصْبِرْ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾
وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ
إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ
أَجْرًا إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِى فَطَرَنِىٓ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٥١﴾
وَيَٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ
عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا۟
مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ يَٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ
بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾

**(٤٦):** ﴿ قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾ ﴾:

﴿ قَالَ ﴾ خـوا ﷻ به نـووح ﷺ فەرموو: ﴿ إِنَّهُۥ لَيْسَ مِنْ أَهْلِكَ ﴾ ئەوانـەی پەیمانم پێدای بـە ڕزگـار کردنیـان ﴿ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيْرُ صَٰلِحٍ ﴾ واتـە: ئـەم پاڕانـەوەی کـە تۆ کـردت بـۆ ڕزگاربوونـی بێبڕوایانێـک بـوو کـە بـڕوای بـە خـواو پێغەمبەرەکەی نیـە ﴿ فَلَا تَسْـَٔلْنِ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴾ واتـە: ئـەوەی کـە دەرەنجامەکـەی نازانیـت ئایە خێرە یـان شـەڕە؟! ﴿ إِنِّىٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ واتـە: مـن ئامۆژگاریـت دەکـەم بـەو ئامۆژگاریـە ببیتـە یەکێک لە تـەواوو کامڵـەکان، وە ڕزگـارت ببـێ لـە سـیفەتی نەفامـانو گوناهـکاران.

**(٤٧):** ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾:

ئنجـا نووح ﷺ پەشـێمان بوویەوە لەوەی کە لێی دەرچوو (ئەو قسـەی لـە زاری دەرچوو)، ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ لێخۆشـبوونو میهرەبانـی مـرۆڤ ڕزگار دەکات لـەوەی لە زیانمەنـدان بێت، ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کە نـووح ﷺ نەیزانیـوە داوا کردنـی لـە پەروەردگاری بۆ ڕزگـار کردنی کوڕەکەی شـتێکی قەدەغە کـراوە، دەچێتە چوارچێوەی فەرمایشـتی خوا ﷻ کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾هـود، بەڵکو هەردوو کارەکـە دژ یـەک بوونـەوە لـە لای، وا گومانـی بـرد دەچێتـە چوارچێـوەی فەرمـوودەی خـوا ﷻ: ﴿ وَأَهْلَكَ ﴾ پـاش ئـەوە بـۆی ڕوون بوویـەوە کـە ئـەو پاڕانەوەیـە دەچێتـە چوارچێـوەی قەدەغـە کـراوەوە (داوای لێبـوردنو لێ خۆشـبوونو بەزەیی خـوای کرد).

(٤٨): ﴿ قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٤٨﴾ ﴾:

﴿ قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَ ﴾ لـە هەمـوو مرۆڤـەکانو غەیـری ئەوانیش، لەو نێـرو مێیانەی کە کەشـتیەکە لەگەڵ خۆیـدا هەڵیگرتوە، خـوا ﷻ فـەڕو بەرەکەتـی خسـتە هەموویانـەوە هەتـا سـەر زەویـان پڕ کـردەوە ﴿ وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ﴾ لـە دونیـادا ﴿ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ ئـەم ڕزگـار کردنە بەربەسـت نیـە بـۆ ئێمە کـە هەر کەسـێک دوای ئێمە بێبڕوایی بکات سـزای لەسـەر پێویسـت بکەین، ئەگەرچـی تـا ماوەیەکـی کەمیـش بژیـن، لە پـاش ئەوە سـزا دەدرێـن، خوا پـاش ئەوەی ئـەم چیرۆکـەی بـە دوورو درێـژی بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ فەرمـووەو بـاس کـردوە، کە کـەس نایزانـێ تەنهـا ئەو نەبـێ، ئـەوە منەتی کـردوە بەسـەریدا بـە پەیامەکەی.

(٤٩): ﴿ تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ إِلَيۡكَۖ مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ مِن قَبۡلِ هَٰذَاۖ فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾:

﴿ تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ إِلَيۡكَۖ مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ مِن قَبۡلِ هَٰذَا ﴾ دەیانـوت: بێگومـان ئـەو دەیزانـی، دەی سـوپاسو ستایشـی خـوا ﷻ بکـە، ئـارام بگـرەو خۆڕاگربە لەسـەر ئـەو ڕێگـا ڕاسـتو ئاینـە پتـەوە، وە بانگەواز بکـە بۆ لای خـوا ﷻ، ﴿ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴾ ئەوانـەی خۆیان دەپارێزن لە هاوبەشـدانانو سـەرجەم گوناهـەکان، بێگومان تـۆ لـە داهاتـوودا سـەرەنجامت هەیە بەسـەر گەلەکەتـەوە، وەکو چۆن نـووح ﷺ هەیبوو بەسـەر گەلەکەیەوە.

(٥٠): ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۖ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُفۡتَرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾:

﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗا ﴾ تـا کۆتایـی چیرۆکەکـە، واتـە: ناردمان بۆ لای گەلـی عاد، کە هۆزێکـی ناسـراو بـوو لـە ئەحقاف دەژیـان لـە زەوی یەمـەن ﴿ أَخَاهُمۡ ﴾ لـە ڕەچەڵەکدا ﴿ هُودٗا ﴾ بـۆ ئـەوەی بتوانن لێـی وەربگرنو زانیاریـان هەبێ بە ڕاسـتگۆیی، جا ﴿ قَالَ ﴾ پێـی وتـن: ﴿ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۖ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُفۡتَرُونَ ﴾ واتە: فەرمانـی پێکـردن بـە بەندایەتـی خـوای تـاکو تەنهـا، وە قەدەغـەی لێکردن ئـەوەی کە لەسـەری دەڕۆن لـە بەندایەتـی کردنـی جگـە لە خـوا، هەواڵی پێـدانو ئاگـاداری کردنەوە کـە بە ڕاسـتی ئەوان درۆیـان بە دەم خواوە هەڵبەسـتووە لـە بەندایەتی کردنیانـدا بۆ غەیری

خـوا ﷻ، وە لـە بە دروسـت دانانـی ئـەو کارە، بـۆی ڕوون کردوونەتەوە پێویسـت بوونی بەندایەتـی خواو خراپـی بەندایەتی غەیـری ئەو.

(٥١): ﴿ يَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِي فَطَرَنِيٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ٥١ ﴾:

پاشـان باسـی نەبوونی بەربەسـت دەکات لە ملکەچ بووندا، هەروەکو فەرموویەتی: ﴿ يَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا ﴾ واتـە: پاداشـتم نـاوێ لـە مـاڵو سـامانتان لەسـەر ئەو بانگـەوازەی کـە دەیکـەم، تا نەڵێـن ئەمـە دەیەوێت مـاڵو سـامانەکانمان ببـات، بەڵکـو بانگەوازتان بۆ لای خـوا ﷻ دەکـەمو بەبـێ بەرانبەر فێرتـان دەکـەم ﴿ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِي فَطَرَنِيٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾ ئـەوەی کـە بانگتـان دەکـەم بـۆ لای، وە ئـەو پێویسـتە قبووڵ بکـرێ هیچ بەربەسـتێک نیە بـۆ ڕەتکردنەوەی.

(٥٢): ﴿ وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارًا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ ٥٢ ﴾:

﴿ وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ﴾ لـەوەی ڕابوورد لێتانـەوە ﴿ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾ ڕووی تێبکەن بـە تەوبـەی ڕاسـتەقینەو گەڕانـەوە بۆ لای خوای بـەرز، بێگومـان ئێوە ئەگـەر ئەوەتان کرد ﴿ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارًا ﴾ واتـە: بـە بارانـی زۆر کـە زەویەکانتـان پـڕ پیتو بەرەکـەت دەکاتو خێـرو خێراتی زۆر دەکات ﴿ وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ ﴾ بەڕاسـتی ئـەوان بەهێزترینی نـاو خەڵکی بوون، بۆیە وتیـان: ﴿ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ ١٥ ﴾ فصلت. (واتە: کـێ لـە ئێمـە بەهێزترە)؟ پەیمانـی پێـدان ئەگەر ئەوان بـڕوا بهێنـن هێزی تریـان بۆ زیاد دەکات ﴿ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ ﴾ (ڕوو وەرمەگێـڕن) لێـی، واتە: لـە پەروەردگارتان ﴿ مُجۡرِمِينَ ﴾ لـووت بـەرزی بکـەن بەرانبەر بـە بەندایەتی کردنـی، وە بوێـرو چاونەترس بن لـە بەزاندنی سنوورەکانیدا.

(٥٣): ﴿ قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ٥٣ ﴾:

﴿ قَالُواْ ﴾ وتەکەیـان ڕەتکـردەوە: ﴿ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ ﴾ ئەگـەر مەبەسـتیان بەڵگـەی ڕوون بـێ، ئـەو بەڵگەیەی خۆیان پێشـنیاری دەکەن ئەمە پەیوەسـت نیـە بە هەقو ڕاسـتیەوە، بەڵکـو پێویسـت ئەوەیـە بێـن بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ بـە بەڵگەیەک کـە ئاماژە بـێ بۆ ڕاسـتی ئـەو پەیامـەی هێناویەتـی، وە ئەگەر مەبەسـتیان ئەوەیـە ئـەو بەڵگەیەکی بۆ نەهێنـاون کە ببێتە شـایەت بۆ ڕاسـتی قسـەکانی، بە ڕاسـتی لەمەدا درۆیان کـردوە، چونکە

هیــچ پێغەمبەرێــک نەهاتــوە بــۆ لای گەلەکــەی مەگــەر خــوا ﷻ لەســەر دەســتی کۆمەڵە ئایــەتو نیشــانەیەکی پێــداوە کــە مرۆڤ بــڕوای پــێ بهێنێ.

جــا ئەگــەر نیشانەیەکیشــی بــۆ نەهاتبێ تەنهــا ئەوە نەبــێ کــە بانگەوازیــان دەکات بۆ لای یەکتاپەرســتی خــوای تــاکو تەنها بــە دڵســۆزی، وە فەرمانکــردن بە هەمــوو کردەوەیەکی چاکو خوڕەوشــتێکی جــوان، وە قەدەغەکــردن لە هەموو ڕەوشــتو ڕەفتارێکی ناشــرینو نامــۆ، لــە هاوبەشــدانان بــۆ خــواو فاحیشــەو ســتەم کــردن، وە هەموو جــۆرە گوناهــەکان، لەگــەڵ ئــەوەدا هــوود عليه السلام خــاوەن ئــەو ســیفەتە بەرزانە بــوو کە بــەدی ناکــرێ تەنها لە باشــترینی بەدیهێنراوەکانو ڕاســتگۆترینیاندا، تەنها ئەو ئایەتو نیشــانانە بەســە بکرێنە بەڵگە لەســەر ڕاســتگۆیی، بەڵکــو خــاوەن عەقڵــەکان، وە ئەوانــەی خاوەن دڵــن دەبینن ئــەم ئایەتە گەورەتــرە لــە سروشــتی خۆیو لە ڕادەبــەدەرە، کە هەنــدێ خەڵکی وادەبینن کــە ئەوە تەنها موعجیزەیــە، وە لــە ئایــەتو نیشــانەکانی کــە بەڵگەن لەســەر ڕاســتگۆیی ئــەو تەنها یەک کــەس بــوو، هیچ پشــتیوانێکی نەبوو، بــە دەنگی بــەرز هاواری دەکــرد لە نــاو گەلەکەیداو بانگــی دەکردنو پێــی دەفەرمــوون: ﴿ إِنِّي تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُم ﴾ هــود. (واتە: بە ڕاســتی من پشــتم بە خــوا بەســتووە، کە پەروەردگــاری مــنو پەروەردگاری ئێوەشــە).

﴿ إِنِّيٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦ فَكِيدُونِي جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴾ (واتــە: بەڕاســتی مــن خــوا ﷻ دەکــەم بــە شــایەت، وە ئێوەش شــایەت بن کە مــن بــەریو دوورم لــەوەی کە ئێوە دەیکەنــە هاوبەش بۆ خــوا . جگە لە خوا جــا هەمووتان پیلانــم لێبگێــڕن لە پاشــان مۆڵەتیشــم مەدەن).

ئــەوان دوژمــن بوون کــە خاوەن دەســەڵاتو هێــز بــوون، وە دەیانویســت ئــەو ڕووناکیە بکوژێننــەوە بەهــەر ڕێگایــەک بــێ، بــەڵام ئــەو لــە چــاو ئەوانــدا زۆر نەبــوو بێبــاک بوو لێیــان، وە ئەوانیــش بــێ توانــا بــوون لــەوەی زیانێکــی پێبگەیەنن، بە ڕاســتی ئەمــە ئایەتو نیشــانەیە بــۆ کۆمەڵێــک کــە تێبگــەن، وە قســەی وانیــش ئــەوە بــوو: ﴿ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ ﴾ واتــە: واز لــە عیبادەتکردنــی پەرســتراوەکانمان ناهێنیــن تەنهــا لەبەر قســەیەکی تــۆ کە هیــچ بەڵگەیەکت لەســەری نەهێناوەتــەوە، بە بۆچوونــی وان! ﴿ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴾ ئەمــەش بــێ ئومێــد کردنــی پێغەمبەرەکەیان هوودە عليه السلام لــە لایەن گەلە بێبڕواکەیــەوە لــەوەی کە بــڕوای پێ بێنــن، بێگومان ئــەوان بەردەوام بوون لەســەر کوفرو بێبڕواییان.




(٥٤-٥٥): ﴿إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖۗ قَالَ إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ٥٤ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي جَمِيعٗا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ٥٥﴾

﴿إِن نَّقُولُ﴾ دەربارەی تۆ ﴿إِلَّا ٱعۡتَرَىٰكَ بَعۡضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٖ﴾ واتە: تووشی شێتیان کردووی، وات لێهاتووە هەرچی بێت بە دەمتدا ڕەتی ناکەیتەوە. پاکی بۆ ئەو خوایەی چۆن مۆری داوە بەسەر دڵی ستەمکاراندا، چۆن ڕاستگۆترینی دروستکراوەکان کە بە پەیامی ڕاستەوە هاتوە، لەم پلە نزمەدا دایانناوە کە عاقڵ شەرم دەکات گوێ لە قسەی لەو جۆرە بگرێت.

بۆیە هوود ؑ متمانەی هەبوو بە ئەوپەڕی متمانە بوون کە ئەو لە لایەن ئەوانەوە، وە لە لایەن پەرستراوەکانیانەوە تووشی نارەحەتی نابێ، فەرموویەتی: ﴿إِنِّيٓ أُشۡهِدُ ٱللَّهَ وَٱشۡهَدُوٓاْ أَنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ٥٤ مِن دُونِهِۦۖ فَكِيدُونِي جَمِيعٗا﴾ واتە: هەمووتان زیان بە من بگەیەنن، بە هەموو ڕێگاکانو ئەوەی لە تواناتان دایە، ﴿ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ﴾ واتە: مۆڵەتیشم مەدەن.

(٥٦): ﴿إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٥٦﴾

﴿إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ﴾ واتە: لە هەموو کاروبارەکانمدا پشتم بە خوا ﷻ بەستوە ﴿رَبِّي وَرَبِّكُمۚ﴾ واتە: بەدیهێنەری هەموومانەو دەسەڵاتدارە بەسەر ئێمەو ئێوەشدا، تەنها ئەو پەروەردگارمانەو پەروەردەی کردووین ﴿مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ﴾ (هیچ شتێک) ناجوڵێو ناوەستێت تەنها مەگەر خۆی ڕێگەی پێدات، ئەگەر هەمووتان کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانم پێبگەیەنن، خوا ﷻ دەسەڵاتتان نەدات بەسەرمەوە، هیچتان پێناکرێ، جا ئەگەر دەسەڵاتتانی دا بەسەرمەوە، ئەوە لەبەر حیکمەتێکە خۆی دەیزانێ

﴿إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ واتـە: لەسـەر دادپـەروەریو دانایـیو ستایشـە لـە قـەزاو قەدەریـدا، لـە شـەرعو فەرمانیـدا، وە لە پاداشـتو سـزایدا، کردەوەکانی لانادەن لـە ڕێگای ڕاسـت، کـە بەوە سـتایشو وەسـفی لەسـەر دەکرێ.

(٥٧): ﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦٓ إِلَيْكُمْ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّى قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٥٧﴾﴾:

﴿فَإِن تَوَلَّوْاْ﴾ واتـە: لەوەی کە بانگم کـردوون بۆی ﴿فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦٓ إِلَيْكُمْ﴾ هیچ شـتێک لەسـەر من نەمـاوە دەربـارەی ئێـوە، ﴿وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّى قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾ بەندایەتی بۆ دەکەنو هاوبەشـی بـۆ دانانێن، ﴿وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔا﴾ بە ڕاسـتی زیانە کـەی دەگەڕێتەوە بۆ سـەرتان، سـەرپێچی سـەرپێچی کاران زیان بە خـوا ﷻ ناگەیەنـێ، وە گوێڕایەڵی کردنی گوێڕایـەڵان هیچ سـوودێکی پـێ ناگەیەنـێ، ﴿مَّنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ﴿٤٦﴾﴾ فصلت. (واتـە: هـەر کەسـێک کردەوەیەکـی چـاک بـکات بـۆ نەفسـی خۆیەتی، وە خراپـەش بـکات لەسـەریەتی). ﴿إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی پەروەردگـارم بەسـەر هەموو شـتێکدا پارێـزەرو چاودێرە).

(٥٨): ﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَـٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾﴾:

﴿وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا﴾ واتـە: سـزای ئێمـە بـە ناردنـی (ڕەشـە) بـای نەزۆک، کـە ﴿مَا تَذَرُ مِن شَىْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾﴾ الذاریات. (واتە: بەسـەر هەر شـتێکدا برۆشـتایە وازی لـێ نەدەهێنا، تـا وەک ڕزیوی لێ دەکـرد). ﴿نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَـٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ﴾ واتـە: مـەزنو سـەخت، خوا ﷻ هێنای بەسـەر گەلـی عاددا، وای لێهـات جگە لـە ماڵەکانیـان هیچ شـتێک نەدەبینرا.

(٥٩): ﴿وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُواْ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْاْ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾﴾:

﴿وَتِلْكَ عَادٌ﴾ ئـەوەی خـوا ﷻ بە هۆی سـتەم کردنیانەوە بەسـەریانی هێنـا، چونکە ئەوان ﴿جَحَدُواْ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِمْ﴾ (نکوڵیـان لـە ئایەتەکانـی پەروەردگاریـان کـرد) لەبـەر ئەمە بە هوودیـان وت: ﴿مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ ﴿٥٣﴾﴾ هـود، بەمـە دەردەکـەوێ ئـەوان دڵنیـا بوونە لە ڕاسـتی بانگەوازەکـەی، بـەڵام عینـادیو کەللەڕەقیـان لەگەڵـدا کـرد ﴿وَعَصَوْاْ رُسُلَهُۥ﴾ چونکە هەر کەسـێک سـەرپێچی پێغەمبەرێک بکات، ئەوە سـەرپێچی سـەرجەم پێغەمبەرانی کـردوە، چونکـە یـەک بانگەوازیـان هەیـە ﴿وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ﴾ واتـە: دەسـەڵاتدارە

بەسەر بەندەکانی خوادا بە زۆرداری ﴿ عَنِيدٍ ﴾ واتە: دژی هەموو ئایەتەکانی خوا ﷻ دەوەستنەوە، سەرپێچی هەموو ئامۆژگاریکارێکی دڵسۆز دەکەن، وە شوێنی فێڵکەرو کزی کار کەوتوون کە دەیەوێ لە ناویان بیات، بە راستی خوا ﷻ لە ناوی بردن.

(٦٠): ﴿ وَأُتْبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُواْ رَبَّهُمْۗ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ٦٠ ﴾

﴿ وَأُتْبِعُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً ﴾(لەم دونیایەدا بە شوێنیاندا نەفرین نێردرا) هەموو کاتو سەردەمو نەوە لە دوای نەوە، تەنها لە بەر هەواڵە خراپو ناشرینەکانیان، باس دەکرێن، وە زەمو سەرزەنشتێک تووشیان دەبێ ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ بە هەمان شێوە نەفرینیان لێ دەکرێت ﴿ أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُواْ رَبَّهُمْ ﴾ واتە: ئینکاریو نکوولیان کرد لەوەی خوا ﷻ دروستی کردوونو ڕزقو ڕۆزی داونو پەروەردەی کردوون ﴿ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴾ واتە: خوا ﷻ دووری خستنەوە لە هەموو خێرێکو نزیکی کردنەوە لە هەموو شەرو خراپەیەک.

(٦١): ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ٦١ ﴾

﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ﴾ تا کۆتایی چیرۆکەکە. واتە: ناردمان ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ ﴾ ئەوانیش عادی دووەم بوون، ئەوانەی ناسراون بە دانیشتوانی ناو بەرد، وە (وادي القرى)، (لە نێوان مەدینەو تەبووک دەژیان)، ﴿ أَخَاهُمْ ﴾ لە ڕەچەڵەکدا ﴿ صَٰلِحًا ﴾ صالح بەندەو پێغەمبەری خوا ﷺ، بانگی دەکردن بۆ لای بەندایەتی خوای تاکو تەنها، جا ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ ﴾ واتە: بە تاکو تەنهاو بە دڵسۆزیەوە بەندایەتی بۆ بکەن، ﴿ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴾ نە لە خەڵکی ئاسمانەکانو نە لە خەڵکی سەر زەوی.

﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ﴾ واتە: دروستی کردوون تیایدا ﴿ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴾ واتە: دەسەڵاتی پێداون تیایدا، وە نازو نیعمەتی ڕشتووە بەسەرتاندا، وە جێگیری کردوون لەسەر زەویدا،ماڵو کۆشکو تەلاری تێدا دروست دەکەن، وە کشتوکاڵو دانەوێڵەی تێدا دەچێنن بە ویستی خۆتانو سوود لە بەرهەمەکانی وەردەگرن بۆ بەرژەوەندیەکانتان، جا هەروەکو چۆن هاوەڵی نیە لە هەموو ئەوانەدا ئێوەش هاوەڵی بۆ پەیدا مەکەن لە بەندایەتی بۆ کردنیدا ﴿ فَٱسْتَغْفِرُوهُ ﴾ لەوەی ئەنجامتانداوە لە بێبڕوایی و هاوەڵدانانو سەرپێچی کردن، وە خۆتان لێیان دابڕنن ﴿ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ ﴾ واتە: پاشان بگەڕێنەوە بۆ

لای بـە داوای لێبوردنـی ڕاسـتەقینەو گەڕانـەوە، ﴿ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴾ واتـە: زۆر نزیکـە لـەو کەسـەی لێـی دەپاڕێتـەوە بـە پاڕانـەوەی داواکـردن (دعـاء المسئلة)، یـان پاڕانەوەی بەندایەتـی (دعـاء عبـادة)[٧] (وەڵامـی دەداتـەوە بە پێدانـی پرسـیارەکەی، وە بەندایەتیەکەی وەردەگرێو پاداشـتی دەداتەوە لەسـەری باشـترین پاداشـت.

بزانە کە بێگومان نزیک بوونەوە لە خوای بەرز دوو جۆرە: گشتیو تایبەت.

١- **نزیك بوونـەوەی گشتی**: نزیـک بوونەوەیەتـی لـە زانسـتی بە هەمـوو بەدیهێنـراوەکان، ئەویش باسـکراوە لـە فەرمـوودەی خـوادا: ﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ ﴾ ق. (واتە: وە ئێمـە لـە مرۆڤـەوە نزیکترین لـە شـادەماری دڵی).

٢- **نزیك بوونـەوەی تایبـەت**: نزیـک بونەوەیەتـی لـە بەندەکانـی، وە ئەوانـەی لێـی دەپاڕێنـەوەو خۆشـیان دەوێ، ئەویـش باسـکراوە لـە فەرمـوودەی خـوای بـەرزدا: ﴿ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب ﴿١٩﴾ ﴾ العلـق.(واتـە: سـوژدە بـەرەو لە خـوا ﷻ نزیک ببـەرەوە) وە لەم دەقـەدا خوای بـەرز دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ ﴿١٨٦﴾ ﴾ البقـرة. (واتـە: هـەر کاتێـک بەندەکانی من پرسـیاریان لێکردیـت دەربارەی مـن، ئـەوە بێگومـان مـن لێیانـەوە نزیکم).

ئـەم جـۆرە نزیـک بوونەوەیـە کـە بەزەیـی خـوای بـەرز دەخـوازێ، وە وەڵامدانـەوەی دوعاکانیـانو بەدەسـتهێنانی مەبەسـتەکانیان دەخـوازێ، بۆیـە گرێـدراوە بە نـاوی پیرۆزی (القریـب) زۆر نزیـک ناوی (المجیـب) وەرگری پاڕانەوەیـە، کاتـێ پێغەمبەرەکەیان صالح ﷺ فەرمانـی پێکردن بـۆ بەندایەتیکردنی خوای تـاکو تەنها بە دڵسـۆزی بانگەوازەکەیان ڕەتکـردەوە، وە بە ناشـرینترین شـێوە بەرپەرچیـان دایەوە.

(٦٢): ﴿ قَالُوا يَا صَالِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَا ۖ أَتَنْهَانَا أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾ ﴾:

﴿ قَالُوا يَا صَالِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَا ﴾ واتـە: بە ڕاسـتی ئێمە هیـواو ئومێدی زۆرمان بـە تۆ هەبوو کـە کەسـێکی عاقڵو سوودبەخشـی، ئەمـە شـایەتیدانیانە بـۆ پێغەمبەرەکەیان

---

٧ - مەبەسـت لـە پاڕانـەوەی داواکـردن (دعـاء المسئلة)، ئەوەیە مـروڤ داوای شـتێک لە خوا ﷻ دەکات بـۆ نموونـە: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ ﴿١٨٦﴾ ﴾ البقـرة. (واتـە: هەردەمـێ بەندەکانـی مـن پرسـیاریان لێکردیـت دەربـارەی مـن ئـەوە بێگومـان مـن لێیانـەوە نزیکـم). پاڕانـەوەی بەندایەتی(دعـاء عبـادة) ئەوەیـە جگـە لـە خـوا ﷻ داوا لـە کـەس نـاکات. واللـە أعلـم.

صاڵـح ﷺ کـە ئەو بە ڕەوشـتی بەرزو ئاکاری جـوان بەناوبانگە، وە یەکێکە لەو کەسـانەی لـە نـاو گەلەکەیـدا هەڵبژێـردراوە، بـەڵام کاتێـک کـە ئـەم فەرمانـەی هێنـا کـە لەگەڵ هـەواو ئـارەزووە خراپەکانـی ئەوانـدا نەدەگونجا ئەم قسـەیان لـە بەرانبـەری بەکارهێنا، کە ناوەڕۆکەکـەی ئـەوە دەگەیەنـێ کە بە ڕاسـتی تۆ کەسـێکی تـەواوو کامـڵ بوویت لە لای ئێمـە، بـەڵام ئێسـتا گومانەکـەی ئێمەت بـە درۆ خسـتەوە، وە بـووی بە کەسـێک ئومێدی خێرو چاکـەت لێناکرێ.

وە تاوانەکـەی کە ئـەوان دایانە پاڵی ئەوەیە کە وتیـان: ﴿ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾ بـە بۆچوونـی وان ئەمـە مەزنتریـن لەکـەو پەڵەیـە بـۆ صاڵح ﷺ، چـۆن عەقڵـی خۆیانو بـاوکو باپیـرە گومڕاکانیانی لەکـەدار کردوە، وە چـۆن قەدەغەی لێکـردوون بەندایەتی بۆ شـتێک بکەن کە سـوودو زیانی نیە، لـە دارو بەردو هاوشـێوەکانی، وە فەرمانـی پێکردوون بـە دڵسـۆزیەوە بەندایەتی بـۆ پەروەردگاریان بکەن، ئـەو پەروەردگارەی کە هەمیشـە نازوو نیعمەتەکانـی دادەبارێنـێ بەسـەریاندا، کـە هیـچ نازوونیعمەتێک نیـە لەلای ئـەوان تەنها لە لایـەن خواوەیـە، وە هیـچ خراپەیەکیـان لـێ دوور ناخرێتـەوە مەگـەر بـە ویسـتی خوایە، ﴿ وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴾ واتـە: بـە بـەردەوام ئێمە لە گوماندایـن لـەو پەیامەی کـە بانگـی ئێمەی بـۆ دەکەی، گومـانو دوودڵیـەک کە کاریگـەری لە دڵمان کـردوە، بە بۆچوونـی خۆیـان ئـەوان ئەگـەر بیانزانیبا ڕاسـتی ئـەو پەیامەی ئەو بانگەشـەی بـۆ دەکات ئـەوە شـوێنی دەکەوتن، بەڕاسـتی لەو قسـەیاندا درۆ دەکـەن، لەبەرئـەوە درۆکەیانی ڕوون کردۆتەوە لـەم وتەیەدا:

قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي
مِنۡهُ رَحۡمَةٗ فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِنۡ عَصَيۡتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِي
غَيۡرَ تَخۡسِيرٖ ٦٣ وَيَٰقَوۡمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗۖ
فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ
عَذَابٞ قَرِيبٞ ٦٤ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ
ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ٦٥ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا
نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَمِنۡ
خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ٦٦ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ
ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ٦٧
كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا
بُعۡدٗا لِّثَمُودَ ٦٨ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُواْ
سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ٦٩ فَلَمَّا رَءَآ
أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ
قَالُواْ لَا تَخَفۡ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ ٧٠ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ
فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ٧١

(٦٣): ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي مِنۡهُ رَحۡمَةٗ فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِنۡ عَصَيۡتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيۡرَ تَخۡسِيرٖ ﴿٦٣﴾﴾

﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي﴾ (صالح عليه السلام وتی: ئەی گەلەکەم! پێم بڵێن: ئەگەر من لەلایەن پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕوون ئاشکرا بم) واتە: سەلماندنو دڵنیایی لە منەوە ﴿وَءَاتَىٰنِي مِنۡهُ رَحۡمَةٗ﴾ واتە: منەتی کردوە بە سەرمدا بە پەیامو وەحی بۆ ناردووم، ئایا من شوێنی ئەوە بکەوم کە لەسەریم، یان ئەوەی ئێوە منی بۆ بانگ دەکەن؟! ﴿فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِنۡ عَصَيۡتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيۡرَ تَخۡسِيرٖ﴾ (واتە: جا کێ یارمەتیم دەدات، لە بەرانبەر خوادا، ئەگەر سەرپێچی ئەو بکەم، کەواتە: ئێوە هیچ بۆ من زیاد ناکەن) جگە لە دۆڕانو فەوتانو زەرەرو زیان نەبێت.

(٦٤-٦٧): ﴿وَيَٰقَوۡمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗ فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ ﴿٦٤﴾ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ﴿٦٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾﴾

﴿وَيَٰقَوۡمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗ﴾ (وە ئەی گەلەکەم! ئەمە حوشتری خوایە، نیشانەیە بۆ ئێوە) یەک ڕۆژ ئاو خواردنەوەی بۆ هەیە لە بیرەکە، پاشان هەموو لە شیرەکەی دەخۆنەوە، ئەوانیش ڕۆژێکی دیاریکراویان بۆ هەیە لەو بیرە بخۆنەوە ﴿فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِ﴾ لەسەر ئێوە نیە خزمەتی بکەنو لەوەری بۆ دابین بکەن ﴿وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ﴾ واتە: سەری مەبڕن، ﴿فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ ﴿٦٤﴾﴾ فَعَقَرُوهَا

فَقَالَ ﴿ صالـح پێی وتن: ﴿ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ﴾ بەڵکـو هـەر دەبـێ ڕووبـدات ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا ﴾ بـە تووشـبونی سـزا ﴿ نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍۚ ﴾ واتـە: ڕزگارمـان کـردن لە سـزاو سەرشـۆڕیو ڕیسـوایی، ﴿ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴾ لـە توانـاو دەسـەڵاتی، لـە نـاو بردنـی ئوممەتـە سـەرکێشو سـتەمکارەکان بـوو، پێغەمبـەرانو شـوێنکەوتووانی ڕزگـار کـرد ﴿ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ ﴾ (ئەوانـەش سـتەمیان کـرد) شـریخەیەکی مەزن جەرگیانـی بـڕی، ﴿ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴾ (واتـە: ئیتـر لەنـاوماڵەکانیانـدا کەوتـن بـە دەمـداو) جوڵەیان لـێ برا.

(٦٨): ﴿ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾ ﴾:

﴿ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآ ﴾ واتـە: وەک ئـەوەی لـەو شـوێنەدا نەژیابێتـنو ڕۆژێـک لـە ڕۆژان چێژیـان وەر نەگرتبـێ، خۆشـیەکانیان لێدابـڕا، سـزای هەمیشـەییان بـۆ پێویسـت بـوو بە بـێ دابـڕان، ﴿ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمۡ ﴾ واتـە: ئینکاریـان کـرد پاش ئـەوەی ئایەتی ڕوونیـان بـۆ هـات ﴿ أَلَا بُعۡدٗا لِّثَمُودَ ﴾ ئای چەندە ڕیسـواو بـێ عەقڵ بوون، پەنـا دەگرین بە خـوا ﷻ لـە سـزای شەرشـۆڕی دونیا.

(٦٩): ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ﴿٦٩﴾ ﴾:

﴿ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ ﴾ هەتا کۆتایی چیرۆکەکە.

﴿ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ ﴾ واتـە: لـە فریشـتە بەڕێـزەکان، پێغەمبەرمـان ﴿ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾ خۆشەویسـتو خەلیـل، ﴿ بِٱلۡبُشۡرَىٰ ﴾ واتـە: بە مـژدە پێدانی بە کوڕ، کاتـێ کە خوا ﷻ ناردنـی بـۆ لـە ناوبردنـی گەلـی لـووط ؛، فەرمانـی پێکـردن بـە لای ئیبراهیمـدا ؛ تێپـەڕن، مـژدەی بدەنـێ بـە ئیسـحاق ؛، کاتی چوونـە ژوورەوە بـۆ لای، ﴿ قَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞ ﴾ واتـە: سـڵاویان لێکـرد، ئەویـش وەڵامی دانـەوە ؛.

ئەمە بەڵگەیە لەسـەر شـەرعیەتی سڵاو کردن، بێگومان ئەوە بەردەوام لە میللەتی ئیبراهیم ؛ بـووە، سـڵاو کـردن پێـش قسـە کردنـە، وە دەبـێ وەڵامدانـەوەی سـڵاو جوانتـر بـێ لە دەسـتپێک، چونکـە سـڵاوی فریشـتەکان بـە جوملـەی فیعلـی بـوو، کـە ئاماژەیە بـۆ تازە کردنـەوە، بـەڵام وەڵامدانـەوەی ئیبراهیـم بـە جوملـەی ئیسـمی بوو، کـە ئاماژەیە لەسـەر جێگیـر بـوونو بـەردەوام بـوون، وە لـە نێوانیانـدا جیاوازیەکـی گـەورە هەیە، هـەر وەکو

ئەمــە شــتێکی زانــراوە لــە زمانــی عەرەبیدا.
﴿ فَمَا لَبِثَ ﴾ (ئەوەنــدە نەمایــەوە) ئیبراهیم کاتێ هاتنــە ژوورەوە بۆ لای ﴿ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ﴾ واتــە: لــە ماڵــی خۆیــدا دەسپێشــخەری کــرد، بــۆ میوانەکانــی گوێرەکەیەکــی قەڵــەوی برژانــد، نزیکــی کــردەوە لێیــان، جا پێــی وتن: بۆچــی ناخۆن؟

(٧٠): ﴿ فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ قَالُواْ لَا تَخَفۡ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ ٧٠ ﴾

﴿ فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ ﴾ (واتــە: جــا کاتــێ بینــی دەســتیان درێــژ ناکــەن بۆی) بۆ ئــەو میوانداریــە ﴿ نَكِرَهُمۡ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ ﴾ لــە دەروونــی خۆیــدا وا گومانی برد بــۆ کارێکــی خــراپ هاتبــن، لە کاتێکــدا پێش ئــەوەی بزانی بــۆ چی هاتــوون؟ ﴿ قَالُواْ لَا تَخَفۡ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ ﴾ واتــە: وتیــان: ئێمــە پەیامبەری خواین (مەترســە)، خوا ﷻ ناردوونــی بۆ لــە نابردنی گەلــی لووط.



قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا
لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ
وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ فَلَمَّا ذَهَبَ
عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾
إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ ۖ إِنَّهُۥ
قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ وَلَمَّا
جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا
يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ وَجَآءَهُۥ قَوْمُهُۥ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِن قَبْلُ كَانُوا۟
يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِى هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ ۖ
فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِى ضَيْفِىٓ ۖ أَلَيْسَ مِنكُمْ رَجُلٌ رَّشِيدٌ ﴿٧٨﴾
قَالُوا۟ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا لَنَا فِى بَنَاتِكَ مِنْ حَقٍّ وَإِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا نُرِيدُ
﴿٧٩﴾ قَالَ لَوْ أَنَّ لِى بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِىٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ﴿٨٠﴾ قَالُوا۟
يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓا۟ إِلَيْكَ ۖ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ
مِّنَ ٱلَّيْلِ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ إِلَّا ٱمْرَأَتَكَ ۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا
مَآ أَصَابَهُمْ ۚ إِنَّ مَوْعِدَهُمُ ٱلصُّبْحُ ۚ أَلَيْسَ ٱلصُّبْحُ بِقَرِيبٍ ﴿٨١﴾

**(٧١-٧٢):** ﴿ وَٱمْرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴿٧٢﴾ ﴾:

**لەو كاتەدا خێزانەكەی ئیبراهیم ﴿ قَآئِمَةٌ ﴾ وەستابوو، خزمەتی میوانەكانی دەكرد ﴿ فَضَحِكَتْ ﴾ واتە: كاتێك كە حاڵیانی بیست بۆچی نێردراون، بە سەرسوڕمانەوە ﴿ فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴾ سەری لەمە سوڕماو ﴿ قَالَتْ يَٰوَيْلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٌ وَهَٰذَا بَعْلِى شَيْخًا ﴾ (واتە: وای چۆن منداڵم دەبێ من پیر بووم، ئەمەش مێردەكەمە كە پیرە) ئەم دووانە بەربەستن لە بوونی منداڵ، ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عَجِيبٌ ﴾ (واتە: بە ڕاستی ئەمە شتێكی سەیرە).**

**(٧٣):** ﴿ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ۖ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴿٧٣﴾ ﴾:

**﴿ قَالُوٓا۟ أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ ﴾ بە ڕاستی كاری خوا ﷻ سەرسوڕمانی تێدا نیە، لەبەر ئەوەی توانای هەیە بەسەر هەر شتێكدا كە بیەوێت، هیچ شتێك جێگای سەرسوڕمان نیە لەسەر توانای خوا ﷻ، بە تایبەت ئەوەی كە بەڕێوەی دەبات و تەواوی دەكات بۆ خاوەنی ئەم ماڵە پیرۆزە، ﴿ رَحْمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ ﴾ واتە: بەردەوام ڕەحمەت و چاكەو بەرەكەتی خواتان لەسەر بێت، ئەویش خێرو چاكەی زیادەیەتی، وە ڕەوابوونی خێری خواوەندە لەسەر بەندە ﴿ عَلَيْكُمْ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ ۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٌ مَّجِيدٌ ﴾ واتە: سیفەتەكانی ستایش كراوە، چونكە سیفەتەكانی سیفەتی تەواون، كردارەكانیشی ستایش كراون، چاكن، بەخشندەن، كاربەجێ و دادپەروەرن.**

(مجیـد): بریتیە لـە مەزنی سـیفەتەکانو بەرفراوانیان، خاوەن سـیفەتی تـەواوە، وە لە هەموو سـیفەتێکی تەواو خاوەن تەواوتریـنو فراوانترینیانە.

(٧٤): ﴿ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِى قَوْمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ ﴾

﴿ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنْ إِبْرَٰهِيمَ ٱلرَّوْعُ ﴾(واتـە: ئنجـا کاتـێ تـرسو بیمـی ئیبراهیـم لاچـوو) کە تووشـی بـوو لە ترسـی میوانەکانی، ﴿ وَجَآءَتْهُ ٱلْبُشْرَىٰ ﴾واتـە: بە کوڕ، ڕاسـتەوخۆ ڕووی کـردە نێردراوەکان مشـتو مڕی لەگـەڵ دەکردن دەربارەی لـە ناوبردنی گەلی لووط ﷺ، وە پێی فەرموون: ﴿ إِنَّ فِيهَا لُوطًا ۚ قَالُوا۟ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَن فِيهَا ۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ ﴿٣٢﴾ ﴾العنکبـوت. (واتـە: بەڕاسـتی لـووط لەو شـارەدایە، وتیـان: ئێمە چـاک دەزانین کێی لێیـە، سـوێند بە خـوا ئێمە لـووطو ئەندامانـی خێزانەکـەی ڕزگار دەکەین جگـە لە ژنەکەی کە لـە جێمـاوان دەبێت).

(٧٥): ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٌ مُّنِيبٌ ﴿٧٥﴾ ﴾

﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ ﴾واتـە: خـاوەن ڕەوشـتێکی جـوانو دڵێکـی فـراوان بـوو، وە تـووڕە نەدەبـوو بەرانبـەر نەفامی نەفامـان ﴿ أَوَّٰهٌ ﴾واتە: ملکەچ بـۆ خوا ﷻ لە هەمـوو کاتەکاندا، ﴿ مُّنِيبٌ ﴾ واتـە: ڕوو لـە خـوا بـوو لـە هەمـوو کاتێکـدا بـە ناسـینیو خۆشویسـتنیو ڕووتێکردنـی، وە پشـت تێکـەرو خۆپارێـز بوو لە غەیری خـوا ﷻ، جا لەبەر ئەوە مشـتو مـڕی دەکـرد دەربـارەی ئەوانەی خـوا ﷻ بڕیـاری لەناوبردنـی دابوون.

(٧٦): ﴿ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ ۖ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴿٧٦﴾ ﴾

پێـی وتـرا: ﴿ يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَآ ﴾(وازبهێنە لە) مشـتو مڕ کـردن ﴿ إِنَّهُۥ قَدْ جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ﴾بـە لـە ناوبردنیـان ﴿ وَإِنَّهُمْ ءَاتِيهِمْ عَذَابٌ غَيْرُ مَرْدُودٍ ﴾مشـتو مـڕ کـردن هیچ سـوودێکی نیە.

(٧٧): ﴿ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ ﴾

﴿ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا ﴾واتـە: ئـەو فریشـتانەی کـە لای ئیبراهیم ﷺ دەرچـوون، کاتێ گەیشـتنە ﴿ لُوطًا سِىٓءَ بِهِمْ ﴾واتـە: هاتنیانـی پێ ناخۆش بـوو ﴿ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴾واتـە: توونـدو ناخۆشـە، دەیزانـی گەلەکـەی وازیان لێناهێنـن، چونکە لـە وێنـەی گەنجێکـی سـافو لـووس لـە ئەوپـەڕی تـەواوی جوانیـدا بـوون، لەبـەر ئەمە ئەوەی هـات بەخەیاڵیـدا ڕوویدا.

(٧٨): ﴿ وَجَآءَهُۥ قَوۡمُهُۥ يُهۡرَعُونَ إِلَيۡهِ وَمِن قَبۡلُ كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطۡهَرُ لَكُمۡۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ فِي ضَيۡفِيٓۖ أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ ٧٨ ﴾:

﴿ وَجَآءَهُۥ قَوۡمُهُۥ يُهۡرَعُونَ إِلَيۡهِ ﴾ واتــە: هاتــن بــۆ لای بە پەلە پــەل، دەیانویســت میوانداریان بکــەن بــەو فاحیشــەی کــە ئەنجامیــان دەدا، بۆیــە فەرمــووی: ﴿ وَمِن قَبۡلُ كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾ واتــە: ئــەو فاحیشــەی ئــەوان هیــچ گەلێکــی دیکــە پێشــیان نەکەوتبــوو لــە جیهانــدا، ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطۡهَرُ لَكُمۡ ﴾ لــە میوانەکانــم!

ئەمــەش وەکــو ئــەوەی کــە بــۆ ســولەیمان ﷺ خــراوە ڕوو دەربــارەی ئــەو دوو ئافرەتە، ئــەو منداڵــەی کە کێشــەی لەســەر بــوو بیکــوژێ بۆ ئــەوەی هەقو ڕاســتی دەرکــەوێ، وە لــووط ﷺ دەیزانــی کچەکانــی بۆ ئــەوان حەرامــەو هیچ مافێکیــان بەســەریانەوە نیە، بەڵام مەبەســتی گــەورە لێــرەدا ڕێگــری کردنە لــەم تاوانــە گەورەیــە، ﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ فِي ضَيۡفِيٓ ﴾ واتــە: یــان ئەوەیــە ئێــوە لە خــوا ﷻ بترســنو خۆتان بپارێــزن، یــان ڕێز لە مــن بگــرن دەربــارەی میوانەکانــم، سەرشــۆڕم مەکــەن لــە لای میوانەکانــم، ﴿ أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ ﴾ (واتــە: ئایــا پیاوێکــی ژیــرو ســەر ڕاســتان تێدانیــە) ڕێگریتان لــێ بکات سەرزەنشــتو تەمێتــان بــکات؟! ئەمە بەڵگەیە لەســەر ئەوەی کــە ئەمانە هیــچ خێرو چاکەو پیاوەتیەکیــان تێــدا نەماوە.

(٧٩-٨٠): ﴿ قَالُواْ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ ٧٩ قَالَ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً أَوۡ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ ٨٠ ﴾:

جــا ﴿ قَالُواْ ﴾ بە لــووط ﷺیــان وت: ﴿ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ ﴾ واتــە: ئێمــە هیچمــان نــاوێ جگە لە پیــاو، ئێمــە ئارەزوومان بۆ ئافــرەت ناجوولــێ، لووط ﷺ بــە تەواوەتی بیتاقەت بــوو خەم دایگــرت، وە ﴿ قَالَ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً أَوۡ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ ﴾ (وتــی: ئەگەر توانــام لــە بەرانبەرتاندا ببووایە، یــان هانام بردبایە بــەر پەنایەکــی بەهێز بەرگریم لــە میوانەکانــم دەکــرد) وەکو هۆزێــک ڕێگری لــە ئێوە بکردایــە، ئەمەش بە پێی ئــەو هۆکارە هەســتیارانەیە، ئەگەرنــا ئــەو پەنای بــردوە بــۆ لای بەهێزترینو توونــدوو تۆڵتریــن پایە ئەویش خــوا ﷻیــە، ئــەو خوایەی کە هیچ شــتێک لــە بەرانبەر هێــزی ئەودا ناوەســتێ.

(٨١): ﴿ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡۚ إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ ٨١ ﴾:

لەبەر ئەمە کار گەیشتە ئەوپەڕیو، خەمو بێتاقەتی دایگرت ﴿قَالُواْ﴾ (فریشتەکان) وتیان: ﴿إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ﴾ هەواڵیان پێدا دەربارەی خۆیان هەتا دڵی ئارام ببێتەوە ﴿لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَ﴾ هەرگیز بە تاوان ناگەن بە تۆ، پاشان جبریل ﷺ بە باڵەکانی چاویانی داخستو ڕۆیشتن، هەرەشەیان لە لووط دەکرد بە هاتنی بەیانی، فریشتەکانیش فەرمانیان بە لووط کرد شەوڕۆیی بکات بە خێزانو کەس و کاری ﴿بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ﴾ واتە: لە بەشێکی شەودا زوو پێش بانگی بەیانی، تا تەواو دوور بکەونەوە لە نزیکیانەوە ﴿وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ﴾ واتە: پەلە بکەن لە دەرچووندا با هەموو خەمێکتان تەنها ڕزگار بوون بێ، با هیچ کەس لە ئێوە لانەکاتەوە بە دوای خۆیداو ئاوڕ نەداتەوە، ﴿إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡ﴾ (جگە لە هاوسەرەکەت ئەوەی ئەوان تووشیان دەبێ ئەویش تووشی دەبێ) لە سزا، لەبەر ئەوەی بەشدار بووە لەگەڵ گەلەکەیدا لە تاوان کردن، ئاگاداری کردوونەتەوە لە میوانەکانی لووط، کاتێ کە میوانەکانی هاتن بۆ لای ﴿إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُ﴾ وەکو ئەوە وایە لووط ﷺ پەلەی کردبێ لەوەدا، جا پێی وتراوە: ﴿أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ﴾ ئایا بەرەبەیان نزیک نیە؟

فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا
حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ٨٢ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَۖ
وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ ٨٣ ۞ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ
شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ
وَلَا تَنقُصُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَۖ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ
وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ٨٤ وَيَٰقَوۡمِ
أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ
أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ٨٥ بَقِيَّتُ
ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم
بِحَفِيظٖ ٨٦ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ
مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ
لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ٨٧ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ
عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ
أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ
مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ٨٨

(٨٢): ﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ﴿٨٢﴾﴾:

﴿فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا﴾ بە دابەزاندنی سزاو لە ناوبردنیان ﴿جَعَلۡنَا﴾ شارەكەیان ﴿عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا﴾ واتە: سەروژێرمان كردن، وە هەڵمان گێرایەوە بەسەریاندا ﴿وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ﴾ واتە: بەردی ئاگرینی زۆر گەرم ﴿مَّنضُودٖ﴾ واتە: بە دوای یەكداو بەبێ پچڕان.

(٨٣): ﴿مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَۖ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ ﴿٨٣﴾﴾:

دەفەرموێ: ﴿مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ﴾ واتە: نیشانەدار كرابوو، نیشانەی سزاو تووڕەیی بەسەرەوە بوو، ﴿وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ ئەوانەی خۆیان دەشوبهێنن بە كردەوەی گەلی لووط ﴿بِبَعِيدٖ﴾ با ئاگاداربن بەندەكان لە كردەوەی هاو شێوەی كردەوەی وان نەكەن، بۆ ئەوەی سزایان لەسەر پێویست نەبێ، وەكو چۆن ئەوان سزایان لەسەر پێویست بوو.

(٨٤): ﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ وَلَا تَنقُصُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَۖ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ﴿٨٤﴾﴾:

﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا﴾ تا كۆتایی چیرۆكەكە، وە ناردمان ﴿وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ﴾ بۆ خەڵكی مەدیەن، چونكە هۆزێكی ناسراو بوون لە شاری مەدیەن دادەنیشتن لە خوارووی فەلەستین ﴿أَخَاهُمۡ﴾ لە ڕەچەڵەكدا ﴿شُعَيۡبٗا﴾ چونكە دەیانناسی، بۆ ئەوەی بتوانن لێی وەربگرن ﴿قَالَ﴾ پێیانی وت: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥ﴾ واتە: بە دڵسۆزیەوە بەندایەتی بۆ خوا بكەن، بێگومان ئەو گەلە بتپەرست بوون، وە لەگەڵ بتپەرستیاندا كەمو كوڕیان دەكرد لە پێوانەو كێشانەدا، وە لەبەر ئەمە قەدەغەی

کـردوون لـەو کارە دزێـوو ناشـرینە، جـا فەرموویەتـی: ﴿ وَلَا تَنقُصُواْ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ﴾ بەڵکـو بـە چاکـیو دادپـەروەری پێوانەو کێشـانە بکـەن، ﴿ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ ﴾ بـە نـازو نیعمەتی زۆرو لـەش سـاغییەوە، وە بە ماڵو سـامانو منداڵـی زۆرەوە، جا شـوکری خوا ﷻ بکەن لەسـەر ئـەوەی پێـی بەخشـیون، وە کوفـری نیعمەتەکانی خوا ﷻ مەکـەن، چونکـە لێتـان وەردەگرێتـەوە، ﴿ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴾ واتـە: سـزایەک دەورتان بـدات‌و تووشـتان بـکات، هیچ کەسـێکتان ڕزگـاری نەبێ.

(٨٥): ﴿ وَيَٰقَوْمِ أَوْفُواْ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَٰقَوْمِ أَوْفُواْ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ﴾ واتە: بـە دادپەروەری، بـەوەی کە خۆتان حەز دەکـەن لەگەڵتاندا بکـرێ، ﴿ وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ ﴾ واتـە: کـەمو کوڕی مەکـەن لە شـتی خەڵکیدا، لێی بـدزن لە ڕێگـەی کەم کردنـی پێوانەو کێشـانەدا، ﴿ وَلَا تَعْثَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴾ بێگومان بەردەوام بوون لەسـەر سـەرپێچی ئاینـەکان تێـک دەدا، وە بیروباوەڕو ئایـن‌و دنیـاو کێڵگەو وەچەش لە نـاو دەبات.

(٨٦): ﴿ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿٨٦﴾ ﴾:

﴿ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾ واتـە: ئەوەندەتـان بەسـە کـە خـوا ﷻ بۆتـان دەهێڵێتـەوە لـە خێـرو چاکـە، تەمـاح مەکـەن بەکارێک کە پێویسـتان پێی نیـەو زیانی هەیـە بۆتان ﴿ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ دەی کار بکـەن بـە داخوازی ئیمـان ﴿ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴾ من پارێـزەری کردەوەکانـی ئێوە نیـم، بەڵکو خـوا ﷻ دەیانپارێزێ، بەڵام من تەنهـا ئاگادارتان دەکەمـەوە لـەوەی کە بۆم نێـردراوە.

(٨٧): ﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْ ۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ ﴾:

﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ ﴾ (وتیـان: ئـەی شـوعەیب! ئایا نوێژو خوا پەرسـتیەکەت فەرمانـت پێ دەکات، کە ئەوەی بـابو باپیرانمان دەیانپەرسـت، وازی لـێ بێنیـن؟!!) واتـە: ئـەو قسـەیان وت بە شـێوەیەکی گاڵتەجـاڕی لە نێـوان خۆیانـدا کـە زۆر دوورە لە وەڵامدانـەوەو بەدەمـەوە هاتنیان.

وە مانـای قسـەکەیان بـە ڕاسـتی: قەدەغەکردنـت پێویسـت نیـە لەسـەر ئێمـە، جگـە لەوە نەبـێ تـۆ نوێـژ بـۆ خـوا ﷻ دەکەیت‌و دەیپەرسـتی، جـا ئەگـەر تۆ بەو شـێوەیە بـی، ئایا

پێویستە لەسەر ئێمە واز لە بیروو باوەڕی باوکو باپیرمان بهێنین لەبەر قسەیەک کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، تەنها ئەوەیە لەگەڵ خۆتدا دەگونجێ، دەی چۆن شوێنت بکەوینو واز لە شوێنکەوتنی باوکو باپیرانمان بهێنین، کە خاوەن عەقڵو ژیری تەواو بوون؟! بە هەمان شێوە قسەکانت پێویست نیە لەسەر ئێمە ﴿ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا ﴾ ئەوەی کە تۆ بە ئێمەت دەڵێی دەربارەی مامەڵەکردنی ڕاستو دروست بە پێوانەو کێشانە، وە بەجێهێنانی ئەو مافانەی پێویستە لەسەرمان، بەڵکو ئێمە بە ویستی خۆمان چیمان بوێ لەماڵو سامانەکانمان دەیکەین، چونکەماڵی خۆمانە، تۆ هیچ مافێکت بەسەرەوە نیە، مامەڵەی پێوە بکەیت، بۆیە بە گاڵتەجاڕیەوە وتیان: ﴿ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴾ ئا تۆ ئەو کەسەی کە لەسەرخۆیو هۆشمەندی بووە بە خووڕەوشت تیاتدا، وە ژیری بووە بە ئاکار لە تۆدا، هیچ شتێک لە تۆوە دەرناچێ تەنها ژیری نەبێ، وە فەرمان ناکەی بە ژیری نەبێ، قەدەغە ناکەی لە گومڕاییو خراپە نەبێ؟! واتە: کارەکە بەو شێوەیە نیە.

مەبەستیان ئەوە بوو کە ئەو بە پێچەوانەی ئەو دوو وەسفە وەسف کراوە: گەمژەییو کەم عەقڵیو گومڕایی، واتە: بێگومان مانای ئەوەیە چۆن دەکرێ تۆ لەسەرخۆو ژیر بیت، وە باوکو باپیرانی ئێمە گەمژەو گومڕا بن؟! ئەم قسەیەی کە کردوویانە بە شێوازێکی گاڵتەجاڕیەوە بووە، بێگومان کارەکە پێچەوانەی قسەی ئەوانە، بەو شێوە نیە کە ئەوان گومانی بۆ دەبەن، بەڵکو بەو شێوەیەیە کە وتیان: بە ڕاستی نوێژەکانی فەرمانی پێدەکات بە قەدەغە لێ کردنیان لەوەی باوکو باپیرە گومڕاکانیان دەیانپەرست، وە بە ویستی خۆیان لە ماڵو سەروەتەکانیاندا چیان بوێ بیکەن، بێگومان نوێژ ڕێگری دەکات لە فاحیشەو خراپەکاری جا چی فاحیشەو خراپەکاریەک لەوە گەورەترە کە بەندایەتی بۆ غەیری خوا ﷻ بکرێت، وە کەسێک ڕێگری لە مافی بەندەکانی خوا ﷻ بکات، یان لە ڕێگای پێوانەو کێشانەوە بیان دزێ، بە ڕاستی شوعەیب ﵇ لەسەرخۆو ژیرو عاقڵ بوو.

(٨٨): ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ ﴾:

﴿ قَالَ ﴾ شوعەیب پێی وتن: ﴿ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي ﴾ واتە: یەقینو دڵنیاییو ئاسودەیی سەر ڕاستی ئەوەیە کە بۆم هێناون ﴿ وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗا ﴾ واتە: خوا ﷻ پێی بەخشیوم لە جۆرەها سەروەتو سامان لەوەی کە پێی بەخشیوم ﴿ وَمَآ أُرِيدُ ﴾ من نامەوێ ﴿ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ ﴾ قەدەغەتان لێ بکەم لە کەمو کورتی لە پێوانەو کێشانەدا لە کاتێکدا خۆم ئەنجامی بدەم، هەتا تۆمەتم بخرێتە سەر لەوەدا، بەڵکو ئەگەر قەدەغەتان لێبکەم لە هەر شتێک، ئەوە خۆم یەکەم کەس دەبم لە وازهێنانیدا ﴿ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ ﴾ واتە: من هیچ مەبەستێکم نیە تەنها ئەوە نەبێ کە لە بەرژەوەندی ئێوە دایەو سوودی ئێوەی تێدا بێت، من هیچ مەبەستێکی تایبەتم نیە لەوەدا.

کاتێ کە ئەمە جۆرێ لە پاک ڕاگرتنی نەفسی تێدابوو، ڕەتیکردەوە بە وتەی: ﴿ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ ﴾ واتە: سەرکەوتن بەدەست ناهێنم بۆ کاری چاکەو دوورکەوتنەوە لە خراپە تەنها بە پشتیوانی خوای بەرز نەبێ، نەک بە پشتیوانیو توانای خۆم، ﴿ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ ﴾ واتە: لە کاروبارەکانمدا پشتم بە خوا بەستووەو تەنها متمانەم بەوە هەیە، ﴿ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴾ (هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە) لە بەجێ هێنانی ئەوەی فەرمانی پێکردوون لە جۆرەکانی پەرستندا، وە لەمەدا نزیک بوونەوە لە خوا ﷻ بەدی دەکرێ بە سەرجەم کردارە چاکەکان، وە بەم دوو کارە کاروباری بەندە ڕێک دەبێ ئەوانیش: پشت بەستن بە پەروەردگارو گەڕانەوەیە بۆ لای، هەروەکو خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِۚ ١٢٣ ﴾هود. (واتە: بەندایەتی بۆ بکەو پشتی پێ ببەستە)، وە فەرموویەتی: ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥ ﴾الفاتحة. (واتە: تەنها تۆ دەپەرستینو تەنها پشت بە تۆ دەبەستین).

وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ
قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم
بِبَعِيدٖ ﴿٨٩﴾ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي
رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَقُولُ
وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗاۖ وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ لَرَجَمۡنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ
عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَهۡطِيٓ أَعَزُّ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ
وَٱتَّخَذۡتُمُوهُ وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ
مُحِيطٞ ﴿٩٢﴾ وَيَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَٰمِلٞۖ
سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَمَنۡ هُوَ كَٰذِبٞۖ
وَٱرۡتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمۡ رَقِيبٞ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا
شُعَيۡبٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَأَخَذَتِ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾
كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّمَدۡيَنَ كَمَا بَعِدَتۡ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾
وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ
وَمَلَإِيْهِۦ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ فِرۡعَوۡنَۖ وَمَآ أَمۡرُ فِرۡعَوۡنَ بِرَشِيدٖ ﴿٩٧﴾

(٨٩): ﴿ وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ ﴿٨٩﴾ ﴾

﴿ وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ ﴾ واتە: با دژایەتیتان لەگەڵمدا نەبێتە مایەی ئەوەی ﴿ أَن يُصِيبَكُم ﴾ لە سزاکان ﴿ مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ ﴾ (واتە: وێنەی ئەو سزایەی گەلی نووح، یان گەلی هوود، یان گەلی صالح بوو، خۆ گەلەکەی لووط دوور نیە لێتانەوە) نە لە ماڵداو نە لە کاتەکاندا.

(٩٠): ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴿٩٠﴾ ﴾

﴿ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ﴾ لەو تاوانانەی کە کردووتانە ﴿ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾ لەو تەمەنەی کە ماوتانە بە تەوبەیەکی ڕاستەقینەو گەڕانەوە بۆ لای بە گوێڕایەڵی کردنی، وە وازهێنان لە سەرپێچی کردنی ﴿ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴾ واتە: بۆ ئەو کەسەی کە تەوبە دەکاو دەگەڕێتەوە خوا ﷻ ڕەحمی پێدەکاو لێی خۆش دەبێ، وە تەوبەی لێوەردەگرێو خۆشیشی دەوێ، وە مانای (ودود) لە ناوە پیرۆزەکانیەتی، بە ڕاستی خوا بەندە بڕوادارەکانی خۆش دەوێ، ئەوانیش ئەویان خۆش دەوێ، (ودود) لەسەر کێشی (فعول) بە مانای (فاعل)، وە مانای (مفعول).

(٩١): ﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗاۖ وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ لَرَجَمۡنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ ﴿٩١﴾ ﴾

﴿ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَقُولُ ﴾ واتە: ژاوەژاویان کرد لە ئامۆژگاریەکانیدا بۆیان ﴿ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗا ﴾ واتە: ئێمە تۆ دەبینین، لە سەرگەورەو دەسەڵاتداران بیت، بەڵکو لە لاوازەکانی ﴿ وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ ﴾ واتە: کەسو کاروو هۆزەکەت

﴿ لَرَجَمْنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ﴾ واتــە: تـۆ هیــچ توانایەکـت نیە لــە بەرانبــەر ئێمەدا، وە هیــچ ڕێزێکــت نیــە لای ئێمــە، بەڵکــو ڕێزمــان لە هۆزەکــەت گرتــووە وازمــان لێهێناوی.

(٩٢): ﴿ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَهْطِيٓ أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَٱتَّخَذْتُمُوهُ وَرَآءَكُمْ ظِهْرِيًّاۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٩٢﴾ ﴾:

﴿ قَالَ ﴾ بــە نــەرمو نیانیــەوە پێــی وتــن: ﴿ يَٰقَوْمِ أَرَهْطِيٓ أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: چــۆن ڕێــزم لێدەگــرن لەبەر خاتــری هۆزەکــەم، وە ڕێزم لێناگــرن لەبەر خاتــری خوا ﷻ، کەوابــوو خزمانــم لــە لای ئێــوە بەدەســەلآتدارترن لــە خــوا ﷻ! ﴿ وَٱتَّخَذْتُمُوهُ وَرَآءَكُمْ ظِهْرِيًّا ﴾ واتــە: فەرمانــی خواتــان پشــت گــوێ خســتوەو بــە بــای خەیاڵتاندا نایــەتو لێی ناترســن ﴿ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴾ هیچــی لــێ ناشــاردرێتەوە لــە کردەوەکانتان تەنانــەت بــە قــەد مســقاڵە زەڕەیەکیــش، نــە لــە زەویو نە لــە ئاســمانەکاندا، لــە داهاتوودا پاداشــتی کردەوەکانتــان دەداتــەوە بــە تەواوترین پاداشــت.

(٩٣): ﴿ وَيَٰقَوْمِ ٱعْمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَٰمِلٌۖ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَمَنْ هُوَ كَٰذِبٌۖ وَٱرْتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴿٩٣﴾ ﴾:

فەرمانــی کــرد کاتــێ کــە ماندوویــان کــرد، وە بێتوانــا بــوو لــە بەرانبەریانــدا فەرمــووی: ﴿ وَيَٰقَوْمِ ٱعْمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ ﴾ واتە: لەســەر بارودۆخی خۆتــانو ئاینەکەتان ﴿ إِنِّي عَٰمِلٌۖ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ ﴾ وە بــۆی حــەلآڵ دەبێ ســزای بەردەوام ﴿ وَمَنْ هُوَ كَٰذِبٌ ﴾ مــن یــان ئێــوە، بێگومــان ئەوەیان زانی کاتێ تووشــی ســزا بوون ﴿ وَٱرْتَقِبُوٓاْ ﴾ ئــەوەی بەســەر منــدا دێ ﴿ إِنِّي مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴾ ئەوەی بەســەر ئێوەدا دێ.

(٩٤-٩٥): ﴿ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾ ﴾:

﴿ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا ﴾ بــە لــە ناوبردنــی گەلی شــوعەیب ﷺ ﴿ نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴾ گوێــت لــە هیــچ دەنگێکــەوە نەدەبــوو، وە هیــچ جووڵەیەکــت نەدەبینــی ﴿ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْاْ فِيهَآ ﴾ وەکــو ئــەوەی لــەو وڵاتــەدا هــەر نەژیابێتــن، وە بەهەرمەنــد نەبووبــن تێیــدا کاتێ کە ســزایان بۆ هــات ﴿ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ ﴾ کاتــێ کــە خــوا ﷻ لــە نــاوی بــردنو ڕیســوای کــردن ﴿ كَمَا

بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴾ واتــە: ئــەم دوو گــەلو هــۆزە لــە خەشــمو قیــنو دووریو لــە ناوچووندا بەشــدار بوون.
شــوعەیب ﷺ ناونرابوو بە وتاربێژی پێغەمبەران ﷺ ئەویش بە هۆی چاک مامەڵە کردنی بــوو، لەگــەڵ گەلەکەیــدا، وە لــە چیرۆکەکەیدا ســوودو پەنــدو ئامۆژگاریەکــی زۆر هەیە:

## سوودو پەندو ئامۆژگاریەکی بەسەرهاتی شوعەیب ﷺ

یەکــەم: وەکــو چــۆن تۆڵەیان لــێ دەکرێتــەوەو ســزا ئەدرێن بە بنەمای ئیســلام، بــە هەمان شــێوە بــە شــەریعەتەکانیو لقو پۆکانــی، چونکە شــوعەیب ﷺ گەلەکەی بانــگ کرد بۆ یەکتاپەرستی، وە بــۆ ڕاســتو دروســتی پێوانەو کێشــانە، وە هەڕەشــەی دیاری کــردوە لە کۆی هەمــوو ئەوانە.
دووەم: بــە ڕاســتی ناتــەواوی لــە پێوانەو کێشــانەکان لە تاوانە گەورەکانە، مەترســی ســزای بــە پەلــە دەکرێت بۆ ئەو کەســەی ئــەو کارە ئەنجــام دەدات، ئــەو کارە دزیکردنــە لە ماڵی خەڵکــدا، جا ئەگــەر دزیکردنیان لە پێوانەو کێشــانە هەڕەشــە پێویســت دەکات، ئەوە دزینی مــاڵو ســامانی خەڵکی لــە ڕێگای هێزو دەســەڵاتەوە لە پێشــترە.
سێیەم: پاداشــت لــە ڕەگــەزی کردەوەیە، هەر کەســێک فرو فێــڵ لە ماڵــی خەڵکی بکاتو لێــی کــەم بکاتــەوە بــۆ ئــەوەی ماڵی خــۆی پێ زیــاد بکات، ســزا دەدرێــت بــە پێچەوانەی ئــەوە، وە دەبێتــە هــۆکار بــۆ نەمانــی ئــەو خێرەی کــە لــە لایەنــی لــە ڕزقو ڕۆزی، لەبەر فەرمــوودەی ئــەو: ﴿ إِنِّىٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ ﴾(واتــە: بــە ڕاســتی مــن دەتانبینــم بــە مــاڵو ســامانی زۆرەوە) مەبنــە هــۆکاری نەمانــیو لــە ناوچوونی بــە کــردەوە خراپەکانتان.
چــوارەم: پێویســتە لەســەر بەنــدە ڕازی بێــت بــەوەی خــوا ﷻ پێــی داوە، وە ڕازی بێــت بە حــەڵاڵ لــە حــەرام، وە بــە کارو کەســابەتی حــەڵاڵو ڕەوا لــە کارو کەســابەتی حــەرامو نــارەوا، بێگومــان ئــەوە باشــترە بــۆ ئەو، لەبــەر وتــەی شــوعەیب ﷺ: ﴿ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ ﴾ لــەوەدا بەرەکــەتو زیــادەی ڕزقو ڕۆزی هەیــە، نــەک لــە پەنا بردن بــۆ هۆکارە قەدەغەکــراوەکان کــە پێچەوانــەی فــەڕو بەرەکەتــەو لەنــاوی دەبات.
پێنجــەم: بە ڕاســتی کــردەوە لە پێویســتیەکانی ئیمــانو شــوێنەواریەتی، چونکــە کردەوەی پەیوەســت کــردوە بە بوونــی ئیمانەوە، کــە بەڵگەیە لەســەر ئــەوەی ئەگەر کــردەوە نەبوو، ئــەوە ئیمان ناتــەواوە، یــان هەر بوونــی نیە.

شەشـەم: بـە ڕاسـتی نوێژ لـە لای سـەرجەم پێغەمبەرانی پێشـوو شـەرعیەتی پێـدراوە، وە لە باشـترینی کردەوەکانـە، تـا لـە لای بێبڕوایان فـەزڵو چاکـەی جێگیر بووەو پێـش خراوە بەسـەر گشـت کردەوەکانـدا، بێگومـان نوێـژ ڕێگری لـە خاوەنەکەی دەکات لە فاحیشـەو خراپـەکاری، ئـەو پێوانـەی ئیمانو شـەریعەتە، جا بـە بەجێهێنانـی وەکو خـۆی کاروباری بەنـدە تـەواو دەکات، وە بەجێنەهێنانـی کەلێن لـە دینداریەکەیدا دروسـت دەکات.

حەوتـەم: ئـەو ماڵـەی کـە خـوا ﷻ دەیبەخشـێ بـە مـرۆڤ -ئەگەر چـی ئـازادی کردوە تیایـدا- مافـی ئەوەی نیـە چۆن بیـەوێ کاری تێدا بـکات، چونکە ئـەوە ڕاسـپاردەیە کە لە لای ئـەو، پێویسـتە لەسـەری مافی خـوای تێـدا بەجێبهێنـێ، وە ڕێگری بکات لـە ئەو کارو کەسـابەتانەی کـە خـواو پێغەمبەرەکـەی ﷺ قەدەغەیان کـردوە، نەک وەک بێبـڕواکانو هاوشـێوەکانیان وادەزانـن کـە مـاڵو سـامانەکانیان هـی خۆیانە، چـۆن بیانەوێ بە ویسـتی خۆیـان مامەڵـەی پێوە دەکەن، یەکسـانە لایـان ئەگەر لەگـەڵ فەرمانی خـوادا بگونجێ، یان پێچەوانـە بێ.

هەشـتەم: لـە تەواوی‌و کامڵـی بانگخواز ئەوەیە خـۆی یەکەم کەس بێ ئـەو فەرمانە جێبەجێ بـکات کـە فەرمانـی پێـدەکات بـە خەڵکـی، وە یەکـەم کـەس بـێ وازی لێبهێنـێ ئەوەی لـە خەڵکـی قەدەغـەی دەکات، وەکـو شـوعەیب ﷺ فەرمـووی: ﴿ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ ﴿٨٨﴾ ﴾هـود. (واتـە: مـن هەرگیز نامـەوێ پێچەوانـەی ئێوە بکەم لـەو کارەی ڕێگـری لە ئێـوە دەکـەم)، وە هەروەها فەرموویەتـی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الصف. (واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێناوە بۆچـی ئـەوەی ئەیڵێن ئەنجامـی نـادەن . زۆر مایەی ڕقو تووڕەییـە لـەلای خـوا کە قسـەیەک بڵێـنو کردەوەی پـێ نەکەن).

نۆیەم: بە ڕاسـتی پیشـەو سـوننەتی پێغەمبەران ویسـتی چاکسـازیە بە پێی تواناو دەسـەڵات، ئـەوان هاتـوون بـە تەواوترین شـێوە چاکسـازیەکان دەسـتەبەر بکەن، یـان بەدەسـتهێنانی ئـەوەی لـە توانایاندایـە، وەبـە ڕێگریکـردن لـە خراپـەو کەمکردنـەوەی‌و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیـە گشـتیەکان بەسـەر بەرژەوەندیە تایبەتەکانـدا، حەقیقەتـی بەرژەوەندی: ئەوەیە بارودۆخـی بەنـدەکان چـاک بـکات، کاروباری دیـنو دنیایان ڕێـک بخات.

دەیەم: هەر کەسـێک هەڵبسـتێت بەوەی لە توانایدایە لە چاکسـازی ئەوە لۆمەو سەرزەنشـت ناکـرێ لـە نەکردنـی کارەکەیـدا بە مەرجـێ لـە توانایدا نەبـێ، جا پێویسـتە لەسـەر بەندە

سـەرەتا چاکسـازی لـە نەفـسو دەروونی خۆیدا بـکات، وە لە خەڵکیشـدا بە پێـی توانا.
یـازدە: بەندە پێویسـتە لەسـەری پشـت بە نەفـسو دەروونی نەبەسـتێ بە قـەد چاوترووکانێ، بەڵکـو دەبـێ بـە بەردەوام پشـت بـە پەروەردگاری ببەسـتێو پەنـا ببات بۆ لای ئـەو داوای سەرکەوتنیشـی لێبـکات، ئەگـەر هەنـدێ لـە سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا بـا بیداتـە پاڵ پەروەردگـاریو سەرسـام نەبـێ بە نەفسـی دەروونی خـۆی، چونکە شـوعەیب فەرمووبەتی: ﴿وَمَا تَوْفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ٨٨﴾هـود، (واتـە: سەرکەوتنیشـم تەنهـا بـە پشـتیوانی خوایـە، پشـتم هـەر بە خوا بەسـتوەو هـەر بـۆ لای ئەویـش دەگەڕێمەوە).
دوازدە: ترسـاندن بـە گرتنـی ئۆممەتەکانـی پێشـوو وە ئـەوەی بەسـەریاندا هـات، بێگومان دەبـێ لـە میانـەی ئامۆژگاریو سەرزەنشـت کردنـدا ئـەو چیرۆکانە باس بکرێ کە سـزای سـتەمکارانی تێـدا دراوە، هەروەکـو چـۆن پێویسـتە لە کاتی هانـدان دا لەسـەر خۆپارێزیو تەقـوای خـوادا باسـی ئەوانـە بکـرێ لـە ئەهلـی تەقـواو خواناسـان کـە خـوا ﷻ ڕێـزی لێگرتوون.
سـێزدە: بـە ڕاسـتی تۆبـەکار لـە تاوانەکـەی بـوراوە، وە خـوا خۆشـی دەوێو نـەرمو نیانە لەگەڵیـدا، پەنـد وەرناگیرێ لە وتـەی: (تۆبەکار ئەگەر داوای لێخۆشـبوونی کـرد ئەوەندەی بەسـە خـوا لێـی خـۆش بـێ، بـەڵام گەڕانـەوەی خۆشەویسـتیو دڵسـۆزی ئـەوە بێگومان ناگەڕێتـەوە)، چونکـە بـە دڵنیایـی خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ ٩٠﴾هـود. (واتـە: وە داوای لێبوردنیش لـە پەروەردگارتان بکـەن، پاشـان بگەڕێنـەوە بـۆ لای، بـە ڕاسـتی پەروەردگـارم میهرەبانی بە سـۆزە).
چـواردە: خـوا ﷻ بەرگـری لـە بـڕواداران دەکات بـە چەندیـن هـۆکاری زۆر، هەندێکی دەزانـن، وە هەندێکـی نازانـن، هەندێک جـار بەرگریان لێـدەکات بە هـۆی هۆزەکانیانەوە، یـان بـە هـۆی هاونیشـتیمانیە بێبڕواکانیـان، وەکـو چـۆن خـوا ﷻ بەردبـاران کردنـی گەلەکـەی لـە شـوعەیب ﷺ دوور خسـتەوە بە هـۆی هۆزەکەیـەوە، ئـەم پەیوەندیانە کە دەبێتـە مایـەی ئـەوەی خراپەکاری لـە ئیسـلامو مسـوڵمانان دوور بخاتەوە کۆشـش کردن بـۆی هیچـی تێدانیـە، بەڵکـو هەندێک جـار پێویسـتە، چونکە چاکسـازی پێویسـتە بە پێی تواناو دەسـەڵات.
لەسـەر ئەمـە ئەگـەر هـاوکاری ئـەو بڕوادارانە بکـرێ کە لـە ژێـر دەسـەڵاتی کافراندان، وە کار بکـەن بۆ دروسـتکردنی دەسـەڵاتێکی کۆمـاری، بتوانـن تیایدا مافی ئاینـیو دنیایی

تـاكـو گه‌له‌كانـی تێـدا بپارێزرێ، ئـه‌وه چاكتره لـه‌وه‌ی ملكه‌چـی ده‌وڵه‌تێک بن ده‌سـت بگـرێ به‌سـه‌ر مافـی ئاینـیو دنیاییاندا، وه سـوور بێت له‌سـه‌ر لـه ناوبردنیـانو بیانكات به كرێـكارو خزمه‌تـكاری خۆیـان، به‌ڵێ ئه‌گـه‌ر بكرێ مسـوڵمانان ده‌وڵه‌تێكیـان هه‌بێ خۆیان حاكـمو ده‌سـه‌ڵاتدار بـن تێیدا ئه‌وه پێویسـته، بـه‌ڵام له‌گـه‌ڵ نه‌توانینـی ئه‌م پلـه‌و پایه، ئه‌و پلـه‌و پایـه‌ی كـه ئاسانجو پارێزگـاری تێدایـه بۆ دیـنو دونیا له پێشـتره.

(٩٦-١٠١): ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِ فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ﴿٩٧﴾ يَقْدُمُ قَوْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَوْرَدَهُمُ النَّارَ وَبِئْسَ الْوِرْدُ الْمَوْرُودُ ﴿٩٨﴾ وَأُتْبِعُوا فِي هَٰذِهِ لَعْنَةً وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ بِئْسَ الرِّفْدُ الْمَرْفُودُ ﴿٩٩﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنبَاءِ الْقُرَىٰ نَقُصُّهُ عَلَيْكَ مِنْهَا قَائِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَمَا أَغْنَتْ عَنْهُمْ آلِهَتُهُمُ الَّتِي يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مِن شَيْءٍ لَّمَّا جَاءَ أَمْرُ رَبِّكَ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ ﴾:

خـوای بـه‌رز ده‌فه‌رمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴾ تـا كۆتایـی چیرۆكه‌كـه.

خـوا ﷻ ده‌فه‌رمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ ﴾ كـوڕی عیمـران ﴿ بِآيَاتِنَا ﴾ (بـه نیشـانه‌كانمان، واتـه: موعجیـزه‌كان) كه به‌ڵگه‌یه له‌سـه‌ر ڕاسـتی ئـه‌و په‌یامـه‌ی هێناویه‌تی، وه‌ک گۆچـانو ده‌سـتی، وه هـاو وێنه‌ی ئه‌و نیشـانانه‌ش كه له‌سـه‌ر ده‌سـتی مووسـا ﵇ هێنایـه بـوون ﴿ وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ ﴾ واتـه: به‌ڵگـه‌ی ڕوونو ئاشـكرا، ده‌ركـه‌وت وه‌كـو ده‌ركه‌وتنـی خۆر ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِ ﴾ واتـه: گه‌وره‌ی گه‌له‌كه‌ی چونكه پێشـه‌وای خه‌ڵـک بـوون، ملكـه‌چ نه‌بوون بـه‌و به‌ڵگه‌و نیشـانانه‌ی كـه پێی پێشـاندان، وه‌كـو چۆن له پێشـه‌وه لـه سـووره‌تی ئه‌عـراف به تێرو ته‌سـه‌لی باسـكرا.

﴿ فَاتَّبَعُوا أَمْرَ فِرْعَوْنَ وَمَا أَمْرُ فِرْعَوْنَ بِرَشِيدٍ ﴾ (واتـه: ئه‌وانیـش شـوێن فه‌رمانی فیرعه‌ون كه‌وتـن، خـۆ فه‌رمانی فیرعه‌ونیش سـه‌ر ڕاسـتانه نه‌بـوو) به‌ڵكو وێـڵو گومڕا بـوو، بڕیاری نه‌ئـه‌دا ته‌نهـا بـه زه‌ره‌رو زیانـی په‌تـی نه‌بووایـه -كاتـێ گه‌له‌كـه‌ی شـوێنی كه‌وتـن- هه‌موویانـی لـه ناوبردن.

يَقۡدُمُ قَوۡمَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَأَوۡرَدَهُمُ ٱلنَّارَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡوِرۡدُ
ٱلۡمَوۡرُودُ ٩٨ وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِۦ لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ بِئۡسَ
ٱلرِّفۡدُ ٱلۡمَرۡفُودُ ٩٩ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيۡكَۖ
مِنۡهَا قَآئِمٞ وَحَصِيدٞ ١٠٠ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ
أَنفُسَهُمۡۖ فَمَآ أَغۡنَتۡ عَنۡهُمۡ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِي يَدۡعُونَ مِن دُونِ
ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ لَّمَّا جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ وَمَا زَادُوهُمۡ غَيۡرَ تَتۡبِيبٖ ١٠١
وَكَذَٰلِكَ أَخۡذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلۡقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌۚ إِنَّ أَخۡذَهُۥٓ
أَلِيمٞ شَدِيدٌ ١٠٢ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّمَنۡ خَافَ عَذَابَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ
ذَٰلِكَ يَوۡمٞ مَّجۡمُوعٞ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوۡمٞ مَّشۡهُودٞ ١٠٣
وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٖ مَّعۡدُودٖ ١٠٤ يَوۡمَ يَأۡتِ لَا تَكَلَّمُ نَفۡسٌ
إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ فَمِنۡهُمۡ شَقِيّٞ وَسَعِيدٞ ١٠٥ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ فَفِي
ٱلنَّارِ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَشَهِيقٌ ١٠٦ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ
وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ١٠٧
۞ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ
ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۖ عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ ١٠٨

﴿ يَقۡدُمُ قَوۡمَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَأَوۡرَدَهُمُ ٱلنَّارَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡوِرۡدُ ٱلۡمَوۡرُودُ ٩٨ وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِۦ ﴾ واتە: لەم دنیایەدا ﴿ لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ﴾ واتە: خواو فریشتەکانو هەموو خەڵکی بە گشتی نەفرینیان لێدەکەن لە دنیاو دوارۆژدا ﴿ بِئۡسَ ٱلرِّفۡدُ ٱلۡمَرۡفُودُ ﴾ واتە: ئای چەند خراپە ئەوەی بۆیان کۆدەکرێتەوە، وە سزاو نەفرینی خوا ﷻ بە دوای یەکدا بۆیان دەڕوا لە دنیاو دوارۆژدا.

کاتێک باسی چیرۆکو داستانی ئەو ئوممەتانەی کرد لەگەڵ پێغەمبەرەکانیاندا، خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی فەرموو: ﴿ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيۡكَۖ ﴾ (واتە: ئەوەی باسکرا لە هەواڵی شارەکانی ڕابردوو بۆت دەگێڕینەوە) تا خەڵکی پێ ئاگادار بکەیتەوە، بۆ ئەوەی ببێتە نیشانەیەک بۆ پەیامەکەت، وە ئامۆژگاریو یادخستنەوەیەک بۆ بڕواداران ﴿ مِنۡهَا قَآئِمٞ ﴾ لەناو نەچوون، بەڵکو هەندێ لە شوێنەواری شارەکانیان ماون، کە بەڵگەیە لەسەریان، وە تیایاندایە ﴿ وَحَصِيدٞ ﴾ خانووماڵەکانیان ڕووخاوەو پەرشو بڵاوبوەتەوە هیچ شوێنەوارێکی نەماوە ﴿ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ ﴾ بە لە ناوچوونیان بە جۆرەها سزا ﴿ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡۖ ﴾ بە هاوەڵ دانانو کوفرو کەللەڕەقیو سەرکێشی ﴿ فَمَآ أَغۡنَتۡ عَنۡهُمۡ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِي يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ لَّمَّا جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ ﴾ بەم شێوەیە هەر کەسێک پەنا باتە لای غەیری خوا ﷻ، هیچ سوودێکی پێناگەیەنێ لە کاتی دابەزینی ناڕەحەتیدا ﴿ وَمَا زَادُوهُمۡ غَيۡرَ تَتۡبِيبٖ ﴾ واتە: زەرەرو زیانو ماڵ وێرانی، بە پێچەوانەی ئەوەی بە خەیاڵیاندا بێت.

(١٠٢): ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَخۡذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلۡقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌۚ إِنَّ أَخۡذَهُۥٓ أَلِيمٞ شَدِيدٌ ١٠٢ ﴾:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَخۡذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلۡقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌۚ إِنَّ أَخۡذَهُۥٓ أَلِيمٞ شَدِيدٌ ﴾ واتە: لە ناویان دەبات بە سزاو تەفرو توونایان دەکات، ئەوەی لە غەیری خواش ﷻ دەیانپەرست، هیچ سوودێکیان پێناگەیەنێت.

(١٠٣): ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ الْآخِرَةِ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ النَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ ﴾ئـەو سـتەمكارانەی کـە سـزادران بـە جۆرەها سـزادان، ﴿ لَآيَةً لِّمَنْ خَافَ عَذَابَ الْآخِرَةِ ﴾واتـە: پەنـدو بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی کـە ئەوانـەی سـتەمو خراپەکاریان کـردوە سـزای دنیایـیو دوارۆژیـان بـۆ هەیە، پاشـان لـەم باسـە دەیگوازێتەوە بۆ وەسـفی دوارۆژ، ﴿ ذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّجْمُوعٌ لَّهُ النَّاسُ ﴾واتـە: کۆدەکرێنـەوە لـە پێنـاوی ئـەو رۆژەدا بـۆ پاداشـت دانـەوە، تـا بۆیـان دەربکەوێت لە مەزنـیو دەسـەڵاتو دادپەروەری خـوا ﷻ، ئا بـەوە دەیناسـنەوە بە چاکتریـن ناسـینەوە ﴿ وَذَٰلِكَ يَوْمٌ مَّشْهُودٌ ﴾واتە: خوا ﷻ شـایەتی بـۆ ئـەدات، وە فریشـتەو سـەرجەم بەدیهێنراوەکانیش شـایەتی دەدەن.

(١٠٤): ﴿ وَمَا نُؤَخِّرُهُ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴿١٠٤﴾ ﴾

﴿ وَمَا نُؤَخِّرُهُ ﴾واتـە: هاتنـی رۆژی دوایـی ﴿ إِلَّا لِأَجَلٍ مَّعْدُودٍ ﴾ئەگـەر کاتێ دونیا تـەواو بـوو، وە ئـەوەی خـوا ﷻ ئەنـدازەی کـردوە تیایدا لـە بەدیهێنـراوەکان، ئـەو کاتە دەگوازرێنـەوە بـۆ ماڵـی دوارۆژ، ئنجـا بڕیاری پاداشـتیان بەسـەردا پێویسـت دەبـێ، وەکو چۆن لـە دنیـادا بڕیاری شـەرعیان لەسـەر پێویسـت بوو.

(١٠٥): ﴿ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾ ﴾

﴿ يَوْمَ يَأْتِ ﴾ کاتـێ ئـەو رۆژ دێـتو خەڵکـی کۆدەکرێتـەوە ﴿ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِ ﴾تەنانـەت پێغەمبـەرانو فریشـتە بەڕێزەکانیش، تکا ناکەن تەنها بە ویسـتی خوا ﷻ نەبـێ ﴿ فَمِنْهُمْ ﴾ واتـە: بەدیهێنـراوەکان ﴿ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ ﴾ (الأشقياء) ئەوانـەن کـە بێبڕواییـان کـردوە بـە خـوا ﷻ، وە پێغەمبەرەکەیـان بە درۆخسـتوەتەوەو سـەرپێچی فەرمانەکانیـان کـردوە، (السعداء) بـڕواداره لـە خـوا ترسـەکانن.

(١٠٦): ﴿ فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا فَفِي النَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾

بـەڵام پاداشـتیان ﴿ فَأَمَّا الَّذِينَ شَقُوا ﴾واتـە: بەدبەختـی نەگبەتـیو ڕیسـواییان بە دەسـت هێنـاوە ﴿ فَفِي النَّارِ ﴾قـووت دەدرێـن لـە نـاو ئاگـری دۆزەخـدا، سـزایەکی سـەختو دژواریـان بـۆ هەیە ﴿ لَهُمْ فِيهَا ﴾لـە ناڕەحەتی ئـەوەی تیایـدان ﴿ زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴾(هەر ئـاخو هەنێسـکیانە) ئـەوەش ناخۆشـترینو ناشـرینترین دەنگـە دەنگە.

(١٠٧): ﴿ خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ إِلَّا مَا شَاءَ رَبُّكَ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ﴾

﴿ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ﴾ واتــە: لەو ئاگرەی كە ئەمە سـزاكەیەتی،﴿ مَا دَامَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ﴾ واتــە: بـۆ هەتـا هەتایـی تیایـدا دەمێننەوە، جگـە لەو ماوەیـەی خوا ﷻ ویسـتی لە سـەریەتی كـە تیایدا نەبـن، ئەویش پێـش چوونـە ناوەوەیەتـی، هەروەكو چۆن زۆربـەی شـیكارانو لێكدەرەوانـی قورئـان بۆچوونیانـە، جـا (إستثناء) جیاكردنـەوە لێرەدا دەگەڕێتـەوە بـۆ پێـش چوونە نـاوەوەی دۆزەخ، ئـەوان لە هەمـوو كاتەكاندا بە هەمیشـەیی تیایـدا دەمێننـەوە، جگـە لـەو ماوەی پێـش چوونـە نـاوی﴿ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾ (بە ڕاسـتی پەروەردگـارت هـەر شـتێ بیەوێـت دەیـكات) جا هـەر شـتێک بیـەوێ بیكاتو حیكمەتـی وا بخوازێـت دەیـكات، هیـچ ناتوانێت ڕەتـی بكاتەوە.

(١٠٨):﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَـٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۖ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾ ﴾ :

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ ﴾ واتــە: بەختەوەریو سـەركەوتنیان بۆ بەدەسـت هاتووە﴿ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَـٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَـٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ﴾ پاشـان ئـەوەی تەئكید كردوەتەوە بـە وتـەی﴿ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴾ واتـە: ئـەوەی خـوا ﷻ پێی بەخشـیون لە نـازو نیعمەتی جێگیـرو لەززەتـی بـەرز، بـە ڕاسـتی ئـەوە بەردەوامـە، بێبڕانەوەیەو هەتـا هەتاییـە، داوا لە خـوای بەخشـندە دەكەیـن بە چاكەكانـی خـۆی بمانگێڕێت بـە یەكێک لەو كەسـانە.

فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰؤُلَاءِ ۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ
آبَاؤُهُم مِّن قَبْلُ ۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ
﴿١٠٩﴾ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ فَاخْتُلِفَ فِيهِ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ
سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ
﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ ۚ إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ
خَبِيرٌ ﴿١١١﴾ فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا ۚ
إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا
فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ
لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ
اللَّيْلِ ۚ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ
لِلذَّاكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَاصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ
﴿١١٥﴾ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ الْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُولُو بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ
عَنِ الْفَسَادِ فِي الْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ۗ وَاتَّبَعَ
الَّذِينَ ظَلَمُوا مَا أُتْرِفُوا فِيهِ وَكَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا
كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾

(١٠٩): ﴿ فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰؤُلَاءِ ۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ آبَاؤُهُم مِّن قَبْلُ ۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾ ﴾:

خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰؤُلَاءِ ﴾ (واتە: هیچ جۆرە گومانو دوودڵیەکت نەبێت، لەوەی ئەوانە دەیپەرستن) بتپەرستەکان، گومانت لە حاڵیان نەبێ، بێگومان ئەوەی ئەوان لەسەری دەڕۆن بەتاڵە، هیچ بەڵگەیەکی شەرعیو عەقڵیان لەسەری نیە، بەڵکو بەڵگەو گومانیان ئەوەیە ئەوان ﴿ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ آبَاؤُهُم مِّن قَبْلُ ﴾ (واتە: تەنها ئەوە دەپەرستن کە باوکو باپیرانیان دەیانپەرست لەوەو پێش). ئەوەی زانراوە ئەمە گومان نیە هەتا بکرێت بە بەڵگە، چونکە وتەی غەیری پێغەمبەران بەڵگەی بۆ دەهێنرێتەوە، ناکرێت بە بەڵگە، بە تایبەت هاوشێوەی ئەو گومرایانە ئەوانەی هەڵەو پەڵەیان زۆرە، وە خراپی بۆچوونەکانیان دەربارەی بنەماکانی ئاین، بە ڕاستی ئەگەر چی یەکدەنگ بن لەسەر وتەکانیان، بێگومان ئەوە هەڵەو گومراییە ﴿ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴾ واتە: دەبێ لەم دنیایەدا بەشی خۆیان پێ بدرێت، لەوەی بۆیان نووسراوە، ئەگەر چی ئەو بە شەش زۆر بێت، یان لە پێش چاوت جوانو ڕازاوە بێت، بێگومان ئەوە نابێتە بەڵگە لەسەر چاکی حاڵیان، خوا ﷻ دونیا دەبەخشێت بەو کەسەی خۆشی دەوێو بەو کەسەش خۆشی ناوێت، بەڵام ئیمانو ئاینی ڕاستەقینە تەنها بە کەسێک دەبەخشێت خۆشی بوێ، بە پوختی نابێت سەرسام بێت بە یەکدەنگی گومراکان لەسەر وتەی باوکو باپیرە گومراکانیان لە پێشین، وە نە بەوەی خوا ﷻ ئازادی کردوونو سەروەتو سامانی دنیایی پێبەخشیون.

(١١٠-١١٣): ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ فَاخْتُلِفَ فِيهِ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ

لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ إِنَّهُ بِمَا
يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾ فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ
﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوا إِلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا فَتَمَسَّكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِنْ أَوْلِيَاءَ ثُمَّ لَا
تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ ﴾:

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ فَاخْتُلِفَ فِيهِ﴾ خـوای بـەرز هـەواڵ ئـەدات کـە کتێبـی تەوراتـی بەخشـیوە بـە موسـا ، پێویسـتە یەکدەنـگ بـن لەسـەر فەرمـانو قەدەغەکراوەکانـی، بـەڵام لەگـەڵ ئەمـەدا ئەوانـەی دراونەتـە پاڵ ئـەو ئاینـە جیاوازیان لە نێوانـدا هەیـە جیاوازیـەک زیـان بـە بیـرو باوەڕیـان دەگەیەنێـت، وە بـە یەکدەنگیـان لە ئاینەکەیانـدا ﴿وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ﴾ (واتـە: ئەگـەر لەبـەر بڕیارێـک نەبووایـە کـە پێشـتر دراوە لـە لایـەن پەروەردگارتـەوە) بە دواخسـتنی سـزادانیانو پێش نەخسـتنی ﴿لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ﴾ بە سـزادانی سـتەمکارانیان، بەڵام خـوای بەرز حیکمەتی وای دەخواسـت دادوەری لـە نێوانیانـدا دوا بخـات بـۆ ڕۆژی دوایـی، تـا هـەر لـە گومانـدا بمێننەوە.

ئـەوان ئەگـەر لەگـەڵ کتێبەکـەی خۆیانـدا حاڵیـان وابێـت، لەگـەڵ قورئاندا کـە خوا ناردوویەتـی بۆت، شـتێکی سـەر سـوڕهێنەر نیە لە دەسـتەی جوولەکـە بڕوای پـێ نەکەن، وە لـە گومـانو دوودڵیدا بـن بەرانبەری.

﴿وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَالَهُمْ﴾ واتـە: هـەر دەبێ خوا دادوەری لـە نێوانیاندا بـکات لـە ڕۆژی دوایـیدا بە حیکمـەتو دادپـەروەری خۆی، پاداشـتی هەمـووی دەداتەوە بـەوەی شایسـتەیەتی ﴿إِنَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾ لـە خێـرو خراپـە ﴿خَبِيرٌ﴾ هیـچ شـتێکی لێ ناشـاردرێتەوە لـە کردەوەکانیان، وردو درشـتی.

کاتـێ خـوا هەواڵـی دا بـە بـەردەوام نەبوونیـان کـە بـووە مایەی ئـەوەی جیـاوازیو دووبەرەکـی بکەوێتـە نێوانیانـەوە، فەرمانـی بـە پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد کـردوە، خـۆیو ئەوانـەی لەگەڵیـدان لە بـڕواداران لەسـەر ڕێگای ڕاسـت بن وەکو چـۆن فەرمانیان پێکـراوە، ڕێگـای شـەریعەتی خـوا بگرنـە بـەر، وە بڕوایـان هەبـێ بـەوەی خـوا هەواڵـی پێـداوە لـە بیروو بـاوەڕی ڕاسـتەقینە، با لـەوە لانەدەن نە بـەلای ڕاسـتداو نە بەلای چەپـدا، وە بـەردەوام بـن لەسـەر ئـەوە، سـنورو یاسـای خـوا نەشـکێنن کە خـوا بۆی دیـاری کـردوون لـە بـەردەوام بوون.

کـە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ واتە: هیچ شـتێکی لێ ناشـاردرێتەوە

لــە کردەوەکانتــان، وردو درشــتی پاداشــتتان دەداتــەوە لەســەری، ئەمــە هاندانــی تێدایــە بە ڕەفتــار کــردن بە ئیســتیقامەو بەردەوام بوون، وە ترســاندنیش لــە پێچەوانەکــەی، لەبەر ئەوە ئاگــاداری کردوونەتــەوە لــە لادان ئیســتیقامەو بــەردەوام بــوون، جــا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ ﴾واتــە: مەیــل مەکــەن ﴿ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾بێگومــان ئێــوە ئەگــەر مەیــل بکەنو پاڵیــان پێــوە بــدەنو ڕازی بن لەســەر ئەو ستەمەی ئــەوان دەیکــەن ﴿ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ﴾ ئەگــەر ئــەوە بکــەن ﴿ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ﴾(واتــە: بێجگــە لــە خوا ﷻ هیــچ پشــتیوانێکتان نابــێ) بەرگریتان لێ بکات لە ســزای خــوا ﷻ، وە هیچتان بۆ بەدەســت ناهێنــن لــە پاداشــتی دونیــا ﴿ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾(پاشــانیش یارمەتــی نادرێــن) کــەس ناتوانــێ ڕێگری ســزاتان لــێ بکات کاتــێ تووشــتان دەبێ.

لــەم دەقــەدا ئاگــادار کردنەوە هەیــە لە مەیــلو پاڵدانەوە بە هەموو ســتەمکارێک، مەبەســت لــە (الركون) مەیــلو پاڵدانەوەیــە بــۆ لای ســتەمەکەیو ڕازیــی بوونــە لەســەر ئــەوە، هەر کەســێک بــەوە ڕازی بێت ئەوە ســتەمە.

جــا ئەگــەر هەڕەشــە لە مەیــلو پاڵدانــەوەدا بێــت بۆ لای ســتەمکار، دەبــێ حاڵی ســتەمکار چــۆن بێــت؟!! داوا لــە خــوا ﷻ دەکەیــن بمانپارێزێ لە ســتەم.

(١١٤-١١٥): ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾خــوا ﷻ فەرمــان دەکات بــە بەجێهێنانــی نوێژ بە تــەواوی ﴿ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ ﴾ســەرەتای ڕۆژو کۆتاییەکــەی، وە دەچێتــە نــاو ئەمــەوە هــەر یەکــە لــە نوێــژی بەیانــیو نوێــژی نیــوەڕۆو نوێژی عەســر ﴿ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ﴾وە دەچێتە نــاو ئەمەوە نوێژی مەغریــبو عیشــا، هەروەهــا شــەو نوێژیــش دەگرێتــەوە، چونکە بەنــدە نزیــک دەکاتەوە لــە پەروەردگــار ﴿ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾واتــە: ئەم پێنــج نوێژە، وە ئەوەیشــی بەســتراوە بــە ئەوانــەوە لــە ســوننەتەکان لــە گەورەترینــی چاکەکانــە، لەگــەڵ ئــەوەدا لــە چاکەکانــە، مــرۆڤ نزیک دەکاتەوە لــە خوا ﷻ و پاداشــتی بۆ پێویســت دەکات، بێگومان گوناهەکانیشــی لەســەر لادەبــاو دەیســڕێتەوە مەبەســتی پێی تاوانــە بچوکەکانــە، هەروەکو چــۆن فەرمــوودە ڕاســتەکان لە پێغەمبــەرەوە ﷺ بەســتوویانەتەوە، بــۆ نموونــە فەرموویەتی: {الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ، إِذَا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ»} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩١٨٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٤)، واته:

لــە کردەوەکانتــان، وردو درشــتی پاداشــتتان دەداتــەوە لەســەری، ئەمــە هاندانــی تێدایــە بە ڕەفتــار کــردن بە ئیســتیقامەو بەردەوام بوون، وە ترســاندنیش لــە پێچەوانەکــەی، لەبەر ئەوە ئاگــاداری کردوونەتــەوە لــە لادان ئیســتیقامەو بــەردەوام بــوون، جــا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓاْ ﴾واتــە: مەیــل مەکــەن ﴿ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ﴾بێگومــان ئێــوە ئەگــەر مەیــل بکەنو پاڵیــان پێــوە بــدەنو ڕازی بن لەســەر ئەو ستەمەی ئــەوان دەیکــەن ﴿ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ﴾ ئەگــەر ئــەوە بکــەن ﴿ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ﴾(واتــە: بێجگــە لــە خوا ﷻ هیــچ پشــتیوانێکتان نابــێ) بەرگریتان لێ بکات لە ســزای خــوا ﷻ، وە هیچتان بۆ بەدەســت ناهێنــن لــە پاداشــتی دونیــا ﴿ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾(پاشــانیش یارمەتــی نادرێــن) کــەس ناتوانــێ ڕێگری ســزاتان لــێ بکات کاتــێ تووشــتان دەبێ.

لــەم دەقــەدا ئاگــادار کردنەوە هەیــە لە مەیــلو پاڵدانەوە بە هەموو ســتەمکارێک، مەبەســت لــە (الركون) مەیــلو پاڵدانەوەیــە بــۆ لای ســتەمەکەیو ڕازیــی بوونــە لەســەر ئــەوە، هەر کەســێک بــەوە ڕازی بێت ئەوە ســتەمە.

جــا ئەگــەر هەڕەشــە لە مەیــلو پاڵدانــەوەدا بێــت بۆ لای ســتەمکار، دەبــێ حاڵی ســتەمکار چــۆن بێــت؟!! داوا لــە خــوا ﷻ دەکەیــن بمانپارێزی لە ســتەم.

(١١٤-١١٥): ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٥﴾ ﴾

﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾خــوا ﷻ فەرمــان دەکات بــە بەجێهێنانــی نوێژ بە تــەواوی ﴿ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ ﴾ســەرەتای ڕۆژو کۆتاییەکــەی، وە دەچێتــە نــاو ئەمــەوە هــەر یەکــە لــە نوێــژی بەیانــیو نوێــژی نیــوەڕۆو نوێژی عەســر ﴿ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِ ﴾وە دەچێتە نــاو ئەمەوە نوێژی مەغریــبو عیشــا، هەروەهــا شــەو نوێژیــش دەگرێتــەوە، چونکە بەنــدە نزیــک دەکاتەوە لــە پەروەردگــار ﴿ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾واتــە: ئەم پێنــج نوێژە، وە ئەوەیشــی بەســتراوە بــە ئەوانــەوە لــە ســوننەتەکان لــە گەورەترینــی چاکەکانــە، لەگــەڵ ئــەوەدا لــە چاکەکانــە، مــرۆڤ نزیک دەکاتەوە لــە خوا ﷻ و پاداشــتی بۆ پێویســت دەکات، بێگومان گوناهەکانیشــی لەســەر لادەبــاو دەیســڕێتەوە مەبەســتی پێی تاوانــە بچوکەکانــە، هەروەکو چــۆن فەرمــوودە ڕاســتەکان لە پێغەمبــەرەوە ﷺ بەســتوویانەتەوە، بــۆ نموونــە فەرموویەتی: {الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ، إِذَا اجْتُنِبَتِ الْكَبَائِرُ»} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩١٨٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٤)، واته:

پێنج نوێژە فەرزەکان، جمعە تا جمعە، ڕەمەزان تا ڕەمەزان نێوانی خۆیان دەسڕنەوە، ئەگەر ئینسان خۆی لە گوناهە گەورەکان دووربگرێ. بەڵکو هەروەکو چۆن بەستوویەتیەوە ئەم ئایەتەی کە لە سوورەتی (النساء)دا هەیە، لە وتەی خوا: ﴿ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ٣١ ﴾ النساء. (واتە: ئەگەر دووربکەونەوە لەو تاوانە گەورانەی لێتان قەدەغەکراوە، ئەوە تاوانە بچووکەکانتان بۆ دەپۆشین، وە دەتان خەینە شوێنێکی چاکو ڕێزدارەوە).
﴿ ذَٰلِكَ ﴾ واتە: دەگونجێ ئاماژە بێ بۆ هەموو ئەوانەی لە پێشەوە باسکراوە، لە پەیوەست بوونی ئیستیقامەو بەردەوام بوون لەسەر ڕێگای ڕاست، لە سنوور دەرنەچوونو تێنەپەڕاندنی، پاڵنەدانو نەبوونی مەیل بۆ لای ستەمکاران، فەرمان کردن بە بەجێنەهێنانی نوێژەکان، ڕوونکردنەوەی کە بەڕاستی چاکەکان تاوانەکان لادەبەن، هەموو ئەوانە ﴿ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ تێدەگەن لەوەی کە خوا ﷻ فەرمانی پێکردوونو قەدەغەی لێکردوون، هەموو ئەو فەرمانە چاکانە جێبەجێ دەکەن کە خێرو چاکە بەرهەم دەهێننو دەبنە ڕێگر بۆ خراپەو خراپەکاری، بەڵام ئەو کاروبارانە پێویستی بە تێکۆشانو ماندوو بوونی نەفسو دەروون هەیە لەگەڵ ئارام گرتن لەسەری، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَٱصۡبِرۡ ﴾ واتە: دەروونت بەند بکە لەسەر گوێڕایەڵی خوا ﷻ، وە لە سەرپێچی خوا ﷻ، وە پەیوەستکردنی بە ئەوەوە، بەردەوام بەو بێتاقەتو وەڕەس مەبە ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ بەڵکو چاکترین کردەوەیان لێوەردەگرێ، وە پاداشتیان دەداتەوە بە چاکترینی ئەو کردەوانەی ئەنجامیان داوە، ئا لەمەدا هاندانێکی مەزن هەیە بۆ دەستگرتنو پەیوەست بوون بە خۆڕاگریو ئارام گرتنەوە، بە هاندانی نەفسو دەروونی لاواز بۆ پاداشتی خوا ﷻ، هەر کاتێ بێزارو خاو بوویەوە.
(١١٦): ﴿ فَلَوۡلَا كَانَ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مِن قَبۡلِكُمۡ أُوْلُواْ بَقِيَّةٖ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡفَسَادِ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّنۡ أَنجَيۡنَا مِنۡهُمۡۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجۡرِمِينَ ١١٦ ﴾:
کاتێ خوا ﷻ باسی لە ناوبردنی ئەو ئوممەتانەی کرد کە پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، بێگومان زۆرێک لەوانە لادەر بوون لە ڕێگای ڕاست، تەنانەت خاوەن کتێبە پیرۆزەکانیش، هەموو ئەوانەی دەستیان دەگرت بەسەر ئاینەکاندا بە نەمانو پەرشو بڵاو بوون، باسی کردوە کە بەڕاستی ئەو ئەگەر لە سەدەکانی پێشوودا دابینەنابا کەسانی خاوەن کتێب لە ئوممەتەکاندا کە بانگی خەڵکیان دەکرد بۆ ڕێنمایی و

ڕێگریـان لێدەکـردن لـە خراپەو خراپـەکاری، جـا مانـەوەی ئاینەکانیان بە هۆی سـوودی ئەوانـەوە بـە دەسـت هاتـووە، ئـەوان ڕێژەیـان زۆر کـەم بوو.
پوختـەی کارەکـە ئەوەیـە کە ئـەوان بـە شـوێنکەوتنی پێغەمبـەران ڕزگاریان بـوو، وە بە بەجێهێنانیان بەوەی پێی هەسـتاون لە ئاینەکەیاندا، وە لەسـەر دەسـتی ئەمان بەڵگەی خوا ﷻ پێویسـت بـوو لەسـەر بێبڕوایـان، تـا ئـەوەی دەبـێ بمـرێو تیـا بچـێو ئـەوەش بڕیـارە بـژیو زینـدوو بـێ با هـەردوولا بـە بەڵگەی ئاشـکرا بـێ، (واتـە: کـێ مسـوڵمان دەبێ با لەسـەر بەڵگـە مسـوڵمان بێـت، کێـش کافـرو خوانەنـاس دەبێـت بـا ئەویش پـاش بەڵگە بێـت) ﴿ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ ﴾ واتـە: ئەو سـتەمکارانە شـوێنی خۆشـی ژیـانو ڕابـواردن کەوتـن، بەهیچ شـتێکی دیکـە نەیانگۆڕیـەوە ﴿ وَكَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴾ بە شـوێنکەوتنی هەواو ئـارەزوو ڕابواردنەکانیان، ئا لەبەر ئەمە سـزایان لەسـەر پێویسـت کراو لـە بنـجو بنەوانـەوە دەرهێنـران، ئـا لەمـەدا هاندانی تێدایـە بۆ ئـەم ئوممەتە کە کەسـانێکی تیـادا هەبـێ چاکەخـوازو بۆ خوا صوڵحاو بـێ بەرانبەر بەوانـەی کە خراپـەکارنو دەیانەوێ ئاینـی خەڵکـی تێـک بـدەن، پەیوەسـتن بە ئاینـی خـواوە، بانگـی گومـڕاکاران دەکەن بۆ هیدایـەتو ئارام دەگـرن لەسـەر ناخۆشـیو نارەحەتیەکان.
ئـەم حاڵەتـە بەرزتریـن حاڵەتە کـە ئارەزوومەندان ئـارەزووی دەکەن، خاوەنەکەشـی دەبێتە پێشـەواو سەرمەشـق لـە ئاینـدا بە مەرجـێ کردەوەکانـی بە دڵسـۆزیەوە بـۆ پەروەردگاری جیهـان بێ.
(١١٧): ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ ١١٧ ﴾:
واتـە: هەرگیـز خـوا ﷻ لە نـاوی نەبـردوە دانیشـتوانی شـارەکان بە سـتەم کردنـی لێیان، لـە کاتێکـدا ئـەوان چاکەخـواز بوونو بـەردەوام بـن لەسـەری، هەرگیز خـوا ﷻ لە ناوی نەبـردوون مەگـەر سـتەمیان کردبـێو بەڵگـەی خوایان لەسـەر پێویسـت بووبێ.
وە دەگونجـێ ماناکـەی: پەروەردگـاری تۆ لـە ناوی نەبردوە خەڵکی شـارێک بـە هۆی ئەو سـتەمانەی کە لـە پێشـودا کردوویانە، کاتێ کـە گەڕاونەتـەوەو کردەوەی چاکیـان ئەنجام داوە، بێگومـان خـوا ﷻ لێی خۆش بوونو تاوانەکانی پێشـوویانی سـڕیوەتەوە.

وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ
﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ
لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ وَكُلًّا نَّقُصُّ
عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ وَجَآءَكَ فِى هَٰذِهِ
ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ
ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ
﴿١٢٢﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ
فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾

(١١٨-١١٩): ﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾:

﴿ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴾ خوا هەواڵ دەدات بێگومان ئەگەر بیویستبایە هەموو خەڵكی دەكرد بە شوێنكەوتەی یەك ئۆممەت لەسەر ئاینی ئیسلام، بێگومان ویستی خوا ﷻ كورت نیەو هیچ شتێك ڕێگری لێناكات، بەڵام حیكمەتی وای خواستووە بەردەوام جیاواز بن، پێچەوانەی ڕێگای ڕاست بن، شوێنی ئەو ڕێگایە بكەون كە بۆ ئاگر دەیانبات، هەموویان هەق‌و ڕاستی لەوەدا دەبینن كە دەیڵێن، وە گومڕاییش لە قسەی بەرانبەرەكانیاندا دەبینن ﴿ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ﴾ (جگە لەوە نەبێ كە خوا ڕەحمی پێ كردوە) ئەوانە خوا ﷻ هیدایەتی داون بۆ زانستی ڕاستەقینەو كار پێكردنی‌و یەك دەنگ بوون لەسەری، تا ئەوانە كامەرانی‌و خۆشبەختیان بۆ پێش كەوتووە، وە داپۆشراون بە پشتیوانی پەروەردگاریان‌و سەركەوتنی خوایی، بەڵام غەیری ئەوانە سەرشۆڕو زەلیلن دراونەتە دەستی نەفس‌و ئارەزوویانەوە.

دەفەرمووێ: ﴿ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ﴾ واتە: حیكمەتی خوا ﷻ وایخواستوە كە ئەو دروستی كردوون، تا بەختەوەرو بەدبەختیان تێدابێ، وە یەكدەنگان‌و جیاوازی كاران، ئەو دەستەی كە هیدایەتی داوە، ئەو دەستەشی گومڕایی لەسەر پێویست بووە، هەتا ڕوون ببێتەوە بۆ بەندەكان دادپەروەری‌و حیكمەتی، وە تا دەربكەوێ ئەوەی شاراوەیە لە سروشتی مرۆڤەكان لە خێر شەڕ، وە بۆ ئەوەی بێتە جێ ڕەوانەكردنی جیهادو ئەو عیبادەتانەی كە تەواو نابێت‌و ڕێك نابێتەوە تەنها بە

تاقیکردنـــەوەو بـــەڵاو نارەحەتـــی نەبێـــت ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾ هـــەر دەبـــێ ئاســـانی بـــکات بـــۆ نـــاو ئاگـــر کەســـانێک، کـــردەوەی خراپـــە دەکـــەن کـــە دەیانگەیەنێتـــە دۆزەخ.

(١٢٠-١٢٣): ﴿ وَكُلًّا نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَٰذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ (١٢٠) وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَامِلُونَ (١٢١) وَانتَظِرُوا إِنَّا مُنتَظِرُونَ (١٢٢) وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ الْأَمْرُ كُلُّهُ فَاعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ وَمَا رَبُّكَ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (١٢٣) ﴾:

﴿ وَكُلًّا نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ ﴾ (واتـــە: هەمـــووت بـــۆ دەگێڕینـــەوە) بـــۆ ئـــەوەی دڵـــی پـــێ چەســـپاوو ئـــارام بکەیـــن، وە خـــۆ ڕاگـــر بـــێ وەکـــو چـــۆن پێغەمبەرانـــی خۆڕاگـــرو بەهێـــز دانیـــان بـــە خـــۆدا گـــرت، بەڕاســـتی نەفـــسو دەروونـــەکان بـــە پەیـــڕەو کـــردن دەحەســـێنەوەو چـــالاک دەبەن لەســـەر کارو کـــردەوەو کێبڕکـــێ دەکـــەن لەگـــەڵ غەیـــری خۆیانـــدا، پشـــتیوانیش لـــە هـــەق دەکـــەن بـــە باســـکردنی بەڵگەکانـــیو زۆری ئەوانـــەی کاری پێدەکـــەن.

﴿ وَجَاءَكَ فِي هَٰذِهِ ﴾ ئـــەم ســـووڕەتە ﴿ الْحَقُّ ﴾ ڕاســـتی، هیـــچ گومـــانو دوو دڵیـــەک هەڵناگرێـــت بـــە شـــێوەیەک لـــە شـــێوەکان، جـــا زانســـت بـــەوە زانســـتە بـــە هـــەق کـــە گەورەتریـــن فـــەزڵو چاکەکانـــی نەفـــسو دەروونـــە ﴿ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴾ واتـــە: ئامۆژگـــاری پـــێ وەردەگـــرن، خۆیـــان دەپارێـــزن لـــەو کارە خراپـــەکانو یـــادی کارە چاکەکانـــی پێدەکەنـــەوە کـــە لـــە لای خـــوا ﷻ خۆشەویســـتە، ئنجـــا ئەنجامـــی دەدەن.

بـــەڵام ئـــەوەی خـــاوەن ئیمـــان نەبـــێ، ئامۆژگـــاریو یادخســـتنەوە هیـــچ ســـوودێکیان پێناگەیەنێـــت، بۆیـــە فەرموویەتـــی: ﴿ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ واتـــە: پـــاش ئـــەوەی ئایەتەکانیـــان لەســـەر بەجێهێنـــرا: ﴿ اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ ﴾ (واتـــە: ئێـــوە کـــردەوە بکـــەن لەســـەر) ئـــەو دۆخـــەی تیایـــدان ﴿ إِنَّا عَامِلُونَ ﴾ (واتـــە: ئێمـــەش کار دەکەیـــن) لەســـەر ئـــەوەی لەســـەری بوویـــن ﴿ وَانتَظِرُوا ﴾ (چاوەڕوانـــی بکـــەن بزانـــن) چیمـــان بەســـەر دێـــت ﴿ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴾ (ئێمەیـــش چاوەڕوانیـــن) چیتـــان بەســـەر دێـــت.

بێگومـــان خـــوا ﷻ نێوانـــی ئـــەو دوو دەســـتەیەی جیـــا کـــردەوە، سەرخســـتنی بەنـــدە بڕوادارەکانـــی نیشـــان داو دوژمنـــە بـــە درۆدانەرەکانـــی خواشـــی لەنـــاو بـــرد ﴿ وَلِلَّهِ

﴿غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ واتــە: هیــچ شــتێکی لێناشــاردرێتەوە لــە شــاراوەکانو ئــەو کارو بارانــەی پەنهانــن ﴿وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ﴾ لــە کاروو کــردەوەکان، جیــای دەکاتــەوە پیــس لــە پــاک ﴿فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ﴾ واتــە: هەســتە بــە بەندایەتــی کردنــی، ئەویــش هەمــوو ئەوانەیــە کــە خــوا ﷻ فەرمانــی پێکــردوە لــەوەی لــە تواناتدا بێــت، وە پشــت بــە خــوا ﷻ ببەســتە لــەوەدا ﴿وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾ (واتــە: بێگومــان پەروەردگــارت بــێ ئاگــا نیــە لــە هــەر کردەوەیــەک ئێــوە دەیکــەن) لــە خێــرو شــەڕ، بەڵکــو بێگومــان بــە زانســتی دەوری داوە، وە قەڵەمــی بەســەردا هێنــاوە، وە بەســەریدا دێــت بڕیــارو پاداشــتی.

سوورەتی (هود) تەواو بوو

سوپاسو ستایش بۆ خوا


بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
الٓرۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ① إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا
عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ② نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ
ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ
لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ③ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّى رَأَيْتُ
أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِى سَٰجِدِينَ ④

## تەفسیری سوورەتی (یوسف)

### مەککیە (١١١) ئایەتە

### بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە

(١-٣): ﴿ الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ① إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ② نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ③ ﴾:

﴿ الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ① إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا ﴾ واتە: خوا هەواڵ دەدات کە دەقەکانی قورئان بریتین لە ﴿ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾ واتە: وشەو ماناکانی ڕوونو ئاشکران، لە ڕوونو ئاشکراییەکانی ئەوەیە کە بە زمانی عەرەبی دایبەزاندوە کە ڕوونترینیانە، هەموو ئەو ڕوون کردنەوانە ﴿ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ واتە: تا سنوورو بنەماو لقو فەرمانو قەدەغەکراوەکانی بپارێزن، ئەگەر بەوە دڵنیا بوونو بە دڵەکانتان زانیاریتان لەسەر وەرگرت، ئەوە کردەوە بە جەستەو ملکەچبوون بەرهەم دێت، وە ﴿ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ واتە: تا عەقڵو ژیریتان زیاد دەبێت بە دووبارە کردنەوەی مانا بەرزو پیرۆزەکانی، لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تەواوو بەرزتر بچن.

﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ ﴾ واتە: ئەویش بە هۆی ڕاستگۆییو جوانی دەربڕینو واتاکانی ﴿ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ ﴾ واتە: بەوەی کە ئەم قورئانە هەموو سروشو نیگاکانی لە خۆ گرتوە کە بۆمان دابەزاندووی، وە بە هۆیەوە فەزڵو چاکەی تۆمان داوە بەسەر سەرجەم پێغەمبەراندا، ئەویش منەتو چاکەی تەواوە لە لایەنی خواوە ﷻ ﴿ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴾ واتە: تۆ نەتدەزانی کتێبو ئیمان چیە پێش ئەوەی وەحیو سروشت لە لایەن خواوە ﷻ بۆ بکرێت، بەڵکو ئێمە کردمان

بـە نـوورو ڕۆشـنایییەک بە ویسـتی خۆمان هیدایەتـی بەندەکانـی پێدەدەیـن، کاتێک کە بە گشـتی وەسـفی ئـەو چیرۆکانەی کرد کـە لە قورئانـدا باسـکراوە، لە باشـترین‌و چاکترین چیرۆکەکانـن، بێگومـان لـە هیـچ کتێبێک لـە کتێبەکانـدا چیرۆکێکی لەم شـێوە دەسـت ناکـەوێ، کـە لـە قورئانـدا هەیـە، ئنجـا باسـی چیرۆکـی یوسـف ﷺ باوکـی براکانی دەکات، کـە بەسـەرهاتێکی زۆر سەرسـوڕهێنەرو جوانـە، فەرموویەتی:

(٤-٦): ﴿إِذۡ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ ٤ قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٥ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦﴾

بزانـە خـوا ﷻ باسـی کـردوە ئـەو (واتـە: خـوا) چاکتریـن چیـرۆک لـەم کتێبـەدا بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺ بـاس دەکات، پاشـان باسـی ئەم چیرۆکـەی کردوە بـە دوورو درێژی، هـەر کەسـێک بیەوێـت تـەواوی بـکات، یان بـە چاکتر باسـی بـکات، بەوەی لـە مێژوی کتێبە ئیسـرائیلیەکاندا باسـکراوە کە هیچ سـوودێکی نیە، وە هیچ هەڵقەیەکی گواستنەوەشـی نیـەو زۆربەیشـی درۆیە، ئەوە خۆ سـەپاندنە بەسـەر خـوادا، تەواوکـەری شـتێکە وا گومان دەبـات ئـەوە ناتەواوە، ئەوەندەت بەسـە شـتێک بگاتـە ئـەم ڕادەی ناشـرینیە، بێگومان زیاد کراوانـی ئـەم سـوورەتە لـە زۆرێـک لـە تەفسـیرەکاندا پـڕە لـە درۆی ناشـرین‌و کۆمەڵە شـتێکی نابـووت کـە پێچەوانەی ئەوەیە خوا ﷻ باسـی کردوە، پێویسـتە لەسـەر مسـوڵمان تێگەیشـتن لـەوە وەربگـرێ کە خوا باسـی کـردوە، جگە لە ئـەوە واز لەوانی تـر بهێنێ کە لـە پێغەمبەرەوە ﷺ نەگواسـتراوەتەوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِذۡ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ﴾ یەعقووبـی کـوڕی ئیسـحاقی کـوڕی ئیبراهیم خۆشەویسـتی خوا (علیهم السلام)، ﴿يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ﴾ (واتـە: بـە ڕاسـتی مـن خەوێکی سـەیرم بینیـوە، بینیـم: یازدە ئەسـتێرەو خـۆرو مانـگ سـوژدەم بـۆ دەبـەن) ئەم خـەوە پێشـکەوت لـەوەی کە یوسـف ﷺ پلەو پایـەی بەرزی پێی گەیشـت لە دنیـاو دواڕۆژدا، بەو شـێوەیە ئەگەر خـوا کارێکی گەورەی بـوێ، پێشـەکیەکی بـۆ دەهێنێتە پێش، تـا ببێتە سـەرەتایەک بۆی‌و ئاسـانکاریەک بۆ کارو بارەکانـی، وە خـۆ ئامادەکـردن بەوەی کـە ناخۆشـی‌و نارەحەتی دێت بەسـەر بەنـدەدا لەو پێنـاوەدا، وەک سـۆزێک بـۆ بەندەکـەی‌و چاکەیەک بۆی،

قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ
إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٥ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ
رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ
وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ
وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ٦ ۞لَّقَدۡ كَانَ فِي يُوسُفَ
وَإِخۡوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٞ لِّلسَّآئِلِينَ ٧ إِذۡ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ
إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٨
ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ
وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ٩ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ
لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ يَلۡتَقِطۡهُ بَعۡضُ
ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ١٠ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۫نَّا عَلَىٰ
يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ١١ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ
وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ١٢ قَالَ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ
أَن يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ ١٣ قَالُواْ لَئِنۡ
أَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّآ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ١٤

جا یەعقووب خەوەکەی لێکدایەوە بەوەی کە خۆر: دایکێتی، مانگیش: باوکێتی، ئەستێرەکانیش: براکانین، ئەو بارو دۆخ وای لێدەکات تا دەگاتە حاڵەتێک ملکەچی دەبن‌و سوژدەی بۆ دەبەن، وەک ڕێزو بە گەورە زانینێک، دیارە ئەمەش ڕوونادات مەگەر چەندین هۆکار پێشی بکەوێ وەک هەڵبژاردنی خواو پاک کردنەوەی، وە تەواو کردنی نیعمەتەکانی بەسەریەوە بە زانست‌و کردەوەو جێگیر کردن لە زەویدا، بێگومان ئەم نیعمەتە هەموو بنەماڵەی یەعقووب دەگرێتەوە ئەوانەی کە سوژدەیان بۆ برد، بوون بە شوێنکەوتووی ئەو لەوەدا، لەبەر ئەمەیە خوا فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ﴾ واتە: هەڵتدەبژێرێ بەوەی کە منەتی کردوە بەسەرتدا بەو وەسفە بەرزو کردەوە جوانانە ﴿وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ﴾ واتە: لێکدانەوەی خەوەکان، وە ڕوونکردنەوەو لێکدانەوەی کتێبە پیرۆزەکان ﴿وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ﴾ لە دنیاو دوارۆژدا، بەوەی لە دنیادا پێت دەبەخشێ، وە لە دوارۆژیشدا ﴿كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ﴾ بەو شێوەی کە نازو نیعمەتەکانی ڕشت بەسەریاندا، کە نازو نیعمەتی مەزن‌و فراوان بوون لە دنیاو دوارۆژدا، ﴿إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ﴾ واتە: زانستی دەوری هەموو شتەکانی داوە، بەوەیشی کە لە ناخی بەندەکانیدایە لە چاکەو جگە لە ئەویش، بە پێی دانایی‌و حیکمەتی خۆی بە هەموویان دەبەخشێ، بێگومان خوا ﷻ بە حیکمەتەوە هەموو شتێک لە جێگای خۆیدا دادەنێت بە پێی پلەو پایەی خۆی.

کاتێک کە خەوەکەی بۆ یوسف لێکدایەوە، باوکی پێی فەرموو: ﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ﴾ واتە: لە ناخی خۆیانەوە حەسوودیت

پـێ ببـەن، کـە تـۆ ببـی بـە سـەرۆکو دەسـەڵاتدار بەسـەریانەوە، ﴿ كَيۡدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَـٰنَ لِلۡإِنسَـٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴾واتە لێناهێنـێ بـە شـەوو بـە ڕۆژ وە بـە نهێنـیو ئاشـکرا، بۆیـە دوورکەوتنـەوە لـەو هۆکارانـەی کـە دەبێتـە مایـەی ئـەوەی زاڵ بێـت بەسـەر ئینسـاندا پێویسـتە، یوسـف فەرمانـی باوکـی بەجێهێنـاو هەواڵـی نـەدا بـە براکانـی، بەڵکـو شـاردیەوە لێیـان.

(٧-٩): ﴿ لَّقَدۡ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخۡوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٞ لِّلسَّآئِلِينَ ٧ إِذۡ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٨ ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ٩ ﴾

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخۡوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٞ ﴾واتـە: بـە ڕاسـتی بەسـەرهاتی یوسـفو براکانـی گەلێـک بەڵگـەو پەنـدی زۆر جوانـی تێدایـە، ﴿ لِّلسَّآئِلِينَ ﴾واتـە: بۆ هەمـوو ئەوانـەی لـەو ڕووداوە دەپرسـن بـە زمانـی حـاڵ یـان بـە زمانـی وتـن، بێگومان تەنهـا پرسـیارکەران پەنـدو وانـەی لێوەردەگـرن، بـەڵام ئەوانـەی پشـتیان تێکـردوە سـوود لـە بەڵگـەو نیشـانەکان وەرناگـرن، تەنانـەت چیـرۆکو ڕوونکردنەوەکانیـش.

﴿ إِذۡ قَالُواْ ﴾(کاتێـک) لـە نێوانـی خۆیانـدا (وتیـان:) ﴿ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ ﴾واتـە: بنیامیـن، بـرای دایـکو باوکـی، ئەگەرنـا هەموویـان بـرای یەکتـر بـوون ﴿ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ ﴾واتـە: دەسـتەو کۆمەڵـە پیاوێکیـن، چـۆن فەزڵـی ئـەو دووانـە دەدا بەسـەر ئێمـەداو نـەرمو نیانیـان زیاتـر بـۆ دەنوێنـێ؟! ﴿ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴾واتـە: لـە هەڵەیەکـی ڕوونو ئاشـکرادایە، لەبـەر ئـەوەی فەزڵـی ئـەو دووانـەی داوە بەسـەر ئێمـەدا بەبـێ هـۆکارێ کـە ببینیـن، ﴿ ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا ﴾ واتـە: لـە پێـش چـاوی باوکـی بیشـارنەوەو فڕێیدەنـە شـوێنێکی چـۆڵ کـە باوکـی نەتوانـێ ببینـێ، ئەگـەر ئێـوە یەکـێ لـەم دوو کارە بکـەن (کوشـتنی، یـان فڕێدانـی لـە شـوێنێکی چـۆڵ) ﴿ يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ ﴾واتـە: ئەوکاتـە یـەکلا دەبێتـەوە بـۆ ئێـوەو سـۆزو خۆشەویسـتیتان بـۆ دەردەبـڕێ، بێگومـان ئـەو دڵـی سـەرقاڵ بـووە بـە یوسـفەوە ناتوانـێ ڕووبکاتـە ئێـوە، ﴿ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ ﴾واتـە: لـە پـاش ئـەو کارە ﴿ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ﴾واتـە: دەگەڕێنـەوە بـۆ لای خـواو داوای لێخۆشـبوونی لێدەکـەن لـە پـاش ئـەو تاوانـەی ئەنجامتانـدا، سـوور بـوون لەسـەریو تەوبەیـان پێشخسـت پێـش ئەنجامدانـی تاوانەکـە، تـا بـە ئاسـانی ئەنجامـی بـدەن، بـۆ ئـەوەی ناشـرینی ئـەو تاوانـە

لــە پێــش چاویــان نەمێنــیو هەندێکیــان بینــە مایــەی هانــدان بــۆ هەندێکــی تریــان.
(١٠): ﴿ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾ ﴾:

دەفەرمــوێ: ﴿ قَالَ قَآئِلٌ ﴾ (یەکێــک) لــە براکانــی یوســف، ئەوانــەی کــە ویســتیان بیکــوژن یــان دووری بخەنــەوە (وتــی:) ﴿ لَا تَقْتُلُوا۟ يُوسُفَ ﴾ بــە ڕاســتی کوشــتنی تاوانێکــی مــەزنو ناشــرینە، مەبەســتیش ئــەوە بــوو دوور بخرێتــەوە لــە باوکــی بەبــێ کوشــتن، بــەڵام بــۆ دوورخســتنەوەی گەیشــتن بــەو بڕیــارەی کــە فڕێــی بدەنــە ﴿ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ ﴾ واتــە: (نــاو بیرێکــی قوڵــەوە) وە پەیمانــی لێوەردەگــرن کــە دەربــارەی ئێــوە هیــچ نەڵــێ، تەنهــا ئــەوە نەبــێ کــە ئــەو کۆیلەیەکــی ســەرپێچیکارە، لەبــەر ئەوەی ﴿ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ ﴾ ئەوانــەی کــە بــۆ شــوێنێکی دوور دەڕۆنو لــەوێ دەیپارێزن. ئــەم قســەکەرە (کــە بــرای یوســف بــوو) جوانتریــن بۆچوونــی هەبــوو لــە ناویانــدا دەربــارەی یوســف، وە لــە خواترســترینو خۆپارێزترینیــان بــوو لــەم کێشــەیەدا، بێگومان هەنــدێ خراپــە ســوکترە لــە هەندێکــی تــر، وە زیانــی ســووکو ئاســان زیانی گــەورەی پــێ لا دەبــرێ.

(١١-١٤): ﴿ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ قَالَ إِنِّى لَيَحْزُنُنِىٓ أَن تَذْهَبُوا۟ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأْكُلَهُ ٱلذِّئْبُ وَأَنتُمْ عَنْهُ غَٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُوا۟ لَئِنْ أَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ وَنَحْنُ عُصْبَةٌ إِنَّآ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿١٤﴾ ﴾:

کاتێــک کــە ڕێککەوتــن لەســەر ئــەم بۆچوونــە ﴿ قَالُوا۟ ﴾ واتــە: براکانــی یوســف بــۆ ئــەوەی بگــەن بــە ئامانجەکانیــان بــە باوکیــان وت: ﴿ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأْمَ۫نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴾ واتــە: چ شــتێک وات لێــدەکات کــە لــە ئێمــە بترســی دەربــارەی یوســف، بەبــێ ئــەوەی هیــچ هۆکارێــک هەبێــت؟! ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴾ واتــە: لــە کاتێکــدا کــە ئێمــە بــۆ ئــەو دڵســۆزین، ئــەوەی بــۆ ئــەو پێمــان خۆشــە بــۆ خۆمانیــش بــە هەمــان شــێوە، ئەمــە بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی یەعقــووب ﷺ ڕێگــە نــادات یوســف لەگــەڵ براکانیــدا بچــن بــۆ چۆڵەوانــیو هــاو شــێوەی.

کاتــێ خۆیــان لــەو تۆمــەتو گومانە بــەری کــرد کــە بــە هۆیــەوە لەگەڵیانــدا نایَنێرێت، باســی ئەوەیــان بــۆ کــرد کــە ئــەو زۆر بەرژەوەنــدی یوســفی دەوێو خۆشــی دەوێ کــە

وا پێویسـت دەکات لەگەڵیانـدا نەینێـرێ، وتیـان: ﴿ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ ﴾ واتـە: لـەو دەشـتە چـی پێخۆشـە بـا بـۆ خـۆی بیـکات ﴿ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴾ واتـە: دەیپارێزیـن لـە هـەر شـتێک تووشـی ببـێ.

وەڵامـی دانـەوەو فەرمـووی: ﴿ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ ﴾ واتـە: تەنهـا بـە بردنـی یوسـف خەمبـار دەبـمو زۆر سـەختە بـە لامـەوە، چونکـە توانـای فیراقیـم نیـە، ئەگـەر چـی ماوەیەکـی کەمیـش بـێ، لەبـەر ئەمـە رێگـری کـرد لـە ناردنـی ﴿ وَأَخَافُ أَن يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ ﴾ واتـە: گوێـی نەدەنـێو لێـی بێئاگـا بـن، چونکـە منداڵـە ناتوانـی خـۆی لـە گـورگ بپارێـزێ ﴿ قَالُواْ لَئِنۡ أَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ ﴾ واتـە: کۆمەڵێکـن سـوورن لەسـەر پاراسـتنی ﴿ إِنَّآ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ﴾ واتـە: نـە خێرمـان تێدایـە نـە سـوود، ئەگـەر گـورگ بیخـواتو نەتوانیـن سـەرکەوین بەسـەریدا.

کاتـێ کـە پێشـەکی ناردنیـان بـۆ باوکیـان ڕوونکـردەوە کـە هیـچ مەترسیەکی لەسـەر نیـە، ئەویـش ڕێگـای پێیانـدا لەگەڵیانـدا دەربچێـت بـۆ گەمـەو کەیـف خۆشـی.

فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجۡمَعُوٓاْ أَن يَجۡعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّۚ وَأَوۡحَيۡنَآ
إِلَيۡهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمۡرِهِمۡ هَٰذَا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ١٥ وَجَآءُوٓ
أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ١٦ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ
وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُۖ وَمَآ أَنتَ
بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ١٧ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ
بِدَمٖ كَذِبٖۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ
وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ١٨ وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ
فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ وَأَسَرُّوهُ
بِضَٰعَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ١٩ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۭ بَخۡسٖ
دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ٢٠ وَقَالَ
ٱلَّذِي ٱشۡتَرَىٰهُ مِن مِّصۡرَ لِٱمۡرَأَتِهِۦٓ أَكۡرِمِي مَثۡوَىٰهُ عَسَىٰٓ
أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗاۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي
ٱلۡأَرۡضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ
أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٢١ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ
ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٢٢

(١٥-١٨): ﴿ فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجۡمَعُوٓاْ أَن يَجۡعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمۡرِهِمۡ هَٰذَا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ١٥ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ١٦ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ١٧ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ١٨ ﴾

﴿ فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجۡمَعُوٓاْ أَن يَجۡعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ ﴾ واتــە: كاتێــك كــە براكانــی یوســف، یوسـفیان بــردە دەرەوە پــاش وەرگرتنــی مۆڵــەت لــە باوكــی، ســوور بــوون لەســەر ئــەوەی كــە فڕێــی بدەنــە نــاو بیرێكــەوە، وەك چــۆن پێشــتر ئــەو بڕیارەیــان دابــوو، دەیانتوانــی ئــەم كارە بكــەن لەبــەر ئــەوەی كــە یــەك دەنــگ بــوون لەســەری، بۆیــە توانــای خۆیانیــان بەكارهێنــاو جێبەجێیــان كردو خســتیانەوە نــاو بیرێكــەوە.

پاشــان خــوا ﷻ بەزەیــی پێداهاتــەوە وەحــی بــۆ نــارد، لــەو حاڵەتــە نارەحــەتو ناهەمــوارەدا: ﴿ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمۡرِهِمۡ هَٰذَا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴾واتــە: ڕۆژێــك دێ تــۆ ڕزگــارت دەبــێ، سەرزەنشــتی ئــەوان دەكەیــتو هەواڵیــان پێــدەدەی لە ســەرەنجامدانی ئــەم كارەیانــدا، لــە كاتێكــدا ئــەوان هەســت ناكــەن كــە ئــەوە تــۆی.

ئەمــە مــژدەی تێدایــە بــەوەی كــە ڕزگــاری دەبــێ لــەوەی تێــی كەوتــووە، وە خوا ﷻ كــۆی دەكاتــەوە لەگــەڵ خانــەوادەو براكانیــدا بــە ســەربەرزی توانای دەســەڵاتی لەســەر زەویــدا. ﴿ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ﴾تــا دوا كەوتنەكەیــان درەنــگ بــێ لــە كاتی سروشــتی خۆیــدا، وە گریانەكەیــان ببێتــە بەڵگــەو نیشــانە لەســەر ڕاســتگۆییان، بۆیــە عــوزرو بیانوویەكــی درۆیــان هێنایــەوەو وتیــان: ﴿ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ ﴾

واتــە: ئێمــە ڕۆشــتین غارغارێــن یــان پێشــبڕکێ بکەیــن ﴿ وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا ﴾ تــا بــۆ خــۆی پشــوو بــدات ﴿ فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ ﴾ لــەو کاتــەی ئێمــە دیــار نەمایــن‌و پێشــبڕکێمان دەکــرد، ﴿ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴾ واتــە: ئەگەرچــی بیانــووش بهێنیتــەوە بــەم بیانــووە، ئــەوە دیــارە تــۆ بــڕوا بــە ئێمــە ناکــەی لەبــەر ئــەو خــەم‌و پەژارەیــەی لەســەر دڵتــە بــۆ یوســف، بــەڵام بــڕوا پێنەکردنــی تــۆ ڕێگــری لــە ئێمــە نــاکات کــە بیانــووی ڕاســتەقینە نەهێنینــەوە، هەمــوو ئەمانــە جەختکردنــەوە بــوو لەســەر پاســاوەکەیان، ئــەوەی کــە جەختیــان لێکــردەوە، ئــەوان ﴿ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖ ﴾ وا پێشــانیاندا کــە ئــەوە خوێنــی یوســفە کاتــێ گورگەکــە خواردوویەتــی، بــەڵام باوکیــان هەرگیــز بــڕوای بــەوە نەدەکــرد، ﴿ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ ﴾ واتــە: نەفــس‌و دەروونتــان شــتێکی ناشــرینی لا جــوان کــردووە لــە جیاکردنــەوەی مــن‌و یوســف، چونکــە بەڵگــەو نیشــانەی بینــی بــوو، وە هەســتی پێکردبــوو، بــە تایبــەت لــەو خــەوەی یوســف کــە بــۆی گێڕایــەوە، بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی کــە وتــی: ﴿ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾ واتــە: مــن پیشــەم ئەوەیــە پێــی هەســتم، ئەویــش ئەوەیــە ئــارام بگــرم لەســەر ئــەم میحنــەت‌و ناخۆشــیە بــە ئارامگرتنێکــی جــوان، دوور بێــت لــە تووڕەیــی‌و ســکاڵا بــردن بــۆ لای خەڵکــی، وە پشــت بــە خــوا دەبەســتین لەســەر ئــەوە، نــەک لەســەر توانــاو هێــزی خــۆم، لــە ناخــی خۆیــدا ئــەم پەیمانــەی دا، وە ســکاڵای بــرد بــۆ لای بەدیهێنــەری کــە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ﴿٨٦﴾ ﴾ یوســف. لەبــەر ئــەوەی ســکاڵابردن بــۆ لای بەدیهێنــەر، پێچەوانــەی ئارامگرتنێکــی جــوان نیــە، چونکــە پێغەمبــەر ﷺ ئەگــەر پەیمانێکــی بدایــە جێبەجێــی دەکــرد.

(١٩-٢٠): ﴿ وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۭ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾:

یوســف لەنــاو بیرەکــەدا مایــەوە تــا ﴿ وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ ﴾ واتــە: قافڵەیــەک بــەرەو میســر دەڕۆشــتن (هاتــن) ﴿ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ ﴾ واتــە: ئــاو هەڵگــۆزو دۆڵچەکانیــان نارد ئاویــان بــۆ هەڵبێنــن‌و ئاویــان بــۆ ئامــادە بکــەن، ﴿ فَأَدۡلَىٰ ﴾ ئــەو ئــاو هەڵگــۆزەرە ﴿ دَلۡوَهُۥ ﴾ (دای هێشــتە بیرەکــەوە) کاتێــک کــە هەڵیکێشــا یوســف خۆی هەڵواســیبوو

پیایـدا ﴿ قَالَ يَـٰبُشۡرَىٰ هَـٰذَا غُلَـٰمٌ ﴾واتـە: مـوژدە بێـت ئەمـە منداڵێکـی گـران بەهایـە ﴿ وَأَسَرُّوهُ بِضَـٰعَةً ﴾ئـەو کات براکانـی یوسـف لێـەوە نزیـک بـوون، یەکێـک لـە کاروانیـەکان یوسـفی لـێ کڕیـن ﴿ بِثَمَنِۭ بَخۡسٍ ﴾واتـە: بـە نرخێکـی زۆر کـەم، کـە هـەر بـەم فەرمایشـتە تەفسـیری کـردوە: ﴿ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٍ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴾

چونکـە ئـەوان هیـچ مەبەسـتێکیان نەبـوو تەنهـا ئـەوە نەبـێ کـە لەبەرچـاو باوکـی بیشـارنەوەو دووری بخەنـەوە، وە مەبەستیشـیان ئـەوە نەبـوو بیفرۆشـن‌و سـوود لـە پارەکـەی وەربگـرن. مانـای ئەمـەش ئەوەیـە: کاروانیەکـە کاتێـک کـە دۆزیانـەوە سـوور بـوون لەسـەر ئـەوەی بیشـارنەوە، وە بیگێـڕن بـە یەکێـک لـەو شـت‌و مەکانەی لەگەڵیاندایـە، تـا براکانـی هاتـن گومانیـان بـرد کـە ئـەوە بەندەیەکـی لـە فەرمـان دەرچـووە، بۆیـە بـەو پـارە کەمـە کڕیـان، وە بەسـتیانەوە بـۆ ئـەوەی ڕانـەکات.

(٢١): ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِي ٱشۡتَرَىٰهُ مِن مِّصۡرَ لِٱمۡرَأَتِهِۦٓ أَكۡرِمِي مَثۡوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗاۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢١﴾ ﴾

دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِي ٱشۡتَرَىٰهُ مِن مِّصۡرَ لِٱمۡرَأَتِهِۦٓ ﴾واتـە: کاتـێ کـە کاروانچیەکان بردیـان بـۆ میسـرو لـەوێ فرۆشـتیان، پاشـاو عەزیـزی میسـر کـڕی، کاتێ کـە کڕی سەرسـام بـوو پێـی، وەسـیەتی بـۆ ژنەکـەی کـردو وتـی: ﴿ أَكۡرِمِي مَثۡوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗا ﴾واتـە: یـان وەک بەندەیـەک بـە هەمـوو شـێوەیەک سـوودی لێوەردەگریـن، یـان وەک منداڵێکـی خۆمـان چێـژی لێوەردەگریـن، دەکـرێ عەزیـزی میسـرو خێزانەکـەی منداڵیـان نەبووبـێ ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتـە: وەک چـۆن ئاسـانمان کـرد کـە عەزیـزی میسـر بیکـڕێ‌و بـەم شـێوەیە ڕێـزی لێبگـرێ، ئەمەشـمان کـردوە بـە پێشـەکیەک بـۆ ئـەوەی لەسـەر زەویـدا جێگیـری بکەیـن ﴿ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ ﴾ئەگـەر بمێنێتـەوەو هیـچ کارو خەمێکـی نەبـێ جگـە لـە زانسـت، ئـەوە دەبێتـە هـۆکاری ئـەوەی زانسـتێکی زۆر فێرببـێ لـە زانسـتی چارەسـەر کردنـی کێشـەو گرفتـەکان، وە زانسـتی لێکدانـەوەی خەونـەکان‌و غەیـری وانیـش ﴿ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ ﴾واتـە: فەرمانـی خـوا ﷻ جێبەجـێ کـراوە هیـچ شـتێک ناتوانـێ بەتاڵـی بکاتـەوەو لـە ڕوویـدا ڕابوەسـتێ، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ

ﭐلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ واتــە: (بــەڵام زۆربــەی خەڵکــی نایزانــن) لەبــەر ئەوەیــە ئــەوەی لێیانــەوە دەردەچــێ کــە دەردەچــێ لە ســنور بەزاندنــی ئەحکامــە قەدەریەکانــی خوا ﷻ، بێگومان ئەوان زۆر بێتواناو لاوازترن لەوەدا.

(٢٢): ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٢٢ ﴾:

دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَمَّا بَلَغَ ﴾ (وە کاتێــک) یوســف (گەیشــتە) ﴿ أَشُدَّهُۥٓ ﴾ واتــە: تــەواوی هێــزی مەعنویــیو هەســتەوەری، شایســتەی ئــەوە بــوو کــە ئەرکــی قــورسو گــران بخەینــە ئەســتۆی، لــە پێغەمبەرایەتــی ﴿ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗا ﴾ واتــە: کردمــان بە پێغەمبــەرو زانــاو پارێــزکار ﴿ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ لــە بەندایەتــی بەدیهێنــەردا بە کۆشــش کــردنو ئامۆژگــاری تیایــدا، وە بــە ســوود گەیانــدنو چاکــە کــردن لەگــەڵ بەندەکانــی خــوادا ﷻ، پێیــان دەبەخشــین لــە کــۆی پاداشــت لەســەر چاکەکانیــان بــە زانســتی بــە ســوود، ئەمــە بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی یوســف پلــەی ئیحســانی تــەواو کــرد، خــوا حوکــمو دەســەڵاتی پێــدا لــە نــاو خەڵکیــدا، وە زانســتی زۆرو پێغەمبەرایەتــی پــێ بەخشــی.

وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ
وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ
إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٣ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا
لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ
وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ٢٤ وَٱسۡتَبَقَا
ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ
قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ
أَلِيمٞ ٢٥ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ
أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ
ٱلۡكَٰذِبِينَ ٢٦ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٢٧ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ
مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ٢٨ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ
هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ
٢٩ ۞ وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا
عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ٣٠

(٢٣-٢٩): ﴿ وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا
عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ
لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ
إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ
بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ
كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ
إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾
وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ
وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ
أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ
﴿٢٥﴾ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ
شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ
مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾
وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ
مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ
﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾ ﴾:

بە ڕاستی ئەم بەڵاو میحنەتە گەورەیە مەزنترە لەسەر یوسف ﷺ لە بەڵاو میحنەتی براکانی، ئارام گرتنی لەسەر مەزنترین پاداشتە، چونکە بە ویستی خۆی ئارامی لەسەر گرت لەگەڵ بوونی هۆکارێکی زۆر بۆ ڕوودانی کارەکە، خۆشەویستی خوای پێشخست بەسەریدا، بەڵام ئارامگرتن لەسەر بەڵای براکانی ناچاری بوو، وەک ئەو نەخۆشیانەی تووشی مرۆڤ دەبێ بەبێ ویستی خۆی، هیچ دەرچەیەکی نیە تەنها ئارامگرتن نەبێ لەسەری، پێی خۆش بێ، یان پێی ناخۆش بێ، بەو شێوەیە یوسف ﷺ لەماڵی عەزیزی میسر بەڕێزەوە مایەوە، وە جوانیەکی تەواو سەرسوڕهێنەری هەبوو، کە بووە مایەی ئەوە، کە ﴿ وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ ﴾ واتە: ئەو منداڵو خزمەتکاری ئەو بوو، لە ژێر فەرمانیدا بوو، لە یەک شوێنی نیشتەجێ بووندا بوون، ئاسان بوو کاری لەو جۆرە بکرێ بەبێ ئەوەی کەس بزانێو مرۆڤ هەستی پێبکات ﴿ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ ﴾ موسیبەتەکە زیادی کرد، بەوەی کە دەرگاکانی داخستو

شـوێنەکە چـۆڵ بـوو، هەردوو کیـان بێخەم بوون لـەوەی کەسـێک بێتــە ژوورەوە، بە هۆی گرتنو داخســتنی دەرگاکانەوە، بانگی یوسـفی کرد بـۆ لای خۆی﴿ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ ﴾ واتــە: کاری خراپــم لەگــەڵ بکــەو ڕووم تێبکــە، لەگــەڵ ئەمەدا ئــەو غەریبــەو بێگانەیە، لە غەریبیــدا شــەرم کەمتر دەکــرێ، وەک ئــەوەی لەناو کــەس‌و کاری خۆیدا بێ، ئــەو دیلەو لــە ژێــر دەســتیدایە، ئافرەتەکــەش ســەییدو گەورەیەتی، ئەوەنــدەش جوانە کــە ببێتە مایەی نزیکبوونــەوە، وە ئەویــش گەنجێکی تازە پێگەیشــتوە، هەڕەشــەی لێکردبوو ئەگــەر نەچێتە لایــەوە دەیخاتــە بەندیخانەوە، یان ســزایەکی ســەختی دەدات.

ئارامــی گــرت لــە ســەر ســەرپێچی کردنــی خــوا ﷻ لەگــەڵ بوونــی هــۆکاری بــە هێــز تیایــدا، لەبــەر ئــەوە حــەزی جــولاّ بــۆ لای، بەلاّم لەبــەر خــوا ﷻ وازی لــێ هێنا، ویســتی خوای پێشخســت بەســەر ویســتی نەفســی فەرمانکەر بــە خراپــە، وە بەڵگەو نیشــانەی خوای بینــی -ئەویــش ئــەو زانســت‌و بڕوایــە بــوو کــە پێویســت دەکات واز بهێنــێ لــە هەمــوو قەدەغەکراوێکــی خــوا- بــوو بە مایــەی ئــەوەی دوور بکەوێتەوە لــەو تاوانــە گەورەیە، وە ﴿ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ ﴾ واتــە: پەنــا دەگرم بە خوا ﷻ لــەوەی کاری واقێزەون‌و ناشــرین بکەم، چونکــە دەبێتــە مایــەی تــووڕە بوون‌و خەشــم‌و قینی خــوا ﷻ، وە لەبــەر ئــەوەی خیانەتە لە بەرانبــەر ئــەو کەســەی کە ڕێــزی لێگرتووم‌و پەنــای داوم، ناکــرێ لە بەرانبەر ئــەو چاکەدا من خراپەی وا ناشــرین بکەم، بەڕاســتی ئەمە مەزنترین ســتەمە، ســتەمکاریش ســەرناکەوێ.

بــە پوختی ئەوەی بووبە مایەی بەربەســت لــەو تاوانە خۆپارێزی‌و تەقوای خــوا بوو، وە لەبەر چــاو گرتنــی مافــی گەورەکەی بــوو کە ڕێــزی لێگرتبــوو، وە باشــترین جێگای بــۆ دابین کردبــوو کــە ماڵەکــەی خۆیەتــی، وە نەفســی خۆی پاراســت لە ســتەم کردن کــە بێگومان ئــەوەی ســتەم بــکات ســەرکەوتوو نابــێ، بــە هەمــان شــێوە منەتی خــوا ﷻ بەســەریەوە لە نیشــاندانی بەڵگــەی ئیمان کە لــە دڵیدایە دەبێتە مایــەی جێبەجێکردنــی فەرمانەکانی خوا ﷻ و دور کەوتنــەوە لــە خراپــەکان، کۆکــەرەوەی هەمــوو ئەوانــە وای کــرد، خــوا ﷻ لــەو کارە زۆر خــراپ‌و قێزەونــەی دور خســتەوە، چونکــە بەندەیــەک بوو لە بەندە دڵســۆزەکان، ئەوانــەی خــوا ﷻ هەڵبــژاردوون‌و تایبەتی کــردوون بە خــۆی، نازو نیعمەتەکانی بەســەردا ڕشــتوون، لــە خراپەکاریەکانیــش دووری خســتنەوە تــا ببن بــە باشــترین بەدیهێنراوەکانی.

کاتێــک کە بەرگری کرد لــە وەلاّمدانــەوەی داواکاریەکەی پاش هەوڵێکی زۆر، ڕۆشــت‌و ڕایکــرد بــەرەو لای دەرگاکــە بەڵکــو ڕزگــاری بــێ لــەو فیتنەیە، شــاژنیش بە دوایــدا تا لە

دواوە دەستی لـە کراسـەکەی گیر بوو دڕانـدی، کاتێ کە گەیشتن بە دەرگاکە (یوسـف بـۆ ڕزگـار بوونو شـاژن بـە دوای حـەزی خۆیـدا) لـەو کاتـەدا، هەردوو کیـان لەبەردەم دەرگاکەدا تووشـی مێردەکەی هاتن، شـتێکی زۆر ناخۆشـی بینی، ژنەکەی دەستپێشـخەری کـرد بـۆ درۆ کردن کە گوایـە یوسـف هەوڵیداوە دەسـتی بۆ ببات، وتـی: ﴿مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا﴾ نەیـوت: (مـن فعـل بأهلـك سـوءا) تـا خـۆی ئەویـش بەری بـکات لەو کارە قێزەونـە. تەنها قسـە لەسـەر ویسـتو هەوڵدانـە ﴿إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ واتە: بەنـد بکرێ، یان سـزا بـدرێ بە سـزایەکی بـە ئێش.

(یوسـف) خـۆی بـەری کرد لەو تۆمەتەی کە شـاژن دایـە پاڵی، فەرمـووی: ﴿هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِي﴾ (واتـە: نەخێـر وانیـە ئـەو هەوڵێکـی زۆریدا بۆ کاری ناپەسـند، منیـش قبووڵم نەکـردو هەڵهاتـم) لەوکاتـەدا دەکرێـت هـەردوولا ڕاسـت بکـەن، نەزانـرا کـێ ڕاسـت دەکات، بـەلام خوا ﷻ بۆ ڕاسـتی نیشـانەی دانـاوە کە بەڵگەبن لەسـەری، دەکـرێ هەندی لـە بەنـدەکان بیزانـنو هەندێکیـان نەیزانن، خـوا ﷻ لەو کێشـەیەدا بە فەزڵی خۆی ڕاسـتی ئـەو دووانـەی دەرخسـت، پێغەمبەرەکـەی خـۆی یوسـف ﷺی بـەری کرد، شـایەتی لە خزمانـی شـاژن شـایەتی دا بە نیشـانەیەک کە لە لای هەرکامیـان بێ ئەوە ڕاسـتگۆیە، وتی: ﴿إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ (واتـە: ئەگەر کراسـەکەی یوسـف لە پێشـەوە دڕابێ ئەوە (شـاژن) ڕاسـتی کردوەو یوسـف لە درۆزنانە) چونکە ئەوە بەڵگەیـە لەسـەر ئەوەی کـە ئـەو ڕووی تێکـردوەو هەوڵی داوە، وە شـاژنیش ویسـتویەتی بەرگـری لە خـۆی بـکات، بۆیە لە پێشـەوە کراسـەکەی دڕاوە.

﴿وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴾ (واتـە: ئەگـەر کراسـەکەی یوسـف لـە پشـتەوە دڕابـوو، ئەوە (شـاژن) درۆی کـردوە، (یوسـف)یش ڕاسـتی کردوە) چونکـە ئـەوە بەڵگەیە لەسـەر ئـەوەی لێی ڕایکـردوە، شـاژنیش دوای کەوتوەو دەسـتی بۆ بردوە سـەرەنجام کراسـەکەی لـە دواوە دڕاوە.

﴿فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ﴾ (واتـە: جـا کاتێک کـە (مێردەکەی) بینی کراسـەکەی لـە پشـتەوە دڕاوە) بـەوە ڕاسـتیو پاکی یوسـف ﷺی بۆ دەرکـەوت، وە زانـی ژنەکەی درۆی کـردوە، مێردەکەی وتـی: ﴿إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ﴾ (واتە: بەڕاسـتی ئـەو کارە هـەر لە پیلانو فـرتو فێڵی ئێـوەی ژنانە، چونکـە فێڵی ئێوە گەلێـک گەورەیە).

ئایـا لـەم فێڵـە مەزنتر هەیە کە خـۆی بێبەری کرد لەوەی کە خۆی ویسـتی خۆشـی کردی،

وە تۆمەتـی داوە پـاڵ پێغەمبـەر یوسـف ﷺ؟! پاشـان کاتێ عەزیـزی میسـر، مێردەکەی، لێکۆڵینـەوەی لـە کارەکـە کـرد، بـە یوسـفی وت: ﴿ يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَٰذَا ﴾ واتە: واز لـەو بابەتـە بهێنـەو لـە بیـری خۆتی ببـەرەوە با کـەس نەزانـێ، بـۆ ئـەوەی خانەوادەکەی داپۆشـێ ﴿ وَٱسْتَغْفِرِي ﴾ تۆش ئـەی شـاژن ﴿ لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلْخَاطِـِٔينَ ﴾ فەرمانـی بـە یوسـف کرد بە خۆپاراسـتن، ئەویـش بـە داوای لێخۆشـبوونو تەوبەکردن.

(٣٠-٣٥): ﴿ وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦۖ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٣٠﴾ فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـٔٗا وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٖ مِّنْهُنَّ سِكِّينٗا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّۖ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٞ كَرِيمٞ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِۖ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَۖ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونٗا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِۖ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُاْ ٱلْـَٔايَٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٣٥﴾ ﴾:

﴿ وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ ﴾ واتـە: هـەواڵو رووداوەکـە لە دەوروبەری کۆشـکو ناوشـار بڵاوبویـەوە، کۆمەڵێـک لە ژنـە نـاودارەکان وتیـان: ﴿ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفْسِهِۦۖ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ﴾ واتـە: بەڕاسـتی ئەمە شـتێکە لەئەوپـەڕی ناشـرینیدایە، ئافرەتێکی بەڕێزو بەناوبانـگ بوو، بە هەمان شـێوە مێردەکەیشـی، لەگەڵ ئەمـەدا بەردەوام خەریکـی دڵداریو ڕاوکردنـی غوڵامەکـەی بـوو، ئـەو غوڵامـەی کـە لـە ژێـر دەسـتی دایـەو خزمەتـکاری دەکات، لەگـەڵ ئەمـەدا خۆشەویسـتیەکەی گەیشـتۆتە پلەیەکـی مـەزن لـە دڵیـدا ﴿ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ﴾ خۆشەویسـتی چووبـوە نێـو دڵیەوەو پـەردەی دڵی کون کردبوو، (شـغفها): بریتیـە لە نـاوەوەو ڕەشـایی دڵ، ئەمە مەزنترین خۆشەویسـتیە ﴿ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴾ نەدەبـوو لەگـەڵ خزمەتکارەکـەی خۆیـدا کاری وا بـکات، کە نەدەبـوو لەو بوەشـێتەوە، ئا ئەمـە حاڵەتێکـە پلـەو پایەی لـە ناو خەڵکیـدا دادەبەزێنـێ، ئەم قسـەیەی ئـەوان فێڵێک بوو مەبەسـت تێیـدا تەنهـا لۆمـەو لەکـەدار کـردنو سەرزەنشـت نەبـوو، بەڵکـو ویسـتیان بەو قسـانە بگـەن بـە بینینی یوسـف، کـە ژنی عەزیزی میسـر بـە هۆیەوە تووشـی فیتنـە بووە، تـا تـوورە بـێو بانگیـان بکاو یوسـفیان پێ نیشـان بـدات، بـۆ ئەوەی ئـەوان بیانـووی بۆ بێننـەوە، لەبـەر ئەمەیـە ناونراوە بـە فێڵ.

فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا
وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ
أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ
إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ٣١ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ
عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ
وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ٣٢ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ
إِلَيْهِ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ
٣٣ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ
ٱلْعَلِيمُ ٣٤ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُا۟ ٱلْءَايَٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ
حَتَّىٰ حِينٍ ٣٥ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّىٓ
أَرَىٰنِىٓ أَعْصِرُ خَمْرًا وَقَالَ ٱلْءَاخَرُ إِنِّىٓ أَرَىٰنِىٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِى
خُبْزًا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ
ٱلْمُحْسِنِينَ ٣٦ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٌ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا
بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَا ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِى رَبِّىٓ إِنِّى تَرَكْتُ
مِلَّةَ قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ٣٧

جا فەرمووی: ﴿ فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ ﴾ بۆیە ناردی بە دوایانداو بانگیانی کرد بۆ ماڵەکەی خۆی بۆ میوانداری ﴿ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا ﴾ واتە: پشتیو ڕایەخی زۆر جوانو ڕازاوەی بۆ ڕاخستن، لەگەڵ خواردنی زۆر خۆشو بەلەززەتی بۆ ئامادە کردبوون، لە کۆی ئەو خواردنانەدا شتێکی بۆ ئامادە کردوون کە پێویستی بە چەقۆ بێت، یان نارنج بوو یان هاوشێوەی ئەوە ﴿ وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا ﴾ بۆ ئەوەی ئەو خواردنەی پێ ببڕن ﴿ وَقَالَتِ ﴾ بە یوسفی وت: ﴿ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ ﴾ (واتە: وەرە دەرەوە بۆ ناویان) لە ئەوپەڕی جوانیو قەشەنگیدا، ﴿ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ ﴾ واتە: لە ناخی خۆیاندا زۆر بە مەزن تەماشایان کرد، دیمەنێکی زۆر ناوازەو جوانیان بینی، کە پێشتر شتی لەو جۆرەیان نەبینیبوو ﴿ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ﴾ لە سەرسام بووندا (دەستی خۆیانیان بری) ﴿ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ ﴾ واتە: پاکو بێگەردی بۆ خوا ﷻ ﴿ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴾ بەو شێوەیە جوانیەکی سەرسوڕهێنەری پێبەخشرابوو، کە ببێتە نیشانەیەک بۆ تەماشاکارانو پەندێک بۆ ئەوانەی کە سەرنج دەدەن، کاتێ جوانی یوسف ﷺیان بینی، سەریان سوڕما، عوزرێکی زۆریان بۆ شاژن هێنایەوە، ویستی پاکی ناخی یوسفیان نیشان بدات، وە خۆشەویستی ڕاستەقینەی خۆی بە بێباکانە ئاشکرا بکات، لەبەر ئەوە لۆمە لەسەری هەڵگیرا لە لایەن ئافرەتانەوە(کاتێ بینی ئەوانیش گیرۆدەی دەردی ئەوین بوون): ﴿ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ﴾ واتە: یوسف بەرگری کرد، ئەو بەردەوام بوو لە خشتە بردنی، بەڵام درێژایی کاتەکان هیچ سوودی پێنەگەیاند تەنها دوودڵیو خەمو خەفەتو بە ئاوات بوون بە گەیشتنی یوسف نەبێ، لەبەر ئەمە لە پێش چاوی هەموویانەوە پێیوت: ﴿ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾ تا بەو هەڕەشەیە ناچاری بکات، بگات بە ئامانجەکەی، بەڵام ئەو خۆی گرت پشتی تەنها بە خوا ﷻ بەست لە فرتو فێڵی ئەوان ﴿ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ ﴾ ئەمەش بەڵگەیە

لەسەر ئەوەی ئافرەتەکان ئاماژەیان بۆ دەکرد کە بە داواکەی شاژن ڕازی ببێ، جا ئەو زیندانیو سزای پێ باشتر بوو لە لەزەتێکی کاتی ببێتە مایەی سزایەکی قورسو گران ﴿ وَإِلَّا تَصۡرِفۡ عَنِّي كَيۡدَهُنَّ أَصۡبُ إِلَيۡهِنَّ ﴾ (خۆ ئەگەر فرتو فێڵی ئەوانم لێ لانەدەیت) لەوانەیە دڵم مەیلو ئارەزوویان بکات، بێگومان من لاوازم، ئەگەر تۆ خراپەم لێ دوور نەخەیتەوە ﴿ وَأَكُن ﴾ واتە: ئەگەر مەیلم بۆیان بڕوا ﴿ مِّنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴾ بە ڕاستی ئەمە نەفامیە، چونکە خۆشیەکی کەمی هەڵبژارد بەسەر خۆشیەکی بەردەوامی جۆراو جۆر لە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت؟! بێگومان زانستو عەقڵ مرۆڤ بانگ دەکەن بۆ لای پێشخستنی مەزنترینی ئەو دوو بەرژەوەندیەو گەورەترینی ئەو دوو لەززەتە، وە ئەوەیان هەڵدەبژێرێ کە سەرەنجامی چاکە.

﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ ﴾ واتە: کاتێک کە پاڕایەوە ﴿ فَصَرَفَ عَنۡهُ كَيۡدَهُنَّ ﴾ (واتە: فێڵەکەیانی لادا لێی) بەردەوام هەوڵی لەگەڵدا دەدا، ئەوەی لە توانایدا بوو هەموو ئامرازەکانی بەکارهێنا، تا بێ هیوا بوو، خواش فێڵەکەی لێ دوورخستەوە ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ﴾ بۆ پاڕانەوەی ئەو کەسەی لێی دەپاڕێتەوە ﴿ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ بە نیەتێکی چاک، وە پێکهاتەیەکی لاواز کە پێویستی بە هاوکاریو پشتیوانیو سۆزو بەزەیی ئەو هەیە، بەو شێوە خوا ﷻ یوسفی ڕزگار کرد لەو فیتنە نارەحەتیو بەڵا قورسەی بەسەری هات، بەڵام گەورەکانی، کاتێک کە هەواڵەکە بڵاوبوویەوەو ئاشکرا بوو خەڵکیش لە نێوانی بیانوو لۆمەو سەرزەنشتکردنو لەکەدار کردنیدا بوون ﴿ بَدَا لَهُم ﴾ واتە: کاتێ کە بۆیان دەرکەوتو ئاشکرابوو ﴿ مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ ﴾ پاش بینینی ئەو بەڵگانەی کە نیشانەن لەسەر پاکی یوسف ﴿ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ ﴾ (واتە: تا ماوەیەک بیخەنە زیندانەوە) بەڵکو وردە وردە دەنگۆی باسەکە نەمێنێو لەبیر بچێتەوە، چونکە ئەگەر شتێک لەناو خەڵکیدا بڵاوبوویەوە، بەردەوام باس دەکرێو لەسەر زارە، تا هۆکارەکانی بوونی هەبێ، ئەگەر هۆکارەکان نەمان لەبیر دەچێتەوە، بینیان ئەمە بەرژەوەندی ئەوانی تێدایە بۆیە خستیانە زیندانەوە.

(٣٦-٤٠): ﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ
إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ
٣٦ قَالَ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي
رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ٣٧ وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ
إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى

ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾:

﴿ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ ﴾ واتـە: کاتێـک کـە یوسـف کرایـە زیندانـەوە لـە کۆی ئەوانـەی خرابوونـە زیندانەوە دوو لاو هەبـوون بە تۆمەت لەگەڵیـدا زیندانی کران، هەریەک لـەو دوو لاوە خەویـان بینـی، گێڕایانەوە بۆ یوسـف تا بۆیان لێـک بداتەوە ﴿ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا ﴾ (واتـە: یەکێکیـان وتـی: خۆمـم بینـی کـە ترێم دەگوشـیو دەمکـردە شـەڕاب بـۆ گەورەکـەم، ئەویدیکەش وتی: خۆمم دی سـینییە خواردنێک، کە لەسـەر سـەری خـۆم هەڵگرتبوو) ئـەو نانە ﴿ تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ نَبِّئۡنَا بِتَأۡوِيلِهِۦٓۖ ﴾ (باڵنـدە لێـان دەخوارد، سـەرەنجامو مانای ئـەو دوو خەونەمان پـێ بڵـێ) واتـە: لێکـی بـدەرەوە، وە سـەرەنجامی هەریەکیان بـەرەو کـوێ دەڕوات، وتەی ئـەو دوانـە: ﴿ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾ (ئێمـە تۆ لە چاکـەکاران دەبینین) واتـە: تۆ لە چاکەکارانـی بـۆ خەڵکـی، دەی چاکـە لەگـەڵ ئێمەدا بکـە بـە لێکدانـەوەی خەونەکانمان، وەک چـۆن چاکـەت لەگەڵ غەیـری ئێمەدا کـردوە، لێـی پاڕانەوە بـە چاکەکانی.

﴿ قَالَ ﴾ لە وەڵامی داواکەیانـدا وتی: ﴿ لَا يَأۡتِيكُمَا طَعَامٞ تُرۡزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأۡتُكُمَا بِتَأۡوِيلِهِۦ قَبۡلَ أَن يَأۡتِيَكُمَاۚ ﴾ واتـە: بـا دڵتـان ئارام بـێ، من هـەوڵ دەدەم خەونەکەتـان بۆ لێـک بدەمەوە، سـبەینێ هـەر ژەمـە نانێکتـان بۆبـێ، سـەر لـە بەیانی، یان سـەر لـە ئێـوارە، پێـش ئەوەی بگاتـە دەسـتان مـن دەزانـم چیـەو پێشـتان دەڵێـم. دەگونجێ یوسـف عليه السلام مەبەسـتی ئەوە بووبـێ بانگیـان بـکات بۆ ئیمـان هێنان کە لـەو کاتەدا ئـەوان پێویسـتیان پێی هەبـووە، تا سـەرکەوتوو بـێ لـە بانگەوازەکەیـداو ئەوانیـش ڕووی تێبکەن (پێـی وتن:) ﴿ ذَٰلِكُمَا ﴾ ئـەو خـەوەی بۆتـان لێکدەدەمـەوە ﴿ مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ ﴾ واتـە: ئـەوە زانسـتو بەهـرەی پەروەردگـارە کـە فێـری کـردووم، وە ﴿ إِنِّي تَرَكۡتُ مِلَّةَ قَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴾ وازهێنـان (تـرک) وەک چۆن بچێتە ناو شـتێکەوە، پاشـان لێـی دەرچێت، دەبێتیـش هـەر نەچووبێتـە ناویـەوە. ناوترێ: یوسـف عليه السلام پێشـتر لەسـەر ڕێبـازی غەیری میللەتـی ئیبراهیـم بووە.

وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ
لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى
ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ٣٨ يَٰصَٰحِبَيِ
ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ
٣٩ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ
وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ
أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ
ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٠ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا
فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ
مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ٤١ وَقَالَ
لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ
ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ
٤٢ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ
سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا
ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ٤٣

﴿ وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ ﴾ پاشان میللەتی ئیبراهیمی شیکردۆتەوە بەو فەرمایشتەی: ﴿ مَا كَانَ لَنَآ ﴾ واتە: هەرگیز نابێ‌و بۆ ئێمە ناگونجێ ﴿ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ ﴾ بەڵکو خوا ﷻ بە تاک‌و تەنها دەپەرستین‌و بە دڵسۆزیەوە بەندایەتی بۆ دەکەین ﴿ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ واتە: ئەمەش لە گەورەترین منەت‌و فەزڵ‌و چاکەکانی خوایە بەسەرمانەوە، وە لەسەر ئەو کەسانەی خوا ﷻ هیدایەتی داون وەک چۆن ئێمەی هیدایەت داوە، بێگومان هیچ فەزڵێک لە منەتی خوا ﷻ گەورەتر نیە بەسەر بەندەکانیەوە بە پێدانی ئیسلام‌و ئاینی بەهێز، هەر کەسێک وەری بگرێ‌و ملکەچی بکات، ئەوە بەشی خۆی بردوە، وە گەورەترین نازو نیعمەت‌و چاکەی بەدەست هێناوە ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴾ بۆیە منەت‌و چاکەیان بۆ دێت وەریناگرن‌و بە مافەکانی خوا ﷻ هەڵناسن، لەمەدا هاندان بەدی دەکرێ بۆ ئەو ڕێگایەی کە یوسف خۆی لەسەریەتی، (یوسف) کاتێک کە زانی ئەو دوو گەنجە بە چاوێکی گەورەو ڕێزەوە تەماشای دەکەن، وە ئەو چاکە خوازو مامۆستایە بۆی باسکردن کە ئەو حاڵەتەی من لەسەری دەڕۆم، هەمووی لە فەزڵ‌و چاکەی خوایە، کە منەتی کردوە بەسەرمدا بە وازهێنان لە شیرک‌و شوێنکەوتنی باوو باپیرم، بەم شێوەیە گەیشتم بەوەی کە دەیبینم، بۆیە پێویستە لەسەر ئێوەش هەمان ڕێگای من بگرنە بەر.

پاشان بە ئاشکرا بانگی کردن فەرمووی: ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴾ واتە: (ئەی هاوەڵانی زیندانیم) چەند پەرستراوێکی

لاواز (باشتره)، كـه هیـچ خێـرو چاكەیەكیـان لەدەسـت نایـەت، وە ناتوانـن بەخشـنو بەرگـری بكـەن، هـەر یەكـە جیـا جیـان لـە داروبەردوخـتو بـەردو فریشـتەكان، وە بێجگـە لەوانـەش لـە جۆرەهـا پەرسـتراوی تـر كـە موشـریكەكان دەیپەرسـتن، یاخـود ﴿أَمِ ٱللَّهُ﴾ ئـەو خوایـەی كـە هەمـوو سـیفاتە تەواوەكانـی لـە خۆگرتـوە ﴿ٱلْوَٰحِدُ﴾ لـە زاتو سـیفەتو كردەوەكانیـدا، هیـچ هاوەڵێكـی نیـە لەوانـە ﴿ٱلْقَهَّارُ﴾ كـە هەمـوو شـتەكان ملكەچـی توانـاو دەسـەڵاتی ئـەون، ئـەوەی ویسـتی بـووە، وە ئـەوەی نەیویسـت نابـێ ﴿مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ ٥٦﴾هـود. (واتـە: هیـچ گیانلەبەرێـك نیـە مەگـەر خـوا دەسـەڵاتدارە بەسـەریدا)، بێگومـان ئـەوەی زانـراوە ئـەوەی كـە ئەمـە وەسـفی بێـت، باشـترە لـەو پەرسـتراوە جیـا جیایانـەی كـە تەنهـا نـاون، هیـچ تەواویەكیـان تێدانیـە، وە هیـچ كردەوەیەكیشـیان نیـە، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسْمَآءً سَمَّيْتُمُوهَآ﴾ واتـە: ناوتـان لێنـاونو كردووتانـن بـە پەرسـتراو كـە ئەویـش هیـچ نیـە، وە هیـچ سـیفەتێكی پەروەردگارێتـی لـە خـۆ ناگرێـت ﴿مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ﴾ واتـە: بەڵكـو بەڵگـەی نـاردوە بـە قەدەغەكـردنو دوور كەوتنـەوە لـە عیبـادەت كردنیـانو ڕوون كردنـەوەی بەتاڵـیو بـێ بنەماییـان، ئەگـەر خـوا ﷻ هیـچ بەڵگەیەكـی دانەبەزاندبـێ، ئـەوە هیـچ ڕێگـاو هـۆكارو بەڵگەیـەك نیـە بـۆ پەرسـتنیان، چونكـە حوكـمو بڕیـار بـۆ خـوای تـاكو تەنهایـە، تەنهـا ئـەو فەرمـان دەكاو قەدەغـە دەكات، وە شـەرعو یاسـاو ڕێسـا دادەنـێ، هـەر ئـەو فەرمانتـان پێـدەكات، ﴿أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾ واتـە: ئاینـی ڕاسـت كـە دەیگەیەنێتـە هەمـوو خێـرو چاكەیـەك، هـەر ئاینێكـی تـر جگـە لـە ئیسـلام ڕاسـتو دروسـت نیـە، بەڵكـو لارو گێـرە دەیگەیەنێتـە هەمـوو شـەڕو خراپەیـەك ﴿وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾ بـەلام زۆربـەی خەڵكـی حەقیقەتـی شـتەكان نازانـن، ئەگەرنـا جیـاوازی نێـوان بەندایەتـی خـوای تـاكو تەنهـای بـێ هـاوەڵو نێـوان هاوەڵدانـان زۆر ڕوونو ئاشـكرایە.

بـەلام بەهـۆی نەزانینـی زۆرینـەی خەڵـك بـەو حەقیقەتـە، ئـەوە ڕوویـدا كـە ڕوویدا لـە شـیركو هاوەڵدانـان، یوسـف ؏ بانگـی هـەردوو هاوڕێـی بەندیخانـەی كـرد بـۆ بەندایەتـی خـوای تـاكو تەنهـاو بـە دڵسـۆزی ملكەچـی بكـەن، دەگونجـێ

هەردووکیان وەلامیان دابێتەوەو شوێنی کەوتبن، نیعمەتیان بەسەردا ڕژابێ، وە دەشگونجێ ئەوان بەردەوام بووبن لەسەر شیرکو هاوبەش دانان، بەو شێوە بەلگەیان لەسەر پێویست بووبێ (إقامة الحجة)، پاشان یوسف عليه السلام خەوەکەی بۆ لێکدانەوە، پاش ئەوەی کە بەلێنی پێدابوون، جا فەرمووی:

(٤١): ﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ ﴾:

﴿ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا ﴾ واتە: ئەوەی کە بینی تریٚ دەکات بە شەراب، ئازاد دەبێ لە زیندان ﴿ فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗا ﴾ واتە: شەراب دەرخواردی پاشاکەی دەدات کە پێشتر خزمەتی کردوە، ئەوە بێگومان لە زیندان ڕزگاری دەبێ ﴿ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ ﴾ واتە: ئەوەی کە بینی نان بەسەر سەریەوەیە باڵندە لێی دەخوات ﴿ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦ ﴾ ئەو نانەی کە باڵندە لێی دەخوارد، بە گۆشتی سەریو ئەوەی لە ناویدایە لە مۆخی سەری لێکدایەوە، ئەو ناخرێتە ناو گۆڕەوە لە باڵندە بپارێزرێ، بەڵکو هەڵدەواسرێ لە شوێنیکدا دادەنرێ، باڵندەکان دەتوانن لێی بخۆن.

پاشان هەواڵی پێدان ئەو لێکدانەوەی کە بۆ خەونەکانی کردوە هەر دەبێ ڕووبدات، دەفەرموێ: ﴿ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴾ واتە: پرسیاری لێکدانەوەو تەفسیر کردنتان دەکرد.

(٤٢): ﴿ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾

﴿ وَقَالَ ﴾ واتە: یوسف عليه السلام، ﴿ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ﴾ ئەوجا یوسف کە زانی شەراب گێرەکە ڕزگاری دەبێو دەچێ بۆلای پاشا پێی وت: ﴿ ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ ﴾ واتە: بەسەرهاتی منی لە لا باس بکە، بەڵکو دڵی نەرم بێو لەو زیندانیە ڕزگارم بکات ﴿ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ ﴾ واتە: شەیتان یادی خوای لە بیری شەراب گێرەکە بردەوە، لە کۆی ئەوانەشدا، بیرچوونەوەی باسکردنی یوسف بوو عليه السلام کە هەق وابوو بە چاکترین شێوە پاداشتی بداتەوە، بە هۆی ئەوەی خوا ﷻ کارووبارەکەی بۆ ڕێکخست.

﴿ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴾ وشەی (بضع) لە سێ ساڵەوە بۆ نۆ ساڵە،

لەبەر ئەمەیە وتراوە: حەوت ساڵ لە زیندان مایەوە، کاتێک کە خوا ﷻ ویستی کارەکەی تەواو بکاتو بڕیاری دەرچوونی بدات لە زیندان، هۆکارێکی بۆ ئەوە دانا کە ببێتە هۆی دەرچوونی یوسفو بەرزبوونەوەیو ڕێزو پلەو پایەی، کە ئەویش خەوی پاشا بوو.

(٤٣-٤٩): ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ
سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾
قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ
أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ فَأَرۡسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ
يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ
يَعۡلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ
﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ
بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾:

کاتێک خوا ﷻ ویستی یوسف لە زیندان دەربێنێ، ئەم خەوە سەرسووڕهێنەرەی پێشانی پادشادا، کە لێکدانەوەکەی هەموو خەڵکی دەگرێتەوە، تا لەسەر دەستی یوسف لێک بدرێتەوەو گەورەیی دەربکەوێو زانستی ئاشکرا ببێ، بۆ ئەوەی ببێتە پلەو پایەیەکی بەرز بۆی لە دونیاو دوارۆژدا، وا گونجا پاشا ئەو خەوە ببینێ، کە هەموو بەرژەوەندیەکان بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوەو پەیوەندیان بە خواوە هەیە.

بەو شێوەیە ئەو خەوە دەبێتە مەراقی پاشا، هەموو زاناو شارەزایانی گەلەکەی کۆدەکاتەوە پێیان دەڵێ: ﴿إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ﴾ واتە: لە خەومدا بینیم حەوت مانگا (عجاف)ی لەڕوو لاوازو بێهێزو بێ توانا، حەوت مانگای قەڵەو بەهێزو بە توانا دەخۆن ﴿وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ﴾ واتە: بینیم حەوت گوڵە گەنمی سەوز حەوت گوڵە گەنمی ﴿يَابِسَٰتٖ﴾ وشکیان دەخوارد ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ﴾ لەبەر ئەوەی لێکدانەوەی هەموویان یەک شێوە بوو، ﴿إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ﴾ دەستەوئەژنۆو دەستەوەستان مانەوە نەیانزانی چۆن لێکی بدەنەوەو تەفسیری بکەن،

قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ٤٤
وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ
فَأَرۡسِلُونِ ٤٥ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ
سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ
وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٤٦ قَالَ
تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا
قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ٤٧ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ
مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ٤٨ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ
عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ٤٩ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي
بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ
ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ٥٠
قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ
لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ
ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٥١ ذَٰلِكَ
لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ٥٢

بۆیە وتیان: ﴿أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖ﴾ واتە: خەوێکە هیچ بەرهەم ناهێنێ، وە هیچ لێکدانەوەیەکی بۆ ناکرێ، ئەمە جەختکردنەوە بوو لەسەر شتێک کە نەیاندەزانی، وە بیانوو هێنانەوەیەک بوو لە لایەن ئەوانەوە بەوەی کە ناکرێتە بیانوو، پاشان وتیان: ﴿وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ﴾ واتە: ئێمە تەنها خەوی ڕاستەقینە (الرؤیا) لە یەک دەدەینەوە، بەڵام خەوی (الأحلام) تێکەڵو پێکەڵ لە لایەن شەیتانەوەیە، یان بە هۆی بیرو خەیاڵەوە تەفسیر ناکەین، ئەوانە نەفامیو سووربوونیان لەسەر ئەوەی کە خەوی تێکەڵو پێکەڵە کۆکردەوە، لەگەڵ سەرسوورمانیان بە نەفسو ئارەزوی خۆیان لەو ڕوانگەی ئەوان نەیانوت: ئێمە نازانین لێکی بدەینەوە، ئەمەش لەو کاروباراننەیە کە دروست نیە بۆ خاوەن ئاینو بەڵگە، بەهەمان شێوە ئەمەش لە بەزەیی خوایە بەرانبەر یوسف ﷺ بێگومان ئەگەر سەرەتا تەفسری کردبایە -پێش ئەوەی نیشانی پیاوماقووڵانی گەلەکەیو شارەزایانی بدابا نەیانتوانیبایە- ئەوە کاریگەری زۆر نەدەبوو، بەڵام کاتێک کە خستیە ڕوو ئەوانیش نەیانتوانی وەڵامی بدەنەوە، بوو بە مایەی ئەوەی کە پادشا زیاتر گرنگی پێ بدات، یوسف لێکی دایەوە، بۆیە بەلایانەوە زۆر مەزن بوو، ئەمەش وەکو ئاشکرا کردنی فەزڵی ئادەمە بە سەر فریشتەکانەوە بە زانستو زانیاریی، پاش ئەوەی پرسیاری لێکردنو نەیانزانی، پرسیاری لە ئادەم کرد ئەویش هەموو ناوەکانی فێر کردن، بەو شێوەیە فەزڵو چاکەی دەستەبەر بوو، وەک چۆن دەرکەوت فەزڵو چاکەی باشترین دروستکراوی موحەممەد ﷺ لە قیامەتدا دەردەکەوێ، کاتێک خوا ﷻ بە ئیلهام دەیخاتە دڵی بەدیهێنەرەکانەوە کە داوای تکا لە ئادەم بکەن، پاشان لە نوح پاشان لە ئیبراهیم، پاشان لە مووسا پاشان لە عیسا (علیهم السلام) ئەوانیش پاساوو بیانوو دێننەوە، پاشان دەڕۆن بۆ لای موحەممەد پێی دەڵێ: (أنا لها أنا لها) واتە: من تایبەتم بە ئەوە، من تایبەتم بە ئەوە.

پاشـان تـکا بـۆ هەمـوو بەدیهێنـراوەکان دەکات بـەو شـێوەیە پلەو پایـەو مەقامـی مەحمودی پێـدەدرێ، کـە یەکەمیـن‌و کۆتـاکان ئاواتـی بۆ دەخـوازن، پاکی‌و بێگـەردی بۆ ئـەو خوایەی نـەرم‌و نیانی شـاراوەتەوەو بـە وردی چاکەکانـی دەگەیەنێت بـۆ تایبەترینی بەنـدە پاڵفتەکانی.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِى نَجَا مِنْهُمَا ﴾واتـە: لـەو دوو گەنجـەی (کە لـە زیندان پێکەوە بوون) ئەو کەسـەیە کـە لـە خەونیـدا بینی ئەو ترێ دەکات بە شـەراب، ئەو کەسـەی کە یوسـف ﷺ وەسـێتی بۆ کـرد کە لە لای پادشـا باسـی بـکات، ﴿ وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ ﴾واتە: یوسـفی بیر کەوتـەوە، کاتێ کـە خەونەکـەی بـۆ لێکدانەوە، وە ئەوەشـی کە ئامۆژگـاری پێکردبـوو، زانی کە ئـەو دەتوانی ئـەو خەونـە لێکبداتـەوە، دوای ماوەیەکی زۆرو چەند سـاڵێک، وتـی: ﴿ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأْوِيلِهِۦ فَأَرْسِلُونِ ﴾(مـن هەواڵتـان پێـدەدەم بە مانـای لێکدانەوەی خەونەکـە بمنێرن) بۆ لای یوسـف تا پرسـیاری لێبکەم.

ئنجـا ناردیـان، هـات بـۆ لای، یوسـف لێـی تـووڕە نەبوو لەسـەر لـە بیـر چوونـەوەی، بەڵکو گوێی بۆ پرسـیارەکەی گرت‌و وەڵامیشـی دایـەوە، وتـی: ﴿ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ ﴾واتە: زۆر ڕاسـتگۆ لە گوفتارو کرداریـدا، ﴿ أَفْتِنَا فِى سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعِ سُنۢبُلَـٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَـٰتٍ لَّعَلِّىٓ أَرْجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾(هەواڵمـان پێـدە لەبـارەی «لـە خەونـدا دیتنـی» حەوت مانگـای قەڵـەو، کە حەوتی لـەڕ دەیانخـواردن، وە حـەوت گوڵە دانەوێڵـەی سـەوزو حەوتی دیکەی وشـک، بەڵکـو بگەڕێمەوە لای خەڵک بەڵکـو بزانن، «چۆن لەگەڵ ئـەو خەونەی پاشـادا مامەڵـە بکەن؟»).

بـە ڕاسـتی ئەوان تامـەزرۆی لێکدانـەوەن‌و گرنگی زۆری پێـدەدەن، یوسـف ﷺ لێکیدایەوەو وتـی: حـەوت مانگـا قەڵەوەکـەو حـەوت گوڵە گەنمـە سـەوزەکە، حەوت سـاڵی پڕ لـە نازو نیعمـەت‌و هەرزانیـن، وە حـەوت مانگا لـەڕو لاوازەکـەو حـەوت گوڵەگەنمە لـەڕو لاوازەکە، بریتیـن لە سـاڵانێکی گرانی‌و قـات‌و قڕی‌و برسـێتی، دەکرێ مەبەسـت لەوەدا خوا شـارەزاترە خۆشـگوزرانی‌و برسـێتی بێ، کشـت‌و کاڵ لەسـەر ئـەوە بونیاد دەنـرێ، ئەگەر خۆشـگوزەرانی دەسـتەبەر بـوو کشـت‌و کاڵ‌و بەروبـووم بەهێـز دەبێ‌و شـێوەی جـوان دەبـێ‌و بەرهەمی زۆر دەبێ، وە برسـێتیش پێچەوانـەی ئەوەیە.

ئـەوە بـوو بـە زۆری مانگا لەو سـەردەمەدا بۆ کێلانـی زەوی‌و ئاودانـی بەکاردەهێنـرا، وە گەنم باشـترین بژێـوی‌و چاکترینیان بوو، بەو شـێوە دەربڕیـوە لەبەر گونجان، کۆی کـردەوە بۆیان لـە لێکدانەوەکەیـدا لـە نێـوان لێکدانەوەو ئاماژە بـەوە کە دەیکـەن‌و خۆیانی بۆ ئامـادە دەکەن،

لـە خـۆ ئامادەکردن لە سـاڵی خۆشـیو هەرزانیـدا بۆ سـاڵانی گرانـیو بێبارانی، جـا فەرمووی: ﴿ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا ﴾ (حـەوت سـاڵان بە ڕێکو پێکی کشـتوکاڵی دەغـڵو دان بکەن) واتە: بەسـەریەکەوە، ﴿ فَمَا حَصَدتُّمۡ ﴾ واتە: وازی لێ بهێنـن ﴿ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ ﴾ (بە گوڵەکەیەوە بیکەنـە عەنبـار)، چونکـە ئـاوا دەپارێزرێ (لە سـونو کوللـەو گیانەوەری تـر) ﴿ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ﴾ واتـە: بـە هەمان شـێوە خواردنی خۆتانـی لێ ئامادە بکەن لەو سـاڵانەی کە سـەوزن، بـەڵام بـا کەم بـێ، وە ئـەوەی هەڵیدەگـرن با زۆر بـێو چاکو بە سـوودیش بێ.

﴿ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ ﴾ واتـە: لـە ئەو حەوت سـاڵە خـۆشو پڕ بە پیتـە ﴿ سَبۡعٞ شِدَادٞ ﴾ واتە: حەوت سـاڵی گرانـیو قاتو قڕیـی ﴿ يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ ﴾ واتە: هەموو ئەوانـەی هەڵتانگرتوە دەیخـۆن ئەگـەر چـی زۆریـش بێـت ﴿ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ﴾ واتـە: کەمێکـی نەبـێ کە بۆ تـۆوی هەڵدەگرن.

﴿ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ ﴾ واتـە: پـاش ئـەو حەوت سـاڵە ناخۆشـە ﴿ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ﴾ واتـە: لـەو سـاڵەدا بـاران زۆر دەبـێو خواردەمەنـی پەیـدا دەبـێ، تـا تـرێ زۆر دەبـێو دەیگوشـنو وێنـەی ئەویش، لەوانەیـە بەڵگە هێنانەوەی لەسـەر ئەم سـاڵە پـڕ لە پیتو بەرەکەتـە، لەگـەڵ ئـەوەدا بـە روونی لـە خەوەکەی پاشـادا باس نەکـراوە، چونکە تێگەیشـتوە بـە ئەندازەکردنـی حەوت سـاڵی گرانی، ئەو سـاڵەی کە بە دوایـدا دێ نارەحەتیـەکان لادەبات، بێگومـان زانـراوە حەوت سـاڵی قـاتو قڕیو برسـێتی لاناچێت مەگـەر بە سـاڵێکی پڕ پیتو بەرەکـەت نەبـێ، ئەگەرنـا ئـەو پێش بینیە هیـچ سـوودێکی نابێت.

کاتێـک کـە نێردراوەکـە گەڕایەوە بۆ لای پادشـا، هەواڵـی پێدان بە لێکدانەوەی یوسـف ﷺ بـۆ خەوەکە، سـەریان سـوورما لێـی، وە زۆر دڵیان پێـی خۆش بوو.

(٥٠-٥٧): ﴿ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ
ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ٥٠ قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ
حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ
وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ٥١ ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ٥٢ وَمَآ
أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٣ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ
أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ٥٤ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي
حَفِيظٌ عَلِيمٞ ٥٥ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن
نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٥٦ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ٥٧ ﴾:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ﴾(پاشـا بەوانـەی وتـن کـە) کە لـە دەوریدا بـوون ﴿ ٱئْتُونِي بِهِۦ ﴾واتە: یوسـف ﷺ بـەوەی دەریبهێنن لە زینـدانو بیهێنن بۆ لای، کاتێ کـە نێردراوەکە هـات بـۆ لای یوسـف ﷺ فەرمانی پێکرد لە لای پاشـا ئامـادە بێ، ڕێگری کرد لـەوەی کە لە زیندانـی بێتـە دەرەوە، تا بێتاوانی دەسـەلمێ، ئەمەش لـە ئارامیو ژیریو بۆچوونـی تەواویەتی.

﴿ قَالَ ﴾بـە نێردراوەکەی وت: ﴿ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ ﴾واتە: (بگەڕێوە) بۆ لای پاشـا ﴿ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ ﴾واتـە: لێـی بپرسـە بۆچی ئـەو ژنانە دەسـتی خۆیانیان بڕی، بێگومـان کارەکەیـان ڕوونو ئاشـکرایە ﴿ إِنَّ رَبِّي بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ ﴾پاشـا ئافرەتەکانـی ئامـادە کـرد، وتـی: ﴿ مَا خَطْبُكُنَّ ﴾واتـە: حاڵتـان چـی بـوو؟ ﴿ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ ﴾ ئایـا شـتێکتان لێـی بینـی مایـەی گومـان بـێ؟ بەریـان کـردو ﴿ قُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ﴾(واتـە: خـوا بـەو ڕۆژە نـەکات ئێمـە بوختانـی بۆ بکەیـن، ئێمە هیـچ جۆرە خراپەیەکمـان لـە یوسـف نەبینیوە) نـە زۆرو نە کەم، ئێسـتا هۆکارەکـە نەما کـە تۆمەتەکەی لەسـەر بونیـاد نرابـوو، شـاژنی عەزیزی میسـر هیچی بە دەسـتەوە نەمـا ﴿ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٰٔنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ ﴾(واتـە: ژنەکـەی عەزیـزی میسـر وتی: ئێسـتا بـێ پەردە هەقو ڕاسـتی) ڕوون بوویـەوەو ئاشـکرا بـوو، پـاش ئـەوەی ئێمـە تـاوانو تۆمەتمـان داوە پاڵی، بێتـە مایەی ئـەوەی بچێتـە زینـدان ﴿ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴾(یوسـف ڕاسـتگۆیە لە) وتەکانـیو بەریبونـیو پاکیـدا ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ئـەو دانپێدانانـەی کـە دانـم پێـدا نا، مـن هەوڵمداو زۆرم لـە یوسـف کـرد ﴿ لِيَعْلَمَ أَنِّي لَمْ أَخُنْهُ بِٱلْغَيْبِ ﴾(واتـە: تـا بزانێ مـن لە پەنهـان خیانەتم لێنەکردوە).

دەگونجـێ مەبەسـتی پیاوەکەی بێ، واتـە: بۆیە دانم نا بـە هەڵەکەمدا کە من هەوڵـم داوەو زۆرم لێکـردوە لەگەڵ یوسـفدا تـا دڵنیا بێت هیـچ کات لە پەنهـان خیانەتم لێ نەکردوە، دەشـگونجێ مەبەسـت لـەوەدا ئـەوە بـێ، تا یوسـف بزانـێ کاتێ دانـم پێدانـا کە مـن هەوڵم لەگـەڵ داوەو زۆرم لێکـردوە، ئەو ڕاسـتگۆیە، مـن لەو کاتەش کە دیـار نەبووە خیانەتـم لێنەکردوە.

﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِي كَيْدَ ٱلْخَآئِنِينَ ﴾واتـە: بێگومان هەموو خیانەتکارێـک دەبێ باجی خیانەتەکەی بـدات، وە دەبێت کارەکەی ئاشـکرا بێت.

﴿وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ
إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥٣ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ
لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ٥٤
قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ ٥٥ وَكَذَٰلِكَ
مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ
بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٥٦ وَلَأَجۡرُ
ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ٥٧ وَجَآءَ
إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ
٥٨ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ أَلَا
تَرَوۡنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ٥٩ فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي
بِهِۦ فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ ٦٠ قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ
وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ٦١ وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ
لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ
٦٢ فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ
فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ٦٣﴾

پاشان کاتێ کە لەم قسەیەدا جۆرێک لە تەزکیەو خۆ بە پاک زانینی نەفس‌و دەروونی خۆی تێدایە، ئەو هیچ تاوانێکی نەبوو لە حاڵی یوسفدا، هەستی پێکردو وتی: ﴿ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ ﴾ واتە: لە هەوڵدان‌و حەز پێکردن‌و سووربوون‌و فرت‌و فیڵ کردن ﴿ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ ﴾ واتە: زۆر فەرمانی خراپ بە خاوەنەکەی دەکات بە فاحیشەو گوناهی ناشرین، نەفس‌و دەروون ئامرازی گواستنەوەی شەیتانن، هەر لەوێوە دەچێتە ژوورەوە بۆ لای مرۆڤ ﴿ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ ﴾ (مەگەر کەسێک خوا) ڕزگاری بکات لە نەفس‌و دروونی، تا نەفسەکەی ببێتە ئارامگر بۆ لای پەروەردگاری، ملکەچی داواکاری هیدایەت بێ، سەرپێچی لە داواکردنی خراپ بکات، ئەوەش لە نەفس‌و دەروونەوە نیە، بەڵکو لە فەزڵی خواوەیە بۆ بەندەکەی ﴿ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ ﴾ واتە: ئەو لێبوردەیە بۆ ئەو کەسەی بوێری بکات بۆ تاوان‌و سەرپێچی کردن، ئەگەر تەوبەی کردو گەڕایەوە ﴿ رَّحِيمٞ ﴾ بە وەرگرتنی تەوبەو داوای لێخۆشبوونەکەی، وە سەرکەوتنی بۆ کردەوەی چاک، ئا ئەمە پێکانە، ئەمە وتەی شاژنی عەزیزی میسرە، نەک وتەی یوسف ﷺ، چونکە لە میانەی قسەکانی ئەودایە، یوسف ﷺ ئەو کات لە زینداندا بوو ئامادە نەبوو (لەو مەجلیسە).

کاتێک پاشاو خەڵکی پاکی یوسفیان بۆ ڕوون بوویەوە، پاشا نێردراوێکی نارد بە شوێنیداو وتی: ﴿ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ ﴾ واتە: بیکەم بە یارو هاوڕێی خۆم‌و لە خۆم نزیکی بخەمەوە، بە ڕێزەوە هێنایان ﴿ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ ﴾ (واتە: کاتێ کە دواندی) سەری سووڕما بە قسەکانی، پلەو پایەی لە لای زیاتر بوو،

پێـی وت: ﴿ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا ﴾واتـە: لـە لای ئێمـە ﴿ مَكِينٌ أَمِينٌ ﴾واتـە: بەڕێـزیو جێگـای باوەڕپـت، دەسـتپاکی لەسـەر نهێنیەکانمـان.

﴿ قَالَ ﴾یوسـف لەبـەر بەرژەوەنـدی گشـتی وتـی: ﴿ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِ ﴾ واتـە: سـەرکارو بەڕێوەبردنـی خەزێنەکانـی شـاخو دەشـتەکان، وەکیـلو پارێـزەرو زانـا ﴿ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴾واتـە: پارێـزەری ئـەوەمو دەیگرمـە ئەسـتۆ، شـتیک بـە زایـە نـادەم، مەگـەر لـە شـوێنی خـۆی دایدەنێـم، نـاوەوەو دەرەوە قایـم دەکـەمو دەیپارێـزم، زانـام بـە چۆنیەتـی ڕێکخسـتنو پێـدانو پێنـەدان، وە بـە هەمـوو جۆرەکانی بەڕێوەبـردن، ئەمـە سـوربوونی یوسـف نەبـوو لەسـەر دەسـەڵات، بەڵکـو حەزێـک بـوو بـۆ بەرژەوەنـدی گشـتی، خـۆی دەناسـی لـە توانـاو ئەمانـەتو دەسـتپاکیدا، وە پاراسـتنی بـە جـۆرێ کـە ئـەوان نەیاندەزانـی، بۆیـە داوای لـە پاشـا کـرد خەزێنـەی وڵات بخاتـە ژێـر دەسـتی، پاشـا لەسـەر خەزێنـەی زەوی داینـاو دەسـەڵاتی پێـدا.

خـوا فەرموویەتـی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾واتـە: بـەم هـۆکارو پێشـەکیانەی کە باسـکرا ﴿ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُ ﴾لـە ژیانـی خـۆشو نـازو نیعمەتـی بـەر فـراوانو پلـەو پایـەو ڕێـز ﴿ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُ ﴾واتـە: ئەمـە لـە ڕەحمەتـی خـواوە بـوو بـۆ یوسـف ﷺ کـە پێـی بەخشـی، تەنهـا کـورت نەکراوەتـەوە لـە دنیـادا ﴿ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾(واتـە: هەرگیـز پاداشـتی چاکـەکاران نافەوتێنیـنو ونـی ناکەیـن) یوسـف ﷺ لـە پێشـەوایانی چاکەکارانـە، لـە دنیـادا نـازو نیعمەتـی پێبەخشـراوە، لـە دوارۆژیشـدا بەهرەمەنـد کـراوە، بۆیـە فەرموویەتـی: ﴿ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٌ ﴾لـە پاداشـتی دونیـا ﴿ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴾واتـە: بـۆ ئـەو کەسـەی تەقـواو خۆپارێـزی پێکـەوە کـۆ کردوەتـەوە، بـە تەقـوای خـوا ﷻ واز لـە قەدەغەکـراوەکان دەهێنـرێ لـە تاوانـی بچـووکو گـەورە، بـە بـڕوای تـەواوو بەڕاسـتدانانی دڵ دەسـتەبەر دەبـێ، بـەوەی کـە خـوا ﷻ فەرمانـی پێکـردوە بەڕاسـت دابنـرێ، وە کردەوەکانـی دڵو جەسـتە شـوێنی بکـەون لـە فـەرزو سـوننەتەکان.

(٥٨-٦٨):﴿ وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ٥٨ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ أَلَا تَرَوۡنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ٥٩ فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ ٦٠ قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ ٦١ وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ

أَهْلِهِمْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٦٢﴾ فَلَمَّا رَجَعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيهِمْ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلْكَيْلُ فَأَرْسِلْ
مَعَنَآ أَخَانَا نَكْتَلْ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿٦٣﴾ قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ
عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ ۖ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَـٰفِظًا ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُوا۟ مَتَـٰعَهُمْ وَجَدُوا۟
بِضَـٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ ۖ قَالُوا۟ يَـٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِى ۖ هَـٰذِهِۦ بِضَـٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا ۖ وَنَمِيرُ أَهْلَنَا
وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ۖ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ
تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ ۖ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ
﴿٦٦﴾ وَقَالَ يَـٰبَنِىَّ لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ ۖ وَمَآ أُغْنِى عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ
مِن شَىْءٍ ۖ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ۖ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ مِنْ
حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغْنِى عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِى نَفْسِ يَعْقُوبَ
قَضَىٰهَا ۚ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَـٰهُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾:

کاتێک کە یوسف ﷺ کرا بە بەڕێوەبەری خەزێنەی وڵات، بە جوانترین شێوە سەرپەرشتی کرد، لەو ساڵانەی کە پڕ پیتو بەرەکەتو بارانـاوی بوو، لە هەموو زەوی میسردا کشتوکاڵی زۆری کرد، شوێنی گەورەی بۆ دیاری کردن، خواردنێکی زۆری تیایدا دانـاو پاراستنی، کاتێ کە ساڵانی برسێتیو قاتو قڕیی هاتە پێش فەلەستینیشی گرتەوە کە یەعقووبو منداڵەکانی تیایدا دەژیان، یەعقووب منداڵەکانی نارد بۆ میسر بۆ بەدەستهێنانی هەندێ ڕزقو ڕۆزی ﴿ وَجَآءَ إِخْوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَعَرَفَهُمْ وَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾ واتە: (کاتێک براکانی چوونە لای، ئەو براکانی ناسیەوەو بەڵام براکانی یوسفیان) نەدەناسیەوە ﴿ وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ ﴾ واتە: بۆی پێوانە کردن وەک چۆن بۆ غەیری ئەوان پێوانەی دەکرد، شێوەو پێدانی زۆر چاک بوو، بۆ هەر یەکێک باری حوشترێ زیاتری پێنەدەدا، دیارە پرسیاری لە نەژادو بارو دۆخیان کردبوو، ئەوانیش هەواڵیان پێدابوو کە برایەکی تریان هەیە لە لای باوکیەتی ئەویش بنیامینە، وە ﴿ قَالَ ﴾ پێی وتن: ﴿ ٱئْتُونِى بِأَخٍ لَّكُم مِّنْ أَبِيكُمْ ﴾ پاشان هانیدان بۆ هێنانی، وتی: ﴿ أَلَا تَرَوْنَ أَنِّىٓ أُوفِى ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴾ (واتە: نابینن من بە چاکی پێوانەم کردو بارتان دەدەمی)و میوانداریشم کردن بە جوانترین شێوە، پاشان ترساندنی بە نەهێنانی، پێی وتن: ﴿ فَإِن لَّمْ تَأْتُونِى بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِى وَلَا تَقْرَبُونِ ﴾ ئەویش بۆ ئەوەی ناچاریان بکات بیهێنن ﴿ قَالُوا۟ سَنُرَٰوِدُ

﴿عَنۡهُ أَبَاهُ﴾ (واتە: هەوڵ لەگەڵ باوکیدا دەدەین) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە یەعقووب (عليه السلام) خووی پێوە گرتووەو ئارام ناگری بێ یوسف، لە پاش یوسف بۆن بە ئەوەوە دەکات، بۆیە پێویستی بە هەوڵدانو نەخشەدانان هەیە لە ناردنی لەگەڵیاندا ﴿وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ﴾ (وتیان: ئەوە ئەنجام دەدەین) کە فەرمانت پێکردین ﴿وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ﴾ یوسف (عليه السلام) بەوانەی وت کە لە خزمەتیدا بوون: ﴿ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ﴾ واتە: ئەو نرخەی کە شتەکانیان پێ کڕیوە ﴿فِي رِحَالِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ﴾ واتە: (بیخەنە ناو بارەکانیانەوە) بۆ ئەوەی شتو مەکەکانیان بناسنەوە کاتێک دەگەڕێنەوە بۆ لای کەسو کاریان ﴿لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ﴾ لەبەر ئەوەی شەرمەزار نەبن بەو شێوەیە بیبەنەوە، وەک ئەوەی وتراوە، بەڵام ئەوەی کە ئاشکرایە ئەو ویستی بە هۆی چاکە کردن لەگەڵیاندا، بە پێدانی پێوانەی تەواو هانیان بدات، پاشان گەڕانەوەی کەلوپەلەکانیان بە شێوەیەک کە هەستی پێ نەکەن، چونکە چاکە پێویستە بە تەواوی ئەنجام بدرێ.

﴿فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ﴾ واتە: ئەگەر براکەمان لەگەڵماندا نە نێری ﴿فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ﴾ واتە: تا ببێتە هۆی ئەوەی پێوانەمان پێبدەن (بە دەستی بەتاڵ نەگەڕێینەوە) پاشان پابەند بوون بە پاراستنی، وتیان: ﴿وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ (دەیپارێزین) لەوەی کە تووشی ناڕەحەتی ببێت.

قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن
قَبْلُ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ٦٤ وَلَمَّا فَتَحُوا۟
مَتَٰعَهُمْ وَجَدُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا
مَا نَبْغِى هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا وَنَحْفَظُ
أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ٦٥ قَالَ
لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأْتُنَّنِى
بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا
نَقُولُ وَكِيلٌ ٦٦ وَقَالَ يَٰبَنِىَّ لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ
وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ وَمَآ أُغْنِى عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن
شَىْءٍ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ
ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ٦٧ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ
يُغْنِى عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِى نَفْسِ يَعْقُوبَ
قَضَىٰهَا وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ لِّمَا عَلَّمْنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ
لَا يَعْلَمُونَ ٦٨ وَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَخَاهُ
قَالَ إِنِّىٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ٦٩

﴿ قَالَ ﴾ یەعقووب عليه السلام پێی وتن: ﴿ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ ﴾ واتە: پێشتر پابەند نەبوون بە پاراستنی یوسف، لەگەڵ ئەمەدا پەیمانەکەتان بەجێ نەهێنا، من متمانە بە ئێوە ناکەم کە پابەندی پاراستنی ببن، بەڵکو متمانە بە خوا جل جلاله دەکەم ﴿ فَٱللَّهُ خَيْرٌ حَٰفِظًا وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ واتە: بە حاڵم دەزانێ، ئومێدم وایە کە ڕەحمم پێبکات، بیپارێزێ‌و بیگەڕێنێتەوە بۆم، وەک ئەوە وایە لەم قسەیەدا دڵی نەرم بووبێ بە ناردنی لەگەڵیاندا ﴿ وَلَمَّا فَتَحُوا۟ مَتَٰعَهُمْ وَجَدُوا۟ بِضَٰعَتَهُمْ رُدَّتْ إِلَيْهِمْ ﴾ (کاتێک بارەکانیان کردنەوە «ئازووخەی نێو بارەکانیان تەماشا کرد» دەستمایەکەیانیان بینی بۆ لایان گێڕدرابۆوە) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوان زانیویانە یوسف عليه السلام بە مەبەست بۆی گەڕاندونەتەوە، ویستویەتی بیکاتەوە بە موڵکی خۆیان ﴿ قَالُوا۟ ﴾ بە باوکیان وت: -وەک هاندانێک بۆ ناردنی براکەیان (بنیامین) لەگەڵیاندا-: ﴿ يَٰٓأَبَانَا مَا نَبْغِى ﴾ (ئەی باوکی بەڕێزمان) واتە: لە پاش ئەم هەموو ڕێزە داوای چی بکەین، بە تەواوی پێوانەی پێداین، کەلوپەلەکەی بۆ گەڕاندینەوە بە چاکترین شێوە، کە تەواوی دڵسۆزی‌و ڕەوشت بەرزی لە خۆ دەگرێ؟ ﴿ هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتْ إِلَيْنَا وَنَمِيرُ أَهْلَنَا ﴾ (ئەمە دەستمایەکەمانە بۆمان گێڕدراوەتەوە)، واتە: ئەگەر براکەمان لەگەڵ خۆمان ببەین، دەبێتە هۆکارێ بۆ پێدانی خۆراک‌و بژێوی بۆ خاو خێزانمان، کە بە ڕاستی ئێمە زۆر پێویستیمان بە بژێوی هەیە ﴿ وَنَحْفَظُ أَخَانَا وَنَزْدَادُ كَيْلَ بَعِيرٍ ﴾ بە ناردنی لەگەڵماندا، بێگومان بۆ هەر یەکێک بارێکی حوشتری پێدەدرێ ﴿ ذَٰلِكَ كَيْلٌ يَسِيرٌ ﴾ واتە: ئاسانەو هیچ زیانێک نادات، چونکە ماوەکە درێژە ناخایەنێت، بەرژەوەندیش دەرکەوتووەو لە پێش چاوە ﴿ قَالَ ﴾ یەعقووب عليه السلام پێی وتن: ﴿ لَنْ أُرْسِلَهُۥ مَعَكُمْ حَتَّىٰ تُؤْتُونِ مَوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ واتە: پەیمانێکی پتەو بدەن‌و

سـوێند بخـۆن بـە خـوا ﴿ لَتَأْتُنَّنِي بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمْ ﴾ واتە: مەگـەر لە هەمـوو لایەکەوە داگیـر بکرێـنو توانـای بەرگریتان نەمێنێ ﴿ فَلَمَّآ ءَاتَوْهُ مَوْثِقَهُمْ ﴾ لەسـەر ئـەوەی باوکی داوای کـردو ویسـتی ﴿ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٌ ﴾ واتـە: بەسـە کـە تەنهـا خوا شـایەتو پارێـزەرو چاودێـر بێ بەسـەرمانەوە.

پاشـان کە نـاردی لەگەڵیاندا، وەسـیەتی بۆ کـردن ئەگەر چوونە ناو میسـرەوە، ﴿ لَا تَدْخُلُوا۟ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ وَٱدْخُلُوا۟ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ ﴾ بـەو شـێوە لە چاوی پیس ترسـاوە، لەبەر زۆریو جوانـی قـەدو قیافەیان، لەبـەر ئەوەی منداڵـی یەک پیاون، ئەمـە هۆکارێک.

﴿ وَمَآ أُغْنِى عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ ﴾ (مـن بـەم ئامۆژگارییـەم هیـچ سـوودێکتان پـێ ناگەیەنـم لـە بەرانبـەر بەڵای خـوادا) قـەدەر هـەر دەبـێ ڕووبـدات ﴿ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ﴾ قـەزاو قـەدەر هـەر هـی خوایـە، بڕیـارو فەرمـان تەنها بـۆ ئـەوە، ئـەوەی بڕیـارو فەرمانی لەسـەر بـدات دەبـێ بێتە جـێ ﴿ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ ﴾ واتـە: تەنها پشـت بە خوا دەبەسـتم، نەک لەسـەر ئەوەی وەسـیەتم بـۆ کردوون لـە هـۆکارەکان ﴿ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴾ بێگومـان بـە پشـت بەسـتن هەمـوو ئامانجـەکان بـەدی دێـن، وە هەمـوو ترسـەکان دوور دەکەونەوە.

﴿ وَلَمَّا ﴾ (وە کاتێـک) ڕۆیشـتن ﴿ دَخَلُوا۟ مِنْ حَيْثُ أَمَرَهُمْ أَبُوهُم مَّا كَانَ ﴾ (جـا لـەو جێگایـەوە کـە باوکیان بـۆی دیاری کـردن بە جیا جیـا چوونە ژورەوە) ئـەو کارەیان ﴿ يُغْنِى عَنْهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ إِلَّا حَاجَةً فِى نَفْسِ يَعْقُوبَ قَضَىٰهَا ﴾ (واتـە: هیچ بڕیارێکی خوایـی لـێ دوور نەخسـتنەوەو بێنیـازی نەکـردن) ئەوەش لەبـەر خۆشەویسـتی باوکایەتی بـوو بۆ منداڵەکانی (ویسـتی لـە مەترسـی ڕزگاریان بکات)، بەو شـێوە جۆرێـک ئارامی بە دڵیـدا هـات، وە ئەوەشـی لە ناخیـدا بوو بەجێـی هێنا (لە ئامۆژگـاری کردن)، ئەمـە لە کەم زانسـتی نەبـوو، ئەو لـە پێغەمبـەرە بەڕێـزەکانو زانـا خواناسـەکانە، لەبەر ئەمەیـە خوا ﷻ دەربـارەی فەرموویەتـی: ﴿ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلْمٍ ﴾ واتـە: خاوەن زانسـتی مەزنە ﴿ لِّمَا عَلَّمْنَـٰهُ ﴾ واتـە: لـەو زانسـتەی فێرمـان کردبـوو، نـەک بـە توانـاو هێـزو دەسـەڵاتی خـۆی، بەڵکو بـە فـەزڵو زانسـتی خـوا ﴿ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (واتـە: بـەڵام زۆربەی خەڵکـی) سـەرەنجامی کاروبارەکانو وردەکاری شـتەکان نازانن، بە هەمان شـێوە زانایانیش لـە نێویاندا، شـتێکی زۆریان لـێ دەشـاردرێتەوە لە زانسـتو حوکمو پێویسـتیەکانی.

(٦٩-٧٩): ﴿ وَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَخَاهُۖ قَالَ إِنِّيٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ
بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِي رَحۡلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ
مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلۡعِيرُ إِنَّكُمۡ لَسَٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُواْ وَأَقۡبَلُواْ عَلَيۡهِم مَّاذَا تَفۡقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُواْ
نَفۡقِدُ صُوَاعَ ٱلۡمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمۡلُ بَعِيرٖ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٞ ﴿٧٢﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ عَلِمۡتُم
مَّا جِئۡنَا لِنُفۡسِدَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾ قَالُواْ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمۡ كَٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾
قَالُواْ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوۡعِيَتِهِمۡ
قَبۡلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسۡتَخۡرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِۚ كَذَٰلِكَ كِدۡنَا لِيُوسُفَۖ مَا كَانَ لِيَأۡخُذَ
أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلۡمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ وَفَوۡقَ كُلِّ ذِي عِلۡمٍ
عَلِيمٞ ﴿٧٦﴾ قَالُوٓاْ إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِي نَفۡسِهِۦ وَلَمۡ
يُبۡدِهَا لَهُمۡۚ قَالَ أَنتُمۡ شَرّٞ مَّكَانٗاۖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ
إِنَّ لَهُۥٓ أَبٗا شَيۡخٗا كَبِيرٗا فَخُذۡ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٧٨﴾ قَالَ مَعَاذَ
ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾:

﴿ وَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾ واتە: كاتێ براكانی یوسف چوونە ژورەوە بۆ لای ﴿ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَخَاهُ ﴾ واتە: برا دایكو باوكیەكەی (بنیامین) كە فەرمانی پێكردبوون بیهێنن بۆ لای، بردیە لای خۆیو جیای كردەوە لە براكانی، پاشان حەقیقەتی هەواڵەكەی بۆ باسكرد، وە ﴿ قَالَ إِنِّيٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ ﴾ (واتە: بێگومان من براتم) خەمبار مەبە ﴿ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ بێگومان سەرەنجام باشترە بۆ ئێمە. پاشان هەواڵی پێدا، كە دەیەوێ چی بكات بۆ هێشتنەوەی لە لای خۆی تا كارەكە تەواو دەبێت.

فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِى رَحْلِ أَخِيهِ
ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ ٧٠ قَالُوا۟
وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ٧١ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ
وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ٧٢ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ
لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ
٧٣ قَالُوا۟ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ ٧٤ قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ
مَن وُجِدَ فِى رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ
٧٥ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن
وِعَآءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ
فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ
وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ ٧٦ ۞ قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ
فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِى نَفْسِهِۦ
وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ۚ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا
تَصِفُونَ ٧٧ قَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا
فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ٧٨

﴿ فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ ﴾ واتــە: (کاتــێ بــاری بــۆ ڕێکخســتن) بــۆ هــەر یــەک لــە براکانــی لــە چوارچێــوەی ئەوانــدا براکــەی خــۆی بنیامیــن بــوو ﴿ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ ﴾ ئەویــش بریتیــە لــەو جامــەی کە ئــاوی پــێ دەخــواو عەیارەی دانەوێڵــەی پێــدەکات ﴿ فِى رَحْلِ أَخِيهِ ﴾ خســتیە نــاو بــاری براکەیــەوە، کاتــێ کــە ڕۆیشــتن ﴿ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ ﴾ (واتــە: پاشــان جــاڕ چییــەک جاڕیــدا: ئــەی کاروان! بــە دڵنیایــی ئێــوە دزن) دەگونجــێ ئــەم کەســەی کــە بانگــی کــردوە بــە حەقیقەتــی باســەکە نەزانــێ.

﴿ قَالُوا۟ ﴾ واتــە: براکانــی یوســف وتیــان: ﴿ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم ﴾ (ڕوویــان تێکــردن) بــۆ دوورخســتنەوەی هەمــوو گومانێــک، چونکــە بێگومــان دز هیــچ خەمێکــی نیــە تەنهــا ئــەوە نەبــێ کــە دووربکەوێتــەوەو ماڵــە دزراوەکــە لەگــەڵ خۆیــدا ببــات، بــۆ ئــەوەی پارێــزراو بێــت، ئــەوان ڕوویــان تێکــردنو بــەرەو لایــان ڕۆشــتن وە هیــچ خەمێکیــان نەبــوو تەنهــا لابردنــی ئــەو گومــانو تۆمەتــەی کــە دراوەتــە پاڵیــان، لــەم کاتــەدا وتیــان: ﴿ مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴾ نەیانــوت: (ما الذي سرقنا) واتــە: چیمــان دزیــوە، لەبــەر ئــەوەی ئــەوان دڵنیــا بــوون لــەوەی کــە پاکــن لــە دزی.

﴿ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ ﴾ (وتیــان: پێوانــەی پاشــامان لــێ ون بــووەو هــەر کەســێک بیهێنێتــەوە، بارێکــی حوشــتر «ئازووخــە»ی وەک خــەڵات هەیــە) واتــە: لــە پاداشــتی ئــەوەدا، وە لەســەر ویژدانــی ﴿ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ﴾ واتــە: مــن کەفیلــم (دەســتەبەری ئــەو خەڵاتــەمو لــە ئەســتۆی دەگــرم) ئەمــە وتــەی ئــەو کەســەی کــە بــە دوای پێوانەکــەی پاشــادا گــەڕا.

﴿ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ بــە هەمــوو جۆرەکانــی

سـەرپێچی کـردن ﴿وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ﴾ دزی کـردن گەورەتریـن جـۆری فەسـادو خراپەکاریـە لەسـەر زەویـدا، لەبـەر ئـەوەی سـوێندیان خـوارد کـە ئـەوان نـە دزن، وە نـە خراپـەکارن، چونکـە زانیـان ئـەوان تاقیکراونەتـەوە بـە باروودۆخیـان، کـە بەڵگەیـە بـۆ پاکـیو خواناسـیان، کاری وا هەرگیـز لـەوان ناوەشـێتەوە، ئەمـەش ڕەوانبێـژ ترینـە لـە نەهێشـتنی تۆمـەت بەسـەریانەوە، لـەوەی ئەگـەر بیـان وتبایـە: (تالله لم نفسد في الأرض ولم نسرق) واتـە: سـوێند بـە خـوا نەخراپەمـان لەسـەر زەویـدا بڵاو کردۆتـەوە نـە فەسـاد.

﴿قَالُواْ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ﴾ واتـە: پاداشـتی ئـەم کارە ﴿إِن كُنتُمۡ كَٰذِبِينَ﴾ ئەگـەر لەلای ئێـوە بـوو؟ ﴿قَالُواْ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِي رَحۡلِهِۦ فَهُوَ﴾ واتـە: لـە بارەکـەی ئـەودا بـوو، ﴿جَزَٰٓؤُهُۥ﴾ بـەوەی کـە ببێتـە کۆیلـە بـۆ خـاوەنماڵـە دزراوەکـە، ئەمـە لـە ئاینـی ئەواندا بـوو، ئەگـەر کەسـێک دزی بکردایـەو بەسـەریەوە سـاغ ببوایەتـەوە، دەبـووە کۆیلـە بـۆ خـاوەن ماڵـە دزراوەکـە، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی: ﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ (واتـە: بـەو شـێوەیە پاداشـتی سـتەمکاران دەدەینـەوە).

﴿فَبَدَأَ﴾ پشـکنەر ﴿بِأَوۡعِيَتِهِمۡ قَبۡلَ وِعَآءِ أَخِيهِ﴾ بـۆ ئـەوەی ئـەو گومانـە لابچـێ کـە وا دەزانـرێ بـە ئەنقسـت ئەنجامـدراوە، کاتێـک کـە لەنـاو بارەکانیانـدا هیچیـان نەدۆزیـەوە ﴿ٱسۡتَخۡرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ﴾ (واتـە: لـە نـاو کەلووپەلـی بنیامینـی برایانـدا پێوانەکەیـان هێنایـە دەرەوە) نەیـوت: دۆزیـەوە (وجدها)، یـان براکـەی دزی (سرقها أخوه) لەبـەر لەبەرچاوگرتنـی ڕاسـتیو حەقیقەتـەکان.

بـەو شـێوەیە یوسـف توانـی براکـەی بگێڕێتـەوە بـۆ لای خـۆی بـە جۆرێـک براکانـی هەسـتی پـێ نەکـەن، خـوا فەرموویەتـی: ﴿كَذَٰلِكَ كِدۡنَا لِيُوسُفَ﴾ واتـە: ئـەم نەخشـەو پلانەمـان بـۆی ئاسـانکرد کـە پێـی گەیشـتە ئامانجەکـەی خـۆی ﴿مَا كَانَ لِيَأۡخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلۡمَلِكِ﴾ چونکـە لـە ئاینـی ئـەودا ئـەوە نەبـوو دز بکرێـت بە کۆیلـەو گـل بدرێتـەوە، بـەڵام دز لـە لای ئـەوان سـزایەکی تـری هەبـووە، ئەگـەر ڕەت بکرایەتـەوە بـۆلای دینـی پاشـا، ئـەوە یوسـف نەیدەتوانـی براکـەی لای خـۆی گـل بداتـەوە، بەڵکـو حوکـمو بڕیـاری بـە پێـی یاسـای براکانیـدا، تاکـو ئـەوەی دەیـەوێ بەدەسـتی بهێنـێ، خـوا دەفەرمـوێ ﴿نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُ﴾ واتـە: بـە زانسـتی بـە سـوود، وە زانیـاری ئـەو ڕێگایانـەی کـە دەگـەن بـەو مەبەسـتە، وەک

چـۆن پلـەی یوسـفمان بـەرز کـردەوە ﴿ وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴾ هەمـوو زانایەک کەسێک هەیە لـەو زاناتـر بێ، تـا دەگاتـە لای خـوای زانـا بـە پەنهـانو ئاشـکرا، کاتێـک کـە براکانـی یوسـف ئەوەیـان بینـی ﴿ قَالُوٓاْ إِن يَسْرِقْ ﴾ (ئەگـەر دزی بـکات) ئـەم برایەمـان، بـە ڕاسـتی ئەمـە شـتێکی نامـۆ نیـە، ﴿ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ﴾ مەبەسـیان: یوسـف ﷺ بـوو، وە بـەری کردنـی نەفسـی خۆیـان، ئـەمو براکـەی دزییـان لـێ دەوەشـێتەوە، ئەوانـە بـرای دایـکو باوکـی ئێمـە نیـن، لەمـەدا بـە کەمـیو بـێ بایەخیـەوە تەماشـایان کـردن، لەبـەر ئەمـە بـوو یوسـف ئـەو وشـەی لـە دڵگـرتو لـە ناخـی خـۆی شـاردیەوە ﴿ وَلَمْ يُبْدِهَا ﴾ واتـە: ڕووبەڕوویـان نەبـووەوە لەسـەر ئـەوەی کـە وتیـان بـەوەیو پێیـان ناخۆشـە، بەڵکـو تووڕەییەکـەی خـواردەوەو لـە دڵـی خۆیـدا شـاردیەوەو ﴿ قَالَ ﴾ لـە دەروونـی خۆیـدا وتـی: ﴿ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ﴾ (ئێـوە خراپتـرن لـەو دوو برایەتـان کـە بـە ناهـەق تۆمەتباریـان دەکـەن بـە دزیـی) لەسـەر ئـەوەی سەرزەنشـتو تۆمەتبارمـان دەکـەن کـە لـە ڕاسـتییدا ئـەوە لـە ئێـوەدا بەرجەسـتەیە ﴿ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴾ (واتـە: خـوا دەزانـێ بـەوەی کـە وەسـفی دەکـەن) لـە ئێمـە زیاتـر، لـە وەسـفکردنمان بـە دزی کـردن، خـوا دەزانـێ ئێمـە بەریـن لـەوە.

پاشـان ڕێگـای خـۆ هەڵواسـینو تەمەلوقیـان لەگەڵیـدا بـەکار هێنـا، بەڵکـو لـە براکەیـان خـۆش بێـێ.

﴿ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا ﴾ (وتیـان: ئـەی عەزیـز! بـە دڵنیایـی ئـەو برایەمـان باوکێکـی پیـری بـە سـاڵدا چـووی هەیـە) واتـە: هۆگـری بـووەو ناتوانـی ئارامـی لەسـەر بگـرێ، ناتوانـێ لێـی دابـبڕێ، ﴿ فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ (دەجـا یەکێـک لـە ئێمـە لـە شـوێنی بگـرەو گـل بـدەوە) لەگـەڵ ئێمـەو باوکمانـدا بـەم کارە چاکـی بنوێنـە،

قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ
إِذًا لَّظَٰلِمُونَ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُوا۟ مِنْهُ خَلَصُوا۟ نَجِيًّا
قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم
مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ فَلَنْ أَبْرَحَ
ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ
﴿٨٠﴾ ٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ
وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ
﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا
وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا
فَصَبْرٌ جَمِيلٌ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا إِنَّهُۥ هُوَ
ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ
يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ
﴿٨٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُا۟ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا
أَوْ تَكُونَ مِنَ ٱلْهَٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشْكُوا۟ بَثِّى
وَحُزْنِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾

﴿قَالَ﴾ یوسف وتی: ﴿مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأْخُذَ إِلَّا مَن وَجَدْنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ﴾ واتە: ئەمە ستەمە لە لایەن ئێمەوە، ئەگەر بێ تاوانێ بخەینە جێگای کەسێک کاڵاکەمانی لەلا بووە، نەیفەرموو: (ئەوەی دزی کردوە) هەموو ئەمانە خۆپاراستنە لە درۆ ﴿إِنَّآ إِذًا﴾ واتە: ئەگەر کەسێک بەیـن کاڵاکەمان لەناو بارەکەی ئەودا نەبووە ﴿لَّظَٰلِمُونَ﴾ ئەو کات سزامان لە جێگای خۆیدا دانەناوەو جێبەجێ نەکردوە.

(٨٠-٨٣): ﴿فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُوا۟ مِنْهُ خَلَصُوا۟ نَجِيًّا قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٠﴾ ٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُوا۟ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدْنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمْنَا وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَٰفِظِينَ ﴿٨١﴾ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٨٢﴾ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٨٣﴾﴾

ئنجا خوا دەفەرمووێ: ﴿فَلَمَّا ٱسْتَيْـَٔسُوا۟ مِنْهُ﴾ واتە: کاتێ براکانی یوسف بێ ئومێد بوون لەوەی یوسف لێیان ببوورێو براکەیان ئازاد بکات ﴿خَلَصُوا۟ نَجِيًّا﴾ واتە: بە تەنها کۆبوونەوە کەسی تریان لەگەڵدا نەبوو، لە نێوانی یەکتردا کەوتنە چپە چپکردن، ﴿قَالَ كَبِيرُهُمْ أَلَمْ تَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ أَبَاكُمْ قَدْ أَخَذَ عَلَيْكُم مَّوْثِقًا مِّنَ ٱللَّهِ﴾ (واتە: برا گەورەکەیان وتی: ئایا نەتانزانیوە باوکتان پەیمانی پتەوی بە ناوی خوا لێوەرگرتوون) لە پاراستنیدا، کە هەر دەبێ بیگەڕێننەوە، مەگەر لە لایە کەوە داگیر بکرێنو تواناتان نەبێ ﴿وَمِن قَبْلُ مَا فَرَّطتُمْ فِى يُوسُفَ﴾ (واتە: بەر لەوەش دەربارەی یوسف خراپەتان کرد) دوو شت بەسەرتانەوە کۆ بووەتەوە، ڕۆچوون لە خراپەکاریدا بەرانبەر یوسف،

وە نەهێنانـەوەی براکـەی تـری، مـن هیـچ ڕوویێکـم نیـە تەماشـای باوکـم بکـەم ﴿ فَلَنْ أَبْرَحَ ٱلْأَرْضَ ﴾ واتـە: لـەم زەویـەدا دەمێنمـەوە ﴿ حَتَّىٰ يَأْذَنَ لِىٓ أَبِىٓ أَوْ يَحْكُمَ ٱللَّهُ لِى ﴾ واتە: بڕیـاری گەڕانـەوەم بـۆ دەدا بە تەنهـا، یان لەگـەڵ براکەمـدا ﴿ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَـٰكِمِينَ ﴾ واتە: پاشـان وەسـیەتی بۆیـان کـرد کـە چی بـە باوکیـان دەڵێـن، وتـی: ﴿ ٱرْجِعُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَبِيكُمْ فَقُولُوا۟ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبْنَكَ سَرَقَ ﴾ واتـە: بـە هۆی دزیکردنیـەوە بردیان ئێمـەش نەمانتوانی بیهێنینـەوە بـۆت، لەگـەڵ ئەوەدا زۆر هەوڵماندا، ئێمە شـایەتی بۆ شـتێ نادەین کـە نەیزانین، بەڵکـو شـایەتی بە شـتێ دەدەیـن کە دەیزانیـن، چونکە بە چـاوی خۆمـان پێوانەکەمان بینی لـە ناو بارەکـەی ئەودا دەرهێنـرا ﴿ وَمَا كُنَّا لِلْغَيْبِ حَـٰفِظِينَ ﴾ واتە: ئەگـەر لە غەیبو پەنهانمـان بزانیایـە، ئەوە سـوور نەدەبووین کـە لەگەڵ خۆمانـدا بیبەین، وە پەیمـانو بەڵێنی قورسیشـمان پـێ نـەدەدای، هەرگیـز گومانمـان نەبـرد کـە کارەکـە بـەو جـۆرەی لێدێ، ﴿ وَسْـَٔلِ ﴾ ئەگـەر گومانـت هەیـە لـە قسـەکەی ئێمە، پرسـیار بکە لـە ﴿ ٱلْقَرْيَةَ ٱلَّتِى كُنَّا فِيهَا وَٱلْعِيرَ ٱلَّتِىٓ أَقْبَلْنَا فِيهَا ﴾ (خەڵکـی ئـەو شـارەی کە لێـی بووینو، ئـەو کاروانەی لەگەڵـی هاتیـن لـەو بـارەوە پرسـیار بکـە) ئەوانیـش بـەو هەواڵەیان زانـی کە بـە تۆماندا ﴿ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴾ (بـە دڵنیایی ئێمە لە ڕاسـتگۆیانین) درۆمان نەکـرد، وە نەمانگۆڕی بەڵکـو ئەمە حەقیقـەتو ڕاسـتییەکەیە کە باسـمان کرد.

کاتێـک کـە گەڕانـەوە بـۆ لای باوکیـانو ئـەم هەواڵەیـان پێـدا، تـەواو خـەمو خەفـەت دایگـرتو بێتاقـەت بوو، بە هەمان شـێوە لـەم ڕووداوەشـدا تۆمەتباری کـردن، وەک چۆن پێشـتریش تۆمەتباری کردبـوون ﴿ قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ۖ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ ﴾ واتە: دیسـانەوە دەگەڕێمـەوە بـۆ ئارامگرتنێکـی جوان، کـە تووڕەیىو بێـزاری بـەدوادا نەیەت، وە سـکاڵاش نابـەم بـۆ لای هیچ کەسـێک، پاشـان چاوەڕێـی کرانەوەی دەرگـای خوا ﷻ دەکـەم، فەرمـووی: ﴿ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَنِى بِهِمْ جَمِيعًا ﴾ واتـە: یوسـفو بنیامیـنو بـرا گەورەکەیـان کـە لـە میسـر جێگیـر بـووە ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ﴾ کـە حاڵـم دەزانـێ، وە چەنـدە پێویسـتم بـە کردنـەوەی ڕەحمـەتو منەتیەتـی ﴿ ٱلْحَكِيمُ ﴾ ئـەو خوایەی کـە بـۆ هەمـوو شـتێک ئەندازەیەکی دانـاوە، وە بـۆ هەموو کارێکیـش کۆتاییـەک بە پێی حیکمـەتو کارلەجێـی خۆی.

(٨٤-٨٦): ﴿ وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَـٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ تَفْتَؤُا۟ تَذْكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوْ تَكُونَ مِنَ

ﭐلۡهَـٰلِكِينَ ﴿٨٥﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨٦﴾ ﴾:

دەفەرمـوێ: ﴿ وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَـٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ ﴾ واتـە: ئیتـر یەعقـووب ﷺ ڕووی لـە منداڵەکانـی وەرچەرخاند، پاش ئـەوەی ئـەو هەواڵەیان پێ گەیشـت، وە زۆر خەمبـارو سـەغڵەت بـوو دەیـوت: ئـای داخەکەم بۆ یوسـف! بە ڕاسـتی ئـەو زامەکەمـی کوڵانـدەوە، جا بـە هۆی خـەمو خەفەتەوە ئاوی سـپی پەڕیە سـەر هەردوو چـاوی، تـا بە تەواوەتـی هەردوو چاوی سـپی بـوون، ﴿ فَهُوَ كَظِيمٞ ﴾ (خـەمو تووڕەیی خـۆی کـپ کـردەوە) واتـە: دڵ پڕ لـە خـەمو ناسـۆر ﴿ وَقَالَ يَـٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾ واتە: دەرکـەوت تێیـدا ئـەو خەمـە کۆنـە، وە بیری ئـەم موسـیبەتە سـووکو ئاسـانەی کردەوە لـە بەرانبـەر ئەو موسـیبەتە قورسـەی یەکەمـدا، منداڵەکانی پێیـان وت: بە سەرسـوورمانەوە لـە باروودۆخـی ﴿ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُاْ تَذۡكُرُ يُوسُفَ ﴾ واتە: بـەردەوام لە هەمـوو کاتەکاندا بیـر لـە یوسـف دەکەیتـەوە ﴿ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا ﴾ هەتـا دەکەویتە سـەر جـێو توانای قسـەکردنت نامێنـێ ﴿ أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَـٰلِكِينَ ﴾ (یـان لـە فەوتـاوان دەبـی) واتە: هەرگیـز واز لـە یادکردنـەوەی ناهێنی ئـەوەی لە تواناتـدا بێ.

﴿ قَالَ ﴾ یەعقـووب ﷺ ﴿ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي ﴾ ئـەوەی لەسـەر زمانمـە ﴿ وَحُزۡنِيٓ ﴾ ئـەوەی کـە لـە دڵمدایـە ﴿ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ تەنهـا بـۆ لای خوا، نـەک بـۆ لای ئێـوەو بێجگە لە ئێـوە لـە بەدیهێنراوەکان، چـی دەڵێن بڵێـن: ﴿ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ هیوام بـە خوا ﷻ زۆرە لـە داهاتوویەکی نزیکـدا منداڵەکانم بـۆ دەگەڕێنێتەوەو چاوو دڵم ڕۆشـن دەکات بـە کۆبوونەوە لـە گەڵیاندا.

يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ
مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ
ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ
مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ فَأَوۡفِ لَنَا
ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ
﴿٨٨﴾ قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ
جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ
وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ
ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ
ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ
عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ
﴿٩٢﴾ ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ
بَصِيرٗا وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا فَصَلَتِ
ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن
تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٩٥﴾

**(٨٧-٨٨):** ﴿ يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾

یەعقـووب عليه السلام بـە منداڵەکانـی فەرمـوو: ﴿ يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ ﴾واتـە: بـڕۆن بگەڕێنو سـۆراغی یوسـفو براکـەی بکـەن ﴿ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ ﴾ (لـە بەزەیـیو دەروو کردنـەوەی خـوا، نائومێـد مەبـن) بێگومان هیـوا بوون ئـەوە پێویسـت دەکات لەسـەر بەنـدە کـە هەوڵو کۆشـش بدات بـۆ بەدەسـتهێنانی ئەو هیوایەی کـە هەیەتـی، وە بێ هیوا بـوون قـوورسو بێتوانـای دەکات، باشـتر وایە بەنـدەکان ئومێـدی فەزڵو چاکـەو بەزەیی خـوا بکەن.

﴿ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾ بێگومـان (مرۆڤـەکان) بـە هـۆی بێبڕواییانـەوە دوور دەکەونـەوە لـە میهرەبانـیو بەزەیی خـوا، وە ڕەحمەتی خوایـی لێیانەوە بـە دوورە، خۆتـان مەچوێنـن بە بێبـڕواکان.

ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئومێـد بـوون بـە ڕەحمەتـی خـوا بـە پێـی ئیمانو بـڕوای کەسـەکەیە. جـا ڕۆیشـتن ﴿ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ ﴾واتە: یوسـف عليه السلام ﴿ قَالُواْ ﴾بە ملکەچیـەوە پێیـان وت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآ ﴾واتـە: خۆمـانو مـاڵو منداڵمـان تووشـی گرانـی بوویـنو ناچار کەوتوویـن ﴿ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ ﴾واتـە: بەهاو دراوێکی کـەمو بێ بایەخ ﴿ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ ﴾واتـە: لەگـەڵ نەبوونی شـتومەکی پێویسـت، وە چاکەمان لەگەڵـدا بکە زیاد لـە پێویسـت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ﴾بە پاداشـتی دنیـاو دواڕۆژ.

کاتێـک کارەکـە تـەواو بـوو وە گەیشـتە ئەوپەڕی، یوسـف نـەرمو نیانیو خۆشەویسـتی بۆیـان نوانـد بـە جوانتریـن شـێوە، وە خۆی پـێ ناسـاندنو سەرزەنشتیشـی کردن.

(٨٩): ﴿ قَالَ هَلْ عَلِمْتُم مَّا فَعَلْتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذْ أَنتُمْ جَاهِلُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾:

﴿ قَالَ هَلْ عَلِمْتُم مَّا فَعَلْتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ ﴾ ئەمـە یـان قسـەی یوسـف ﷺ ئـەوەی کە بەسـەریدا هێنایـان، یـان براکـەی، (هەردووکیـان) دەگونجـێ -خـوا زاناترە- ئەو قسـەیان کـە وتیـان: ﴿ قَالُوا إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُ مِن قَبْلُ ﴾ یـان ئـەو شـتەی ئـەوو باوکـی لـە یەکتـر جیـا کـردوە، ئـەوان هـۆکار بـوون تیایدا، لـە بنەماشـدا پێویسـت بوو بـێ، ﴿ إِذْ أَنتُمْ جَاهِلُونَ ﴾ ئەمـەش جۆرێکـە لـە بیانـوو هێنانـەوە بـە نەفامیـان، یـان سەرزەنشـکردنیانە کاتـێ کـرداری نەفامانەیـان ئەنجامدا، لەگەڵ ئـەوەدا نابـێو ناگونجێ بۆ ئەوان.

(٩٠-٩٢): ﴿ قَالُوا أَإِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ ۖ قَالَ أَنَا يُوسُفُ وَهَٰذَا أَخِي ۖ قَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا ۖ إِنَّهُ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ عَلَيْنَا وَإِن كُنَّا لَخَاطِئِينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ ۖ يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ ۖ وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ﴾:

زانیـان ئەو کەسـەی دەیاندوێنی یوسـفە ﷺ، وتیـان: ﴿ قَالُوا أَإِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُ ۖ قَالَ أَنَا يُوسُفُ وَهَٰذَا أَخِي ۖ قَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا ﴾ بـە ئیمـانو تەقـواو جێگیـر بـوون لەسـەر زەویـدا، دیارە ئەویـش بە هۆی ئارامـی خۆپارێزی تەقوا بـووە ﴿ إِنَّهُ مَن يَتَّقِ وَيَصْبِرْ ﴾ واتـە: (بێگومـان هەر کەس) خـۆی بپارێزێ لەوەی خـوا قەدەغەی کردوە، وە ئـارام بگرێ لەسـەر ناخۆشـیو نارەحەتیـەکان، وە لەسـەر جێبەجێکردنـی فەرمانەکانـی خوا، ﴿ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴾ بەڕاسـتی ئەمـە لە ئیحسـانو چاکەیە، خـوای گەورەش پاداشـتی چاکـەکار نافەوتێنێو بـزری ناکات.

﴿ قَالُوا تَاللَّهِ لَقَدْ آثَرَكَ اللَّهُ عَلَيْنَا ﴾ واتـە: (بـە دڵنیایـی خـوا) چاکەی تـۆی داوە بەسـەرماندا، بـە ڕەوشـتی بـەرزو ئارامـیو هێمنیتـەوە، ئێمـەش خراپەمـان لەگـەڵ کردی ئەوپـەڕی خراپە، سـوور بووین لەسـەر زیـان گەیاندن پێـتو دوورخسـتنەوەت لە باوکت، خـوا فەزڵـی تـۆی دا بەسـەرماندا، چـۆن بتەوێـت جێگیـری کردیـت ﴿ وَإِن كُنَّا لَخَاطِئِينَ ﴾ ئەمـەش ئەوپـەڕی دانپێدانانـە لە لایـەن ئەوانەوە بە جەخـت کردنەوەیەکی تـەواو لەسـەر ئەو هەڵـەی بەرانبـەر یوسـف کردیان.

﴿ قَالَ ﴾ یوسف ﷺ بە ڕێزو شکۆوە پێی وتن: ﴿ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ ﴾ واتە: هیچ گلەییتان لێناکەمو سەرزەنشتیشتان ناکەم ﴿ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾ بە تەواوەتی لێیان بورا، بە بێ ئەوەی تانەیان لێ بدات لەسەر تاوانی پێشوو، داوای لێخۆشبوونو میهرەبانیشی بۆ کردن، ئەوەش ئەوپەڕی چاکەخوازیە کە دەستەبەر نابێ مەگەر لە لای بەدیهێنراوە تایبەتمەندیەکان نەبێ، وە باشترینی هەڵبژێردراوان نەبێ.

(٩٣): ﴿ ٱذْهَبُوا۟ بِقَمِيصِى هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٣﴾ ﴾

یوسف بە براکانی فەرموو: ﴿ ٱذْهَبُوا۟ بِقَمِيصِى هَٰذَا فَأَلْقُوهُ عَلَىٰ وَجْهِ أَبِى يَأْتِ بَصِيرًا ﴾ لەبەر ئەوە هەموو نەخۆشیەک بە دژەکەی (واتە: دەرمانەکەی) چارەسەر دەکرێ، ئەم کراسە لەبەر ئەوەی پاشماوەی بۆنی یوسف ﷺ کە لە دڵی باوکیدا بەجێی هێشتبوو لە خەمو ناسۆریو تامەزرۆیی بینینی، ویستی بۆنی بکات، ڕووحی بێ بەبەردەوام دەروونی بۆ بگەڕێتەوەو ڕووناکی چاوەکانی بێتەوە، ئا لەمەدا خوا حیکمەتو نهێنی زۆری داناوە بەندەکان پەی پێ نابەن، یوسف ﷺ لەوانەدا پەی بەم کارە برد.

﴿ وَأْتُونِى بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ واتە: خاو خێزانو هەموو کەسوکارتان، بە تەواوی بینن تا دەستەبەر بێو نارەحەتیو برسێتیو تەنگەتاویتان لەسەر لابچێت.

(٩٤-٩٧): ﴿ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلْعِيرُ قَالَ أَبُوهُمْ إِنِّى لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِى ضَلَٰلِكَ ٱلْقَدِيمِ ﴿٩٥﴾ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ أَلْقَىٰهُ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ ﴾

﴿ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلْعِيرُ ﴾ واتە: (جا کە کاروانیەکە) لە زەوی میسر دەرچوو بەرەو زەوی فەڵەستین، یەعقووب ﷺ بۆنی کراسەکەی کرد، جا فەرمووی: ﴿ إِنِّى لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَ لَوْلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴾ واتە: گاڵتەم پێدەکەن، وە دەزانن ئەم قسەیە لە خۆمەوە بە بێ هەستو شعور دەیکەم، چونکە هەستی کرد سەریان سوڕما لە حاڵی، بۆیە ئەو قسەی کرد، گومانە کە لە جێی خۆی بوو پێیانو ڕوویدا، وتیان: ﴿ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِى ضَلَٰلِكَ ٱلْقَدِيمِ ﴾ (واتە: سوێند بە خوا ئێستاش هەر لەسەر هەڵە کۆنەکەی خۆتی) بەردەوام وێڵی لە دەریایی خۆشەویستیدا، نازانی چی دەڵێی.

فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ أَلْقَىٰهُ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا ۖ قَالَ
أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟
يَٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوْفَ
أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾ فَلَمَّا
دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ٱدْخُلُوا۟ مِصْرَ
إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّوا۟
لَهُۥ سُجَّدًا ۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا
رَبِّى حَقًّا ۖ وَقَدْ أَحْسَنَ بِىٓ إِذْ أَخْرَجَنِى مِنَ ٱلسِّجْنِ وَجَآءَ بِكُم
مِّنَ ٱلْبَدْوِ مِنۢ بَعْدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيْطَٰنُ بَيْنِى وَبَيْنَ إِخْوَتِىٓ ۚ إِنَّ
رَبِّى لَطِيفٌ لِّمَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ۞ رَبِّ
قَدْ ءَاتَيْتَنِى مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِى مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ
فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِىِّۦ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ
تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ
ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ۖ وَمَا كُنتَ لَدَيْهِمْ إِذْ أَجْمَعُوٓا۟ أَمْرَهُمْ
وَهُمْ يَمْكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾

﴿ فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلْبَشِيرُ ﴾ (واتە: کاروانیەکە نزیک بوویەوە مـوژدە دەرکەوت)، بە نزیک بوونەوەی کۆبوونەوەی یوسفو براکانیو باوکی ﴿ أَلْقَىٰهُ ﴾ واتە: کراسەکە ﴿ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ فَٱرْتَدَّ بَصِيرًا ﴾ واتە: وەک جاری پێشوو ڕووناکی بۆ چاوەکانی گەڕایەوە، پاش ئەوەی کە بە هۆی خەمو خەفەتەوە سپی بوو بویەوە، بە ماڵو منداڵەکانی وت کە لە لای ئامادە بوون، ئەوانەی کە بۆچونەکەی باوکیان بەکەمو ناڕێری تەماشا دەکرد، ئەوانە سەریان سوڕما کە قسەکانی هەمووی تەواو دەرچوو سەرکەوت بەسەریاندا، بە فەزڵو نیعمەتی خوا: ﴿ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ (واتە: ئەی پێم نەوتن کە من لە لایەن خواوە هەندێ شت دەزانم ئێوە نایزانن) کاتێ کە من ئومێدم بە بینینی یوسف بوو، چاوەڕوانی نەمانی خەمو پەژارەم دەکرد. دانیان نا بە تاوانەکەیاندا، وە ﴿ قَالُوا۟ يَٰٓأَبَانَا ٱسْتَغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ﴾ (واتە: کوڕەکان وتیان: باوکی خۆمان! داوای لێخۆشبونمان بۆ بکە بەڕاستی ئێمە هەڵەو گوناهبارین) کاتی کە ئەوەی کردمان لەگەڵت کە کردمان.

(٩٨): ﴿ قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾ ﴾:

﴿ قَالَ ﴾ لە وەڵامی داواکەیاندا، ڕاستەخۆ وەڵامی دانەوەو وتی: ﴿ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ ئومێدەوارم خوا لێتان خۆش بێو میهرەبانی بڕژێنی بەسەرتاندا، وتراوە: دوای لێخۆشبوونی دواخستوە بۆ دوای سەحەر، تا پارانەوەکە تەواو بێو نزیکتر بێ بۆ وەرگرتن.

(٩٩-١٠٠): ﴿ فَلَمَّا دَخَلُوا۟ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيْهِ أَبَوَيْهِ وَقَالَ ٱدْخُلُوا۟ مِصْرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ

ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن
قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ
أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾

﴿فَلَمَّا﴾ واتە: کاتێ کە یەعقووب ﷺ خۆی و منداڵەکانی ئامادەی دەرچوون بوون، لە وڵاتی خۆیان دەرچوون بۆ میسر بە مەبەستی گەیشتن بە یوسف و دانیشتوانەکەی، کاتێ گەیشتن پێی ﴿دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ﴾ واتە: باوک و دایکی لە ئامێز گرت، وە جیای کردنەوە لە کاروانەکەو چاکەو ڕێزی تەواوی بۆ دەربڕین، وە زۆر بە گەورەو گران تەماشای کردن ﴿وَقَالَ﴾ بە هەموو کەس و کارەکەی وت: ﴿ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ﴾ (واتە: فەرمووی بچنە میسرەوە (إن شاء الله) لە ئاسایش و ئاسوودەییدا دەبن) دوور لە هەموو ناخۆشی و ترسێک، بەو شێوە بە دڵێکی خۆشەوە چوونە میسرەوە، نارەحەتی و ناخۆشیان لەسەر نەما، دڵخۆشی و خۆشبەختیان دەستەبەر بوو.

﴿وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ﴾ واتە: باوک و دایکی لەسەر تەختی پاشایەتی دانا ﴿وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ﴾ واتە: باک و دایک و براکانی، سوژدەی ڕێزو مەزنی و حورمەتیان بۆ برد ﴿وَقَالَ﴾ کاتێ کە ئەم دۆخەی بینی کە سوژدەیان بۆ برد فەرمووی: ﴿يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ﴾ کاتێ کە بینی یازدە ئەستێرەو مانگ و خۆر سوژدەی بۆ دەبەن، ئەمە هاتنە دی، خەوەکەیە ﴿قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ﴾ کە نەیکردوە بە خەوی تێکەڵو پێکەڵ ﴿وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ﴾ چاکەیەکی جوانی (لەگەڵدا کردم) ﴿إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ﴾ ئا ئەمە لە لوتف و جوانی دواندنێتی ﷺ کاتێ باسی حاڵی خۆی کرد لە زینداندا، بەڵام ئێش و ئازاری ناو بیرەکەی وەبیر نەهێنانەوە، لەبەر ئەوە بە تەواوی لە براکانی خۆش بوو، وە هێنانیان لە دەشتەوە بۆ لای من لە چاکەکانی خوایە بەسەرمەوە.

نەیفەرموو: برسێتی و نەداری ئێوەی گەیاندە لای من، وە نەیفەرموو: (أحسَنَ بكم) چاکەی لەگەڵ کردن، بەڵکو فەرمووی: ﴿أَحۡسَنَ بِيٓ﴾ (واتە: چاکەی لەگەڵم کرد) چاکە لەگەڵ کردنی داوەتە پاڵ خۆی، پاکی بۆ ئەو خوایەی میهرەبانی خۆی تایبەتی کردوە بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت لە بەندەکانی،

وە لـە لایـەن خۆیـەوە ڕحمەتـی بەخشـیوە پێیـان، بـە ڕاسـتی تەنهـا ئـەو بەخشـندەی میهرەبانــە، ﴿ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ ﴾ نەیـوت: (نـزغ الشـیطان إخـوتي) شـەیتان زەفـەری بـە براکانـم بـرد، بەڵکـو وەک ئـەوەی تـاوانو نەفامـی بداتـە پـاڵ هـەردوولا، دەی سـوپاسو سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی کـە شـەیتانی ڕیسـوا کـردو کـۆی کردینـەوە پـاش ئـەو دابڕانـە ناخۆشـە ﴿ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ ﴾ فـەزڵو چاکـەی دەگەیەنێـت بـە بەندەکـەی لـەو ڕووەی کـە هەسـتی پێنـاکات، وە بـەرزی دەکاتـەوە بـۆ پلـەو پایـەی بـەرز لـە کۆمەڵـە شـتێکدا کـە حـەزی پێنـاکات ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ کـە ئاشـکراو نهێنـی کاروبـارەکان دەزانـێ، وە نهێنـی بەنـدەو ئـەوەی لـە ناخیاندایـە ﴿ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ لـە دانانـی شـتەکان لـە شـوێنی خۆیـدا، وە بردنـی کاروبـارەکان بـۆ ئـەو کاتـەی کـە دیـاری کـردوە.

(١٠١): ﴿ رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ١٠١ ﴾:

کاتـێ خـوا ﷻ دەسـەڵاتی تـەواوی بەخشـییە یوسـف ؈و جێگیـری کـرد لەسـەر زەویـدا، وە چـاوو دڵـی ڕۆشـن کـرد بـە بینینـی بـاوکو دایـکو براکانـی، وە پـاش ئـەو زانسـتە مەزنـەی پێیدابـوو، دانـی بـە نیعمەتەکانـی خـوادا نـاو سوپاسـگوزاری کـردو داوای پابەنـد بوونـی کـرد لەسـەر ئیسـلام: ﴿ رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ ﴾ بـەو شـێوەی کـە خەزێنـەی میسـری لـە ژێـر دەسـتدا بـوو، وە وەزیرێکـی گـەورەی پاشـا بـوو ﴿ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ ﴾ واتـە: لـە لێکدانـەوەی کتێبـە پیـرۆزە دابەزێنـراوەکانو لێکدانـەوەی خەوەکانیـش، وە جگـە لـەو زانسـتانەش ﴿ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا ﴾ واتـە: بەردەوامـم بکـە لەسـەر ئیسـلامو پابەنـدم بکـە لەسـەری، بـە مسـوڵمانی بممرێنـە، ئەمـە پاڕانـەوە نیـە بـە پەلـە کردنـی مـردن، ﴿ وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ واتـە: لـە پێغەمبەرانـی پـاکو پاڵفتەکـراو هەڵبژێـردراوان.

(١٠٢): ﴿ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۖ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ وَهُمۡ يَمۡكُرُونَ ١٠٢ ﴾:

کاتـێ خـوا ﷻ ئـەم چیرۆکـە بەسـەر موحەممـەدا ﷺ دەخوێنێتـەوە، پێـی دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئـەو هەواڵانـەی بۆمـان بـاس کردیـت ﴿ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ ﴾ (واتـە:

هەمـوو بـاس و هەواڵـی غەیبـە) کـە ئەگـەر سروشـمان بـۆ لات نەکردبووایـە، ئـەم هەواڵـە مەزنـەت پێنەدەگەیشـت، بێگومـان تـۆ لـەلای ئـەوان ئامـادە نەبوویـت ﴿إِذْ أَجْمَعُوٓاْ أَمْرَهُمْ﴾ واتـە: براکانـی یوسـف ﴿وَهُمْ يَمْكُرُونَ﴾ (واتـە: پیلانیـان دارشـت بـۆ) یوسـف، کاتـێ بریاریانـدا بـە جیاکردنـەوەی نێـوان ئـەوو باوکـی، لـە حاڵەتێکـدا کـە کـەس نەیدەزانـی بێجگـە لـە خـوای بـەرز، هیـچ کـەس نەیدەتوانـی پێـی بگـات مەگـەر خـوا فێـری کردبایـە.

وەک خـوا فەرموویەتـی: کاتـێ کـە چیرۆکـی مووسـا بـاس دەکات و ئەوەی بەسـەریدا هـات، باسـی ئـەو حاڵەتـە دەکات کـە هیـچ کـەس بـە زانسـت پێـی ناگـات تەنهـا بـە وەحـی ئـەو نەبـێ، ﴿وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾﴾ القصص، (واتـە: تـۆ ئـەی موحەممـەد ﷺ لـە لای خـۆر ئـاوای (کێـوی طـور) نەبوویـت کاتـێ کـە فەرمانـی پێغەمبەرایەتیمـان بـە مووسـادا، وە تـۆ لـە ئامـادە بووانـی ئـەو ڕووداوە نەبوویـت) بەڕاسـتی ئەمـە گەورەتریـن و دیارتریـن بەڵگەیـە کـە ئـەوەی موحەممـەد ﷺ هێناویەتـی ڕاسـت و هەقـە.

(١٠٣-١٠٧): ﴿وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأْتِيَهُمْ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٠٧﴾﴾:

خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿وَمَآ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ﴾ (واتـە: زۆربـەی ئـەو خەڵکـە هەرچەنـدە تـۆ زۆریـش سـوور بـێ و هەوڵبـدەی) بـۆ ئیمـان هێنانیـان ﴿بِمُؤْمِنِينَ﴾ بـە ڕاسـتی بیرکردنـەوەو مەبەسـتەکانیان فاسـدو تێکچـوە، سـوور بوونـی بانگخـوازان هیـچ کەڵکـی نیـە بۆیـان، ئەگـەر چـی بەربەسـتەکانیش نەمێنـێ، بـەوەی کـە فێریـان بکـەن و بانگیـان بکـەن بـۆ خێـرو چاکـە بـۆ خـودی خۆیـان و دوورکەوتنـەوەی شـەڕو خراپـە لێیـان، بەبـێ پاداشـت و بەرانبـەر، ئەگـەر بەڵگـەو شایەتیشـیان بـۆ بهێنیتـەوە لەسـەر ڕاسـتیان ئـەوان هـەر بەجێـی ناهێنـن، لەبـەر ئەمەیـە فەرموویەتـی:

وَمَا تَسْأَلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأْتِيَهُمْ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِيٓ إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَدَارُ ٱلْءَاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُواْ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾

﴿وَمَا تَسْـَٔلُهُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ واتــە: یــادی پــێ دەکەنــەوەو کاری پێدەکــەن ئــەوەی ســوودی هەیــە بۆیــان، وە وازی لێدەهێنــن ئــەوەی زیانــی هەیــە بۆیــان.

﴿وَكَأَيِّن﴾ واتــە: زۆر ﴿مِّنْ ءَايَةٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا﴾ واتە: بەڵگەیــە بۆیــان لەســەر یەکتاپەرســتی خوا ﴿وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ﴾ لەگــەڵ ئەمــەدا ئەگــەر هەنــدێ ئیمانیــان لــێ بینرا ﴿وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ﴾ (واتــە: بەشــی زۆری ئــەو خەڵکەیــش کــە ئیمــان دێنن هەر موشــریکن) ئــەوان ئەگەر دانیــش بنێــن بــە پەروەردگاریێتی خــوا، کە دروســتکەرو ڕزقو ڕۆزیــدەرەو ڕێکخــەری هەمــوو کارو بارەکانــە، بــەڵام هەر هــاوەڵ بۆ خــوا دادەنێــن لــە پەرســتراوێتیو یەکتاپەرســتیدا، ئەوانــەی گەیشــتن بەم دۆخــە هیچیان بۆ نەمایــەوە تەنهــا ئــەوە نەبــێ ســزایان لەســەر حــەڵاڵ بــێو لەنــاکاودا تووشــی ســزا بین لە کاتێکــدا زۆر بێخەمــن، بۆیــە فەرموویەتــی: ﴿أَفَأَمِنُوٓاْ﴾ ئەوانــەی بەو کارە هەڵدەســتنو پشــت لــە ئایەتەکانی خــوا ﷻ دەکــەن ﴿أَن تَأْتِيَهُمْ غَٰشِيَةٌ مِّنْ عَذَابِ ٱللَّهِ﴾ واتە: ســزایەکە دایاندەپۆشــێو بــە جــارێ هەموویان قــڕ دەبــن ﴿أَوْ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً﴾ واتــە: لە ناکاو ﴿وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ﴾ واتــە: بــە ڕاســتی ئــەوان ئەو ســزایانەیان لەســەر خۆیان پێویســت کــرد، دەی بــا تەوبــەو داوای لێخۆشــبوون بکەن لــە لای خــوا، وازبێنن لــەوەی دەبێتە هۆی سزادانیان.

(١٠٨): ﴿قُلْ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدْعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي وَسُبْحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾﴾

خــوا بــە پێغەمبەرەکــەی موحەممــەد ﷺ دەفەرمــوێ: ﴿قُلْ﴾ بــە خەڵکــی بڵــێ: ﴿هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ﴾ واتــە: (ئــەوە) ڕێگــای منــە کە بانگــەوازی بــۆ دەکەم، ئــەوە ڕێگــای گەیەنەرە

بـۆ لای خـواو ماڵـی ڕێـزداری، کە زانسـتو کردەوەو دڵسـۆز بـوون بۆ خـواو دینەکەی لـە خـۆ دەگرێ، وە هیـچ هاوەڵو هاوبەشـێکی نیـە ﴿ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ ﴾ واتە: هانـی خەڵکی دەدەم بـۆ گەیشـتن بـە پەروەردگاریـان، وە دەیانترسـێنم بـەوەی کـە دووریـان دەخاتەوە لـەوە، لەگـەڵ ئەمەدا ﴿ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ ﴾ لەسـەر بنەمای زانسـتو دڵنیایی بەبـێ گومانو دوو دڵـی، بە هەمان شـێوە ئـەو کەسەشـی ﴿ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِي ﴾ (لەگـەڵ مندایە) بانگـەواز دەکات بـۆ لای خـوا وەک چۆن من بانگـەواز دەکەم، لەسـەر بنەمای چاوسـاغی ﴿ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ ﴾ لـەوەی دەدرێتـە پاڵـی کە شایسـتەی گەورەیی ئـەو نیە، یـان دژی کەماڵو تـەواوی خوایە ﴿ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ لـە هەمـوو کاروبارەکانمـدا، بەڵکـو بەندایەتی بـۆ خوا دەکەم بە دڵسـۆزی بـۆ ئاینەکەی.

(١٠٩): ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۗ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ١٠٩ ﴾:

پاشـان خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا ﴾ واتـە: فریشـتەمان نەنـاردوە، وە جگـە لەوانیـش لە بەشـەکانی تـری بەدیهێنراوەکانـدا، بە چ شـتێ قەومەکەت بـە پەیامەکـەی تـۆ سـەریان سـووڕدەمێنێ، وە وا گومـان دەبـەن کـە تۆ فـەزڵو چاکەت نیـە بەسـەریانەوە، بێگومـان بـۆ تـۆ هەیـە سەرمەشـقێکی چـاک لـە پێشـینی خۆتـەوە لە پێغەمبـەران، ﴿ نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓ ﴾ واتـە: نـەک خەڵکانـی دەشـتەکی، بەڵکو لە خەڵکـی شـارەکان، ئەوانـەی کە خـاوەن عەقڵی کامـڵو بۆچوونی تـەواون، تـا کاروباریان ڕوون بێتـەوەو دەربکـەوێ ﴿ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ (ئایـا بە زەمیندا نەڕۆیشـتوون) ئەگـەر تۆیـان بـە ڕاسـت نەزانـی ﴿ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾ (سـەرنج بـدەن! داخـۆ سـەرەنجامی ئەوانـەی پێشـووان چـۆن بـووە؟) چـۆن خوا لـە ناوی بـردوون بـە هۆی بە درۆخسـتنیانەوە، ئاگـادار بن، لـەوەی وەک ئەوان هەڵسـوکەت بکەن، سـەرەنجام وەک ئـەوان سـزا دەدرێن ﴿ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ ﴾ واتە: بەهەشـتو ئـەوەی تیایدایە لـە نـازو نیعمەتـی نەبـڕاوە، ﴿ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ ﴾ (واتە: باشـترە بـۆ ئەوانـەی خۆپاریزی دەکـەن) لە بەجێهێنانـی فەرمانەکانی خواو دوورکەوتنـەوە لە قەدەغەکراوەکانی، بە ڕاسـتی نـازو نیعمەتـی دونیـا نامێنێو دەبڕێتـەوە، بەڵام نـازو نیعمەتـی دوارۆژ تـەواوو نەبڕاوەیە، هەرگیـز تەواو نابـێ، بەڵکو بەردەوامـەو لە زیاد بووندایـە ﴿ عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ ١٠٨ ﴾ هود.

(واتــە: ئەو بەخششــە هەتا هەتایــیو نەبڕاوەیــە). ﴿ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾ واتە: ئەوەنــدە عەقڵتان نیــە چاكــەو فەزڵــی دواڕۆژ بدەن بەســەر دنیادا.

(١١٠): ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُۖ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ١١٠ ﴾:

دەفەرمــوێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ ﴾ خــوا هــەواڵ دەدات ئــەو پێغەمبــەرە بەرێــزە كان دەنێــرێ، كەلــە ســتەمكارە كانیان بــە درۆیان دەزانــن، خوا ﷻ مۆڵەتیــان دەدات بەڵكــو بگەڕێنــەوە بــۆ هەقو ڕاســتی، بــەردەوام خــوا مۆڵەتیــان پێدەدات تــا حــاڵ دە گاتــە ئەوپەڕی بێــزاری لــە لایــەن پێغەمبەرانەوە، تــا پێغەمبــەران بــە ئەوپەڕی دڵنیاییانــەوەو ئەوپــەڕی بڕوابوونیــان بــە پەیمــانو هەڕەشــەی خــوا، هەنــدێ جــار جۆرێ لــە ختــورە بــە دڵیانــدا دێت، وە جــۆرێ لــە لاوازی زانســتو بەراســتدانان، جا ئە گــەر كار گەیشــتە ئەم حاڵــە ﴿ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُۖ ﴾ (واتــە: لەو كاتەدا یارمەتــی ئێمەیان بــۆ هاتــوە، جــا هــەر كەسیشــمان بویســتایە ســزای نەدەیــن ڕزگــاری دەبــوو) ئەوانیــش پێغەمبــەرانو شــوێنكەوتوانی بوون، ﴿ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾ واتە: ســزامان ڕەتنا كرێتــەوە لەو كەســەی كە ســتەمی كــردوە، بوێری كــردوە بەرانبەر خوای باڵادەســت، ﴿ فَمَا لَهُۥ مِن قُوَّةٖ وَلَا نَاصِرٖ ١٠ ﴾ الطــارق. واتــە: هیــچ هێزو ســەرخەرێک نیە بەدەمیــەوە بێتو ڕزگــاری بكات.

(١١١): ﴿ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ مَا كَانَ حَدِيثٗا يُفۡتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَتَفۡصِيلَ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ١١١ ﴾:

﴿ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ ﴾ (واتــە: ســوێند بــە خوا لە) چیرۆكــی پێغەمبــەرانو نێردراوان لەگــەڵ گەلە كەیانــدا ﴿ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ ﴾ (واتــە: گەلــێ پەنــدو ئامۆژ گــاری مــەزن هــەن) بــۆ ئــەوەی دەرسو وانــەی لێوەربگــرن، بــۆ شــوێنكەوتەی چاكــەو شــوێنكەوتەی خراپــە، وە هــەر كەســێک وەک ئــەوان ڕەفتــار بــكات، وەک ئــەوان ڕێــزی لێدە گیــرێ، یان سەرزەنشــتو ڕیســوا دە كرێ، (دیارە شــوێنكەوتووی پێغەمبەران پاداشــت وەردە گرێ، شــوێنكەوتووی خراپە كارانیــش ڕیســوا دە كــرێ)، بــە هەمــان شــێوە عیبــرەتو پەنــدی لێوەردە گــرن كــە خــوا خــاوەن ســیفەتی تــەواوو مەزنــە، وە خوا تاكــەو تەنهایە هاوبەشــی نیــە، نابــێ عیبــادەت بــۆ كــەس بكرێ لــە غەیــری خوا.

وە خــوا كــە دەفەرمــوێ: ﴿ مَا كَانَ حَدِيثٗا يُفۡتَرَىٰ ﴾ واتــە: نا كــرێ ئــەم قوڕئانــە پیرۆزە

-کـە خـوا بـۆی دابەزاندووون لـە غەیبەوە- قسـەو باسـی هەڵبەسـتراو بێ ﴿ وَلَٰكِن ﴾ بەڵکـو ﴿ تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ ﴾ (بەڕاسـت دانەری) کتێبە پێشـووەکانە، وە شـایەتی ڕاسـتیان بـۆ دەدات ﴿ وَتَفۡصِيلَ كُلِّ شَيۡءٖ ﴾ بەنـدەکان پێویسـتیان پێیەتـی لـە بنەماو لـقو پۆکانـی ئاینیـان، وە لـە بەڵگەهێنانەوەشـدا ﴿ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾ بێگومان ئـەوان -بـە هـۆی ئـەوەی زانسـتو هەقیـان بـە دەسـت هێنـاوەو شـوێنی کەوتـوون- هیدایەتیـش بەدەسـت دەهێنـن، وە بە هۆی ئەوەی پاداشـت وەردەگرن لە ئێسـتاو داهاتوودا، میهرەبانیشـیان بـۆ دەسـتەبەر دەبێ.

## بەشێکی تایبەت

### پوختەی پەندو ئامۆژگاریو سوودە وەدەستهاتووەکانی نێو ئەم چیرۆکە مەزنە:

خوا لە سـەرەتای ئەم چیرۆکـەدا فەرموویەتی: ﴿ نَحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ أَحۡسَنَ ٱلۡقَصَصِ ﴾یوسـف، وە فەرموویەتـی: ﴿ لَّقَدۡ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخۡوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٞ لِّلسَّآئِلِينَ ٧ ﴾یوسـف. وە لە کۆتاییدا فەرمووی: ﴿ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١١١ ﴾یوسف.

یەکـەم: ئـەم چیرۆکـە لـە چاکترینـی چیرۆکـەکانو ڕوونترینیانـە، لـەوەی کـە جۆرەها گواسـتنەوەی تێدایـە لـە قۆناغێکەوە بـۆ قۆناغێکی تر، لـە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکـی دیکە، لە ناخۆشـیەکەوە بـۆ ناخۆشـیەکو منەتێک، لـە زەلیلیەوە بۆ سـەربەرزی، لـە کۆیلایەتیەوە بۆ پاشـایەتی، لە جیـاوازیو دووبەرەکیـەوە بۆ یەکگرتنو خۆشەویسـتی، لە خـەمو خەفەتەوە بـۆ دڵخۆشـیو بەختـەوەری، لـە هەرزانیـەوە بۆ گرانی، لـە گرانیەوە بـۆ هەرزانی، لـە تەنگە تاویـەوە بـۆ بەرفراوانـی، لـە نکوڵـیو ئینکارییـەوە بـۆ دانپێدانـان، پاکـیو بـەرزی بۆ ئەو خوایەی کـە گێڕاویەتیـەوەو ڕوونو ئاشـکرای کردوەتەوە.

دووەم: بنەمایەکـی تێدایـە بـۆ لێکدانـەوەی خـەوەکان، زانسـتی لێکدانـەوەی خـەو لـەو زانسـتە گرنگانەیـە کـە خوا ﷻ بە هەر کەسـێ حـەز بـکات دەیبەخشـێ، زۆرێ لەوانە کە خەوەکـەی لەسـەر بونیاد دەنرێ، گونجـانو لێکچوونە لە ناوو سـیفەتدا، خەوەکەی یوسـف کـە بینـی، خـۆرو مانگو یازدە ئەسـتێرە کڕنووشـی بۆ دەبـەن، ڕووی گونجـان تیایدا: ئەو ڕۆشـناییانە بریتیـن لـە جوانی ئاسـمان، وە بـەو جوانیەی سـود دەبەخشـێ، بە هەمان شـێوە پێغەمبـەرانو زانایـان جوانـیو ڕووناکی سـەر زەمینن، بە ئـەوان تاریکـی دەڕواتو نامێنێ، وەک چـۆن لـە خۆرو مانگو ئەسـتێرەکان ڕۆشـنایی وەردەگیـرێ، وە لەبەر ئـەوە دایکو

باوکـی ئەصـڵو بنەمان، براکانیشـی لقو پـۆن، وا دەگونجێ ئەصـڵ نورو ڕۆشـنایی مەزنتر بـێ لـە لقو پـۆکان، بۆیە خـۆر دایکی بـوو، مانگیش باوکی بـوو، ئەسـتێرەکانیش براکانی بوون.

وە ئـەوەی گونجـاوە خۆر وشـەیەکی (مؤنث)ە مێیـە، بۆیە دایکێتی، وە مانگو ئەسـتێرەکان نێرینـەن، بۆیـە تایبـەت کـراوە بـە بـاکو براکانـی، وە لـە گونجانـدا، سـوژدەبەر مەزنو بەرێـزە بە لای سـوژدە بـۆ براوەوە، وە سـوژدە بـۆ براویش مـەزنو ڕێز لێگـراوە، بەڵگەیە لەسـەر ئەوەی یوسـف مـەزنو بەرێزە لـە لای بـاوکو براکانی.

وە پێویست وایە هەڵبژێردراو فەزڵی بەسەر ئەوانەوە هەبێ لە زانستو هەرچی پێویستە بۆ ئەو مەبەستە، بۆیە باوکی پێیوت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ ﴿٦﴾ ﴾ یوسف.

وە دەربـارەی خـەوی دوو گەنجەکـە، خـەوی یەکـەم: خاوەنەکـەی بینـی لـە خـەودا ترێ دەگوشـێ، ئـەو کەسـەی کە شـەراب ئامـادە دەکات بە پێـی نەریت ئـەوە خزمەتـکارە بۆ غەیـری خـۆی، بـۆی لێکدایـەوە بەو شـێوەی کـە لێکدەدرێتـەوە، کە ئـەو شـەراب ئامادە دەکات بـۆ گەورەکـەی خـۆی، ئـەوەش ئـەوە لەخـۆ دەگرێ لـە زینـدان دەردەچێ.

وە خـەوی ئـەوەی دیکـەی لێکدایـەوە کـە بینی لەسـەر سـەری نانـی دانـاوەو باڵنـدە لێی دەخـوا، ئەوە پیسـتەی سـەریەتیو گۆشـتەکەیەتی، ئەو کەسـە هەڵدەواسـرێ لە شـوێنێکدا کـە باڵنـدە بتوانـێ لە سـەری بخوات، تەماشـای حاڵـی کرد ئەو دەکـوژرێو هەڵدەواسـرێ دوای مردنـی، دەردەخـرێ بـۆ باڵنـدەو ئەوانیش لەسـەری دەخۆن، ئـەوەش نابێـت تەنها بە هەڵواسـین نەبێ دوای کوشـتنی.

وە خـەوی پاشـای لێکدایـەوە لـە بینینـی مانگـاو گوڵەگەنمەکان، بە سـاڵانی سـەوزیو پڕ پیـتو بەرەکـەت، وە سـاڵانی وشـکو بێبارانیو برسـێتیو قـاتو قڕیـی، ڕووی گونجاو: ژیـانو بەرژەوەنـدی خەڵـک پەیوەنـدی هەیـە بە دۆخـی پاشـاکەیەوە، بە باشـبوونی باش دەبـن، وە بـە خراپبوونـی خـراپ دەبـن، بە هەمـان شـێوە سـاڵەکان بەوانە دۆخـی خەڵک بـاش دەبـنو ژیانیـان جێگیر دەبـێ یـان پێچەوانەکەی.

بـەڵام مانگـا ئـەوە زەوی پـێ دەکێڵێـدرێ، وە ئاوی پێـدەدرێ، ئەگەر سـاڵ بارانـاوی بوو ئـەوە قەڵـەو دەبـێ، وە ئەگـەر وشـکە سـاڵی بوو ئـەوە لـەڕو لاواز دەبـێ، بە هەمان شـێوە گوڵەگەنمەکانیـش لـە سـاڵی باراناوی هاتیـدا زۆر دەبێ، وە لە وشـکە سـاڵیدا کەم دەکاتو وشـک دەبـێ، ئـەوەش باشـترینی دانەوێڵەی سـەر زەویە.

سـێیەم: بەڵگەی تێدایە لەسـەر ڕاسـتیو ڕەوانی پێغەمبەرایەتی موحەممـەد ﷺ کاتێ خوا ﷻ ئـەم چیرۆکـە دوورو درێـژەی بـۆ گەلەکەی باس کـردوە، زانراوە ئـەو نە کتێبی پێشـینی خوێنـدوەو نـە وتویەتیـەوە، قەومە کـەی بـە ڕۆژ بەشـەو لـە نـاو خۆیانـدا بینیویانـە، ئـەو نەخوێنـدەوار بـوو، نەیدەزانـی بنوسـێو بخوێنێتـەوە، قورئـان دەگونجێ لەگـەڵ کتێبەکانی پێشـوودا کە لـە لایانە.

چـوارەم: کاتێک کە پلانیان دارشـت بیکوژن، ئەمە وای پێویسـت دەکـرد دوور بکەوێتەوە لـە هۆکارەکانی شـەڕو خراپە، وە شـاردنەوەی ئەو شـتەی کە گومان دەکـرێ زیان بەخش بـێ، لەبەر ئـەوە یەعقووب بـە یوسـفی وت: ﴿ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ ﴾ یوسف.

پێنجـەم: بێگومان دروسـتە باسـی کەسـێک بکـرێ کە پێی ناخۆشـە لە لای کەسـێکی تر لە ڕووی ئامۆژگاریـەوە، لەبەر فەرموودەی: ﴿ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ ﴾.

شەشـەم: نیعمەتـی خـوا بەسـەر بەندەکەیـەوە، نیعمەتێکـە بـۆ تـەواوی ئـەو خانەوادەیـەو خـزمو کـەسو دۆسـتەکانی، چونکـە دەکـرێ نیعمەتەکـە ئەوانیـش بگرێتـەوە، بـە هۆی ئـەوەوە شـتێ بەدەسـت بهێنـن، وەک یەعقـووب ﷺ لە لێکدانـەوەی خەوەکەی یوسـفدا فەرمـووی: ﴿ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ ﴾ یوسـف. کاتـێ نیعمەت تەواو بوو بەسـەر یوسـفەوە، بنەماڵەی یەعقووب بـەو هۆیـەوە لەسـەر زەویدا ڕێـزو پلەو پایەیـان زیادی کـردو جێگیر بوون تیایـدا، هەموو ئەوانـە بە هـۆی یوسـفەوە بوو.

حەوتـەم: دادپەروەری لـە هەموو کاروبارەکاندا پێویسـتە، نەک تەنها لە مامەڵەی دەسـەڵات لەگـەڵ ژێـر دەسـتەکانی خۆیـدا، تەنانـەت لـە مامەڵەکردنـی باوک بـۆ منداڵەکانیشـی لە خۆشویسـتنو گرنگی پێدانو هاوشـێوەی ئەوانە، بە وازهێنان لە دادپـەروەری کاروبارەکانی لـێ تێکدەچـێ، لەبـەر ئـەوەی کاتێ کـە یەعقووب یوسـفی پێش خسـت بەسـەر براکانیدا لـە خۆشەویسـتنو گرنگـی پێـدان، ئـەوە هات بەسـەریاندا کـە بینـرا، وە بەسـەر باوکو براکەیاندا.

هەشـتەم: خـۆ پاراسـتن لـە شـوومی خراپی تـاوان، یەک تـاوان سەردەکێشـێ بـۆ چەندین تـاوانو سـەرپێچی دیکـە، براکانـی یوسـف کاتـێ ویسـتیان یوسـفو باوکـی لـە یەکتر دابڕێنـن، چەندین فێڵیـان بەکارهێنا، وە چەندیـن جار درۆیان بەدەمەوە کرد، وە سـاختەیان

بەرانبەر بە باوکیان کرد لە کراسەکەی یوسفو ئەو خوێنەی خستیانە سەر کراسەکە، وە لە هاتنیاندا لە کاتی عیشادا بە گریان، دوور نیە کە لەو ماوەدا زۆر باس کرابێ (لە هەموو وەڵامدانەوەیەکدا درۆیەکیان کردوە)، بەڵکو دەگونجێ لە کاتی دانیشتندا هەر کە باسی یوسف بهاتایەتە ناو، کۆمەڵە هەواڵێکی درۆو بوختان بکرایە، ئەمەش شوومی درۆو شوێنەوارەکانیەتی کە بە دوای خۆیدا دەیهێنێ.

نۆیەم: پەندو عیبرەت لە حاڵی مرۆڤدا بە سەرەنجامو کۆتایەکەیەتی نەک بە ناتەواوی سەرەتای، بێگومان منداڵەکانی یەعقووب ﷺ ئەوەی ڕوویدا لێیانەو لە سەرەتادا ڕوویدا، کە بە ڕاستی گەورەترین هۆکاری ناتەواوی‌و سەرزەنشت کردنە، پاشان کارەکانیان کۆتایی هات بە تەوبەی ڕاستەقینەو نەصوح، وە لێبوردنی تەواو لە لایەن یوسفو باوکیەوە، وە پاڕانەوە بۆیان بە لێخۆشبوونو میهرەبانی، جا ئەگەر بەندە لە مافی خۆی خۆش بێ، بێگومان خوا باشترینی لێبوردەکانە. لەبەر ئەمە لە ڕاسترینی بۆچوونەکاندا، ئەوان پێغەمبەر بوون[٨]، لەبەر ئەو فەرمایشتەی خوا: ﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ ﴿١٦٣﴾﴾النساء

ئەوانیش منداڵەکانی یەعقووب بوون، دوازدە دەستەکەو وەچەکانیشیان، ئەوەشی دەبێتە بەڵگە بۆ ئەوە، یوسف لە خەوەکەیدا بینیانی ئەستێرەی ڕووناک بوون، ئەستێرەش ڕووناکی تێدایە کە لە سیفاتی پێغەمبەرانە، ئەگەر پێغەمبەر نەبن، ئەوە زانای هیدایەتدەرن.

دەیەم: خوا منەتی خۆی کرد بەسەر یوسف ﷺ بە زانستو لەسەرخۆیی‌و ڕەوشتی بەرز، وە بانگەواز کردن بۆ لای خواو ئاینەکەی، وە لێبوردنی لەو برایانەی کە هەڵەکار بوون، لێبوردنێک کە دەست پێشخەری تێدا کرد، وە بەوەش تەواوی کرد کە گلەییان لێناکاتو سەرزەنشتیان ناکات، پاشان چاکەی مەزنو گەورەی لەگەڵ باوکو دایکیداو ئیحسانی لەگەڵ براکانیدا، بەڵکو بۆ هەموو بەدیهێنراوەکان.

یازدە: هەندێ شەڕو خراپە هەیە ئاسانترو سوکترە لە هەندێکیان، بێگومان براکانی یوسف کاتێ کە یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی بیکوژن، یان فڕێی بدەنە سەر زەوی، قسەکەرێکیان وتی: ﴿لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ ﴿١٠﴾﴾یوسف. (واتە:

٨) بێگومان ئەوان پێغەمبەر نەبوون، ئەم بۆ چوونە زۆر لاوازەو کاری پێناکری، والله أعلم. چونکە پێچەوانەی، دەقەکانی قورئانە، وە پێچەوانەی وتەی (شێخ سەعدی)یە لە خاڵی هەشتەمدا هەندێکی باس کردوە. وەرگێر.

یوسـف مەکـوژن فرێـی بدەنـە نـاو بیرێکـی قوڵەوە) قسـەکەی باشـترو ئاسـانتر بـوو، بە هـۆی ئـەوەوە تاوانـی گەورەیان لەسـەر سـووک کرا.

دوازدە: ئەگـەر شـتێک دەسـتاو دەسـتی پـێ بکـرێو ببێتە بەشـێک لـە مـاڵو موڵکەکان، وە نەزانـێ ئـەوە لەسـەر شـێوەیەکی رێگـە پێنـەدراوە لـە بنەرەتدا، ئـەوە تاوانبـار نابێ ئەو کەسـەی کریـنو فرۆشـتنی پێـوە دەکات، یـان خزمەتـکاری یان سـوود وەرگرتـن، یان بـەکار هێنان، یوسـف ﷺ براکانی فرۆشـتیان بە فرۆشـتنێکی حەرامو نادروسـت، پاشـان کاروانـی رێبـوار بردیـان بۆ میسـر لەوێ بازرگانیـان پێوە کـرد، بوو بە غوڵامێکـی کۆیلە، خـوای گەورەیـش نـاوی لێنا کریـن، لایان مایـەوە بە پلـەی منداڵێکـی کویلـەی بەرێز.

سـێزدە: خۆپارێـزی لـە مانەوە لەگـەڵ ئەو ئافرەتانەدا مەترسـی فیتنـەی لێدەکـرێ، بە هەمان شـێوە ئاگاداربـوون لـە خۆشەویسـتیەک کـە تووشـی زیانـی گـەورەی بـکات، بە راسـتی شـاژنی عەزیـز ئەوەی لێیـەوە روویدا کـە روویدا، بە هۆی ئـەوەی زۆر لەگەڵ یوسـفدا بوو، وە زۆریـش خۆشـی دەویسـت، وازی لێنەهێنا تا سـەرەنجام هەوڵی کاری فاحیشـەی لەگەڵدا دا، پاشـان درۆی بـە دەمـەوە کـرد، بە هۆی ئـەوەوە زیندانی کـرا بـۆ ماوەیەکی زۆر.

چـواردە: ئـەو نیـازەی کـە یوسـف ﷺ بـە شـاژنی کـرد، پاشـان لەبـەر خـوا ﷻ وازی لێهێنـا، ئـەوە لـە خـوا نزیکـی کـردەوە، چونکە نیـاز کـردن بانگکەرێکـە لـە بانگکەرانی نەفـسو فەرمانکـەر بـە خراپە، ئـەوە سروشـتی زۆربـەی بەدیهێنراوەکانـە، کاتێ لـە نێوان ئـەو کارەو خۆشەویسـتیو ترسـی خـوای هاوتـا کـردوە، خۆشەویسـتی خـوا ﷻ زاڵبـوو بەسـەر بانگکـەری هەواو ئـارەزودا، ئەو کات بـوو یەکێـک لەوانەی (کە خـوا دەربارەیان دەفەرمـوێ): ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾﴾ النازعـات. (واتـە: بەڵام ئەو کەسـەی لـە گەورەیی دەسـەڵاتی پەروەردگاری ترسـا بـێ، وە جڵەوی نەفـسو هەواو ئـارەزووی خـۆی گرتبـێ). وە لەو حەوت کەسـەی کە خوا لەسـێبەری خۆیـدا دایاندەنێت، لـە رۆژێکـدا هیچ سـێبەرێک نیـە بێجگە لە سـێبەری ئـەو، یەکێکیـان: {رَجُـلٌ دَعَتْهُ امْـرَأَةٌ ذَاتُ حُسْـنٍ وَجَـمَالٍ، فَقَـالَ: إِنِّي أَخَـافُ اللهَ} (أَخْرَجَـهُ الْبُخَـارِيُّ برقـم: (١٤٢٣)، وَمُسْـلِمٌ برقـم: (٩١)) واتـە: پیاوێـک ئافرەتێکـی جـوانو خاوەن پلەو پایـە بانگی بکات بـۆ کاری خراپە، بڵـێ: مـن لـە خوا دەترسـم. بەڵام ئـەو نیـازەی کە بەندە لەسـەری سـەرکۆنە دەکـرێ، ئەو نیازەیـە کـە لـە دڵیـدا جێگیـر دەبـێ، وە سـوری دەکات لەسـەر تـاوان، هەنـدێ جـار بە کـردەوەش دەیکات.

پـازدە: هـەر كەسـێک بـرواو ئیمـان بچێتـە نـاو دڵیـەوە، لـە سـەرجەم كارەكانـدا دڵسـۆز بـێ، ئـەوە بێگومـان خـوا ﷻ هەمـوو جۆرەكانـی گوناهـو سـەرپێچی هۆكارەكانـی لێـی دوور دەخاتـەوە بـە هۆی نـوری ئیمانو دڵسـۆزی راسـتەقینەیەوە، ئـەوەش پاداشـتی برواو دڵسـۆزیەتی، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ۚ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾یوسف. لـە خوێندنـی ئـەوەی بە (كسـر)ەی (الـلام) دەیخوێنێتەوە، ئەوەشـی بە (فتحـە) بیخوێنێتەوە، ئەوە لە دڵسـۆزی خوایە بـۆ یوسـف، ئەوەش دڵسـۆزی یوسـف بۆ نەفسـی خـۆی لەخۆ دەگـرێ، كاتێ دڵسـۆزی بۆ خـوا ﷻ نوانـد، خـواش دڵسـۆزی لەگەڵـدا كـرد، وە رزگاری كرد لـە گوناهو فاحیشـە.

شـازدە: پێویسـتە لەسـەر بەنـدە هەركاتـێ شـوێنێكی بینـی دەبێتە مایـەی فیتنـەو هۆكاری سـەرپێچی كـردن لێـی دووربكەوێتـەوە، تـا بتوانـێ پێویسـتە لێی رابـكات، بۆ ئـەوەی لە سـەرپێچی رزگـاری ببـێ، چونكـە یوسـف عليه السلام كاتـێ شـاژن زۆری لێكرد لـە ماڵەكەی خۆیـدا، رایكـرد بـۆ ئـەوەی رزگاری ببـێ لـە شـەرو خراپەكاریی.

حەڤـدە: لـە كاتی گومانو دوودڵیدا قەرینـە كاری پێدەكرێ، ئەگەر ژنو مێـردێ دەمەقاڵیان بـوو لـە قـاپو قاچاخی نـاو ماڵ، ئـەوەی دەگونجێ بـۆ پیاو ئەوە هـی پیاوەكەیە، ئەوەشـی دەگونجـێ بـۆ ژن ئەوە بـۆ ژنەكە دەبـێ، ئەمە ئەگـەر بەڵگە نەبـوو، بە هەمان شـێوە ئەگەر دار تـاشو ئاسـنگەرێ مشـتو مڕیان كرد لەو كەرسـتانە كە كاری پێدەكـەن، هیچ كامیان بەڵگەیـان نەبـوو، كار بـەوە دەكـرێ كەرسـتەی نەجار بـۆ نەجـارو كەرسـتەی دارتاش بۆ دارتـاش، بێگومان شـایەتەكەی یوسـف شـایەتی بـە قەرینـەدا، وە بڕیاری لەسـەر دا دڕینی كراسـەكە، وە دڕینـی لە دواوە كردە بەڵگە لەسـەر ڕاسـتی یوسـفو درۆزنی ژنەكە.

وە ئـەوەش دەبێتـە بەڵگـە بۆ ئەم یاسـایە، بینینـی پێوانە لە ناو بـاری براكەیدا بـوو بە مایەی ئـەوەی بڕیـاری دزێتی بەسـەردا بچەسـپێت، بەبـێ شـایەتیو دانپێدانان، لەسـەر ئەمە ئەگەر ماڵـی دزراو بـە دەسـتی دزەوە بـوو، بـە تایبـەت ئەگـەر بـە ناوبانگ بـوو بە دزێتـی، ئەوە بڕیـاری دزێتـی دەدرێـت بەسـەریدا، ئەمـە لـە شـایەتی بەهێزتـرە، بە هەمـان شـێوە بینینی كەسـێک دەرشـایەوە ئـارەق لە دەمـی دەهاتە خـوارەوە، یـان بینینـی ئافرەتێ سـكی پڕبی نەپیـاوی هەبـێو نە گەورە (سـید)، ئەوە یاسـای بەسـەردا دەسـەپێ، ئەگەر بەربەسـتێ نەبێ بـۆ ئەوە، بۆیـە خوا ئەم بڕیـارەی كردوە بە شـایەت، جا فەرمـووی: ﴿ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَآ ﴿٢٦﴾ ﴾یوسـف. (واتـە: شـایەت حاڵێک لـە خزمی ژنەكە شـایەتیدا).

هـەژدە: جوانی یوسـف لە ڕووخسـارو لـە ناخیدا بوو، جوانـی دەرەوەی وای کـرد لە ژنەکە کـە کـردی، وە ئەو ژنانـەش کە کۆی کردنـەوە، کاتێ کە سەرزەنشـتیان کرد لەسـەر ئەو کارە، دەسـتەکانی خۆیانیان بڕیو وتیان: ﴿مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾﴾ یوسـف. (واتـە: ئـەم لاوە ئادەمـی نیـە، ئەمە فریشـتەیەکی قەشـەنگو خـاوەن ڕێزە). بـەلاّم جوانی ناخـی، ئەو خۆپاراسـتنە مەزنەیە لەسـەر سـەرپێچی کردن، لەگـەڵ بوونی هـۆکاری زۆر بۆ ئەنجامدانـی، وە شـایەتیدانی شـاژنو ئافرەتەکانـی دیکە بە پاکـیو بێگەردی، لەبـەر ئەمەیە شـاژنی عەزیـز وتـی: ﴿وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ ﴿٣٢﴾﴾ یوسف، (واتـە: بێگومـان هەوڵێکـی زۆرم لەگەڵیـدا، بـەلاّم هـەر خـۆی گرت) پاشـان وتـی: ﴿ٱلْـَٰٔنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾﴾ یوسـف. (واتـە: ئێسـتا بـێ پـەردە هـەقو ڕاسـتی ئاشـکرا بـوو، مـن بـووم تەماحم لە یوسـف کـرد، بێگومان ئـەو لاوێکـی بێتاوانو ڕاسـتگۆیە) ئافرەتەکانیش وتیان: ﴿حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ﴿٥١﴾﴾ یوسـف، (واتە: خـوا بـەوڕۆژە نـەکا ئێمـە بوختانی بـۆ بکەیـن، ئێمە هیـچ جـۆرە هەڵـەو خراپەیەکمان لە یوسـف نەدیوە).

نۆزدە: یوسـف ﷺ زیندانی هەڵبژارد بەسـەر سـەرپێچیدا، کەواتە: پێویسـتە لەسەر مسوڵمان ئەگـەر تووشـی بەلاّ بـوو لە نێـوان دوو شـتدا، یان گوناهـو تاوان، یـان سـزایەکی دنیایی، ئـەوە بـا سـزای دنیایـی هەڵبژێـرێ لەسـەر ئەنجامدانـی تاوانێـک ببێتـە مایەی سـزایەکی تونـد لـە دنیـاو دوارۆژدا، لەبەر ئەمەیـە لە نیشـانەکانی بڕوابـوون، مرۆڤ پێـی ناخۆش بێ بچێتـەوە سـەر ئـەو گوناهـە پاش ئـەوەی خوا ﷻ ڕزگـاری کـردوە لێی، وەک چـۆن پێی ناخۆشـە فـڕێ بدرێتە نـاو ئاگرەوە.

بیسـت: پێویسـتە لەسـەر بەنـدە پەنـا بباتـە لای خـوا ﷻ لـە کاتـی بوونـی هۆکارەکانـی سـەرپێچی، خـۆی بـەری بکات لـە هێزو توانای خـۆی، وەک یوسـف ﷺ دەڵێ: ﴿وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّى كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾﴾ یوسـف. (واتـە: خـۆ ئەگـەر تـۆ فێـڵو حیلـەی ئەوانـم لـێ لانەدەیـت لەوانەیـە دڵـم مەیلی ئـارەزوو بـکاتو بچمـە ڕیزی نەفامەکانـەوە).

بیسـتو یەک: زانسـتو عەقـڵ خاوەنەکەیان بەرەو خێـرو چاکە دەبەن، وە شـەڕو خراپەی لـێ قەدەغـە دەکـەن، وە نەفامـی خاوەنەکـەی بانـگ دەکات بـۆ گونجـان لەگـەڵ هەواو نەفسـدا، ئەگـەر سـەرپێچیەکە زیانی بـۆ خاوەنەکـەی هەبێ.

بیستو دوو: وەک چۆن پێویستە لەسەر ئینسان عیبادەتی خوا ﷻ بکات لە خۆشیدا، بە هەمان شێوە پێویستە عیبادەتی بکات لە کاتی نارەحەتیو تەنگانەدا، یوسف ﷺ بەردەوام لە خوا دەپاڕایەوە، کاتێ خرایە زیندانەوە بەردەوام بوو لەسەر ئەوە، وە بانگی ئەو دوو گەنجەی کرد بۆ یەکتاپەرستی، وە هاوبەشدانانی لێ قەدەغە کردن، لە زیرەکیو ژیری یوسف ﷺ کاتێ کە بینی ئەوان لە ئاستی بانگەوازەکەیدان، -کاتێ کە ئەوان گومانی باشیان بۆ بردو پێیان وت: ﴿إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ۝٣٦﴾یوسف. (واتە: وا دەزانین تۆ کەسێکی ڕەوشت بەرزو چاکە خوازیت). هاتنە لای بۆ ئەوەی خەوەکەیان بۆ لێکبداتەوە، تەماشای کردن زۆر تامەزرۆی لێکدانەوەی خەوەکەیانن- ئەوەی کردە هەلێکو وەریگرت، بانگی کردن بۆ لای خوا ﷻ پێش ئەوەی خەوەکەیان بۆ لێکبداتەوە، لەبەر ئەوەی ئامانجەکەی بپێکێ، وە نزیک ببێتەوە لەوەی دەیەوێ، سەرەتا ئەوەی بۆ ڕوون کردنەوە، ئەو کەسەی کە ئەمی گەیاندوە بەو حاڵەی کە دەیبینن لە کەماڵو زانست، بڕوابوونو یەکتاپەرستیەتی، وە وازهێنانی لە میللەتێک کە بڕوایان بە خواو ڕۆژی دوایی نیە، ئەمەش بانگەشە کردنیان بوو بە زمانی حاڵ، پاشان بە زمانی قسە کردن بانگی کردن، فەسادو خراپی هاوبەشدانانی بۆ ڕوون کردنەوە، بە بەڵگەی ڕوونو ڕاستی یەکتاپەرستیو نموونەی بۆ هێنانەوە.

بیستو سێ: (ئینسان) دەبێت لە گرنگەوە بۆ گرنتر دەست پێبکات، ئەگەر زاناو موفتی پرسیاری لێکرا، پرسیارکەر پێویستیەکەی لە پرسیارەکەی گرنگتر بوو، ئەوە پێویستە سەرەتا فێری بکات چی پێویستە بۆی، پێش ئەوەی وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە، ئەمە نیشانەیە لەسەر بە توانایی‌و (سەر ڕاستی لە) ئامۆژگاری مامۆستا، یوسف ﷺ کاتێ کە دوو گەنجەکە پرسیاری خەوەکەیان لێکرد، پێش ئەوەی خەوەکەیان بۆ لێکبداتەوە، بانگی کردن بۆ لای خوای تاکو تەنهاو بێ هاوەڵ.

بیستو چوار: ئەو کەسەی دەکەوێتە ناو نارەحەتیو ناخۆشیەوە، گوناهبار نابێ ئەگەر داوا لە کەسێ بکات هاوکاریو یارمەتی بداتو ڕزگاری بکات، یان حاڵی خۆی لەلا باس بکات، ئەمە سکاڵابردن نیە بۆ لای دروستکراو، بێگومان ئەمە شتێکی ئاسایی لە عورفو نەریت کە خەڵکی هەندێکیان هاوکاری یەکتر دەکەن، لەبەر ئەمەیە یوسف فەرموویەتی: ﴿ٱذْكُرْنِى عِندَ رَبِّكَ ۝٤٢﴾یوسف.

بیستو پێنج: پێویستە لەسەر مامۆستا لە کارەکەیدا دڵسۆزی تەواوی تێدابێ، با

فێرکردنەکەی نەکاتە کەرستەیەک لە بەرانبەریدا پارە وەربگرێ، یان لەبەر ئەوەی بناسرێ، یان سوود وەربگرێ، وە ڕێگری نەکات لە فێرکردنی خەڵک، یان ئامۆژگاری نەکات، ئەگەر داواکەر ئەو ئەرکەی مامۆستا دایبەسەریدا جێبەجێی نەکرد، بە ڕاستی یوسف ئامۆژگاری کردو وەڵامی دایەوە، ئامۆژگاری یەکێک لەو دوو گەنجەی کرد، باسی بکات لە لای پاشا، باسی نەکردو بیری چوو، کاتێ کە پێویستیان بە وەڵامی یوسف ﷺ بوو، ئەو گەنجەیان نارد، هات بۆ لای پرسیاری لێکدانەوەی خەوەکەی لێکرد، یوسف ڕەق نەبوو لەگەڵیدا، وە سەرزەنشتی نەکرد لەبەر ئەوەی بیری چووە لای پاشا باسی بکات، بەڵکو وەڵامی پرسیارەکەی دایەوە بە چاکترین شێوە.

بیست‌و شەش: پێویستە لەسەر بەرپرس ڕێ پێشاندەری پرسیارکەر بێ لەسەر کارێک کە سوودی بۆی هەبێ‌و پەیوەندی بە پرسیارەکەیەوە بێت، وە ڕێنمایی بکات بۆ ڕێگایەک سوودی بۆ دین‌و دنیاو هەبێ، بەڕاستی ئەمە لە تەواوی شارەزایی ئامۆژگاری‌و جوانی ڕێنماییەتی، بێگومان یوسف ﷺ تەنها بە لێکدانەوەی خەوی پاشاوە نەوەستا، بەڵکو لەگەڵ ئەوەدا ڕێنمایی کردن لەسەر ئەوەی چی دەکەن لەو ساڵانەدا کە بارانی تێدا دەباری‌و هەرزانی دەکەوێتە وڵاتەوە، لە زۆر کردنی کشت‌و کاڵ‌و هەڵگرتنی.

بیست‌و حەوت: مرۆڤ لۆمە ناکرێ لە هەوڵدان بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر تۆمەتێک بخرێتە سەری، وە داوا کردنی پاکی‌و بێتاوانی بۆی، بەڵکو لەسەری ستایش دەکرێ، وەک چۆن یوسف بەرگری کرد لە دەرچوون لە زیندان تا پاکی‌و بێگەردی ڕوون بوویەوە بۆیان دەربارەی ئەو ئافرەتانەی کە دەستەکانی خۆیانیان بڕی.

بیست‌و هەشت: فەزڵی زانست، زانستی ئەحکام‌و شەرعی، وە زانستی لێکدانەوەی خەو، وە زانستی بەڕێوەبردن‌و پەروەردەکرن، زانست زۆر چاکترە لە وێنای ئاشکرای جوانی، ئەگەر ئەوە بگاتە جوانی یوسف، بێگومان یوسف بەهۆی جوانیەوە ئەو هەموو بەڵاو ناخۆشیەی بەسەر هات، وە بە هۆی زانستەوە گەیشت بەو پلەو پایە بەرزە، بە ڕاستی هەموو خێرێک لە دنیاو دوارۆژدا لە شوێنەوارەکانی زانستە.

بیست‌و نۆ: زانستی لێکدانەوەی خەون یەکێکە لە زانستە شەرعیەکان، مرۆڤ پاداشت وەردەگرێ لەسەر فێربوون‌و فێر کردنی، لێکدانەوەی خەون دەچێتە چوارچێوەی فەتواوە، بۆیە بە دوو گەنجەکەی وت: ﴿ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ ﴾ یوسف. (واتە: ئەوەی پرسیارتان دەربارەی کرد لە لای خوا بڕاوەتەوەو ناگۆڕدرێ) لاوەکەیش

بــە یوســفی وت: ﴿ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٍ ﴿٤٦﴾ ﴾ یوسـف. (واتـە: ڕای خۆت بـدە دەربارەی حـەوت مانگا) بەبـێ زانیاریی دروسـت نیـە خـەون لێکبدرێتەوە.

ســـی: ئاسـاییە ئەگـەر مـرۆڤ باسـی خۆی بـکات، بە سـیفەتی بەرزو تـەواو لـە زانیاریی، یـان کـردەوە، ئەگـەر بەرژەوەنـدی تێدا بـوو، مەبەستیشـی پێی ڕیـاو ڕووپامایـی نەبێ، وە پارێزراویـش بێت لە درۆ، یوسـف وتـی: ﴿ قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾ ﴾ یوسف. (واتـە: یوسـف بە (پاشـای) فەموو لەسـەر خەزێنـەو دارایی زەوی (میسـر) دا دامنـێ، بـە ڕاسـتی مـن پارێزەرێکی شـارەزام). بە هەمان شـێوە دەسـەڵات زەمنەکراوەو خـراپ نیـە، ئەگـەر دەسـەڵات پێـدراو تیایـدا مافەکانـی خـوا ﷻو مافـی بەندەکانـی بە جـێ بهێنـێ، داواکردنیشـی ئاسـاییە، ئەگـەر بـە تواناتـر بـێ لە غەیـری خۆی، تەنهـا ئەوە سەرزەنشـتکراوە، ئەگـەر توانـای تیـادا نەبـێ، یان کەسـێکی تر هەبێ هاوشـێوەی ئـەو بێ، یـان لـەو بـە توانا تر بـێ، یـان نەتوانێ پـەرە بدات بـە ئاینی خـوا ﷻ، بەم جۆرانـە قەدەغە کراوە داواکـردنو ڕووتێکردنی دەسـەڵات.

ســیو یەک: خوا خـاوەن ڕێزو بەخشـندەیی بەرفراوانە، بەخشـندەیە بەسـەر بەندەکەیەوە بە چاکـەی دونیـاو دواڕۆژ، وە چاکـەی دواڕۆژیش دوو هـۆکاری هەیە: بڕوابـوونو تەقوای خـوا ﷻ، بێگومـان باشـترە لـە پاداشـتو موڵکـی دونیـا، بەنـدە دەبـێ بانگـی دەروونو نەفسـی خـۆی بـکاتو هانی بدات دڵخۆشـی بکات بـە پاداشـتی خـوا ﷻ، وازی لێنەهێنێو خـەم دایبگـرێ، ئەگـەر شـوێنکەوتووانی دونیـای بینـی لـە خۆشـیو چێـژ وەرگرتنـدان، ئـەو نەیدەتوانـی، بەڵکـو دەبـێ بـە پاداشـتو فـەزڵو چاکـەی خوایـی هانی بـدات، لەبەر فەرمـوودەی خـوای بـەرز: ﴿ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾ یوسف (واتـە: بـە ڕاسـتی پاداشـتی ڕۆژی دوایـی چاکترە بۆ ئـەو کەسـانەی بڕوایان هێنـاوە وە بە هەمیشـەیی خۆپاریـز بوون).

ســیو دوو: کۆکردنـەوەی ڕزقو ڕۆزی ئەگـەر مەبەسـت پێـی ئاسـانکاری بێ بـۆ خەڵکی بـە بـێ زیانێ کە تووشـی بـێ، ئـەوە ئاسـاییە، چونکـە یوسـف ﷺ فەرمانی پێکـردن بە کۆکردنـەوەی ڕزقو ڕۆزیو خواردەمەنیـەکان لەو سـاڵانەی کە پڕن لە پیـتو بەرەکەت، بـۆ خـۆ ئامـادە کـردن بـۆ ئـەو سـاڵانەی کـە وشـکو بـێ بارانیـە، ئەمـەش پێچەوانەی پشتبەسـتن نیـە بـە خوا، بەڵکو بەندە پشـت بە خـوا ﷻ دەبەسـتێ، وە کار بـەو هۆکارانەش دەکات کـە خێـری دنیـاو دواڕۆژی تێدایە.

سـیو سـێ: چاکـی بەڕێوەبـردن کاتـێ کـە خەزێنەی زەوی میسـری لە ئەسـتۆ گـرت، تا خۆراکیـان زۆرو زەبەنـد بـوو، خەڵکـی دەورو بـەری میسـر پەنایـان بـۆ دەبردن بۆ بەشـە خـۆراک، چونکـە دەیانزانـی لەوێ بەدەسـتی دەهێنن، جا هەموو کەسـێک بە قەد پێویسـتی خـۆی پێـدەدرا، یان کەمتـر، هەر کەسـێ بهاتبایـە زیاتر لەباری حوشـترێکی پێنـەدەدرا.

سـیو چـوار: ڕێگـە پێدانـی میوانداری، ئـەوەش لـە سـوننەتی پێغەمبەرانـە، وە ڕێزگرتن لە میـوان، وەک یوسـف بـە براکانـی فەرمـوو: ﴿أَلَا تَرَوْنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ٥٩﴾یوسف. (واتـە: ئایـا نابینـن مـن بـە تێـرو تەسـەلی پێوانـەو بارتـان ئەدەمـێ، مـن چاکتریـن خانـە خـوێ بـووم بۆتان).

سـیو پێنـج: گومانی خـراپ لەگـەڵ بوونـی قەرینەکانـدا کە ئامـاژەی پێبکەن بەربەسـت نەکـراوەو قەدەغـە نیـە، چونکـە یەعقووب ؏ بـە منداڵەکانـی وت: پاش ئـەوەی ڕێگای نـەدا یوسـفیان لەگەڵـدا بنێرێ، تـا زۆر داوایـان لێکرد، پاش ئـەوەی کە گەڕانـەوەو وتیان گـورگ خواردوویەتـی پێـی فەرمـوون: ﴿بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا ١٨﴾یوسـف، بۆ براکەی تریشـیان پێی فەمـوون: ﴿قَالَ هَلْ ءَامَنُكُمْ عَلَيْهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمْ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبْلُ ٦٤﴾یوسـف، پاشـان کە یوسـف لای خۆی هێشـتیەوە، بـرا باوکیەکانـی هاتن بۆ لای باوکـی، ئەویـش پێـی فەرمـوون: ﴿بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا﴾ ئـەوان لـە کۆتایی دا ئەگـەر چـی تاوانباریـش نەبـوون، ئەوەی کە لـە پێشـتر ڕوویدا بـوو بە مایەی ئـەوەی کە باوکیـان ئـەم قسـەی پێ وتـن، بەبێ ئـەوەی گوناهبـار بێ.

سـیو شـەش: ئـەو هۆکارانـەی دەبنـە مایـەی ڕێگـری لـە چـاو پیسـی جگـە لـەوەش لە نارەحەتیـەکان، یـان بـەرزی دەکەنـەوە پاش ئـەوەی کـە دایبەزانـدوە، ڕێگە لێگیـراو نیە بەڵکـو دروسـتە، ئەگـەر چـی هیـچ شـتێک بە قـەزاو قـەدەری خـوا نەبـێ ڕوونـادات، بە هەمـان شـێوە هۆکارەکانیـش لە قـەزاو قـەدەرن، لەبەر فەرمانـی یەعقـووب ؏ کاتێ بە کوڕەکانی فەرمووو: ﴿يَٰبَنِيَّ لَا تَدْخُلُواْ مِنۢ بَابٍ وَٰحِدٍ وَٱدْخُلُواْ مِنْ أَبْوَٰبٍ مُّتَفَرِّقَةٍ ٦٧﴾یوسـف، (واتـە: کوڕەکانـم کـە نزیکی شـار دەبنـەوە هەمـوو پێکـەوە لە یـەک دەرگـا مەچنە ناو شـارەکەوە، لـە دەروازەی جیاواز بچنـە ژوورەوە).

سـیو حـەوت: دروسـتە بەکار هێنانـی فـرتو فێڵێک بەوهۆیەوە بۆ گەیشـتن بـە مافەکان، بێگومـان زانینـی ڕێگا شـاراوەکان بـۆ ئەوەی بگاتـە ئامانجەکەی شـتێکی چاکـەو جێگای سـتایش کـراوە، بەڵکـو ڕێگەپێنەدراو و خۆدزینەوەیـە لە هەڵگرتنو لابردنـی واجبێک، یان

کارێکــی قەدەغەکراو.

سـیو هەشـت: پێویسـتە ئەو کەسـەی کـە دەیەوێت کەسـی بەرانبـەری بە شـتێکی نەزانێ کـە پێی ناخۆشـە، ئـەوە بەربەسـتی زارەکـیو کرداریانە بـەکار بهێنـێ کە دەبنـە ڕێگر لە بـەردەم درۆکردنـدا، وەک چـۆن یوسـف ﷺ پێوانەکـەی خسـتە نـاو بـاری براکەیەوە، پاشـان دەریهێنـا، تـا بـە ڕووکەش وابزانـرێ ئـەو دزە، وە هیچی تێـدا نیە تەنها ئـەو قەرینە ڕووکەش کـراوە نەبێ بۆ براکەی، پاش ئەوە فەرمـووی: ﴿ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ ﴿٧٩﴾ ﴾ یوسـف، نەیفەرمـوو: (من سرق متاعنا) (واتـە: ئەوەی ماڵەکەی دزیویـن)، وە هەروەهـا نەیفەرمـوو: (إنـا وجدنا متاعنـا عنـده)، (واتە: ئێمـە ماڵەکەی خۆمان لای ئـەو دۆزیـەوە) بەڵکـو قسـەیەکی گشـتی کرد بـۆ ئەو بگونجـێو بۆ غەیـری ئەویش، لـەوەدا قەدەغەکـردن نیـە، بـەڵام گومانی تێدایـە کە ئـەو دزە، لەبـەر ئـەوەی ئامانجی ئەو سـاتەی کـە تیایدایـە بیپێکـی، وە لـە لای براکـەی بمێنێتەوە، بێگومـان ئەو گومانە لەسـەر براکـەی نەمـا کاتێ کـە حاڵەکـە ڕوون بوویەوە.

سـیو نـۆ: دروسـت نیـە بۆ مرۆڤ شـایەتی بـدات مەگەر پـاش ئـەوە نەبێ کە بـە تەواوی زانسـتو حەقیقەتـی بـۆ دەربکـەوێ، یـان بـە بینیـن، یـان بـە هەواڵی ئـەو کەسـەی کە متمانـەی پێیەتـیو ویژدان پێی ئاسـودە دەبێ، لەبـەر ئەو وتەیـان: ﴿ وَمَا شَهِدۡنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمۡنَا ﴿٨١﴾ ﴾ یوسـف: (واتـە: تا ئیسـتاش شـایەتیمان بۆ هیچ شـتێ نەداوە، مەگـەر بەچاو بینیبێتمان).

چـــل: ئـەو میحنەتو ناخۆشـیەی کە خـوا یەعقووبی خۆشەویسـتی خۆیـی ﷺ پێ تاقی کـردەوە، کاتـێ بڕیـاری بـە جیاکردنـەوەی نێـوان ئـەوو کوڕەکـەی دا، کە ناتوانـی لێی جیابێتـەوە تەنانـەت بـۆ سـاتێکیش، وە خەمبـاری دەکات بەوپـەڕی خەمبار بـوون، بۆیە بۆ ماوەیەکـی زۆر لـە یەکتـر دابیراندن کە کەمتـر نەبوو لە بیسـتو پێنج سـاڵ، یەعقوب ئەو ماوەیـە خەمی لـێ دانەبـڕا، ﴿ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ ﴿٨٤﴾ ﴾ یوسـف. (واتـە: جـا بـە هۆی خـەمو خەفەتـەوە (ئاوی سـپی) پەڕیە سـەر هـەردوو چاوی).

پاشـان خـەمو خەفەتـی زیـادی کـرد، تـا جیابوونـەوەی کـوڕی دووەمـی بـرای یوسـفی بەسـەردا هـات، بەوشـێوە ئارامگربوو لەسـەر فەرمانی خـوا ﷻ، چاوەڕوانی پاداشـتی دەکرد لـە لای خـوا، پەیمانـی دابـوو بە جوانـی ئـارام بگـرێ، بێگومـان پەیمانەکەی خـۆی بردە سـەر، وتەکەیشـی پێچەوانەی ئەوە نیە کـە فەرمـووی: ﴿ قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى

ﱡ ﭐ ﱡ ... اللَّهِ ﴿٨٦﴾ ﴾یوسف. (واتـە: تەنها سـکاڵاو خەمو پـەژارەم دەبەم بۆ لای خـوا ﷻ) بێگومان سـکاڵا بـردن بـۆ لای خـوا ﷻ پێچەوانـەی ئارامگرتن نیـە، بەڵام ئـەوە پێچەوانەیە سـکاڵا ببرێـت بۆ لای دروسـتکراوەکان.

چـلو یەک: کردنـەوەی دەرگـای خێر لەگـەڵ ناڕەحەتیدایـە، لە پاش هەموو ناخۆشـیەک خۆشـی دێـت، کاتـێ کـە خـەمو پـەژارە درێـژەی کێشـاو تـەواو ناڕەحەتی کـرد، پاش ئـەوەی ناڕەحەتـی بەرۆکی بنەماڵـەی یەعقووبی گرتـەوە، خوا ﷻ دەرگـای ئومێدو هیوای بەسـەردا کردنـەوە، گەیشـتن بـە یەکتـر لـە توندتریـنو ناڕەحەتتریـن دۆخدا، بەو شـێوە پاداشـتی تـەواوی بەدەسـت هێنـاو دڵـی خۆش بـوو، بێگومـان لـەوەدا ئـەوە دەردەکەوێ خـوا ﷻ بـەڵاو ناڕەحەتـی بەسـەر بەندەکانیـدا دەهێنـێ بـە خۆشـیو ناخۆشـیو تەنگانەو ئاسـانکاری، تـا ئارامگـریو سوپاسـگوزاریان تاقـی بکاتـەوە، بەو شـێوەیە ئیمـانو بڕواو دڵنیاییـان زیـاد بکات.

چـلو دوو: دروسـتە مـرۆڤ باسـی حـاڵو دۆخـی خـۆی بـکات، لـەوەی کـە تیایدایە لە نەخۆشـیو هەژاریو هاوشـێوەیان، بەبێ ناشـکوریو تـوورە بوون، چونکە براکانی یوسـف وتیـان: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ ﴿٨٨﴾ ﴾یوسف. (واتە: ئەی عەزیزو پاشـای میسـر خۆمـانو بنەماڵەکەمـان تووشـی برسـیەتی بوویـن) یوسـف نکوڵـی لێنەکردن لەسـەر ئەو قسەیە.

چـلو سـێ: فەزڵو چاکـەی تەقواو پارێـزکاری، بێگومان هەمـوو خێری دونیـاو دواڕۆژ لە شـوێنەوارەکانی تەقـواو ئارامگرتنە، سـەرەنجامی خاوەنەکانیان باشـترین سـەرەنجامە، وەک یوسـف عليه السلام فەرمـووی: ﴿ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾یوسـف. (واتـە: خـوا منەتی کرد بەسـەرماندا، چونکـە هەر کەس لـە خوا بترسـێو خۆڕاگر بێ، بەڕاسـتی خـوا پاداشـتی چاکـەکاران نافەوتێنێ).

چـلو چـوار: پێویسـتە ئەو کەسـەی کە خـوا ﷻ نـازو نیعمەتێ دەڕێـژێ بەسـەریدا، پاش ئـەوەی کـە بارودۆخی ژیانـی ناخۆش بـووە، دان بنێـت بـە نیعمەتەکانی خوا بەسـەریەوە، بـەردەوام حاڵـی پێشـتری بهێنێتـە پێش چاو، تـا هەرکاتێ بیـری لێکردەوە سوپاسـگوزاری خـوا بکات، وەک وتـەی یوسـف عليه السلام: ﴿ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ ﴿١٠٠﴾ ﴾یوسـف. (واتـە: بێگومان ئەو دەمەی لـە زیندان دەریهێنـام چاکەی لەگەڵ کردم، ئێوەشـی لـە بیابانەوە هێناوە (میسـر).

چل‌و پێنج: میهرەبانی خوا ﷻ بەرانبەر یوسف ؈ کاتێ کە گواستیەوە لەو قۆناغانەوە، وە تووشی ناخۆشی‌و میحنەتی کرد، تا بیگەیەنێت بە بەرزترین پلەو پایە.

چل‌و شەش: پێویستە لەسەر بەندە بەردەوام خۆی هەڵبواسێت بە خوای گەورەوە بۆ چەسپاندنی ئیمان‌و بڕواکەی، وە سەرجەم ئەو هۆکارانە بگرێتە بەر کە پێویستن بۆ بەهێز کردنی ئیمانەکەی، بەردەوام داوای سەرەنجامی خێرو تەواوی نیعمەتەکان بکات، وەک یوسف فەرموویەتی: ﴿ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ﴾ یوسف. (واتە: ئەی پەروەردگارم! بە ڕاستی پێت بەخشیوم هەندێ لە دەسەڵات‌و پاشایەتی، وە هەندێکیش لە لێکدانەوەی خەوت فێر کردووم، ئەی دروستکاری ئاسمانەکان‌و زەوی پشتیوانی‌و یارمەتی دەری منی لە دونیاو دواڕۆژدا، بە مسوڵمانی بممرێنەو بمخەرە ڕیزی چاکەکارانەوە).

ئەمە خوا ئاسانی کرد لە سوودو پەندو ئامۆژگاریەکانی ناو ئەم چیرۆکە پیرۆزە، هەر دەبێ بۆ کەسی ژیرو عاقڵ لە بیرکردنەوەی ئەم سوورەتەدا شتی تری بۆ دەربکەوێ. داوامان لە خوای بەرزو مەزن ئەوەیە زانستی بە سوودو کردەوەی وەرگیراومان بە نسیب بکات، بێگومان ئەو بەخشەندەی میهرەبانە.

تەفسیری سوورەتی (یوسف) تەواو بوو

سوپاس بۆ خوای پەروەردگار.

